# ڕامان

ژمارە: 65 (2001/11/5)
مەجەللەیەکی ڕۆشنبیری گشتییە
دەزگای گوڵان دەری دەکات

65



## د. زوهدی داوودی:

## کە لەبارەی کوردەوە دەنووسم ناتوانم شتەکان بەڕەنگی گوڵ ڕەنگ بکەم ، هەندێ ڕەخنەش وەک تەور داهێنان دادەپاچێ



## عەبدولقادر سەعید سەرچناری:

## خوێنەرێک زیرەک و بە ئەزموون نەبێ، شیعری چاک و خراپی پێ لە یەکتر جیا ناکرێتەوە



دوو تابلۆی هونەرمەند:

**ئەحمەد خەلیلی فەرد**

کوردستانی ئێران/ سنە





١٦



مزگەوتی شەرەف بەگی بدلیسی باپیری شەرەفخانی مێژوونووس کە لە ساڵی (٩٣٠)ی کۆچی دروستی کردووە. ئەم مزگەوتە گۆڕی شەرەف بەگ و ژنەکەی تێدایە. ئەم وێنەیە لە ساڵی (١٩٧٧)دا گیراوە.



بخێری (مخەیری) - ئاگردان لە خانووی حەسەن پاشادا لە ئامێدی. ئەم وێنەیە لە (١٩٨٣/٩/١٨)دا گیراوە.

(دیاری: عەبدولڕەقیب یووسف)

Concessioner
Shewket Sh. yezdeen
Editor inchief
Saro Qadir
Editor Director
Azad Abdul-wahed



خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین
سەرنووسەر: سەرۆ قادر
بەڕێوەبەری نووسین: ئازاد عەبدولواحید

دەزگای ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی گوڵان دەری دەکات

زمارە: 65 | مانگانەیەکی ڕۆشنبیریی گشتیی ئازادە | نرخی (10) دینارە | ساڵی شەشەم / تشرینی دووەم / 2001

## ناوەرۆک

• فۆتۆگراف 3
• پێرست 4
• لێکۆڵینەوە
- سەرچاوەکانی بیروباوەڕی کوردەواری............ شوکور مستەفا 6
- کولتوورو پۆست مۆدێرنیزم لە ئەمریکا............ د. سەباح عەبدوڵلا سالح 27
- دەقی ناوێتە............ فوئاد ڕەشید 31
- سەنتەریزمی شارستانی و ڕەهەندی گەمارۆی کولتوورەکان............ عومەر عەلی محەمەد 37
- ستراتیژییەتگوتاری هێرمینیۆتیکا............ ستاری پیرداودی 42
- سەمەد هەر زیندووە............ و/ لە فارسییەوە: عومەر باڵەکی 54
- ئەنتی ڕیالیزم.. ئەفسوونی ڕۆمانتیزم............ و/ لە فارسییەوە: حەمەکەریم عارف 63
• ڕەخنە
- خواندنەکا نە تەمام بۆ هۆزانەکا نە تەمام بووی............ د. عارف حیتو 71
• تیۆری ئەدەبی
- تیۆری هەڵوەشانەوە............ بەختیار سەجادی 80
• ئەدەبی بەراورد
- ئەزەرگەی پیران و سێیەمین بەستێنی چۆم............ سەلام مەغی 88
• چاوپێکەوتن
- چاوپێکەوتنێکی تێروتەسەل لەگەڵ نووسەری دوورەوڵات (د. زوهدی داوودی)............ ئا: ئازاد عەبدولواحید-مەحموود زامدار 92
- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ شاعیری لاو (عەبدولقادر سەرچناری)............ ئا: مەحموود زامدار-ئازاد عەبدولواحید 103
- تۆدۆرۆف بە تۆدۆرۆف-دا دەچێتەوە............ و/ جەمال ڕەشید 109
• دیمانە
- لەگەڵ ڕۆحی سپی منداڵێکی بەساڵاچوودا............ ئا: ئازاد عەبدولواحید 116
• مێزگرد
- ناسینی ڕۆشنبیرو دیاردە ڕۆشنبیرییەکان............ ئا: ڕامان 120
• وتار
- مۆرە بچکۆلەو توغرای شەرەفخانی بەدلیسی............ عەبدولڕەقیب یووسف 132
- دەڤەری کەرکوک و ناوچەی شوێنەوارەکانی............ ئا: خالید سابیر 135
- هێندێک لەلایەنەکانی زمان لە شیعری مەحوی-دا............ وریا ڕەحمانی 139
- بیری پۆست مۆدێرن............ و/ لە فارسییەوە: عەوڵا بەهرامی 142
- دایالۆگێک لەگەڵ (ئیروین)دا............ و/ لە ئینگلیزییەوە: ئازاد خدر 145
- سەلیم بەرەکات لە دەیەی سێیەمی ئەزموونی خۆیدا............ کەریم دەشتی 149
- ڕەخنەی ڕۆشنبیری.. خوێندنەوەیەک لە نەسەقەکانی ڕۆشنبیریی عەرەبی............ و/ کەمال غەمبار 153
• شیعر
- گشت شتەکان بسڕەوە............ سەلاح شوان 158
- جەژنوارەی فەنا............ ئەوزاد ڕەفعەت 159
- دەرزەکانی ناو.. درزەکانی ناوێتە............ ئەحمەدی مەلا 160
- دالغێن قەرەچکی............ موحسن قوچان 168
- دارستانی ئۆرگازموز و............ زانا خەلیل 171
- سەمفۆنیای بەیانییەک............ ڕۆژە حەسەن 173
• شیعری بیانی
- ڕۆژێ ژیرۆد............ و/ لە فەرەنسییەوە: د. فەرهاد پیرباڵ 174
• چیرۆک
- سەفەری مۆر............ جەبار جەمال غەریب 176
- خۆ ئەدانەدەست!............ مەولوود ئیبراهیم حەسەن 183
- من و پیاوە ڕۆبۆتەکە............ یاسین بانیخێلانی 187
- ئازراندن............ عسمەت محەمەد بەدەل 189

بەڕێوەبەری هونەری: محەمەد قادر

ناوونیشانی گۆڤاری (ڕامان):
هەولێر - گەڕەکی مامۆستایان: بارەگای گۆڤاری ڕامان

فاکس و تەلەفۆنەکانی گۆڤاری **ڕامان**

پۆستی ئەلکترۆنی:
raman @ gulan- Media. net

TEL: 0044-16284-86006 FAX: 0044-2075170914



- بەسەر درکەوە.......... ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی 191
- خەونی ئەو کیژانەی لە خۆر دزران.......... ئەحمەد قادر سەعید 193

• چیرۆکی بیانی

- لاواندنەوەیەک بۆ ژاڵەو بکوژەکەی.......... و/ لە فارسییەوە: نەجیبە ئەحمەد 197

• نۆڤلێت

- گەمەی گۆڕینەوەی قەرەوێڵەکان.......... شێرزاد حەسەن 202

• دەروونزانی

- شێوازەکانی مامەڵەکردن و پێوەندیی بە ئاسایشی دەروونی.......... مونەیەد ئیسماعیل جەرجیس 214

• فەلسەفە

- ڕۆشنگەری چییە؟.......... و/ لە فارسییەوە: سەید جەعفەری مستەفەوی 223

• هزر

- ڕاسیزم هەڵگێڕانەوەی جیاوازییەکان.......... محەمەد تەها حوسێن 227

• زمانزانی

- بینای (ناوەڵناو) و ئەرک و جۆری لە شێوەزاری دەشتی هەولێردا.......... ئیدریس عەبدوڵلا 237

• بیرەوەری

- دوو هەڵوێستی مەردانەی حوزنی لە دیدەنی مەلیک فەیسەڵی یەکەم و مەلیک غازی-دا.......... د. کوردستان موکریانی 242

• ئینتەرنێت

- ئەنتێ زلهێزی کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت.......... مەهاباد عومەر خۆشناو 245

• مێژوو

- چوار بەڵگەنامە لە بارەی سەرەتاکانی پێوەندی نێوان کوردو عوسمانییەکان.......... د. زرار سدیق تۆفیق 247

• کەلەپوور

- لانک و لای لایەی کوردەواری.......... زەینۆ شێخانی 251

• گۆرانی و مۆسیقا

- چۆپی.......... بەشیر بۆتانی 254

• شانۆ

- گیروگرفتەکانی شانۆکارانی کورد لە دەرەوەی وڵات.......... مەهدی مەجید جاف 259

• سینەما

- دراکیۆلا.......... ئا: نەسیم ستیڤن 268

• تیراژ (285 - 271)

• کتێب

- مولازم تەحسین و شتی تریش.......... لێدوانی: عوسمان یاسین 286
- دەرسیم لە مێژووی کوردستاندا.......... لێدوانی: عەباس سلێمان سمایل 288
- زەکی هەناری و هۆنراوەی منداڵان.......... لێدوانی: ڕۆستەم باجەڵان 291
- فەرهەنگۆکا کلاسیکێن کورد.......... لێدوانی: یاسرێ حەسەنی 295
- فەرهەنگی وێنەدار.......... لێدوانی: عەبدولخالیق قەرەداغی 296
- ئەزموونی شیعری منداڵان.......... لێدوانی: نیان حەمەکەریم سوبحان 298
- شەوچرا.......... لێدوانی: بەدرەدین ساڵح 300

• ئەلبوومی ڕامان (302 - 301)

• زاراوەسازی

- چیرۆکی ئەفسانەیی.......... ئا: د. موحسین ئەحمەد عومەر 303

• نامە

- نامەیەک لە (ئەنوەر قادر محەمەد)ەوە.......... ئا: ڕامان 304

• دوا پەنجەرە

- شوێنەوارەکانمان وەک سەرمایەیەکی گرنگی نەتەوایەتی.......... ئازاد عەبدولواحید 306

# سەرچاوەکانی بیروباوەڕی کوردەواری



شوکور مستەفا

نەتەوەی کوردیش، وەک هەر نەتەوەیەکی دیکەی ئەم سەر دنیایە چارەنووسی دەگەڵ نەتەوە نزیک و دوورەدەستەکاندا، لە هەموو قۆناخەکانی مێژوودا، ئەگەر یەک نەبووبێ، لە زۆر چتی بنەڕەتدا، وەک یەک بووە. کوردیش کە تازە پێرۆکە بووە، بیری لە دەوروبەری خۆی کردۆتەوە - سەری لە گومەزی شینی ئاسمانی پڕ ستێر، لە چیای بڵندو هەڵدێری هەزار بە هەزار، لە دەشت و بیابانی کاکی بە کاکی، لە گرمەی هەورو ناڵەو چەخماخەی بروسکە، لە سووتمانی گەورەی لێڕەواران، لە باوبۆران و ڕەهێڵەو بەفرو بەستەڵەک و ڕێبەندان، لە ستێرکشان و بوومەلەرزەو لافاو و لاسامە، لە دڕندەی لەخۆ تواناترو گەورەتر، لە مردن، لە پاش مردن و تاد.... سەری سوڕماوە، هێندێ جار بەوەندە مێشکەی کە هێشتا وەکو ئەوەی ئێستای نەبووەو کەم ئەزموون بووە، بە خەیاڵ و وەهم، هۆکارو سەوەوکارێکی بۆ ئەم جۆرە دیاریدانە بە بیردا هاتووەو بە هەڵەو بێ هیچ بەڵگەیەکی واقیعیانە قەناعەتی بەخۆی هێناوە..... مانگ و ڕۆژ گیراوە، پێی وابووە، دێوەزمەیەک گرتوویەو کردوویە بە هەنگامەو هەراوهۆریاو تەنەکە لێدان و گرم و هۆڕ، دێوەزەمەی پێ بترسێنێ، باران بڕان بووبێ، بەزمی کۆسەوەوی و بووکە بەبارانەو گێچییەگیرانی بۆ گێڕاوە، دوعاو نوێژی تایبەتی بۆ کردووە، بەڵکو بباریێ. یا باران زۆر باریوەو بەجارێ خەڵکی لە کارو کاسبی کردووە، ناچار نێوی دە کەچەڵ، یا زۆرتر یا کەمتری لەکن مەلایەک لەسەر کاغەز نووسیوەو بەمە پێی وا بووە، باران ڕادەگرێ، ئاژەڵی لێ ئاوەکی بووەو لە گەلە دابڕاوەو نەیزانیوە بەکوێ کەوتووە، لەکن شێخ و مەلا دەمی گورگی بەستووە، زاوا بە زاوا نەبووە، چووەتە کن کولەنانی زاوای بۆ کردووەتەوە، ویستبێتی کیژێ حەزی لێ بکا، جۆرەها سیحرو جادووی لەکن جادووگەر کردووەو تاد... خۆلاسە ئەوەی لە ئەورووپاو ئەفریقاو ئاسیاو ئەمەریکاو غانەو فەرغانەو مەدغەشقەرو تاد... و هەر کوێیەکی دیکەت بە بیردا دێ، دەگەڵ ئەوەکەی لای خۆمان و وڵاتی خۆماندا چ فەرقێکی ئەوتۆی نەبووە، مەگەر زمانی مەردمەکە نەبێ... کەواتە: بیروباوەڕی مرۆ دەگەڵ ئەو هەمەڕەنگی و هەمەزمانییە، سەرچاوەکانی بیری، نەک هەر نەتەوەی کورد، بگرە سەرلەبەری نەتەوەکانی سەر دنیایێ، دەبێ - لە سێ قۆناغدا قۆناغبەندی بکرێن:

(١) قۆناغی دێرین - واتە: سەروبەندی ڕەوندایەتیی مرۆ کە هێشتا خەت و نووسین پەیدا نەببوو. مرۆ لەم سەروبەندەدا زانستی ئەوەی بە بەرەوە نەبووە، کە هەرچییەکی ڕەنێوهێناوە (ئەزموونەکانی، ئەدەبیات، بیروباوەڕ و ڕێوڕەسمی ئایینی) بە سەردێڕی ڕەمزی ژیانی تاکە کەسی و دەستە جەمعییەوەی تۆمار بکاو بەم جۆرە مێژووی ژیانی خۆی بنووسێتەوە.

(٢) قۆناغی کۆمەڵەکیی مێژوویینە- واتە: قۆناغی شارستانیەتیی بەرەی مرۆ - سەرەتای سەروبەندی داهێنانی خەت و نووسین. لەم قۆناغەدا مرۆ بووگە وە خاوەن بەرپرسیاریی تاکە کەسیش و دەستەجەمعیش و دەستی لەنیهادەکانی پەرەورشت و سیستمی فێرکردن و پەروەراندن گیربووەو لە ئاکامدا ئەم سەروبەندە، بووە بە سەروبەندی ڕازونیازو ڕەمزەکان لە بۆ بەرەکانی دیکەی مرۆی پاشە خۆی.

(٣) قۆناغی هاوچەرخ - ئەم قۆناغە، بە وردی لە سەدەکانی دوایینڕا دەستی پێ کردووەو دەگەڵ ڕێنەسانسی ئەورووپاو لە دیلی و بەندەگیی ڕۆحانییەتی کلێسا ڕزگاربوونی زانست و ئەقڵ و بیرو بە چلەپۆپەگەیشتنی ئەم بەهرە گەورانەی مرۆ بەگەشە کەوتووەو کۆڕەوی شارستانیەتیی مرۆڤایەتی، بە ڕۆژگارێ گەیشتووە، ئەوەتا لە پشت ستارەکانی ئاسمانەوە سۆسەی جۆرە مرۆی دیکە دەکرێ و دە مرخێش مرخێش و پەیجۆری دۆزینەوەی لە خۆمان دەست هەورازتر، یا ئەویتردایە. ئەورۆ مرۆی هاوچەرخ بیر لە دوو شتی سەرەکی دەکاتەوە:(١) بەرەو ژیان لە بۆ سەرلەبەری مرۆڤایەتیی سەرزەوین خۆش کردن

و لە برسیێتی و ترس و نامۆیی و بێکاری و هەڵپەساردن ڕزگاربوون و ڕێز لێنران، کە ئەوەش لە سیستمێکی بۆ ئەورۆ لە گوێن سیستمی دیموکراسیدا نەبێ فەراهەم نابێ. (٢) زانست و فەلسەفەو هونەر بۆ خێروبێری مرۆ بەکار بهێندرێت.

بنەمای شارستانیەتی لەوێ ڕۆژێوە، هەڵنرا، کە مرۆ خەتی وێنەکیی بۆ خۆی داهێنا. بەڵگە بۆ ئەوە زۆرە، کە ئەگەر خەت نەبا هیچ کۆمەڵێ، لە ڕووی ئابووری و بازرگانییەوە، نەیدەتوانی کار لە کۆمەڵێکی دیکە بکا.

هەر بە «خەت» بوو کە یاراو بەهرەکانی مرۆ پشکوتوون و وەگەشە کەوتوون، هونەری خۆشنووسی بوو ڕێگای لەبۆ هونەری نیگارکێشی خۆش کردو هەر ئەم دوو زەمینەیەش بوو کە پەیکەرتاشیی، واتە: هونەرێکی دیکەی شکۆمەندی بە دیاری پێشکێش بە کۆمەڵی مرۆ کرد. ئەسڵەن پێشینەی ئاوها ئەوازەیی و دەست ڕەنگینی و بلیمەتییەک - بەش بە حاڵی نەتەوەی کورد کە لەسەرەتاوە نیشتەنیی زاگرۆسن - دەتواندرێ لە ئاسەوارە پەی پێ براوەکانی ئیلام (لوڕستان) و شووشدا کە تەمەنی بە (٣٦٠٠) ساڵ پ.ز. دەگا بەرچاو بکەون.

بە گەشەکردنی نیشانە وێنەکییە (Pictography)کان، ئەلفوبێ هاتە گۆڕێ. ئێمە یادگاری خەتە وێنەکییەکان هێمان دە ئەلفبێتکەی چیندا دەبینین. پاومانی خەتی ئەلفوبێ، سێ هەزار ساڵ پ.ز دەگاتە میسرو گرداوەکانی کریت و گۆیا لەم دوو مۆڵگە شارستانەتییەی ئەو ڕۆژگارەوە خەتی ئەلفوبێ بە سەرانسەری شوێنەکانی دیکەی جیهاندا بڵاوبووەتەوە.

ئەم قۆناغەی ژیانی مرۆیە ڕێکەوتی سەروبەندی شارستانییەت و شارنشینی (شارۆنان) یا بە کۆمەڵی گەورە-گەورە پێکەوە ژیانی مرۆیە. مرۆی ئەورۆکە شانازی بەوەوە دەکا، کە ڕازی خەتەکانی ئاشووری و میسریی هەڵێناون و لە ئەنتیکەخانەکاندا بە یادگاری پاراستوون. ژمارە داهێنان کاری هندییانە. ئەم دوو داهێنانە گەورەیە: ژمارەو پیت، پێ بە پێی فراژووبوون و گەشەکردنی مرۆ گەشەیان کردووەو سەرەنجام بەم شێوەیەی ئەمرۆ گەییون.

ئەلفوبێی (٢٤ پیتی) ستاندارتێکە کە لە هەزارەی دووەم و سێیەم، بگرە چارەمی پ.ز دا سەری هەڵداوە. یەژن فینیقییەکان ئەلفوبێی سامیتیکیان داهێناگەو یۆنانییەکان لە گەشەکردن و پێ گەیاندنیدا زۆریان ڕەنج کێشاگە. دیارە لەوەهێش باخەبەرین کە «هیرۆگلیف» بە مانای «مۆرهەڵکەنیی پیرۆزە».. خەتی «هیراتیکی» (١)و«دیمۆتیکی» (٢) لە هەزارەی دووەمی پ.ز دا پەیدا بوو. ئەم خەتە لەسەر تاتەبەردی ئاسک و سپی دەنووسراو ئەمیش دیاریدەیەکە لە هیمەکانی پەیدابوونی داهێنانی کاغەز کە پێداویستێکی دیکەی مرۆی شارستانییە. تاتەبەردەنووسەکانی ئەم سەروبەندەیان لە کتێبخانەکانی «بابلستان» و «ئیلام»دا دۆزییەوە.

ئەوجا لەسەروبەندی دێریندا چەند بیروبڕوایەکی ئایینی پەیدابوون و بەم ئایینانە، ئایینی سەرەتایی(٣) (بتپەرستی) دەگوترێ، بەڵام ئەم ئایینانە بە کتێب ناتوانین سەرەودەریان لێ دەرکەین، چونکە نووسین نەبووە. کە واتا دەبێ خەریکی سەروسۆراخێکی کۆنتر بین و لە ئایینێک بگەڕێین کە لە ئایینێکی دیکەی پێشە خۆوەی نەهاتبێتە گۆڕێ، واتە: پێشینەی نەبووبێ. دیارە ئەمەش بە پێی بیروباوەڕی ماتریالیزم کارێکی لە کر بەدەرە؛ چونکە هیچ چتێ، بێ سەرەتاو پێشینەیەک، چ لە شکڵ و چ لە نێوەرۆکدا، با لەوپەڕی سادەگیشدا بێ، نایەتە گۆڕێ. هەر بۆیە هەموو چتێ دەبێ سەرچاوەیەکی واقیعی و ماددیی هەبێ. خودا بۆ خۆی دەفەرموێ: **«منها خلقناكم و فيها نعيدكم ومنها نخرجكم تارة أخرى»** (ئایەتی ٥٥ سوورەتی تاها) واتە: لە خاکم گووراندوون و لە خاکیشتاندا وەدەگێرم و هەر لە خاکیشەوەتان دەردێنمەوە. ئەدی هەر خوداوەند بۆ خۆی نافەرموێ: **«إن الله فالق الحب و النوى يخرج الحي من الميت و مخرج الميت من الحي ذلكم الله فأنى تؤفكون»** (ئایەتی ٩٥ سوورەتی الأنعام) واتە: خوداوەند دانە لە گیا دەتەرەکێنێ و ناوک لە خورما دەرسکێنێ و مردوو لە زیندووگوورێنە، ئەوە خوداوەندە خوداوەند! چۆن لە باوەڕو ئیمان پێ هێنانی وەلادەکەون، بە بەڵگەی ئاشکراوە؟! ئەوجا کە ئەوەمان دەستنیشان کرد، هەنگێن دەبێ بە کۆمەگی دەوروبەری ئایینە سەرەتاییەکانی مرۆگەلی سەردەمی لەسەر دارودرەخت ژیان و میوەچنینەوەو لەنێو ئەشکەوتدا ژیان و بە ڕاووشکار بەڕێوەچوون و لە دەشت و ئاران و چۆڵاندا بە ئاژەڵوانی گوزەران بەسەربردنی ڕەوەندو کۆچەران ئاسەوارێکمان وەگیرکەوێ. بۆ ئەمەش دەبێ پەنا وەبەر دێرینەشناسی و کۆمەڵ شناسی و زمان شناسی و ئابووری شناسی بەرین. تەنانەت ئەمەش یەگانە ڕێگایەک نییە لەبۆ ئەم کارە، بەڵکو بە چوونە نێو خەڵکانی زۆر کۆنی پاشماوەی ئەو سەروبەندە کۆنەوە کە دە ژیانی شارستانیەتی بە دوور ماونەوەو هێمان سەردەقی کۆنایەتییان نەشکاوە، ئەوجا کارەکە مەیسەر دەبێ. ئەم ئایینانە ئەمانەی پایینن:

(١) فتشییەت، جادوو-«فتیش» واژەیەکی بە بنەچەکە پورتکێشییەو بە مانای چتی وەک متومووروو و گوێچکە ماسی و قەپێلک و تاد..ە کە مرۆی ڕەوەندو زۆر سەرەتایی بە پیرۆزیان زانیوە و بوون بە چتهایەک کە پێیی وا بووە هەر یەکە ڕۆحێکیان تێدا وەشارتییە. جا یەکێ لە سەرچاوەکانی بیروباوەڕی کوردەواری لە سەروبەندە فرە کۆنەکاندا ئەم فتیشییەتیە. تا ئەورۆکەش لە کوردەواریدا نیشانەی ئەم فتیشییەت (ئەرواپەرستی)یە لە دەزبێنک و ملوێنک و لووتەوانە و خەزێم و گوارەو چتی لەم جۆرە بابەتانەدا کە ڕۆژگارێ لە بەردو ئێسک و شتی وا داتاشراون و کون کراون، بەرچاو دەکەون. ئەم فتیشانە نەک تەنێ هەر پیاوو ژن لە دەست و گوێ و لووتی خۆیانیان کردوون و دەکەن بگرە بە ملی ئاژەڵ و شمەکی نێومالیشەوەیان هەڵاواسیون و هەڵی داواسن: دە مشتووو کالانی شیر و خەنجەرو قۆناغەی شەشاگر و تفەنگانیش چەقێندراون.. کووژەکەی شینی کون کونیان بۆ چاوەزارو لە خراپە و گەڕی ئەرواى پیس بە دوور بوون، بە هەنیەی ساواوە، بە هاسانەو سەرەدەرانەی مالێوە، بە زین و کەڵپۆسی زینی ئەسپ و مایینەوە، بە ڕستی ملی توولەو تاژییەوە هەڵاواسیون و هەڵی داواسن. تەزبیەی سەد و یەک دانەیی دوو ئیمامە، ئەویش تەرحێکە لە فتیش و چەندین کاری پێ ڕادەپەڕێندرێ.. تەسبیحات، ئیستیخارە، ئەژماردن و تاد..ی پێ دەکرێن و بە چتێکی پیرۆز دەزاندرێ و ئەمیشە هەر جۆرە فتیشێکە. بروا بفەرموو، وەبیرمە داڵکم کە گوریسی دەهۆندەوە، دەبوا لە میمکە خەوشەی پرسیبا، وە کامیان:


ئەبوعەلای مەعەری

گورزەهۆن، یا پەلکەهۆنی بهۆنێتەوە؟ ئەگەر بۆ کاری قورس با دەیگۆ: وە گـورزەهۆن، ئەگـەر بۆ کـاری سـووک با دەیگۆ: وە پەلکەهۆن. ئەم فـتیشـە بە مانای جادوو و سیحرە. فـتیش دوو لایەنی هەس: (١) لایـەنی تەلـەســـمکاری. (٢) لایـەنی نوشتەکاری.

تەلەسـمەکـان چتـهـایەکن نرخ و بەهای بەکـارو کـاریگەریی خۆیان هەس. نوشتـەکان تواناییی بەرگرییـان هەیە. بۆ چاوەزار خاسن و لە گـەرو گـۆلـمـەزی چت خراو خـاوەنەکـانیـان بە دوور دەگرن. موورووو، کووژەکە، شاخی کەڵەکێوی، کوزەکەمتـیارو تاد.. سەرلەبەر نموونەی زەق و زۆیی بیروبڕوای فـتیشییەتن کە تا ئەورۆکەش لەناو کوردەواریدا ماونەوە.

هێندێ لە کۆمەڵناسان لەو باوەڕەدان کە ئەم فـتـیشـییـەتە لە بڕوا بە «مـانا» کـەوتۆتەوە. مـانا، واتە: هێـزێکی نادیارو لە پێـواردا کە لە هەمـوو شوێنێ هەس و دەگەڵ چتی پیرۆزدا ، بە هاوبەشی دەگشت چتـێکدا تەشریفی هەس... ئەم زاراوەیە لە پێـشـدا (برۆس) دای هێنا. بگرە ئۆگـەست کـانتـیش بەکـاری بردووە. بە کـورتی و کـرمـانجی ئەم فـتـیشـییـەتە سەرەتای بت پەرسـتـیی مـرۆی هەرە سـەرەتاییـە لەکن نەتەوەکـانی پێش شارستانیەتیدا، کە باوەڕیان وا بووە هێندێ چتی ماددی هەن، ئەروایان هەس. هەکە پورتکێشەکان بۆ یەکەم جار بەرەو رووی خـەڵکی ئەفریقـا بوونەوە، دیتـیـان گـیـاوگـۆڵ و داروەرەخـتـان دەپەرستن و پێیان وایە ئەمانە خێوی دەسەلاتی لە کێش و توانی مرۆ بەدەرن، لە کوردەواریدا بەسەدان قسنەبەرد و غەڵە خرک و داری بەوزو داری زریسک و داری زەیتوون و داری گوێزو گـیای بزنترێنەو خوشیلکە کێویلە و گادەمەو گاوما (گیای هوما) کە مووبەدانی ئاورگایەکانی زەرتوشتییان شەرابی پیرۆزیان لێ ساز دەداو برێ گـیـاوگـۆڵی دیکە بە پیـرۆز دەزاندرێن و برین و سووتاندن و ئاژەڵ تێ کردنیان بە گوناه دەزاندرێ.

(٢) ئانیـمیزم (ئەرواپەرستی)- واژەی «ئانیم» و «ئەنیـمە» بە مـــانای بزواندن و ورووژاندنە، کـــە هەر لە واژەی رۆح کــەوتۆتەوە. بە بڕوای زۆرینەی ئایین شناســـان، ئایینی ئەرواپەرستی سەرتاییترین ئایینی سەر رووی زەوینە.

مـانای رۆح بە زمـانە کـۆنەکـانی سامـیـتـیک سـەرلەبەر، بە زمـانی پەهلەوی Ruvan و فـارسی و کـوردی، کە «ڕەوان= ڕۆحی ڕەوان»ە و بەرابەر بە «گـیـان» بەکـوردی و «جـان» بە فارسییەو بە ئەسڵ بە مانای ڕۆیشتن و بزووتنە. هەر بۆیە کورد پێی وایە رۆح دە کـاتی نووسـتندا دەڕوا و گـەشت و سـەیرانی خۆی دەکا. ئەدی ئەو هەمـوو چتە سـەیروسـەمەرانە کە ڕەنگە قەتی نەدیتبێ، چن کە نووسـتـوو بە خەون دەیان بینێ؟ ڕۆح بە زمـانی عـەرەبی کـە وەک ئایین شناسـان دەڵێن، واتە با. لە ڕیحـــەوە هاتووە؛ چونکە بایش دەڕوا.. ئەدی بۆ دەڵێن (راح یروح، رواح)؟ خۆلاسە ئەمە قسەی فرە لەبان کریاگە، ئێرە جێی نییە زۆری بە تاندا بچم.

ئەرواپەرسـتی بەو مـانایەیە، کە مـرۆی سـەرەتایی بڕوای بە ئەروای نادیتـە و لە پێـواری تایبـەت هەبووگـە. باشـە، ئەم ئەروایانە چێ تایبەتمەندییەکیان ها وەلاوە؟

یەکەم: خێوی کەسایەتییەکی بنیادەمانەن، وشیارو وریان، وە ئیرادەن، وە رک و کـینەن، دڵداری و ئاشـقـێنی و مـاشـقـێنی دەکەن، وەک مەمانان یەکدی دەلێسنەوەو دەگەوزێن، خیانەت دەکـەن، چاکـە دەکـەن، خـراپە دەکـەن، هێندێکیـان شـووم و بەدفەساڵ و جاسووس و ڕاپۆرت نووس و بشێونەو دووزمان و پەست و هیچ و پووچن، هێندێکیـان پیـرۆزو خـێـرەومـەندن. خۆلاسە، هەمـوو سیفات و ئاکارو ڕەفتارێکی مرۆیانەیان هەن. ئەمـانە ژیان و بزووت وجـونبـوش و چالاکی بە بەرەی مـرۆ دەبەخشن، شەخسییەتیان هەیە. دووەم: ئەم ئەروایانە نەمرن. کـاتێ مرۆیەک دەمرێ ڕۆحەکەی دەمێنێتـەوەو بە ئاسـمـانەوە دەگەڕێ، یا لە تاریکسـتـانان، لە لێڕەوارو جەنگەڵسـتـانان ، یا لە گـۆشـەو کـەناری شـاران، یا بە تەنیشت تەرمی مردووانەوە دەمێننەوەو دەژین و هەریەکە پاسەوانی تەرمی خۆیەتی. هەر لەبەر هەندێکەشە مردی حەوتەو چلەی بۆ دەکرێ، نان و حەلوای بۆ دەبەشرێتەوە، گۆڕی بۆ هەڵ دەگیرێ، گومەزی لەسـەر دروست دەکـرێ، پەیکەری بۆ دەتاشـرێ، بە مـردوو نازاندرێ؛ چونکە ڕۆحەکەی ناو بەناو سەری لێ دەدا. کـێلە قـەبرەکـەی بە وێنەی شێرو خەنجەر و ئەسپ و چتی وا دەنەخشێندرێ. دیارە مەبەست لە ڕۆح، لێرەدا ئەو ڕۆحە نییـە کە ئێمە دەیزانین. ڕۆح بەلای ڕەوەندە سەرەتاییەکانەوە هێزێکی نابەرچاوی لە پێـواردایەو لە چتی مـاددی و کـەسـاندا هەیە. بەو تەرزەی ئێـمـە تێی دەگـەین چتی ماددی ڕۆحی تێدا نییەو ڕۆح بە هۆکاری ژین و گـەرما و بزفتی لەشمان دەزانین، وەلێ خەڵکانی کۆن، بە نموونە ئەسکیمۆ باوەڕیان بە چتێکی سێیەمیش، کە غەیری لەش و ڕۆحە هەیەو ئەنیمیستان بەو سێیەمە دەڵێن «ڕۆح» جا لەبەر هەندێ ئەوان باوەڕیان بەوەیە کـە مـرۆ لە ڕۆح و لەش و ناو پێکهـاتووە Birashit ithaw wa Miltha) = برا شـیت ئیـثـاو وا ملثـا = لەپێـشدا واژە هەبوو - ئینجیلی پیـرۆز).. ئەی ئەوە نییە کە نێوی پێغەمبەران و پیران و ئەولیاو مەشایەخ و پادشا و سوڵـتـانان دێنین، دەبێ بۆ ڕێز لێ نان و بڕوا بە پیـرۆزییـان، واژەگەلی وەک: حەزرەت، جەناب خاوەن شکۆو تاد... یان بۆ کـار بێنین؟! جا بەمەدا بە دیار دەکەوێ کە ڕۆح «ڕەوان» نییـە، بەڵکو ڕۆح و ڕۆح پەرسـتی باوەڕێکی سـەرەتایی مـرۆیە، باوەڕێکە بە یەکتابوونی خۆ، یا دووەکیەتی «دوالیزم»ی گێتی، واتە جیهانی ماددی و چتەکانی خۆرسک خێوی ڕۆحن و مرۆش خێوی سریشتێکی نادیتەی دە پێواری دیاریکراوەو نێوی ڕۆحە و نرخ و بەهای مرۆ لە سای ویدایە. جا لێرەڕا گرینگ ئەوەیە کە مرۆ لە نیگای ئەم باوەڕەوە هەست بە جۆرە خزمـایەتییـەک دە

نێوان خۆی و خۆرسکدا دەکا. هەر لەبەر هەندێکەیە لە کوردەواریدا زۆر چت وەک مرۆ گیانلەبەرەو نابێ تووشی وەی و گەزەند بێ... ئەدی ئەوە نییە شاعیری فەیلەسووفی عەرەب، ئەبو عەلای مەعەڕڕی فەرموویەتی: «والذي حارت البَريَّة فيه/ حَيَوان مستحدث من جماد» کە هەر دەکاتەوە فەرموودەی قورئانی پیرۆز، وەک لەو دوو ئایەتەی پێشەوەدام عەرزکردن. ئەمن پێم وایە ئەو بیرە: کەس پێش ئەبو عەلای نەگوتووە! زانایان لەو باوەڕەدا بوون کە زیندوو لە مردوو نایەتە گۆڕێ، بەڵام وەدیارکەوت کە هیچ وا نییە، ئەوەتا خانەی لەشی زیندەورێکی بەبەرد بووی بیست، یا چل هەزار ساڵ لەوە بە پێش، کە هیچ ئاسەوارێکی زیندوێتیی تێدا نەماوە، بەو بەهرەی زانستییەی خودا بە بەندەی خۆی بەخشیوە زیندوو دەکرێتەوە..

مرۆی سەرەتایی زۆر چاک باوەڕی بە یەکپارچەییی خۆی و خۆرسک بووە، ئەدی بیروباوەڕی یەکیەتیی هەبوون (وحدة الوجود) یا یەکیەتیی هەس (وحدة الموجود)ی بودیزم، کە دزەی کردۆتە نێو بیروباوەڕی ئیسلامەوەو لەخۆڕایی ئەهلی باتین بە مل ئەهلی زاهیری ئیسلامیاندا بڕیوەو بە سەدان پاساودان و تەئویلی لە ڕۆحی دەقی قورئان بە دوور، پینەو جووتبەقێی لۆ کراوە، لە کوێڕا هاتووە؟ ئەوە لەوەڕا هاتووە کە خەڵکی هیچ سەروبەندو زەمانێ، لە بیروباوەڕی نوێباوی هیچ ئایینێ وەک یەک لە چتان حاڵی نەبوون و نابن.. خوێندەوار دە ئاستێک، نەخوێندەوار دە ئاستێک، خاوەن بەرژەوەند بە بارێکدا، ئەوەی زۆر دەمارکرژو لە هەموو چتی دیکەی غەیری ئی خۆی تووڕەو نەیار، دە ئەقڵێکدا، هەموو چتێ بایی تێ گەیشتنەکەی خۆی لێی حاڵی دەبێ.. پیرەژنێکم دەناسی، لێم دەپرسی: ئەرێ ئەتۆ بە عەرەبی یا بە کوردی نوێژان دەکەی، دەیگۆ: توخودا جا ئەوە ئەقڵە! هەیە بەکوردی نوێژ نەکا ؟! برادەرێ بۆی وەگێڕام: کابرایەک لە تەوێڵە کوڕێکی ساغ و جوانکیلەو کوڕێکی مجرۆی دەبن، کوڕە جوانکیلەکەی نەخۆشییێکی گران دەگرێ، دەکەوێتە گیانەڵا. کابرای بابی کوڕە، یەکسەر دەست دەداتە دەمانچە دەڵێ،خودایە - ئەستەغفیرەڵڵا - وا پێت یەژم کوڕەکەم بووەیتەوە وەگیان محەمەدلستەفا منیشە ئەو شەلەکە ئەکوژم، ئیتر کەیف خۆتە... ئەمە یەک، دووەم: مرۆ باوەڕی بە «دوناودۆن» [تناسخ] کلێشەگۆڕی هەبووەو ئێستاش هەیە. واتە مرۆ پاش مردنی ڕۆحی مبارەکی لە لەشی دەرتێ، لێ بەلێ هەر بە ئەمری دێ بمینت و دێ چتە لاشەکە دن و ژییا خوە جارەکە دن ددۆمینەو پاشی مرنا لاشێ دودوهێ ژی، ئان دچە جیهانێ ئەڕواحان ئان ژی د لاشێ چارەم و پێنجەمێدا دێ بهێورت. ئینجا ئەی جەنەک سێیەمین و چوارەمین وپەنجەمین و تاد... یە هەنێ جار وارێک ئەکەفێ جەنەک ئایەمێ وێ یان جەنەک حەیوانێ وێ یان گیایێ وێ یان درەختێ وێ یان تەوەنێ، خرکێ وێ. ئینجاکە، عەقییەی دۆنادۆن کە لە دیانەتەیل هیندی و ئەهل هەق- کاکەییەگان خۆمانا هەس، یە عەقییەی هەزارەیل ساڵ و هەرەکوهنەی دیانەتەیل سەر زەوینەس.

ئاشکرایە، ئانیمیزم، جادوو و سیحریشی تێدا هەیە. ئەمەش بۆ خۆی لە بنیچەدا، لە فتیشییەتەوە تەشەنەی کردگەسە ناو ئانیمیزمەوە. مرۆ هەروەکو لەو باوەڕەدا بووە کە دەتوانێ کار بکاتە بوونەوەری ئەڕواحی، هەر وەو تەرحەیش دەتوانێ وە تاسیر قسە و گەپ و بزفت و جموجویل، تاسیر لە تەبیعەتیش بکات. وە نموونە: کوڵەنانییەکی کوردەواری کە زاوایەک دەبەسترێ، بە هێندێ قسەی لە تەرح «قاپی کریاوە، کلۆم کریاوە، گرێکوێرە کریاوە، زاوا کریاوە» زات وەبەر زاوای بەستریاگ ئەنێ و کاورا دەکرێتەوە..

لەبیرم دێ شێخێک هەر بە قسەی سیحراوی شێتی خاس دەکردەوە. هەروەها ئەو بەزم و بالۆرانەی بۆ باران بارین دەگوتران، جۆرە جادوویەک بوون، کاری خۆیان دەکرد و بەرێکەوت بارانیان پێ دەباری:

**هەیاران و مەیاران**
**یاخوا داکاتە باران**
**بۆ فەقیر و هەژاران**

هەروەها کۆسەوەوی و ڕان لە کەلدان و نوێژبارانێ و ئی دیکە... دەچنە خانەی ئەم بابەتەوە..

هێندێ چتی وەک نوشتە و تەلەسم و درەختی کوڵکن، گۆیا هێزی جادوویان تێدایە و بەدبەختی دەرەوێننەوەو خۆشبەختی تێرن..

ئەم ئایینە ئی سەردەمێکە کە مرۆ زێتر لە سەروبەندی ئابووریی ڕاووشکاردا ژیاوە. لەبەر هەندێ دەبینی یەکێ کە وێنەی کەڵەکێوییەکی لە سەر دیواری ئەشکەوتێک کێشاوە و تیرێکی تێ سرەواندووە، ئەوە جادووی لێ کردووەو لەو بڕوایەدا بووە کە بێ سێودوو، کەڵەکێوییەکە دەنگێوێ. هەر لە سای ئەم ئایینەوە، هونەری نیگارکێشی و موزیک و سەماو هەڵپەڕکێ و ئایینی دەروێشی و تاد.. پەیدابووە. زۆر لە سەماو سترانەکان وەختی خۆی بۆ وەی و گەزەند لە خۆ دوورخستنەوەوخێروبێر لەخۆ نزیک خستنەوە بووە.

(٣) تەوتەمیەت - ئەمیشە بە نامێترین ئایینێکە کە سەرلەبەری کۆمەڵناسان، چ ڕاستەوخۆ و چ تییان، دەبن کاریگەریی تێزی کۆمەڵشناساییی ئەودان. تەوتەمییەتئایین لەو باوەڕەدایە کە خێڵ و هۆزە ڕەوەندەکان، کە تا ئەوڕۆش لە ئەفریقاو ئەمریکای باکوورو ئوستralیاو ناو هۆزی عەلکانی کورەدەواری لە کوردستانی تورکیا کە ئیسماعیل بێشکچی لەمەڕ ژیانیان ماجستێری لە زانستگای ئەرزەڕۆم وەرگرتووەو ڕەوەندانە دەژین، هەر یەکە چتێ، گیانلەبەرێ دەپەرستێ.

تەوتەمئایینان (بتپەرستان) هۆز- هۆزو تیرە-تیرەن. هەر هۆزە، تەوتەمێکی تایبەتی خۆی هەس. ئەفرادی هۆزەکان، لە بەڕێوەبردنی ڕێوەڕسمی پەرستش و تەوتەم ناسیدا، دە جلوبەرگ لەبەرکردندا، دە ئارایشت و خۆ لە تەلی تەمووڕەدان و بەزەک و دۆزەک و خشڵ و زێڕو زەبەند بە خۆوە کردندا، دە هەموو ڕەفتارو کردارێکیاندا، هەوڵ دەدەن سەروسیماو ڕەنگ و ڕووی تەوتەمەکەیان بنوێنن و هەر لە شکڵ و شەماییلی ویدا ئارایشتی خۆ بدەن و وەک جلوبەرگی وی لەبەر بکەن و تاد..

یەکێ لە پاشماوەکانی تەوتەمییەت لە ناو کوردەواریدا، ئەوەسا کە ئەگەر گوری و قوربانی و گاوگەردوونێکیان ئەنجام دا، گۆشتەکەی ناخۆن و بۆ خەڵکی دیکەی بە حەڵاڵ دەزانن، نەک خۆیان. بە پیرۆززانین و خوێشاوەنی و خۆشەویستیی نێوان تەوتەم (بت) پەرست و تەوتەم، هەر یەک چتە، کە لە نێو تاکە کەس و کۆمەڵدا ڕەچاو دەکرێن.

بنواشەکانی ئایینی تەوتەمییەت لەسەر سێ کوچکە ڕۆنراون:

(١) تەوتەم- واتە: گیانلەبەرێ لە گیانلەبەران، بە نموونە وەک: ئەسپ، سەگ، یا گیاوگوڵ، وەک: گیای هوما، داری زریسک، یا بێ گیان، وەک: ئەستارەی بەخت و بەردی ڕەش، ئی چەرمگ، نی بە نرخ و بە بەها، ئەمانە هەموو لە کوردەواریدا تەوتەمی پیرۆزن. ئەمانە گشت بە باپیرە گەورە دەزاندرێن. بە نموونە: ئەگەر لە واژەی «سەگەوەند»ی تیرەی لەک،یا ناوی «شێرکۆ» یا «هەزار ئەسپ»و «لوراسپ» وتاد.. وردبینەوە، کە بەم نێوانە نێونراون، هەر وا لە خۆڕا نەهاتوون، بەڵکو سەروکاریان بە بیروباوەڕی تەوتەم پەرستییەوە هەیە. هێندێ کەس وێنەی «ئاسک» یا هەر چتێکی کە لەسەر لەشیان دەکوتن، ئەوە نیشانەی پاشماوەی تەوتەم پەرستییە. ئەمن بۆ خۆم سێ وێنەیان لەسەر باسکی چەپم کوتاوە....لە دایکمم پرسی، ئەوە چییە؟ گوتی: ئەوە نیشانەی تیرەکەمانە. کام تیرە:؟ ئابابازا! لە گوندێک ئافرەتێکم دیت مارێکی -بیلامانێ- لەسەرەوە بە دەوری ....دا کوتابوو، پرسیم ئەوە چییە؟ گوتی: ئەوە بۆ ئەوەیە هەموو کەسێکم پێ نەوێرێ.

کابرایەک لە گوندی کەوەڵە هەبوو، ئەگەر کەسێ ئەساغیی برکی گرتبا، تەشتێکیان بە لاکەلەکەیەوە دەگرت، حەوت تیری دارینی بە تەشتەکەوە دەسراوەند، ئەساغەکە ئیفاقەی دەدا.. کابرا ئەو کارەی لەوەڕا وەگیرکەوتبوو، کە وەختی خۆی لە کوشتنی گورگێکدا، گورگە، گازێکی لە ڕەفیسکی گرتبوو. بەو گازە وەک بێژی ودمی دەست کەوتبوو بۆ ئەوەی ئەساغیی برکان وەرەوێنێ. ترک لەسەروبەندی ڕەوەندایەتییاندا گورگیان پەرستووە و بە پاپیرە گەورەی خۆیانیان دەزانن. لە شیعرێکی شاعیری کورد، جەگەرخیندا، نووسراوە باپیرە گەورەی کوردانیش گورگ بووە. ئەدی ترک لۆچی ئەتاترکی ئەیاری کوردی بە گورگە بۆز نێوناوە؟!

لە کوردەواریدا تا ئەوڕۆکەش وێنەی کێوی و دارودرەخەت لەسەر بەڕو مافوورو ڕایەخ ئەخش دەکرێ. کورد پێی وایە هەر مرۆیی ئەستارەیەکی بەختی لە ئاسمان هەس. ئەستارەکان تەوتەمن. حەوتەوانە بە لای کوردەوە، حەوت بران و تەرمی داڵکیان ها وەبان شانەوە.بیروباوەڕی «گۆی زەوین بەسەر شاخی گاوە ڕاوەستاوە»، بۆ یەکەم جار بە نووسین لە کتێبی «تەزکەرەی ئەعلا»ی ئەهلی حەقدا نووسراوەو ئەمە لای کورد جۆرێکە لە بیروباوەڕی تەوتەمییەت و گا بە خودا زانین و گاپەرستییەکەی هیندۆسانیش دوور نییە هەر لەوەوە کەوتوێسەوە. بە بیرم دێ هێندێ تیرەی کورد حەزیان لەوەبوو، زێتر مەڕی ڕەش بەخێو بکەن و بە دووری نازانم ئەوە بیروباوەڕی تەوتەمییەتێک بێ کە لە ئاسیاییەکانی کۆنەوەمان بۆ مابێتەوە. فەرمانڕەوا تورکمانە قەرەقۆیونلوو و ئاق قۆیونلووە تورکمانەکان، لە ڕەوەندە بیروبڕوا تەوتەمییەکانن و لەوانەوە زۆر بیروباوەڕی نەک هەر تەوتەمییەت،بگرە فتیشییەت و ئانیمیسمیشیان لێ کەوتبنەوە. تەنانەت هەر تیرەیەک لە تورکمان نیشانەیەکی تایبەتی تەوتەمانەی خۆیان هەبوو و سەرلەبەر، مەڕەکانیان پێ نیشانە دەکردن. (بڕوانە دیوانی لوغاتی تورک/ مەحموودی کەشغەری). هێندێ تیرەی کوردەواری حەزیان لە وڵسات و ئاژەڵ و بەرزەی سپی ڕەنگ، هێندیکیان تەو، هێندێکیان مارۆ (قەش، قەشان، بەش)، هێندێکیان، ڕەش بوو. ئەوەش هەمووی سەروکاری بە بیروباوەڕی تەوتەمییەتەوە هەس. خۆلاسە کۆمەڵی



ئیسماعیل بێشکچی

کوردەواری،کە هێشتا پێش نەکەوتووە، زۆرینەی بیروباوەڕەکەی لە بیروباوەڕی فتیشییەت و ئانیمیسم و تەوتەمیسم ئاو دەخواتەوە.. ئەگەر لەو گوڵ و گوڵووک و گوڵانەی کە لە کوردەواری و ڕەنگە لەنێو زۆرینەی نەتەوەکانی سەر دنیایێدا بۆ دەرمان کردنی جۆرەها ئەساغی و چتی دیکە بەکاردەبرێن، لە نێوەکانی ورد بیبەوە بۆت بەدیار دەکەوێ، کە ئەوانە ڕۆژگارێ تەوتەم بوون. ئەتۆ هەر بیر لە «ڕێواس» بکەوە، بە بڕوای باب و باپیرانی هەرە کەونارامان، مەشی و مەشیانەی لێ کەوتوونەوە، کە ماکی نێر و مێیە..

* «وەم بەر و وەو بەری ڕۆخانەدا، هەر جۆرە درەختێکی خۆراکی دەڕوێ کە گەڵایەکانیان سیس هەڵ ناگەڕێن و میوەیان هەرگیز لێ نابڕێ و هەر مانگە میوەیەکی تەڕ و تازە دەگرن، چونکە ئاویان لە پیرۆزەوە بۆ دێ و میوەکانیان بۆ خۆراک و گەڵایەکانیان لەبۆ چارەسەرکردن بەکاردێن». (سەردەمی کەونارا/ کیتاوی حەزقیال پیغەمبەر بەشی ٤٧: ١٢)

ئەوجا بنۆڕە ڕستەی (ئاویان لە پیرۆزەوە بۆ دێ)... واتە لەو سەرچاوەوە کە پیرۆز (موقەددەس)ە، خودایە... ئەوجا بۆیەکا، هەرچی دارودرەخت و گژوگیای سەرزەوین هەس، کە هێندێکیان بە سوود و کەڵکن - هەر بە ئەزموون - پەرستراون...

(٢) مانا- دووەم ئەسڵی تەومییەت، «مانا»یە. مانا: بە زمانی «مەلانیزی»ی باکووری ئوستورالیا، واتە هێزێکی بێ نێوونیشان کە لە هەموو شوێنێ هەیەو سەرلەبەری گیاندار و بێ گیانی تێدا هاوبەشن. لە هێندێ ناوچەی کوردەواریدا واژەی «پێز» و «نێ» کە یەکێکیان بۆ نان و ئەوی دییان بۆ خاک و زەوین بەکار دەبرێ، دوور نییە بەرابەر بەم «مانا»یە بی؟! کورد دەڵێ هەویرەکە پێزی نییە، زەوییەکە نێی پەڕیوە..

ئەم مانایە لە کوردەواریدا کە شکڵی ئەهریمەن (شەیدان: لە تیشکی ئاور دروست کراوە) بە زمانی عەرەب شەیتان لە ئاهورا (ئاهورامازدا= ئاور= ئاگر) هەر بە زمانی عەرەبی، ڕەحماندا ماوەتەوە. ئەی ئەوە نییە موسوڵمان، کە دەست بە هەر کارێ بکا دەبێ بیسمیللای لێ بکا، وەک: پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) فەرموویەتی: کل شيء لم يبدأ به بالبسملة فهو أقطع و أبتـر» واتە: هەر چتێ بیسمیللای لێ نەکرێ ئەستێور و بێ

خێرو بێرە. بە بیسمیللا لە چت کردن، واتە: شەیتان لەو شوێنەی کە ئەو چتەی لێیە، دەرپەڕاندن.. خۆ حەزرەتی شەیتان (مەلەکێ تاووس) بە بڕوای برایانی ئێزەدییانمان لە هەموو شوێنێ تەشریفی هەس. هەموو کوردێ لەو بڕوایەدایە کە خوداوەند لە هەموو شوێنێ حازرە.

(٣) تابوو - سێیەم نەسڵی تەوتەمییەت تابوو «بڤە=پیرۆز، حەرامە. ئەم بڤانە دوو جۆرن: ١- ئەرێنی (چاک)، نەرێنی (خراپ). خراپ (حەرام)ەکان ئەو چتانەن، ئەگەر خۆیان لێ نەپارێزرێ زەرەرو زیانیان لێ دەکەوێتەوە، وەک: کوشتن، یان ڕێز لێ نەگرتن، یان دەست پێ کەوتنی هێندێ گیانلەبەر. بە نموونە کوشتنی پەپووە سلێمانکە، کۆترە باریکە، مێروو، ڕێز لە بوراقیان دەلدول- لە ڕەسمی سندووقی جاراندا نەبێ، کەسیش نەیدیتوون - نەگرتن، دەست لە سەگ و بەراز کەوتن، دەسنوێژی ژن و پیاو (دیارە لە کن شافیعی و حەنبەلییان) لە یەکدی شکان، بە بێ دەسنوێژ دەست لە قورئانی پیرۆز کەوتن، بێ دەستنوێژ، نوێژکردن، پەڕەسێلکە کوشتن کە گۆیا قورئانی خوێنیشەو هەمیشە ئایەتی پیرۆزی «إذ يتلقّى المتلقّيان عن اليمين و عن الشّمال قَعيد» دەخوێنێ و نابێ هێلانەی بشێوێندرێ. تیتراوسک نابێ دەستی لێ بوەشێندرێ. کۆتر لە ماڵێ ڕامەگرە، بەدیومنە. لە قەلەڕەشکە بە دوورکەوە، بە شەو گسک مەدە، سێ شەممان سەرمەتاشە، شەومەنەو پەزێرە مەخۆ، ئەوی ئەسپێ و ڕشکی نەبێ گولە، قەیچی و هەورێن لەخۆڕایی مەقەوچێنەو مەهەورێنە، زاوا کە چووە پەردەوە، دەبێ پاژنەی ڕاستی لەسەر ئەنگوستە کەڵەی بووکێ دانێ و بەیدەستی کا، کچان لە حەوت ساڵیدا سوننەت کەن (کوڕکەی بوورن..)، ئەگەر خۆی دۆڕان وەبەرەواژ، سواری کەرێکی کەن و خۆڵ و دۆی بەسەردا بکەن و وەناو ئاواییدای بگێڕن، گۆشتی باڵندەی گۆشتخۆر ناخورێ. ڕۆژووگرتن لە بنیچەدا بۆ خۆی جۆرێکە لە عیبادەتی تەوتەم پەرستی. داک و خوشک و کەنیشک و پوورو ئەنک و خۆلاسە هەرچی مەحاریم هەس لە کوڕو برا و کوڕی خوشک و کوڕی کوڕ....تاد. حەرامن. پارێزو خەڵوەکێشی و چلەکێشی هەموو لە بنەڕەتدا جۆرێک بوون لە تەوتەم پەرستی، بەڵام ئەم تابوو و بڤانە، بە نموونە بێ دەسنوێژ دەست لە قورئانی پیرۆز دان و خوێندنی بە پێی ئایەتی پیرۆز «في كتاب مكنون، لايمسه إلا المطهرون» {سوورەتی الواقعە- ئایەتی/ ٥٦}، دەسنوێژ بەدەست لە لەشی ئافرەت کەوتن شکان بە پێی ئایەتی پیرۆز «أولامستم النساء فلم تجدوا ماء فتيمموا...» یا ڕۆژوو نەگرتن بەپێی ئایەتی پیرۆز «يا أيها الذين آمنوا كتب عليكم الصيام» {سوورەتی البقرە- ئایەتی /٢}. لە ئایینی ئیسلامەتیدا بە حەرام و بڤەزانین، یا بە تەزبیە زیکرو ئیستیخارە گرتنەوە، یان بە دەست لە سەگ دان گڵاوبوون و زۆر چتی دیکەش، بەو مانا ساکارە نەزانانەی سەروبەندی تەوتەمییەتی کۆن نییە، بەڵکو ئەوانە هەریەکە حیکمەتێکی تەعەببودی و ڕەوانی و کۆمەڵەکی و تەندروستیی لە پشتەوە هەس... ئێمە ئەورۆکە، ڕێز لە چتی وادەگرین کە تا ئەندازەی خۆ لەسەر کوشتن حورمەتی دەگرین... ئەدی بۆ ڕێز لە چتها گرتنێ کە باری ڕەوانی و تەندروستی و دڵنیاییمان بۆ دابین دەکا، نەگرین؟! کابرایەک هێندەی بە پەرۆشی ئەتەکێتی ئەوروپاییانەی ئەورۆ گرتنەوەیە، بەو ڕادەیە گوێ بەچتە پیرۆزەکانی ئایینی نادا... ئەمن خۆم بە دەمڕاستی ئایین نازانم، بەڵام هێندێ چت لە ئایینی ئیسلامەتی دا هەیە، پڕە لە حیکمەتی ڕەوانی و کۆمەڵایەتی و تەندروستی، دەبێ ڕێزیان لێ بگیرێ.

بەڕاستی پیاو کە تەوتەمییەت لەڕووی فەلسەفی- (چتی پیرۆز) مرۆڤەکییەوە ئەنالیزەو شی دەکاتەوە، بەم ئاکامانە دەگا: بە گوێرەی پێوەندیی مرۆ بە تەوتەمەوە (چتی پیرۆز) (لە تەوتەمییەتدا)و بەپێی پێوەندیی وی بە فتیشییەتەوە (لە فیتیشییەتدا) و لە نیگای پێوەندییەوەی بە چتهاو بنیادەم و ئەرواوە (لە ئانیمیسمدا) دنیا و هەرچی هەس و نیس، کریاگە وە دوو بەشەوە: ١- حەڵاڵ (پاک) ٢- حەرام (پیس). هەرچییەکی مرۆ دەیکا یا بۆ قازانج وەدەست هێنانە یا بۆ زیان لە کۆڵە خۆکردنەوەیە. ئیسپینسەر دەڵێ: لە کابرایەکی ڕەوەندم پرسی ئەوە کوو ئەو هەموو فتیشانەت پاراستوون و بەوپەڕی ڕێزەوەیان دەست پێدا دێنێ و بە سەرو چاوتیاندا دەسوی و ماچیان دەکەی و فەڕو بەرەکەتیان لێ دەخوازی، مەگەر ئەمانە چین؟! لۆ دەستەونەزەر لە خزمەت ئەو جادووگەرانەدا ڕادەوستی و ئەژنۆی ماچ دەکەی، دەستی ماچ دەکەی و داوای مەدەدی لێ دەکەی؟ چما ئەو چییە؟! دەڵێ: لە وەڵامدا گوتی: ئەمانە ئەروایان هەس.. تا ئێستاش، لە زۆر جێیان، دارعاسای پیرێکی پیرۆز، تەپلەکەی، سۆلەکەی، بەرماڵەکەی، گۆزەی دەسنوێژ شووشتنەکەی و تاد... دەپارێزرێن. ئەسڵەن بیری ئەنتیکەخانە (مۆزەخانە) کە ئاسەواری کۆنی تێدا خڕدەکرێتەوە هەر لەو پیرۆزییەوە ئاودەخواتەوە.

لە بولغارستان، لە ئەنتیکەخانەی شۆڕشدا، چتی زۆر سەیرم دیتن: ئاغزوونەی پشتێندی پێشمەرگەکانی دیمیترۆف، قەڵەمەکەی، نوسخە داسکەپیتاڵە دەسخەتەکەی مارکس، ئەو پەیژەیەی کە ناو بەناو لە حاڵەتی هەڵاتندا، خۆی پێ دەرباز دەکرد، ئەوانەم هەموو لە مۆزیۆمی تایبەتی ماڵی دیمترۆف-دا، لە ساڵی (١٩٦٠)دا دیتن..

تەحنیت کردنی مردوو ئەوەش هەر بڕوا بە نەمریی ئەرواو تەوتەمییەتە... بەڵام ئەم چتانە مانای وا نییە هەموویان خراپن، نەخێر هێندێکیان لەباوچوون و بۆ خوێندنەوەی مێژووی نەتەوە نەبێ بە کەڵکی چیدیکە نایەن، هێندێکیان بۆ ڕێز لە نەتەوەو قارەمان و سەرکردەو پیاوچاک و بڕوا بە نەتەوەکەت و خەبات و نیشتمانەکەت پێویستن... بەڵام بە مەرجێ نەبێ بە مایەی بت پەرستی.. ئیمامی عومەر (د.خ) داری ڕیزوانی کە بەیعەتیان دەبندا کردو بەو بەیعەتە ئیسلام سەرکەوتنی وەدەستهێنا، بڕییەوە؛ چونکە نواری موسڵمانان ناو بەناو دێن زیارەتی دارەکە دەکەن... دەبینی کاتێ نەتەوەکان دەدەنە باری کزی و کەنەفتی و چکۆلە دەبنەوەو گەورەپیاوانیش نرخ و بەهایان دە زەین و مێشک و دڵی واندا لە دەست دەدەن و نرخ و بەهای بەرزو بڵیندیان پەردەی بەسەردا دەکێشرێ، ئەفرادی نەتەوەکە ئەم نرخ و بەهایانەیان لە کن دەبن بە شتێکی غەریب و نامۆو بۆ خۆشیان تووشی نامۆیی دێن و وردە- وردە پشت گوێیان دێخن وپاشان نرخ و بەهایەکی ئاشنا و ڕۆشنای دیکە دادەتاشن و وە پاڵیان دەدەن. حەزرەتی مووسا (د،خ) پاش ئەوەی بۆ میسر گەڕایەوە، سامیری بتێک، (پیرۆز)ێکی لە گوێن گوێرەکەیەک، لە زێڕ دروست کرد، دەیویست ئایینە بێ خەوشەکانی پێشترێ لەبیر خەڵکی فەلەستان بەرێتەوە، بەڵام

که حەزرەتی مووسا (د.خ) لە میسر گەڕایەوە، نەی لەو جۆرە بیروباوەڕە نەزانانەی خەڵک کردو فەرمووی ئیدی «ئەدونای» (عەزیز= تاکە خودا) بپەرستن....

لەبیرمە دەگەڵ مەلایەکی زۆر زیرەکدا لە گوندێک هێندێ چتی سەیروسەمەرەمان دەکرد.. خەڵکەکە ئەوەیان لە چاو بەهرەو زیرەکیی من و مەلایەکە ڕانەدەدیت، دەیان گوت: ئەوە هەموو لە سای تەوەجوهی شێخ فلانیەو هونەری خۆیان نییە.. تازە ڕادیۆ داکەوتبوو، دەیان گوت شێخ فلان کاغەزی لۆ ئەورووپا ناردووە و ئەو ڕادیۆ دروستکردنی فێرکردوون. بەندە توانج لە شێخ و پیاوچاکان ناگرم، ئەوانەی من ناسیومن و هیچ سەروکارێکیان بە دنیا (ومافیها)وە نەبوو، لە غەیری خێروبێری موسڵمانان بەولاوە چتێکی دیکەیان مەبەست نەبوو. ئەمن مەبەستم ئەو کەسانەیە کە خیلافی ئەقڵ و ڕێی ڕاستی ئیسلام، خەڵک چەواشە دەکەن و...خودا ڕێگەی ڕاستی ئەقڵیان پێ ببەخشێ.

خۆ ئەوە شاراوە نییە کە لە پاش پێغەمبەر (د.خ)، ئیسلام وردە- وردە لە خشتەبرا، خوبزەو بە خۆڕایی نانخۆرو چاپلووسی سەرخوانی لە خودانەترسان، چتی وایان بۆ ئەم ناخوداو لە خودانەترسانە هەڵدەبەست، کە پێغەمبەر بۆ خۆی نەیبوون. ساڵی ڕۆژگیرانەکە خەڵک گوتیان: ئەوە لە خراپەی کوردانە، وەلێ خودا ڕەحمی کرد، شێخ فلان بەزەی بە چەند کەسێکی دڵپاکدا هاتەوەو لە دەست دێوەزمەی قوتارکردن... باران نەباری، گوتیان شێخ فلان دووعای لە کورد کردووە.. گۆیا کورد لەبەر هەندێ بە ئاواتی خۆ ناگەن، چونکە پێغەمبەر دووعای لێ کردوون... لۆ؟ خۆ دەنا کورد لە عەرەبیش و عەجەمیش و تورکیش پێغەمبەریان خۆشتر دەوێ..

ئەوجا لە کۆمەڵگایەکانی فیتیشیسم و ئانیمیسم وتەوتەمیسم و جادوونیسمدا، وا بڕوا کراوە کە هێزێک هەس، پێی یەژن: «شوورینگا» کە تەنێ چەند خوداپێداوێ ئەو هێزەیان هەس و بەس. ئەمانەش بۆ خۆتان دەزانن کێن.. شێت چادەکەنەوە، کەیفیان لێ بێ مردیش -نەعووزوبیللا- بەبێ عیلم زیندی دەکەنەوە، بەڵام گۆیا ناوێرن؟! دووعاگۆی ساختەچی، دووعا لۆ دیکتاتۆرو پیاوکوژان دەکەن، فتیش، یا مانا، یا تەوتەم دەستیان بە باڵیانەوە بگرن و جەبەرووت و حەمەڕووت و شەڕەمووتیان کەم نەبێتەوە. ئەگەر دیکتاتۆر گوتی ڕۆژ لە ئەشکەوسەقا (سەفا؟)وە هەڵدێ، دەڵێن سەدەق، ئەگەر فەرمووی دوو سەد هەزار کورد ئەنفال کەن و حەلاڵە، یەژن حەلاڵەو وەولاتریشەوە.. مەبەستم لە مەلاو شێخی کوردەکە نییە، زۆریان کوردپەروەرن.

مرۆی سەرەتایی ئەنالیزەو لێکدانەوەیەکی بۆ تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی ئایینەکانی ژیانی ڕەوندایەتیی خۆی هەبوو:

١- هەوڵدان بۆ ئەوە کە مانایەک، پاساوێک بۆ هەبوون بسەپێنێ. مرۆ پێی وابووە، کە ئێستەش هەر پێی وایە، هەرچی لەم جیهانەدا هەس نابێ بێ مانا بێ. بە کورتی جیهانبینیی ئایینی جیهانبینییەکی ئەرێنی (موسبەت) نەک نەرێنی (مەنفی)یە. ئەوجا بێ مانا نەبوونی هەبوون واتە: مرۆ و جیهان هەروا بە هەرزە و بێهوودەو بێ کاکڵەو پڕوپووچ نەهاتووە و ئەمەش بە فەلسەفەی ئامانجگەری نێودەبرێ، بەڵام ئەمە بە فەلسەفەی ماتریالیستان ڕاست نییە.؟!

٢- بڕوا بەوە کە ئەم جیهانە بۆ مەبەستێکی بنەبڕ هاتۆتە گۆڕێ، مرۆ، مێژوو بە بێهوودە نەهاتۆتە گۆڕێ.

٣- لە تەواوی ئایینە کۆنەکاندا بیری دوانەیی (دوالیزم=ئەنەوییەت)ی هەستی، هەبوون. چاک و خراپ، جوان و دزێو، چەپەڵ و پیرۆز هەن. (دیارە ئەمە بەلای هێندێ یەکتاپەرستانەوە وەک یارانی بیری «وحدة الوجود»هەرزەیە...)

٤- پیرۆزی لە جیهاندا -لە هەر شوێنێ و لە هەر باوەڕێکدا کە مانای پیرۆزیی تێدا بێ، دەبینی هەست و خوستی ڕێز لە مرۆگرتنی تێدا بە زەقی قوت دەبێتەوە «وقد كرمنا بني آدم و حملناهم في البر والبحر» (سوورەتی الإسراء، ئایەتی ١٧).

٥- هەموو چتەکانی جیهان هێندێکیان بەرهەست و هێندێکیان نابەرهەستن.

٦- ئایین ڕۆحی کۆمەڵایەتیی تێدایە.

٧- ئایین چتێکی نێونەتەوەیی و جیهانییە (سەروکاری بە نەتەوە و نەژادو ئابووری و کۆمەڵایەتیی تایبەتەوە نییە).«كلكم من آدم وآدم من تراب»

٨- یەکێتیی مرۆ و خوڕسک (مرۆ بۆ دامەزراندنی هاوسەنگییەکی سایکۆلۆجیی خۆی، خۆی بە خزم و نزیکی خوڕسک دەزانێ، ئەوەش بۆ ئەوەی کە جیهانی لێ نەبێ بە ڕمووزن و چتێکی ناقۆڵاو ناحەز. مارکس کە دەڵێ مرۆ لە سیستمی سەرمایەداریی بێ بەزەدا جیهانی لێ وەتەنگ هێندراوەو بە دەوروبەری لە خۆی سەرووتر نامۆیە. ئەسڵەن ئەو ژیانەی سەرمایەدار لە کۆشک و تالاراندا بە سەری دەبەن، بەلای مرۆی چەوساوەوە وەکوو خەون و خەیاڵ وایە.. بەڵام مرۆی سەرەتایی بەو جۆرە نەژیاوە، دەگەڵ واقیعی ڕۆژگارانی پێش ئاغا و مسکێندا زۆر ئاشنا بووە. (مرۆ و خوڕسک و خودا) ئەو سێیینەیەیە. لە مێشکی مرۆدا خزمی گیانی بە گیانیی یەکدین. ئەدی حەزرەتی عیسا کوو لەکن برایانی مەسیحی - دیارە بەپێچەوانەی بیروبڕوای موسڵمانان - کوڕی خۆشەویستی خودایە؟!

٩- هەڵپە بۆ پەیوەستیی سەرومڕ و بێ پشوو، لە دووی چتی تازەنەفەس و نەسمراو، هەڵوەداییی دوای حەقیقەت کە بۆ خۆی هەروەکو مارکس دەڵێ ڕەها (مطلق)یش و ڕێژەکی (نسبي، إضافي)یشەو ئەوەی ئەوڕۆ ڕەهایە سبەی دەبێتە ڕێژەکی و مرۆ پەی دەریەی ڕاستینەکان دەدۆزێتەوە، بەڵام دواییشیان نایە. دیارە ئەمە لای ئیسلام ڕاست نییە، چونکە موسوڵمان بەش بەحاڵی پەروەردگار باوەڕی بە (جوزئی لایەتەجەزا)یە، خودا بەسەر هیچ شتێکدا دابەش نابێ. ئەمە مەسەلەیەکی (عەقڵی)یە.. بەڵام لەکن وەحدەتی وجوود ئایینان بەڕاست دەزاندرێ... حافز یەژێ «جنگ هفتاد و دو ملت همەرا عذر بنە/ چون ندیدند حقیقت رە افسانە زدند». ڕاستە مرۆ زۆرجار بە ڕێی گومڕایی و ئەفسانەدا ڕۆیشتووە، وەلێ هەر ڕێی ئەو ئەفسانانە بوو کە مرۆ ئاخرییەکەی هەر وە سەر ڕچەی حەقیقەتی ڕێژەکی کەوت و ئێستێکە هەنگاوی هەراوو بەرین بەرەو ڕاستینە گەورەکانی جیهان هەڵدەگرێ.

١٠- بڕوا بە زاڵبوون و سەرکەوتن و بزووتی بێ وچان. مرۆ بە بیروبڕوای ئەو ئایینەکۆنە خوڕسکانانە و ئایینە خودایییە گەورەکانیشدا نابێ هەر دە قپێلک و قاوغی خۆدا گنیگڵ بخوا

و برش و کەڕوو هەڵێنێ.

١١- مرۆ لەم ئایینە سریشتییانەدا دەبێ بەرپرس بێ. دەبێ خاوەن ویست و خواست بێ. ئەگەر هەستی بەمە نەکردبا هەر هیچی بە هیچ نەدەکرد.

شاعیری بەربەری جەزاییری، ئەبو قاسمی شابی بەزمانی عەرەبی دەڵێ:

**«إذا الشعب يوما أراد الحياة**

**فلابد أن يستجيب القدر**

**ولا بد لليل أن ينجلي**

**ولابد للقيد أن ينكسر»**

هەروەها شاعیری کوردی کرماشانی، ئەبولقاسمی لاهووتی وەک لەبیرم مابێ، دەڵێ:

**اگر فلک با مراد ما نگردد**

**باید کاری کنیم که بگردد**

ئەدی هەرئەوەش نییە کە مرۆ لە ئاژەڵ جوێ دەکاتەوە؟!

١٢- هیچ چتێ بە ڕێکەوت نەبووەو نییە و بێهوودەو بە عەبەس پەیدانەبووە (دیسان هەر فەلسەفەی ئامانجەگەرییەکەیە).

١٣- بڕوا بە ئەسڵی دووفاقایەتی (تضاد): یاسای نە لە نەکردن (قانوونی نەفییی نەفی).

١٤- هیچ چتێ لە خۆڕا نەهاتووە و نایەتە گۆڕێ، واتە: قانوونی ئەنگێزەو ئەنجام (سبب و مسبب). ماتریالیزم ئەمەی قوبوڵە...

١٥- بەرفرەوانیی لە جیهان ڕوانین. مرۆ هەمیشە دنیا لەوەی لە پێش چاوەیەتی هەراوتر و بەرینتر دەبینێ و لای وایە نە سەرەتای هەس و نە بنەتا ئەدی ئەوە نییە هەر کەشف و کشووفاتی گەردوونە؟! (بەپێچەوانەی ئایینی ئیسلامەوە، چونکە خوداوەند ئەو جیهانەی لە کاتی تایەندا دروست فەرمووەو لە کاتی تایەنیشیدا تێک وەردەپێچێ...).

١٦- ئەسڵی ئەمری و ئەبرانەوەی جەوهەرو ماکی چت. مرۆ دەمرێ وەلێ ڕۆحی نامرێ و جاویدانە، ئەدی بۆ میسرییان ئەو هەموو گۆڕخانە گەورانەیان دە شکڵی قووچەکان (ئەهرامان)دا بۆ ئەرواى فیرعەونەکان ڕۆناوە؟!

١٧- هەڵپەی لە هەر تەوقێ هەس قوتاربوون: مرۆ هەمیشە لەو هەست وخوستەدایە کە لە خۆ و دەوروبەر، سەرەنجام و چارەنووسی خۆی ناقایلە و لەبەر هەندێ، سەرومر و بێ وچان لەهەڵوەدای خۆ لە بەند و ئەسارەت و دەستەپاچەیی و بێ دەستەڵاتی ڕزگارکردندایە.

١٨- مشوورخواردنی چاوێری و پاراستنی مرۆ و ئاسەوارە ماددی و مەعنەوییەکانی لە نەمان و لە ناوچوون. واتە: ئاشقە کۆمەڵایەتیی مرۆ، دەنا ئەگەر وا نەبا، ئەو هەموو شارستانیەت و مەدەنییەتە کوو لەسەر یەکدی کەڵەکە دەکرا؟!

١٩- ڕۆحی بزۆزی و ئاڵهای لووت دە هەموو چتێ ژەندن و خواخوای هەموو چتێ فێر بوون، هەرگیز لە زانین وشارەزا بوون تێر نەبوون. ئەدی نابینی مرۆ هەر لە منداڵیڕا چۆن دەست بە هەموو کۆنێکدا دەکاو چەند فوزوولییە؟!

٢٠- هەست بە زەروورەتی سەرپشکی (اختيار)و ئازادی و سەربەخۆیی لە بیرکردنەوە و گوتار و کرداردا. ڕاستە ئایینەکان سەرحەد و سنووری چاک و خراپ و جوان و دزێو و ڕاستی و درۆی دەستنیشان کردووە، وەلێ تا ئەندازەیەکیش، ئازادیی چارەنووسینی خۆشی دە قەبەڵ کردووە. (ئەشعەرییەت) سەرپشکیی لەسنووری دەستەڵاتی ئازادیی خۆیدا داوەتێ. سەرپشکە لەوەی کێهە چاکە، ئەوە بکاو پاداشتیشی دەداتێ..

٢١- زەروورەتی هەست بە جوانی و هونەر پاژێکی زگماکی پەرستنە. بێیتە سەر واقیع هونەر بێچووی ئایینە. کەچی ئەوڕۆ لە ئایین بە چەوت و چەوێڵی گەییوان، کە هونەریان لە مرۆ کردووە بە ڕمووزن و کارێکی بێهوودە و تورەهات، بووە بە کوری لاپرەسەن. بەڵێ هونەری مرۆ بۆ چەوساندنەوەی مرۆ و بێ ئاکاری چتێکە مرۆ بۆ خۆی، پاشان لێی وەڕەز دەبێ.

٢٢- ئەوین و پەرستن، هیچ ئایینێک نییە ئەشق وپەرستنی تێدا نەبێ (بەش بەحاڵی ئیسلام تەنێ عەشقی خوداوەند)؛ چونکە پێوەندیی نێوان مرۆ و خودا، بڕبڕەی پشتی پێوەندیی ئەشق و خۆشەویستییە. ڕادها کریشنا دەفەرموێ: «ئێمە بۆ ئەوە بانگ کراوین کە ئاوها جیهانێ ڕانێین و ئەو هاودەستی و هاوکارییەی ئاوها لەنێوان مرۆ و ئەوین و خودادا مەیسەر کەین و ئەوە ئەوینی ئایینە کە هەمیشە لە فیترەتی مرۆ هەڵقوڵاوەو هەموو دەم مرۆی بەرەو بزووت و کەماڵ شاقاو هەڵێنان ناچار کردووە..»

لە ئایینە کۆنەکانی میسردا لە شاری ئەبی دۆس و ئەنیس «چەقەڵ» دەپەرسترا، لە فەییوم «تیمساح». لە تەبەس خودای ئاموون لە وێنەی «بەران»دا بوو. تەنانەت قالۆنچەش کە بە سەرچاوەی پیت و فەڕی خاک زاندراوە، هەر یەکێ لەو بتە پەرستراوانە بووە، پاش هەڵێنانی ڕازی گۆڕخانەو ئارامگایەکانی فیرعەونەکان، بە سەدان قالۆنچەی لە مەعدەن و داری سەندەل دۆزراونەوە، کە دە حاڵی پیسایی خلداندا دروست کرابوون. ئەم قالۆنچانە لە بانووی نیل هێندە زۆر بوون لە ئاکامی پیسایی خلدان و ئەو پیسایییە دە بن خاکدا وەشارتنە، زەوی و زاری میسر، نێیان تێ دەگەڕا و وە برشت و برست دەکەوتنەوە. بۆیان وەگێڕام سالێکیان لە کوردستان (بەری کۆیە) بارانبران دەبێ، لە جیاتیی لەوەڕ قالۆنچەیەکی بێ شوومار پەیدا دەبێ. ئاژەڵ لە باتیی گیاوگۆڵ بە قالۆنچە خواردن دەژین، تەنانەت شیری ئەوێ سالێی مەڕومالات سوور دەبێ.. خەڵکەکە لە پاشان بیریان لێ کردبۆوە، کورە نەکەن ئیدی قالۆنچە قڕکەن... ئەوە گیانلەبەرێکی پیرۆزە. وەک بەدیار دەکەوێ لە ئاکامی تێکەوڵێکەی سیاسی، زۆر لە شکڵ و شێوازی خودایەکان گۆڕاوە.. دەبینی خودایەک سەری جانەوەرێک و لەشی، لەشی بنیادەمە.. یا بنیادەمێکی دووسەرە.. کە کورد گوتوویە تەمەنم ڕەسی وە ئی سەرە نەدیم ئایەم وەدوو سەرە، هەروا لە خۆڕا نەهاتووە؟!

درەختی خورما، پیاز، هەنجیر، زەیتوون. کانیاوێ لەو گۆڕەو تاد.. شتهایەک بووگن، پەرستریاگن. ئەدی نابینی لە قورئانی پیرۆزدا سوێند بە هەنجیرو بە زەیتوون خوراوە؟! لە هەمبانە بۆرینەی شادرەوان، مام هەژاردا نووسراوە. ئەینەمەل ١- عەینەمەل: خەزایی، عایلەمەن ٢- کانیاوێ کە ئاوی لە مەزرا دەپرژێنێ خەزایی پێوەدیت. (خەزایی عایلەمەن=ئاتەش ملووچ)...

لە سەدەی شەشەمی پ.ز.دا کە پادشای ئێران هێرشی کردۆتە سەر وڵاتی میسر، ژمارەیەک کتک و لەگەڵگی وەپێشە لەشکری خۆداون، میسرییان کە چاویان بەو گیانلەبەرانە کەوتووە بە

پیرۆزیان زانیوون و لاقەیان نەکردوون، بەم فێڵە لەشکری ئێران بەسەر لەشکری میسردا زاڵ بووە و میسرییەکان لە شەڕدا، بەزیون.

پلوتارک دەڵێ لە مەندیس جوانترین کەنیشکی جوان بۆ شەوباخەڵی دە باخەڵی گیانلەبەری پیرۆز دەکرا. سوودیر بولووم دەڵێ: مرۆ گیانلەبەری لە خۆ بە ڕازو نهێنی ئامێزتر زانیوە. تا ئێستاش کوردێکی ڕەوەند مەڕێکی نازانم لە چی خۆشتر دەوێ ... بۆیان وەگێڕام لە گرانییەکەدا ژنیان بە مەڕێ مارە کردووە. هەروەها زۆرم حەکایەت لەمەڕ چۆمی سیروان بیستووە، کە چەند پیرۆز بووەو ئەهلی هەق هەر لە سۆنگەی پیرۆزیی سیروان بەم بەرو بەو بەریدا ژیاون. لە گوندی شێخ جگری کە بە هەنجیری زۆر نایاب نامێ بووو ئێستا نەگریسان وشکاویان پێ هێناوە، خودا وشکاویان پێ بێنێ، بیستمەوە شیرینیی هەنجیرەکەی گۆیا لە بەرەکەتی مێروویەک پەیدا دەبێ کە هەر چەند ساڵ جارێ بە دیار دەکەوێ و موتوربەیان دەکا... گۆیا ئەو مێرووە حەزرەتی سلێمان-رووحی فیداه- بۆ وێندەرێی هەناردووە.

ئایینی میسریان باوەڕ بە دوو خودا:

١- ڕۆژ - میسرییەکان ڕۆژیان لە وەرزی کشتوکاڵدا بە خودا دەزانی؛ چونکە سەرچاوەی گەرمایەو بۆ فراژووبوونی گیاوگۆڵ و دارودرەخت کاریگەرییەکی ژینەکیی هەیە. بە بڕوای وان ڕۆژ بە قایەغێک هەموو ڕۆژێ بە ئاسماندا تێ دەپەڕێ و شەوانەش لە چۆل و بیابان دەگەڕێ. ٢- خودای خۆرسک- تەنگانەکانی کەش و هەوا کە لە لاسامەی ڕۆخانەی نیل پەیدا دەبووو دوای سەرماو گەرمای بیابان پەنجا ڕۆژ دەبوو بە فەرتەنە و باوبۆران، ئەوجا بەهار دەهات و شنەبای فێنک «شم النسیم» هەڵی دەکرد و دەشت و دەر سەرسەوز دەبوون، وایان دەزانی خودای خۆرسک هەموو ساڵێ زیندوو دەبێتەوە؛ لەبەر هەندێ «ست» خودای بەدکاری و گرەو هوڕە، بە دەستیاوی و کۆمەگی پێنج کەس لە نۆکەرانی، بەرپرسی ئەم بەدکارییانە بوو و خودای ئاتوور (١حەنتوور) کە دە هەمبەر وی کۆمەگی مەزراو باخاتی دەدا، بە دەستی نۆکەرانی «ست» دەکوژراو سەرلەنوێ لە وەرزی بەهاردا زیندوو دەبۆوەو بەکار دەکەوتەوە. ئەمە هەر کتومت وەکو تەمووزەکەی بابلستان وابوو. میسرییەکان مردوویان مۆمیایی کردووە.، چون ئەگەر وایان نەکردبا بە بڕوای وان، ئەروا سەرلەنوێ وەدەگەڕانە نێو لاشەی مردووان. وا دیارە ئەودەمیش دەستکورتی و دەستڕۆیی سەروکاری بە مردووشەوە هەبووە. دەسترۆ تەمەنی مۆمیاییی مردووەکەی هەر بایی پوولەکەی بووە. ئەدی نابینی ئەوڕۆش خوداپێداوی دەسترۆ، گومەزی وای لەسەر گڵکۆ ڕۆنراوە، بە سێ هەزار ساڵی دیکەش لە بن نایە.. بیستوومە ملیاردێرانی هەندەران مردوویان دەنێو سارندا دەشارنەوە، بەو ئومێدەی کە کاتێ زانست دەگاتە پلەی مردی زیندی کردنەوە، زیندوویان کەنەوە..

سێ قووچەکەکان (هەرەمەکان) لە میسر بۆ پارستنی پاشایەکی «خنوپس» ناو، ڕۆنرا. میسرییەکان لە سەروبەندی «ئامن هتب»ی چوارەم یا «ئەمنوفیس»ی چوارەم، لەسەدەی (١٤١)ی پ. ز. ئایینی یەکتاپەرستییان بڕیار داو خودایەکیان کە بە ناوی «ئاتوون»ەوە بوو و تا ئەو سەردەمە هێندەی بایەخ پێ نەدەدرا، بە ناوی خودای تاک و تەنها بڕیاردرا، وەلێ لەبەر وەی دەسەلاتی ڕۆحانییانی ئامۆن لە «تەب» پتر بوو و دە ڕێی چاکسازی و پاکسازیی نوێدا بیوو بەکۆسپ و تەگەرە، ناچار پێتەختی بەجێ هێشت. لە میسری ناوەند، شاری «ئەخناتوون»ی بە مانای «بەستووی پەپکەی ڕۆژ» کە نێوی «تیل لیل ئامارنا» بوو، ڕۆناو نێوی ئامۆونی لەهەموو شوێنێ وەسڕی و ئەو ئایینی یەکتاپەرستییەی قەدەغان کرد.

بەم گۆڕانکارییە گەورەیە، پادشا جوداوازییەکی گەورەو درەخشانی لە نێوان فرەخودایی و یەک خودابیدا هێنایە گۆڕێ. یەکەم: دەستەلاتی ڕۆحانییانی ئامۆونی تێک شکاند. دووەم: ئایینەکەی لە پاوانی خەڵکی «تەب» قوتار کرد. سێیەم: وای کرد کە رەعیەتی غەیری میسریش بتوانن پەیڕەوی لە ئایینی نوێ بکەن. ئیدی ڕۆژپەرستی، سەرەتای تەرزی بیرکردنەوەی دەستەجەمعی و هەموانی بوونی ئایینی لە جیهاندا هێنایە گۆڕێ.

لەم ئایینەدا، ڕۆژ بوو بە مەزهەری حەقیقەت و دروشم و نیشانە. بە ڕاستی ئەوەی شا بە خودای دەزانی دەستەلاتێکی توانا نەبوو، بەڵکو چتێک بوو لە جۆری مرۆ خۆی و وەکوو وی دەستەلاتەکەی تا سنوورێ بوو. لەم ئایینەدا جۆرە دۆناودۆنێک هەبوو و واسیتە و واسیتەکاریی ڕۆحانییانی پێویست نەبوو. ئەم شۆڕشە ئایینییە گەورەیە، گۆڕانکارییەکی ئاکاری و ئەخلاقییەکی گەورەی لێ کەوتەوە. ڕۆژ سەرلەبەری نەتەوەکانی سەر زەوینی لە هەژارو دەسرۆ، بە پرتەوی تیشکی پیرۆزی خۆی شاداب دەکردو بەم جۆرە پرتەوی ئێزەدی بە هەموو کون و کەلێنێکدا بلاو دەبۆوە کە ئەمەش هەمووی لە بنەمای سەرپشکایەتی (اختیار) و غەریزە ئاوی دەخواردەوە. تیل ئیل ئامارنایییەکان لەو بڕوایەدا بوون کە پەروەردگار زۆری حەز لەوەیە ئەفراندەی خۆی ئازاد و ئەویندار بێ.

ئایینی ڕۆمییانیش هەس. ئەم ئایینە ڕەگ و ڕیشەی دەچێتەوە سەر ژیانی ڕەوەندایەتیی مرۆ. بۆ خۆی لە بنەڕەتدا کالای هیندو یۆنان و بیروبڕوای ڕۆژهەلاتە کە پاشانەکێ گۆڕانکاریی بەسەردا هات. ئایینی ڕۆمییان وەک بلێی «بیژی» بێ ئەوهایە.. مێژووی نییە.. خودایەکانیان شەجەرەی ئەفسانەییان نییە.. نزیکەی (٢٤) خودایان هەبووە. خولاسە ئەو هەموو بەندو بالوڕەیەی هۆمەرو هسیود بە بالای خودایانی یۆنانییاندا بڕیون، ڕۆمییان لێی بێ بەشن. بەپێی بیروباوەڕی ڕۆمییان ئەروا وردە-وردە دەچنە کلێشەی خودایانەوە. ڕۆمییان بێ ئەوەی پێ بزانن کە ئەمانە هەر یەک خودایەکە بۆ خۆی، پەرستوویانن. ئەم ئایینە ئەوە بوو، کە مەسیحییەت ڕامیاڵی و داری بەسەر پەردوویەوە نەهێشت، بەلام تا ئەوڕۆش ئاسەواری لە کوردستاندا هەر ماوە.. (بیروباوەڕی ڕۆم و ڕۆمۆلۆس، هەروەک ئەوەکەی کوورش و ئەستیباک، لە کوردەواریدا زۆر ئاشکرایە).

بەش بە حاڵی ئایینی یۆنانییان، دەتوانم بلێم بوو بە سەرچاوەی جوانیی گرانبایی شاکاری هونەر. میعماری و پەیکەرتاشی و ئەدەبیات، مەنتیق و فەلسەفەو حیکمەت، سەرلەبەر قەرزاریاری ئایینی یۆنانییانن.

زانایانی کورد لە بواری فەلسەفە و مەنتیقی یۆناندا، وەک هەموو زاناو فەیلەسوفەکانی ئیسلام بەر کاریگەریی فیکری یۆنانی کەوتوون.. دەمیان لە مەشسائییەت (بەدەم هاتوچۆوە دەمەتەقێ و چەقەچەق)و ئیشراقییەت و ڕیواقییەت و مەزهەبی ماتریالیزم و بێ سەرەتایی و بێ بنەتایی جیهان کوتاوەو

نووسینیان چ بە کتێب و نامیلکەو شرۆڤەو پەراوێز لەسەر کتێبی عومدەی کەلام و ئوسوولی فیقھ و تەفسیرو لێکدانەوەی قورئانی پیرۆز و چ بە ڕانانی مەدرەسەو مۆڵگای زانست و فەلسەفە بڵاوکردنەوە زۆر بەرچاون.. کاتب چەلەبی لە کتێبی کەشفوززنووندا دەفەرموێ مەلا و فەقێی کورد نەبان لە سەروبەندی سوڵتان محەمەددا خوێندەواری و زانست و فەلسەفە بڵاوکردنەوە بە سەرانسەری وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناویندا ئاسەواری نەدما. دەڵێ: «طفره صاتان اولدیلر». (بڕ: قامووسی فەلسەفە بە زمانی عوسمانی) مەلاو فەقێی کورد لەدنیای ئیسلامەتیدا پەیامبەری ڕۆشنبیری بڵاوکردنەوە بوون. سەرلەبەری یاساو ڕێسایەکانی دەوڵەتی کوڕانی عوسمان، کە لە خۆڕایی بەنێوی سوڵتان سلێمانی قانوونییەوە لەقەڵەم دراون، شیرەی مێشکی مەلایەکی کوردی (ابوالسعود العمادي)ی شێخولئیسلامی وڵاتی ڕۆم بووە... (هارۆڵد لامپ/ سوڵتان سلێمانی قانوونی).

پێویست بەوە ناکا بەندە لەمەڕ ئایینەکانی ژاپۆن و هیند و چین و شوێنانی لە کوردستانەوە زۆر دوورەدەست فرەبڕێسم؛ چونکە ئەگەر هەرچییەک لەو ئایینانەشڕا دزەی کردبێتە نێو بیروبڕوای کوردەوارییەوە، دیارە زێتر لە ڕێی فەرهەنگی فارسییەوە بووە، بەڵام خۆ دەبێ بڕێکتان دەربارەی ئایینەکانی ئێران زەمین، کە کورد بۆ خۆشی وەک ڕەگەزێکی ئاریایی نەژاد، دە هەر چتێکی لەو سەرزەمینەدا ڕووی دابێ هاوبەشێکی بەکار بووە. کورد نێوی لەچوار هەزار ساڵ لەمە بە بەرەوە لە بەردنووس و تەورات و زۆر بەڵگەنامەی گرینگدا، بە گۆتی، لۆلۆ، لۆلۆبی، سیرتی، کیرتی، گۆر، کاردۆو گورد هاتووەو نەتەوەیەکی هەرەکۆنی ڕۆژهەڵاتی ناوینە. هیچ گومان لەوەدانییە کە کوردیش چ لە پێش هاتنی مادەکان و هەخامەنشییەکاندا و چ لە پاش هاتنیان، بیروباوەڕی لە زەردەشتی کۆنتریان هەبووە. بە نموونە ناوی "ئاسوورا" لە ئاسەوارەکانی "ڤیدایی"دا هەر ئاهوورا ئێرانییەکەیە. خولاسە خۆ هەر هیچ نەبێ بیروبڕوای ئاریاییەکان پێش لێکدی جودابوونەوە یەک بابەت بووە. خۆ بەش بەحاڵی ئایینی زەردەشتیش ئەوە کوردستان مۆڵگەی یەکەمی ئایینی زەردەشتی بووەو نەتەوەی کورد زۆر بە شانازییەوە زەردەشت پێغەمبەری بە پێغەمبەری خۆی زانیوەو ئایینی زەردەشتی یەکێکە لە سەرچاوە هەرەگرینگ و زەنگینەکانی بیروبڕوای کوردو خەڵکانی کوردستان. ئاریاییەکان لەپاش داگیرکردنی هیندستان، فەرهەنگ و ڕۆشنبیری و شارستانیی سیاسی و کۆمەڵەکیی گەورەیان لە ئێران هێنایە گۆڕێ، کە پارسەنگی ئایینگەلێکە، برایەکانیان لە ئێران زەمین بنیاتیان ناوەو فەرهەنگ و شارستانییەتێ کە ئاریاییانی ئێران و کوردستان دایان مەزراند، دەگەڵ ئەو فەرهەنگ و شارستانییەی برایانیان لە هیندستان بناخەیان لێ دا، جوداوازە، ئاریاییەکانی ئێران و کوردستان سێ نەتەوەی گەورە بوون. بەشی ڕۆژهەڵاتی خۆراسان، پارتییەکانی پێک هێنا، بەشێکیان لە کوردستان و ئازەربایجان مادەکانیان پێک هێنا و بەشی سێیەمیان لە فارس "پارس" یان پێک هێنا.

نەتەوە ئاریاییەکان یەک ئایینیان نەبوو. ئایینی ئێرانییە کۆنەکانی پێش زەردەشت "میهر" یا "میترا" پەرستی بوو. میترا چاوی ڕۆژەو چاوێریی هەموو چتێکی ڕووی زەوین دەکاو لە هەموو شوێنێ تەشریفی حازرەو هەزاران چاو و هەزاران گوێی هەن. میترا دەرهەق وەبەدنیهادان و بەدئەندێشان و چەپەڵ و پەیمان شکێنان زۆر بێ بەزەو دەرهەق بە پاک نیهادو چاک ئەندێشان و ستایشت کاران فرە میهرەبان و بە بەزەییەو میتراپەرستان لە نازو نیعمەتی زۆر بەرخوردارن . میترا دوو فریشتەی هەن: "ڕاشنوو" و "سەرائووشا" و هەمیشە گوێ لەمستی میتران و بەرپرسی سزادانن. دە هەمبەری خوداو مەلەکووت، واتە: (ڕووناکی و فەرەحی)و تاریکی و چەپەڵیدا ڕاوەستاون، کە لەوێدا دێوەکان فەرمانڕەوان. بڕوا بە جمک و دووانەیی لە تایبەتمەندییەکانی ئێرانی نەژادانی دێرینە. خۆ ئەگەر کەمێ بیر لە مەشی و مەشیانە (ڕیواس) بکەینەوە، ئەوە سادەگی و دە هەمان کاتدا قووڵیی بیری ئەو ئاریاییانەمان بە ڕوونی بۆ دەردەکەوێ. ئەوان بڕوایان بە ئاکامی پاش مەرگ هەبوو و لەو بڕوایەدا بوون کە مرۆی بە باوەڕ لەو دنیا پاداشتی دەدرێتێ و لە بەختەوەریی هەتا هەتایی بەرخوردار دەبێ.

بە پێی بڕوای زانایان، ئێرانی نەژادانی دێرینی (پێش حەزرەتی زەردەشت) وێڕای بڕوا بە فرەخودایی، بڕوایان بە "خودای خودایان" یا "ئێزەدی ئێزەدان"یش هەبووەو دە نێوان هەموو ئەوانەدا، بڕوایان بە "ئاگنی" خودای ئاور و "ئیندرا"، خودای خۆڕسک و شریخەو بروسکە، "میترا" خودای ڕووناکی و ڕۆژو "واروونە" یا "واژوونە" کە ئێستاش لە واژەی "ئاوەژوو"ی کوردیدا کە بە مانای سەرنگوون، دەمەوڕوو، دەمەوقلپ و بەرەواژدا ماوەتەوەو بە ئەسڵ لە (aparun)ی پەهلەوی‌ڕا کەوتۆتەوەو بە مانای خودای ئاسمانە؛ چونکە ئاسمان وەک دەفرێکی دەمەوڕوو و ئاوەژوو دەچێ و هەروەها "ئاناهیتا" خودای بڕوا و ئیمان، هەبووە.

ئێرانی نەژادانی سەروبەندی دێرین بەش بەحاڵی "ئاور" جۆرە ڕێزێکی تایبەتیان بۆ هەبووە. ئاور نیشانەو مەزهەری "ئاگنی" بوو. ئاور هەڵایسێنان کە لە جیاتیی ڕۆحانیانی ئەو سەروبەندە بوون، "ئەتەربانان" یا "ئازەربانان" یا "ئاوروانان" (هاوکیشی پاسەوانان) یان پێ دەگوترا. ئێرانی نەژادانی دێرین بڕوایان بە دروشمی "پندار نیک، گفتار نیک، کردار نیک" (نیهادی چاک، قسەی چاک، کرداری چاک) هەبووەو زۆر پابەندی ئەم دروشمە بوون و کاریان پێ کردووە. لە وڵاتی ئێران زەمیندا، زۆر پەیامبەری دیکە بە نێوی زەردەشت پێغەمبەرەوە هاتوون. زەردەشت بە مانای "ستارەی زێڕین" بوو (دیارە مانای دیکەشی زۆر هەن) ئەوانە بیروباوەڕو ئایینێکی وەکە ئەوەی کە زەردەشتی نامێ هێنای، هەبووە. وەلێ خەڵکانی سەروبەندی هەخامەنشییان ئەم نێوەیان تەنێ بەدوا پەیامبەر داوە. دیارە ئەوەش هەر لە ڕکی مادەکان کە ئەوان پێیان وا بووە زەردەشتی دیکەش هەبوون، خۆلاسە ویستوویانە بێژن زەردەشت لەوانڕا دەستی پێ کردووە. تەنانەت دەمارکرژی شۆڤینیستی پان ئیرانیزمی وا هەس یەژن زەردەشت خەڵکی کوردستان، ورمێ نەبووەو خەڵکی خۆراسان بووگەو ساسانییەکان و ئەوروپاییەکان و کەنیسەی فلان بەو دەردەیان بردووە...

ئەوجا کوردستانی باشوور (ئێلام) کە لوڕستانەکەی خۆمانە بریتی بوو لە خوزستان و پشتکۆ (زاگرۆس): وڵاتی گۆر (گەبر) گۆران، ئەوانەی نەبوون بە زەردەشتی و چیایەکانی بەختیاری لە ڕۆژاواوە دەگەڵ دیجلە (تیر)و لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ فارس و لە باکوورەوە دەگەڵ بابلستان و ئەکباتانا (هەمەدان)و لە باشوورەوە لەگەڵ کەنداوی فارس تا بوشەهر، تخووبی وەدەگەڕا.

ئێلام بە مانای کوێستان و زۆزان هاتووە کە کوردستانەکەی باشوورە. نەتەوەی ئێلام خێوی شارستانییەتێکی فرە وەشکۆ و دەبدەبەو درەخشانی بەر لەچوار هەزار ساڵ بووگە. ئاسەواری فرەی لێ وەجێ ماگە. ئایینیان فرە وە ڕۆشنی دیار نییە. وەلێ ئەوەی کە کێشەی لەسەر نییە وەکو سۆمەرییان، کە ئەوانیش هەر (وە دوا ڕای بەهەشتی مامۆستا تاها باقری دۆستم) کوردستانی بوون، باوەڕیان وا بووگە کە ئەروا لە جێی تاریکستانی لێرەوار و جەنگەڵستاندا دەژیێن و نێوی خودا (رب النوع) یان "شووشیناگ" بووە. ئێلامییەکان بە بۆنەی جێژنان و ڕۆژانی پیرۆزیانەوە پەیکەرەو موجەسسەمەی خۆیان لە شاراوگەکانیان وەدەردێنان و ڕێزیان لێ دەنان.

تا ئەوڕۆش برایانی ئێزەدی ئایینانمان "مەلەکی تاووس" لە جێژنەکانیاندا دەردێنن و ڕێزی لێ دەگرن، هەروەها تا ئەوڕۆش لە کوردەواریدا ژمارەی "حەوت" زۆر بەسەر زارانەوە دەگەڕێ. تەنانەت لە تەورات و قورئانی پیرۆزیشدا کە خوداوەند جیهانی لە حەوت ڕۆژاندا ڕۆناوە، ئەو حەوتە بە پیرۆز دەزاندرێ. لە کن ئەهلی هەق (کاکەیی) و ئێزەدئایینانی کوردیش خودا جیهانی دە حەوت ڕۆژاندا گووراندووە. بیروباوەڕی گۆی زەوین لە سەر شاخی گایەک ڕاوەستاوە، لە بیروباوەڕە بنەڕەتەکانی ئەهلی هەقە (بڕ: تەزکەرەی ئەعلا).. حەوت تەوەقەی ئاسمان و حەوت تەوەقەی زەوین و حەوت مەقام و حەوت ستارەی گەڕۆک و تاد... تا ئێستاش لە کوردەواریدا هەر ماون. ستێرشناسی و ڕەمڵ و ئوستورلاب و بەخت وەخوێندن و پزیشکی و تاد...ئەمانە هەموو بەرماوەی میهرپەرستین لە کوردەواریدا.

پلەکانی حەوتینەی میهرپەرستی ئەمانە بوون: ١- قەلەڕەشکە، سەر بە"عوتارید"، نماو ڕەمزی هەواو با. ٢- هاوسەر، سەر بە "زوهرە" (ناهید یا ڤینۆس) نمای ئاو. ٣- سەرباز، سەر بە "مەڕیخ" (بەهرام= بارام- مارس) نمای خاک. ٤- شێر، سەر بە "موشتەری= هورمز= ژۆپیتەر" نمای ئاو. ٥- پەیک و قاسیدی ڕۆژ، سەربە ئەستێرەی بەیان (هلیۆس)...؟ ٦- پارسا، سەر بە "مانگ" نمای....؟ ٧- پیری سۆفی و دەروێش، سەربە "زوحەل= کەیوان= ساتورن"....؟ ئەمانە تا ئەوڕۆش بە بڕوای زۆر لە کوردان کاریگەرن و لە دەستنیشان کردنی وەرزی کشتوکاڵ و سەرماو گەرما و باران و بەفربارین و جەخت و ناجەخت و سەبر و ناسەبر لەکارو سەفەرو تاد...دا حیسابیان بۆ دەکرێ. لە لوڕستان، شاری خوڕەم ئاباد جێی میهرپەرستی بووەو تا وێستاکەش ئاسەوارێک لە پایین کۆچەرمگ (سفید کوه)دا دەخمەیەک هەس چەندین کۆڵەکەی لێ بەجێ ماون و چوار دیوارەکەی هێمان هەر ماگەسەوە. خەڵکی لوڕستان پێیان واسە، کە گڵکۆی "باباعەبباسی"ی لێیەو فرەجار دییەنیی دەکەن و پەڕۆو پاتاڵ و ڕێسمانی ڕەنگینی پێوە هەڵ داواسن. ئەم پەڕۆو ڕێسمان و کشتەک بە قسن و داری شەخسەوە هەڵاواسینە لە سەراسەری کوردستاندا تا نهاژی هەر باوە. ئەسڵەن واژەی "ئابەریان ئاوە" بە فارسی و کوردی بە مانای گومەز، گومەت هاتووەو گەرمابە، گەرماوە، سەردابە، سارداو، میهرابە، کە پاشان بووە بە "میحراب"ی مزگەوت هەر لەمەڕا کەوتۆتەوە..

لە کوردەواریدا کە قوربانی دەکوژنەوە. دەبێ بەڕێوڕەسمێکی تایبەت بیکوژنەوە. لە پێشدا چتی ئاڵاو واڵای بە ملەوە دەکرێ و تەنانەت کلۆیەک شەکریشی بە دەمەوە دەدرێ و حەوت جار بە دەوری ئەو کەسەی کە قوربانیی بۆ دەکوژرێتەوە بۆ بەڵاوەگێڕی، وەدەگێڕدرێ. ئەدی واژەی "باڵاگەردانی باڵاو بەڵاوەگێڕی باڵای" لە چیڕا هاتووە؟ ئەوجا پاش کەوڵ کردن، گۆشتی گورییەکە لەسەر چیغێکی خاوێن لەت لەت دەکرێ و دەبەشرێتەوە. نابێ خاوەن قوربانی خۆی لە گۆشتی بخوا.

تا ئەوڕۆش "گاوما= گیای هوما= گیای باڵندەی پیرۆز" کە لە سەروبەندی میتراپەرستیدا شەرابی پیرۆزیان لێ دروست کردووە، لە کوردستان چەند چڵێکی لە گۆماوی ماسی دێخن، ماسیی پێ سەرخۆش دەکەن و بە ئاسانی دەیان گرن. ئەمن بۆ خۆم چەندین جارم ئەو کارە لە چۆمی ڕۆخانە کردووەو ماسیی زۆریشم پی ڕاو کردووە..

کاشییەکان، کوردی گۆران= گەبران= لوڕەکانی پشتکۆ= بە یۆنانی زاگرۆس کە هەر پشتکۆ دەکاتەوە، وەک "زاکافکاس" واتە پشت قەوقاز لەوە دەچێ- هەروەک مینۆرسکی و مامۆستای ڕەوان شادمان تۆفیق وەهبی بەگ دەفەرموێ- پێش هاتنی ئارياييەکان هەر هەبوون و خێوی پێشینەیەکی شارستانیترین ڕۆژگاری خۆیان بوون. ئەم نەتەوەیە کە هەر دەکاتەوە ئیلامییەکان دەگەڵ بابلییەکاندا تێکەڵ بوون و بەسەریاندا تەواو زاڵ بوون و چەندین سەدە فەرمانڕەوای ئەو بەشەی کوردستان بوون. کاشی خێوی چەندین خودا بوون "دیاکەنەف" زانای ڕووسی بە نامێ دەڵێ نەتەوەی کاشی خێوی چەندین خودا بوون "کاشوو" خودای هۆزو"ویناییی کاستیان"یشیان هەر هەبووە. خودایەکی دیکەیان لە باکوور نێوی "ئەللە کوێستانی" بوو. یەکێکی دیکە نێوی "شیبروو= شووکاموون" خودای ژێر زەوین و پارێزگاری ڕەچەڵەکی شاهی بوو. خودایەکی دیکە نێویان "هاربە" بوو، "شیخو"، ساخ" شووریاش"، خودای ڕۆژ بوو. بیروبڕوای نەتەوەی کوردی فرە کەونارای ڕەسەنی لوڕ و کەلوڕ، لە لوڕستان و کەلوڕستان ئاشکرا نمایانە (کەلوڕ= کەڵەئەهورا= گەورە ئەهورا= گەورە ئەهورامازدا، وەک کەڵگامێش، واتە:

ئەو گیان لەبەرەی کە بۆ خۆی کەڵێکەو سەری مێشن= میش= مییەر=مەڕ= مێ-یە. کە بەرابەرەکەی نییەر= نێر=نەڕ= نێ. دیارە هەر «نێ» یەکەی زەوی بە بڕشت هێنە... کاشییەکان هونەری خۆیان لە زۆر چتاندا ڕەنگ پێ داوەتەوە. ئاسەوارەکان بە ڕۆشنی شایەتیی ئەوە دەدەن کە ئەم نەتەوەیە تا بێژی بە ئایینەوە پابەند بوون و زۆریان بیر لە ئاکامی پاش مردن کردۆتەوە...

بەش بە حاڵی بیرباوەڕی سۆمەر و ئەکاد، وەک سەرچاوەیەک بۆ بیری کوردەواری، هەر ئەوەندەیە کە ئاکامی پاش مەرگیان لەکن زۆر ڕوون نەبووە. بڕوایان وا بووە مردوو دە برسێتی و تینوێتیدا گوزەران دەکەن؛ جا لەبەر هەندێ بۆ پارێزگاریی خۆ و ماڵ و منداڵیان زۆر دووعا و نزایان کردووە و هەمیشە هەر خەریکی قوربانی کوشتنەوە بوون و ئەمەش لە کوردەواریی ئەوڕۆدا فرە لە باوەس.

هەرچی ماد (ماگ)ەکانن، کە نەتەوەیەکی ئاريايی نەژادن، لە کوردستان و ئازەربایجان هێوربون. ڕەنگە زۆر چت لە مەڕ مادەکان دەردەست نەکرابن.

هیرۆدیت دەڵێ موغەکان لە گرۆیەکی شەشگانە پێک هاتبوون، وەلێ ئایینیان چبوو؟ دیار نییە. (کەچی ئەوەی زۆر ئاشکرایە ئەوانیش هەر کۆنتر باوەڕیان بە «زەروانییەت»(٤)

(پێش مێترائیـیەت) هەبووەو پاشان ئایینی "ئاهورامازدا"یان پەسند کردووە). هیرۆدیت دیسان دەڵێ: وەک بیستوویە، کە مادەکان هورمزپەرست بوون، (کە هەر دەکاتەوە ئاهورامازدا پەرستی). هەروا دەڵێ ئەو هورمز پەرستییە موغەکان دەگەڵ جادووگەری و پڕوپووچیاندا هەرەمە کرد. جادووگەری و سیحر هەمیشە کاری خودایە شەڕکارەکان بووە؛ چونکە بە فەند و فێڵ و گزی و فزی کار لە خۆڕسک کردن بووە... ڕێگای ناتەبیعی و خوار و خێچ و چەشم بەستەی گرتووە... هەر بۆیەش، ئیسلامەتی نەی لێ کردووە...

زەردەشت کە بۆ خۆی لە هۆزی ماد بوو ویستی ئەو ئایینە چاکاتەوە، وەلێ موغەکان نەیان هێشت... لەبەر هەندێ زەردەشت تۆرا و گۆیا لە خۆراسان گیرسایەوە.

ئەوی پێویستە بگوترێ، فرە ڕێی دەچێ کە کورد سەروکاری نەژادیی دەگەڵ مادەکاندا بووبێ و ڕەنگە هەر لەبەر خاتری خاترداران زۆری لێ وە نەکۆڵدرابێ...

ئەمن پێم واسە کە نەتەوەی ماد لە پێشدا ئەسپ پەرست بوون و زۆریان حەز لە ڕەوەندایەتی و کۆچەری کردووە، ئەمەش تا شێست- حەفتا ساڵێک لەمەوبەر لەناو هۆزی گەورەی جاف و بڵباس و مەنگوڕ و تاد... دا زۆر ئاشکرا بووە. هۆزی جاف هەمیشە خۆی بە خێوی سەرانسەری کوردستان دەزانی و ملی بۆ هیچ پاشا و شایەک نەدەداو هەمیشە لە گێرمەو کێشمەی گەرمیان و کوێستاندا دەگەڵ ئێران و عوسمانیدا لە شەڕو هەرادا بوون و تەنانەت حەزیان لە چارەی گۆران نەدەکرد، چونکە ڕەوەند نەبوون؟!

بەداخەوە ئێرە ئەوەندەی بە بەرەوە نییە زێتری درێژدادڕێ لەسەر بکەم...

بەش بە حاڵی هەخامەنشییان کە لەسەر داروپەردووی مادەکان دەوڵەتی خۆیان، بەسەرکردایەتی کوورشی مەزن (بە قسەی هیرۆدیت کوڕی ئەستیاک = ئەژدەهاک)ەوە دەردەکەی ڕۆم و ڕۆمۆلۆس و ئیدیبی بەسەرهاتووە و هەر ئەو ئەژدەهاکی - کە بابی خۆیەتی - کوشتووە؟! ڕۆناوە، لەمەڕ ئایین و بیروباوەڕیانەوە، ئەوانیش هەر زەردەشتی، یا چتێکی مینانێ وی بوون، باوەڕیان بە چوار سریشت و ئاهورامازدا هەبووە و مردوویان ناشتووە و گۆڕستان و ئارامگای تایبەتیان بۆ پادشایانیان هەبوون. وا بە دیار دەکەوێ کە لەو سەروبەندەدا ئازادیی ئایینی دە پەرەساندندا بووە. کوورش جووەکانی، پاش وێران کردنی ئورروشەلایم، پاراستووەو زۆریانی لە کوردستان، لە ناوچەی کارداکا (قەرەداغ) و شوێنانی دیکە هەواربەند کردوون و بیروباوەڕی جوهوودان زۆر کەوتوونە ناو کوردەوارییەوە.

هەرچی سەروبەندی ساسانیانە، بە ڕاستی زۆر هەڕەمە و تێکەڵ و پێکەڵە؛ هۆیەکەشی ئەوەیە کە چەندین ئایین و بیروباوەڕ لەو سەردەمەدا لە باو بوون.

ئایینی زەردەشت، ئایینی ڕەسمیی دەوڵەت بوو. ئایینی (زەروان) و "کیومەرس و فتیش"، کە پێشتریش باسم کرد، لەم سەروبەندەدا هەبوون.

خۆلاسە ئەم ئایانەی پاین لەو سەردەمەدا هەبوون: ١- موسەوییەت ٢-مانەوییەت ٣- مەزدەکییەت ٤- بودائییەت.

لەم سەروبەندەدا بە زۆر خەڵک بە زەردەشتی کردن بە جارێ تەشەنەی کردبوو. هەر ئەمەش یەکێ بوو لەهۆیەکانی ڕووخانی دەوڵەتی ساسانی، سەرەڕای سیستمی نەگریسی چینایەتی، کورد لەو سەروبەندەدا، هێشتا زێتر لە حاڵی ژیانی ڕەوەندایەتی و ئاژەڵوانیدا دەژیان، کە عەرەبی موسوڵمان هێرشیان هێنایە سەر مەدائین، کوردان بەرگرییان لە یەزدگوردی سێیەم نەکرد و هەر زوو بە پیری و پێشوازی ئیسلامەوە چوون و تەنانەت ئەوڕۆکەش دەور و زەمان هەر دەڵێی بەو تەرزە دەگوزەرێ. کوردەکە مەگەر هەر چاوەڕوانی ئەوە بێ، سا بەشکو دەرفەتێکی لە جەنگەی ئاژاوەو مرخێش مرخێشی نێوان عەرەب و عەجەم و تورکدا بۆ ڕێکەوێ و خودموختارییەک، (الجیب الآمن)ێک، لە ڕاخوا پارێزەرانێکی لۆ دەسەبەرکرێ.

لە کوردەواریدا ئاسەواری ئایینی جوهوود و فەلە و مانی و مەزدەکی و بوودائی زۆر نمایانن...

سۆفیەتی و تەسەووف و دەروێشی لە بوودائیەت و ئیمامی عەلی- ئەستەغفیروللا- گۆیا کوڕی خودایەی ئەهلی هەق، لە مەسیحیەت و حەز بەنەخش و نیگار و شیعرو ئەدەبیات و جوانی لە مانەوییەت و ئاشقە ئیشتیراکیەت و کۆمۆنیزم هەر دەڵێی لەمەزدەکیەت و زۆر بە تەنگ داک و خاڵوانەوە هاتن لە یەهوودییەتەوە، بە دووری نازانم کەوتبنەوە...

کورد پاش لە ئایینی ئیسلام پێشواز کردنی، دەستی بە نوێژکردن کرد، کە چتێکی نامۆ و نائاشنا بە ئایینی زەردەشتی نەبوو. مەلیکوششوعەرا، بەهار دەڵێ زۆربەی ئاداب و ڕوسووم و ژمارەی نوێژەکان و کاتەکانی نوێژ لە سەروبەندی زەردەشتیشدا هەبوون. ڕۆژووگرتن هەبووە، حەج کردن، بە مانای چوونە سەر نەزرگە و ئارامگای پیران و پیاو چاکان هەبووە، زەکات و سەرفیترە و خێرکردن و بەزەیی بە مرۆی بێ دەسەڵاتدا هاتنەوە و ڕێزو حورمەت لە ئافرەت گرتن و خۆشەویستیی منداڵ و حەز لە کارکردن و ڕەنجدان و کشتوکاڵ کردن و وڵات ئاوەدانکردنەوە، لە کوردەواریی سەروبەندی پێش ئیسلامدا هەر هەبوون، وەلێ ئەمە مانای وا نییە کە ئیسلام توانیبێتی، هەرچی بیروباوەڕی کۆنی کورد هەس، لە بنیچەڕای هەڵ تەکاندبن و لەبەر یەکیانی هەڵوەشاندبن و لەناوی بردبن...

ئەدی ئەگەر وا نەبێ، کو لە پاش چەند ساڵێک موسوڵمان بوون، سەدان بیر و باوەڕی سەیروسەمەرەو ئۆل و مەزەبی جۆراوجۆر لەسەرانسەری کوردستاندا هاتوونەتە ئاراوە؟! دیارە ئەو مەزەب و ئۆلە کەونارایانەی پێش ئایینی ئیسلامی پیرۆز، لە ئاکامی بەجێ نەگەیاندنی جەوهەری ئیسلامدا سەرلەنوێ بە بەجل و بەرگ و بەزەک و دۆزەکی جۆراوجۆرەوە هاتوونەوە سەرخوان و ئەوانە بە پێی «کتاب بیان الأدیان» (نوو: ٤٨٥ مانگی ) لێوەکۆڵان تێ کۆشاون ژمارەی ئەم دەستەو گرۆیانە بە ٧٣ یا ٧٢ دەستە بگەیەنن، تا دەگەڵ ئەو فەرمایشتەی وەپاڵ پەیامبەر دراوە، پڕاوپڕ ڕێک کەوێ.

سەیر ئەوەیە کە هێندێ دەستەجات ژمارەی دەستەو گرۆیەکانی شیعەیان بە ١٥٥ دەستەو گرۆ گەیاندووە، بەڵام ئەوەی کە کێشەی لەسەر نەماوە ئەمانە دەکرێن بە چوار دەستەی سەرەکییەوە: ١- زەیدییە. ٢- کەیسانییە. ٣- توندڕۆیان (غولات). ٤- دوازدە ئیمامی. لەم دەستانە گرۆیەکی زۆرو زەوەندە کەوتوونەوە. بەپێی «کتاب بیان الأدیان» ئەمانە بەم جۆرەی پاین:

١- پەیڕەوانی فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ). پێنج دەستەن.

٢- خاوەنی عەقڵ بیر و ڕا، یەک دەستە.

٣- موعتەزیلە، حەوت دەستە.
٤- دەستەی یەکەمی شیعە، پێنج گرۆ.
٥-دەستەی دووەمی شیعە، پێنج گرۆ.
٦-دەستەی سێیەمی شیعە، یەک گرۆ.
٧-دەستەی غالیە، هەشت گرۆ.
٨-دەستەی چوارەمی شیعە، دوو گرۆ.
٩- دەستەی پێنجەمی شیعە، یەک گرۆ.
١٠- خەورایج، پازدە گرۆ.
١١- موجەببیرە، شەش گرۆ.
١٢- موشەبیهە، دە گرۆ.
١٣- سۆفیەتی، یەک گرۆ.
١٤ مورەححیبە، شەش گرۆ.

بە پێی «کتاب علل ظهور الفرق و المذاهب الإسلامیة.. ئەمانە ١٥ دەستەن. هەرچی دیکە هەن لەمانە کەوتوونەوە. شێخی توسی بە ٣٣ دەستەیان لەقەڵەم دەداو دەبن بە دوو بەشی سەرەکییەوە: ١- النواصب. ٢- الروافض. مەبەست لە ڕافزی ئەو ١٨ کەسەن کە لە کۆبوونەوەی «سەقیفە»دا ئیمامەتیی ئەبوبەکریان ڕەفز کردەوەو گوتیان ئیمامەتیی موسڵمانان، مافی بێ چەندوچوونی حەزرەتی عەلییە و بەس و لایان وایە کە بە خەلیفە بوونی ئەبوبەکر لەسەر پایەی «أهون الشرین= الأمر الواقع» سەروبەر نراوە. بەڵام بەلای ئەهلی سوونەت و جەماعەتەوە کارەکە بە شوورا سەروبەر نراوەو هیچ خەوشێکی بەسەرەوە نییە. ڕافزییەکان دەڵێن: حەزرەتی ئەبوبەکر تەنها بەوەندەی کە پاش وەفاتی پێغەمبەر (د.خ.) پێشنوێژیی موسڵمانانی فەرمووە، نابێ ببێ بە خەلیفە.. چونکە گۆیا پێشنوێژی چتێکەو پێشەواییی هەموو موسڵمانان چتێکی دیکەیە.. بە پێی ئەم بیروباوەڕە بێ، ئوسووڵی حوکمڕانی نە لەسەر کاغەزو نە بە وەسیەت، ڕوون نەکراوەتەوە.. تەنها ئەوە نەبێ کە پێغەمبەر فەرموویەتی: ئەوا قورئانم لە بۆ بەجێ هێشتن، ئەوە دەستووری دنیا و قیامەتتانە.. جا بە ڕاستی قورئانیش و فەرموودەکانی پێغەمبەریش هەردووک بوون بە سەرچاوەی یاساو ڕێسای دەوڵەتی ئیسلامەتی و ئەوە بوو، قیاسیش و ئیجماعیشی هاتنە پاڵ و بە پێی مەزهەبی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، ئەم چوار سەرچاوە گرینگانە تا ئیستاش لە موعامەلات و عیباداتدا کاریان پێ دەکرێ. بەڵام بەلای برایانی شیعەی دوازدە ئیمامییەوە، کار بە ئیجتیهاد دەکرێ. مەبەست لە ئیجتیهاد، واتە تاکە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو، کە شەخسی موجتەهیدە. هەرچی ئیجماعە، واتە: هیچ فەتوایەک بەتاکە کەسێ ناکرێ، بەڵکو دەبێ بە شوورا، بە ئەهلی ئیجماع لە مەلاو زانایانی ئەهلی خیبرە، کارەکە شەرعییەتی بدرێتێ.. خۆلاسە لە کن ئەهلی سوننەت ئەهلییەتی ئیجتیهاد، پاش پێغەمبەرو چواریارانی، وجوودی نەماوە، ئێمە تابیعی تابیعینین... دیارە لێرەدا مەسەلەی ئەقڵ یا نەقڵ، کێهەیان پتر کاری پێ دەکرێ؟ ئەوە لە مەزهەبە سوننییەکاندا بە ڕوونی ئاشکرایە. ئیمامی ئەعزەم دوای قورئان و حەدیس و ئیجماع پتر بە لای ئەقڵ و قیاس و ئیستیحساندا دەلەنگێ.

ئیمامی شافیعی زێتر پابەندی «ظاهیری دەقە» {لا اجتهاد في مورد النص)، ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل پاش قورئان لە هەمووان زێتر بە فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە پابەندە. ئیمامی مالیک مەزەبەکەی ئەختێ فروەوانترە، تەنانەت «المصالح المرسلة» شی کردووە بە سەرچاوەی یاساو ڕێسا دانان.. ئیمامی ئەعزەم لە زیندانی مەنسووردا مرد. بۆ خۆی لە شاری کووفە لەدایک ببوو، نوعمان یا لوقمان ثابت کوڕی زووتی بوو. بابی خەڵکی شاری کابوڵ یا تیرمز بوو. بە خزمەت ئیمامی عەلی گەیشتووەو زۆری دووعای خێر بۆ کوڕەکانی کردووە. ئیمام ئەحمەد کوڕی حەنبەل لە دژی ئەوە بوو کە وەک موعتەزیلە دەیان گوت، بڵێ قورئان مەخلووقە. مەئموونی عەباسی دەگەڵ ڕای موعتەزیلەکاندا بوو. دە زیندانێی هاویشت. موعتەسیم داوای لێ کرد لە ڕای خۆی پەژیوان بێتەوە، بێهوودە بوو، ئاخرییەکەی فەرمانی دا دارکاریی بکەن، هێندەیان لێ دا، چوارجار بوورایەوە.. هەر دەیگوت، ئەخێر قورئان کەلامی خودایەو مەخلووق نییە. پاشان بە نووکە شیر لەشیان کون- کون کرد، هەستی بە ئازار نەدەکرد. لە ٢٤١ ک. دا ئەم دنیای پڕ لە ئەحمەق و دیکتاتۆرو لە خودانەترسانەی بەجێ هێشت؟! هەرچی ئیمامی شافیعییە، کە بە «ناصر الحدیث»و «مجدّد القرن الثالث» نامێیە، ناوی محەممەد کوڕی ئیدریس کوڕی عەبباس کوڕی عوسمان کوڕی شافیع کوڕی سائیب کوڕی عوبەید کوڕی عەبد یەزید کوڕی هاشیم کوڕی عەبدولموتتەلیبەو بە ئەبو عەبدوڵلا نامێیە. خاقانی دەڵێ:

**اوگ شب بوحنیفه در گذشت**

**شافعی آخر شب از مادر زاد**

ئیمامی شافیعی ١١٣ کتێبی لە فیقه و تەفسیر و ئوسووڵ و ئەدەبیاتدا نووسیوە. فتیان ناوێ لە یارانی مالیکی کوڕی ئەنەس دەگەڵیدا کەوتە گفتوگۆ و دەمەتەقێی زانستەوە، ئیمامی شافیعی بەزاندی، کابرا جنێوێکی زۆری دایێ. والیی میسر کە بەم سەربوورەکەی زانی، فەرمانی دا، فیتیان دارکاری بکەن، بەڵام دەستەیەک لە چەقۆکێشانی هاوڕێیانی فیتیان، چوونە نێو کۆڕی دەرزگوتنەوەی ئیمامی شافیعییەوە، تێروپڕیان لێ دا، هەموو لەشیان شکاند، تا گەیشتە ماڵەوە، لە تاوان ڕۆحی پاکی بۆ ئاسمان فڕی و ئەویش ئەم دنیایەی بۆ چەقۆکێش و پیاوکوژو لە خودانەترسان بەجێ هێشت. (٢٠٤ ک.).

بەش بە حالێ سوننەت و جەماعەت وەک خاوەنی (دبستان المذاهب) دەڵێ، دەچت لە مەزەبی ئەهلی سوننەت و جەماعتدا بە سوننەت (واجب؟!) دەزاندرێ: ١- بەخاوەن فەزڵ و ئەردەوزانینی ئەبوبەکر و عومەر(د). ٢- خۆش ویستنی هەردوو زاوای پێغەمبەر، عوسمان و عەلی (د).٣- ڕێز لەهەر دوو ڕووگە، بەیتولمەقدیس و مەککە، گرتن. ٤- پاش دەستنوێژشوشتن، پێڵاو مەسح کردن. ٥- خۆ لە شایەتی و قەزاوەتی ئەم دووچتە پاراستن: نەڵێی: «فلانەکەس بەڕاستی بەهەشتییە، یان دۆزەخییە». ٦- نوێژ لەدووی دوو بەرنوێژەوە نەکردن: واتە یەکێکیان ساڵح و ئەوی دییان فاسق. (بەم پێیە حەدیسی «صلُّوا خلف كلٍّ برٍّ و فاجر» دەبێ ڕاست نەبێ... ٧- باوەڕ بەوە کە وتارو ڕەفتاری چاک و خراپی مرۆ لە خوداوەندەوەیە. ٨- نوێژ لەسەر تەرمی بێ گوناه و گوناهکار. ٩- نوێژکردن و زەکات دان. ١٠- گوێ ڕایەڵیی سوڵتان و وپێشەوا، چ زۆردار چ دادوەرو عادڵ.

**دستەکانی شیعە:**

(١) شیعە بەو کەسانە گوتراوە کە پاش شەهیدبوونی ئیمامی عەلی (د.خ)، حەزرەتی عەلییان لەهەموو موسڵمانان لەبەرتر زانیوەو بەیعەتیان پێ کردووەو بە وەفاداری ماونەوەو پاش وی بەیعەتیان بە ئیمام حەسەن و پاش وی بە ئیمام حوسەینی شەهید کردووە.

پاش شەهیدبوونی ئیمام حوسەین، شیعە بڕوایان هاتە سەر ئەوە کە ئیمامەت دەبێ لە نێوان کوڕانی ئەو دوو ئیمامەدا بە ڕاوێژکردن بێ و دەبێ بۆ ئەم مافە شۆڕش بکەن و کێ شۆڕشی کرد، ئەوەیان شایستەی ئیمامەتە. بەم دەستەیە (زەیدییە) دەگوترێ.

جا لەم دەستەیە چەندین گرۆ کەوتنەوە. بە پێی (کتاب بیان الأدیان) پێنج دەستەن. نامێترینیان جاروودییەیە. ئەم دەستەیە لەو باوەڕەدا بوون کە پێغەمبەر بە «وەسف» نەک بە «ڕەسم» بە خەلیفە هەڵبژاردراوەو لەبەر وەی موسڵمان بەیعەتی یەکێکی دیکەیان کرد، تووشی گومڕایی و کوفر بوون. ئەم دەستەیە، پاش ئیمامەتی (زەید کوڕی عەلی کوڕی حوسەین) گوتیان ئیمامەت ئی (محەمەد کوڕی حەسەن کوڕی حوسەینە). تەنانەت هێندێکیان لەو بڕوایەدا بوون کە نەمردووەو زیندوو دەبێتەوە. شیعەی دوازدە ئیمامی دامەزرێنی ئەم دەستەیە کە ئەبولجاروود، (سەرحوب= شەیتان)ە، بە مەلعوون دەزانێ.. هێندێک گوتیان، نەخێر ئیمامەت ئی محەمەد کوڕی حەنەفییەیەو نەمرەو نامرێ و لەبەر وەی کە نەمردووە، ئیمامەت ئی کەس نییە. بەمانە کەیسانییە گوتراوە. هێندێ لایان وابوو لە کێوی «ڕەزوا» نێوان مەککەو مەدینە لەچاو ون بووە. دەستەی کەڕڕووبییە لەم دەستەی کەیسانییەیە جودا بوونەتەوەو یارانی ئەبوبەکرە کوێرەن و لایان وا بووە، کوڕی حەنەفییە زیندووەو چاوەنۆڕی سەرهەڵدانی دەکەن.

دەستەی حەربییە لە پەیڕەوانی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کیندی بوو کە باوەڕیان بە دۆناودۆن (تناسخ) هەبووەو دەیان گوت ڕۆحی خوداوەند چۆتە لەشی پەیامبەرەوەو ڕۆحی ئەو چۆتە لەشی ئیمامی عەلی و تاد... تا دەگاتە فرزەندی ئەبوهاشم و لە ئەبوهاشیمەوە بۆ لەشی عەبدوڵڵای کوڕی حەرب. هەرچی دەستەی حارثییەیە، ئەوە یارانی عەبدوڵڵای کوڕی حارثی مەدائینین و بڕوایان بە ئیمامەتی عەبدوڵڵای کوڕی محەمەد حەنەفییەو عەبدوڵڵای موعاوییە کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبوتالیب، هەیە. دەستەی هاشمییە، گرۆیەک لە کەیسانییەن و لە یارانی ئەبو هاشیمن. دەستەی بەیانییە لە یارانی بەیانی کوڕی سەمعانی مەهدین. ئەمانە لەو بڕوایەدا بوون کە ئەبوهاشم (بەیان)ی لەلایەن خوداوەندەوە بەناوی پەیامبەرەوە ناردووەو ئایەتی «هذا بیان للناس»ی بە شایەتی ئەم لافە دەهێنایەوە. ئەم دەستەیە، وەک لێیان دەگێڕنەوە، باوەڕیان لە قیامەتدا بە خودا دیتن هەبووە. گۆیا بەیان پاش مەرگی ئەبوهاشم داوای پێغەمبەرایەتیی کردووە. دەستەی ڕەززامییە پەیڕەوانی پیاوێ بوون، نێوی ڕەززام بووەو لە دەستەی کەیسانییە جیابووەتەوە. ئەم دەستەیە باوەڕیان بە ویسایەت و دۆناودۆن هەس. باوەڕیان وایە ڕۆحی خودا چۆتە لەشی ئەبوموسلیمەوەو دەنا کوو بەسەر کوڕانی ئومەییەدا زاڵ دەبوو. (ئەبوموسلیم، بەقسەی ئەبو دولامە کوردەو لە دێرە شیعرێکیدا بە «آباؤك الكرد»ی نێوهێناوە.. ئەمن ئەمە بەدوور نازانم، چونکە هەر وەک شەهرستانی دەڵێ ئەم دەستەیە باوەڕیان بە نەمریی ئەبوموسلیمی (کورد) هەبووەو بە پەیڕەوانی بابەکی خوڕەم دینن! زانیوە! عەبدوڵڵا بابەکی کورد، وەرزێری جــــــاویدان بــوو (٢٠١- ٢٢٢ک) لــە ئەردەوێڵ لە دژی حوکوومەتی مەئموون سەری هەڵدا، ئەوەی ئەو بەوی کرد، با بە دەواری شڕی نەکرد، بەڵام بەداخەوە بەدەستی خەیزەر (حەیدەر) کوڕی کاووس (ئەفشین، تورکی ملهوڕی (بەپێی قسەی ضیاء بنیادۆف (٨-٩ عصرلردا آذربایجان) بە نامەردانەترین شێوە کوژرا، بەڵام تا لەت و پەتیان کرد هەر جنێوی بە موعتەسیم دا....

دەستەی ڕاوەندییە، ئەمانە پەیڕەوانی محەمەد کوڕی عەلی کـوڕی عـەبـبـاس بوون و بەناوی شـیـعـەی بەرەی هەبباس یا ڕەوەندانن (ڕاوەندییە) نامێن. هێندێکیان مەنسووری عەبباسیی دووەمیان بە خودا زانی و بڕوایان بە دۆناودۆن هەیە. مەنسوور زۆری لێ لە زیندان هاویشتن. بۆ هاوڕێیانی خۆ لە زیندان ڕزگار کردن، فیتلێکیان دیتەوە.. تابووتێکیان وەسەر شـانی خـۆ دانا و کـاوێ لە زیندان نزیک کـەوتنەوە دەرو دەروازەیان شکاندو یارانی خۆیانیان وەدەرنان. هێندەی نەما، مـەنسووری تێدا بچێ.. ئەمن پێم وایە ئەم دەستـەی «ڕاوەندییە»یە وێڕای وەش کە زۆری لەسەر گوتراوە، بە بنەچەکە کورد بوون و خەڵکی کۆنە شارۆکەی لای مووسڵ بوون کە گۆیا ڕاوەندی کوڕی ئەکبەر کوڕی بیوراسب ئەژدەهاک- زوحاک ڕۆی ناوە. (معجم البلدان/لغت نامەء دهخدا). ناوەکە لە «ڕەوەند» کـــۆچەرەوە هاتووەو ناوێکی لەباوی کـــوردی بووە. «ڕەواندز»ەکەش هەر لەو «ڕەوەند»ەوە کەوتۆتەوە. دز: واتە قـەڵا، دژ. دزدار: قـەڵاچی...کـە عـارەب - دوایان وڕێ - هاتوون، لایان وابووە ناوەکەی (دز = دژ)ە، هەر یەکسەر - ئای بۆ ناو گۆڕینی وڵاتی خەڵک چەند خێران! - گوتوویانە «قەلعە دزە).

ڕەنگە بپرسی، ئەرێ ئەم کابرایە بۆچی بەم ئۆل و مەزهەبانەوە سەری خۆی ئێشاندووە؟ کورد لەم بەزمانەی چی؟! لەوەڵامدا دەڵێم: کەسی بابی، باسەکەمان باسی سەرچاوەکانی بیروباوەڕی کـوردەوارییـە. لەبەر ئەوەی کـورد لە هەمـوو نەتەوەکـانی دەوروبەری خۆی سەرەتاییتر بووە، دەبینی هەمیشە، کاڵا بە قەد باڵا، هەر خـەریکی بیـروباوەڕی سـەرەتاییـانەتر بووە.. واتە نەیتوانیوە خۆی لە ڕەگ و ڕیشەی زۆر کەونارای ئۆل و ئایینە ئەرواحییەکان، لە فتیششیەت، لە ئانیمیزم و هتد.. ڕزگار بکا، تائێستاش وەکو سێبەری لە دوویتی و لێی جودا نابێتەوە. ئەوڕۆ لە کوردو ئی وەکو کورد زێتر کێ باوەڕی بە (دۆناودۆن) ماوە؟ کێ باوەڕی بە خۆرگیران، بە مانگ گیران بەدەست (دێوەزمە) ماوە و تەنەکەی بۆ لێ دەدا. کێ بڕوای بەوە ماوە گۆی زەوین لەسەر شاخی گایەک وەستاوە؟ کورد لە هەزاردا چەند کەسی دەزانێ باران چۆن دەبارێ؟ بوومەلەرزە بۆ ڕوودەدا؟ چوار وەرزەی ساڵ چۆن ڕوو دەدا؟

شەوو ڕۆژ چۆن دێن و دەڕۆن؟ هەزاران چۆن و چۆنی کوڕی چۆنی دیکە.... چۆن دەبن بە خـزمی خـەزووری سـەپانی شێخی؟! لە کوردی هێشتا ئاوەزی ڕەوەند و وەکو ئی وی بەوڵاوە، کێ بڕوای بە خـودابوونی مـرۆ هەیە؟ باوەڕ بەخـودا بوونی مەهدی، بەخودا بوونی ئەبو موسلیم، بە خودا بوونی ئیمامی عەلی و هتد.. لەمێشکی ئی وەکو کورددا مەگەر

مـابێ؟ تەنانەت خـۆ بە ڕابردووەوە شـەتەکـدان- هەرچەند بۆ نەتەوەی کـورد ئەوڕۆ پێـویسـتـیش بێ - دیسـان یادکـردنەوەی بەشێکی زگماکی فـیتیشیـیەت و ئانیمیزم و تۆتەمیزمە، کە لە مـێـژووی مـرۆ جـوداناکـرێتـەوە.. ئەوڕۆ لە ئەورووپاش یادی سەروبەندە هەرە کۆنەکانی مرۆ دەکرێتەوە، بەڵام نەک بە بڕوا پێ کردنیانەوەو دەژێر کاریگەرییدا ژیان بەسەربردن، بەڵکو تەنێ بۆ ڕابواردن و بیـــرەوەری بۆ بیـــرەوەری.. کـــە دەڵێین، دەبێ کەلەپوورەکەمان کۆکەینەوە، نابێ لەبەر ئەوە بێ کە بیپەرستین، نابێ لەبەر ئەوە بێ کە ئەو کەلەپوورە لە هەموو چتـێکی نوێباو بەچاتر لە قەڵەم بدەین، نابێ بەناوی ڕەسەنایەتی پاراستنەوە، بێ وەی بەخـۆمان بزانین، تووشی سەلەفـیـیەت ببین... ناشبێ لەبەر چاوی کـاڵی مۆدێرنیـزمی ئەزم نەکـراو و لەسـەر مـەعیـدە قـورس و لەشان گـران، شـەق لە کـەلەپووریش هەڵ بدەین و بە جارێ فـتی کـەین. کـەلەپوور با پڕوپووچ و هەرزەو ئەفسـانە و وورێنەش بێ، زێوەری و ئارایشـتی هونەری نەتەوەیە، بەزەک و دۆزەکی کوردایەتییە، ئارایشت و سووراو و سپیاوی ڕوخساری ئەدەبیـاتی کـوردەوارییە.... بە کورتی و کـرمـانجی، نابێ وەک دەڵێن، خۆمان لە هەردوو دینەکە بکەین...

(ابن الراوندی) ئەحـمـەد کـوڕی یەحـیـا کـوڕی ئیـسـحـاق، ئەبولحـەسـەن، بە ابن الراوندن نامێ، لە زانایانی زەبردەست کەلام بوو. بە گوتەی مەسعوودی ١١٤ بەرگ کتـێبی هەبووە. هێندێ بەزەندیقیان نێوهێناوەو شیـعری «کم عـالم عـالم أعیت هذاهبە» و تاد یان وە پاڵ وی داوە...

ئەمن لەسـەر ئەوە سـوورم کـە لەبەر ئەوەی کـورد لەهەمـوو نەتەوەکـانی بەرشـاڵاوی عـەرەب کـەوتە و سـتـەمدیدەتر بووە، لەهەمـــوو نەتەوەکـــان ناڕازیتـــر بووەو لەهەر لایەک شنەیەک نارەزایی و ئازادی هەڵی کـردبێ، پێی شنیـوەتەو بووە بە کـەوڵ سووری پێش لەشکری و پێشەنگایەتیی خۆی نواندووە. کوردی لە فـەرمانڕەوای بەناوی موسـڵمـانەتییەوە حوکمڕان زۆر تووڕەو دڕدۆنگ، دە هەموو شەڕێکی دژی دەسەڵاتی عەرەب و عەجەم و تورک و تاد...دا، بەدرێژای مێژوو، ئەگەر پێشەنگ نەبووبێ، هاوبەشـێکی بەکـار بووە... بڕۆ لە کـون و کـەلێنێ مـێـژووی شۆڕشەکانی سەروبەندی کوڕانی هەباس بگەڕێ، هەر کوردەو لە دژمن ڕادەسێ و لە نەیاران هەڵ دەکـا... ئەوڕۆ لە کـوردەواری بەولاوە لەناو نەتەوەکانی دەرودراوسێدا کێهە نەتەوە بڕوای بە دۆناودۆن مـاوە؟! کـێـهـە بڕوای بە مـەلەک تاووس مـاوە؟! ئەم بیروباوەڕانە، هەر یەکە شـەقڵ و مـۆرکی سیـاسـیـانەی خـۆی پێوەیەو ئایدیۆلۆجییـەتی «لەپشت کـێهـە پەردەوە خۆ لە دژمنی داگیرکەر قوتار کردن»ی بەڕاشکاوی پێوە دیارە...

**دەستەکانی زەیدیە:**

١- جاروودییە.
٢- یەعقووبییە.
٣- سلیمانییە.
٤- صالحییە.
٥- بەترییە.
٦- قاسمییە.
٧- حەسەنییە.
٨- ذوکەیرییە.
٩- خەشەبییە.
١٠- ئەبرەقییە.
١١- ئیدریسییە.
١٢- خەلەفییە.
١٣- صەباحییە.
١٤- عیجلییە.

**دەستەکانی ئیسماعیلییە:**

١- خەططابییە.
٢- موبارەکییە.
٣- سەمطییە.
٤- ناصرییە.
٥- صەباحییە.
٦- موستەعلەوییە.
٧- ئاغاخانییە.

**دەستەکانی خەواریج:**

١- مەحکەمەی یەکەم.
٢-ئەزاریقە.
٣- نەجەدات.
٤-عاذرییە.
٥- صوفرییە.
٦- عەجاریدە.
٧- ئیباضییە.
٨- ثەعالیبییە.
٩- شوعەیبییە.
١٠- مەیموونییە.
١١-خەلەفییە.
١٢- مەعلوومییە.
١٣- صەلتییە.
١٤- موحەممیزە.
١٥- مەعبەدییە.
١٦- ئەخنەسییە.
١٧-شەیبانییە..
١٨-ڕەشیدییە.
١٩- کرامییە.
٢٠- زیادییە.
٢١-حەفصییە.
٢٢- یەزیدییە.
٢٣- حارثییە.
٢٤- بەیهەسییە.
٢٥-شەمراخییە.

ئەهلی کەلام، موعتەزیلە

**پێنج ئەسڵەکان:**

١- یەکـایەتیی خوداوەند لە زات و سیـفـاتی ئافەریدگـار و کردارەکانیدا.

٢- خوداوەند دادوەرو حەزی لە زوڵم و فەساد نییە.

٣- بەڵێن بە پاداشـتی چاکە و گەفە لە خراپکار بە سزادانی بێ بەزە.

٤- مەنزڵی نێوان دوو مەنزڵان: گوناهکاری گوناهی گەورە نە ئیماندارو نە دووڕووە.

٥- فەرمان بە چاکە و نە لە خراپە.
ئەم ئەسڵانە هەمووی بە ئەقڵ و مەنتیق پاساو دەدرێن و لێک دەدرێنەوە.
جا دەستەکانیان ئەمانەی پاین:
١- حەسەنییە. ٢- واصلییە. ٣-نەظظامییە. ٤-بەشیرییە. ٥-کەعبییە. ٦- هیشامییە. ٧- جوبائییە. ٨- جاحیظییە. ٩- موعەممەرییە. ١٠- خەییاطییە. ١١- مردارییە. ١٢- شەمامییە. ١٣- خابیطییە. ١٤- هاشمییە. ١٥- حیمارییە. ١٦- ئیسکافییە. ١٧- ئەسوارییە. ١٨- جەعفەرییە. ١٩- صالحییە. ٢٠- مەریسییە. ٢١- عەمرەوییە.

**فێرگەی کەلامی:**
١- ئەشعەرییەت.
أ- ئیلاهییات..
- خودا هەیە، یەکتایە، قەدیمە، جەوهەرنییە، جیسم نییە، عەرەز نییە، جیهەت و مەکانی نییە، لەوانەیە بدریترێ، باقی و ئەبەدییە.
(لیس کمثله شي ء).
ب- سیفاتی خوداوەند:
سەرلەبەری ئەو سیفاتانەی لە قورئانی پیرۆزدا بۆ گوتراون عەینی و کەلامی قەدیمە، عیلمی ئەزەلی و ئەبەدییە.
ج- کردارەکانی خوداوەند: خوداوەند جیهان ئافەرینی هەموو کردارەکانی بەندەکانی خۆیەتی، بەندە کرداری ئی خۆی نییە، هەرچییەکی بکا، بە خوایشتی وی نییە، خودا ئیرادەی لە سەری نەبێ ناکرێن، گووراندن و داهێنانی خودا لە ڕووی بەخششەوەیە، بەلای خوداوە هیچ بە زۆر بەسەر بەندەدا ناسەپێندرێ و هیچ چتێ لەسەر خوداوەند واجیب نییە.
فێرگەی کەلامیی ماتوریدییە
**بیروبڕوای ماتوریدییە:**
١- جوانی و دزێوی چتهایەکن بە ئەقڵ لێک درێنەوە.
٢- خوداوەند هەرگیز ئەرک بە زۆر بە ملی بەندەی خۆیدا ناسەپێنێ (لا یكلف الله نفساً إلا وسعها).
٣- مرۆ لە گوفتارو کرداری خۆیدا ئازاد و سەربەستە. بەڵام لەکن ئەشعەرییە سەربەستیی تەواوی نییە.
٤- کردارەکانی خوداوەند لە پێناوی بەرژەوەندەکانی مرۆدایە.
٥- برواو ئیمان زیاد و کەم ناکا.
٦- پەشیمان بوونەوەو تۆبە لە کاری خراپ، هەمیشە قوبوول دەکرێ. (ئەمە ددان بە گوناهی خۆدا نانی مەسیحیمان لە کن کەشیشێک، بە بیر دێنێتەوە).
٧- خوداوەند مەحاڵە زاڵم بێ. ئەم ئەسڵە هەر بە تەواوەتی بە پێچەوانەی ئەشعەرییەوەیە.
دەستەکانی ئەوانەی خوداوەند بە چتی بەرجەستەی ماددی بیر لێ دەکەنەوە و بەچتی ماددیی دەشوبهێنن:
١- هشامییە. ٢-موغیرییە. ٣-یوونسییە. ٤-نوعمانییە. ٥-مونهالییە. ٦-تەمیمییە و تاد..
دەستەکانی کەلامیی دۆناودۆن و حولوول- غولات (توندرۆ):
١- بەیانییە. ٢- حائطییە. ٣- حیمارییە. ٤- طارییە.
بە نامێترینیان ئەمانەن:

١- جیلمانییە. ٢- بەیانییە. ٣- جەناحییە. ٤- خەططابییە. ٥-موغرییە. ٦-مەنصوورییە. ٧-عەلیائییە. ٨- غورابییە. ٩- ئەزدەرییە. ١٠- نوصەیرییە.
گرۆیەکانی نوصەیرییە:
أ- حەیدەرییە. ب- شیمالییە. ج- کلاوزییە. د- غەیبییە.
١١- کەیالییە. ١٢- نومەیرییە. ١٣- غەمامییە. ١٤- موعەممەرییە. ١٥-طییارییە. ١٦-لاعییە. ١٧- هیلالییە. ١٨- موقەننەعییە. ١٩- طمامییە. ٢٠-شەلمەغانییە.
دەستەکانی غولات (توندرۆ):
١- ئەهلی حەق. ٢- بەکتاشییە. ٣- ئیبراهیمییە. ٤-ئێشنەینییە. ٥-ئەحەدییە. ٦- ئەزدەرییە. ٧- ئەزەلییە. ٨- ئیلحاقییە. ٩- یارانی زەیغ (لەرێ دەرچووان) ١٠-یارانی کەیسا. ١١- نامیرییە. ١٢- ئەنازیلە. ١٣- بەهمەنییە. ١٤- تفویضییە، ١٥- جەبەلییە. ١٦- جەعفەرییە. ١٧- حیلمانییە. ١٨-خەصیبییە. ١٩-صورەیغییە. ٢٠- شەبەک. ٢١- عومەرییە. ٢٢- غالییە. ٢٣- قوتەیبییە. ٢٤-قزلباش. ٢٥- کاکائییە. ٢٦- موشەعشەعییە. ٢٧- نوصەیرییە. ٢٨- خورەمییە. ٢٩- مازیارییە. ٣٠-سنباذییە. ٣١-ئەبو موسەیلەمییە.
فیرقەی بابییە و بەهائییە. فیرقەی ئەحمەدییە. فیرقەی وەههابییە.
ئەم دەستە و گرۆیانە دەکرێ بەش بە حاڵی کورد ئەوە بڵێین کە لێیانەوە کەم تا زۆر، بە دوور نەبوون و ڕەنگە پیاو لە ناخی بیروباوەڕی کوردان بە وردتر بگەڕێ هەواخوازو پەیڕەوانیان تا ئەوڕۆکەش وەچنگ بکەون.
خۆ مەزهەبی حولوول (دۆناو دۆن= تەناسوخ) لەکن ئەهلی حەق زۆر ئاشکرایە. مەزهەبی شیعەی دوازدە ئیمامی یا ڕەنگە ئی دیش لەنێو کوردەواریدا، بە تایبەت لە لوڕستان و کەلهوڕستان و خۆراساندا بەرچاو بکەون و دیارە لەدێرسیم و ماکۆ و کوردانی باشووری سووریاش بەرچاو دەکەون. گوندێک لای عفرین هەیە کوردەکەی عەلەوین.. دەستەی هەقە بێ گومان سەروکارێکیان دەگەڵ بەهائوڵڵا، محەمەد عەلی شیرازیدا هەبووە. (دیارە لە بەشی دووەمی ئەم نووسینەدا، باسی یەکە بە یەکەی ئەم ئۆل و مەزهەبانەتان هەموو بۆ دەکەم، بەش بەحاڵی تەسەووف، ئەوە هێند زۆرن هەر لە ژمارە نایەن:
بەڕاستی ئەگەر لکە زۆرو زەوەندەکانی هەریەک لەم تەریقەتانە وردکەینەوە، ئەوە ڕەنگە بە پەنجا لاپەڕەی دیکە لێ نەبەوە. ئەوڕۆ ئەوەی زۆر ئاشکرایە لە کوردستاندا تەریقەتی نەقشبەندییە بە هەموو لکەکانییەوە و تەریقەتی قادرییە لە هەموان بەرچاوترن. هەروەها ئەگەر هەقەکانیش بە تەریقەت بزانین، ئەوە ئەوانیش، هەر چەندە زۆر نین، لە کوردستاندا هەن. بۆ زێدە زانیاری بەرگی دووەمی کتێبەکەی ئیسماعیل بێشکچی، تەرجەمەی شوکور موستەفا بەنێوی (نظام الأناضول الشرقية) بخوێنییەوە زێتری درێژدادڕی تێدا کراوە.
ئەوجا بەندە دەمەوێ ئەوەتان عەرزی خزمەت کەم کە من تەنێ سەردەمی دێرینم بۆ باس کردوون، سەردەمی بە کۆمەڵی گەورە- گەورەی ژیانی مرۆ و سەروبەندی نوێم بۆ خستوونە پاش دەرفەتێکی دیکە.
دیارە لە سەروبەندی دووەمدا یەکە- یەکە، باسی ئایینی زەردەشتی و مووسەوییەت و عیسەوییەت و ئیسلام و

سۆفیگەریتان، لە نیگای ئەمانەی پایینەوە بۆ دەکەم:
١- ئەم ئایینانە چۆن سەر لەبەر ئاو لە سەرچاوە کۆنەکانی سەروبەندی دێرین دەخۆنەوە؟
٢- ئەم چوار ئایینە لە چیدا یەک دەگرنەوە و لە چیدا جودا دەبنەوە؟
أ- خودا بە لای ئەم ئایینانەوە. ب- جیهان دروست بوون لە نیگای ئەم ئایینانەوە. ج- چیرۆکی باوکە ئایەم دروست کران لە نیگای ئەم ئاییانەوە د- جەهەننەم و بەهەشت لە نیگای ئەمانەوە. و- ڕۆژی قیامەت و ئەو دنیا لە دیدی ئەمانەوە. ز- نوێژ و مەرجەکانی نوێژ بەلای ئەمانەوە. و- ڕۆژی قیامەت و ئەو دنیا لە دیدی ئەمانەوە. ز- نوێژ و مەرجەکانی نوێژ بەلای ئەمانەوە.ح- قیبلە. ط- دووعا. ی- تۆبە. ک- سیاسەت. ل- ئابووری. م- کۆمەڵ. ن- یاسا. فەرهەنگ و ڕۆشنبیری. س- هونەر. دوارۆژ.

ئینجا بیروباوەڕی کورد، بە پێی هەریەک لەم خاڵانە و نموونە لەناو کۆمەڵی کوردەواریدا، لە کۆن و نوێوە.

بۆ سەردەمی نوێش، لەبەر ڕۆشنایی ئەم خاڵانەی پایین، باسی بیروباوەڕی کوردەواری دەکەم:
١- گۆتاوەڕۆی فەلسەفەی خاوەر، ئاسەوارەکانی فەلسەفەی یۆنان، بیروباوەڕی ناسیۆنالیستی، سۆسیالیستی، دیمۆکراسییەت، لیبرالییەت، ئەزموونە سیاسییەکانی کورد و تاد.. لە بیری کوردەواریدا.

بەڵام وام بە باش زانی کە جەوهەری باسەکە بەش بە حاڵی سەردەمی دێرین، لەم چەند خاڵانەی پایندا پەیت کەمەوە:
١- فتیشییەت، واتە: پەرستنی سریشت و چتەکانی خۆڕسک، ئەمە یەکێکە لە ئایینە کۆنەکانی کۆمەڵەی سەرەتاییی مرۆ. لەبەر ئەوەی کە مرۆی سەرەتایی، جەوهەری چتەکانی لێ وەشارتی و نادیار بووە، ناچار بڕێ سیفاتی تایبەتمەندی سەرووی خۆڕسکی بە باڵابڕیون و باوەڕی وابووە ئەم چتانە (فتیشانە) تەواوی نیازو خوایشت و مرادی لۆ بەجێ دێنن.

فتیشییەت و تەوتەمییەت و جادوو سێ دەستەبران و دەگەڵ یەکدیدا هاوسەروکارن و ئەمیان لەگەڵ ئەوی دییاندا هەمیشە لە سەرەتاتکێدان. تەنانەت دەتوانم بێژم: لە ناوکرۆک و ماکی سەرلەبەری ئایینەکان، هۆزەکان، نەتەوەکان، کۆمەڵە و حیزب و دەستەو گرۆ و خۆلاسە لە سەرلەبەری سازمانی ئەوڕۆی سەرزەویندا هەن و بە درۆشم و ئارم و نیشانە و ئاڵا و تافتە و ڕەنگ و شکڵ و شێوە و تاد..ەوە، کە تا ئەوڕۆش ماونەوە، لە گوێن: خاچ و مەلەک تاووس و بوراق تا دەگاتە توربەی ئیمام حوسەین و تاد... تا ئەندازەی پەرستنیان بە پیرۆز دەزاندرێن.
٢- ئانیمیزم، واتە: بڕوا بەوە کە مرۆ و گیانلەبەر، هەموو لە لایەن ئەرواوە بەڕێوەدەبرێن و هەرچی لە دنیادا هەیە دەبن کاریگەریی ئەروایاندایە. هۆی پەیدابوونی ئەو باوەڕەش ئەوەیە کەهێزەکانی ڕەنێوهێن دە ئاستێکی فرە پاشکەوتەی گەشەکردندا بوون و هەمبانەی زانست و زانیاریی مرۆ هێند چکۆلە بووە، ئیدی نەی پەرژاوە لە پەسپایەترین چتەکانی خۆڕسک ڕاسێ و سەرێچیی لێ بکا. لە ئاستێکی تایەنی پەس پایەترین چتەکانی کۆمەڵەکیدا، بنیادەماندنی ئەم هێزانەی خۆڕسک، واتە: بەمرۆکردنیان، جۆرێکە لە بەیدەست کردن و دەبن ڕکێفی خۆ ئاوێتنی ئەم هێزانە... خودای با، خودای ئاو، خودای جوانی، خودای شەڕ، خودای هەرچییەکی ئەتۆ بە بیرتدا دێ... هەبوون.

ئانیمیزم بووەتە بنەما و بنواشەی سەرلەبەری ئەو ئایینانەی کە پاشە وی پەیدا بوون و لە بنیچەدا پاژێکی زگماکی هەموو ئایینەکانە.
٣- تەوتەمییەت- ئەم بیروباوەڕە واتە: یەکەم شێوە ئایینێک کە لەناو کۆمەڵانی سەرەتاییدا بەرچاو کەوتووە... تەنانەت تا ئەوڕۆش لە ئەمریکا و ئوستراليا و ئەفریقا و بگرە لەکن هێندێ هۆزی دواکەوتەی کورد و شوێنانی دیکەدا هەر ماوە. تەوتەمییەت ئەوەیە کە بەرەی مرۆ بەپێی هاوپێوەندیی ڕەگ و ڕەچەڵەک، بەپێی هاوخوێنیی بەرەی مرۆ، سەرلەبەری گیانلەبەرێ، درەختێ، سریشتێ لە سریشتەکانی خۆڕسک، گرۆ - گرۆ دەبن و ئەو تەوتەمە دەبێ بە ئارم و نیشانە و مارکەی جوداوازییان. تەوتەمییەت لە سەروبەندی سیستەمی میوە خڕکردنەوەو ڕاووشکارو چتی وادا، لە خزمایەتییەکی هاوخوێنی وەولاوە چیدیکە نییە. ئەگەر لە تەرکیبی هۆزو تیرەو عەشیرەتەکانی کوردەواری وردبییەوە، دەبینی ئەم تەرزە بیرە تا ئەوڕۆش زۆر لە باو و لە ڕمێنە و لە برەودایە. تەنانەت دەستەڵاتی سیاسیی گەورە پتر لەسای ئەم باوەڕەدا خۆی پاراستووە. ئەوجا تەوتەم، چ باپیرەگەورەی گیانلەبەرێ یا پەیکەرەو تیمسالێک، یا نماو ڕەمزێک، یا گرۆیەکی بنیادەم لە گەوهەردا هەریەک شتن. مرۆ لەو بڕوایەدا بووە کە تەوتەم پاسەوان و پارێزگاری کۆمەڵە و ڕۆزیدەی مرۆیە. ئاسەواری تەوتەمییەت تا ئەوڕۆش لە بیروباوەڕی خوداوەند: بابی هەموو ئیماندارانەو یا گیانلەبەر بەستەزمان و پیرۆزن، یا فلان چت پاژێکە لە لەشی خوداوەند، یا لە ڕێوڕەسمی ئایینەکاندا، نان لە شەراب وەردان و خواردنی، یا گوێز شکاندنەکانی جەمجەمی کاکەییان، یا لە فۆلکلۆردا بیروباوەڕی خزمایەتیی مرۆ و گیانلەبەران و ورچ چۆن ژنان دەدزێ و بەکابانی ماڵە خۆی دەکاو منداڵی سەرخڕ- سەرخڕی لێ دەبن، چتهایەکن زۆر ئاشکران.
٤- فیتشییەتی کاڵا- ئەمەش هەر لە بیروبڕوایەکانی فیتشییەتەوە چەکەرەی کردووە. مرۆ جاران کاڵای بە پووڵ نەدەکڕی، چونکە پووڵ نەبوو، ئاڵووێر بە کاڵا بە کاڵا وەگۆڕین سەروبەر دەندرا، واتە: پێوانەیەکی ستاندارت بۆ نرخ و بەهای چت نەبوو، مەگەر ئەوە نەبێ کە یەکێ مێوژ، هەنجیرەوشکە یا چتێکی دیکەی هەبووبێ و ویستبێتی بە بزنێ بە چتێکی دیکەی وەگۆڕێ.. کەواتە: نرخ، هەروەکو مارکس دەڵێ، دوو نرخە، نرخی بەکاردبردنی کاڵاو نرخی وەگۆڕینی کاڵا. ڕاستیت گەرەکە بەکاربردنەکە زێتر وا لە مرۆ دەکا کە فلانە کاڵا، کە بۆ خۆی شکی نابا، دەگەڵ کاڵایەکی دیکەدای کە، یەکێکی دیکە هەسیەتی، وەگۆڕێ. لەم ڕەوشەدا، دوو جۆرە بەکاربردن واتە: دوو جۆرە پێداویست هەن. ئەمانە وەک لە ئابووری شناسیدا دەگوترێ، دەستاودەست کردن (تداول= سیولە) دیننە گۆڕێ کە نرخی دووەم و بە نرخی ئاڵشت وەگۆڕینم نێوبرد. وەلێ ئەم پێوەندییەی نێوان دوو کاڵایە کە دوو کەس پێویستیان پێیانە، پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ نییەو سەرمایەدار بە تەرازووی بازاڕ ڕەفتاریان لەگەڵ دەکاو کێش و تەرازووەکەش بە دەستی خۆیەتی و فێڵێکی گەورەو خاپینۆک لە مێشک و زەینی کڕیارو فرۆشیار هەرتکاندا دروست دەکا و پێوەندییەکە شێوەیەکی مەڕمووز و پەنامەکی ئامێز پەیدا دەکا و مرۆ کە بۆ خۆی کاڵا

دروستکارەکەیەو داهێنەریەتی دەبینی لە سیستەمی بازاڕدا کالاَیەکە دەبێ بە خاوەن دەستەلاَت و ئەو جڵەوی کالاَداهێنەکە بە دەستەوە دەگرێ و ئەو دەبێ بە بەندەی کالاَیەکە.. لەبەر هەندێ، دەبینین مرۆ دەگاتە ئەندازەی پەرستنی کالاَیەکەی، واتە چۆن پارێزگاریی لە بتەکەی، فتیشەکەی دەکرد، هەر بەو ئەندازەیەش، پارێزگاری لە گەنجینەکەی دەکا.. تەلسمی بۆ دەنێتەوە، بانبانکی لەسەر دادەنێ، پاسەوانی لۆ دادەنێ و وەکو قاروون کە خوداوەند لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: "الا إن مفاتیحه لتنوء بالعصبة" کلیل و کلۆمی بۆ دەکا و لە نێو قاسەی وەدەشێرێ و خۆلاسە هەروەک مارکس دەڵێ، لە جیاتیی وەی کالاَ و پووڵ بوێ وە بەنەی ئایەم، ئایەمەکە خۆی ئەوێ وە بەنەی کالاَو پووڵەکەی خۆی، ئەمیشە گشت لە سای وە هەڵە لە سریشت و تەبیاتی کالاَو پووڵ گەیشتێ و فێڵ و فەرەجە بەسەر مێشک و ئەقڵ و ئاوەزی مرۆدا سەپاندنە.. بە نموونە: تەلاَو زێڕو زیوەر، چتهایەکی بەنرخن.. بەلاَم ئەگەر ئەم نرخەیان لەبەر ئەوەی بێ کە هێندێ تایبەتمەندیی وایان تیا هەس کە لە مەرتالی دیکەدا نین، ئەوە نابێ ببێتە هۆی ئەوە کارەکە بگاتە ڕادەی پەرستن. مەبەستم لە پەرستن، واتە: دەبەرابەریدا دەستەپاچەو داماو وەستان، هەروەکو مرۆ دەبەرابەر بتەکەیدا تا ئەوڕۆش ملکەچ و دەستەپاچە دەوەستێ.. ئەدی ئیبن عەرەبی کە فەرمووی: "دینکم و دنانیرکم تحت قدمي هاتین" مەبەستی چبوو؟! مەبەستی ئەوە بوو، کە مرۆی گێل، بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ، چۆن دەبێ بە بت پەرست و بتی لە هەمـــوو بتێ دەستڕۆتر زێڕو زێوە.. مرۆ خۆی، بت بۆ خۆی دورووست دەکا، وەڵێ کە گەیشتە تێنیشی دەشی شکێنێ، عەرەب خودای لە خورما دورووست دەکرد، بەلاَنەکێنی کە برسیی دەبوو، ناچار خودایەکەی خۆی زۆر بە ئیشتیاوە دەخواردو چباکیشی پێ نەبوو. کەواتە: نرخی هەموو کالاَیەک لە پێداویستیی ماددی و مەعنەویی مرۆوە سەری هەڵ داوە.

٥- جادوو (سیحر)یش یەکێکە لە ئایینەکانی سەرەتایی کە بە برێ ڕێتورەسم (کیش)، بە نیازی کار لە مرۆ و گیانلەبەرو ئەروای خەیاڵی کردن، ئەنجام دەدرێ. جادوو واتە: بروا بە بوونی پێوەندییەکی سەرووی خۆڕسک دە نێوان مرۆ و دەوروبەریدا لە هەمبەر فەلاکەت و نەخۆشی و خراپەو تاد.... بروا بە جادوو، کە تا نیوەی سەدەکانی ناوینیش درێژەی هەبوو، (بڕوانە: سیمیاگەری) لە لێشاوی (ئۆکولتیزم)دا لە نوێژەنرا سەری هەڵ داوەتەوە، ئەدی ئەو هەمـــوو بروا بەوە کە پیر و مەشایەخ دەتوانن پێوەندی دەگەڵ هێزە نهێنییەکاندا بگرن و هەرچیبەکیان نیاز بێ بۆیان مەیسەر دەبێ، لە چییەوە هاتووە؟! جادوو و سیحری چاوی ئافرەتی ئەم سەردەمە بە داوودەرمان، لە چیرا بەو ئەندازەیە تەشەنەی کردووە؟! خۆ واژەگەلی (سیحری چاو و جادووی موژەو تاد... دە ئەدەبیاتی فارسی و کوردیدا هەر دەڵێی خوێی چێشتن.. سەرلەبەری ئارایشتی ژنان لە بابەتی سیحرن، بە کلاَوی سەخرەجن گۆیا خۆ پێوارکردن، بە موخومەسی خالیولوەسەتی غەززالی خەزێنەو گەنجینە دۆزینەوەو سەدان چتی دیکە گۆیا دەردەست کردن، پیسایی دەگەڵ مووی بەری جوولەکەو ڕشک و گیاتسکەنە پێکەوە بۆ بنیادەم شێت کردن، بە زەمانی پەپوە سلێمانکەو خوناوی شەوی یازدەی شەعبان لە بەرەبەیاندا بە مەزراوەکردن و دەغڵوداو یەک و چل هێنانی. سەری کلاَشەکۆن بە ملی پەزی پزووگرتەوەکردن و یەکـــاویەک چابوونەوەی، دەرپێی کەسانی بێ تارات بە دەمولووتی پەسیوگرتەوە گرتن و بێ سێودوو چابوونەوەی، ناڵی ئێسترو کووژەکەی شێن و ددانی چاڵەکە بەسەردەرانەو هاسانەی ماڵێوە چەقاندن بۆ لە چاوی پیس بەدوور بوون و سەدان خوزەعبەلاَتی سەیروسەمەرە لە چییەوە سەریان هەڵ داوە؟! بۆ خۆم دووعای ئەبودووجانەم بۆ ئافرەتێکی نەزۆک کردووە، ئێستا سێ کوڕی هەن،؟! هێندێ ئایەتی قورئانی پیرۆز بۆ چاوەزارو چتی دیکە بە نوشتە دەنووسرێن، یەکاو یەکە. یەک لەو ئایەتە پیرۆزانە، ئایەتی "وان یکاد الذین لیزلقونک بأبصارهم تاد..." بۆ چاوەزار باشە.. مەلاَم دیوە کشتەکی بۆ لەرزو تێ بڕیوە یەکا و یەک بووە. منداڵ بووم، کە نەخۆش دەکەوتم، دایکم دەیگوت ترساوە، قورقوشمی دەتواندەوە، بە دەوری ئاگردانێکیدا سێ جاران دەگێڕام، پێی دەگوتم، بڵێ دایە چدەکەی؟ ئەمنیش دەم گوت چدەکەی؟ ئەویش دەیگوت: ترست دەردەکەم و قورقوشمە تواوەکەی بە دەوری سەرمدا سێ جاران دەگێڕاو دە عاردی ڕۆ دەکردو ئەوجا شڕو شکڵی سەیرو سەمەرەی لێ پەیدا دەبوون، هەڵی دەچنینەوە، دەی گوت: ئەمەیان مێردەزمەیە، ئەوەیان دێوەزمەیە، ئەوی دیکەیان کوڕی زمەی ئامۆزای سمەیە، ئەمی دیکەیان خزمی خەزووری سەپانی ئەنکی سمەی خوشکەزای زمەیەو تاد.. بەلاَم تا تەمەنم بوو بە پازدە ساڵیش لە نەوەو نەتیژانی ئەو زمەو سمانە زەندەقم دەچوو. دایکم زۆر جاران دەرزیلەی لە بوخچەی جلوبەرگی دەدا، دەی گوت نەبادا جندۆکان لە شاییاندا لەبەریان بکەن.

### پەراوێزەکان

.......

**(١) خەتی هیرۆگلیف.**

**(٢) خەتی ڕەمەکیی خەڵک داهێن.**

**(٣) ئایینی جیهانبینییەک، جۆرە بیروبروا و کردارو ناکارو ڕەوشتێکە لەسەر بنچی بروا بە چەند خودایەک یا یەک خودا، (پیرۆز)ێک، واتە واقعییەتی میتافیزیکییەتی ئەمەیان یان ئەویان ڕواوە.. ئایین بریتییە لە هێندێ بیروباوەڕی وا کە بەسەر ژیانی ڕۆژانەی مرۆدا زاڵەو لە ئاکامی ئەو هێزانەی کە مرۆ دەستەلاَتی بەسەریدا نەڕۆیشتووە، لەپێشان بەشێوەیەکی خەیالاَوییانە لە مێشکیدا ڕەنگی داوەتەوەو ئەم هێزانەش لە شتی بەرهەستی ماددیی سەرزەوین بەولاوە چیدیکە نین، بەلاَم مـرۆ شکڵ و شێـوەو بەرگ و بەزەک و دۆزەکی ئاسمانیی لەبەرکردوون و کردوونی بە چتی شایستەی پەرستن..**

**ئایین و ڕووداوە مێژوویینەکان: ئایین ڕەنگە لە سەرووبەندی سەرووی بەرد، واتە (٤٠ - ٥٠) ساڵ پەیدا بووبێ. دەگەڵ گەشەکردن و ڕەنگ و ڕوو گرتنی کۆمەڵدا گەشە دەکاو ڕەنگ و ڕوو بەخۆوە دەگرێ. پشت بە لێکۆڵینەوە ئێتنۆلیژییەکانی (ی. تایلۆر، ج فریزر، ک. پرۆیۆس) ئایین لە ئاستی نزمی گەشەکردنی شارستانییەتیی ڕێتوهێنانی بەرهەمدا سەری هەڵداوە. پەیدابوونی ئایین بە پێی سەردەمی بەردناسی، ئاسەوارناسی، ئێتنۆگرافیاناسی، ڕەوانناسی و تاد... چەسپیوە. (ئایین بیروبۆچوونی هەرە سەرەتاییانەی مرۆی هەرە نەزان، لەمەڕ سروشتی خۆی، چەکەرەی کردووە/ مارکس ک. ئنگلس ف.، لەمەڕ ئایین ١٩٦٥ ل٢١٦)[ACE III] ل**

[٤٦٨.

بیــری بنەڕەتی ئایین لەســـەر بنجی خـــودا ڕواوە. ئایین هەروەهاش باری ڕەوانی و هەست و خــــوســـتی ســــەر بە بیروبۆچوونی ئایینی دە خۆدا یەک خستوون (ئنگلس ف. ئەنتی دۆرینگ، ب.، ١٩٦٧، ل٣٢٠).

ئەمە لە نیگای ماددەگەرییەوە، بەڵام بە لێکدانەوەی زانایانی خوداناس و ئایینپەروەران: ئایین بە چۆنایەتییەکی گشتی کە لە سەرلەبەری ژیانی مرۆدا خۆی دەنوێنێ لە قەڵەم دەدرێ. مێژوو بە دیاری دێخی کــە هەر نەتەوەیەک ئایینی تایبــەتی خــۆی هەبووەو پەرستن و پاڕانەوەو دووعـا و نزاکـردن بە خۆرسکترین مـاکی ژیانی مـرۆ زاندراون. نان و ئاو چەند بۆ مـرۆ پێویست بووە، ئایینیش بەو ئەندازەیە بەپێویست زاندراوە.

لەمـــەڕ پەیدابوونـی ئایین هێندێ لایان وایە کــە لە ترســەوە ســەری هەڵداوە، ئەمــە بەش بە حــاڵی مــرۆیەکی هەرە نەزانی سـەرەتایی ڕەنگە ڕێی تێ بچێ، بەڵام پاش وریا بوونەوەی مـرۆ و لە ڕاســتینەکـانی زۆر چت گـەیشتن، ئیـدی مـرۆ لە بروسکەو لاقاو و بوومەلەرزەو ڕۆژگیران و مـانگ گیـران و تاد... (دیارە پاش تێگەیشتن) ترسی نەمـاو بەسـەر زۆر هێزی خۆرسکدا زاڵ بوو، کـەچی خـوداپەرستی و ئایین هەر مـاوەو ئایین پەرستی وا هەبووەو هەس لە هەمـــوو کـەسێ ئازاو بوێرترە. هێندێکی دیکە دەڵێن ئـایین لە بێ هێـزی و بێ دەسـتـەڵاتیی مـرۆڕا پەیدابووەو غوونە بە منداڵ دێننەوە کـە چۆن لە پێشـدا زۆر بێ تەوان و بێ دەستەڵاتەو کە بەرەوڕووی چتێک، توانستی بەسەریدا ناشکێ، دەبێتەوە، یەکسەر پەنا وەبەر دایکی دەبا، واتە ئایین بەپێی ئەم بیـروبۆچوونە، بریتـیــە لە برێ چتی منداڵانەو وەهم و خـەیاڵ و تاد... بۆ وەڵامی ئەمەش گوتراوە، بەڵێ ڕاستە بیروباوەڕی زۆر لە گـەلانی سـەر زەوین لە چتـی منداڵانە سـەریان هەڵداوە، بەڵام دەبێ بگوترێ کــە ئایین لـە غــەریزەی منداڵانەوە ســەری هەڵ نەداوە، چونـکە ئەگـەر بەم جۆرە با، مـرۆ ئەم جـۆرە بیـروبڕوا بە ئیــســتـیــلاح منداڵانەی خــۆی وەلا دەنـاو بەرەو پێــشکەوتن هەنگاوی هەڵ دێناو خۆی لە کـۆت و بەندی دیلی و یەخسـیری ڕەها دەکـرد. هەروەها ئەگـەر وا با، دەبوا پیــاوی خــوداناس و ئایینپــــەروەر برێ بوودەڵەو ترســـەنۆک و لە هەمـــوو یاراو توانســـتـێکی ئاکــاری و ئەخــلاقی بێ بەهرە بان، کـــەچی ڕاستییەکەی وا نییەو پیاوی خوداناسی وا هەن کە لە هەموو کـەسێ بەهێـزترو تواناترن و هەمـیـشـە هەنگاو بەرەو زانست و هێزو قودرەت وەدەست هێنان هەڵ دەگرن.

هێندێکیش دەڵێن: نەخێر ئایین لە کۆمـەڵەوە سەری هەڵداوەو سـەرلەبەری یاسـاو ڕێسـاو ئوسـووڵ و داب و دەسـتـوورو پێـڕۆ و نیزامی ئایینی بریتییە لە یاسا و ڕێسا و ئوسووڵی کۆمەڵی مرۆ و گـۆیا ئایین بەرهەمی کـۆمـەڵەو شـەخـسی ئایینپـەروەر خـودا ناپەرسـتێ، بەڵکو بۆ یاسـاو ڕێسـایەکـان مل دەدا. هەروەها دەڵێن پایە و هیـم و تەرازوو و پێـوانە لە ئایینـدا خودا نیـیـە، بەڵکو مـرۆ بۆ خـۆیەتی(سـۆفیـزم=سـەفـەتە) ، واتە: کـۆمـەڵی مـرۆیەو دە ئاییندا چتێ نیـیـە لە کـۆمـەڵ وەرنەگیـرابێ، کـەواتە ئایین پەیڕەوی کۆمەڵە نەک کۆمەڵ پەیڕەوی ئایینە..

ئەم بیــروبۆچوونە ڕەنگە بە شـەرت و شـورووتێ پەسـەند بێ بەتایبەت لەم سەروبەندەدا کە خەڵکانێ لە ئایین تەوەلان و لێی بە شـک و گــومـان کــەوتوون. هیــچ گــومـان لەوەدا نیــیـە کــە ســەرامەدی زۆر لە یاسـاو ڕێسـاو ئاداب و دەسـتـوور، کۆمـەڵەو کۆمەڵ دایناون. تەنات فرە لە یاساو ڕێسا کۆنەکان کە یادگاری سـەروبەندی نەزانیی مرۆن، دەشێ بە یاساو ڕێسـای کۆمـەڵەکی نێـو ببـرێن و دەکـرێ ئەمـانـە لەناو ئایین و بیـروباوەڕی نەتەوە شارستـانییـەکانیشـدا دەستنیشـان بکرێن. وەلێ نابێ ئەمانە بە سەرەتاو سـەرامەدی ئـایین لە قـەڵەم بدرێن. بگرە لەناو خەڵکی نەزان و لە هەمـوو شارسـتـانییـەتێکەوە بە دووریشـدا هێزێ هەیە کە زۆر لە هێزو دەستەڵاتی هۆز و عـەشیرەت بڵـیندترو بەڕێزترەو لە پشت پەردەی ئەو بیـروباوەڕانەوە هێـزێکی نهـێنیـی وا هەیە (ماتریالیستەکان بڕوایان بە هیچ هێزێکی پشت پەردە نییە) کە ئەسـڵـەن بە هێـزی دەوروبەر و دەسـتـەڵات لە قـەڵـەم نادرێ، بێ گــومــان جــاری واش هەبووە هێــزێکی لە خــەڵکی بەدەر یا شەخسیش لە ئاییندا پەیدا بووە.. هێندێ جار وا ڕێک کەوتووە لەناو جەرگەی نەتەوەیەکەوە تاکە کـەسێ سەر هەڵ دەداو یاساو ڕێساو ڕێوڕەسم و بیروباوەڕی ئایینی ئەو نەتەوەیەی کە چەندین چەرخ و چاخ گــوێ لە مـــســـتی بوون، ژێروژوور کـــردووەو شۆڕشێکی گەورەی لە دنیای بیروباوەڕی مرۆدا هێناوەتە گۆڕێ. ئەگەر ئایین لە تایبەتیی تەنیا هۆزێ یا کۆمەڵێکی تایەن سەری هەڵ دابا، ئەم هەمـوو پێشـکەوتنانە هەرگـیـز ڕوویان نەدەدا، چونکە هێزی تاکە کەس و شەخسیی ئایین لە هێزی کۆمەڵەکیی وی کەمتر نییە. لە ئاییندا بڕوا بە هێزێکی دەرەکی هەیە.. لەم حـاڵـەتەدا دەبێ هێـزێکی دەروونیـشی تێـدا هەبێ، کـە باس لە چۆن پەیدابوون و سـەرەتای وی دەکـا... ئایین لە بنیـچـەدا، لە کــۆمــەڵ لە دایک نابێ، بە ڕواڵەت لەوی وەرگـیـــراوە، بەڵام گەوهەرەکەی مەعنەوی و شەخسـییە. بەڵێ ئەمـەیە بیروبۆچوونی کۆمەڵگەری لەمەڕ پەیدابوونی ئایین. دیارە ئەمـە لە دوو نیگاوە لێک دەدرێتـەوە: یەکـمـیـان نیـگای ماددەگـەرییـە، کـە ئایین بە ڕەنگدانەوەیەکی خـەیاڵـیـانەی واقـیـعی مـاددی لە مـێشـکی مرۆدا، لە قەڵەم دەداو پێی وایە هیچ ئەسڵ و بنەمایەکی نییەو مـرۆ بۆ خـۆی دروسـتی کـردووەو هەر بۆ خـۆشی لە بەریەکی هەڵدەوشێنێ و بەپێی گەشەکردنی خەیاڵ و مێشکی، گەشەو پەرەی پێ دەدا.. دووەمـیـان نیـگای غوونەگـەری (ئایدیالیزم)ە.

بە باوەڕی ماددەگـەری، مرۆ لە سـەرەتای پەیدابوونیدا مێشکی توانستـی وێنەی چتی بەرچاو عـەمـارکردنی نەبووە، چتی تەنیا بەرچاوەکیی ڕاستەوخۆی دەرک کردووە، کە چتەکەی لەپێش چاو نەماوە هێشـتا بەهرەی ئەوەی نەبووە وێنەی چتەکە بەبێ دیتنی بە بیردا بێتەوە. دە قۆناخی چت بەرجەستە کردندا ژیاوە، بەڵام وردە وردە پێش کـەوتووەو مـێـشـکی پـتـری پەرەسـانـدووەو عەمارکەرو وەبیرهێنەوەو خەیاڵی لە مێشکدا بۆ پەیدا بوون. لە سـای ئەمـانەوە توانیـویە، ئیـدی وێنەی چت لە مـێشکیـدا عـەمارکا، ئەگەر پێویسـتی پێ بووبێ جارێکی دیکەی وەپێشە چاوی خۆ هێناوەتەوە.. ئەمە تەنێ بەش بە حاڵی هەستی بینین. بەش بە حـاڵی هەسـتی تام کـردن و بۆن کـردن و دەست لێـدان (لەمس) و هەســتی بیـسـتن، ئەمــانەش وردە وردە وەگــەشـە کەوتوون.. هەروەک توانیـویە چتی بەرچاو وەبیـرە خۆ بێنێتەوە، هەر وەو تەرحـەش توانیـوێسی بۆن و بەرامـەی گـوڵێ، تامی چتێکی شیرین، یا ترش، دەنگێکی خۆش یا ناخۆش، چتێکی گەرم یا ساردیش وەبیرە خۆ بێنێتەوە.. زانست چەسپاندوویە کە مـرۆ، با لە خـەیاڵ کـردنەوەدا زۆر دواکـەوتەش بێ، بەڵام بۆ ناسـینەوەی چت پەنا وەبەر وێکچـواندن و بەراوردکێ دەبا، مەجازو ئیسـتیـعارەو کینایەت (میتافۆرە) لەمەڕا پەیدابوون. لەبیـرم دێ لە سـاڵی (١٩٣٥)، تەمـەنم هەر پێنج سـاڵ دەبوو، گوتیان ئەسپەچۆینە پەیدا بووە.. ئەسپەچۆینە چییە؟ پایسکل..

ئەتۆ بنۆڕە مرۆ کوو بە بەهرەی خەیاڵ ئالیاتەکانی (مەجازی تەشبیه، ئیستیعارە، کینایە، مەجازی ئەقلی، چتێکی کە پێشینەی لە کنی نەبووبێ بۆ خۆی دروستی دەکا.. بڕوا بفەرموون هەر ئەو یاراو توانستی خەیاڵ و وەبیرهێنانەوەیەیە، کە مرۆ لە سەرەتادا لە هەموو سەروبەندێکی ژیانیدا چەندین خوداو بت و ئایین و تاد...ی بۆ خۆی بە خەیاڵ دروست کردوون. ئەوجا بەم قۆناغەی پاش واقیع بەرجەستەکردنە کە باسم کرد، قۆناغی مانا (هێزی پێوار) دروست کردن، چتی نابەرچاو لە مێشکدا تەسەوور کردنی (ئەبستراکت = تجرید) پێ دەگوترێ.

ئەمن پێم وایە ئەم بیروبۆچوونانە، بەتایبەت ئەوانەی لەسەر بنجی خەیاڵ ڕۆنراون، خۆیان لەبەر ڕەخنەی زانستانە ڕاناگرن. هیچ گومان لەوەدا نییە کە مرۆ، لەپێشدا بە چتی بەرچاو (بەرهەست) قەناعەت دەکا.. ئەوە مەشهوورە، کە دەڵێن، مەلایەک سەرمەشقی بۆ شاگردێک دادەدا، ناوی ماری بۆ نووسی. نەخوێندەوارێک حازرمەجلیس دەبێ، دەڵێ: مامۆستا چ ڕەوای هەقە تۆ ئەو منداڵە چەواشە دەکەی، تو خودا مار ئەوەیە کە تۆ بۆ ئەو منداڵەت نووسیوە - کوێرێک دەکێشی وەک وێنەی مار- دەڵێ تو خودا ئەمە مارە یا ئەوەی تۆ؟!

بەش بەحاڵی نموونەگەری، ئایین لە پێشکەوتووترین شێوەیدا، چتێکە لەلایەن خوداوە بەهۆی پێغەمبەرانەوە بۆ مرۆ دێتە خوارێ و مرۆ هەر ئەوەندەی لەسەرە تێی بگاو کاری پێ بکاو ژیانی ئەم دنیای خۆی پێ ڕێک بخاو بۆ ئەو دنیاش بەپێی فەرمایشتەکانی خوداوەند ڕەفتار بکا؛ بۆ ئەوەی ئەو دنیاشی بە قسمەت بێ. ئایین لە نموونەترین شێوەیدا کە لە ئیسلامەتیدا بەرجەستە بووە لە گەوهەردا هاوسەنگییەکی ڕەوانی و تا ڕادەیەک ئابووریی بۆ موسڵمانان بڕیار داوە. لەم وتەیەدا کە دەڵێ: (اعمل لدنياک وکانک تعيش أبدا واعمل لاخرتک وکانک تموت غدا) ئەم تەوازون و هاوکێشییە بە ڕوونی بەرچاو دەکەوێ.

بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەم بیروبۆچوونانە هەموو دەمەتەقێ و بگرەو بەردە هەڵ دەگرن و هەر یەکەیان شایانی بەربەرچ دانەوەی خۆیەتی.. جارێ یەکەم چت: ئەم ئایینانە هەر وا لە سەرەتاوە بەم ڕێکوپێکییە نەهاتوونە گۆڕێ، بەڵکو پاش چەندین دەورو زەمان گۆڕان و مشت وماڵ کران ئەوجا بەو شێوەیەی ئەوڕۆ گەیشتوون... ئەوەتا خوداوەند لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: «اليوم أكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي» سوورەتی المائدة ئایەتی ٥). لەوەڕا بەدیار دەکەوێ، کە ئایینەکان هەروا لە خۆڕا کوردواتەنی «لە پڕێ نەبوون بە کوڕێ»، بەڵکو بەرە- بەرە تەکامولیان کردووە. ڕاستە مرۆ لە سەرەتای پەیدابوونیدا لە هەموو چتێ سڵەمیوەتەوەو ترساوە، بەڵام پاش ئەوەی وردە - وردە مێشکی وە گەشە دەکەوێ، ترسی لە چتان دەڕەوێتەوەو بگرە بەسەر زۆر چتدا زاڵ دەبێ.. ئیدی ناترسێ، بەڵام ئایینی دەگەڵدا هەر دەمێنێ. مرۆ پاش ئەوەی لە گرۆگاڵی چتی ماددیی خوێڕیلە - خوێڕیلە خۆ دەبوێرێ، لە بیرکردنەوە ناوەستێ، ئەوە سروشتی مرۆیە، هەر بیر دەکاتەوەو بیر دەکاتەوە... ئەگەر وا نەبا ئیفلاتوونێک، ئەرەستوویەک، ئەم هەموو فەیلەسووفانە پەیدا نەدەبوون. چتێکی دیکەش: ڕاستە مرۆ هەنگاوی زێتری هەڵێناوەو بەو هەندە قایل نەبووە، وەلێ لەمەش بەولاترەوە هەنگاوی هەڵێناوە، بە تەنێ دەرک کردنی ڕاستی و جوانی، دڵی دانەکەوتووە، بەڵام ئەمانە چتهایەکی ڕووت (مجرد = ئەبستراکت)ن و قەناعەت بە مرۆ ناکەن.. مرۆ خاوەنی کەسایەتییەو هەر کەسایەتیشە کە بایەخ و بەها بەم بیروبڕوایانە دەدا. بە بایەختترین و ڕێزدارترین و بەنرخترین چت کە مرۆ هەیەتی کەسایەتییە، نەک بیروباوەڕ.. ئەدی ئەوە نییە کاتێ مرۆ چەند هەنگاوێکی دیکە هەورازتر چووە، خوداوەندی بە شێوەیەکی شەخسی وێنە کێشاوەو بۆی ڕوون بووەتەوە کە خودا نە هێزێکی سیحراوییەو نە چتێکی وەک چیای بڵیند و دەریای بێ پایانە و نە وەک ئاسمانەو نە وەک ڕۆژەو نە بیروباوەڕی ڕووت و پەتییە، بەڵکو مەوجوودێکە خاوەنی شەخسییەتەو دەگەڵ مرۆدا هاوسەرکاریەتی پەیدا دەکا، ئەدی ئەو هەموو سیفەتانە کە لە قورئانی پیرۆزدا بۆ خۆداوەند گوتراون و بەدرێژایی چەند سەدە موعتەزیلەو ئەشاعیرە لەسەریان کێشەیانە، گەلۆ، خودا سیفەتەکانیشی وەکو زاتی خۆی «هەرهەبوون و هەردەبن» یا هەر «زات»ی خودا ئەو «هەر هەبووەو هەر دەبێ»یە، نەک سیفەتەکانیشی؟ ئیدی ئەوە بوو، بیری وا پەیدا بوو، کە زات و سیفەت (ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) یەک شتن و کێشەکە بەم جۆرە بڕایەوە.... ئیدی بەم جۆرە ئایین بە شێوەی هەرە بەرزی گەیشت.. هەر لەمەشڕا بوو کە مرۆ لەم هاوڕێوەندی و هاوسەروکاری و دۆستایەتی و خۆشەویستییەی دەگەڵ خودادا، دەستی لە ئارامیی دڵ و دەروون گیر بوو و لە ترس و دڵەڕاوکێ و پەژارەو هەراسانی ڕزگاری بوو.

٤- زەروان: چەند جارێ بە دوای ئێزەدانی دیکەدا نێوی هاتووەو یەکێ لەوانە بە مانای فریشتەی زەمانەی بێ سەرحەدو سنوور هاتووە. بە زۆری دەگەڵ سیفەتەکانی "ئەکران" (بێ سەرحەدو سنوور)و "در غو خوذاته" هاتووە کە لە {مينو خرد پازند}دا "زروان درنگ خدای"و لە ئامیلکەی پارسیی (زانایانی ئیسلام)دا بە "درنگ خدای" گوتراوە، لەم دوو سیفەتە پێک هاتووە کە بۆ مانای زەمانە، سەرەتاو کۆتایی بە بیردا نەهاتووەو هەمیشە بە پایەدارو نەمر زاندراوە. لە "زاد سپرم"دا، بەشی (بەندی ٢٤) زەروان بەڕاشکاوی بە ئەفراندەی ئەهورامازدا لە قەڵەم دراوەو لە چەند ڕستەیەکدا کە لە ئاوێستادا هاتوون، تەنها لە پاش ئێزەدانی دیکەوە هاتووەو بە شایستەی پەرستن زاندراوە. لە نێوەرۆکی ئاوێستادا وا دەفامرێتەوە کە زەروان بە مانای زەمانەی بێ سەرحەد و سنوورو نەمر دە کاربراوە. لە عیبارەتێکدا لە گاتەکانی (یەسنا ٣٠، بەندی ٣)دا زەروان چاکەکارو بەدکار، وەک "دوو گەوهەری هاوزا" تاریف کراوە. لەبەر هەندێ، وا پێدەچێ کە زەردەشت باوەڕی بە ئەسڵ و سەرامەدێکی کۆن کە بابی دوو ڕۆح (ڕەوان)ی نێوبراوی، کردبێ، وەلێ نازاندرێ کە زەردەشت بە چ نێوێکی نێو بردووە؟ بێ گومان لە پاشان، زەروان وەک پەروەردگارێ ناسراوە. لە سەروبەندی هەخامەنشییاندا لەمەڕ چییەتیی ئەم پەروەردگارە، بیروباوەڕی جۆراوجۆر هەبوون: هێندێ لەو باوەڕەدا بوون زەروان زەمانەو هێندێ پێیان وابووە، مەکانە. بەڵام لە پاشان ئەوەکەی دواییان زاڵ بووە. لە قورئانی پیرۆزدا، ئایەتی: «وما يهلكنا إلا الدهر» دیاردییە بۆ ئەم بەرەی زەروانییانە. ئەدی کوردیش تا ئەوڕۆ، نالێ: چەرخی چەپگەردو چەرخی سپڵەو گەردوونی بێ بەزەو تاد..؟! لە ئایینی میهرپەرستیدا باوەڕی زەروانی قبووڵ کراوە. مانی کە بیروباوەڕی خۆی هەر لە زەردشتیڕا هەڵێنجاوە،

زەروان بە خـودای مـەزن نێـو دەبا. هێندێ لە زانایانی ئایینی خـواسـایی مـەزدیسـنا، هەر بە هەمـان زەروانـی لە قـەڵەم دەدەن. نوسیـارو مێژوونـووسی سەدەکانی پێنجەم و هەشتـەمی زایینی ئەم ئەفسـانەیەی پایینیـان لەمەڕ بیـروباوەڕی ئێـرانییـەکانی سـەروبەندی ساسـانییـان: کە چۆن گێـتی دروسـتکراوە، نەقڵ دەکەن و سـەروکاری بەم زەروانـەوە هەس: زەروان، یەکەم خودا، هەزار سـاڵی ڕەبەق گـاوگـەردوون و قـوربانیی گێـڕا، تا کـوڕێکی ببێ و هورمـزی نێـو بنێ، بەڵام پاشـانەکێ بۆ خـۆی لەمەڕ کـاری قوربانییەکانی وە گومان کەوت ئەوجا دوو کوڕی لە زگیدا پەیدا بوون: یەکیـان ئەهرمـەزد کـە قـوربانیی بۆ کـردبوو، ئەوی دیان ئەهرەمەن کە بە گومانەوە قوربانیی بۆ کردبوو. زەروان بەڵێنی دا هەر کـێـهـە لەو دوو کـوڕە پێـشـتـرێ بە خـزمـەتی بگا، تاجی پادشـاییی لەسەر دەنێ. وەلێ ئەهرەمەن زگی بابی دڕی و خۆی بە خزمەتی گەیاند. زەروان لێی پرسی: ئەتۆ کێی؟ گوتی کوڕی تۆم. زەروان گـوتی کـوڕی من بۆن و بەرامـەی خـۆشی هەس و نوورانیـیـە، وەلێ ئەتۆ تاریکسـتـانی و بۆگەنی.. هەر لەودەمی زەروان پێی لێ لە کـۆشی کـرد، دەبێ خـۆ نوورانی و بۆن خـۆش کەی، ئەویش کردی. زەروان بە فرزەندی خۆی قوبووڵ کرد.

ئەهرمـەن بەڵێنەکەی وەبیـری بابی هێنایەوە، زەروان وەڵامی دایەوە، بڕۆ، وا پادشاییی نۆ هەزار ساڵم دە قەبەڵ کردی، پاش بەسـەرچوونی ئەو نـۆ هەزار سـاڵ پادشـاییـە، ئەهرەمـەزد دەبێ بە پادشـای جیـهان. ئەوە لەبیـر نەکەی لە پاشانەکێ، زەروان دەگەڵ زەردەشت و ئەو هەرتـکەش دەگەڵ حەزرەتی ئیـبراهیـمدا تێکەڵ کراون.

لەم ئەفسانەیەدا چەند شتێک هەن:

١- گومان و ڕاڕایی کارێکی خراپەو چیی لێ شین نابێ.

٢- بەچکەی گـومـان ناشـەرعـیـیـەو بە فـرت و فـێـڵان خـۆ دەسەپێنێ.

٣- ئەگەر ئەو بەچکە ناشەرعییە بە قسەی خودایەکەی کرد، لێی قوبووڵ دەکا و پاداشتی دەداتێ.

٤- زێتر دەسـتوپێـوەندی فێـڵباز و بێ بار و هەڵ خواز گەورەو خاوەن دەسـتەڵات لە خشـتـە دەبەن و وەک بێژی هیچی دەگەڵ ناکـرێ. «تەزکـەرەی ئەعـلا»ی ئەهلی هەقـدا، خـوداوەند و حەزرەتی جبرائیل (بنیامین؟!) لەسەر دروست کردنی حەزرەتی باوە ئایەم دەبێ بە مـشـتـومڕیان... بنیـامین (بنی یامین؟!) دەڵێ: «ئەتۆ سـەروکـارت بە دنیـای ڕۆشنەوە هەس و من بە دنیـای تاریکسـتـانەوە. ئایەم دروست کـردن، کـە کـارێکی تاریکسـتـانییـە، سـەروکاری وە منەوە هەس، تۆ چکارەی؟!» خوداوەند لەسەر ئەم بێ پەروایییەی بنیامین، سێ جاری حەفتا ساڵ - حەفتا ساڵ، دوور دەخاتەوە، تا لە پاشان ئاقڵی دەکا... ئەوجا کـوڕنووشی بۆ دێنێ کـە هەر خـۆیەسی و کـەس لەخـۆی وەولاوە حەددی هیـچی نیـیـە... ئیـدی حەزرەتی ئایەم دروست دەکرێ. خۆلاسە، شەیتانەکەی خۆمان و بنیامینەکەی ئەهلی هەق و ئەهریەنەکـەی کـوڕی زەروان، یا هابیل و قـابیلەکـانی کـوڕانی باوکـە ئایەم هەر لە یەک بیـروبۆچوونـی (ئیـمـانی بێ خەوش) و (بڕوای گوماناوی)یەوە هەڵ قوڵیوە...

٥- مرۆ بێ بیر لە «دووانە» کردنەوە، کە ماکی «وجوود»ە لە سـەرەتاشـەوە و تا ئەوڕۆش نەیتـوانیـوە چێی (یەک قـوتبی) لە مـێشکیـدا جێ بکاتەوە. (هەر ئەرێنی و نەرێنی)یەکـەیە - سـالیب و مـووجـەبەکـەیە، مـەنفی و مـوسبـەتەکـەیە، نێـر و مێیەکەیە، کارەبا بەچکەی نەگەتیڤ و پۆزەتیڤە.

سەرچاوەکان

.........


١- ئەنسیکلۆپیدیای ئازەربایجان (ACE).

٢- فـەرهەنـگی فـەلسـەفـەی مـاتریالیـزم (materyalist felsefe sozlugu).

٣- لغتنامە، دهخدا.

٤- تاریخ ادیان و مذاهب جهان/ مبلغی آبادانی.

٥- بودا/ ع. پاشانی.

٦- تاریخ اجتماعی هنر/ هاوزر/ ترجمە، ابراهیم یونسی.

٧- الفصل فی الملل والأهواء والنحل/ ابن حزم.

٨- تاریخ دە هزار سالە، ایران/ عبدالعظیم رضائی.

٩- هند در یک نگاه/ دکتر محمد رضا جلالی نائینی.

١٠- فـرهنگ نمادها/ ژان شـوالیـە الن گـربران/ ترجـمـە، سودابە/ فضایلی.

١١- تاریخ تصوف در کردستان/ محمد رئۆف توکلی.

١٢- قورئانی پیرۆز.

١٣- سەرمایە. کارل مارکس/ ترجمە، ایرج اسکندری.

١٤- عـادات و تقـالیـد الشـعـوب القـدیمە/ د. فـاضل عبدالواحد د. عامر سلیمان.

١٥- نخسـتین انسان و نخستین شهریار/ ارتور کریست سن در تاریخ افسـانەای ایرانیـان/ ترجـمە، ژالە اموزگـار- احـمد تفضلی.

١٦- مەم و زین/ ئەحمەدی خانی.

١٧- ادیان و مکتبهای هند/ داریوش شایگان.

١٨- قصە، ارباب معرفت/ عبدالکریم سروش.

١٩- تاریخ بزرگ جهان/ کارل گریمبرگ/ ترجمە، دکتر سید ضیاء الدین دهشیری.

٢٠- تەوراتی پیرۆز.

٢١- تاریخ ادیان بزرگ /هاشم رضي.

٢٢- أعلام فرهنگ معین.

٢٣- وهابیت و ریشهای ان/ نورالدین چهاردهی.

٢٤- ریاض المشتاقین/ مخطوطة.

٢٥- الأساطیر القدیمە فی التورات، علي الشوک.

٢٦- تاریخ الشعوب الإسلامیة/ کارل بروکلمان.

٢٧- جنبش حروفیها/ محمد فطروس.

٢٨- دائرة المعارف الإسلامیة. (التصوف) باللغە الترکیة.

٢٩- فربە تر از ایدیولوژی/ عبدالکریم سروش.

٣٠- تصوف و ادبیات تصوف/ یوگنی ادواردویچ برتلس.

٣١- قبض و بسط تئوریک شریعت/ نظریە، تکامل معرفت دینی/ عبدالکریم سروش.

٣٢- اسرار التوحید فی مقامات شیخ ابوسعید ابو الخیر / باهتمام حسین بدرالدین. پەراوێزی ل: (٢٤٢)

# کولتوور و پۆست مۆدێرنیزم لە ئەمریکا



د. سەباح عەبدوڵلا سالح
(زانکۆی بلومزبێرگ - ئەمریکا)

نزیکەی سێسەد ساڵ لەمەوبەر بە ڕێگەی شیللەرەوە ماثیوئارنۆلد پێناسەی کولتووری کردو گوتی: کولتوور بریتییە لە باشترین بەرهەمی هونەری، ئارنۆلد- بەنموونە- ناوی هۆمەرو دانتی و شەکسپیری هێناوە. ئاژاوە بەلای ئارنۆلدەوە دژی کولتوورە. هەروەک لەناونیشانی کتێبەکەشییەوە دیارە (Culture and Anarchy) (واتە: کولتوورو ئاژاوە). یەک لە جۆرەکانی ئاژاوەش کولتووری گەلییە (Popular culture) واتە بە گوێرەی پێناسەکەی ئارنۆلد، ولیەم فۆکنەر بەشێکە لە کولتوورو گۆرانیبێژ (ئیلڤس پرێسلی- Elvis Prestly) بەشێکە لە ئاژاوە.

ئەمرۆ لە ئەمریکا بە چاوێکی سووک سەیری ئەم جۆرە پێناسەیە دەکرێت و بەپێی پۆست مۆدێرنیزم ئەم پێناسەیە شۆڤێنی و ستالینییە.

پێناسەی کولتوور لە ئەمریکا، ئەمرۆ زۆر فراوان کراوەتەوە، هەر وەک تێری ئیگلتۆن لە کتێبی (The Idea of cul-ture) واتە: (هزرۆکەی کولتوور) باسی لێوە دەکات: کولتوور بریتییە لە زۆر شت، بەڵێ بریتییە لە هۆمیرۆس و دانتی و شەکسپیر، بەڵام سەرەڕای ئەمانەش زۆر شتی تر دەگرێتەوە وەک: چۆنیەتیی ژنهێنان، چۆنیەتیی مردوو ناشتن، چۆنیەتیی سوعبەت کردن، چۆنیەتیی جلک لەبەر کردن، چۆنیەتیی دوورنە، چۆنیەتیی ژیان، چۆنیەتیی بنیادنانی خانوو و شار، چۆنیەتیی ژیانی ناوشارو گوند، واتە کولتوور بەپێی پۆست مودێرنیزم هەم حاجی قادری کۆیییەو هەم حەسەن سیساوەیە، هەم مەولەوییەو هەم گۆرانە، هەم زەکەریایەو هەم سیتۆو مازدەیە، هەم چارلس دیکنسەو هەمیش ژیانی جلشۆرەکانی لەندەنە لەسەدەی نۆزدەمدا، تێری ئیگلتۆن لە کتێبی (The Illusions of Postmodernism) (واتە: وەهمەکانی پۆست مۆدێرنیزم) زۆر گلەیی لە پۆست مۆدێرنیزم دەکات. یەک لەو گلەییانە ئەوەیە کە پۆست مۆدێرنیزم هەموو بنچینەیەک بە چاک و خراپەوە دەڕووخێنێ، واتە بەرە لەبن پێی هەموو بیرێک دەردێنێ، بەڵام لەهەمان کاتدا، ئیگلتۆن لایەنێکی ڕزگاریخوازانەی لەناو دەبینێ، بە بیروبۆچوونی ئەو، کۆمەڵگەی ئەمریکی زۆر سوودی لەو لایەنەی وەرگرتووە کە بە یەکجاری کۆتایی بە زمانی ستالینی و زمانی (Fundamentalism) هێناوە.

هەموو جۆرە تیۆرییەکی ئایینی، نەتەوەیی و سیاسی نەهێشتووە، ئێستا زمانی گفتوگۆو نووسین و ڕەسمی بە تەواوەتی خاوێن کراوەتەوە. لەو جۆرە وشانە کە بە چاوێکی سووک تەماشای ئافرەت و کەمینەو مرۆڤی بێدەسەڵات دەکات.

بۆ نموونە: هەتا ئەو ساڵانەی دوایی زۆر لە هاووڵاتیانی ئەمریکی فانیلەیەکیان لەبەر دەکرد بە گەورە لەسەری دەنووسرا (U. S. A is number One) (واتە: ئەمریکا یەکەمینە)، ئێستا گاڵتە بەو زمانە ڕەهایە دەکرێت. بەشەرمەزارییەوە باس دەکرێت، چونکە ئەو وشەیە بە کەمی و نزمی دەڕوانێتە نائەمریکییان، ئەگەر ئەمریکی (ژمارە یەک بن)، واتە غەیرە ئەمریکی ژمارە دوو یا سێ یا چوار تا خوارەوەن، پۆست مۆدێرنیزم دەسەلمێنێ کەوا بناغەی ئەو جۆرە قسانە شلۆقە، ئەگەر پرسیاری لێ بکەین ئەو پۆلێن کردنە چۆن دروست کراوە. ناتوانێ داکۆکی لە خۆی بکات و ئەو جۆرە قسانە بە ئاسانی دەڕووخێندرێن.

خاڵێکی تر هەیە پۆست مۆدێرنیزم بواری هیچ شتێک، هیچ بیرێک، هیچ کەسێک نادات بپەرسترێت.

دەبێ بزانین کەوا ئەو شتەی کە ئێمە پێی دەڵێین کەلەپوور (Heritage) یاخود مێژوو یاخود بیروباوەڕی کۆمەڵایەتی و ئایینی یاخود ناوێکی گەورەی مێژوو، ئەوانە گشتیان دروست

زەروان بە خوداى مەزن نێو دەبا. هێندێ لە زانایانى ئایینى خواسایى مەزدیسنا، هەر بە هەمان زەروانى لە قەڵەم دەدەن. نوسیارو مێژوونووسى سەدەكانى پێنجەم و هەشتەمى زایینى ئەم ئەفسانەیەى پاییٖنیان لەمەڕ بیروباوەڕى ئێرانییەكانى سەروبەندى ساسانییان: كە چۆن گێتى دروستكراوە، نەقڵ دەكەن و سەروكارى بەم زەروانەوە هەس: زەروان، یەكەم خودا، هەزارساڵى ڕەبەق گاوگەردوون و قوربانیى گێڕا، تا كوڕێكى ببێ و هورمزى نێو بنێ، بەڵام پاشانەكێ بۆ خۆى لەمەڕ كارى قوربانییەكانى وە گومان كەوت ئەوجا دوو كوڕى لە زگیدا پەیدا بوون: یەكیان ئەهرەمەزد كە قوربانیى بۆ كردبوو، ئەوى دیان ئەهرەمەن كە بە گومانەوە قوربانیى بۆ كردبوو. زەروان بەڵێنى دا هەر كێهە لەو دوو كوڕە پێشترێ بە خزمەتى بكا، تاجى پادشاییى لەسەر دەنێ. وەلێ ئەهرەمەن زگى بابى دڕى و خۆى بە خزمەتى گەیاند. زەروان لێى پرسى: ئەتۆ كێى؟ گوتى كوڕى تۆم. زەروان گوتى كوڕى من بۆن و بەرامەى خۆشى هەس و نوورانییە، وەلێ ئەتۆ تاریكستانى و بۆگەنى.. هەر لەودەمى زەروان پێى لێ لە كۆشى كرد، دەبێ خۆ نوورانى و بۆن خۆش كەى، ئەویش كردى. زەروان بە فرزەندى خۆى قوبووڵ كرد.

ئەهرەمەن بەڵێنەكەى وەبیرى بابى هێنایەوە، زەروان وەڵامى دایەوە، برۆ، وا پادشاییى نۆ هەزار ساڵم دە قەبەڵ كردى، پاش بەسەرچوونى ئەو نۆ هەزار ساڵ پادشاییە، ئەهرەمەزد دەبێ بە پادشاى جیهان. ئەوە لەبیر نەكەى لە پاشانەكێ، زەروان دەگەڵ زەردەشت و ئەو هەرتكەش دەگەڵ حەزرەتى ئیبراهیمدا تێكەڵ كراون.

لەم ئەفسانەیەدا چەند شتێک هەن:

١- گومان و ڕاڕایى كارێكى خراپەو چیى لێ شین نابێ.

٢- بەچكەى گومان ناشەرعییەو بە فرت و فێڵان خۆ دەسەپێنێ.

٣- ئەگەر ئەو بەچكە ناشەرعییە بە قسەى خودایەكەى كرد، لێى قوبووڵ دەكا و پاداشتى دەداتێ.

٤- زێتر دەستوپێوەندى فێڵباز و بێ بار و هەڵ خواز گەورەو خاوەن دەستەڵات لە خشتە دەبەن و وەک بێزێ هیچى دەگەڵ ناكرێ. «تەزكەرەى ئەعلا»ى ئەهلى هەقدا، خوداوەند و حەزرەتى جبرائیل (بنیامین؟!) لەسەر دروست كردنى حەزرەتى باوە ئایەم دەبێ بە مشتومڕیان... بنیامین (بنى یامین؟!) دەڵێ: «ئەتۆ سەروكارت بە دنیاى ڕۆشنەوە هەس و من بە دنیاى تاریكستانەوە. ئایەم دروست كردن، كە كارێكى تاریكستانییە، سەروكارى وە منەوە هەس، تۆ چكارەى؟!» خوداوەند لەسەر ئەم بێ پەروایییەى بنیامین، سێ جارى حەفتا ساڵ - حەفتا ساڵ، دوور دەخاتەوە، تا لە پاشان ئاقڵى دەكا... ئەوجا كوڕنووشى بۆ دێنێ كە هەر خۆیەسى و كەس لەخۆى وەولاوە حەددى هیچى نییە... ئیدى حەزرەتى ئایەم دروست دەكرێ. خۆلاسە، شەیتانەكەى خۆمان و بنیامینەكەى ئەهلى هەق و ئەهریەنەكەى كوڕى زەروان، یا هابیل و قابیلەكانى كوڕانى باوكە ئایەم هەر لە یەک بیروبۆچوونى (ئیمانى بێ خەوش) و (بڕواى گوماناوى)یەوە هەڵ قوڵیوە...

٥- مرۆ بێ بیر لە «دووانە» كردنەوە، كە ماكى «وجوود»ە لە سەرەتاشەوە و تا ئەوڕۆش نەیتوانیوە چتێ (یەک قوتبى) لە مێشكیدا جێ بكاتەوە. (هەر ئەرێنى و نەرێنى)یەكەیە - سالیب و مووجەبەكەیە، مەنفى و موسبەتەكەیە، نێر و مێییەكەیە، كارەبا بەچكەى نەگەتیڤ و پۆزەتیڤە.

سەرچاوەكان

.........


١- ئەنسیكلۆپیدیاى ئازەربایجان (ACE).

٢- فەرهەنگى فەلسەفەى ماتریالیزم (materyalist felsefe sozlugu).

٣- لغتنامە ‌ء دهخدا.

٤- تاریخ ادیان و مذاهب جهان/ مبلغى آبادانى.

٥- بودا/ ع. پاشانى.

٦- تاریخ اجتماعى هنر/ هاوزر/ ترجمە ‌ء ابراهیم یونسى.

٧- الفصل فى الملل والأهواء والنحل/ ابن حزم.

٨- تاریخ ده هزار سالە ‌ء ایران/ عبدالعظیم رضائى.

٩- هند در یک نگاه/ دکتر محمد رضا جلالى نائینى.

١٠- فرهنگ نمادها/ ژان شوالیە الن گربران/ ترجمە ‌ء سودابە/ فضایلى.

١١- تاریخ تصوف در كردستان/ محمد رئۆف توكلى.

١٢- قورئانى پیرۆز.

١٣- سەرمایە. كارل ماركس/ ترجمە ‌ء ایرج اسكندرى.

١٤- عادات و تقالید الشعوب القدیمە/ د. فاضل عبدالواحد د. عامر سلیمان.

١٥- نخستین انسان و نخستین شهریار/ ارتور كریست سن در تاریخ افسانەاى ایرانیان/ ترجمە ‌ء ژالە اموزگار- احمد تفضلى.

١٦- مەم و زین/ ئەحمەدى خانى.

١٧- ادیان و مكتبهاى هند/ داریوش شایگان.

١٨- قصە ‌ء ارباب معرفت/ عبدالكریم سروش.

١٩- تاریخ بزرگ جهان/ كارل گریمبرگ/ ترجمە ‌ء دكتر سید ضیاءالدین دهشیرى.

٢٠- تەوراتى پیرۆز.

٢١- تاریخ ادیان بزرگ /هاشم رضي.

٢٢- أعلام فرهنگ معین.

٢٣- وهابیت و ریشهاى ان/ نورالدین چهاردهى.

٢٤- ریاض المشتاقین/ مخطوطة.

٢٥- الأساطیر القدیمە فى التورات، علي الشوک.

٢٦- تاریخ الشعوب الإسلامیة/ كارل بروكلمان.

٢٧- جنبش حروفیها/ محمد فطروس.

٢٨- دائرة المعارف الإسلامیة. (التصوف) باللغە التركیة.

٢٩- فربە تر از ایدیولوژى/ عبدالكریم سروش.

٣٠- تصوف و ادبیات تصوف/ یوگنى ادواردویچ برتلس.

٣١- قبض و بسط تئوریک شریعت/ نظریە ‌ء تكامل معرفت دینى/ عبدالكریم سروش.

٣٢- اسرار التوحید فى مقامات شیخ ابوسعید ابو الخیر / باهتمام حسین بدرالدین. پەراوێزى ل: (٢٤٢)

# کولتوور و پۆست مۆدێرنیزم لە ئەمریکا



د. سەباح عەبدوڵلا سالح
(زانکۆی بلومزبێرگ - ئەمریکا)

نزیکەی سێسەد ساڵ لەمەوبەر بە ڕێگەی شیللەرەوە ماثیوئارنۆلد پێناسەی کولتووری کردو گوتی: کولتوور بریتییە لە باشترین بەرهەمی هونەری، ئارنۆلد- بەنموونە- ناوی هۆمەرو دانتی و شەکسپیری هێناوە. ئاژاوە بەلای ئارنۆلدەوە دژی کولتوورە. هەروەک لەناونیشانی کتێبەکەشییەوە دیارە (Culture and Anarchy) (واتە: کولتوورو ئاژاوە). یەک لە جۆرەکانی ئاژاوەش کولتووری گەلییە (Popular culture) واتە بە گوێرەی پێناسەکەی ئارنۆلد، ولیەم فۆکنەر بەشێکە لە کولتوورو گۆرانیبێژ (ئیلڤس پرێسلی- Elvis Prestly) بەشێکە لە ئاژاوە.

ئەمڕۆ لە ئەمریکا بە چاوێکی سووک سەیری ئەم جۆرە پێناسەیە دەکرێت و بەپێی پۆست مۆدێرنیزم ئەم پێناسەیە شۆڤێنی و ستالینییە.

پێناسەی کولتوور لە ئەمریکا، ئەمڕۆ زۆر فراوان کراوەتەوە، هەر وەک تێری ئیگلتۆن لە کتێبی (The Idea of culture) واتە: (هزرۆکەی کولتوور) باسی لێوە دەکات: کولتوور بریتییە لە زۆر شت، بەڵێ بریتییە لە هۆمیرۆس و دانتی و شەکسپیر، بەڵام سەرەڕای ئەمانەش زۆر شتی تر دەگرێتەوە وەک: چۆنیەتیی ژنهێنان، چۆنیەتیی مردوو ناشتن، چۆنیەتیی سوعبەت کردن، چۆنیەتیی جلک لەبەر کردن، چۆنیەتیی دوورنە، چۆنیەتیی ژیان، چۆنیەتیی بنیادنانی خانوو و شار، چۆنیەتیی ژیانی ناوشارو گوند، واتە کولتوور بەپێی پۆست مودێرنیزم هەم حاجی قادری کۆییەو هەم حەسەن سیساوەیە، هەم مەولەوییەو هەم گۆرانە، هەم زەکەریایەو هەم سیتۆو مازدەیە، هەم چارلس دیکنسەو هەمیش ژیانی جلشۆرەکانی لەندەنە لەسەدەی نۆزدەمدا، تێری ئیگلتۆن لە کتێبی (The Illusions of Postmodernism) (واتە: وەهمەکانی پۆست مۆدێرنیزم) زۆر گلەیی لە پۆست مۆدێرنیزم دەکات. یەک لەو گلەییانە ئەوەیە کە پۆست مۆدێرنیزم هەموو بنچینەیەک بە چاک و خراپەوە دەڕووخێنێ، واتە بەڕە لەبن پێی هەموو بیرێک دەردێنێ، بەڵام لەهەمان کاتدا، ئیگلتۆن لایەنێکی ڕزگاریخوازانەی لەناو دەبینێ، بە بیروبۆچوونی ئەو، کۆمەڵگەی ئەمریکی زۆر سوودی لەو لایەنەی وەرگرتووە کە بە یەکجاری کۆتایی بە زمانی ستالینی و زمانی (Fundamentalism) هێناوە.

هەموو جۆرە تیۆرییەکی ئایینی، نەتەوەیی و سیاسی نەهێشتووە، ئێستا زمانی گفتوگۆو نووسین و ڕەسمی بە تەواوەتی خاوێن کراوەتەوە. لەو جۆرە وشانە کە بە چاوێکی سووک تەماشای ئافرەت و کەمینەو مرۆڤی بێدەسەڵات دەکات.

بۆ نموونە: هەتا ئەو ساڵانەی دوایی زۆر لە هاووڵاتیانی ئەمریکی فانیلەیەکیان لەبەر دەکرد بە گەورە لەسەری دەنووسرا (U. S. A is number One) (واتە: ئەمریکا یەکەمینە)، ئیستا گاڵتە بەو زمانە ڕەهایە دەکرێت. بەشەرمەزارییەوە باس دەکرێت، چونکە ئەو وشەیە بە کەمی و نزمی دەڕوانێتە نائەمریکییان، ئەگەر ئەمریکی (ژمارە یەک بێ)، واتە غەیرە ئەمریکی ژمارە دوو یا سێ یا چوار تا خوارەوەن، پۆست مۆدێرنیزم دەسەلمێنێ کەوا بناغەی ئەو جۆرە قسانە شلۆقە، ئەگەر پرسیاری لێ بکەین ئەو پۆلێن کردنە چۆن دروست کراوە. ناتوانێ داکۆکی لە خۆی بکات و ئەو جۆرە قسانە بە ئاسانی دەڕووخێندرێن.

خاڵێکی تر هەیە پۆست مۆدێرنیزم بواری هیچ شتێک، هیچ بیرێک، هیچ کەسێک نادات بپەرسترێت.

دەبێ بزانین کەوا ئەو شتەی کە ئێمە پێی دەڵێین کەلەپوور (Heritage) یاخود مێژوو یاخود بیروباوەڕی کۆمەڵایەتی و ئایینی یاخود ناوێکی گەورەی مێژوو، ئەوانە گشتیان دروست


حاجی قادری کۆیی

کراون، مرۆڤ دروستی کردوون و لەوانەیە دروستکردنەکە هەڵەی تێدابێ، لەوانەیە درۆی تێدابێ، لەوانەیە ئیهانەی میللەتێکی تێدابێ.
کەلەپوور وەک وتمان دروستکراوەیەو لە گۆڕپانێکی تۆیانێ دەچێت، هەندێک ژێر دەکەون و هەندێکی تر سەردەکەون، یان هەندە کەس بە درۆودەلەسە ناوبانگ پەیدا دەکەن، هەندێک بە نەتەوەخوازی و نیشتمانپەروەری خۆیان ڕەپێش دەکەن، بە کورتی کەلەپوور جێگەی ململانێی ئایدیۆلۆژییەکانە.
تا حەفتاکان لە کتێبەکانی مێژووی ئەمریکاییدا، (تۆماس ژێفەرسۆن) یان دەپەرست، کە مرۆڤێکی زۆر زیرەک و بە کەڵک بوو. هەروەها سەری لە زۆر شتان دەردەچوو، هەندەجار پێیان دەگوت باوکی گەل (Father of the Nation).
ئێستا قوتابی کە باسی ژێفەرسۆن دەکات، بە شێوەیەک باسی دەکات هەر دەڵێی دراوسێیانە. باسی لایەنە باشەکانی دەکات، لەهەمان کاتیشدا باسی لایەنە خراپەکانیشی دەکات. یەک لەو باسانە لە دوازدە ساڵ زێتر، لەگەڵ کارەکەرە ڕەشەکەی خۆی، پێوەندییەکی جینسی هەبووە، بەڵام نەیهێشتووە کەس بەوە بزانێت.
بابەتێکی تری پۆست مۆدێرنیزم هەیە، دەپرسێ، بۆ ئاڵای وڵات پیرۆزە؟ کە لە ساڵی (١٩٩٠)دا ئەو پرسیارە کەوتە ناو دادگاوە، دادوەرەکان بڕیاریان دا، کەوا ئەوە مەسەلەیەکی کەسانییە (شەخسی)، واتە هاووڵاتییەکی ئەمریکی حەز بکات دەتوانێ ئاڵا لەبەر دەرگای خۆی بچەقێنێ و بیپەرستێ، لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانێ بیدڕێنێ و بیسووتێنێ و بیخاتە بەر پێیان، بە بیروبۆچوونی من ئەمەیان هەڵوێستێکی زۆر سەربەستە.
پۆست مۆدێرنیزم پرسیارێکی تر دەکات. ئایا دەق یا نووسین کارێکی بێ مەبەستە، شتێکی بێلایەنە؟ هەر خۆیشی وەڵام دەداتەوە، بێلایەنی و نیازپاکی مەحاڵە.
میشێل فۆکۆ Michel Foucault نیشانمان دەدا، کە هەموو جۆرە نووسینێک بریتییە لە دەسەڵات کردن. واتا دەسەڵات بەکارهێنان، بۆیە بەلای فۆکۆ و ئیدوارد سەعید-ەوە بەرهەم هێنانی زانین کارێکی سیاسییە. بەم مەبەستانە، کێ دروستی دەکا؟ لە پێناو کێ؟ لە چ بارودۆخێک؟ چی دەشارێتەوە؟ هەرمێن بە کێ دەدا؟ ئەو کاتەی دەست دەدەیتە قەڵەم، زۆرجارە بێ ئاگاداریی خۆت، قەڵەم دەست دەکا بە حوکم گێڕان.
با نموونەیەکی سادەی بۆ بێنم، ئێمە کە مەتحی کەسێک دەکەین لەوانەیە بڵێین: بەڕاستی فلانە کەس کوڕی پیاوانە، زۆر کەس کە گوێی لەوە دەبێت، دەڵێ ئەوە ڕستەیەکی جوان و نیازپاکە، بەڵام بۆ ئەوەی ئەو ڕستەیە ببێتە ڕستەو بتوانێ پەسن بکات. دەبێ، ئابلوقە لەسەر وشەیەکی تردا بێت. وشەیەکی تر بشارێتەوە، ڕەزیلی بکات و لە پێش چاومان سووک و بێنرخی بکات، دەسەڵاتی بەسەردا بگرێ. دەکاوتێ بکات. بۆیە ئەگەر من ئێستا بڵێم: فلانە کەس بەڕاستی کوڕی ژنانە، ئەوا بە مەتح وەرناگیرێت. لەوانەیە ئەو فلانە کەسە بەخۆی و خەنجەرەوە بێتە سەر ڕێم.
نموونەیەکی تر دێنمەوە، هۆنراوەیەکی ماثیو ئەرنۆلد-ە، کە زۆر بەناوبانگەو ناونیشانی (Dover Beach) (کەناراوی دۆڤەر)ە. هۆنراوەکە بریتییە لە سی و حەوت دێڕ. نۆ دێڕەکەی دوایی بەم شێوەیەیە:

**Ah, love, let us be true**
**To one another! far the world which seems**
**To lie before us like a land of drams**
**So various so beautiful, so new**
**Hach really neither joy, nor love, nor light**
**No certitude, no Peace, nor help for pain;**
**And we are here on a darkling plain**
**Swept with confused alarms of struggle and flight,**
**Where ignorant armies clash by night.**

لێرەدا، زۆر گرنگ نییە، بزانین ئەو هۆنراوەیە چ دەڵێ، بەڵکو بزانین چ ناڵێ، واتە چ وسکت دەکا، چ شتێک دەخاتە بەر ڕەقابەوە، لێرە بڕیاردان لەدەست قسەکەرە. ئەویش (پیاوە) ئەو پیاوە دەسەڵاتێکی ڕەهاداری لەدەستە گوێگریش ئافرەتە، ئەو هیچ مافی نییە، هیچ دەسەڵاتی لەدەست نییە، حەز بکات حەز نەکات، ئەو ئافرەتە دەبێ تەنیا گوێگر بێت، لە قسەکانی ئەو پیاوە، بە وسکت بوون، قسەکانی بەڕاست بزانێ، بەچاو هانی بدات، هەروەک (ڕۆبرت شۆلز Robert scholes) لە کتێبی (Textual Power) واتە (دەسەڵاتی دەق) نیشانمان دەدات هەموو دەقێک پڕ ململانێیە، لێرە قسەکەر خاوەن وشەیە، خاوەن عەقڵە، دنیای بەدڵ نییە، ئافرەتەکەش هیچ چارەی نییە، تەنیا ئەوە نەبێ کە دەبێ ئەیدیۆلۆژیای ئەو پیاوە بە هەرمێن بکات، لەوانەیە ژن شیعری وا هەر نەنووسن، چونکە شیعری وا پێویستی بە

دەسەڵات هەیە، ئافرەتیش هەر لەسەرەتای مێژووەوە بێ دەسەڵات کراوە.

لایەنێکی تری ڕزگاریخوازانەی پۆست مۆدێرنیزم ئەوەیە کە ئەمریکای ناچار کرد، بەتایبەت لەو دە ساڵەی ڕابردوو، کە پێناسەیەکی نوێ بۆ خۆی دابنێت. تاکو شەستەکان بەچەند وشەیەک پێناسەی ئەمریکایان دەکرد:

شۆفەرلێت، کێکی سێو Apple pie و بسبۆل Base ball ئەمریکا بەخۆی دەگوت (یەک نەتەوە لەژێر خودا). one nation under God واتە لە ئاییندا، (دیان) و لە خواردندا (گۆشت و پەتاتە)و لە زماندا: (ئینگلیزی). بە پێناسەیەکی تر دەیگوت (ئەمریکا وڵاتی کۆچبەرانە) زۆربەی ئەوانەش لە ئەوروپاوە هاتوون ئەوانە ئیتاڵی و فەرەنسی و ئەڵمانی و سویدی و پۆڵۆنین. جا ئەمانە و خەڵکی تر گشتیان لەناو مەنجەڵێکی گەورەدا زۆر بەجۆش دەکوڵێن و باش دەتوێنەوەو مسیللەتێکی نوێی لێ دروست دەبێ، بەم کردەوەیە دەگوترێ، Melting Pot theory واتە تیۆریی مەنجەڵی تاواندنەوە.

ئەمرۆ گەر بڵێی ئەمریکا بریتییە لە مەنجەڵێکی تواندنەوە، پۆست مۆدێرنیزم بەم شێوەیە وەڵامت دەداتەوە: لە بێ خەبەران کەشکەک سەڵەوات.

ئێستا ئەمریکا دەڵێ: ئێمە یەک نەتەوە نین، بەڵکو کۆمەڵێک نەتەوەین، یەک ئایین نین، بەڵکو کۆمەڵێک ئایین، یەک ئەدەبمان نییە، بەڵکو کۆمەڵێک ئەدەب، یەک زمانمان نییە، بەڵکو کۆمەڵێک زمان. بەم پێیە، تیۆریی مەنجەڵی تواندنەوە، بۆتە، قاپەکی پڕ زەڵاتە. (Salad Bowl)و ئەمریکا خۆی دەناسێنێ بە وڵاتی (Multiculturalism) واتە فرە کولتوور. لەبەر هەندێ، ئێستا بەشی زمانی ئینگلیزی لە دانشگاکانی، جێی بۆ ئەدەبی کۆری و چینی و ئیسپانی و هیندیی سوور و عەرەبی کردۆتەوە، ئەوانە گشتیان دەخوێندرێن، بەڵام بە زمانی ئینگلیزی، من زۆرجار لە کۆرسەکانمدا شتی کوردی وەردەگێڕم و بەکاری دێنم، بەمەش دەڵێن ئەدەبی ناڕۆژاوایی (Non- Westren lit-erature). پۆست مۆدێرنیزم شتێکی تریشی لە کولتووری ئەمریکی گۆڕی، پێشتر ئەدەب ئەدەب بوو، فەلسەفە فەلسەفە بوو، مێژوو مێژوو بوو، هەریەک لەو بەشانەی زانین، لە بەشەکانی تر جیاواز بوو، بەڵام ئێستا ئەمجۆرە سنووردانانە شکاوە، (ستیفن گرینبلات) لە کتێبی (Collapsing Boundaries) (واتە ڕووخاندنی سنوور) ئەوەمان بۆ دەست نیشان دەکات، کە ئەمرۆ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و فەلسەفەی تێدایە، مێژووی تێدایە، کۆمەڵناسی تێدایە، ئەنثرۆپۆلۆجیای تێدایە، زمانناسیی تێدایە. تا دەگەینە ئەوەی زمانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی بە (نووسینێکی نوێ Anew Kind of Writing)، ڕاستە (ڕۆرتی و دیریدا) لە بەشی فەلسەفەوە هاتوونەتە ئەو مەیدانە و ڕاستە (ئیدوارد سەعیدو تیری ئیگلتون و فرانک کەرمۆد) لە بەشی ئینگلیزییەوە هاتوون، بەڵام ئەو نووسەرانە خاوەنی نووسینێکی نوێنە. لە گشت بەشەکانی (مرۆڤایەتییەکان (Humanities



حەسەن سیساوەیی

دەخوێندرێن، هەر بۆیەش هەندە زانکۆ بەشەکانی ئەدەب و فەلسەفە و مێژوو و ئی تریان تێکەڵاو کردووە. کردوویانە بە (بەشی مرۆڤایەتییەکان (Humanities Division) یاخود (بەشی لێکۆڵینەوە Department of Culural Studies).

جگە لەوانە، پۆست، مۆدێرنیزم هەمیشە لە سەرچاوەکانی دەسەڵات دەگەڕێ تاکو بزانێ کێ دەسەڵاتی هەیە، کێ بێ (دەسەڵات)ە. فیلمێکی سپایک لی هەیە، ناونیشانەکەی (Do the Right Thing) (واتە: شتی ڕاست بکە) ئەم نوقتەیە جوان ڕوون دەکاتەوە.

کابرایەک بەناوی سال (Sal) چێشتخانەیەکی بچووکی هەیە و بە خواردنی ئیتاڵی بەناوبانگە وەک (بیتزە)، سال ئەمریکییە، بەڵام بە ڕەسەن ئیتاڵییە کە دەچێیە نێو چێشتخانەکەی، یەکەم شت کە سەرنجت ڕابکێشێ: کۆمەڵێک وشەی ڕەش و سپییە، گشتیان لە چوار چێوە گیراون و بەدوو ڕیز لە دیوار دراون وێنەکان ئی ئیتاڵی و ئەمریکییە بەناوبانگەکانن و لەلایەن خاوەنەکانیان ئیمزا کراون. لێرە، کێ دەسەڵاتی هەیە و کێ دەسەڵاتی نییە، ئاشکرایە، خاوەنی چێشخانەکە پیاوێکی سپییە وێنەکانی سەر دیوارەکەش هەموویان مرۆڤی سپین، واتا لەناو ئەو چێشتخانەیە، مرۆڤی سپی باوە، مرۆڤی سپی دەڵێ ئەوە موڵکی منە، چۆن بەکاری دێنم مافی خۆمە، هەروەک دیارە، لێرە (سال) خاوەن دەسەڵاتە. چێشتخانەکەی بەکاردێنێ نەک تەنیا بۆ فرۆشتنی خواردەمەنی، بەڵکو بۆ بەرزکردنەوەی نەتەوەکەی، هەر لێرەشدا، نەتەوەیەکی تریش هەیە وسکت کراوە لەو هەڵمەتەی بەرزکردنەوەیەدا پێک نەکراوە و وێنەی لەسەر دیوار نادرێ. ژمارەی ئەو نەتەوەیە زۆرە. چێشتخانەکە کەوتۆتە گەڕەکی ئەوان لە برۆکلین-دا (Brooklyn)، گشت ئەوانە قولەڕەشن. هەر پارەی ئەوانیشە ناهێڵێ چێشتخانەکە ئیفلاس بکا، بەڵام ئەوانە کە دەیانەوێ وێنەی (مارتن لوثەر کینگ- Martin Luther King) لەتەک وێنەکانی تر هەڵواسن، خاوەنی چێشتخانەکە دەڵێ:

ئێرە، موڵكی خۆمە، جا ناهێڵێ وێنەكە لە دیوار بدرێ، بەمە ڕەشەكان یەكسەر هەست بەوە دەكەن دەسەڵاتیان نییە.

ئەوجا بە كۆمەڵ هەڵمەت بۆ ناو چێشتخانەكە دەبەن و بە زەبری توندو تیژی وێنەی كینگ هەڵدەواسن.

پۆست مۆدێرنیزم، ئەوەمان پێ نیشان دەدا، هیچ شتێک بە تەواوەتی تایبەت نییە، تەنانەت چێشتخانەكەی سالی. لایەكی گشتیش هەیە، بەهۆی ئەو لایەنە گشتییە دەتوانێ دەستدرێژی بكا لە خەڵكی بێ دەسەڵات، بەڵام كە تەنگاو دەكرێ دەڵێ ئەو جێگایە موڵكی خۆمە، ئی هیچ كەسی تر نییە.

ئا بەمجۆرە سال دەیەوێ دەسەڵاتی خۆی بپارێزێ.

هەر لەبەر ئەمەش پۆست مۆدێرنیزم، داوا دەكات، كە ئەو دەسەڵاتە بە یەكسانی دابەش بكرێ. ئەوەی تاكو ئێستا وسكت كراوە دەبێ دەنگی بدرێتێ و دەرفەتی بۆ برەخسێ تا قسە بكات، ئەوەی تاكو ئێستا پێک نەكراوە، پێک بكرێ. لە ئەمریكا، ئێستا نزیكە هەموو لایەک ڕێک كەوتوون، كە ئەو گرووپانە غەدریان لێ كراوە: ئافرەت و قولەڕەش و كەمینەكانن، بۆیە ئێستا زۆربەی زانكۆكانی ئەمریكا سەنتەریان كردۆتەوە بۆ لێكۆڵینەوەی ئافرەت و كەمینە واتا (Minority Studies)

هەروەها لەبەر ئەوەی دەسەڵات لە زمانەوە دەست پێ دەكات، گۆڕان لە ناو زمان ئەنجام دەدرێت، پاكردنەوەی لە وشەی شۆڤێنی. ئەركێكی سەرەكییە، بۆ نموونە وشەی (Lady- واتا: خانم) ئەم خاڵە ڕوون دەكاتەوە.

وشەی (Lady) چەند شتێک لەسەر ئافرەت دەسەپێنێ، وەک (دەبێ پانتۆڵی كاوبۆی لەبەر نەبێ، دەبێ تەنوورە یاخود كراسێكی لەبەر بێ لەگەڵ پێڵاوی بن بڵند و یەک دوو ملوانكەی زێڕ یان مرواری).

وشەی (Lady) دەڵێ دەبێ ئەو ئافرەتە پرچی درێژ بێت. دەموچاوی بە ماكیاج بێت، وشەی (Lady) دەڵێ دەبێ ئەو ئافرەتە هاوار نەكات، جوون نەدات، هێدی بڕوات، لەسەرخۆ پێبكەنێ.

وشەی (Lady)وا لەو ئافرەتە دەكا كە نەتوانێ بەخۆی بەرگری لەخۆی بكات، دەبێ پیاو بەرگریی لێ بكات، هەروەها وشەی (Lady)وا لەو ئافرەتە دەكات ببێتە ئامرازێكی جوانی و خۆشی بۆ پیاو، وەک دەبینین وشەی (Lady) وشەیەكی بێ مەبەست نییە، بەڵكو بریتییە لە دروست كردنی ئافرەت بە شێوەیەک كە پیاو سوودی لێ بكات و ئافرەت بەخۆی زەرەری لێ بكات.

لەبەر ئەو هۆیانە زۆر ژنی ڕۆشنبیر هەن، ڕازی نابن پێیان بگوترێ (Lady) دەڵێن ئێمە دەمانەوێ بە خۆمان، خۆمان دروست بكەین، هەروەک دەڵێن:

(Iam a Woman, not a Lady)

واتە من ئافرەتم نەک خانم

هەروەها وشەی (Oriental) (واتە: ڕۆژهەڵاتی) لەبەر ئەوەی دروست كردنی ڕۆژئاوایە، یەكسەر تێگە وانیشان دەدات كە ئەوەی ڕۆژئاواییە باشە، ڕێكە، بە عەقڵە، لەسەرە خۆیە، حەز لە ئاشتی و ڕژێم باشی دەكات، هەرچی ڕۆژهەڵاتییە بە پێچەوانەوە، خراپە، ڕێک و پێک نییە، پەلە پەل دەكات، حەز لە شەڕو ئاژاوە دەكات، بۆیە ئێستا وشەی (Asian) (واتە: ئاسیایی) جێگای (Oriental)ی گرتۆتەوە، بەڵكو (Asian American) بەو كەسانە دەگوترێت، كە ئەمریكین بەس بە ڕەسەن لە وڵاتانی هیندو چین و كۆریا و یابان هاتوون.

پوختەی باس وەک گوتم، پۆست مۆدێرنیزم دەیەوێ هەموو جۆرە زمانێكی دەسەڵاتدار و ڕەها و ستالینی لەناو ببات، بەڵام لە هەمان كاتیشدا حەز ناكات بە خۆشی دەسەڵاتی هەبێ، هەر لەبەر ئەوەش بەرگری لەخۆی دەكات كە ئەو جۆرە زمانانە بەكارنەهێنێ، لە باتی ئەوەی بڵێ (فلانە كەس زۆر هەڵەیە) دەڵێ (بریا فلانە كەس ئەو قسەیەی نەكردبایە) لە باتی بڵێ (ڕاستی وەها پێناسە ناكرێ) دەڵێ (ڕاستی لە لای فلانە كۆمەڵە بەو شێوەیە پێناسە دەكرێ) لە باتی بڵێ (فلان زمان، زمانێكی خۆش و باشە) دەڵێ (فلان زمان لە لای هەندێک كەس زمانێكی خۆش و باشە) لەباتی ئەوەی قسە كەر یاخود نووسەر بەخۆی بڵێ (ئێمە) پۆست مۆدێرنیزم دەڵێ بڵێ (من) چونكە كە گوتت (ئێمە) ئەوا خۆت بە دەستی خۆت، خۆت بە پۆلیسی زمان دادەمەزرێنی، خۆت بە پۆلیسی ڕەوشت دادەمەزرێنی، خۆت بەناوی كۆمەڵ دەكەیتە زمانحاڵ، لە كاتێكدا ئەوان تۆیان ڕانەسپاردووەو هەڵنەبژاردووە. بە كورتی (ئێمە) دەبێتە وشەیەكی دەسەڵاتدار و دەرفەت نادات خەڵكەكە، یەک یەک بەخۆی قسان بكات..❖

**سەرچاوەكان**

..........

*** Eagleton, Terrry. The Illusions of Postmodernidm, oxford University Press, 1990.**

*** Eagleton, Terrry. The Idea of Culture. oxford University Press, 2000.**

*** Greenblatt, Stephen. The Sense of Wonder. Chicago University Press, 1993.**

*** Magge, Bryan. Confessions of a philosopher. Random House. 1998.**

*** Said Edward. Culture and Imperialism, Columbia University Press, 1993.**

*** Scholes, Robert. Textual Powr. Yale University Press, 1988.**

*** Scholes, Robert. the Rise and Fall of English Yale University Press, 1996.**

# دەقی ئاوێتە
# نــاو و نــاسنـامـــــــــە

## کێشەی ئاوێتەبوونی ژانرە ئەدەبییەکان لە ئەدەبی هاوچەرخی کوردیدا



فوئاد ڕەشید
کۆلێژی ئاداب/زانکۆی دهۆک

پێوەندی هاوبەشیانەی نێوان ژانرە ئەدەبییەکان و مەسەلەی بە یەکداچوونیان لە چوارچێوەی ئەدەبدا و لە دەرەوەی ئەم چوارچێوەیەشدا بابەتێکی گرنگ و سەرەکی تیۆری نوێی ئەدەبە و ئەدگار و چۆنێتی پێکهاتەی زۆر دەقی نوێمان بۆ شی دەکاتەوە.

لە لێکۆڵینەوە ئەدەبی و ڕەخنەییەکانماندا تائێستا بە شێوەیەکی بەرفراوان لەم بابەتە نەکۆڵدراوەتەوە. ڕاستە وەک دیاردەیەکی دابڕاوو زۆر بە کورتی لە مێژە ئاماژە بۆ نزیکی و هاوبەشی هونەر و ئەدەب کراوە. هەر چەندە لە ساڵی (١٩٧٥)ەوە نووسەری ناسراو کاک (مەحموود زامدار) لە ژمارە (٢٧)ی گۆڤاری بەیاندا لە ڕێگای وەرگێڕانی وتارێکەوە سەبارەت تێکستی وێنەیی ڕوویەکی ئەم بابەتەی خستووەتە بەرچاوی نووسەرو خوێنەری کورد، بەڵام وەک توێژینەوەیەکی تیۆریی زانستی، زۆر درەنگ و کەم ئاوڕ لە بابەتی پێوەندی و بەیەکداچوونی ژانرە ئەدەبییەکان دراوەتەوە.

ساڵی (١٩٩٧) (د.محەمەد بەکر) لە تێزی دکتۆراکەیدا ئەوەندەی پێوەند بێت بە باسەکەیەوە بەچەند ڕستەیەک ئاماژەی بۆ ئەم بابەتە کردووە.

ساڵی (١٩٩٨) لە ژمارە (٢٩)ی گۆڤاری (ڕامان) کۆمەڵە وتارێکی لەمەڕ پێوەندیی نێوان شیعرو وێنەو هونەر و ئەدەب بڵاوکراوەتەوە.

ئەگەر بە وردی سەرنجی ئەم وتارانەو هەر وتارێکی دیکەی ئەم بوارە بدەین کە تا ئێستا لە گۆڤاراکانماندا بڵاو کراونەتەوە تێبینی دەکرێت زۆربەی وتارەکان نزیک بوونەوەو بە یەکداچوونی هونەرو ئەدەبیان بە شێوەیەکی بنچینەیی و بەرفراوان گرێ نەداوەتەوە بابەتی ئاوێتەبوونی ژانرە ئەدەبییەکانەوە کە ئەمە بنەمای تیۆری و ئیستاتیکی ئەم جۆرە دیاردانەیە.

ئەم لێکۆڵینەوە تیۆرییە هەوڵدانێکە بۆ ڕاڤەکردنی دیاردەی ئاوێتەبوونی ژانرە ئەدەبییەکان کە سەرەنجام (دەقێکی ئاوێتەی) لێکەوتووەتەوە و لە ناو ئەدەبی هاوچەرخی کوردیشدا ڕەنگی داوەتەوە، لە هەمان کاتیشدا بۆ خۆی لە خۆیدا کێشەی زاراوەو ناسنامەی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە ئاراوە.

### ژانری ئەدەبی
### لە نێوان تیۆری کۆن و نوێی ئەدەبدا

بەر لەوەی لە گۆشەنیگای تیۆری کۆن و نوێی ئەدەبەوە باسی سیماو سروشتی ژانری ئەدەبی بکەین، بە پێویستی دەزانین چەمکی ژانری ئەدەبی لە ڕووی زمان و زاراوەوە ڕوون بکەینەوە؛ چونکە لە وتاری ڕەخنەییدا جۆرە ئاڵۆزی و بە یەکداچوونێک لە بەکارهێنانی ئەم چەمکەدا هەیەو لە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی و کوردیشدا پتر لە زاراوەیەکی بۆ بەکارهێنراوە.

١- ژانری ئەدەبی

١-١: کێشەی زمان و زاراوە:

وشەی ژانر(Genre) وشەیەکی فەرەنسییەو بنچینەکەی وشەی (Genus)ی لاتینییە کە مانای جۆر یان ڕەگەز دەگەیەنێت(١).

ئەمڕۆ لە زمانی ئینگلیزیدا هەرچەندە هەندێک لە ڕەخنەگران وشەی (Kind) یان (Typ) بۆ جۆری ئەدەبی بە کاردەهێنن، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی پتر وشەی (Genre) بۆ ئەم مەبەستە بە کاردێت(٢).

لە وتاری ڕەخنەی نوێی عەرەبیشدا زیاتر وشەی (الجنس) بە کار دەهێنرێت(٣). لە لێکۆڵینەوە ئەدەبی و ڕەخنەییە کوردییەکانیشدا تا ئێستا لە بەرامبەر وشەی (Genre = جنس) چەند وشەیەکی جیاجیا بەکارهێنراوە. وەک (جۆر)، (هونەر)، (شێوە)، (ژانر). لە بەرامبەر زاراوەی (الاجناس الادبیة = Literary Genres) زاراوەکانی (جۆرەکانی ئەدەب)(٤)، (هونەرەکانی ئەدەب)(٥)، (جۆرە ئەدەبییەکان)(٦) بە کارهێنراون، بەڵام ئەمڕۆ لە وتاری ڕەخنەییماندا تێبینی دەکرێت زیاتر زاراوەی (ژانرە ئەدەبییەکان) بە کاردێت. ئێمەش لەم لێکۆڵینەوەیەدا لە بەرامبەر وشەی (جنس = Genre)دا هەر بە کارهێنانی وشەی (ژانر)مان لە

د



د. محەمەد بەکر محەمەد

وشەی (جۆر) پێ باشترە بۆ خۆپاراستن لە تێکەڵاوی لەگەڵ وشەی (جۆر = صنف = Kind). هەندێک جار لە ئەنجامی ئاوێتەبوونی دوو ژانری ئەدەبی (جۆر) یا (چەشنێکی) دیکە سەرهەڵدەدات، بەڵام ژانرێکی سەربەخۆی پێک نەهێناوە؛ بۆیە پێی دەوترێت (جۆرێکی ناسەرەکی = نوع فرعی = Sub-Kind) واتە چەشنێکە یاخود جۆرێکە لە ژانرێکی سەربەخۆ. بۆ نموونە هەندێک لە رەخنەگران پێیان وایە (پەخشانە شیعر چەشنێکی شیعرییە نەک ژانرێکی ئەدەبیی سەربەخۆ)(٧).

دەربارەی زاراوەی (هونەرەکانی ئەدەب)یش دەڵێین، گومانی تێدانییە بە کارهێنانی وشەی (هونەر) بۆ ئەدەب، وەک بڵێین (هونەری ئەدب) یان (هونەرەکانی ئەدەب) کارێکی هەڵەنییە؛ چونکە ئاشکرایە ئەدەبیش بۆ خۆی لە خۆیدا هونەرێکە لە هونەرەکان. ئەوەندە هەیە ئەمڕۆ بە شێوەیەکی گشتی لە وتاری ئەدەبی و ڕۆشنبیریدا وشەی (هونەر) یان (هونەرەکان) زیاتر بۆ بزاف و چالاکییەکانی نواندن و شێوەکاری و مۆسیقا بە کاردێت(٨)؛ بۆیە ئێمەش وای بە باشتر دەزانین لە جیاتی زاراوەی (جۆرەکانی ئەدەب) و (هونەرەکانی ئەدەب) زاراوەی (ژانرە ئەدەبییەکان) لە لێکۆڵینەوەکانماندا بە کار بهێنرێت.

١-٢: چەمک و پێناسە:

ئاشکرایە تیۆری ئەدەب (Theory of Literature) کە لقێکی ئەدەبیاتناسییە، یەکێک لە ئەرکەکانی بریتییە لە پۆلکردن و دیاریکردنی سروشت و ئەدگاری ژانرە ئەدەبییەکان(٩).

توێژەرەوانی ئەم بوارەی ئەدەبیاتناسی لە دیدی جیاواز بە دەربڕینی هەمەجۆر پێناسەی ژانری ئەدەبییان کردووە. بۆ نموونە (رێنیێ وێلک) دەڵێت: (ژانری ئەدەبی تەنیا ناوێکی رووت نییە، چونکە لە ڕێگای ئەو ئەدگارە ئیستاتیکییەوە کە بەشداریی بەرهەمەکە دەکات، کەسایەتیی خۆی دادەڕێژێت)(١٠)، بەڵام (ڤینسێنت) بە زمانێکی روونتر پێناسەی دەکات و دەڵێت: (ژانرە ئەدەبییەکان چەند دارشتنێکی گشتی هونەرین کە یاساو سیماو تایبەتمەندێتیی خۆیان هەیە(١١). رەخنەگرو تیۆریزەکاری ئەدەبی (جیرار جینیت) لای وایە، ژانرە ئەدەبییەکان چەند جۆرێکی ئیستاتیکی رووتن(١٢).

ژانرە ئەدەبییەکان بە هەر شێوازێک و دەربڕینێک پێناسە بکرێن، کرۆک و کاکڵەی پێناسەکان لەوە یەکدی دەگرنەوە کە ژانری ئەدەبی (ئەو چوار چێوە هونەرییەیە کە نووسەر دەقە ئەدەبییەکەی تیا دادەڕێژێت. جا ئەو چوارچێوەیە شیعر بێت یا چیرۆک یا رۆمان... تاد)(١٣).

٢- ژانری ئەدەبی و کێشەی پۆلکردنی لە تیۆریی ئەدەبدا:

لە کۆنترین سەرچاوەی بواری تیۆریی ئەدەبەوە پێداوەرە تا نوێترین سەرچاوە، بە شێوەیەکی گشتی بابەتی پۆلکردنی ژانرە ئەدەبییەکان لە رووی چۆنێتی و چەندایەتییەوە - کێشەیەکە لە کێشە ئیستاتیکییە ئاڵۆزەکانی تیۆری ئەدەب (١٤). لەم بوارەدا ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین، دەبینین کێشەکە بە شێوەیەکی سەرەکی لەنێوان دوو تێڕوانیندا خۆی بەرجەستە کردووە، تێڕوانینی تیۆریی کۆن و نوێی ئەدەب. لەم نێوانەشدا بابەتی پۆلکردنی ژانرە ئەدەبییەکان خاڵێکی سەرەکی جیاکەرەوەی هەردوو تێڕوانینەکەیە.

١-٢: ژانری ئەدەبی لە تێڕوانینی تیۆریی کۆنی ئەدەبدا:

شەنگستەکانی تیۆریی ئەدەب بە شێوەیەکی بنچینەیی لەو ژێدەرانەی بواری تیۆریی ئەدەبدا دارێژراون کە لای یۆنانییەکانەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە سەدەی هەژدەیەمی زایینی. ئاشکرایشە کەڤنترین ژێدەری ئەم بوارە کتێبی (هونەری شیعر)ی فەیلەسووفی یۆنانی ئەرستۆیە (٣٨٤-٣٢٢پ.ز)(١٥).

بە شێوەیەکی گشتی بیروبۆچوونەکانی تیۆریی کۆنی ئەدەب لەسەر بنەمای جیاکردنەوەو لێک دابڕین و سنووربەندیکردنی ژانرە ئەدەبییەکان دامەزراوە، ئەمەش لەو روانگەیەوە کە هەر ژانرێک بونیادو قەوارەی تایبەتی سەربەخۆی هەیە(١٦). زیاد لەمەش تیۆریی کۆنی ئەدەب بڕوای تەواوی بە (پاکژیی ژانرەکان) هەیە. واتا لەو بڕوایەدایە کە ژانرەکان هێندە لە یەکدی جیاوازن بواری یەکگرتن و ئاوێتە بوونیان نییە، نە لەنێو خۆیاندا و نە لەدەرەوەی ئەدەبیشدا، لە داهاتووشدا هەروەکو خۆیان دەمێننەوەو هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نایەت. ئەم بیروباوەڕە تاسەدەی هەژدەیەم بەردەوامی هەبوو(١٧).

لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەیەمدا رەخنەگرو فەیلەسووفی ئەڵمانی (لێسینگ ١٧٢٩-١٧٨١) لەبەر پەرچدانەوەی ئەو هەوڵانەی کە باسیان لە هاوبەشی و لە یەکتر نزیک کردنەوەی هونەرەکان دەکردو لەو دەمەدا کە بە بزاڤی (برایەتی هونەرەکان = Brotherhood of Arts) ناوزەد کرابوو(١٨). سەر لە نوێ لە گۆشە نیگایەکی دیکەوە جیاوازی و سەربەخۆیی هونەرو ژانرە ئەدەبییەکانی دووپات کردەوە.

ئەمەش لەو کتێبەیدا کە بە ناوی (لاو کۆون) ساڵی ١٧٦٦ز بڵاوی کردەوە. لێسینگ لەم کتێبەیدا لە رووی بابەت و ئامرازەوە باسی جیاوازی نێوان ئەدەب و هونەری کردووە. بۆ نموونە لە رووی بابەتەوە ئەوەی دووپات کردەوە کە لە نیگارکێشی و پەیکەرتاشیدا ئیستاتیکایەکی ماددی دەبێتە بابەتی سەرەکی. بە مانایەکی دی ئەم دوو هونەرە رەهەندێکی شوێندار (مکانی) یان هەیە، بەڵام ئەدەب رەهەندێکی کاتدار (زمانی)ی هەیە(١٩).

لە سەدەی نۆزدەیەمدا لە ژێر کاریگەریی تیۆریی پەرەسەندنی چارلس داروین (١٨٠٩-١٨٨٢) و لەمیانی سەپاندنی یاساو بۆچوونەکانی ئەم تیۆرییە بەسەر ئەدەبدا، ڕەخنەگری فەرەنسی فەردیناد برۆنتێر (١٨٤٩-١٩٠٦) تیۆریی پەرەسەندنی ژانرە ئەدەبییەکانی دارشت. ئەمەش لە کتێبە بەناوبەنگەکەیدا (پەرەسەندنی ژانرەکان لە مێژووی ئەدەبدا). بە پێی تیۆرییەکەی برۆنتێر هەر ژانرێکی ئەدەبی قەوارەیەکی چەسپاوو نەگۆڕی نییە وەک نووسەرو ڕەخنەگرە کۆنەکان کە لەسەردەمی ئەرستۆوە بڕیاریان لەسەر دابوو، بەڵکو وەک گیاندارێکی ئۆرگانی لە دایک دەبێت و گەشە دەکات و لە ناو دەچێت، یان دووریش نییە لە شێوەیەکی دیکەداو لەژێر کاریگەری ژانرێکی دیکەدا سەر هەڵبداتەوە(٢٠).

ئەم تیۆرییە بایەلۆژییەی برۆنتێر لەلایەن توێژەروانی ڕەخنەو تیۆریی ئەدەبەوە بەتوندی ڕەخنەی لێگیراوە. تا ڕادەیەک (ئۆستن وارین) و (ڕێنیێ وێلک) پێیان وایە کە برۆنتێر بەم کارەی زیانی گەیاندۆتە زانستی ژانرەکان. دیارە هەڵەی برۆنتێر لەوەدایە کە ژانرو بەرهەمی ئەدەبیشی وەکو گیاندارێکی ماددیی رووت تەماشا کردووە، ئەمەش پێچەوانەی سروشتی ئەدەبە(٢١).

لایەنێکی پۆزەتیڤییانەی تیۆرییەکەی برۆنتێر لەوەدا بوو لەلایەک ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە هەڵوەشاندنەوەی هزری نەگۆڕی و نەمری چوارچێوەی ژانرە ئەدەبییەکان، لەلایەکی دیکەشەوە سەرنجی توێژەرانی بۆ لێوردبوونەوەی ژانرە ئەدەبییەکان ڕاکێشا.

٢-٢: ژانری ئەدەبی لە تێڕوانینی تیۆریی نوێی ئەدەبدا:

دیارترین و سەرەکی ترین ئەدگاری تیۆریی نوێی ئەدەب کە خۆی پێ جودا دەکاتەوە لە تیۆریی کەڤن ئەوەیە کە تیۆریی نوێ بڕوای بە ناوێتە بوونی ژانرە ئەدەبییەکان هەیە، جا لەنێو خۆیاندابێت یان لە دەرەوەی سنووری ئەدەب. واتا لەگەڵ هونەرێکی دیکە(٢٢).

سەرەداوی مێژووی بیروبۆچوونی نزیکی و هاوبەشی ژانرێکی ئەدەبی لەگەڵ هونەرێکی دیکە گەلێک کەڤنەو دەگەڕێتەوە بۆ لای شاعیری یۆنانی (هزیود Hesiode) کە لە سەدەی هەشتەمی بەر لەزایین ژیاوەو باسی نزیکی و پێوەندیی نێوان شیعرو وێنەی کردووە(٢٣).

سەرەتای هزری نزیککردنەوەو هاوبەشی کردنی ژانرە ئەدەبییەکان لەنێو خۆیاندا و بڕینی ئەو سنوورانەی کە تیۆریی کۆنی ئەدەب جەختی لەسەر دەکرد دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سەرهەڵدان و گەشەکردنی ڕێبازی ڕۆمانتیکی لەسەدەی نۆزدەیەمدا(٢٤).

لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا بە شێوەیەکی گشتی چەند هۆکارێک ڕۆڵی گرنگ و چالاکیان بینی لە پرۆسەی ناوێتە کردن و نەهێشتنی سنووری نێوان هونەرو ژانرە ئەدەبییەکاندا. گرنگترینیان ئەمانە بوون:

ا- ڕۆڵی ئیستاتیکای بەراوردکاری کە بەشێکە لە ئیستاتیکای هاوچەرخ.

ئەم زانستە گرنگیی دەدایە شیکردنەوەی ڕەگەزە ئیستاتیکییەکانی زۆربەی هونەرەکان و دیاریکردنی لایەنی هاوبەش و لەیەک چوونیان(٢٥).

ب- پەرەسەندنی تیۆرە نوێیەکانی زانستی زمان و تێکەڵ بوونیان بەڕەخنەی ئەدەبی و زانستی نوێی شێواز، کە زیاتر گرنگییان دەدایە دەلالەتی ئاماژە گشتییەکانی زمان، بە نیازی بینینەوەی یاسایەکی گشتی تا ئەو ئاماژانە پێکەوە شرۆڤە بکات. لەم کارەیشدا ناسنامەی ژانرێتی بەرهەمەکە فەرامۆش دەکرا(٢٦).

ج- ڕۆڵ و کاریگەریی ڕێبازە ئەدەبییەکانی (ئایندەخوازی)و (دادایزم)و (سوریالیزم).

ئاشکرایە هەر قۆناغێک لە قۆناغەکانی گۆڕانی جڤاک پێوەندیی ئیستاتیکیی خۆی بە جیهانەوە لە چەند ژانرو چەشنێکی ئەدەبی دیاریکراودا دەردەبڕێت.

کاریگەری باری ڕامیاری و جڤاکی و سایکۆلۆژیی قۆناغ و سەردەمی ئەم ڕێبازە ئەدەبییانە کارێکی وای کرد کە نەک هەر ژانری ئەدەبی و هونەرییان تێکەڵ دەکرد وەک شیعرو وێنە، بەڵکو هەندێ جار لە پارچە کاغەزی ڕۆژنامەو کتێبی جیاجیا دەقێکی تایبەتیان دادەڕشت(٢٧).

ئەمڕۆ لە ژێر کاریگەریی میتۆدە جیاوازەکانی ڕەخنەی نوێدا کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر پرنسیپەکانی زانستی نوێی زمان و سیمیۆلۆژیا دامەزراوە، ژانرە ئەدەبییەکان سنووری نێوانیان بە ئاسانی دەبەزێنرێن و ئاوێتەی یەکدی دەکرێن و هەندێ جار ژانرێک یان چەشنێکی نوێیان لێدروست دەکرێت؛ چونکە ڕەخنەی نوێ لە ڕوانگەیەکی زمانەوانییەوە دەق دەخوێنێتەوەو پتر گرنگی دەداتە ئەدگارە ئەدەبییەکانی دەق. تەنانەت بەبڵاوی بە کارهێنانی خودی وشەی (دەق = Text) لە گوتاری ڕەخنەی نوێدا بۆ خۆی لە خۆیدا سیمایەکی کاڵ بوونەوە و دیارنەبوونی ناسنامەی ژانری ئەدەبییەو لەو ڕوانگەیەشەوەیە کە هەر ناولێنانێک دەستەوەستانە لە پەنجە خستنە سەر ئەدگارەکانی بنیاتی دەقەکە.

لە حاڵەتێکی واشدا ناسنامەی ژانری ئەدەبیی بەرهەمەکە نەک هەر فەرامۆش دەکرێت، بەڵکو بەڕای هەندێک لە ڕەخنەگران ئەم مامەڵەکردنە زمانەوانییە لەگەڵ دەقدا ڕێگا چارەیەکە بۆ کۆتایی پێهێنان و یەکلاییکردنەوەی مەسەلەی پۆلکردنی ژانرە ئەدەبییەکان (٢٨).

هەر لەبەر ئەم هۆیەشە (ڕێنیێ وێلک) لەو بڕوایەدایە کە جوداکردنەوەی ژانرەکان لەلایەن نووسەرانی هاوچەرخەوە فەرامۆشکراوە(٢٩)، (تۆدۆرۆف)یش لای وایە ئەم جیاکردنەوەیە شتێکی بنچینەیی نییە لە ڕەخنەی نوێدا؛ چونکە پەیڤ و وێنە و هێماکان ڕەگەزە بنچینەییەکانی هەر بەرهەمێکی ئەدەبی پێک دەهێنن( ٣٠).

بەم کارەش ڕەخنەی نوێ شیا قەوارەی سەربەخۆیی ژانرەکان هەڵبوەشێنێتەوەو سنوورەکانی نێوانیان لابەرێت و دەرگای بۆ بە یەکداچوون و هاوبەشیکردن و ئاوێتەبوونیان بکاتەوە، چی لە ناوەوەو چی لە دەرەوەی ئەدەبیشدا و سەرەنجام (دەقی ئاوێتە) بێتە بەرهەم.

## دەقی ئاوێتە
## لە ئەدەبی هاوچەرخی کوردیدا

١- چەمکی دەقی ئاوێتە:

هەروەکو لە سەرەتای ئەم لێکۆڵینەوەیەدا ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە تیۆریی نوێی ئەدەب و ڕەخنەی نوێش دەلیقەیان بۆ تێکەڵاوی و بەیەکداچوونی ژانرە ئەدەبییەکان ڕەخساندووە و گۆڕانکاری و کودەتایەکی کۆپەرنیکۆسییان بەسەر تیۆریی (پاکژی و سەربەخۆیی ژانرەکان)دا کردووەو ئەم کودەتایە دەقێکی ئاوێتەکراوی لێکەوتووەتەوە.

کەواتە دەقی ئاوێتە بریتییە لەو دەقە ئەدەبییەی کە لە ئەنجامی ئاوێتەکردنی هەندێک ڕەگەزی ئیستاتیکی دوو ژانری ئەدەبی یان ژانرێکی ئەدەبی و هونەرێکی دیکە پێک دێت و قەوارەیەکی نوێ دروست دەکات کە خاوەنی تایبەتمەندێتی خۆیەتی، هەڵبەتە کرداری ئاوێتە بوونەکە ئاوێتە کردنێکی میکانیکی نییە، بەڵکو لە فۆڕم و داڕشتنێکی نوێدایە، بۆیە ڕەخنەگری فەڕەنسی (جیرار جینیت) ڕای وایە کە ئاوێتەکردنی دوو ژانری ئەدەبی، ژانرێکی نوێ دروست دەکات(٣١).

هەروەک ئاماژەمان بۆ کرد دەقی ئاوێتە مەرج نییە تەنیا بەرهەمی ئاوێتەبوونی دوو ژانری ئەدەبی بێت، بەڵکو هەندێ جار لە سەرەنجامی ئاوێتەبوونی ژانرێکی ئەدەبی لەگەڵ ڕەگەزی ئیستاتیکی هونەرێکی دیکە وەک هونەری شێوەکاری و وێنەکێشان دروست دەبێت، وەک دەقی وێنەیی، یان لەگەڵ ئامرازو هێماکانی بوارێکی زانستیدا، وەک ئەو تێکستانەی کە پتر لە ڕێگای هێماکانی بیرکاری و ئەندازەوە لەگەڵ خوێنەر دەدوێن.

٢- جۆرەکانی دەقی ئاوێتە:

ئەگەر بەوردی سەرنجی دیاردەی ئاوێتە بوونی دەق بدەین لەئەدەبی هاوچەرخی کوردیدا، تێبینی دەکەین کە کرداری ئاوێتەبوونی ژانرە ئەدەبییەکان لە سێ تەوەرەوە بەرجەستە کراوە. هەروەک لەم هێڵکارییەدا ڕوون کراوەتەوە:




تەوەری یەکەم: لە ڕێگای ئاوێتەبوونی ڕەگەزی ئیستاتیکی و هەندێ ئەدگاری دوو ژانری ئەدەبیدا دەقێکی ئاوێتە دروست دەبێت. بۆ نموونە پەخشانە شیعر کە دەرەنجامی ئاوێتەبوونی هەندێ ڕەگەزو ئەدگاری هونەریی هەردوو ژانری شیعرو پەخشانە. هەرچەندە بیروڕای جیاواز هەیە سەبارەت بەژانربوونی پەخشانە شیعر، بەڵام پەخشانە شیعر بەژانرێکی سەربەخۆ پۆل بکرێت یان نەکرێت لە ڕووی پێناسەوە لە سنووری چەمکی دەقی ئاوێتە دەرناچێت.

ئەم جۆرە ئاوێتەبوونەش لە ئەدەبی کوردیدا دیاردەیەکی زۆر نوێ نییەو سەرەتاکانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی حەفتاکان(٣٢).

تەوەری دووەم: لە ڕێگای ئاوێتەبوونی ژانرێکی ئەدەبی لەگەڵ هونەرێکی دیکە، شێوەکاری بێت یان وێنەکێشان، کەواتە ئەم جۆرە دەقانە دوو جۆرن.

١- دەقی وێنەیی: لەم جۆرە دەقانەدا پەیڤێک یان چەند پەیڤێک لەگەڵ داڕشتنیاندا وێنەی شتێکی ماددی پێک دەهێنن، بەشێوەیەک پێوەندییەکی سیمانتیکی پەیڤەکان و سیمای گشتیی وێنەکە پێکڤە گرێ دەدات. ئەم جۆرە دەقانە لە ئەدەبی کوردیدا تا ئێستا زیاتر وێنەی شتێکی ماددی بەرجەستەکردووە.

بۆ نموونە: ئەگەر سەرنجی هەر دوو دەقی (پەرداخێک) و (خاچێک) (٣٣) بدەین:




تێبینی دەکرێت لە هەردوو دەقەکەدا وێنەی شتێکی ماددی بەپەیڤ کێشراوەو ناونیشانی دەقەکە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە فۆرمی دەقەکەوە هەیە. بە واتایەکی دی لێرەدا ناونیشانی یارمەتیی چاوو زەینی خوێنەر دەدات لە وەرگرتن و تێگەیشتنی پەیامی دەقەکە، بەڵام مەرج نییە هەموو دەقێکی وێنەیی بەم شێوەیەبێت، بۆ نموونە لە دەقی (خلود)دا ناونیشان ئەم ڕۆڵە نابینێت.




٢- دەقی شێوەکاری شیعرییەتی ئەم جۆرە دەقانە لە ڕێگای یاریکردن بە فۆرمی ڕێنووسی پەیڤەکان و پارچە پارچەکردنیان و جێگۆڕکێی جوگرافیای وشە و ڕستەکان و بەجێهێشتنی بۆشایی و دانانی خاڵ لەگەڵ پەیامگر دەناخڤێت، ئەم کردارەش مەرج نییە وێنەی شتێکی ماددی

پێک بهێنێت... دەقی (بەشێک لە پەرتبوون)ی مەوجوود سامان و دەقی (خاڵی بوونەوەی) زەبەنگ بەهانەددین نموونەیەکی ئەم جۆرەن.



تەوەری سێیەم: هەندێ جار دەقی ئاوێتە بریتییە لە ئاوێتەکردنی پەیڤ و ڕستەکان لەگەڵ کەرەستەو هێماکانی زانستێکی ڕووتدا وەک بیرکاری و ئەندازە و کیمیا. لەم جۆرە دەقانەدا پتر هێما و هێڵ و ژمارە دەبنە جێگری پەیڤ و دەربڕین.

دەقەکانی (پەرگاڵ)ی فەرهاد پیرباڵ و (هیچ)ی زانا خەلیل و(ئاشتی یا ئاشوب)ی ئەحمەد لەتیف خورشید نموونەیەکی دیاری ئەم جۆرە ئاوێتەیەن.







٣- کێشەی ناوو ناسنامەی دەقی ئاوێتە:

بەشێوەیەکی گشتی ناولێنان و دیاریکردنی ناسنامەی ژانرێتیی دەقی ئاوێتە کێشەیەکە لە کێشەکانی تیۆریی نوێی ئەدەب و گوتاری ڕەخنەیی. سیمایەکی ئەم کێشەیە لەوەدا خۆی دەنوێنێ کە ئەم جۆرە دەقانە لە ڕووی پێکهاتنەوە تێکهەڵکێشێکن لە ژانری ئەدەبی و ڕەگەزو ئالاڤی هونەری دیکە یان زانستێکی ڕووت، کەچی هەر بەناوی تەنیا ژانرێکەوە ناوزەد دەکرێن و بڵاودەکرێنەوە. بۆ نموونە دەقی وێنەیی لە گوتاری ڕەخنەی ئینگلیزی و عەرەبی و کوردیشدا پتر لە دوو سێ زاراوەی بۆ بەکار هێنراوە(٣٤). بۆ نموونە لە ڕەخنەی کوردیدا تا ئێستا ئەم زاراوانە بەکار هاتووە: (شیعری بینراو، شیعری کۆنکریتی، تێکستی وێنەدار، شیعری سەیر کراو، دەقی وێنەیی، دەقی نیگار کاری، شیعری شێوەکاری، شیعری وێنەیی، بەرجەستە شیعر) هەڵبەتە بەکارهێنانی هەموو ئەم زاراوەیە بۆ خۆی لە خۆیدا نیشانەی هەبوونی کێشەیەکە. مەسەلەکەش تەنیا بەکارهێنانی زاراوەو ناو نییە، بەڵکو ئەم کرداره لەلایەک ناسنامەی ژانرێکی دیاریکراو بە دەقەکە دەبەخشێت و لەلایەکی دیکەشەوە پەیامگریش تووشی هەڵوێستێکی ناهاوسەنگ دەکات لەوەرگرتن و مامەڵە کردنیدا لەگەڵ دەقەکەدا، چونکە هۆشمەندیی نووسەر بەمەودای ئەو ژانرەی کاری لەناو دەکات خاڵێکی گرنگی بۆ پێوەندیی نێوان دەق و پەیامگر. کاتێ نووسەرێک لەسەر بەرهەمێکی خۆی دەنووسێت (ڕۆمان) یان (شیعر) ئەوا بەم کارەی ناڕاستەوخۆ داوا لە خوێنەر دەکات ئەم بەرهەمەی لەگەڵ بەرهەمەکانی دیکەی ئەم بوارە بەراوردبکرێت. ڕەخنەگری کەنەدی (نۆر سرۆب فرای) دەڵێت: (دەکرێ لە هەر شیعرێک بکۆڵدرێتەوە بەو پێیەی لاساییکردنەوەی چەند شیعرێکی ترە، نەک لاساییکردنەوەی سروشت)(٣٥).

لە ئەدەبی هاوچەرخی کوردیدا هەندێک لە دەقەکانی (فەرهاد پیرباڵ) نموونەیەکی زەق و دیاری ئەم کێشەیەن. (فەرهاد پیرباڵ) خۆی لەسەر دەقەکانی (مانیفێستی دووەمی وێران - سپیاییەکانی ناو ڕەش ڕەشاییەکانی ناو سپی) نووسیویتی (شیعر). هەر خۆشی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (کاروان) هەندێک لەم دەقانەیان - وەک دەقی (ئەو هەشت حەرفەی لە هەموو حەرفێکم خۆشتر دەوێن) - بە چیرۆکیان لەقەڵەم داوە(٣٦).

چەند دەقێکی دیکەی دوو توێی (سپیاییەکانی ناو ڕەش و ڕەشاییەکانی ناو سپی) کە فەرهاد خۆی بە شیعری لەقەڵەمداون لە هەندێ لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیدا بە پەخشانە شیعر دانراون(٣٧). لە ئاست ئەم بەرهەمەی فەرهاد پیرباڵدا هەندێک لە نووسەرانی کورد هەستیان بەم کێشەیە کردووە؛ بۆیە لە باسکردنی بەرهەمی ناوبراودا (عەبدال نووری عەبدال) سەرنجی شاعیر بۆ ئەوە ڕادەکێشێت کە دەبوو ناوێکی دیکەی بۆ بەرهەمەکەی هەڵبژاردایە و ناوی لێنەنایە (شیعر).

بەڵام عەبدال نووری خۆی هیچ ناوو زاراوەیەکی پێشنیار نەکردووە(٣٨). بنچینەی کێشەکە لەوەدایە کەدەقی ئاوێتە هەڵگری ناسنامەی تاقە ژانرێکی دیاریکراونییە، کەچی زۆر جار بەناوی تەنیا ژانرێکەوە ناوزەد دەکرێت، هەر ئەمەشە کێشەو تێکەڵاوی ناوەکەی دروست دەکات، جا لەبەر ئەوەی دەقی ئاوێتە خاوەنی قەوارەو پێکهاتەیەکی نوێیە پێدڤییە ناوێکی نوێی هەبێت. لێرەوە ئێمە زاراوەی (دەقی ئاوێتە) بۆ ئەو دەقانە پێشنیار دەکەین کە جۆرێک لە جۆرەکانی ئاوێتەبوونی لە خۆگرتبێت.

هەر چەندە هەندێک لە ڕەخنەگران پێیان وایە ئاوێتەبوونی دوو ژانری ئەدەبی ژانرێکی نوێی سەربەخۆ پێک ناهێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دان بەسەرهەڵدانی جۆرو چەشنی نوێ دەنێن(٣٩)، کەچی بەلای (جیرار جینیت)ەوە ئاوێتەبوونی ژانرەکان ژانرێکی نوێ پێک دەهێنێت(٤٠). بەهەرحاڵ دەقی ئاوێتە بەژانرێکی سەربەخۆ دابنرێت یان بەچەشن و جۆرێکی نوێ لە هەردوو حاڵەتەکەدا چەمکی دەقی ئاوێتە وەک پێناسە دەیگرێتە خۆی..❖

پەراوێزەکان

........

١- خلدون الشمعة، الشعرية العربية المعاصرة، بحوث مهرجان المربد السابع القسم الثالث، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٦،ل٣.

٢- فاضل ثامر، الصوت الاخر، الطبعة الاولى، دار الشوون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٩٢، ل٢٥٣.

٣- هەندێک لە ڕەخنەگرو نووسەرانی عەرەب وشەکانی (نوع)، (فن)، (شكل) بەکاردەهێنن. بڕوانە: علي جواد الطاهر، مقدمة في النقد الادبي، الطبعة الثانية، بغداد، ١٩٨٣،ل٥٣.

٤- عەزیز گەردی، ئەدەبی بەراوردکاری، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا،١٩٧٨،ل٩٢. هەندێ جاریش بە هەڵە زاراوەی (جۆرەکانی ئەدەب) لە بەرامبەر (ڕێبازە ئەدەبییەکان = المذاهب الادبية) بەکار هێنراوە. بڕوانە: محمد جمل. سەرنجێک دەربارەی جۆرەکانی ئەدەب، بەیان، ژ٤٣، ١٩٧٧ ،ل٣٧،٣٨.

٥- بۆ نموونە: د. شوکریە ڕەسوول، ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، چاپخانەی فێرکردنی باڵا، هەولێر، ١٩٨٩ ،ل١٢،١٣.

٦- محەممەد بەکر، پەخشانە شیعری کوردی، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی پەروەردە، زانکۆی بەغدا،١٩٩٧،ل٢٧.

٧- علي جعفر العلاق، في حداثة النص الشعري، الطبعة الاولى، دار الشوون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٩٠، ل١٥٤.

٨- ڕوویەکی ئەم دیاردەیە بەشێوەیەکی گشتی لە زەمانی گۆڤارو پاشکۆ ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکاندا بەدی دەکرێت. بۆ نموونە:

* (ڕێگا پاشکۆی ئەدەب و هونەری هەفتەنامەی ڕێگای کوردستانە).

* (برایەتی ئەدەب و هونەر).

هەروەها ساڵی (١٩٨٥) گۆڤارێکی بایەخداری ڕەخنەی ئەدەبییە ژمارەیەکی تایبەتی (ژمارە٢) بەناونیشانی (الادب والفنون) لێ بڵاوکرایەوە، تێبینی دەکرێت وشەی هونەر زیاتر بۆ هونەرەکانی دیکەی جیا لە ئەدەب بەکار هێنراوە.

٩- مجدي وهبة، معجم مصطلحات الادب، مكتبة لبنان، بيروت، ١٩٧٤،ل١٩٢.

١٠- رينيه ويلك، اوستن وارين، نظرية الادب، ترجمة محي الدين صبحي، المجلس الاعلى لرعاية الفنون والاداب والعلوم الاجتماعية، دمشق،١٩٧٢، ل٢٩٥.

١١- ڤينست، نظرية الانواع الادبية، ترجمة د.حسن عون، الناشر منشاة المعارف، الاسكندرية، ١٩٧٨، ل٣١.

١٢- جيرار جينيت، مدخل الى جامع النص، ترجمة عبدالرحمن ايوب، مشروع النشر المشترك، بغداد، (د.ت)، ل٧٤.

١٣- مجدي وهبة، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩١.

١٤- فاضل ثامر، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥١.

١٥- خلدون الشمعة، سەرچاوەی پێشوو، ل٣.

١٦- گراهام هو، مقالة في النقد، ترجمة محي الدين صبحي، مطبعة جامعة دمشق، ١٩٧٣، ل١٠٢.

١٧- رينيه ويلك، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠٦؛ ڤينسێنت، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦.

١٨- مجدي وهبة، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩١،٥٩٢.

١٩- م.اوفسيانيكوف، ز.سمير نوفا، موجز تاريخ النظريات الجمالية، ترجمة باسم السقاء، دار الفارابي، بيروت، ١٩٧٥، ل١٧٤،١٧٥؛ کمال مەعروف میراودەلی، فەلسەفەی جوانی و هونەر، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، ١٩٧٩، ل٢٦٦.

٢٠- مجدي وهبة، سەرچاوەی پێشوو، ١٥٣،١٥٤.

٢١- رينيه ويلك، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٣؛ شوقي ضيف، البحث الادبي، الطبعة الخامسة، القاهرة، ١٩٨٣، ل٩٤.

٢٢- رينيه ويلك، مفاهيم نقدية، ترجمة د.محمد عصفور، عالم المعرفة (١١٠)، كويت، ١٩٨٧، ل٣٧٦.

٢٣- محمد حافظ ذياب، طوبوغرافيا النص الشعري، المنار، العدد، (٥١)، ١٩٨٩، ل١١٠.

٢٤- ڤینسێنت، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٤٦-٥١.

٢٥- توماس مونرو، التطور في الفنون، ت:محمد علي ابو درة و اخرون، الجزء الاول، الهيئة المصرية العامة للتاليف والنشر، ١٩٧١، ل٣٦،٣٧؛ مجدي وهبة، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٩٢.

٢٦- هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٢٧- مالكم برادبري، جيمس ماكفارلن، الحداثة، ت: مؤيد حسن فوزي، الجزء الاول، دار المامون للترجمة والنشر، بغداد، ١٩٨٧، ل٢٣٥،٢٣٨،٢٥٥،٣٠٠.

٢٨- محمد هدى الطرابلسي، مستقبل الاجناس الادبية، بحوث المؤتمر العام الخامس عشر للادباء والكتاب العرب، الجزء الاول، مطابع دار الثورة، بغداد، ١٩٨٦، ل٢١١؛ تودوروف، اصل الاجناس الادبية، ت: محمد برادة، الثقافة الاجنبية، العدد (١)، ١٩٨٢، ل٤٤.

٢٩- رينيه ويلك، مفاهيم نقدية، ل٣٧٦.

٣٠- تودوروف، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٥،٤٩.

٣١- جيرار جينيت، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٢.

٣٢- بۆ لێکۆڵینەوەی سیماو ئەدگاری زمانەوەری و تەکنیکی پەخشانە شیعری کوردی بڕوانە: محەممەد بەکر، سەرچاوەی پێشوو.

٣٣- دەقی (پەرداخێک، (بەشێک لە پەرتبوون) لە گۆڤاری وێران ژ (٣-٤)ی ١٩٩٦ و دەقی (خاچێک) لە ڕامان ژ (٥)ی ١٩٩٦ و دەقی (خلود) لە گۆڤاری (ڕامان) ژ(٤)ی ١٩٩٦، دەقی (شەر یا ئاشوب) لە ژمارە (٥)ی گۆڤاری وێران، ١٩٩٧، دەقی (پەرگاڵ) لە کتێبی (سێبایەکانی ناو ڕەش و ڕەشاییەکانی ناو سپی) وەرگیراوە.

٣٤- د.محمد حافظ ذياب، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٢.

٣٥- خلدون الشمعة، سەرچاوەی پێشوو، ل٦.

٣٦- ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر، ژ (١٠٨)، ١٩٩٨/٨/٢٥، ل٨.

٣٧- بۆ نموونە بڕوانە: محەممەد بەکر، سەرچاوەی پێشوو.

٣٨- عەبدال نووری عەبدال، پیربال نوێخوازو پێگیرە دنێک دەم دە، پەیڤ، ژ (١١)، ١٩٩٩، ل٢٦.

٣٩- يا.اي.اسبورگ واخرون، موسوعة نظرية الادب ، ترجمة جميل نصيف التكريتي، القسم الاول، الطبعة الثانية، بغداد ، ١٩٨٦، ل١٠.

٤٠- جيرار جينيت، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٢.

# سەنتەریزمی شارستانی و ڕەهەندی گەمارۆی کولتوورەکان



عومەر عەلی محەمەد
(سلێمانی)

گەڕان بە شوێن دابین کردنی ئاسایش و پێکەوە ژیان و پەیڤینی کولتووره جیاوازەکان خەونێکی لەمێژینەی گەلان بووەو هەردەم بیریان لەوە کردۆتەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان هۆکارەکانی توندوتیژی کۆتاییان پێ بێت و لەسەر بنەمایەکی مرۆڤ دۆستانە بتوانن پێوەندییەکانیان دابڕێژنەوە، بۆ ئەوەی لە ئەم ڕێگەیەوە مرۆڤ بوون ببێتە سەنتەری دارشتنەوەی پێوەندییەکان و بە چاوێکی ڕێزەوە مامەڵە لەگەڵ کولتووره جیاوازەکان بکرێت. بەمەش دێوەزمەکانی ترس و مەترسییەکانی شەڕو کاولکارییە جۆر بەجۆرە مەترسیدارەکان کۆتاییان پێ دێت، ئەمەش کاتێک دەبێت کە شارستانییەتی سەنتەر بە جۆرێک گوزارشت لە چەمکەکانی بکات کە چەمکێکی مرۆیی بن و بەهاوکاری هەموو شارستانییەتە جیاوازەکانیش بەرهەم هاتبێت، چونکە ئەگەر پەیڤین لەلایەن شارستانییەتی باڵاوە دانی پێدا نەنرێت، ئەوا بانگەشە بۆ ئەم پرەنسیپە هەرچەندە ئەوپەڕی مرۆییش بێت هیچ ڕەنگدانەوەیەکی لە واقیعدا نابێت، بەڵکو جارێکی تر (منی باڵا) خۆی دەخاتەوە قاڵبێکی ترو لە شێوەی جۆرە دەسەڵاتێکی تردا دەیەوێت لە واقیعدا خۆی زاڵ بکات، بەمەش خوێندنەوە دووالیزمەکان سەرهەڵدەدەن و بەشێوەیەکی ئەبستراکت مامەڵە لەگەڵ مێژوو و ڕووداو و گۆڕانەکان دەکات. هەر لێرەشدا خوێندنەوە ڕەگەزی و جوگرافی و شارستانییەکان سەرهەڵدەدات کە سیاسەت ڕابەرایەتی دەکات و جوانی ماناکانی پێکەوە ژیان و هاوکاری دەشێوێنێت، لە جێگەیدا کودەتاو جەنگەکان و شەڕەکانی ناوخۆ سەوز دەکاتەوە، چونکە لە جیاتی گەڕان بە شوێن مانا جوانەکانی ژیان لە پێکەوە ژیان و یەکتر خوێندنەوەو قووڵ کردنەوەی ماناکانی ئازادی، بەرژەوەندیی گرووپەکان و ڕەگەزەکان دەخوێنێتەوە. لێرەشەوە، تارمایی لەسەر وێنە جوانەکان دروست دەکات و دێوەزمەکانی ژیان لە برسییەتی و نەبوونی و کوشتار زیندوو دەکاتەوە.

کۆتایی هاتنی جەنگی سارد لەلای زۆر لە گەلانی جیهان، وەک هیوایەکی گەورە دەبینرا کە بتوانرێت کۆتایی بە نیو سەدە کاولکاری و وێنەی دزێو مێژوویەکی پڕ کارەسات بهێنێت. لە بەرامبەردا بتوانرێت جیهانێکی پڕ لە ئاسایش و ئارامی و خۆش گوزەران دابین بکرێت، بەڵام مەخابن جارێکی تر سەرهەڵدانەوەی تیۆرە نوێیەکان مژدەی هێنانی سەدەیەکی نوێی لە ڕەگەزپەرستی و کوشتارو نەهامەتی ڕادەگەیاند کە ئەویش شێوازی جۆراوجۆری لەخۆ دەگرت.

فرانسیس فوکویاما لە ساڵی (١٩٨٩) لە سەرەتای شکستی بلۆکی ڕۆژهەڵات بوو، دەیەوێت ڕاڤەیەکی سەرکەوتنی «منی باڵا»ی ڕۆژئاوایی بکات و هەر لێرەوە بە سەنتەری بوونی ڕۆژئاوایی لە شارستانییەت و کولتوورو مێژوو و بەهاکان ڕادەگەیەنێت. بەجۆرێکی ڕەها دەچێتە چەقی ڕووداوەکان و ئایندەش وەک حەتمییەتێکی مێژوویی دەخوێنێتەوە، دەیەوێت ئێستاو مێژوو پێکەوە گرێ بدات. هەر لێرەوە باس لە ڕەوشی ئایندەی مرۆڤایەتی بکات و چەقی مرۆیی بوون و پێشکەوتن و جووڵە لە ڕۆژئاواو شارستانییەتییەکەیدا دیاری دەکات، چونکە لەو ڕوانگەوە سەیری دەکرد کە بلۆکی ڕۆژهەڵات وەک نیکسۆن دەڵێت: ئیمپراتۆریەتی شەڕ بوو، واتە ڕەمزێکی دزێو بوو، هێما بوو بۆ هەموو ناهەمواری و ناکۆکی و شەڕو ململانێیەکان، ئەو لە بەرامبەردا هیچ وێنەیەکی جوانی نەدەبینی، نەیدەتوانی دان بە خاڵە هاوبەشە مرۆییەکاندا بنێت، بەڵکو بەردەوام دەیویست وێنەکانی ئەو لە سەرچاوەی شەڕو نامۆبووندا بنەخشێنێت. ئەمەش ئەو گوتارە سیاسییە بوو کە پێوەندی کۆمەڵگاکانی سیخناخ کرد بە جەنگ و کوشتارو ڕق بوونەوە لەیەکتر. هەرچەند خوێندنەوەی بەرامبەرە ڕۆژهەڵاتیەکانیش کەمتر نەبوو لە دزێوکردنی بەرامبەردا کە دەیویست بڵێت (ئەوان) ڕەمزی برسییەتی و چەوسانەوەو قۆرغ کردنی سامان و ئیمپریالیەتی جیهانین.

کۆتایی هاتنی جەنگی سارد ڕزگاربوون بوو لە وێنەیەک لە شەڕەکانی ئەو لایەی کە کاراکتەرێکی گەورە بوو لە تاکرەوی و دیکتاتۆریەت و توندوتیژی، بەڵام لە جێگەیدا نەیانتوانی تیۆرێکی نوێ پێشنیار بکەن بۆ پێکەوە ژیانی نەتەوەکان.

پەترۆس پەترۆس غالی دەڵێت: (زۆر لە دەوڵەتان لەو بڕوایەدا بوون کە لە دوای کۆتایی هاتنی شەڕی سارد، جۆرێک لە ئارامی باڵ بەسەر جیهاندا دەکێشێت، بەڵام واقیع پێچەوانەی ئەوەی خستەڕوو، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە شەڕی سارد کۆتایی پێ هات، بەڵام ئێستا ئێمە بەرەو ڕووی سێ جەنگی تر بووینەوە لە جیهاندا، ئێستا جیهان بەباروودۆخێکی زۆر ناهەموارتردا تێپەڕ دەبێت، وەک لەوەی لەشەڕی ساردا هەبوو. نەتەوە یەکگرتووەکانیش ناتوانێت چارەسەری هەموو



فوکویاما

گرفتەکان بکات)(١).

ئەمەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە بەرژەوەندی جێگەی چەمکە مرۆییەکان و چەسپاندنی مافەکانی مرۆڤی گرتەوە.

فوکویاما وای لێکدایەوە کە کۆتایی هاتنی جەنگی سارد، تەنیا شکستی یەکێتی سۆڤیەت نەبوو، بەڵکو کۆتایی مێژوو بوو، واتە گەشەسەندنی پەرەسەندنی ئایدۆلۆژیای مرۆڤایەتی بەکۆتاییەکەی و سەرکەوتنی کۆتایی بۆ لیبرالیزمی ڕۆژئاوایی و شارستانییەتەکەی بوو، ئەم سیستەمەی ڕۆژئاوایی بە سیستمی دوارۆژ و دوا سیستم لە قەڵەم دا. ئەمەش پێچەوانەی چەمکی گۆڕانی کۆمەڵایەتی بوو، کە ناکرێت ڕەورەوەی مێژوو ڕابوەستێت، بەڵکو دەبێت بەردەوام ژیان لەنوێ بوونەوەدا بێت، هەروەها سەرکەوتنی ڕۆژئاوا لە ململانێیەکی سیاسی لە ماوەیەکی مێژوویی دیاری کراودا، هەرگیز نابێتە مایەی ئەوەی کە حەتمییەتێکی مێژوویی لە ئایندەدا دروست بکات، چونکە هەر ئەم جۆرە بۆچوونە بوو کە مارکسیزمی تووشی هەرەس کرد کە بەشێوەیەکی ڕەها مامەڵەی لەگەڵ فیکری فەلسەفی و مێژوودا دەکرد.

فوکویاما لە تیۆری کۆتایی مێژوودا دەڵێت: (هەموو ئەو شتانەی کە بەرەو ڕووی لیبرالیەت بوونەوە شکستیان خوارد، شکستی بلۆکی ڕۆژهەڵات تەنیا کۆتایی شەڕی سارد نەبوو، بەڵکو کۆتایی مێژوو، واتە لوتکەی باڵای پێگەیشتووی ئایدیۆلۆژیای مرۆڤایەتییە. بەو مانایەی کە لیبرالییەت تەنیا دەستکەوتی مێژووی مرۆڤایەتییە)(٢)

بەمەش ڕەگەزی ڕۆژئاواو شارستانییەتەکەی دەکرێتە سەنتەرو جۆرێک لە پیرۆزی وەردەگرێت. ئەمەش گەڕانەوەیە بۆ مێژوویەک کە ململانێیەکی خوێناوی دروست کردووە، چونکە ئەگەر دوێنێ کەنیسە ڕابەرایەتی چەمکە پیرۆزەکانی دەکردو دژایەتی هەموو عەقڵ و پێشکەوتنێکی دەکرد. لە ڕوانگەی پیرۆزییەوە شەرعیەتی دەدا بە کوشتاری دەرەوەی خۆی و دەرەوەی دەقە پیرۆزەکان، بەمەش چەندان سەدەی لە تاریکی و نەفامی و دواکەوتوویی دروست کرد. گێڕانەوەی ئەم چەمکەش لە دوای ڕۆشنگەری و مۆدێرنیزم بۆ سیستمێکی ئایندەی ژیان، گەڕانەوەیە بۆ ئەو چەمکی بە پیرۆز کردنە کە ماناکانی فرەیی و جوێنی و نە یەکتر گەیشتن و یەکتر خوێندنەوە دەگرێت و لێرەدا سیستمێکی تایبەتی ژیان دەبێتە دەقێکی ئەبستراکت و ئازادییەکانی ڕۆح سنووردار دەبن و سنوورەکانی ناتوانێ بگاتە سنووری مرۆڤایەتی، چونکە ئەو بۆچوونە کە دیوە ئاشکراکەی بریتییە لە وەسفی منی باڵا، دیوەکەی تری گوزارشتە لە ئەوی بەرامبەر کە ناتوانێت هەنگاو بەرەو بەرزی بنێت و پێش بکەوێت و دەبێت هەر لە بازنەکانی دواکەوتوییدا هەنگاو بنێت.

د. ئەبووبەکر قادر لەکۆبوونەوەی شاری «جنادریە» کە تایبەت بوو بە توێژینەوە لەسەر تیۆری کۆتایی مێژووی فوکویاما و لەم بارەیەوە دەڵێت: (فوکویاما مێژووی بەکارهێناوە بۆ گەیشتن بە مێژوو کە تێیدا دەیەوێت بگات بە نموونەی باڵا لە مێژوودا، ئەمە تەنیا بۆچوونی فوکویاما نییە، بەڵکو چەندان کەسی تریش پێش ئەو باسی ئەم تیۆرەیان کردووە. وەک کۆنت کە مرۆڤایەتی دەکات بەسێ قۆناغ، هەر یەکەیان قۆناغی پێش خۆی ناهێڵێت لە قۆناغی سێیەمدا مرۆڤایەتی دەگاتە باڵا)(٣)

مارکس-یش هەمان بۆچوونی هەبوو، دەیویست بگاتە کۆتایی مێژوو لە کۆتا قۆناغدا مۆژدەی دروست بوونی کۆمۆنیزم و دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاو دەسەڵاتی کرێکاران ڕادەگەیەنێت کە ئەویش دەیەوێت، لێرەدا مێژوو ڕەورەوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی بوەستێنێت، ئەمەش قۆناغی هەرەسی وێنەکانی تر دەگەیەنێت کە لە بەرامبەر ئەودا ناتوانن بوەستن کە تێیدا هەموو سیفەتەکانی بەرزی و بڵندی و خۆش گوزەرانی تێدا کۆ دەکاتەوە؛ بە ملیۆنان مرۆڤ کەوتنە شوێن ئەم دروشمە سەرابیەو خەباتیان بۆ کرد لە پێناوی گیانیان بەخت کرد. سەدان ملیۆن دۆلارو دەیان ملیۆن مرۆڤ کرانە سوتماکی بەردەم ئەم تێزە ئایدیالیستیانە، چونکە حەتمیەتی مێژوو شکستی خواردو خوێندنەوە ڕەهاکان بێ ناوەڕۆک بوون و سەر ئەنجام ڕاستییەکان لە واقیعدا بوونی خۆیان سەلماند.

ئەم تیۆرە کە لە ڕووی فیکرییەوە دەیەوێت، شێوازێکی فەلسەفی لەخۆ بگرێت، بەڵام لە ڕوویەکی ترەوە، خوارکردنەوەی ڕەوتی بەرەو پێش چوونی فەلسەفەی فیکرە بۆ واقیع و سیستمێکی سیاسی دیاری کراو کە ئەمریکایە، واتە دەیەوێت ڕابەرایەتی کردنی جیهانی ئەمریکی بخاتە واقیعێکی مێژوویی فیکرییەوە، بەجۆرێک کە لە هەموو ڕوویەکەوە، وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە. بۆ ئەوەی ئەمریکا ڕابەرایەتی نەزمی نوێی جیهانی بکات و لێرەشەوە ببێتە سەنتەری بیرو فەلسەفەو ڕۆشنبیری کە ئێستا لە وێنە جیاوازەکانی (بەجیهانی کردن)دا دەردەکەوێت، واتە وەک بەشێک لە بەئەمریکایی کردنی جیهان دەربکەوێ. بەمەش ئەم تیۆرە تەمەن کورت دەبێت، چونکە لەگەڵ هەر ڕووداوێکی سلبی بەرامبەر ئەمریکا لەناوخۆ و دەرەوەدا کە شکست بە هەندێک سیاسەتی بدرێت، تیۆرەکەش سنووردارو لەکەدار دەبێت.

فرانسیس فوکویاما کە تیۆرنووسێکی ئەمریکی بە ڕەگەز یابانی-یە، پاش نووسینی تیۆری «کۆتایی مێژوو» ناوبانگێکی زۆری پەیدا کردو دەنگی دایەوە، ئەم وتارە کاردانەوەیەکی زۆری لە وڵاتانی جیهانیشدا بەخۆوە بینی.


هیگڵ

سەرئەنجام فوکویاما بۆ ڕاڤەکردنی بیروڕاکانی خۆی کتێبێکی نووسی بە ناوی کۆتایی مێژوو و دوایەمین مرۆڤ، سەرەڕای گرنگی ئەم بۆچوونەی فوکویاما لە ڕووی تیۆرییەوە کە چەند ساڵێک ڕاوێژکاری وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی بووە. لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین کە وتەبێژی دیبلۆماسی بەرەی نوێیە، کرۆکی سەرەکی بیروڕاکانی فوکویاما دەتوانێت بەکورتی بڵێین کە: (دیموکراسی لیبرالی دوایەمین شێوازی بەڕێوەبردنی حکومەتە بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی. ئەو بۆ سەلماندنی بیروڕاکانی، دەستی داوەتە هێنانەوەی زنجیرە بەڵگەیەکی تیۆری کە سوودی لە بەڵگە مێژووییەکان وەرگرتووە، بەتایبەتی لە مێژووی نوێدا. کتێبەکەی سەرەڕای ئەوەی بەشێکی زۆری بۆ ڕووداوەکانی ئەم دواییەی نێو دەوڵەتی تەرخان کردووە، بەڵام نەی ویستووە باس لە کۆتایی شەڕی سارد بکات)(٤)

(نووسەری ئەم کتێبە هەروەکو هیگڵ و مارکس لەو بڕوایەدان کە گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤایەتی بێ کۆتایی نییە، بەڵکو ئەم گۆڕانانە سەرئەنجام دەوەستێت، کۆتایی مێژووش کاتێک دەبێت کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بگاتە شێوازێک کە هەموو پێویستییە بنچینەییەکانی بۆ دابین بکرێت. ئەم قۆناغەش لای هیگڵ دەوڵەتی لیبراڵ و لای مارکس کۆمەڵگەی کۆمۆنیستییە. لێرەشدا لای ئەوان مێژوو کۆتایی پێ دێت)(٥)

ئەوەی فوکویاما دەیڵێت شتێکی تازە نییە، بەڵکو جارێکی تر خستنەوە ڕووی تیۆرەکەی هیگڵ-ە کە باس کردنە لە دیموکراسییەتی لیبرالی. ئەمەش وا ڕاڤە دەکاتەوە کە گۆڕانە جەوهەرییەکان دەوەستن و لێرەوە گۆڕانکاری تەنیا دەچێتە قاڵبێکی سادەو ڕووکەش. ڕووە ئابوورییەکەشی باس لە بازاڕی ئازاد دەکات و پەیوەستی دەکاتەوە بە پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی لە ڕۆژئاوادا، لێرەشەوە گرنگییەکی زۆر لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی دەگێڕێتەوە بۆ ئابووری، ئەمەش چوونە سەر تیۆری مارکسیزمە لە ئابووریدا، بەڵام ئەو سەر ئەنجام لە خزمەت لیبرالیزمدا بە کاری دەهێنێت.

ناتوانین ئەم جۆرە بۆچوونانە بەشێوەیەکی دابڕاو سەیر بکەین لە مێژووی کولتووری ڕۆژئاوایی، بەڵکو لە ڕۆژئاوادا گۆڕانی کۆمەڵایەتی و ڕەوتی بەرەو پێش چوونی ڕەوتی فیکری، بەچەند هەنگاوێکی قۆناغبەندیدا دەڕوات و لە ڕابردووەکانی خۆی دانابڕێت، هەر لەم ڕووەشەوە دەیەوێت ڕوویەکی بەجیهانی بوو بەتێزو بۆچوونەکانی ببەخشێت کە پشت بە دوو بنەمای سەرەکی دەبەستێت.

(یەکەمیان: گەڕانەوەیە بۆ سنوورەکانی جیهانییەتی هیلینی کە توانی بووی هەموو شارستانییە تەقلیدییە هەرێمایەتییەکانی ڕۆژهەڵات لەخۆ بگرێت، ئەوانەش کە دەکەونە باکووری دەریای ناوەڕاست، ئەمەش بە یەکەم جیهانیی بوون دەژمێردرێت، بەهۆی جەمسەرگیری فراوانییەوە کە لە هێرشەکانی ئەسکەندەری مەکەدۆنی دەست پێ دەکات (٣٥٦-٣٢٣ پ.ز). دووەمیان: شارستانییەتی ڕۆمانی کە لە دوای شارستانییەتی هیلینی هاتووە. لەو کاتەشەوە دەستی کردووە بە فراوان بوون لە دەریای سپی ناوەڕاستدا لە ساڵی (٢٠١ پ.ز)و پاشانیش دەست گرتنی بەسەر ڕۆژهەڵاتدا)(٦)

(هەردوو شارستانییەتی ڕۆمانی و هیلینی بە پەیڕەوێکی دروست کراو جیادەکرێنەوە کە کولتوورێکی ئایینی تێدا ڕەنگ دەداتەوە کە پشت بەهێزی خوای ئۆلمپ دەبەستێت، واتە ئایینێکی یەکتایی نییە، خوای ئۆلمپ تایبەت بوو بە ئەسیناو پشتی بەهێزی قەیسەرە ناودارەکان لە ڕۆما دەبەست، ئەمەش پێش ئەوەی ڕۆما بڕوا بە لاهووتی مەسیحی بکات کە لە پاشاندا پێی گەیشت کە بە شێوەی خوایەکی جەستەدار بوو، واتە ئەو خوایە تایبەتمەندییەکانی لەخوای ئۆلمپ و قەیسەرەکان وەردەگرت)(٧)

هەر لێرەوە مەسیحییەت لەسەر دەستی ڕۆژئاواییە ئەورووپییەکان گۆڕا بە وێنەیەکی بارکراو بە پاشماوەکانی هیلینی و ڕۆمانی، واتە تێکەڵ بە کولتووری ڕۆژئاوا بوو، هەر ئەمەش وای کرد کە دواتر ڕەهەندێکی جوگرافی وەربگرێت و لەگەڵ ڕۆژئاوادا باس لە مەسیحییەت بکرێت و پابەندیش کرایەوە بە ماوەیەکی مێژوویی دیاری کراوی ڕۆژئاوا. واتە لێرەوە مەسیحییەت وێنەیەکی تری بۆ دروست کرا، چونکە لە چەمکە لێبووردەیی و ئارامبەخشی و سۆزەکانی لادراو کرا بە دروشمی کۆمەڵێک بەرژەوەندی ڕەگەزپەرستی خوێناوی کە لە جەنگی خاچپەرستیدا دەبینراو پاشانیش هێزەکانی ئیمپریالیزم خۆیان بە هەڵگری ئەم دروشمانە دەزانی.

هەردوو شارستانییەتی هیلینی و ڕۆمانیش یەک جۆر تێڕوانینیان بۆ مرۆڤ هەیە، ئەویش ڕێگەدانە بەکۆیلەکردنی مرۆڤ بە سیفەتی ئەوەی کە وزەیەکی کارەو دەبێت دەستی بەسەردا بگیرێت بەبێ کرێ. دەبێت بکرێتە هێزێکی دەستەمۆکراو لە تێڕوانینی ئەسیناو ڕۆماوەو باشترین کۆیلەش لە بۆچوونی ئەواندا، ئەوەیە کە لە بەرەکانی جەنگدا ململانێ بکات. ڕۆژئاواییە مۆدێرنیتەکانیش جێگرەوەی ئەو دوو شارستانییەتەن کە تێیدا تێڕوانینیان بۆ مرۆڤ لەدەرەوەی خۆیاندا زۆر نەگۆڕاوە کە ئێستا بەجۆرێکی تر مرۆڤ دەستەمۆو کۆیلە دەکات کە لە ژێر سێبەری تەکنۆلۆژیاو شۆڕشی زانیاریدا بواری بۆ دەگونجێنێت. ئەمە بە ئاشکرا لە ئامانجەکانی بەجیهانی کردنی نوێ دەبیندرێت بەتایبەتی لەبواری ئابووریدا کە دەیەوێت هەموو گەلانی جیهان بکاتە کرێکار لە کارگەکانی

خۆیداو خزمەت بە شارستانییەتەکەی ئەو بکەن یان لە شێوازی مامەڵەیان لەگەڵ پەنابەرەکاندا کە لە زۆر وڵات سوکایەتییان پێ دەکرێت و کۆمەڵە کارێکیان پێ دەسپێرن کە خەڵکی سادەی خۆیان نایانکەن. لەلایەکی تریشەوە کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکان ئەو ڕۆڵە دەگێڕن کە ئیفلاس بە پرۆژەکانی ناوخۆ بکەن و وەبەرهێنان بەتەواوی کۆنترۆڵ بکەن و سەربەخۆییەکانی ئابووری شپرزە بکەن، ئەمەش بەئاشکرا لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا دەبینرێت، چونکە ئەوان ئامادە نین جیهانەکانی دەرەوەی خۆیان بگەیەننە ئاستی خۆیان، بەڵکو دەبێت هەمووی لەخزمەت یەک شارستانییەت و کولتووردا بن کە ڕۆژئاوایە. ئەمەش تەنیا هەڵوێستێکی خەڵکی سادەو بەوژەوەندی خواز نییە، بەڵکو گوتارێکی ئەکادیمیەو لەناوەندە ستراتیژییەکاندا باسی لێ دەکرێت و ناوەندەکانی زانکۆو پەیمانگاو پرۆسەی پەروەردە لەسەر ئەم جۆرە بۆچوونە بنیات نراوە. لەبەرئەوە ئەم گوتارەش ڕەگەزپەرستییەکی نوێ بەرهەم دەهێنێتەوە کە ڕەگەزپەرستی شارستانی و کولتووریە.. ئەمەش وا دەکات کە گەلانی دەرەوەی ڕۆژئاوا بخاتە دەرەوەی پرۆژەکانی خۆی، زۆرجار عەقڵی ڕۆژئاواش بە عەقڵێکی کارامەو پێشکەوتووتر دەزانێت لە دەرەوەی خۆی یان دواکەوتن پەیوەست دەکاتەوە بە باری جوگرافی و کەشو ئاو و هەواوە.

ئەگەر توێژینەوەیەکی ورد بکرێت و لە دەرەوەی ڕۆژئاواوە سەیری بکەین، ئەوا هەڵوێستەکان بە ڕوونی دەبینرێت کە ڕەنگدانەوەی کولتووره مێژوویيەکەی خۆیەتی و ئەو کاتە ئەوەت بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئایا بۆچی بەردەوام کە باس لە کولتوورەکانی دەرەوەی ڕۆژئاوا دەکرێت، لە شێوەیەکی شێوێندراو و سەرەتایی و دواکەوتوو لە قەڵەم دەدرێت، چونکە عەقڵی ڕۆژئاوایی ناتوانێت بڕوا بە بوون و چەسپاندنی شتێک بکات تەنیا لە ڕێگەی بەهیچ کردنی بەرامبەرەوە نەبێت و بوونی «خۆیشی» تەنیا لە ڕێگەی ئەوەوە دەبینێت (ئەمەش هەر لە کۆنەوە شتێکی زانراوە لە فیکری ڕۆژئاوادا. لە فەلسەفەی یۆنانیدا بارمنیدس نەیتوانیوە باس لە «بوون» بکات تەنیا لە ڕێگەی نەبوونەوە نەبێت یان باس لە کۆتایی بکات تەنیا لە ڕێگەی بەردەوامییەوە نەبێت.

لە فەلسەفەی تەقلیدی ئەورووپیشدا هیچ کردن ڕۆڵێکی گرنگی هەیە چەسپاندن ڕووندادات تەنیا لە ڕێگەی هیچ کردنەوە نەبێت، منیش ناناسرێت تەنیا لە ڕێگەی بەرامبەرەوە نەبێت، هەروەک سارتەر دەڵێت:

بەرامبەر پێویستە بۆ سەلماندنی بوونی من.

بەشێوەیەکی گشتی عەقڵی ئەورووپی ناتوانێت جیهان ببینێت تەنیا لە ڕێگەی بەیەک گەیشتنی لایەنەکانەوە نەبێت، وەک بەیەک گەیشتنی من و ئەوی دیکە. بەم شێوەیە ئەوە ڕەنگی داوەتەوە لە میسالییەتی هیگڵ و ماددییەتی مارکس و بوونایەتی سارتەر یان هەر مەزهەبێکی فیکری تری ڕۆژئاوا، چونکە بوون ئەگەر میتافیزیکی بێت یان کۆمەڵایەتی یان سایکۆلۆژی، بەشێوەیەک سەیری دەکرێت کە ململانێی نێوان دژەکانە. هەروەها لاهووتی مەسیحیش بەهەمان شێوەیە کە بەراورد دەکات لە نێوان تاوان و ڕزگار بوون یان باوک و



مونتسکیو

کوڕ)(٨)

هەر لەم ڕوانگەیەشەوە دەبینین کە بۆ سەلماندنی بوونی خۆی پەنا بۆ هەموو جۆرە شێوازێک دەبات، بەتایبەتی لە ڕووی تێڕوانینی بۆ چەمکی هێز کە بەردەوام ویستوویەتی لە دەستی خۆیدا بێت.

هیگڵ لە فەلسەفەکەیدا فەلسەفەی جەنگ و هێز تێیدا (چەمکی ئیرادەی ئازاد لەلای دەگۆڕێت بۆ چەمکی هێزو دەسەڵاتی دەوڵەت کە سەرەکیترین ئەرکی دەبێتە پارێزگاری کردن و پاراستنی لە تێداچوون کە لێرەدا دەوڵەت دەبێتە تەنیا ئیرادەو بێجگە لە یاساو دەستوورەکانی ئەو بڕوا بە هیچی تر ناهێنێت. لێرەشدا چەمکی سیاسەت دەبێتە سیاسەتی هێز، نەک باشی و چۆنییەتی و ململانێ لای ئەو دەبێتە ململانێی هێز بۆ تێکشکاندنی بێ هێزەکان، بۆ ئەوەی پارێزگاری لە بوونی خۆی بکات)(٩)

پاشان بۆ خوێندنەوەی دەرەوەی خۆی زیاتر ڕەنگدانەوە لەلای هەندێک نووسەری تر دەبینرێت کە دەیەوێت چەمکەکانی دواکەوتن قووڵ بکاتەوەو تانەت وەک بەر ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمیش لە قەڵەمی بدات. بۆ ئەوەی دواکەوتن لە دەرەوەی ڕۆژئاوادا بکاتە خاڵی نەگۆڕ.

(لەم ڕووەوە فەلسەفەی هیردر جەخت دەکاتەوە لەسەر «سەنتەریەتی ڕەگەزی ئەورووپی» کە لە شێوەیەکی ڕەگەزپەرستی و لایەنگیری و بوغزدا دەیخاتە ڕوو، لەوێدا هیردر دەیەوێت بڵێت کە ڕەگەزەکانی مرۆڤایەتی یەکسان نین لە کاریگەربوون بە ڕواڵەتەکانی مەدەنیەت و لەوەرگرتنی بنەماکانی شارستانییەتدا. هیردر لەو باوەڕەدایە کە هەندێ ڕەگەزی مرۆڤایەتی بۆ پێشکەوتن دروست بوون و هەندێکی تر لە پێناو تێداچوون و دواکەوتوویيدا دروست بوون. ڕەگەزە دواکەوتووەکان دەبێت لە ڕەوتی شارستانیدا بە هەمان شێوە بمێننەوە، چونکە ناتوانن پێشبکەون و تەنیا لەو باوەڕەدا دەبن و هەر لەسەر ئەم بنەمایە هیردر باس لەوە دەکات کە ڕەگەزی ئەڵمانی باشترین و پێشکەوتووترین ڕەگەزی مرۆڤایەتییە کە ڕێزی گەورە لە هەموو پێشکەوتنێکدا بۆی دەگەڕێتەوەو پوختەی ئەم تیۆرەش لە بۆچوونەکانی تشمبرلن-دا ڕەنگ دەداتەوە کە

دەڵێت: چارەنووسی هەموو شارستانییەتە مرۆڤایەتییەکان پەیوەستە بە پوخت مانەوەی ڕەگەزی ئاری «ئەڵمانی». هەر لەسەر بنەمای ئەم بۆچوونانە، پۆلینێکی کردووە بۆ شارستانییەکان کە تێیدا لەسەرەوە ڕەگەزی ئەڵمانی داناوەو لە خوارەوەش عەرەب و جوولەکەو زنجییەکان)(١٠)

هیردر لە ڕوانگەی تێڕوانینی بۆ فەلسەفەی کانت کە لە تیۆری یاساکانی جووڵەی نیوتن وەری گرتووە، ویستی مانایەکی تر بە یاساکە ببەخشێت بە تایبەتی لە تێڕوانینی بۆ پێشکەوتن.. ئەو وتی هەموو گەلان بەجیاوازیی ڕەگەزیانەوە، ئەندامی کۆمەڵەیەکی گەورەترن، ئەمەش هیچ نییە تەنیا ساتەوەختێکی پەرەسەندنی مرۆڤ نەبێت. ئەو پەرەسەندنەی کە ناوەندی سروشتی ڕۆڵی ڕەگەزی سەرەکی و چالاکی تێدا دەبینێت و لە تێڕوانینی ئەودا ڕۆژئاوا خۆشترین ناوەندی سروشتییە لەسەر رووی زەوی. ئەویش بەهۆی ئەو تایبەتمەندییە جوگرافی و ئاوو هەواییەی کە هەیەتی، ئەمیش بووەتە هۆی ئەوەی دەرکەوتنی باشترین ڕەگەزی مرۆڤی تێدابێ. لەبەر ئەوە تەنیا ئەم شوێنە شانۆی شارستانییەتی مرۆڤایەتی بووە. ئەو شارستانییەتەی کە ڕەمزی تەنیا پێشکەوتن بووەو شارستانییە کۆنەکانی تری وەک چین و هیندو ئەوانی تر هیچ پێشکەوتنێکی مێژووییان بە خۆیانەوە نەبینیوە، چونکە هەموو شتێک لای ئەوان وەستاو بووەو ئەو گۆڕانانەش کە تێیاندا هەبووە، نەبووەتە هۆی هیچ پێشکەوتنێک، بەڵکو وەک جووڵەیەک وا بووە لە هەمان شوێن بە دەوری خۆیاندا، ئەمەش بە پێچەوانەی ئەوروپاوە کە بنکەی پێشکەوتن و جووڵەی مێژوویی و گەشەسەندن بووە. هیردر ئەمە دەگێڕێتەوە بۆ کاری سروشت، چونکە هەروەک زیندەوەران هەریەکەیان تایبەتمەندیی خۆی هەیەو گیانەوەرو رووەک و مرۆڤ لە یەکتر جیاوازن، هەر بەو جۆرەش ئەوروپا جیاوازە لەدەرەوەی خۆی لە رووی شارستانییەت و پێشکەوتندا)(١١)

مونتسکیۆ باوەڕی وایە کە باشوور مۆڵگەی تەمبەڵییە، ئەویش بەهۆی ئەو گەرمییەی کە هەیەتی و باکووریش مۆڵگەی کارو چالاکییە بەهۆکاری ئەو بارودۆخە ساردەی کە هەیەتی. نموونە هیندستان دەهێنێتەوە کە لە باشووردایە و دەڵێت: (دیمەنە سروشتییەکەی کە تێکەڵە لەگەڵ گەرمی و شێدا، عەقڵ و ئازایەتی لە هیندییەکان سەندووەو پاڵی پێوەناون بەرەو ئەفسانەو تەمبەڵی و پاڵدانەوەو خۆ بەدەستەوەدان، بەڵام دیمەنی ئەوروپا سادەیەو «وشکە» ساردی و سەرماو بەفر نەبووەتە هۆی دروست کردنی ترس و شڵەژان، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەستی ئەوەی تێیدا دروست کردوون کە دەست بگرن بەسەر سروشتدا نەک بی پەرستن. لەبەر ئەوە لە ڕوانگەی مونتسکیۆ-وە قەدەری گەلانی باشوور ئەوەیە کە دەبێت لەلایەن گەلانی باکوورەوە غەزو بکرێن بەبەردەوامی و ئەوەش شتێکی سروشتییە کە کۆیلەکان لە باشوور بن و ئاغاکانیش لە باکوور بن)(١٢)

لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بڵێین کە ئەم جۆرە تێڕوانینە وای کردووە کە گەلانی دەرەوەی خۆیان، تەنیا لەو ڕوانگەوە کە لە باکوور نائژین، تاوانبار بکەن بە دواکەوتوو، وەک ئەوەی ژینگە کاریگەریی لەسەر جیناتی مرۆڤ هەبێت کە ئەمەش بۆچوونێکی تەواو نازانستییەو ئەمڕۆ ئەندازەی بۆ ماوەیی ئەوەی سەلماندووەو جێگەی سەرسوڕمان نییە.

بەگەڕانەوە بۆ ئەو جۆرە بۆچوونە فەلسەفیانە کە ئەم گوتارە بەردەوام خۆی دروست بکاتەوەو خۆی بخاتە ناو کایەکانی ڕۆشنبیری و سیاسی و ئابووری، هەر لە ئەم ڕوانگەیەشەوە دەبینین کە هنتگتن بانگەشەی پێکدادانی شارستانییەکان دەکاتەوە و لەم ڕێگەیەشەوە دەیەوێت گەمارۆی سەر کولتوورەکان زیاتر بکات و تەنانەت ئەگەر لە ڕێگەی بەجیهانی کردنەوە نەتوانراوە بتوێنرێنەوە، ئەوا ڕێگەی هێزی سەربازی و هاوپەیمانییەتی سیاسی بەکاربهێندرێت کە ئەمەش گوتارێکی تەواو ناکۆکە لەگەڵ مافی مرۆڤ و دیموکراسی و هەرگیز لە خزمەت کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا نییە، چونکە ئەمڕۆ جیهان پێویستی بە گوتارێکی پەیڤینی کولتوورەکان هەیە، هەتا لە ئەم ڕێگەیەوە ئاسایشی جیهان پارێزراو بێت و گەلانیش بۆ ساتێک بە ئاسوودەیی بژین..❖

**پەراوێزەکان**

..........

(١) د. عبدالعزیز بن عثمان، الحوار من اجل التعایش، الشروق،١٩٩٨،ص٤٤.

(٢) گۆڤاری گوڵان، ژ ١٢٠، ٢٧/٤/١٩٩٧، ل٤١.

(٣) بەرنامەی (العالم هذا الاسبوع)، کەناڵی mbc، ١٩٩٧.

(٤) گۆڤاری اطلاعات سیاسی اقتصادی، ژ٩٥-٩٦، ل٢٤.

(٥) هەمان سەرچاوە،ل٢٣.

(٦) د. طه جابر العلواني، ابعاد غائبة عن فكر وممارسات الحركات الاسلامية المعاصرة، معهد العالمي للفكر الاسلامي، ١٩٩٦، ط١، ص٦٤.

(٧) هەمان سەرچاوە، ل٦٥

(٨) د. محمد عابد الجابري، مسألة الهوية، مركز دراسات الوحدة العربية، ص١٨٣ - ١٨٤.

(٩) يورغن هبرماس، الخطاب الفلسفي في الحداثة، مجلة العرب والفكر العالمي، عدد ٩، ١٩٩٠، ص٩٨

(١٠) ابراهيم الحيدي، اطروحات جديدة في فلسفة هيگل الاجتماعية، دفاتر العلوم الاجتماعية، جامعة عنابة، عنابة، ١٩٨٥، ص١٧

(١١) د. محمد عابد الجابري، مسأله الهوية، ص١٢٢

(١٢) هەمان سەرچاوە، ل١٢٣

**سەرچاوەکان**

..........

(١) فريد هاليداي، الاسلام وخرافة المواجهة، ترجمة محمد مستجير، مكتبة مدبولي، ١٩٩٧

(٢) صموئيل هانتينگتون، الاسلام والغرب آفاق الصدام، ترجمة مجدي شرشر، مكتبة مدبولي.

(٣) احمد سمايلوفتش، فلسفة الاستشراق وأثرها في الادب العربي المعاصر، قاهرة، ١٩٨٠

(٤) اسموالد شبنجلر، تدهور الحضارة الغربية، ترجمة احمد الشيباني، بيروت، مكتبة الحياة، ١٩٦٤

# ستراتیژییەتگوتاری هیرمینیۆتیکا



ستاری پیرداودی

**(٣ - ٣)**

### ڕایەڵەکانی (زمان/دەق/مانا) لە نێو تانوپۆی تەئویلیەتدا

بێگومان وەکو لامان ڕوون و ئاشکرایە کە بونیادی زمان بەرجەستەکەری هومانیزمییەتی سەرجەم مرۆڤایەتییە لەنێو سەرجەم ڕایەڵ و کایە هزری و مەعریفی و فەلسەفی و ئایدیۆلۆژییەکاندا، هەروەک لەلای کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا، ئەکتیڤترین شوناسنامە بووە، بۆ ئەوەی بتوانێت سەرجەم کایە ژیارییەکانی هەر نەتەوەو میللەتێک سەبارەت بە سیمایە کولتووری و مرۆڤایەتییەکان، لەنێو هەناوی خۆیدا هەڵبگرێت و بەسەرجەم مرۆڤایەتی ئاشنا بکات، ئیدی هێدی هێدی هەنگاوی بلەزو گەورەی ناوە، تاوای لێ هاتووە لە ڕووی دەسەڵاتەوە توانیویەتی سەرجەم کایە (ئەبستیمی و فیکری و نەریت و ..تاد) لە نێو ڕیشاڵییەت و دەفرییەتی خۆی هەڵبگرێ و یەکە یەکەشیان دەستەمۆ بکات. هەروەها سوڵتەو ئیرادەی دەسەڵاتگەرایی بەسەر هەموو ڕەهەندەکانی تری ژیان هەبووە، وەک (سۆسیۆلۆژیا، ئەنترۆپۆلۆژیا، سایکۆلۆژیا، میتۆلۆژیا، مێژوو.....تاد) ئەوەتا لەنێو هەناو و منداڵدانی میتۆلۆژیادا زمان دەسەڵاتێکی مەعریفی وای پێداوە کە دەسەڵاتێکی گشتگیری بەسەر هەموو ڕەهەندو ژێیەکانی ژیان تەنانەت فەنابوون و مردنیش هەیە. (٩٣).

بە واتایەکی تر هەر چیرۆک و بەسەرهاتێکی ئەفسانەیی بگرین و بە ڕوئیاگرتنێکی مەعریفییانە بێین ڕاڤەو خوێندنەوەی ئەو بەسەرهاتە ئەفسانەییانە بکەین، دەبینین تەنیا لە نێو منداڵدان و ڕیشاڵییەتی زماندا مانا وەردەگرن و دەبەخشن، ئەگینا لەنێو واقیعی سۆسیۆلۆژیدا جگە لە کایەو بەهایەکی زمانی و چەند ڕەمزو ئاماژەو مانایەکی ئاڵۆزی بە یەکاچوو و ڕاڤەو لێکدانەوەیەکی میتۆلۆژییانە نەبێ، هیچی تر بە خۆیدا هەڵناگرێ و بونیاد نانێت.

هەر ئەم هەنگاونانەی زمان بوو کە وای کرد بونیادی زمان ببێت بە خاوەن گەورەترین ئیمپراتۆرییەت لە ڕووی ڕایەڵی دەسەڵاتگەرایی و لە سەرجەم ڕەهەندە (مەعریفی و فیکری و ئایینی و فەلسەفە...تاد) هەر ئەم ماهییەتە ئەکتیڤییانەی بونیادی زمان بوو کە وای کرد بارت و شتراوس خۆیان تەرخان کرد بۆ خوێندنەوەو ڕاڤەکردنی دنیای میتۆلۆژیا، بۆ کەشفکردن و بەرجەستەکردنی لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکانی سۆسێرو جاکۆبسن و خوێندنەوە ناوەکییەکانی لاکان.

کلۆدلیڤی شتراوس، وەک ئەنترۆپۆلۆژیستێک دەستی کرد بە دیراسەکردن و خوێندنەوەی ئەو کۆمەڵگایانەی کە خورافەو جۆرە ئەفسانەیەک دەستی بە بەرۆکییانەوە گرتووەو بۆتە چەشنە دیوەزمەیەک بەسەر بونیادی عەقڵی خەڵکەوە، شتراوس لە ئەنجامی شرۆڤەکردن و خوێندنەوەی هەناوی کۆدە ئەفسانەییەکان گەیشتە ئەو قەناعەت و ڕوئیایە کە جەستەو بونیادی ئەفسانە، تەنیا بریتی نییە لە فۆرمێک و لەونێک لە ئەفسانەو شتی خورافی و پڕوپووچ، بەڵکو خودیەتی دالی

ئەفسانە لەنێو هەناو و ڕیشالیەتی خودی خۆی چەندین مەدلوولی مەعریفی و هزری و ئیستێتیکی هەڵگرتووە کە هیچی کەمتر نییە لەو مەدلوول و ڕایەڵە مەعریفی و فەلسەفییانەی کە لە کۆمەڵگای خۆرئاوادا نمایشکراوەو دەکرێت. هەروەها سەرجەم خوێندنەوەو دیراسەکانی ئەلتۆسێر لەسەر مارکس لەڕێگەی پراکتیزەکردنی میتۆدو ستراتیژییەتگوتاری زمانەوانی بونیادگەرانەوە بوو، ئەمەش خۆی لەخۆیدا وەکو ئەرک، ئەرکێکە لەو دیو دیوی دەسەڵات و سەهمەکانی ئایدۆلۆژیادا کردەیەک پراکتیزە دەکات، چونکە خودی زمان لەو فۆرمەدا چەشنە ڕایەڵەیەکی ئایدیۆلۆژیایی بەخۆیدا هەڵدەگرێت، بۆیە ساتێک پێویستی بە ڕوئیاگرتن و خوێندنەوەی ئایدیۆلۆژییانە بێت، ئەو کات دەبێتە چەشنە سکێچ و زیندانخانەیەک لەبەردەم بونیادی زماندا. (٤٠).

هەر بۆیە لەنێو هەناوی هەر دەق و تێکستێکدا هیچ زمانێک بەسەر زمانێکی تر باڵادەستییەتی وەرناگرێت و بەیەکسانی لەنێو فەزای دەقدا دەخولێنەوە. (٤١) هەر بۆیە لە کتێبی (مەرگی نووسەر)دا ڕوئیای وایە کە ئەو شتەی لەنێو هەناوی دەقدا دەپەیڤێ و دایەلۆگ ساز دەکات، خودی زمانە نەوەک خودی نووسەر، بە واتە تەنیا خودی زمان دایەلۆگ دەسازێنێ، نەوەک خودی نووسەرەکە، هەر بۆیە سیستەمگوتاری تەئویل ئەو کردەیە پراکسیس دەکات کە لەسەر کایەو بونیادی زمان بونیاد دەنرێ، چونکە بونیادی زمان یەکسانە بە بونیادی دەق هەروەک (بارت) دەڵێت: خودی دەق بریتییە لە خودی زمان یان (دەق تەنیا زمانە).

کردەی نووسین جەستەو بونیادێکە هەیکەلی زمان پێک دێنێ، زمانیش وەک ڕایەڵێک دەبێتە گیانی ئەو هەیکەلە. بە واتە (زمان/دەق) دوو ڕووی یەک فۆرمن، چەند فۆرم و بونیادی دەق لە ڕووی سەرجەم تەکنیکە ئیستێتیکی و هزری و مەعریفییەکان باڵادەست بێت و گەشە بکات و هەوڵی بەباڵابوون بدات، ئەوندەش ڕۆحییەتی زمان گەشە دەکات و دەبێت بە لەونێکی شیاوتر بڵێین: (زمان/ دەق) بریتییە لە پێوەندییەکی تۆکمەو دالێکتیکی و هەمیشە لە پێناو جاویدانییەتیدا بەیەکەوە وەک دوو چەمک و دەلالەت کاردەکەن، تا زیاتر هەنگاو بنێت و لەنێو پانتاییەکدا نەمرایەتی بەدیوی ناوەوەی دەق ببەخشێت و دەق بە زیندوویەتی گەشەو نەشونما بکات، دەقێک هەمیشە بارگاویکراو بێت بە ئیستێتیکاو هزرو مەعریفەی ئەکتیڤ، هاوسات دەبێت لە بوارو کایەی زمانیدا چەشنە جەدەلییەت و موغامەرەیەکی دەلالی سیمیۆلۆژی تێدا بێت، هەر بۆیە هەمیشە بونیادی زمان، ماناو مەدلوولی تازەو نوێ لە هەناوی خۆیدا هەڵدەگرێت، ئەو کات زمان لە ساتی



شتراوس

کاژفڕێدان و خۆ تەنزیرکردن و نوێ بوونەوە، جەستەی دەقیش بەرەو پرۆسەی نوێکردنەوە دەبات، جیا لەبەرئەوەی (زمان/دەق) دوو ڕووی یەک دراو و فۆرمن، ئەوە هەر کاتێک هەر گۆڕانێک ڕووبەڕووی دەق بێتەوە، ئەوا ئەو کات ڕووبەڕووی زمانیش دەبێتەوەو بە پێچەوانەوە شەوە. لێرەدا بەپێی ئەو پێناسەیەی کە (زمان/دەق) ئەوە وەتەری زمان لەنێو منداڵدانی خۆیدا پرۆسەی تەئویل فۆرمەلە دەکات و بەخۆیدا هەڵی دەگرێت، جا لە ساتی بەرەو پێشڤەچوونی زمان و گۆڕانکارییەکانی بەسەردا هاتووەو لە پاڵ سەرجەم زانست و تێزە هاوچەرخەکان، پرۆسەو ستراتیژییەتی هێرمینێوتیکاش بەرەو ساتی نوێ بوونەوە هەنگاوی ناوە، زەمینەو فەزای خۆی بەرەو فراوانی بردووە، تا ئەو هەنگاوەی کە پرۆسەی تەئویل خودی خۆی بەیان بکات، بۆ پاڤژکردنەوەی سەرجەم کایە کەونییەکان و هەیکەلی جەستەی جیهان و دەبێت بە ئاڵاهەڵگری بونیادنان و خوڵقاندنی مانای نەمرو زیندوو، دەتوانین (زمان/دەق) بەشێوەیەکی تر و بە لەونێکی تر ڕاڤەی بۆ بکەین و بڵێین بە واتە سەرجەم کایەو شتەکان لەنێو قوڕگی زماندا بونیادنراون، ڕایەڵی زمانیش لەنێو ڕیشاڵییەتی کایەو شتەکاندا بوونی خۆی سەلماندووەو خودی بەیان کردووەو هەیە. کەواتە پێویستە لەسەر هەر لێتۆژەرێک و خاوەن ڕوئیایەک، کردەی هەڵکۆڵین لە نێو هەناوی زماندا لێ بدات و کایەو شتە حەشاردراوەکان کەشف بکات، چونکە سەرجەم چەمک و ئاماژە دەلالییەکان و واتاکانی ژیانی خۆمان لەو دیو دیوی ڕایەڵی زماندا بوونی نابێت و نییە، یەکێک لەو کایەو ڕایەڵە ستراتیژییانە کە لە سەراپای مێژوودا تاکی مرۆڤ مامەڵەی لەگەڵدا کردووە کە ڕایەڵەو ژێیەکی زمانی پتەوی هەیە، بریتییە لە جەستەی دەق. جا دەقەکە هەر دەقێک بێت (ئایینی، کولتووری، مەعریفی، فەلسەفی...تاد) بە تایبەتی دەقە ئایینییەکان زیاتر بە ژیانی

مرۆڤایەتییەوە پەیوەستەو کاریگەرییەکی ئەکتیڤی بەسەرەوە هەیە، هەروەها وەک بونیـادێکی کـۆنکریت و شـیـاو بۆ ڕاڤەکردن و ڕوئیا گرتن و خوێندنەوەی سەرانسەری دنیای مـرۆڤـایەتی، بۆیە جـەسـتـەی دەق دەبێت بەو تاکـە بنەمـاو ستراتیژییەتە کە لە هەناوی زماندا هەڵدەقوڵێ، هەر بۆیە هەر چەشنە مامەڵەکردنێکی تاکی خوێنەر لەگەڵ دەقدا، هەر ئەو کـاتیش مـامـەڵە کـردنێکە لەگـەڵ خـودی زمـاندا، نەک کـایەو شتەکانی تر، بێ ئەوەی هەستیشی پێ بکات.

لەسەرەنجامدا دەگەین بە جۆرە کەشفکردنێکی فرە دەلالی و فـرە ڕەهەندی زمـان، هەر بۆیە خـودی دەسـەڵاتگەرایی زمـان توانای ئەوەی هەیە کە ببێت بە نوێنەرایەتی ئەو ماهییەتەی کـە دەق بەڕێوە دەبات، بە تەلوینێکی تر ڕایەڵ و ڕەهەندی زمان چەشنە ماهییەت و ئەکتیڤ کارایەکی دەق تەنزیر دەکات و پێک دێنێ، لەو کاتیش دەگەینە ئەوەی کە جەستەی دەق بە هەمـوو ئەو چەمک و خـەسـڵـەتانەی کـە بەخـودی خـۆیدا هەڵگرتووە، یەکـسـان و پەرلێڵ بن بەسـەرجـەم ئەو کـایەو چەمک و دەلالەتانەی کە دەسەڵات و ئیمپراتۆرییەتی زمان بەخۆیدا هەڵدەگرێت و دەیخولقێنێ.

پرۆسـەی تەئویلیش پرۆسـەیەکە لەنێـو ڕایەڵ و ژێیـەکـانی زمـاندا مـامـەڵەی لەگـەڵدا دەکرێت و بە ئەنجام دەگـەیەنرێت، هەر بۆیە کردەی تەئویل زیاتر کردەیەکە لە تاک مانایی و تاک ڕوئیـاییەوە بۆ سـاتەکـانی فـرەمـانایی و فـرە ڕوئیـایی گـوزەر دەکات، لە سەرجەم کایەو شتە مەئلوفەکان بۆ سەرجەم شت و کـایە نامـەئلوفـەکـان هەنگاو دەنێت، ئەم هەنگاو هەڵێنانەی تەئویل وا دەکات کە جەستەی دەق، کایەی زمانیشی بەخۆیدا هەڵگرتووە، ئازاد بکات، لە سەرجەم ماناو دەلالەتەکان کە زیاتر بۆ مـامـەڵەیەکی ئایدیۆلۆژی بەکـاردەبراو قـۆرخ دەکـران، کردەی تەئویل تەنیا کردەیەک نییە بۆ ئازادکردنی مانا، بەڵکو سەرەڕای ئازادکردنیش هەوڵی خولقاندنی ماناش دەدا، زیاتر بە واتەو لەونێکی شـەفـاف، پرۆسـەو سـتـراتیـژییـەتگوتاری تەئویل پرۆسـەو کـردەیەکـە بۆ خـولقـانـدن و مـەزراندنی زەمینەیەکی لەبارو فرە بۆ ئازادکردنی ڕایەڵەکانی بیرکردنەوە لە سـەرجەم ئەو نیـمـادانەی کە مـەرامـەگـەری و پابەند بوون بەسـەر زەینییـەتی مـرۆڤ، دەیەوێ بیـانچەسپێنێ، هەروەها کردەی تەئویل بەو دیبلۆماسییەتە کاردەکات بۆ زیاتر لە تاک ڕەهەندێک لە وردبوونەوەو تێفکرنی زەینی خوێنەر و گەڕان و شۆڕبوونەوە بۆ نێو منداڵدانی دەق بۆ بەرسڤـەکردنی خەلایە مـانا زیندووەکـان و ئازادکـردنیـان لە سـەرجـەم سکێـچـە داسەپێنراوەکان، ئەمەش دیسان لەنێو ڕیشاڵە وردەکانی زمان لەنگەر دەگرن و فۆرمەلە دەبێت، چونکە خودی بونیادی زمان پڕە لە درزو بۆشایی، بەو لەونە شەفافەی کە لە نێو هەناوی

هەر دەفرەدەیەکی زمـانیدا درزو کەلێن بوونی هەیە، هەر بۆیە خـودی زمـان هیچ کـاتێک بۆی نییـە دەفـرەدەو ڕسـتـەیەک بخولقێنێ کە سەرجەم درزەکانی کۆدکرا بن و سواغ درابێت، بەو واتەو لەونەی کە هیچ کاتێک لە ئیرادەی خودی ڕوئیای نووسـەردا نییـە کە سـەرجەم ماناکانی نێو هەناوی دەق، بۆ ڕوئیا خودییەکانی خۆی فۆرمەلە بکات و دەستی بەسەردا بگرێت، چونکە وەکو وتمان فۆرم و جەستەی زمان پڕە لە درزو کەلێن، ئیتر ڕوئیاکانی (خوێنەر/بینەر) مافی سواغدانی ئەو درزانەی هەیە، ئەمـەش بەو مـەبەسـتـەی کـە بۆ دووبارە خـولقـانـدنی مـاناکـانی نێـو هەناوی دەق، هەروەک ئەنگاردن-یش زیاتر ڕوئیـاکـانی خـودی خـۆی چڕ دەکـاتەوە لەسەر مەسەلەی درز خستنە نێو هەناوی دەق. (٤٢).

خـودی کـردەی هیـرمـینیـۆتیکا لە سـاتی نمایشکردنیـدا دەیەوێت لەنێو کۆمەڵە ڕیشاڵ و چەمک و مانادا خودی بونیاد بنێت و دەست بە نەشونما بکات کـە یەکـێکی لەو ڕیشـاڵە زیندووانە کـە وەک سـتوونێکی کـارا دەوری خۆی پراکـتیـزە دەکات کە ستوونییەتی بونیادی زمانە، چونکە وەکو دەزانین سـەرجـەم شت و کـایەکـان لەنێـو هەناوی زمـاندا دەست بە نەشـونما دەکـەن و خـودی خـۆی پێ پتـەو دەکـات و دەبێـتـە قـیاسـێکی هەمـەکی بۆ سـەرجـەم کـایە کـەونییـەکـان یان بە لەونێکی شەفافـتر بێژین: خودی تانوپۆی زمانەکە ڕۆحیەت دەبەخشێت بە سەرجەم کایە زیندووەکان و یەکە یەکە مانایانی پێ دەدات، هەروەک عـەلی حـەرب-یش دەبێـژێت: «سـەرجـەم پێـوەندییـەکـانی مـرۆڤ لەنێـو بووندا بریتـییـە لە پێـوەندییـە زمـانییـەکـان، جا ئەم پەیوەست بوون و پێوەندییە لەسـەر هەر ڕایەڵـەیەک تـەنزیرکـــرابێت لە هـزر، عــــەقڵ، زەیـن، هەستەوەرەکان.......تاد) (٤٣).

ئەم تان و پۆو ڕیشاڵییەتە زمانییەش مەبەستمان تەنیا وەک ئامرازو ئالیـیـەتێکی گـفـتـوگـۆیی نیـیـە، بەڵکو زیاتر بەماناو و چەمک و دەلالییەتە قووڵەکەی کە زیاتر بەو واتایە کـە زمان وەک هەر چەمک و دەلالەت و سـتـراتیـژییـەتێک بۆ وردبوونەوەو تێـڕامــان و حــاڵی بوون لە ســەرجــەم کــایەو شـفـرەکـانی نێـو هەناوی بووندا، چونکە حـاڵی بوون وەک ستوونێکی ئەکتیڤ کار دەکات و سەرجەم پرۆسەکان خودی خۆیان لەسەر بونیاد دەنێن.

جا لێرەدا مەبەستەکەی ئێمە زیاتر ڕۆشن دەبێتەوە بەوەی کە تا چەند ستراتیژییەتی زمان دەوری هەیە بەسەر پرۆسەی هیرمینیۆتیکا.

بونیـادی زمـان وەک هەر کـایەو چەمکێک پێـویسـتـە لێی وردبینەوەو بیخەینە نێو ڕایەڵەکانی شرۆڤەکردن، ئەمەش بۆ شـۆڕبوونەوە بۆ نێـو هەناوی سـەرجـەم کـایەو چەمکە


بارت

داخـراوەکـانمان دەبەن، بۆ زیاتر کـەشـفکردن و دۆزینەوەی جەسـتەو مـانای تازە، بێگومـان ئەمـەش لە ڕێگای پرۆسـەی خوێندنەوەو ڕاڤـەکـردنەوە بەرسـڤە دەبێت، ئەوکـات پرۆسـەی هیـرمـینیـۆتیـکا وەک سـتـراتیـژییـەتگوتارێکی چالاک دەوری خۆی پراکتیزە دەکات و خودی خۆی دەخاتە نێو نمایشکردن، بە پێـچـەوانەی سـەرجـەم سـتـراتیـژییـەت و پرۆسـەکـانی تر. ستراتیژییەتی هیرمینیۆتیکا بەو مەبەستە کار دەکات، نەک تەنیـا بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕایەلانەی کـە لەنێـو هەناوی دەق و ڕوئیـاکـانی خوێنەردا پەیوەست کـراون، بەڵکو سـەرەڕای ئەو دۆزینەوەو کەشفکردنەش دێت بە نیازو مەبەستێکی گەورەترو فرەتر کە ئەویش شۆڕبوونەوەیە بۆ نێو خەلایە شاراوەکـان بە مەبەستی جەستەو کایەی تازەی لێ بەرهەم بێت و بەرەو پلەی داهێنانی بەرێت. لە نێـوان ڕایەڵەکـانی (خـود/بابـەت) ئەم هەموو شۆڕبوونەوەو وردبوونەوەیە پەیوەستە بە ڕایەڵی زمان، چونکە نەک تەنیـا شـتـە دەرەکی و ناوەکـیـیـەکان بریتی بن لە زمان، بەڵکو وەک هایدگەر وتەنی (مرۆڤ بریتییە لە زمان)، بە واتا تەنیـا خـودی زمـان دەبێـتـە ئەو مـیـکانیـزمـیـیـەتە بۆ هەڵسووڕاندنی سەرجەم کایەو جەستە تەنزیرکراوەکان، چونکە هەر خودی پرۆسەی زمانە دەتوانێت ڕایەڵی هزری و مەعریفی بە سـەرجەم کردەو ڕوئیاکان ببەخشێت، هەروەک لای ڕیکۆر دەردەکەوێت، بەتایبەتی لە هەوڵە تەئویلییەکانی کە لە کتێبی (فـرۆید و فـەلسـەفـە)دا کە ڕیکۆر کـەشـفی سـەرجـەم ڕایەڵە زمانییە ڕەمزییەکان دەکات، لەلای ڕوئیاکانی فرۆید، زیاتر ئەم زمانە ڕەمزییە لە ڕوئیای فرۆید کە لە نێوان ڕایەڵەکانی (ئایین/خـەون) بەرسـڤـە دەبن، ئەمـەش بە پالپـشـتی خوێندنەوەیەکی سـایکۆلۆژییانەی مـیـتـازمـانیـیانە دەکرێت؛ هەرچەندە لەمەوبەر لای میتۆدەکانی تر توانای خوێندنەوەیان نەبوو یان گەر بوویێتیش ئەوە بە شێوازێکی ئیفلیجی کاری لەسـەر کـراوە، ڕیکۆر دەڵێت: «حـاڵی بوون و تێـرامـان لە چەمک و دالییەتی کایە دەست نیشانکراوەکان، ڕەهەندێکە بۆ حـاڵی بوون لە چەمک و غـمـووزییـەتی خـودی مرۆڤ». (٤٤).

تەنانەت ڕوئیاکانی ئایزەر-یش جەخت لەسەر ڕایەڵی زمان دەکات و زیاتر بیرو بۆچوونەکانی لەوە چڕ دەکاتەوە کە زمانی نێو هەناوی دەق، زیاتر زمانێکی ئەندێشەییە کە چەند ڕایەڵ و ستوونێکی ئەندێشیمان لەنێو بتە زەینییەکانماندا بونیاد دەنێت، ئەمەش پەیوەستە بەو کەشکۆڵە مەعریفەیی و هزرییەی کە لە خودی ڕوئیاگر لەگەڵ سەرجەم پرۆسەکانیدا لەنێـو هەناوی دەقـدا هاوجـووت دەبن و برەو زیاتر بە میکانیزمییەتی تەئویل دەداو فراوانتری دەکات، چونکە هەرچەندی پرۆسـەو ڕایەڵە فـیکری و مـەعـریفی و فەلسەفییەکان فرەتر بێت، ئەوەندەش زەمینەی هیرمینیۆتیکا فرەترو ڕەنگینتر دەبێت.

بونیادی زمان هەمیشە بونیادێکە لە هەوڵی بونیادنانی دیالۆگێکی فیکری و مەعریفی دەدات لەنێو مەنزومەکانی دەقدا. ئەمەش بەو دەسەڵاتەی کە شۆڕ دەبێتەوە بەرەو ناخی خودی نووسەرەکە، ئەمەش دەبێتە فاکتەرێکی ئەکتیڤ بۆ تەفکیکردنی جەستەی ئەو کردە ئارکیۆلۆژییایە، ئەو جەستەیەی کە خەلایە شاراوەکانی نێو ڕیشاڵییەتی دەق بەرجەستە دەکات و یەکە یەکە ڕاڤەیان بکات و بیانخاتە نێو پرۆسـەکـانی خـوێندنەوەو شـرۆڤـەکـردنەوە، سـەرجـەم ڕمووزەکانیش بخاتە نێو جۆرێک لە ڤالایی. هەر بۆ ئەمەش ڕوئیـای ڕیکۆر وەردەگـرێت کـە زیاتر ڕوئیـای وایە (بۆ خوێندنەوەو گوزارشت کردن لە ڕمووزەکان دەبێت پەنا بۆ ڕایەڵ و ستراتیژییەتی زمان بەرین).

هەروەها کـردەی ڕاڤـەکـردنیش پەیوەست دەکـات بە ڕاڤـەی ئاماژە لەنێو هەناوی جەستە زمانییەکان کە ئەمەش یەکێکە لەو ستوونانەی کە مەرامگەراییەتی تەئویلکاری جەختی لەسەر دەکاتەوە، هەر بۆیە ئەمیل لنفست، ڕوئیای وایە کە (بونیادی زمان): بونیادێکە لە ئیرادەیدا هەیە کە داهێنان و خوڵقاندن بهێنێتە ئاراوە). (٤٥)

هەر بۆیە سەرجەم بەشەرییەت دوور لە بەهاو ماهییەتی زمـاندا بەهیچ کلۆجێک ناتوانێت شۆڕبێتەوە بەرەو ناخ و ویژدانییەتی خۆی، چونکە هەروەکو لە پێشوودا جەختمان لەسـەر ئەوە کـردەوە کـە مـامـەڵەی مـرۆڤ لەگـەڵ کـایە کەونییەکاندا بریتییە لە مامەڵەیەکی تەئویلییانەی زمانییانە(٤٦).

ئیتر سەرجەم بەها زمانییەکانیش بۆ پراکتیزەکردن و بەرسڤەکردنی مانایە لەنێو دەقدا، بەواتە ڕایەڵ و ماهییەتی زمان وەک ڕایەڵ و ستوونییەتێکی کارا بەو مەرامە کار

دەکات و ستراتیژییەتی هیرمینیوتیکا خودی خۆی پێ کۆنکریت دەکات ، بەو مەرامگەراییەی کە جەستەو کایەی تازەو نوێ دەخولقێنێ و ماناکان لە دۆخێکی نادیارەوە بەرەو دۆخێکی دیار ئاراستە دەکات و هەمیشەش لە پێناو بونیادنان و سارێژکردنەوەی دەق عەودالە (٤٧). هەر بۆیە دەگەینە ئەوەی کە بڵێین، مومارەسەکردنمان بێ هەڵگری چەند ڕایەڵەیەکی هزری ومەعریفی و زمانی بۆ خوێندنەوەی تێزو میتۆدو چەمکە نوێگەرییەکان بریتییە لە مومارەسەکردنێکی خوارفی و ئیفلیجی و دۆگمایی.

**هەڵکۆڵینی دەمامکەکان (میتۆلۆژیا/ ئایدیۆلۆژیا)**

بێگومان وەکو دەزانین کردەی هەڵکۆڵین زیاتر کردەیەکە لەنێو هەناوی جەستەیەکدا فۆرمەلە دەکرێت و بەکار دەبرێت، بە واتاو لەونێکی شەفاف دەتوانین کردەی هەڵکۆڵین پەیوەست بکەین بە ڕونیاکانی فوکوی هزرمەند کە لە کتێبەکەیدا هەڵکۆڵینەکانی مەعریفە زۆر بە جوانی کردەی هەڵکۆڵین پراکتیزە دەکات لەنێو هەناوی سەرجەم دەقەکاندا، بە واتە خودی ڕونیابین شاوڵئاسا شۆڕ دەبێتەوە بۆ نێو ریشاڵە وردو چرەکانی منداڵدانی دەق، بەمەرامی کەشفکردنی سەرجەم ئەوکایەو خەلایە نابەرجەستانەی کە کەوتونەتە ئاستی ژێرەوەی دەق کە خودی (نووسەر) بەفۆرم و لەونێکی چڕو نادیار تواندوونییەتەوە، جا کایەو خەلایەکانی (هزری، مەعریفی، فەلسەفی....تاد)بن.

جا لەژێر ئەو ڕوونکردنەوەیەی سەرەوەدا، دەتوانین پرۆسەی هەڵکۆڵین بەکاربەرین بۆ کەشفکردنی ئەو ڕایەڵ و ستوونە میتۆلۆژی و ئایدیۆلۆژییانەی کە لە نێو جوهەری زماندا لەشێوەی فۆرمێکی رووتکاریدا لەژێر دەمامکە ئاسنینەکاندا کۆنکریت کراون، چونکە گەر ڕونیاکانی خودی خۆمان بگەڕێنینەوە بۆ سەردەمی کۆمەڵگا سەرەتاییەکان، دەبینین سەرجەم کۆمەڵگا سەرەتاییەکان، سەرجەم ستوونە ژیاری و شارستانییەتە مرۆڤایەتییەکانی خۆیان لەنێو ڕیشاڵییەتی زمان و ئەفسانەدا رواندووەو تواندوویانەتەوە، بەو دەسەڵاتەی کە زمان لە تواناو ئیرادەیدا هەیە کە ببێت بە شوناسنامەیەک بۆ بەیانکردن و ناساندنی سەرجەم بەها مرۆڤایەتییەکانیان لە گەلانی تردا، چونکە ستوون و ڕایەڵەکانی زمان لە تواناو ئیمکانییەتیدا هەیە، دەسەڵات بەسەر هەموو ڕەهەندە مەعریفی و سۆسیۆلۆژی و هزری و فەلسەفییەکاندا پراکتیزەو کۆنترۆڵیان بکات، ئەوەتا لەنێو هەناوو منداڵدانی میتۆلۆژیادا زمان دەسەڵاتێکی مەعریفی وای پێداوە کە دەسەڵاتێکی گشتگیری بەسەر هەموو ڕەهەندو ژێیەکانی نێو کەون، تەنانەت فەنابوون و مردنیش هەیە. (٤٨).

هەر بۆیە بارت دەبێژێت (مرۆڤ کائینێکی زمانییە). دەقی میتۆلۆژی زیاتر دەقێکە گوزارشت لەسەرجەم جووڵەو ئاماژە فەلسەفییەکانی سەردەمی خۆی دەکات، لە هەناوی خۆیدا چەندین دالی مەجازی و ڕەمزی بە خودی خۆیدا هەڵگرتووە، لێرەدا زیاتر بۆ نێو کرۆک و جەوهەری (میتۆلۆژیا / ئایدیۆلۆژیا) شۆڕدەبینەوەو تان و پۆیەک دەکێشین، بەواتە لەنێو پرۆسەی هیرمینیوتیکادا ئاماژەیەکی خێرا بەسەر ڕایەڵ و سەهەمەکانی دنیای میتۆلۆژیا و ئایدیۆلۆژیادا دەکێشین.

ڕەهەندەکانی (میتۆلۆژیا/ ئایدیۆلۆژیا) زیاتر دوو ڕەهەندو ستوونی بەناویەکدا داچوون بە واتا هەموو جەستەیەک لە میتۆلۆژیا کرۆکێکی ئایدیۆلۆژیایی هەیە، هەروەها هەموو جەستەو بونیادێکی ئایدیۆلۆژیش، چاووگێکی میتۆلۆژی هەیە، نەبوونی هەر یەک لەمانە هەناسەنەدان و مردنی ئەویترییانە. دەتوانین بێژین،جەستەی هەر دانەیەک لەمیتۆلۆژیا بریتییە لە پێکهاتەیەکی قەوسوقوزاحی ئاڵۆزو تێکچرژاو، بەواتە خودی جەستەی میتۆلۆژیا لە تواناو ئیرادەیدا هەیە کە سەرجەم ڕایەڵ و ڕەهەندە مەعریفی وهزری و فەلسەفییەکان، لە هەناوی خۆیدا هەڵبگرێت. لە پشت هەر یەک لەوستوون و ڕەهەندە مەعریفییانەشدا سەهەمێکی مەرامگەریی ئایدیۆلۆژی خۆی حەشارداوە. جا ئەم سەهمە مەرامگەراییەش پەیوەستە بەو زەمەنەی کە تێیدا پراکتیزە دەکرێت، مادام جەستەی هەر دانە میتۆلۆژیایەک هەڵگری چەند دالێکی ئیستێتیکی و مەعریفی و هزری بێت، ئەوە بێگومان هەر خودی ئەو جەستەش هەڵگری چەشنێک لە مەرامگەرایی بە خودی خۆیدا قۆرخ دەکات. بۆ بەرسڤەکردنی فۆرمێک لە دەسەڵات بۆ کۆنترۆڵکردنی سەرجەم کایەو دالە کەونییەکان، چونکە هەر جەستەیەک ئەگەر نەیتوانی فۆرمێک لە دەسەڵات بەرجەستە بکات، ئەوە ئەو کات گومانی تێدا نییە کە لە لایەن دەسەڵاتێکی ئەکتیڤتر کۆنترۆڵ بکرێت و بڕووخێنرێت، هەر بۆیە خودی هەر جەستەیەک سەرەتا بەو نیازە کار دەکات، بەوەی کە خودی خۆی قایم بکات، بەچەند ستوونێکی مەعریفی و فەلسەفی و میتازمانی شیاو، بۆ درێژکردنەوەی تەمەنی جەستەی خۆی لە بەرامبەر ئەو جەستەو گۆڕانکارییانەی کە لە دواتر دێت. بۆ ئەوەی لە باسەکەمان دوورنەکەوینە، درێژەی پێنادەین، دوای ئەوەی کە وتمان جەستەی هەر دانە میتۆلۆژیایەک تەنیا بریتی نییە لە جەستەیەکی رووتی تاک فۆرمی، بەڵکو زیاتر جەستەیەکە هەڵگری چەندان دالی مەعریفی و هزری...تاد، یە.

ئەگەر بێت و دیراسەی ئەو کۆمەڵگا سەرەتاییانە بکەین کە تێیدا چەندین ڕایەڵی میتۆلۆژی و ئەفسانە گەرایی باڵی کێشاوە بەسەر هەموو ڕەهەندەکانی ژیان کە لەنێو هەناوی


فرۆید

زەماندا توانددوویانەتەوە، دەبینین خودی ئەفسانە نەک تەنیا کاریگەریی هەبووە بەسەر ڕەهەندەکانی مەعریفی و هزری، بەڵکو کاریگەرییەکی ئەکتیڤکارانەی بەسەر بونیادی عەقڵی و هزری ئەو تاکانەی نێو کۆمەڵگا سەرەتاییەکان هەبووە بۆ نموونە: لە پەرستن و عیبادەت کردن و ترس لە شتەکانی دەوروبەرو سەرجەم ئەو هەڵسوکەوتانەی کە ڕۆژانە ئەنجامیان دەدا، دەبینین جەستەی ئەفسانەو دنیای میتۆلۆژیا تەنیا بریتی نییە لە تاکە فۆرمێکی بە تاڵ و پووچ، بەڵکو بریتییە لە کۆمەڵە دالێکی ئیستێتیکی و مەعریفی و هزری کە وەک چەشنە سیستەمێکی ئەبستیمی بەگڕخراوە، تەنانەت ئەوەندە چڕ بوونەتەوە کە هیچ کەمتر نییە لەهەر بنەمایەکی تری کە لەنێو کۆمەڵگای خۆرئاوا پراکتیزەکراوە، هەروەک بۆیە بارت، شتراوس دیراسەی دنیای میتۆلۆژیاو ڕەوشتەکانی کۆمەڵگا ناخۆرئاواییەکانیان کرد کە لە کۆتاییدا گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە جەستەی ئەفسانە بریتی نییە لە: جەستەیەکی کارتۆنی پڕو پووچ و بەتاڵ، بەڵکو بریتییە لە جەستەیەکی چڕو پڕ لە ڕایەڵی تێکچڕژاو کە ئەستەمە بێ خوێندنەوەی قووڵی مەعریفی شۆڕبیتەوە بۆ نێو خەلایەکانی جەستەی ئەفسانە، ئەگەر بێت و ئێمە بە ڕوئیایەکی ئەبستیمیانە ڕاقەی هەناوی ئەفسانە بکەین دەبینین لەنێو ڕیشالیەت و دەفری زەماندا چەندین مەدلوولی ڕەمزی و ئاماژەیی ئەبستراکتی ئاڵۆزو تێکچڕژاوی مەعریفی و هزری و فەلسەفی بەخودی خۆیدا گرێ دەداو هەڵدەگرێت.

ئەگەر بێت و بە ڕوئیایەکی شەفاف و کراوە، بڕوانینە جەستەی میتۆلۆژیا دەبینین ئەم جەستەیە خاوەن قەوارەو دەسەڵاتێکی فرەیە، بەواتە سەرجەم ڕایەڵ و ڕەهەندە سیاسییەکان، کۆمەڵایەتییەکان و..تاد هاودۆستایەتییەکی تۆکمەیان بەیەکەوە هەیە.

گەر ڕوئیایەک بگرینە فەرهەنگی مێژوو و شۆڕبینەوە بۆ نێو هەناوی مێژوو، دەبینین هیچ ئیمپراتۆرییەت و خاوەن دەسەڵاتگەراییەک نەیتوانیوە بێ بوونێکی میتۆلۆژیانە خودی خۆی کۆنکرێت بکات و سەرجەم ماناو دەلالەتەکانی پێ ئەستوور بکات، چونکە هەموو دەسەڵاتێک بەو مەرامە کاردەکات کە لە ئایندەیەکی نزیکدا جەستەو ئیمپراتۆریەتێک لە میتۆلۆژیا بخولقێنێ. بۆ ئەوەی بتوانێ لەبەردەم شالاوە دەرەکییەکاندا خودی خۆی ڕاگیر بکات و خۆی بخاتە نێو چەشنە تەمومژاوییەکی ئایدیۆلۆژیانە.

بێگومان هەموو چەشنە دەسەڵاتێک ڕایەڵەیەک لە ئایدیۆلۆژیا دەخاتە کارو نمایشی دەکات بۆ ئەوەی جەستەو کایەیەک لە ئەفسانە دابهێنێ و هەناسەی پێ بدات، بەو واتایە تاکو تەوهیمێکی میتۆلۆژیایانە بۆ جەستەی دەسەڵات بهێنرێتە کایەوە کە ئەویش ستوونییەتی ئایدیۆلۆژیایە. بێگومان ئەم تەوهیمە میتۆلۆژیایەش خۆی لەخۆیدا دەبێتە هەناسەبەخشێک بۆ گیانی ئایدیۆلۆژیا.

هەموو چەشنە ئایدیۆلۆژیایەک چەشنێکە لە گوتارێکی دەسەلاتگەراییانە ئەوکاتیش ڕەهەندی میتۆلۆژیا ئەو چەشنە گوتاریزمییەتە دەخاتە نێو سەرجەم ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی ژیان.

ئەوەش لەیاد نەکەین کە لە نێو هەناوی هەموو چەشنە ئەفسانەیەکدا، چەشنە خورافەیەکی دەسەڵاتگرو مەعریفی خودی خۆی دەچێنێت، چونکە ئەگەر بێت و ئەو چەشنە خورافەیە خودی خۆی پتەو نەکات بەچەند ڕایەڵەیەکی مەعریفی و هزری، ئەوە ئەو کات خودی جەستەی ئەفسانە ئیفلیج دەبێتەوەو خودی خۆی بەتاڵ دەکاتەوە، هەر بۆیە میتۆلۆژیا بێ ڕایەڵی مەعریفی ناتوانێت خودی خۆی بە سەلیمی ڕابگەیەنێت و ببێت بە چەشنە ئەفسانەیەکی کۆنکرێت. هەر بۆ نموونە ساتێک دریدا-ی هرزمەند بەپێی ئەو پرۆگرامەی کە کاری لەسەر دەکات کە پرۆگرامی (تەفکیکیەت)ە، توانی ئەو تەوقە تەوهیمییە بشکێنێ کە گوتاریزمییەتی خۆرئاوا کردبوویە چەشنە خورافەیەک و خودی خۆی بەسەنتەریزم و ئەوانی تری بە پەراوێز سەیر دەکرد. دیسان دێمەوە سەر ئەو پێوەندییە تۆکمەییەی کە لەنێوان (میتۆلۆژیا/ ئایدیۆلۆژیا)دا بوونی هەیە، بێگومان کاتێک هەر چەشنە ئەفسانەیەک خودی خۆی دەڕوێنێت، ئەوە لەسەر زەمینەیەکی لەباری ئایدیۆلۆژی خودی خۆی دەڕوێنێ و پتەوی دەکات «ئەفسانە کردەیەکە لە هەناوی ئایدیۆلۆژیا دێتە دەرێ و خودی ئایدیۆلۆژیاش جەوهەری ئەفسانەیە»(٤٩).

ئەم جۆرە ئایدیۆلۆژیایەش چەشنێک لە دەسەڵات بەخودی خۆی هەڵدەگرێ، بەڵام لە دواییدا جەستەی (ئەفسانە) خودی ئەم دەسەڵاتە بە هەموو ڕەهەندە (سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژی

ومێژوویی و زمان و ...تاد) لەنێو هەناوی خۆیدا هەڵدەگرێ، کە لەئەنجامدا گوتاریەتێکی ئەفسانەیی دەخوڵقێ، بەو حوکمەی کە جەستەو بونیادی میتۆلۆژیا بەسەرجەم ڕەهەندە مەعریفی و هزری و فەلسەفییەکان بە خودی خۆیدا هەڵدەگرێت، بۆیە سەرجەم دەسەڵاتگرەکان و چینە بەرزەکانی کۆمەڵ، دێت پێوەندییەکی ستراتیژی و بەهێز لەسەر زەمینەی ئەفسانە دەخوڵقێنن و خودی خۆیانی پێ پتەو دەکەن، هەر بۆیە دەبینین سەرجەم گوتاریزمییەتەکان بەهۆی ئەفسانەو تێزە خورافییەکان، سەرجەم کایە کەونییەکان ڕاڤەدەکەن و دەخوێننەوە کە لە دواساتدا بەهۆی ئەم ڕاڤەکارییەوە دەکەوینە بەردەم میکانیزمییەت وستراتیژییەتێکی ئەکتیڤ کە ئەویش خودی هیرمینیۆتیکایە، بە واتە لەنێو هەناوی ئەفسانەدا چەند خوێندنەوەی بۆ دەکرێت، ئەوەندەش (مانا) زیندوو دەکرێتەوە، بەواتە جەستەی ئەفسانە دەبێت بەو مینبەرەی کە خودی ڕاڤەکار لەنێو ڕاڤەکانی خۆیدا مانا دەخوڵقێنێ. بەواتە دەگەینە ئەوەی کە خودی ئەفسانە لە نێو ڕایەڵەکانی تەئویلییەتەوە مامەڵەیەکی خێرای لەتەکدا کراوە، واتە خودی دنیای میتۆلۆژیا ئاسانکارییەک بوو بۆ خوێندنەوەو ڕاڤەکردنی دەقە سەرەتاییەکان.

لە ئەنجامدا دەگەینە ئەوەی کە بەڵێ میکانیزمییەت و ستراتیژییەتگوتاری هیرمینیۆتیکا میکانیزمییەتێکە کە جەستەی دەق ڕاڤە دەکات و دەیخوێنێتەوە بێ هیچ مەبەست و مەرامێکی ئایدیۆلۆژی، بەڵکو زیاتر سەهم وڕوئیا گرتن بوو سەبارەت بە هەیکەلی مێژوو و شۆڕبوونەوەو بەشداری کردن لە هەناو و جەستەی مێژوودا.(٥٠).

ئەم بەشداربوونە سەبارەت بە هەناو و جەستەی مێژوو، زیاتر بەو مەرامە بوو کە جەستەی دەق ئازاد بکرێت و سەرجەم کایەو ڕایەڵە قۆرخکردووەکان. بەواتە بۆ مەبەست و مەرامێکی ئایدیۆلۆژی نەبێت، هەر بۆیە کردەی تەئویل زیاتر ڕوئیا گرتنێکە بۆ مەبەستی تازەکردنەوەی خەلایەکانی مانای کۆن لە نێو جەوهەری دەقدا، تەنانەت بۆ خوڵقاندنی کایەی تازەو نوێ، بەمەش دەتوانرێت کۆدەکانی مێژوو تێکبشکێنرێت و دەق دوورخرێتەوە لەسەرجەم سەهمە ژەنگاوییەکانی ئایدیۆلۆژیا.




## دوالیزمەکردنی (کەڵچەر/ تەئویل)

بێگومان تێفکرین و حاڵی بوون لەهەر چەمک و دەلالەتێک پێویستی بە چەشنە ڕوئیاو تێگەیشتنێک هەیە بۆ شۆڕبوونەوە بۆ نێو ڕیشاڵییەتی ئەو چەمکەی کە لێی حاڵی نین، خودی کردەی تێگەیشتنیش پەیوەستە بە چەشنە هەزمکردنێکی ڕایەڵی مەعریفی، بێگومان ئەمەش بونیاد دەنرێت لەسەر هەزمکردنی سەرجەم تیۆرو میتۆدی تایبەت بە خودی تێگەیشتن خۆی، بێگومان ئەم جۆرە تێگەیشتنە لەسەر ستوونییەتە مەعریفی و هزرییەکانەوە دامەزراوە، ئیتر هەنگاو هەنگاو گەشەی کردو فراوان بوو، تا وای لێهات ئەبستمۆلۆژیای تایبەت بەخودی خۆی نەشونمای کردو هاتە پێشەوە. تاوای لێهات تیۆر و میتۆدی تایبەت بە خودی خۆی خوڵقاو نەشونمای کرد کە لە دواکاتدا هەر لەنێو هەناوی ئەو چەشنە تێگەیشتنە خودی میکانیزمییەتی ڕاڤەو تەئویل هاتە کایەوە.

جا لێرەدا بۆ تێگەیشتن وحاڵی بوون لە چەمکی کولتوور، دەتوانین بێژین چەمک و دەلالەتی (کولتوور) زیاتر بریتییە لەو چەمک و دەلالەتە ئاڵۆزەی کە لە هەناوی خۆیدا کرۆک و جەوهەری سەرجەم ژێیەکانی هومانیستییەتی بە خودی خۆیدا هەڵگرتووە، بەواتە سەرجەم ڕایەڵە هزرییەکانی کە پەیوەستە بە مامەڵەکردنی مرۆڤایەتی لەگەڵ سەرجەم شتەکانی دەوروبەردا، جا ئەو شتانەی دەوروبەریش بە کۆی هەموو (عادات و تەقالید وئەخلاق و یاسا کۆمەڵایەتییەکان و سەرجەم بەها مرۆڤایەتییەکان و ئایین و ڕۆشنبیری...تاد). هەروەک تایلۆر-ی ئەنترۆپۆلۆژیست سەبارەت بە چەمک و دەلالەتی (کولتوور) لە کتێبەکەی خۆیدا (کولتووری سەرەتایی)دا زۆر بە جوانی ڕاڤەی ئەم چەمکە دەکات و دەبێژێت: «چەمکی کولتوور زیاتر چەمکێکی شموولی پێکهاتەییە لەسەرجەم ڕایەڵەکانی (مەعریفەو یاسا کۆمەڵایەتی و عادات و تەقالید و هونەر و ئایین..تاد) تەنانەت سەرجەم ئەو دابونەریتە باوانەی مرۆڤ لەنێو کۆمەڵگا وەری دەگرێت و بەرجەستەی دەکات.» جا لێرەدا دەگەینە ئەوەی کەوا چەمکی کولتوور زیاتر چەمکێکی ناڕۆشن و ئاڵۆزو تێکچڕژاوە، زیاتر میکانیزمییەت و کردەیەکی سەرپێیانەیە کە خودی مێژوو بەرجەستەی کردووە لە هەناوی خۆیدا..

جا لێرەدا بۆ شۆڕبوونەوە بۆ نێو ئەو ڕیشاڵییەتە باریک باریکانەی کە لەنێو جەستەی کولتووردا هەیە، بەتایبەتی کولتووری کۆمەڵگا سەرەتاییەکان، کەوا چەندین ڕایەڵی (مەعریفی وهزری و زمانی و فەلسەفی و ....تاد) بەخودی خۆیدا هەڵگرتووە، پێویستی بە کردەو میکانیزمییەتێکی


فوکو

شیاو و لەبار هەیە بۆ خوێندنەوەو شرۆڤەکردنی ئەو ڕمووزانەی کە بوونەتە کۆدێکی نارۆشن و تاریک لەنێو جەستەی کولتووردا، لێرەدا بەچاکی دەزانین کە هیرمینیۆتیکا زیاتر ئاشنایی هەبێت و تواناو ئیرادەی هەبێت بۆ خوێندنەوەو شرۆڤەکردنی جەستە ئاڵۆزو تێکچڕژاوەکەی کولتوور.

پرۆسەی تەئویل لە ساتی خوێندنەوەو ڕاڤەکردنی جەستەو هەیکەلی کولتووردا، تەنیا پەیوەست نییە بە ڕایەڵەکانی ڕابردوو، بەڵکو هەر لەنێو هەناوی ئەو کردەیەدا ڕایەڵەکانی (ئێستا/ڕابردوو) دەکات بە تان و پۆیەک و خوێندنەوەی تایبەتییان بۆ دەکات.

پرۆسەی تەئویل زیاتر بەو مەرامە کاردەکات کە خودی چەمکی کولتوور بکات بە خەلایەیەکی ئەکتیڤ بۆ تەنزیرکردنی جەستەیەکی مۆدێرنیستانەی ژیارییانە، خودی خۆی بخاتە نێو سەرجەم تیۆریزە هاوچەرخەکانی. بە واتە بەشداربوونی چەمکی کولتوور بۆ تەنزیرکردنێکی هزری و مەعریفی لە نێو هەناوی گوتارو ڕایەڵەکانی ژیاردا، زەروورەتێکی پڕ ماهییەتانەیە. هەر بۆ نموونە سەرجەم تیۆرێزو میتۆدەکانی سەردەم سوودیان لە ناواخنی کولتووری کۆمەڵگا سەرەتاییەکان وەرگرتووە بۆ تەنزیرکردنی گوتارەکانی خۆیان.

گوتاری سەنتەریزمی خۆرئاوا زیاتر خودی خۆی لەسەر جەستەی کولتووری سەدەکانی ناوەڕاست تەنزیرکردووە. بەواتە کردەی تەئویل لە تەک جەستەو دەقی کولتووریدا زیاتر هەمەئاهەنگییەکی هەیەو مامەڵەیەکی کارای لە تەک دەکات، بۆ بەرجەستەکردنی سەرجەم ڕایەڵە مرۆڤایەتییەکان و حاڵی بوون لە شوناسنامەی سەرجەم مرۆڤایەتی کە جەستەو هەیکەلی کولتووری هەزاران ساڵی لەخۆیدا کۆکردۆتەوە، سەرجەم هەوڵەکانی (نەسر حامد ئەبو زەیدو حەسەن حەنەفی و...تاد) لە بوارەکانی کولتوورو ئایین پراکتیزەکراون کە زیاتر پێیان وابوو کە دەبێت جەستەی کولتوور بلەقێنرێت لە سەرجەم ڕایەڵەکانی مێژوودا دەربهێنرێت و پەیوەست بکرێتەوە بە زەمەنی ئێستا، بۆ بەرجەستەکردنی ماناو دەلالەتی نوێ و بخرێتە نێو ڕایەڵەکانی خوێندنەوەو شرۆڤەکردنەوە، تەکانێکی هزری و مەعریفی پێ بدرێت.

ستراتیژییەتگوتاری تەئویلییەت، زیاتر بۆ ئەو مەرامە کار دەکات کە سەرجەم ڕایەڵەکانی نێو هەناوی کولتوور بخاتە نێو تانوپۆی پرۆژەکانی هاوچەرخ، دەیەوێت لە ڕوئیاگرتنێکی تایبەتدا سەرجەم تێزو ڕایەڵە کولتوورییەکان ڕاڤە بکات و بیان خوێنێتەوە.

ئەگەر بێت و سەیری مامەڵە تەئویلیەکان بکەین، لە پانتاییەکانی گوتاری خۆرئاوا، دەبینین هزرمەندەکانیان زۆر بە پەرۆشەوە توانیوایانە جەستەی کولتووری خۆیان بخەنە نێو ڕایەڵەکانی تەئویل و بەمەش توانیویانە گرنگی و بایەخێکی تۆکمە بە گوتارییەتی خۆیان ببەخشن. ئەگەر بێت و بە ڕوئیایەکی زانستییانەو مەعریفییانە سەیری سەرجەم گوتارە فەلسەفی و هزرییەکانی هەیکەلی خۆرئاوا بکەین دەبینین ستوونێکی تەئویلی لە پشت ئەو گوتارە خودی خۆی حەشارداوە، ئەمەش بۆ تۆکمەکردنی گوتارییەتی خۆیان، بۆ نموونە گوتارە فەلسەفییەکانی دریدا بۆ تۆکمەکردنی گوتارەکەی خۆی پێویستی بە مامەڵەیەکی تەئویلیانە هەیە بۆ خوێندنەوەو تەفکیکییەتکردنی کولتوورو مێژووی جەستەی خۆرئاوا، هزرمەندانی خۆرئاوا توانیویانە سەردەم و زەمەنە پڕ ماهییەتەکانیان لەسەردەمەکانی پێشووی دوگمایی و پاپاییەکان جیا بکەنەوەو توانیویانە مانایەکی زیندوو بە هزریەتی مێژووی خۆیان بدەن.

### (تەفسیر/ تەئویل) لە چەند دیدگایەکدا

بێگومان وەکو لامان ڕوون و ئاشکرایە کە لە پێشوودا تا ڕادەیەکی شیاو و گونجاو توانیمان بەنێو ڕیشاڵ و ڕایەڵەکانی ستراتیژییەتگوتاری (هیرمینیۆتیکا) شۆڕببینەوەو سەرجەم چەمک و دەلالەتەکان بە دیدگای ئێوەی خوێنەر ئاشنا بکەین و شوناسنامەیەکی ئەم میتۆدو ستراتیژییەت گوتارەیە بۆ ڕوئیاکانی خوێنەر بگوازینەوە.

جا لێرەشدا بە پێویستی دەزانین کە هەردوو چەمکی (تەفسیر/تەئویل) لە شێوازێکی تان و پۆکراوی شەفافدا بخەمە بەر دیدگای ئێوە، ئەم دوو چەمک و دەلالەتە زیاتر دوو چەمک و دەلالەتی کردەیین. بەواتە وەک دوو میکانیزم و ستراتیژییەتی مەعریفی توانیویانە مامەڵە لەگەڵ جەستەی دەق بکەن و خوێندنەوەو شرۆڤەکارییەکی پێویستی بۆ بکەن، ئەم دوو میکانیزمییەتەش زیاتر لەنێو ڕایەڵە مەعریفی و

هزری و فەلسەفییەکانەوە مانا بە خودی خۆیان دەدەن و لە ئیرادەشیاندا هەیە بخرێنە نێو سەرجەم گوتارە پڕ لە جەدەلییەتە مەعریفییەکان.

پرۆسەی ڕاڤە (تەفسیر) زیاتر پرۆسەیەکی کەشفییە، بە واتە تەفسیر زیاتر بەو مەرامە کاردەکات کە پێوەندییەکی تۆکمە لەگەڵ سەهمە مەرامگەرییەکانی (نووسەر) و ڕایەڵە دەلالییەکانی جەستەی دەق دەبەستێ. (٥١).

خودی پرۆسەی تەفسیر ناگەڕێت بە شوێن مەدلولەکانی دەق، بەڵکو زیاتر لە پێناو ئەوە کار دەکات کە کرۆک و دالییەتی کایە حەقیقییەکە بەرجەستە بکات کە لە لایەن خوڵقێنەری دەق دێتە دامەزراندن، ئەمەش لەڕێگای شرۆڤە کردنی سەرجەم کایەو دەلالەتەکانی جەستەی دەق دێتە کایەوە. جا لێرەدا خودی ڕاڤەکار بە شوێن کایەترین و دەلالەتترین حەقیقەتی دالە ماناداڕەکان دەگەیەنێت بۆ بەرجەستەکردنی. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بانگەشەی فۆرمێک لە تاک ڕوئیایی لە ڕوئیا وەرگرتن و هزر کردنەوەدا چەشنی میتۆدی (مۆدێرنیزم) کە ئەویش زیاتر جەخت لە تاک ڕوئیای و تاک فۆرمی دەکاتەوە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا جۆرێک لە نامۆیی و فەزا داخراوەیی دەخوڵقێنێ.

ستراتیژییەت و مەنهەجییەتی (ڕاڤە) زیاتر خودی خۆی لەوە کۆدەکاتەوە کە کایە حەقیقییەکان تەنیا لە یەک سات و یەک فۆرمدا لە تاک ڕوئیایەکدا خودی خۆی نمایش دەکات و خودی خۆی زەق دەکاتەوە، ئەمەش وا دەکات تەنیا لە نێو ئاستی سەرەوەی جەستەی دەق کار دەکات، بە واتە تەنیا مامەڵە لەگەڵ ڕایەڵەکانی ئاستی دیارو بەرچاوەکان، خودی خۆی شۆڕ ناکاتەوە بۆ ئاستی ژێرەوە کە بە ئاستی کەڵەکەبووی کایە مەعریفی و هزرییەکان ناسراوە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو کایە شاراوانە فەرامۆش بکرێت و خوێندنەوەی تایبەتییان بۆ نەکرێت، جا لێرەدا هەناسە تەنگییەک تووشی میکانیزمییەتی خوێندنەوەی دەق دەبێت و ڕوویەکی دەق (دیوی ناوەوە) دەبێتە پەراوێزێکی نازیندوو، چونکە ڕوئیاگرتن و بایەخ دان بە ئاستی سەرەوەی دەق (ئاستە ڕووکەشییەکەی) دەبێتە هۆی لە دایک بوونی ڕۆحییەتی دوگمایی و چەشنێک لە داخراوەیی ماناوە.

(ڕاڤە) ئەو میتۆدو ستراتیژییەتەیە کە زیاتر سەهمێکی تاک دەسەڵاتی دەخوڵقێنێ، ئەم چەشنە تاک دەسەڵاتییەش، واتە لە تاک ڕوئیاکاندا خودی (ڕاڤەکار) لە دایک دەبێت و دەخوڵقێ، واتە (ڕاڤە)و خودی (ڕاڤەکار) زیاتر دەیانەوێت چەشنێک لە هەیمەنەیەکی دەسەڵاتگەرانە دروست بکەن، بۆ ئەوەی چوارچێوەو سنوورێک بۆ گوتاریەتی دەق دابمەزرێنێ.

کاتێک ڕاڤەکار جەستەی دەق دەخاتە نێو ڕایەڵەکانی شرۆڤەکردن و خوێندنەوەی خۆی. چەندی مانای پێ بدات، ئەمە دەبێتە خوێندنەوەی ڕەهاو هیچ کەس بۆی نییە خوێندنەوەی تری بۆ بخاتە کار، ئەمەش وەکو وتمان دووبارە جەستەی دەق تووشی خنکاندن دەکات و بەرەو ئیفلیجی دەبات، ڕاڤەکار سەرجەم کایە ماناداڕەکان دەخاتە نێو ڕایەڵە مۆنۆپۆلییەکانی خۆی، بۆ ڕوئیاکانی خودی خۆی قۆرخ دەکات.




لە کۆتاییدا دەتوانین بێژین: خودی ڕاڤەکارو میتۆدی (تەفسیر) بەو مەبەستە کار دەکەن، لەنێو جەستەی دەقدا کە سەرجەم (ڕەنگەکان، فۆرمەکان، ماناکان، کایەکان) بەیەک ڕەنگ و یەک فۆرم و یەک ماناو یەک کایە بخوێنێتەوەو هیچ خوێندنەوەی تری بۆ نەبێت و بیخاتە ژێر هەیمەنەکانی خودی خۆی، ئەمەش هاودژ دەوەستێتەوە لەگەڵ ڕوئیاکانی دریدا سەبارەت بەمەسەلەی خوێندنەوەی دەق کە دەڵێت: «هیچ خوێندنەوەیەک، دواخوێندنەوەی بۆ نییە، تەنانەت خوێندنەوەکانی منیش دواخوێندنەوەیان بۆ نییە».

لە پاڵ میتۆدی (ڕاڤە) میتۆدو ستراتیژییەتێکی خودی خۆی دەخاتە بەر ڕوئیاکانی خوێنەر وەک ستوون و ڕایەڵەیەکی کارا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ جەستەی دەقدا خودی خۆی نمایش دەکات کە ئەویش ستراتیژییەت و میتۆدی (تەئویل)ە.

میکانیزمییەتی (تەئویل) زیاتر میکانیزم و پرۆسەیەکە، خودی خۆی وەک سەهمێکی کارا شۆڕدەکاتەوە بۆ نێو ڕیشاڵە چڕو باریکەکانی جەستەی دەق، بەو مەرامەی کە سەر لەنوێ ڕۆحییەتێکی جاویدانی بە سەرجەم کایە ماناداڕەکان ببەخشێتەوەو بیانخوڵقێنێ. پرۆسەی (تەئویل) چەشنی میکانیزمییەتی (تەفسیر) تەنیا لێکدانەوەو خوێندنەوەی دەلالەتەکانی نێو فەزای دەق ئەنجام نادا، بەڵکو زیاتر بە شوێن مەرامێکی فەزاکراوەدا دەگەڕێت کە ئەویش فراوانکردنی مەداری کایە دەلالییەکانە، بە شوێن ئەمە وێڵە کە سەرجەم خەلایە شاراوەکانی نێو قوڵگی دەق دەگەڕێت بۆ بەرجەستەکردن. بەواتە کاتێک ستراتیژییەتی (تەئویل) بۆ مامەڵەکردنی لەگەڵ جەستەی دەقدا، دەیەوێت لە چەند


دریدا

سووچێکی جیاواز ڕوئیا بگرێت بۆ زەمینەی دەق، بۆ ئەوەی چەندین ڕایەڵ و ستوون بە خودی خۆیدا هەڵبگرێت و فرەمانایی و فرەڕەنگییەت بونیاد بنێت. خۆی تەنیا بۆ یەک تاک ڕەهەندو تاک مانا چڕ ناکاتەوە یان هاوشێوەی میتۆدی (ڕاڤە) بە شوێن کایە حەقیقییەکاندا ناگەڕێت، بەڵکو زیاتر بە شوێن فرەتەئویلییەت و فرەماناییدا دەگەڕێت و دەیخاتە بەر ڕوئیاکانی تاکی خوێنەر یان زیاتر بە واتایەکی شەفافتر بێژین: پرۆسەی تەئویل هەنگاوەکانی خودی خۆی ناهاوێژێت بۆ تەنیا بەرجەستەکردنی یەک حەقیقەت و یەک مانای ڕەهادار، چونکە هیچ حەقیقەت و مانایەک نییە کە ڕەهادار بێت یان لەنێو سەرجەم کایە کەونییەکاندا، هیچ کایەیەک نییە کە بانگەشەی ڕەهایی بە خودی خۆی بدات، زیاتر ئەو کایە حەقیقییانە لەژێر ڕوئیاکانی تەئویلێکی لۆژیکی بەرهەم دێت و بەرجەستە دەبێت.

ساتێک پرۆسەی تەئویل دێت مامەڵە لەگەڵ جەستەی دەق دەکات، هاوفۆرمییەتی ستراتیژییەت و میتۆدی (ڕاڤە) هەڵناستێت بە پراکتیزەکردنی سەرجەم کردە ڕاڤەییەکان، بە واتە تەنیا گرنگی بدات بە یەک ئاست (ئاستی سەرەوەی دەق)، بەڵکو میکانیزمییەتی (تەئویل) ڕوئیا بەوە چڕ دەکاتەوە کە ساتێک مامەڵە لەگەڵ دەق دەکرێت بۆ کەشفکردنی سەرجەم کایەکانی نێو هەناوی دەق، دەبێت مامەڵە لەگەڵ سەرجەم کایە (دیار/ نادیار)ەکان بکرێت، نەک تەنیا لە یەک ئاست و لە یەک دیو بکۆڵدرێتەوە، چونکە ئەگەر بێت و مانای دیار بوونی نەبێت، ئەوە ئەو کات مانای شاراوەش بوونی خۆی دانامەزرێنێ، بە واتە کاتێک چەمکێک خودی خۆی نمایش دەکات، ئەوا خودی ئەو چەمکە هەڵگری جووتێک لە مانا بەخۆیدا دەدا یان لەنێو هەر چەمکێکدا دوو مانای دژ بە خودی خۆی دەلکێنێ و هەڵدەگرێت، چونکە نەبوونی یەکێک لەو دژانە، ئەوە نەبوونی دژەکەی تریشە، بەواتە بە جووتە دەتوانن هەناسە بە خودی خۆیان بدەن و جەستەی خۆیان نمایش بکەن.

جا لێرەدا پرۆسەی (تەئویل) ساتێک کۆنترۆڵی ئاستی سەرەوەی دەق دەکات، ڕاناوەستێت، بەڵکو ڕاستەوخۆ بە ئیرادەی ئەو ڕایەڵە مەعریفی و هزرییانەی کە خودی خۆی پێ بارگاوی کردووە، هەڵی گرتووە. شۆڕدەبێتەوە بۆ نێو هەناوی دەق و ئاستی ژێرەوەی کە بە ئاستی (کەڵەکەبووی کایە مەعریفییەکان) بە ناوبانگە، بۆ بەرجەستەکردنی سەرجەم کایە مەعریفییە حەشاردراوەکان.




جا کاتێک ئەم پرۆسەیە شۆڕ دەبێتەوە بۆ مانای (دیار/ نادیار) ئەو کات دەتوانێت ڕۆحیەتێکی کراوەو جاویدانی دوور لە ڕۆحیەتی دوگمایی دەق بەکردەی بەرجەستەکردنی دەق بدات، بە واتە دەتوانێت سەرجەم کایە ماناداربنەکان لە ژێر سەرجەم هەیمەنە خنکێنراوەکان ڕزگار بکات و دەتوانێت چەندین ڕایەڵ و ستراتیژییەت و چەمکی (هزری و مەعریفی و زمانی....تاد) بخولقێنێ. ئەو کات دەتوانێت جەستەی دەق لە سەرجەم ژەهراوییەکانی (مێژوو/ ئایدیۆلۆژیا/میتۆلۆژیا) دەرباز بکات، ئەو کات (تەئویل) دەبێت بەو مینبەرەی کە خوێنەر مافی ئەوەی هەیە کە ئازادانە و ڤاڵاییانە مامەڵە لەگەڵ جەستەی دەق بکات و هەروەها ئازادانەو دیموکراسییانە لە هەر ڕوئیاگرتنێکدا، دەتوانێت ڕوئیا بگرێت، بۆ جەستەی دەق، بۆ کەشفکردنی سەرجەم کایە شاراوەو دیارەکان، ئەو کاتیش دەتوانێت فۆرمێکی دیموکراسییانە بۆ شرۆڤە کاری دەق دابمەزرێنێ.

ئەوە ماوە بێژین: کە جگە لەو ڕایەڵ و ستراتیژییەتانەی کە ستراتیژییەتگوتاری تەئویل دەیانگرێتەوە بەر بۆ ڤاڵایی کردنی فەزای دەق و شکاندنی سەرجەم نیمادەکانی نێو جەستەی دەق، ستراتیژییەتی ساتێک دەیەوێت دەق ئازاد بکات لە سەرجەم تەپوتۆزی مێژوو، دێت بۆ سەرجەم زەمەنەکان (مانا)ی زیندوو دەخولقێنێ، ئەمەش خۆی لەخۆیدا، میکانیزمییەتی خولقاندنی (مانا) گەشەیەکی زیندوو و جاویدانی پێ دەبەخشێت و لە وەستاندا نایانهێڵێتەوەو دەیانخاتە جووڵەیەکی بەردەوام کە لەگەڵ

هەنگاوەکانی زەمەندا دەیانخاتە گەڕ. بە واتایەکی شەفافتر بێژین، تەئویل هەمیشە بۆ سەرجەم جیاوازەکان خودی خۆی دەخاتە گەڕ، بۆ وەدەست هێنان و خولقاندنی مانای زیندوو، هەروەها کوشتنی جەستە گومانی‌اوییەکان هەروەک پۆل ڕیکۆر کاری تێداکردووە، ئەگەر لە کۆتاییشدا بتوانین (تەئویل/ڕاڤە) لەیەک فۆرم و ستوون یەک بخەین دەبێژین: (تەئویل/ ڕاڤە) دوو کردەی جیاوازن، بەڵام بەرەنجام و خولقاندنەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ساتانەی کە خودی خوێنەر لەنێو جەستەی دەقدا خورد دەبێتەوە لە ساتەکانی گەڕان و شۆڕبوونەوە لەنێو پرۆسەی خوێندنەوەدا. بەواتە لە یەکەم ساتی ڕوئیاگرتنی تاکی خوێنەر بۆ جەستەی دەق بەو هیواو خۆزگەیەی کە بەرجەستەکردنی ئەم خەلایە شاراوانەی کە لە هەناوی دەقدا حەشاردراون، تا ئەو ساتەی کە بەرجەستە دەکرێت و چەمکی تێگەیشتن دێتە خولقاندن و لە دایک بوون.

## (کردەی تەئویل)

لەم گۆشەیەدا زیاتر ڕوئیاکانمان چڕ دەکەینەوە لەسەر مەسەلەی (کردەی تەئویل).. هەمیشە وەکو درکمان پێکردووە کە (کردە) زیاتر چەمکی جووڵەیەک فۆرمەڵە دەکات، جا لێرەدا مەبەستی ئێمە تەنیا ئەوە نییە کە شتێک لە شوێن و زەمەنێک بۆ شوێن و زەمەنێکی تر بگوازینەوە یان هەر گۆڕانێک ڕووبدات، بەڵکو زیاتر مەبەستی ئێمە لێرەدا سەبارەت بەو کردەیەیە کە لە کەشکۆڵی زەینەوە دەخولقێ و نەشونما دەکات.

(کردەی تەئویل) زیاتر هەنگاوێکە لە گۆشەکانی زەین و عەقڵەوە سەرچاوە دەگرێت و دەست دەکات بە نەشونماکردن، هەمیشە مامەڵە لەگەڵ (دەقی نووسراو) دەکات، بەواتە ستراتیژییەت و کردەی تەئویل بە هیچ کلۆجێک جەستەی دەق لەنێو تاک فۆرمێکی کۆنکریتیدا ناهێڵێتەوەو تووشی نەخۆشی هەناسەتەنگی ناکات. بەڵکو ساتێک شۆڕ دەبێتەوە بۆ نێو خەلایەکانی جەستەی دەق، بەو مەرامەی کە سەرجەم پەنجەرەکان ڤاڵا بکات و خوێندنەوەی بۆ بکات و لەسەرجەم نیمادەکانی ڕزگار بکات. بە واتە (تەئویل) خەڵقەندەی دەقی زیندووە یان (تەئویل/ خوێندنەوەی دەق) هەمیشە شۆڕبوونەوەیە بۆ نێو خەلایەکانی دەق و کەشفکردنی سەرجەم دەلالەتە زمانییەکانە.

کردەی تەئویل هەمیشە بە دوای ئەو مەرامەدا وێڵ و سەرگەردانە کە مانای زیندوو بخولقێنێت لەنێو جەستەی دەقدا، بەڵکو تەنیا بە شوێن خوێندنەوەو شرۆڤەکردنی دەلالەتە سیحراوییەکانی دەق لەگەڕیان نییە، بەڵکو زیاتر بە شوێن دۆزینەوەو بەرجەستەکردنی پانتایی و فەزایەکی بەرفراوان دەگەڕێت لەنێو هەناوی خەلایەو ڕایەڵە دەلالییەکاندا. هەروەها بە شوێن کەشفکردنی ئەو خەلایە نابەرجەستانەی کە کەوتوونەتە پشت ڕایەڵە چێنراوەکانی دەق و هەمیشە عەودالی ئەوەیە کە مانای نوێ و دەلالەتی زیندوو کەشف بکات لەنێو پرۆسەکانی خوێندنەوەدا.

هەمیشە تەئویل وەک ستراتیژییەت و تاکە کەرەسەیەک وایە کە مامەڵە لەگەڵ مەجازدا دەکات، هەروەها دەیەوێت هەمیشە شۆڕبێتەوە بۆ نێو کرۆکی مەجاز بۆ بەرجەستەکردنی حەقیقیترین دەلالەت و مانا.. مانای حەقیقی و دەلالەتی حەقیقی، سەرەڕای ئەمەش وەکو لە پێشوودا تیشکێکی کورت و کزمان خستەسەری کە پرۆسەو ستراتیژییەتگوتاری تەئویلییەت بە خۆ قایم کردن بەسەرجەم پرەنسیپە مەنتیقییەکان و میتۆدە ڕەخنەییە سەردەمییەکان لایقی ئەوەیە کە بتوانێت سەرجەم خەلایەکی ماناکان ڤاڵا بکات و ڕایەڵەکانی ڕزگار بکات و بە ئەنجام بگەیەنێت و سەرجەم جەستە تەلبەندکراوەکانیش لە دەلالەتە تەقلیدییە سەلەفییەکان ئازاد بکات کە نەیانهێشتووە هەناسەیەکی زیندوو هەڵمژێت و بداتەوە، بەڵکو خستوویانەتە نێو چەندین ستوونی تەقلیدی و ناهەموار، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بۆتە هۆی نەخولقاندنی کایەو مانای تازەو نوێ.

هەمیشە پرۆسەی تەئویل مامەڵەکردنەکانی لەگەڵ (جەستەی دەق)ە، چونکە ئەگەر پانتایی و زەمینەیەک نەبێت بۆ هەڵڕیشتنی سەرجەم ڕوئیاکان و ڕایەڵە مەعریفییەکان کە لە خودی خۆیدا هەڵی گرتووە، ئەوە ناتوانرێت هیچ میتۆدێک لەسەر هیچ زەمینەیەک پراکتیزە بکرێت، کاتێک دێت و دەیەوێت مامەڵە لەگەڵ دەقدا بکات، تەنیا بە شوێن گوتراوەکان ڕازی نییە لە ساتی ڤاڵایی کردنی زەمینەو فەزای دەقدا، بەڵکو شۆڕدەبێتەوە بۆ ئاستی ژێرەوەی دەق کە بە ئاستی کەڵەکە بوونی سەرجەم کایە مەعریفییەکان ناوزەد کراوە، بۆ بەرجەستەکردنی کایەو گوتە نەوتراوەکان (گوتەخاوەکان) کە هەمیشە دەق لەنێو بێدەنگییەکدا نقومیان دەکات، بێگومان ئەمەش جۆرە مەرامێکی زاتی نووسەری تێدایە.

پرۆسەی تەئویل تەنیا بە شوێن کەشفکردنی ئەو مانایانەش عەودال نییە، بەڵکو زیاتر بە شوێن ئازادکردنی ئەو کایەو مانایانەش عەوداڵە کە دەسەڵاتی دەق خستوونییەتە نێو چەند تەلبەندێکی کۆنکریتی، ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەبێتە هۆی هەناسە تەنگی و کوژران و سڕینەوەی چەندین کایەی زیندوو، هەروەها دەبێتە چەشنە داخراوەیەک، ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەبێتە هۆی خولقاندنی ڤایرۆسێک بۆ کرۆژتنی ئەو ڕۆحە

خولقێنەرە زیندووەی کە جەستەی (دەق) دەهێنێتە خولقاندن.

هەمیشەو هەمیشە پرۆسەی تەئویل لەنێو هەناوی دەلالەتە زمانییەکاندا خودی خۆی نمایش دەکات، چونکە (دەق=زمان).

مادام دەق یەکسان بێت بە زمان، ئەویش هەنگاوەکانی خودی خۆی دەهاوێژێت بە هیوای گەشتێک بێت لە گوازتنەوەی (مانا) لە (تاک ڕەهەند ـــــ فرە ڕەهەند) (مەئلووف ـــــ نامەئلووف) و هەمیشە بێ هیچ مەرامێکی ئایدیۆلۆژی کاردەکات، تەنیا بۆ ڕزگارکردنی جەستەوکایەی مانا لەسەهمە سەلەفییەکانی مێژوودا، هەموو دەقێک وەک هەر بوونێکی دەلالی زمانی خاوەن شوناسێکی تەئویلی بۆ خودی خۆی هەیە. هەر بۆیە جەستەو ستراتیژییەتی تەئویل بەرسڤەکردنی مانایە لەنێو کەشکۆلی دەقدا، یان زیاتر لەپاڵ بەرجەستەکردن و کەشفکردندا خودی خولقاندنیشییەتی، هەمیشە واگوتراوە کە دەق بریتییە لەو کائینە زیندوو زمانییەدا، هەروەکو ڕامان وایە کە جەستەی زمان هەمیشە کون و کەلەبەری تێدایە، بەواتە مادام (دەق = زمان) کەواتە دەق بریتییە لەجەستەیەکی کون کونی پڕ کەلەبەرو درز، جا بۆ پڕکردنەوەی ئەو درزە زمانییانە پێویستی بە پرۆسەیەکی لە باردا هەیە کە ئەویش پرۆسەو ستراتیژییەتگوتاری (تەئویلییەت)ە.

جا هەمیشە پرۆسەی تەئویل ئامادەیە بۆ پڕکردنەوەو بونیادنانەوەی کایەی مانادار لە هەناوی دەقدا، گرفتی هەرە گەورەی گوتاریزمییەتی کوردیش ئەوەیە کە لە نەشیان و نەگونجانی مامەڵەکردنمان لەگەڵ جەستەی دەق و پرۆسەی تەئویلییەتە.. ❖

**پەراوێزو سەرچاوەکان**

...............

**(٣٩) بونیادی زمان، لەنێوان دوالیزمی (بە سیحرکردن)و(بە ئیمپراتۆرییەت بوون)دا، ستاری پیرداودی، (لێکۆڵینەوە)، (ڕامان) ژ.(٤٠)، تشرینی یەکەمی (١٩٩٩)، ل.٦٠.**

**(٤٠)حركة التأويل، موريس أبو ناضر، آفاق جديدة (الحياة) ،عدد (١٢٨٧٢).**

**(٤١) لەکردەی ئەدەبییەوە بۆ دەق، گۆڤاری (سەراب)، ژ (٣-٤).**

**(٤٢) من البنيوية الى التفكيكية، عبدالعزيز حمودة، ص.**

**(٤٣)الممنوع و الممتنع، علي حرب، نقد الذات المفكرة)، الطبعة الاولى، ١٩٩٥، ص٣٠-٣٧.**

**(٤٤) مجلة (الطليعة الادبية)، عدد (٢)، ١٩٩٩.**

**(٤٥) مقولات الفكر ومقولات اللغة، اميل لنفست، مجلة (الفكر والنقد)، عدد (١٦)، سنة (١٩٩٩) ،ص١١٥-١١٩.**

**(٤٦) الممنوع و الممتنع، ص٣٠-٣٧.**

**(٤٧) التأويل والحقيقة، ص ٢٢٠-٢٣٠.**

**(٤٨) هەمان سەرچاوەی (٣٩).**

**(٤٩) دەقی تەئویل.. تەئویلی دەق، ئومێد قەرەداغی، گۆڤاری (ژیار)، ژ (٢) ساڵی یەکەم ساڵی (٢٠٠٠)، ل٧٨.**

**(٥٠) مغامرة المنطق البنيوي، ابراهيم محمود، الطبعة الاولى،١٩٩١، ص١١٣-١١٧.**

**(٥١) الممنوع والممتنع، ص٧٩-٣٨.**



# سەمەد هەر زیندووە

عەلی ئەشرەف دەرویشیان
و/ لە فارسییەوە: عومەر باڵەکی
(کوردستانی ئێران)

(١ - ٢)

سەمەد بیهرەنگی لە دایک بووی ساڵی (١٩٣٩ز)، (١٣١٨)ی هەتاوییە خەڵکی شاری تەورێزە. دوای دیتنی دەورەی دانیشسرای مقدماتی (پیمانگای مامۆستایەتی) دەبێتە مامۆستا لە گوندەکانی سەر بە شاری تەورێز و ئازەرشار و لە ماوەیەکی کەمدا دەبێتە خۆشەویستی منداڵانی بێ دەرەتان و خەڵکی هەژارو دەست کورتی ئەو ناوچانە. هەر لە منداڵییەوە ئۆگری نووسین بووە و لە ڕۆژنامەی دیواری قوتابخانەکەیان بەنێوی («خندە» پێکەنین) بابەتی نووسیوە. بابەتەکانی سەمەد سادەو ساکاربوون، بەڵام بۆ دەسەڵاتداران حوکمی خەنجەرێکی تیژیان هەبوو. مەرگی سەمەد بۆ کەس ڕوون نەبووە لە ڕۆژی (١٣٤٧/٦/٩) تەرمی بێ گیانی ئەویان لە ڕووباری ئەرس گرتەوەو ڕۆژی (١٤/ ٦/ ٤٧) لە تەورێز بە خاک سپێردەدرا کە ئەوساڵ واتە ڕۆژی (١٤/ ٦/ ١٣٨٠)هـ-ش بەرامبەر (٢٠٠١/٩/٥)ز دەبێتە (٣٣)یەمین ساڵرۆژی لە دەست چوونی سەمەدی بیهرەنگی و بەو بۆنەوە وتارێک کە عەلی ئەشرەف دەرویشیان لەساڵوەگەڕی مەرگی سەمەددا پێشکەشی کردووە وەربگێڕینەوەو بەجۆرە یادی سەمەد لە دڵی هەموو منداڵە بێ دەرەتان و ناز لێ شێواوەکان زیندوو ڕابگرین.

**«منداڵ دەبێ بزانێ کە بابی بە چ کوێرەوەرییەک پاروە نانێک پەیدا دەکاو براگەورەکەی چۆن زوڵمی لێ کراوەو پەلەقاژە دەکاو دەخنکێ»**

**- سەمەد بیهرەنگی -**

سەمەد (٦٢) ساڵ لەمەوبەر لە یەکێک لە گەڕەکەکانی شـــاری تەورێز، وەک هەزاران منداڵی دیکە لە دایک بووە. (١) یەکەم شتێک کە بە گوێی ئاشنابوو، نەداری بوو و ئەم منداڵەکە لە هۆدە بچکۆلەکەیان لە تەنیشت دایک و بابی لە مەلۆتکە پێچرابوو ناوی (سەمەد) یان بەسەردا بڕی.

ئەو لەگەڵ منداڵە هاوتەمەنەکانی خۆی لە کۆڵان لەنێو گڵ و خۆڵدا یاریی دەکرد، بەڵام قەت وەکو خەڵکانی تر پشتی لە چینی خۆی نەکرد، تا دواپشووی ژیانی لەوان دواو بۆ ئەوانی نووسی. بۆ خۆی لەم بارەوە دەڵێ- وەک کارگێک لە دایک نەبووم بێ دایک و باب، بەڵام وەک ئەو هەڵداوە. وەک ئەو لەنێو نەچووم- جێگایەک کە تەڕاییەکی لێ بووبێ خـۆم بۆ لای ڕاکێشـاوە، کـەس نەبووە ئاوم بدا. ئەمن پێگەیشتم.... وەک داری سنجووخواروخێچ و قانیع بە کەم ئاوی بووم، لە یەکێک لە دێهاتەکانی ئازەربایجان بووم بە مـامـۆسـتـا. بابم دەیگوت «ئەگەر خاکی ئێران بەسەر ئێرانییەکاندا دابەش بکەن لەوە زیاترت وەبەر ناکەوێ و ....»

یەکەم نووسراوەی سەمەد بەناوی (تەڵخوون) کە وەرگێڕاوێک بوو لە چیرۆکە فۆلکلۆرییەکانی دەڤەری

ئازەربایجان کە بە ئیمزای (ص- قارانقووش کە لە کتێبی حەوتوودا لە چاپ دراو، سەرەتا بە شیعرێکی (م- ئومێد) دەستی پێ کرد بوو کە هەڵقوولاو لەدەروونی نائارامی ناوبراو بوو:

**من لێرە هێندە دڵم تەنگە**
**کە هەر سازێک دەبیستم بێ ئاهەنگە**
**وەرە با بڕێوی ڕێگا هەڵبگرین**
**بارێ یەک بگرین کە گەرانەوەی لەبەرنەبێ**
**بابزانین ئاسمان لە هەر شوێنێک بێ هەریەک ڕەنگە؟**

بەداخەوە زۆری نەخایاند کە ئەم گۆڤارە مەیدانی بۆ ڕەنگیننامەکانی بازرگانی چۆڵ کردو بوو بە هۆی ئەوە کە بەرهەمەکانی بۆ ماوەیەک دەگاتە دەستی ئێمە کە لە شارەکاندا دەژیاین، بەڵام ئەو نووسراوەکانی خۆی لە ڕۆژنامەی (مەهدی ئازادی) لە شاری تەورێز و هێندێ جار بە شێوەی ئازادیش و پاشان لە گۆڤارەکانی دیکەدا بڵاوی دەکردەوە. ئەو دەیەویست لە تاریکدا ببێتە هاوارێک بۆ گیانی ماسی خۆرەکان، دەیەویست ببێتە بڵێسەی ئاگر و لەشەوە زەنگدا داگیرسێ، ببێتە ئافات و لە دارستانی تاریک و بێدەنگدا ببێتە گوڵ نەستێرەو بۆ (خودکارەکان) ببێتە کۆرئۆغڵوو(٢)..... بەداخەوە ئەو هاوارە لە تافی لاویدا دەنگبڕکرا.

لە خۆمان دەپرسین سەمەد بیهرەنگی ئەو پیاوە ساکارو ڕووناکبیرە لەو ڕادەیەدا چۆن بوو بەخۆشەویست؟ ئایا بە پارانەوەو لالانەوە و خۆ بەم و ئەو هەڵاواسین و نان قەرزدان بوو، یان لەلاپەڕە ڕەنگینەکانی گۆڤارەکاندا بەوێنەی بچووک و گەورەی ڕووناکبیر ئاسایانە خۆی خەریک کرد؟ یان وەک ئەو بێ فەرهەنگانەی کە خۆیان بە ڕووناکبیر دەزانن و لە مەیخانەکاندا بیرەیەکی سارد دەخۆنەوەو لەگەڵ هەڵدانی هەر قومە بیرەیەک باسێک لە خەڵک دەکەن؟

بەڕاستی چۆن بوو کە هێندێک لە کتێبەکانی سەمەد لە ماوەی یەک مانگ و نیودا لە چاپ دەدرانەوە؟ ئایا کتێبی لەو بابەتەت پێ شک دێ(٣)

ئەوە لە سەردەمێکدایە کە زۆر کەس بەناوی شاعیر سەری بە ئاخوڕێکەوە بەندە.(٤) هەر نووسەرێک ڕیسەرێکەو هەر مەیخانەیەک گەورەترین ناوەندێکە بۆ شیکردنەوەی گیروگرفتەکانی ژیان و هەر پیاڵە بیرەیەک ڕێگا چارەی کێشە کۆمەڵایەتییەکانە. بۆچی دەبێ ڕێزو حورمەتمان لەبەرامبەر سەمەدی خۆشەویست نەبێ کە بە مووچەی کەمی مامۆستایەتی کتێبی دەکڕی و دەیگەیاندە دەستی لاوەکانی شارو دێهاتەکان و ئەو کارەی لە سەردەمێکدا بەڕێوەی دەبرد کە بۆ دروستکردنی تەنیا یەکدانە ئاودەست لەفلانە ئاوایی



سەمەد بیهرەنگی

هێڵەکانی پێوەندی تەلەفوونەکانی لایەنە پێوەندیدارەکان هاواریان لێ بەرزدەبووەوە. ئایا ناوبراویش لەگەڵ هەڤاڵانیدا بەرەوڕوو دەبووەوە گەورەترین گرفتی خۆخەریک کردن بەمەی خواردنەوە بوو؟ لە دەورانێک کە شاعیرانی (خەڵک) لەبەر زۆر خۆری و فرەخەوتندا وەک گەنمەشامی-ی کوڵاو هەڵدەماسین و بەدەم باوێشکەوە بەسەدان جار ناوی خەڵکیان لە زار دەردەپەڕێ و کاتێک لەگەڵ خەڵک بەرەوڕوو دەبنەوە وەک کەسێکی تاعوون لێدراو ببینن لەبەریان هەڵدەهاتن و بەو برە پارەیەی کە بۆ دابینکردنی تریاک و مادەدە بێ هۆشکەرەکان بۆ فلانە شاعیر لەبەر چاودەگیرێ، دەشێ کتێبخانەیەک بۆ لاوە بێ بەشەکانی شارەکان دروست بکرێ، بەم پێیە جێ خۆیەتی یادی سەمەد درەوشاوەو پرشکۆ بێت و کەسایەتییەکەی هەمیشە زیندوو بێ. من چ نیازێکم بە نووسراوەکانی (جان شتاینبەگ هەیە؟) ئەوکە بە کردەوە سەلماندوویەتی کە هەموو دەربڕینەکانی درۆ بووە، ئەو کە پشتی لە چینی خۆی کردو ئاگری ڕەشاشی بەسەردا باراندن. من فیلمەکانی (جان وەین)م بۆچییە؟

ئەو کە بە مەستان لەچەنەی ئەو مەزڵوومە دەست بەستراوانەی دەدا، ئیدی ئەو سەردەمە بەسەر چووەکە ئیستیعمار لە بەرگی هونەرمەنداندا بیەوێ بە فریوم بدا. یادی ئەو لەکاتێکدا زیندوو دەکەینەوە کە فلانە شاعیری مەیخانەنشین بەرگی دیوانەکەی بەیادی ڕەنگی ئاوڵکراسی دەزگیرانەکەی هەڵدەبژێرێ یان فلانە شاعیری دیکە لەسەر مژۆڵی دەزگیرانی شووتی دەڕوێنێت و لەسەر شووتییەکانیش تەقڵە لێدەدات. ئەو جۆرە هونەرمەندانە، کارگێری کۆمپانیایەک بیردێننەوە کە بۆ بانگەشە هەر چیرۆک و حکایەتێک لە گۆڤارەکاندا بڵاو دەکەنەوە، هەموویان دوعاخوێنی بەڕێوەبەرەکانیان و دیتمان کەچۆن بە دز


م. ئومێد

دەرچوون. هەر کاتێ چاوم بە وێنەیەکی ئەو هونەرمەندانە دەکەوێ کە سیگار بە لالێوەوە و بە شێوەیەکی فیز ئاسایانە گنج لەنێوچاوانیان دەهاوێن و بەشێوەیەکی دەسکردانە بەرۆیەکی هەڵیناوەتەوە، پڕ بەدڵ حەز دەکەم لە بن وێنە نمایشییەکانیاندا بنووسم:

(ڕۆنی مەسڵەحە کواتامی ڕۆنەکەرە دەدات.) هەر بە ڕاستی وانییە؟ شاعیرێک لەنامەیەکدا پرسیاریان لێ کردووە کە سەبارەت بە برسی و ڕووت و ڕەجاڵان بۆ چوونی خۆی دەربڕێ و ئەویش بەم جۆرە وەڵام دەداتەوە: (ئەورۆ مەسەلەی برسییەتی لەگۆڕێدا نییە، دەبا ئەو زگە وەبەر چەقۆ بکەوێ کە لەبرسان دەناڵێنێ). دەبێ بڵێین شاعیری خۆشەویست ئەگەر وایە گرفتی ئەمڕۆ هەر هەمان گرفتی تریاک خواردنی تۆیە. هەربۆیە دەبێ بگوترێ چەقۆ لە مێشکی تۆ بکەوێ کاکی شاعیر. ئێوە و ئەوانەی وەک ئێوە بیر دەکەنەوە، نەچیرۆکەکانتان و نەبیروڕاتان و نەقسەکانتان و نەوێنەکانتان و ڕواڵەتتان وەک ژیانی من ناچێت. ئەوە نموونەیەک لەو چیرۆکانەی کە بۆ منداڵانی دەنووسن:

(ڕێوییەکە لە چەند ڕۆژ لەوە پێشترەوە ددانەکانی تیژ دەکا، هەتا کەڵەبابی (زەری) بگری و کاری تەواو بکا) ئەو جۆرە چیرۆکانە جگە لە منداڵە ناز پەروەرەکانی گەرەکە دەوڵەمەندنشینەکانی شاری تاران نەبێ چ کەسانێکی دیکە لێی تێ دەگەن(٥)؟ ئەوانە هەر هەمان شێن گێڕانی تەفرەدەرن کە لە ڕۆژی عاشووورادا دەچنە ناو بەرگی ئیمام حوسێن و شەهید دەبن و پاش تەواوبوونی ڕێوڕەسمی عاشوورا دەچنەوە ناو بەرگی پێشوویان و کرداری ڕابردوویان دەست پێدەکەنەوە.

سەمەد لەتەمەنی (١٨) ساڵیدا ڕێگای دێهاتەکانی ئازەربایجانی گرتەبەر. لەو تەمەنەدا لاوانی هاوتەمەنی سەمەد لەنێو بابەتە دەستکردەکاندا نقوم ببوون، بەڵام سەمەد ناچاربوو هەرچی زووترە وەفریای بابی بکەوێ. ئەو لەنێومان ڕۆیشت، بەڵام تەنیا بەوە دەست هێنانی پاروە نانێک قەناعەتی نەکرد. ئەو بۆ بەربەرێکانی لە حاست حەق کوژییەکان، فەسادو ناتەباییەکانی سەردەمی خۆیدا قەڵەمی خستەکارو کە بۆ زۆرکەس چەکێکی پڕ مەترسی بوو. لە منداڵەکانڕا دەستی پێ کرد. ئەو ئیدی دەیتوانی چ پەیامێکی بۆ پیروپاتاڵە وردە بۆرژواکان یا لاوە فریوخواردووەکان پێ بێ. ئەو کەسانەی کە پێیان سەلماند بوون کە تەنیا یەک مەسەلە لە گۆڕێدا هەیە، ئەویش مۆدێلی جلوبەرگ و خۆ ڕازاندنەوە و هەڵاویشتنی مۆرەی تەختەیە،... و ئەو دەیزانی دەبێ کەسێک نەشتەر لەو پورکە چڵکنە بدات، چونکە دەیزانی شیعری شاعیرانی هاوچەرخی خۆی جێی هیوا نییەو ئەمەش یەکێک لە ڕوانگەکانییەتی کە دەڵێ: «ئێمە نیازمان بە شاعیرێک نییە کە تەنیا ئارەزوومان بۆ بکا. (سەد خۆزگە ماسی سوور بام لەناو شووشەی ئارەقدا) و لێرەدا دەست دەگرێ و چاوەکانی لە بەرامبەر تەواوی نزمییەکان و پیسییەکانی دەوروبەری خۆی کوێر دەکا.)

هەروەها شاعیرێکمان پێویست نییە کە ئەمڕۆ بە شێوەی ڕواڵەتی باس لەنائومێدی و زوڵم و زۆری بکات و سبەی کە کاتی پێویست ڕەخسا خۆی لێ گێل بکاو هەروا بزانە هیچ نەبووە، لە ڕاستیدا شیعری باش قەت تووشی ئەو هەڵەچەوتانە نابێ.)(٦)

لە ڕاستیدا شاعیرێکمان ناوێ کە ئارەزوو بکاو بەردی دڵسۆزی خەڵک لە سینگ بدا، بەڵام لەکاتی ڕووبەڕووبوون لەگەڵ خەڵک خۆلادا و لەبەریان هەڵێ و سەبارەت بە خەڵک تەنیا لە کتێبەکانیان یا لە پشتی کورسیی ئارەق خواردنەوە بابەتێک باس بکەن و بنووسن.

لە جێگایەکی دیکە دەڵێ:

(کاتێک شیعری ئەو جۆرە شاعیرو نووسەرە شاری و پایتەختنشین دەخوێنییەوە بوونی دووکەڵی گازئۆیل و بەنزین دەدەن. تەواوی شیعرو قسەیان ئاخ و داخە، «ئای ئێمە چەندە تەنیا ماوینەوەو لە بیرچووینەوە، شەمعدانی گوڵ دەرناکا»، ڕابواردن و مەی خواردنەوەو گێڕانەوەی بیرەوەرییەکان دەکەنە چاشنی شیعرەکانیان. چاوەڕوانێکی زۆریشیان هەیە کە دەڵێن: ئەو خەڵکە هونەر نەناسە هێشتا زۆری ماوە لە شیعرو هونەر حاڵی بن و حورمەت و ڕێزی ئێمە بگرن. ئەوانە قەت خۆیان زەحمەت نەداوە کە بچن بۆ شارەکان و سەردانی دێهاتەکان بکەن. هەتا باش لێیان حاڵی بن شیعر بۆ کێ دەڵێن و چیرۆک بۆ کێ دەنووسن. ئەگەر ڕێز لە نیما دەگرین هۆیەکەی ڕوونە نیما پێش ئەوە شاعیرێکی گەورە بێ

مـرۆڤـێکی گـەورەیە، لێکۆڵەرێکی بەتوانایە، هیچ کـات نەیدەسەلماند کە کوێستان بە دووکەڵی گازئۆیل ڕەش و پیس بووە... ئەو قـەناعـەتی بە دووکـەڵی گـازئۆیل و شـەقـامی شارەکان و دووکەڵی سەرخۆشکەری هیرۆیین نەدەکردو شیعری بۆ پڕکردنەوەی لاپەڕی گۆڤارەکان نەدەنووسی و بەکاری خۆی نەدەزانی ڕواڵەتی ڕووناکـبـیـرانە بەخـۆیەوە بگرێ، چونکە «نیما» شاعیر بوو نە «ماعیر»).

دوو سێ ڕۆژێکە فڵان کـەس کـەوتووتە خـەتی شیـعـرەوە و بۆتە شاعیر. بێ ئەوە کوێرەوەرییەکی دیبێ و بەرداشی زەمان هەڵی سووڕاندبێ، هەستان و کەوتنی دیبێ و بەردی ساردو گەرمی هاتبێتە بەرپێی بۆتە شاعیـرو لە نەکاو دەبینی بۆتە ترپاکی و سـەرو ژووری بۆ نییـە و هەمـوو کاتێک لەمەیخانە ئامـادەیە.. بۆچی؟ چونکە جـەمـاعـەتی هونەر نەناس و تێنەگەیشتوو دەبێ ئاگاداربن و باش بزانن کە ئەو شاعیرێکی زۆر ڕووناکبیرە و لەداخی نائومێدی و بێ دەرەتانی و شێواوە و لەداخی ئەو کەسانەی نرخی هونەر نازانن پەنای بردۆتە بەر ئارەق خواردنەوەو ترپاک کێشان و دەڵێ:

«ئێـوە دەبێ ڕێزی ئێـمـە بگرن کـە دڵم لە پەلکی گـوڵ ناسکترە)(٧).

سەمەد چەند ژێرانە دەیڕوانییە هەلومەرجی زەمانی خۆی و دەیزانی هاتەران پاتەرانی بەشێک لە شاعیرانی پایتەختنشین چۆن لە ڕۆح و گیـانی شـار کـاری کـردووە چۆن لە تەمـەنی لاویدا پێش هەمـوو کارێک تووشی هیرۆیین و ترپاک دەبن و مـووی سـەریان تا سـەرشـانیـان دەهێـڵنەوەو بەجلوبەرگی سەیروسەمەرە لەبەیانی ڕا تا ئێوارە لە شەقامەکاندا پیاسە دەکەن و خۆیان بە خەڵک نیشان دەدەن و هیچ و کات لەبیری ئەوەدا نین کـە بیـروزەینی خـۆیان پەروەردە بکەن و لەبیـری چارەسەری گەرەکە دواکەوتوو بێ نیمکاناتەکاندا بن. خۆزگە ئامـاری ئەو لاوانە لە دەسـتـدابایە و ئەو کـات ژمـارەی موعتادەکان دەردەکەوت.

بیـهـرەنگی کـتـێبـەکانی بەنرخی هەرزان چاپ دەکرد و بۆ چاپکردنی بەرهەمەکانی ڕووی لە سەرمایەدارانی مل ئەستوور نەدەکردو چاک هەستی پێی کردبوو کە کتێبی باش پێویستی بە ڕازاندنەوە نییـە و ئەمـەوە لە حـاڵێکدا بوو کـە لە وڵاتی ئێمە ڕازاندنەوەی بەرگی کتێب (ماشاڵڵا)ی لەگەڵ بێ لە زۆر وڵاتان پێشکەوتووترە.

هەروەها لە ئاسـتـی دەهۆڵ و زوڕناش پلە یەکـەمی هەیە، بەڵام بەداخەوە کـتـێبـەکـان بێ نێـوەڕۆکن و ئەوە شـتـێکی سـروشـتـیـیە کە نێـوەڕۆکی باش بیری باش دروست دەکا و دەزانین بیری باش.. جا ئەگەر وایە هەر مەسەلەیەک ڕواڵەتی چاوی لێ بکرێ بێ دەردەسەرترە.

هەمـووی ئێـمـە بەو دەردە گـیـرۆدەین: ڕدێن بۆ شـان و، جلوبەرگ بۆ شـان و، مەدرەک بۆ شان و وشەی جوان و پاراو بۆ شان و. بە هەرحاڵ لێرەدا جێی خۆیەتی لە وتەکانی ناوبراو نموونە بێنینەوە کە سـەبارەت بە دوو نامـیلکەی شـیـعـر کـە هەرکامیان بە شێوازی جیاواز چاپ کراون دەڵێ:

(بە باوەڕی من ئەگـەر کـتـێبی یەکـەمیش بێ ڕازاندنەوە و زیادییـەکـانی بە ڕواڵەتێکی سادەوسـاکـار و بەنرخی هەرزان وەک کـتێبی دوویەم چاپ کرابا هەم بەجێترو هەم بە قازانجتر دەبوو، چونکە باش دەزانین کـە حـەوت قـران لە سێ و پێنج قران زیاترە)(٨)

دکتۆر غولام حوسێنی ساعدی-ی نووسەرو ڕۆژنامەنووسی هاوچەرخ دەنووسێ «سـەمـەد لەو نامـانەی کە بۆ هەڤـاڵانی و نووسـەرانی نووسـیـوە، هەمـوو جـارێک دەپاڕاوە کـە بۆچی ئەوەندە زۆر نرخی ئەو کـتـێبـانە لەسەرەوەیە، چونکە بۆ خۆی هەرچی هەیبـوو دەیدا کـتـێب و ڕۆژەکانی پشـووی حـەوتوو بە جانتـایەکی پڕ لە کتێب بە گوندەکاندا دەگەڕا و بە ئەمانەت کتێبی دەدا بە هەموو کەس)(٩).

بیـهـرەنگی پێش لە هەمـوو کـارێک کـەوتە بیـری ڕزگـاریی منداڵەکـان کـە ئەوان پێکهـێنەری دنیـای داهاتوون. بڕیاری دابوو بۆ پەروەردەکردنیان بە شێوەیەک کە بتوانن لە دنیای پڕ لە فێڵ و تەڵەکە بەرەی خۆیان پێ لە ئاو بێتە دەرێ و فریوی هات و هاواری دەزگاکانی ڕاگەیاندن و پێوەندی گرتنی گشتی نەخۆن و کـلاوی چیـرۆکـەکـانی ئینشـاڵڵا دروست بێ و پەنا بەخـوا کـەرێکە، نەچێـتـە سـەریان. ئەو دەڵێ: (ئایا نابێ بە منداڵەکان بگوترێ کە لە وڵاتی ئێمەدا زۆرن ئەو منداڵانەی کـە تامی گـۆشت و پەنیـر بەمـانـگ و سـاڵ ناچێـژن، بەڵام کـەسـانێـک هەن ئەگـەر بیـانەوێ هەمـوو کـاتێـک قـازی سووروەوەکراوەیان لە شەرابدا مەلە دەکا. بۆچی؟ ئایا نابێ بە منداڵان بگوترێ نیوەی مرۆڤایەتی برسین. بۆچی برسین؟ ڕێگا



نیما

چارەسەری برسیەتی چییە؟ ئایا نابێ تێگەیشتنێکی زانستییانە و دروست لە مێژوو و ئاڵوگۆڕەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بدەین بە منداڵ؟ بۆچی دەبێ منداڵ پاک و خاوێن و بێ دەنگ و شەرمن پەروەردە بکەین)(١٠).

ئەو بە چاکی ژانەکانی کۆمەڵی ئێرانی هەست پێی کردبوو «ئایا دەبێ چاومان لە ئاست ئەو منداڵانەی زستانان لە پشت کورسی قوتابخانەکانیان لە برسیەتی زەرد هەڵدەگەڕێن بەبەستێ؟ ئەوانەی کە لەناو بەفرو سەرمادا ئەگەر پێڵاوێکیان هەبێ لە پێی دەردەهێنن و لەبن هەنگڵی دەنێن تا پیس و قوڕاوی نەبێ و زیاتر بەرگە بگرێ. ئەوانەی لەژێر شاڵوارەکانیاندا هیچیان لەپێدا نییە. لە شائابادی غرب (ڕۆژئاوا) دەرسم دەگوت، زستان بوو، یەکێک لە قوتابییەکانی پۆلی هەشتەمم بانگ کردە پای تەختەڕەشە بۆ لێ پرسینەوە، هەرکە هاتەپێش، هەستم کرد کە شاڵوارە پینەکراوەکەی دوگمەی پێشەوەی نییە و ئەویش نەیدەزانی، دەبوایە لەو کاتەدا چیم کردبایە؟ قوتابییەکانی ڕیزی پێشەوە هەستیان پێی کردبوو و من بۆ ئەوە ئیزن نەدەم کارەکە لەوە خراپتر بێ، ناچار بووم خۆم لە مابێنی ئەو قوتابییە چارە ڕەشەو پۆلدا ڕاوەستم و بە قوتابییەکەشم گوت بڕۆ دانیشە، هەتا کۆتایی ئەو سەعاتە نەمزانی چیم گوتووە و ئەو قوتابییە ماڵوێرانە چ فێر بووە؟

بیهرەنگی دەڵێ: (بۆچی بە منداڵ دەگوترێ درۆ خراپە، بۆچی دەڵێن دزی خراپە، بۆچی دەڵێن گوێڕایەڵی لە دایک و باب باشە، بۆچی نابێ ڕیشەی سەرهەڵدان و پەرەپێدانی درۆزنی و دزی بۆ منداڵەکان شی بکەینەوە.(١١)

ئەو لە چیرۆکی (ئولدوزو قەلەڕەشەکان)دا لەو جێگایەکە لە مابێنی ئولدوزو دایەپیرە قەلەڕەشەدا دەمە تەقە دەکەن چۆن دەچێتە نێوەرۆکی مەسەلەکان و شییان دەکاتەوە.

بەم جۆرە دەنووسێ: (ئولدوز دەنووکی ماچ کرد، دەنووکی بۆنی سابوونی لێ دەهات، وتی «دایە پیرە قەلەڕەشە ئەتو سابوونت زۆر خۆش دەوێ؟

دایە پیرە قەلەڕەشە وتی: «دەمرم بۆ سابوون».

ئولدوز وتی: باوەژنم پێی ناخۆشە. ئەگینا قالبێکم سابوون بۆ دەهێنای و تۆش بتخواردبا. دایە قەلەڕەشە پیرە وتی: «با باوەژنت پێی نەزانێ بەدزی بیهێنە».

ئولدوز وتی: «ئەتۆ پێی ناڵێت؟»

دایە قەلەڕەشە پیرە وتی: «من دووزمانی لە کەس ناکەم»

ئولدوز وتی: «باوەژنم دەڵێ «ئەتۆ هەرکارێک بکەی قەلەڕەشە بەمن دەڵێت».

دایە قەلەڕەشە پیرە قاقاپێکەنی و گوتی: «درۆ دەکا گیانەکەم. سوێند بەو سەرە ڕەشەم من تا ئێستا دووزمانیم لە



غولام حوسێن ساعدی

کەس نەکردووە. خواردنەوە ئاو دەکەمە بیانوو و دێم بۆ سەر حەوزوکانی، لە هەڵێکدا سابوون و ماسی دەدزم و هەڵدەفڕم. ئولدوز وتی: «دایەپیرە دزی بۆچی؟ گوناهە.»

دایە پیرە قەلەڕەشە وتی: «بۆ منداڵانە بیردەکەیەوە. گوناح چییە، ئەوەکەی گوناحە کە نەتوانم زگم تێر بکەم. گوناح ئەوەیە کە نەتوانم زگم تێر بکەم. گوناح ئەوەیە کە سابوون لەژێر پێی دا بکەوێ و من برسی بم. من ئەوەندە ژیام بزانم کە چ دەکەم.

هەربۆیە ئەو ڕێنوێنە و شێکانە ناتوانی پێش بە دزی بگرێ. هەتا برسیەتی هەبێ و هەرکەس لەبیری خۆیدا بێ، دزی هەردەبێ)(١٢)

کاتێک دایەپیرە قەلەڕەشە لە داوای باوەژن دەکەوێ دەڵێت:

(ئەی باوەژنی نەزان وا بیر مەکەوە کە قەلەڕەشەکان دزییان پێ خۆشە؟ ئەگەر من خواردن و خواردنەوەم هەبێ کە بتوانم زگی خۆم و منداڵەکانم تێرکەم. پێویست دەکا دزی بکەم؟

زگی خۆتان تێرە وا بیردەکەنەوە هەموو کەس وەک ئێوەن...)(١٣)

سەمەد بەباشی هەستی پێی کردبوو کە ئەو ئامۆژگارییانە تەنیا بە مەبەستی چۆڵکردنی مەیدان بۆ هێندێک کەسی هەلپەرستە. ناوبراو زۆر بەتوندی تەواوی ئەو قەشمەرییانەی دەخستەبەر پەلاماری ڕەخنەگرانە و لە ڕاستی کاتێک مرۆڤ دەیخوێندەوە هەستی دەجوولا بە جۆرێک کە جاری وابوو لە داغان مست لە دیواربدا.

سەمەد هەر تەنیا بە ئەوەندە ڕوونکردنەوە قەناعەتی نەدەکرد ئیزنی بە کەسانی دیکەش نەدەدا کە کڵاو لە سەر منداڵان بنێن. سەبارەت بە کتێبی «دەنگی نوێ» کە بۆ نازپەروەردەکانی فەرەنگیزان نووسراوە و کتێبی دیکەی لەو

بابەتە کە بەدەستی منداڵانەوە بن زۆرن. ئاوا دەنووسێ:

-(ئەو «نامیلکە ڕێکوپێکی نزمە» هیچ ڕێنوێنییەکی بۆ منداڵان پێ نییە جگە لە هێندێک خافڵاندنیان لە ڕێگای زۆر قسەکردنەوەو هێندێک یاسای ئەخلاقی کە زۆر جارانیش ڕەنگە ویشک بن، بۆ وێنە تێدا هاتووە کە مرۆڤ دەبێ بە بەزەیی بێ. منیش پرسیار دەکەم مرۆڤ دەبێ بەزەیی لە بەرامبەر کام چینی کۆمەڵدا هەبێ. ئایا دەتوانین لەگەڵ ئەو تاقمە لە خەڵک کە بە قسەو بڕیاری ئەوان تاقمێکی دیکە لەخەڵک بۆمبباران دەکرێن بە ڕوحم و بەزەیی بین. ئایا دەکرێ لەگەڵ جەللادانی هیتلەری کە کاریان ئەشکنجەو ئازاری ئازادیخوازان بووە لە سەرەخۆو دڵسۆز بین)(١٤)

هەر بەو هۆیانەوە بوو کەسانێک کە تریاک و هیرۆیین خۆشەویستییان بوو سەمەدیان تاوانبار دەکرد کە منداڵەکان فێری بوغزوکینە دەکا. ئایا بەراستی سەردەمی ئێستا بۆ ئەوە دەبێ منداڵ بە شێوەیەک باربینێ کە ڕوومەتیان بۆ شەپلاغەی دووەمیش ڕابگرن؟ ئەو جۆرە بارهێنانە چ سوودێکی بووە و تەنیا بارهێنانی هێندێک منداڵی ترسنۆک نەبێ کە تەحویلی کۆمەڵتان داوە؟

چەند دێڕ خوارەوەتر دەنووسێ: (تاریفێک «یمینی» لە کتێبەکەیدا لە منداڵی خراپ و نازداری دەکا، ڕاست تاریف لە چەند ملیۆن منداڵی فەقیر و کرێکارو فەرشچن و بێ کارەکانی نیشتمانی ئێمەیە. ئەو جەنابە وا بیردەکاتەوە کەهەموو منداڵی ئێران و تەنانەت ئی دنیاش وەک ئەو چەند منداڵە ناسک و نازدارەی دەوروبەری خۆیەتی، مۆدێلی سەریان ڕێک و پێک کراوە، دەقی ئوتووی شەڵواریان خیاری تورد دوولەت دەکاو قەت لەناو گڵ و خۆڵدا یاری ناکەن و لە بەیانیڕا تا ئێوارە بۆ فرۆشتنی یانەسیب، سیگارو بنێشت و ئاوی سارد بە شەقامەکاندا ناخولێنەوە و لە ژێر خانەکانی تاریک و شەداردا خەریکی فەرش چنین نابن و... بەس نییە؟ ئەو هەموو منداڵانە کە لە بەیانیڕا تا شەو لە کوورەخانەکان تاڵی و سوێریی ژیان دەچێژن و لەبەر گەرمای کووره و هەتاو دەبنە خەڵووز بۆ پارووە نانێک. بە بڕوای ئاغای «یمینی» ئەوانە منداڵی خراپن، بەڵام ئەو چەند منداڵەکە تەنیا هونەریان بێ دەنگی و نەدانی جنێو و ڕاگرتنی پاک و خاوێنییە و لەسەر سفرە نان خواردن بە کەوچک و چەنگاڵ نان دەخۆن و گوێڕایەڵی دایک و بابیانن، منداڵی باش و نموونن)(١٥)

بیهەرەنگی لە کاتی سەفەرەکانی بۆ گوندەکان، بیرەوەرییەکانی خۆی دەنووسێ لەو نووسینانەدا ورد بینی و تەنزی تایبەت بەرچاو دەکەوێ. با سەرنج بدەینە ئەو نووسراوەی خوارەوە.

لە قەراغ گۆڵێکی پڕ لە قەوزە حەوت داری بادامم کە بەرەکەیان سەرمابردبووی و سێ داری سنجوو چوارداری بی و چەند سپیدارێک نەبێ، شتێکی دیکەی لێ نەبوو)(١٦).

لە کۆتاییدا دەنووسێ (ئاواییەک کە گەنمی لە بازاڕی شار دەکڕی)(١٧)

(ئەنباری ماڵە ئاغامان چاوپێی کەوت کە شووشەیەکی زۆری بەتاڵی قۆ دەکاو ئارەقی لێ دانرابوو.) (مەشەدی نەجەف بەجێ نان و پەنیرکە زۆرمان برسی بوو پێنج گوڵی سووری بۆ هێناین.)(١٨).

(لێرە و لەوێ پەین بڵاوکرابۆوە دوو سێ مریشکی کز چینەیان لێ دەکرد و خۆیان تێ وەردەدا. لەبەر بەرۆچکەیێک پیرێژنێک هەڵتروشکابوو و وردە وردە سەری نەوەکەی دەدۆزی «مێش لەسەر لووتی منداڵەکە کۆدەبوونەوەو ئەویش قەپاڵێکی لە تکە نانەوڕشکەکەدەدا. لە سووچێکی دیکەی ئاوایی ژنان لەسەر نۆرە ئاو شەڕیان و چیان بە یەکترەوە نەهێشتووە... مرۆڤ گێژ دەبێ چۆن دەتوانی لەو جۆرە جێگایە بژی و شوکری خوا بەجێ بینی)(١٩).

(لەو کاتەوە ئاغا خراپەی لەگەڵ کردوون، تاقەتی ئاو داشتنیان نەماوەو وازیان لەو کارە هێناوە هەموو ڕۆژێک چاوەڕوانی ئاوی بارانن لە تەنیا هەورێکی بێ باران و ویل بە ئاسمانەوە....(٢٠).

پاشان ئاماژە بە هێرشی نزوولخۆرانی شار بۆ سەر دێی نشینەکان دەکا:

(لەسەریەک (٥٠٠ تا ٦٠٠)سەریان مانگای شیری هەیە کە شیری ساڵانەیان فرۆشراوە، پیاوێک لە شارڕا هاتووە بارگەو بنەی لێ بە ئەرزدا داوە)(٢١)

سەبارەت بە ئاواییەکی دیکە دەنووسێ: گوندنشینەکان دوای پێنج فەرسەخ ڕێگای پیادە دەگەنە پادگانی عەجەب شێر بۆ کۆکردنەوەی ورکەنانی نێو زبڵی سەربازخانەکە. بەو نانە دەگوترێ سۆمی کە تامی ترش و سوێرە. کوڕی کوێخا لەتکێک سۆمی وەبن هەنگڵی دابوو و زۆر بە ئیشتیاوە دیخوارد. کاتێک ویستم لەو تاقمە منداڵەکە سۆمیان دەخوارد وێنە بگرم، بەشێوەیەک ترسان کە ئێمەش ترسمان ڕێی نیشت.)(٢٢)

لەهەر شوێنێک گەڵاڵەو تەرحێکی چاو پێکەوتبایە کە لەگەڵ هەلومەرجی وڵاتی ئێمە نەگونجابایە ڕەخنەی لێ دەگرت. لە پێشەکیی کتێبی (لێکۆڵینەوە لە مەسائیل بارهێنان لە ئێران)و لە وتارەکانی دیکەشیدا لەبارەوە شتی نووسیوە: (مرۆڤ کە هەناسەی لە شوێنی گەرم هاتە دەرێ زۆر شت نابینێ و بەناچاری درێژداری دەکا و تەنیا خۆی دەبینێ و هەربۆیە دەست دەکا بە گوڕانکاری و بە خەیاڵی خۆی

موعجیزەی کردووە.) (٢٣)

سەبارەت بە بنکەکانی چاپەمەنی، کۆنەپەرستان سێ جار نووسراوێک لە بێژینگ دەدەن و ئێسکی مردووەکانیش ناپارێزن. کاتێک نەتوانی لەسەر بابەتی ڕۆژ شت بنووسی بە ناعیلاجی دەست و داوێنی مردووەکان دەبێن کە هەزار ماشاڵلا ڕۆژبەڕۆژ لە زیادبووندان. دەڵێ: (ئێوە «ڕێنوێنی کتێبەکان» گەر پێتان باشە بیکەن تەنیا دەتوانن ئەوەندە بکەن کە کارتان بە سەرکاری کەسەوە نەبێ. ئێرە حەقتان نییە بەردی دڵسۆزی گەل لە سینگتان بدەت بە هۆیەوە لە کاتێکدا نووسەران و شاعیران و لێکۆڵەرانی دڵسۆزو وریای ئەو نیشتمانە نووسینەکانیان لەسەر دەستیان ماوەتەوەو کەس بەهاوارو دەنگیانەوە ناچێ، بەڵام ئێوە خەڵوار خەڵوار کاغزی سپی دەرەجەیەک بە فیڕۆ دەدەن بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی مەتلەب و بابەتی وا ئەگەر تا دنیا بە دنیایە چاپ و بڵاونەکرێنەوە هیچ شتێکمان لێ کەم نابێتەوەو ئەو جۆرە بابەتانە چاپ و بڵاوکردنەوەیان نەک قازانجی نییە، بەڵکو زیانیشی هەیە. بچووکترین زیانی ئەوەیە کە بیرو هۆشی خەڵک لەسەر بابەتە گرینگ و پێویستییەکان لادەداو بۆ لای شتێکی لاوەکی هانیان دەدا. ئەو کەسەی لە قاڕەی ئەفریقیا گۆڤاری ئێوە دەخوێنێتەوە لەبەر خۆیەوە وای لێک دەداتەوە کە تەنیا مەسەلەی چارەسەرنەکراوی وڵاتی ئێمە هەر ئەوەیە کە لەو گۆڤارەدا نووسراوەو چارەسەری ئەو کێشەیەش بە قازانجی کێیە؟)(٢٤)

ژیانی مووچەخۆران زۆرجاران کەوتووتە بەر ڕەخنەو گازندەی سەمەد. لە کتێبی «لێکۆڵینەوەی کێشەکانی پەروردەیی لە ئێران»دا بەشێکی جیاوازی بۆ ئەو مەسەلەیە تەرخان کردووە.

سەمەد لە وتارێکی دیکەدا بەناوی «ئاغای چۆغ بختیار» کە لە تورکی-دا مانای ئاغای زۆر بەختەوەر دەدا تەمسیلی ژیانی یەک ڕەنگ و یەک شێوەی ئێمەی نیشان داوە:

« ژیانی مووچەخۆر بە وێنەی حەوزێکی ئارامە. بەهیچ جۆر ئامادە نییە بەردێک باوێتە نێو حەوزەکەو ئەو ئارامییە تێک بدا. مرۆڤێکی بە گوێ و فەقیرە. ڕازی نابێ دڵی مێروولەیێک برەنجێنێ. بەیانی لە خەو هەڵدەستێ و لەگەڵ ژن و منداڵەکەی نانی دەخوا و لە دواییدا بەرەو ئیدارە دەبێ لەگەڵ دوکاندارو قەسابی گەڕەک سڵاو و عەلێکی گەرم و گوڕی هەیە کە نەکا لپەی گران پێی بفرۆشن یا گۆشتی بێ ئیسکەوە پێ بدەن. کاری ئیداری بە مانای وەدەست هێنانی پارەو پوول بۆ گوزەرانی باش. جا ئەگەر وایە نابێ نێوان ناخۆشی لەگەڵ کەس هەبێ و بەهیچ جۆر ئیزن نەدا ژیانی ئارامی لێ تێک چێ. لەسەر ئەو بڕوایە کە شەرافەت و کەرامەت یا کەللەپڕی ئەوەندەی ناهێنێ کە بە خاتری ئەوان بەرهەڵستکاری وەزیرو وەکیل و بەرپرس بکا» (٢٥)

ئەو لە وتارەکەدا بە ڕوونی دەری دەخا کە ئەو تاقمە لە کۆمەڵ کە ڕادەیان زۆرە تەنیا مەسەلەی ژیان لە وەدەست هێنانی نانێکی سەگمەرگی بۆ ژن و منداڵەکانیاندا دەبینن و پاشەکەوت کردنی پوول لە بانک بۆ منداڵەکانیان کە لە پاشەڕۆژدا ئاسوودە بژین، بەڵام پەندێکی پێشینیان دەڵێ «کوڕی ئازا میراتی باوکی ناوێ» (٢٦)

ئەو فەرمانبەرە بە ڕێزە ئەگەر ڕۆژێ هەزار جنێو لە بەرپرس و ڕەئیس ببیستێ سەری بەرز ناکاتەوەو هەموو قسەی ئەوەیە کە ئەگەر وەڵام بدەمەوە ژن و منداڵم ژیانیان لێ تێکدەچێ. هەروا بزانە کەسی دیکە ژن و منداڵیان نییە یا خوا ژن و منداڵەت بکەونە سەرتەختی تاتەشوار......... لە چەند دێڕی دواتردا دەنووسێ و (گەورەترین ئاواتی بوونی ماشێنێکی سواری فۆلکس واگنەو ڕاگواستنی شوێنی کارەکەی بۆ تارانی پایتەخت.)

بۆ ئەوەی بە ئاوات بگا ئەو حەقە بەخۆی دەدا بەوەخت و بێ وەخت تاریفی بەرپرسەکەی بکا. کاتێک خێزانی ڕەئیس منداڵی بوو بچێتە پێ پیرۆزانەی منداڵەکەو دیاریکیشی بۆ بەرێ. پێش ئەوە ژن بهێنێ جاروبار پیاڵەیەکی ئارەق هەڵداویشت، بەڵام ئێستا خێزانی لێ قەدەغەکردووەو لە ئیدارەوە یەکڕاست بەرەو ماڵ دەبێتەوە. ئێواران جاروبار لەگەڵ خێزانی دەچێتە سینەما. ئەوان لایەنگری فیلمی ئێرانین دەڵێن فیلمی ئێرانی چەندەش خراپ بێ بەرهەمی وڵاتی خۆمانە بۆچی پوول و پارەی ئێمە بچێتە گیرفانی بێگانەوە؟.

ژنەکەی تێدەکۆشێ وەک ژنە هونەرمەندانی سینەمای ئێرانی خۆی بڕازێنێتەوەو بە شێوەی ئەوان جل و بەرگ بپۆشێ و لەناو ماڵدا کەوشی پانیە بڵێند لە پێی بکاو شۆرتی بیهداشتی بەکار بهێنێ.....

جاروباریش باس لە دوکتۆری بنەماڵەیی دەکا لەو دوکتۆرەی سەر دالانەکەی ماڵی خۆیان. بەدایعەی خوا لەلایەنی «ئاغای دوکتۆر منداڵەکمان سەری دێشێ. ئەسپرینی پێ بدەین یا ساریدۆن؟

«تەختی خەومان دوو کەسەیەو هەموو شەوێک پێکەوە دەخەوین، بەڵام دە ساڵە ژن و مێردین تەنیا منداڵێکمان هەیە. پێشگیری لە منداڵ بوون دەکەن. پوولەکانیان لە بانک کۆدەکەنەوە بەمەبەستی کڕینی ماشین. «ئاغای چۆخ بەختەوەر» فێری ماشین لێخوڕین دەبێ و خۆی پێوە سەرگەرم کردووە. بەڕواڵەت کاتی خوێندنەوەی کتێبی نییە. دەڵێ کتێبەکان بیروبۆچوونی جیاوازیان تێدایەو شێوازی بیروفکری

جیاواز پێک دێنێ. بەڵام جاروبار کڕینی یەکێک لە گۆڤارەکانی حەوتووانە بۆ خۆ خافڵاندن خراپ نییە شتی لێ فێردەبین. خێزانی لە بەشی مۆدێلی جلوبەرگ و ئاشپەزی کەڵکی لێ وەردەگرێ و بۆ خۆشی جەدوەلەکەی حەل دەکاو ئەوبەشە لە ڕاپۆرتی کتێبی «ئەدەبی و کۆمەڵایەتی» دەخوێنێتەوە. بۆ نموونە بیستوویەتی کتێبەکانی جەواد فازڵ هەموویان ئەدەبی و کۆمەڵایەتین. هەردووکیشیان لایەنگری بێ ئەم لاو ئەولای چیرۆکەکانی ڕادیۆن. لەڕۆژانی هەینیدا گوێگری ڕادیۆن و حەوتووی دووبلیتی یانەسیب دەکڕن کە بەڵکو بۆیان دەربچێ و سەروسامانێک بەوەزعی خۆیان بدەن. ئاینیان بێ ئەولاولا قەبووڵەو ئامادەن هەموو دەستووڕانی ئایینی بەجێ بهێنن و شک لە هیچ بەشێک لە ئایین-دا ناکەن، بەڵام تەنیا ڕۆژەکانی (١٩ تا ٢١)ی مانگی ڕەمەزان بەڕۆژو دەبێ و نوێژ دەکا.

ئاغای زۆر بەختەوەر لەلای هەموو کەس ناسراوە. ئەو لە جیرانەتی من و ئێوەو هەمووماندا ژیانێکی بێ دەردەسەر تێپەڕ دەکاو خۆی بە مرۆڤێکی بەختەوەر دەزانی)(٢٧)

سەمەد لەو جۆرە کەسانە نەبوو کە ئەو جیاوازییە چینایەتییە گەورەیە ببینی و بەخەیاڵی ئاسوودە لەسەر سفرە دابنیشێ و زگی تێر بکا. ئەو شێوەکار هی مرۆڤی بێ خەیاڵە کە لەگەڵ ژن و منداڵی لەسەر سفرەی ڕازاوە دابنیشێ و دەنگ نەکاو شەوکاتی نووستن حەبێکی پشت بخواو سبەی بەیانی دیسان وەک ڕۆژانی پێشوو لەسەر ڕادەست پێی بکاتەوەو وەک مەکووکەی جۆڵا هەر بێ و بچێ.......

(کتێبی لێکۆڵینەوەی کێشەکانی پەروەردەیی لەئێراندا» بە قسەیەکی برتۆلت برشت دەست پێی دەکا کە ئەو قسەیە چەند باش لە جێگای خۆیدا هاتووە. «ئەو کەسەی ڕاستییەکان نازانێ بێ عەقڵە، بەڵام ئەو کەسەی ڕاستییەکان دەزانی و ناڕاستیان دەکا گێرە شوێنە.)

نازانم کام مامۆستایە کەتا ئێستا لەگەڵ ئەو ڕاستییانەی کە لەو کتێبەی سەمەددا هاتوون ڕووبەڕوو نەبوو بێ.

(لە دانیشسەرا کە تەواو بووم بوومە مامۆستا لە دێهاتەکانی جۆراوجۆری وڵات. لەوێ زانیم کە هەموو ئەو دەرسانەی لە دانیشسەرا بۆ ڕاهێنانی مامۆستایەک دەگوترێ بە خۆڕاییە. هەمووم لەبیر خۆم بردەوەو هەستم کرد کە دەبێ بۆ خۆم ڕێ و شوێنی مامۆستایەتی بدۆزمەوەو هەرواشم کرد)(٨)و بەڕاستی کاتێک لەگەڵ وەزعی گوندنشینەکان ڕووبەڕوو بووم تەنیا توانیم یەکێک لەو هەموو بابەتانەی خوێندبووم بەکاری بهێنم. لەبیرمە ڕۆژێک بە یەکێک لەو ژنە دوکتۆرە ئەمریکاییانەی کە چوو بۆ فرانسە پێشنیارم کرد وا باشە هێندێکیش سەبارەت بە بارهێنان لە دێهاتەکان کە وەزعیان خراپە باسێک بکەین- ژنە کە هێشتا زانیاریی لەسەر وەزعی قوتابخانەکانی تاران نەبوو (گەلێک جار بۆ خۆی دەیگوت) لە پڕدا بەسەرمدا ڕووخاو گوتی کابرا کوا نارێک و پێکی؟ بیروبۆچوونی تۆ خەتەرناکە!

بەهەرحاڵ کتێبی ناوبراو کێشەی وا گرینگی تێدایە کە ڕێگا چارەسەریان کاری ئەو جۆرە سیمینارو کۆبوونەوانە نییە. ئەو مەسەلەیە تەنیا کەسانێک دەتوانن ڕێگای چارەی بۆ بدۆزنەوە کە چەند ساڵێک لەنزیکەوە لەگەڵیان ئاشنا بێ و بزانێ کە لە کلاسی(٧٠-٦٠) قوتابی چوون بەڕێوەدەچێ و لەگەڵ نامرازی سەرەتایی بارهێنانی منداڵ سەروکاری ڕاستەوخۆی هەبێ. ئەو مەسەلانە بەلاق هاویشتنە سەرلاق و خواردنەوەی ساردی و بیرە حەل نابێ. باس کردن لەو کتێبە بۆ خۆی کتێبێکی دەوێ. سەمەد بیهرەنگی دڵی بۆ ژیانێکی ئازادو کەش و هەوایەک لێ دەدا کە بتوانێ لەودا بیروباوەڕی خۆی بە ئازادی دەربڕێ. ئازادی ئاواتی هەموو قارەمانەکانی چیرۆکەکانی ئەو بوو. چونکە دەیزانی کە تەنیا لە چوارچێوەی واقعی و ڕاستەقینەی ئازادیدا دەتوانن مێشکەکان پێی بگەن و ئەو ڕاستییەیە لەکاتی دەرس گوتنەوەدا فێری ببوو و پێی گەیشتبوو. باشتر وایە گوێ ڕابگرین بزانین قارەمانەکانی کتێبەکانی سەبارەت بە ئازادی دەڵێن چی؟

قەلەڕەشە گوتی: (ئۆڵدوزگیان بەڕاستی ئازادی شتێکی باشە)(٢٩)

ئەوکاتەی دایە پیرە قەلەڕەشە بەدەستی باوەژن ئیعدام دەکرێ لە دیفاع لە خۆیدا دەڵێ: (مەگەر ئێمە لەو شارە مافی ژیانمان نییە؟ بۆچی لە هەڵبژاردنی دۆستانی خۆماندا ئازاد نین؟ (٣٠)

قارەمانەکانی کتێبەکانی سەمەد زۆرتر لە کەش و هەوای ژەنگاوی دەوروبەری خۆیانەوە بەرەو ئازادی هەڵدەفڕن (ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە لە جۆگەیەکی بچووکرا بەرەو دەریای ئازاد وەڕێ دەکەوێ. لە کتێبی «ئۆڵدوزو بووکە شووشەی قسەبێژ» یاشار هەڤاڵی ئۆڵدوز بە وێنەی کۆترێک بەرەو دنیای ئازاد باڵ دەگرن. کۆتر نیشانەی ئازادییە هەر بۆیە قارەمانەکانی لەکاتی هەڵاتن و دەرباز بووندا خۆیان بە وێنەی کۆتر دەردێن «یاشار وتی هەڵفڕینم پێی خۆشەو هەرچەندە هەڵفڕم قەت ماندوونابم لە خەونمدا سواری باداوەکەم دەبم و هەڵدەفڕم.)

کۆتری سێیەمیش گوتی: منیش هەموو شەوێک خەون دەبینم کە باڵم گرتووەو هەڵدەفڕم.(٣١)

دوای ئەوە ئۆڵدوزو یاشار بە یارمەتی قەلەڕەشەکان تۆریان چنی بەرەو شاری قەلەڕەشە ئازادەکان هەڵفڕین و بۆ ڕێزگرتن لە هەڤاڵە لەدەست چووەکانیان کۆڕێکی ماتەمینیان پێک

هێنا: (دایە پیرە باڵی گرت و هەڵفڕی و لە حاڵێکدا بەسەر سەری منداڵەکان و قەلەڕەشەکاندا دەخولایەوە بەدەنگی بەرز گوتی: لەسەر ئیزنی ئێوە دەمەوێ دوو قسان بکەم:

قەلەڕەشەکان بێدەنگ بوون. دایە گەورە مەمک مژێکی لەبن باڵی دەرهێناو وتی: هەڤاڵەکانم، ئازیزەکانم، قەلەڕەشە باشەکانم، هەر ئێستا ئوڵدوز چەند پەڕی باڵی ئاغا قەلەڕەشەی دا بەمن. ئێمە ئەوان وەک ئاسەوارێکی ئازیزو بەنرخ ڕادەگرین لەبەر ئەوە تەنیا یادگاری دایک و کوڕێکی باش و فیداکارن. ئەو پەڕو باڵە فێرمان دەکەن کە ئێمە قەلەڕەشەکان چاونەترس و ئازا بین.

ئوڵدوزو یاشار هوریایان کێشاو قەلەڕەشەکان قڕاندیان.) دایەگەورە درێژەی بە قسەکانی داو وتی: «بەڵام ئەو مەمکەمژە تووڕهەڵدەدەین چونکە باوەژن بۆ ئوڵدوزی کڕیوە کە هەموو کاتێک بیمژێ و هەلی قسەکردنی بۆ نەڕەخسێ و نەتوانی دەردی دڵی خۆی بۆ کەس بەیان بکا.)

ئوڵدوز مەمکەمژەی خۆی ناسییەوە. هەرهەمان مەمکەمژە بوو کە دابووی بە قەلەڕەشەکان. دایە گەورە گوتی: باوەژن نەنکە قەلەڕەشەی کوشت و باپیرە قەلەڕەشە بێ مراد مایەوە، بەڵام یاشارو ئوڵدوز ئەوانیان لەبیر نەبردۆتەوە کەوا بوو هەربژین ئەو منداڵانەی قەت هەڤاڵانی بێ مرادو شەهیدیان لەیاد ناکەن! قەلەڕەشەکان بەدەنگی بەرز قڕاندیان و ئوڵدوزو یاشاریش هوریایان کێشاو چەپڵەیان لێدا. (٣٢)

**سەراوەکان:**

...............

**١- هەموو نووسینەکە لە خەرمانانی (١٣٤٨) هەتاوی دوای یەک ساڵ لە مەرگی سەمەد دا نووسراوە.**

**٢- ئەو شارە بەو ناوانەیە کە لە چیرۆکەکانی سەمەددا هاتوون.**

**٣- «کتێبی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لەسەر مەسائیل بارهێنان و پەروەردەکردن لە ئێراندا» لەبانەمەڕ و پووشپەڕی ساڵی (١٣٤٨) گەیشتە چاپی سێیەم و چوارەم.**

**٤- لە وتەکانی «جلال آل احمد» لە کۆبوونەوەی یاد کردنەوە لە نیما یوشیج.**

**٥- وشەی «خورشتی هاتبوو» کە لە کوردییەکەدا کراوەتەوە (ناز پەروەردەو...) لە کرمانشان لە نێو منداڵانی دەست کورت و نەدار بە مانای جنێوە.**

**٦- وتاری «شیعرو کۆمەڵ» ل ١٥٣ «کۆی وتارەکان».**

**٧- «چاوخشاندنێک بەسەر ئەدەبیاتی ئیمڕۆ»دا ل ١٠٥ «کۆی وتارەکان».**

**٨- وتاری «یادێک لە حیدر بابای شهریار» ل ١٨٤ «کۆی وتارەکان»**

**٩- ئارەشی ژمارە ١٨.**

**١٠- ئەدەبیاتی منداڵان ل ١٢٠**

**١١- هەمان سەرچاوە.**

**١٢- ئوڵدوزو قەلەڕەشەکان ل ٩ و ١٠.**

**١٣- هەمان چیرۆک ل ٢٥**

**١٤- ئەدەبیاتی منداڵان ل ١٢٣ و ١٢٤**

**١٥- هەمان وتار**

**١٦- کوخالی ل ٢٢٢ (کۆی وتارەکان)**

**١٧- هەمان وتار**

**١٨- لەگەڵ باریکەی ئاو**

**١٩- هەمان وتار**

**٢٠- هەمان وتار**

**٢١- هەمان وتار**

**٢٢- «چینار»**

**٢٣- لە تەنیشت تەرمی نوێی ئاغای دوکتۆر سناعی» ل ٢٦٤ «کۆی وتارەکان»**

**٢٤- مەسەلەی هەڵدانەوەی گۆڕ ل ٢٨٧ «کۆی وتارەکان»**

**٢٥- ئاغای زۆر بەختەوەر ل ٢٩٠**

**٢٦- کوڕی باش سامانی بۆچییە؟**

**٢٧- هەمان وتار.**

**٢٨- لێکۆڵینەوە لە مەسائیل بارهێنان لە «ئێران-دا» ل٧٠**

**٢٩- ٣٠- ئوڵدوزو قەلەڕەشەکان ل ٢٤ و ٢٥**

**٣١- ئوڵدوزو بووکە شووشەی وتەبێژ.**

**٣٢- ئوڵدوزو قەلەڕەشەکان ل ٦٢ و ٦٣- ل ٤١ و ٤٢**

# ئەنتی ڕیالیزم ئەفسوونی ڕۆمانتیزم

و/ لە فارسییەوە: حەمە کەریم عارف

ئەوانەی کە بێدارن دنیایەکی هاوبەشیان هەیە، لێ ئەوانەی لە خەودان دنیایەکی بچوکی تایبەتی خۆیان هەیە.

**«هیرا کلید»**

«ئێمە نەوەیەکی بەدبەختین. لەبەر ئەمە لە بێچارەییدا ناچارین بە کۆمەکی درۆکانی هونەر، خۆمان لە واقیع و حەقیقەتەکانی ژیان دوور بگرین»

**«جۆرج ساند»**

وەکو لەدەستپێکدا ئاماژە کرا، ڕۆمانتیزم لەباری وێنای هونەرییەوە هەوڵ و تەقەللای کەسانێک بوو کە بەتەمابوون لە ناسازگاری و دژوارییەکانی دنیای پیشەسازییەوە پەنا بەدنیایەکی خەیاڵی ئەوتۆ بەرن کە لە سەرووی بگرەو بەردەو هەراو هەنگامەی کۆمەڵگەی تاک پەروەرو پارەپەرستی ئەو چەرخ و سەردەمەوە بێت، ئەم بزاڤە ئەدەبییە نارەزاییەکی هونەرمەندانە بوو کە زیاتر بایەخی بەناخ دەداو ئاوێتەی نائومێدی و وەهم بوو بوو. ئالفرید دو موسیە هەندێ بابەتی لەمەڕ حاڵی هونەرمەندانی هاوچەرخی خۆی نووسیوە کە بە بۆچوونی ئێمە ئەم لایەنەی ڕۆمانتیزم روون دەکاتەوە:

«دووبەرەکی کەوتە نێوان جەماعەتەوە، لە لایەکەوە دڵاوایان و بەرزەفڕانی ڕەنجکێش لەدەوری یەکدی خڕبوونەوەو کڕنووشیان بۆ ئازادی بیرو بیرکردنەوە بردو فرمێسکیان هەڵڕشت، ئەمانە خۆیان لە پۆشاکی خەونی نەخۆشانەی خۆوە پێچاو وەکو ئاوماڵکە سەر ئاوی دەریای تاڵی و خەم کەوتن و بڵاوبوونەوە و لەلایەکی دییەوە خەڵکی دنیایی لەسەر پێیان وەستان و دەگەڵ هەموو خۆشگوزەرانییەکاندا هەر وشک و سەرسەخت بوون و تەنیا دڵیان بە ژماردنی پاشکەوتەکانی خۆیانەوە بوو، لەلایەکەوە هەنسک هەڵدانی گریەو لەلایەکی دییەوە قاقای پێکەنین دەهاتنە گوێ، کە یەکێکیان لە گیانەوە هەڵدەقوڵاو ئەوی دیکەیان لە جەستەوە.»

**١- سەرچاوە: هونەرو کۆمەڵ، پیلخانۆف، پەراوێزی ل-٤٦)**

بە کورتی، ڕۆمانتیزم لە ڕوویەکەوە ئیعتیرازو نارەزایی، ڕۆشنبیرانی چینی بورژوا دژی سیستەمی کۆمەڵایەتی و بەهاکانی ئەو چینە بوو. (١- **پەراوێز: ئەم پرەنسیپ و پێوانەیە، ڕۆمانتیزمی ئەڵمانی، کە لە هەلومەرجێکی دیدا نەشونمای کرد، ناگرێتەوە.)**

ڕۆشنبیری چینی بورژوا، بەهۆی بونیادی فیکری و ئاسۆی دیدی تایبەتی خۆیەوە، ناتوانێ لە خەباتی هونەری یان کۆمەڵایەتیدا پێ لە کەوشەنی فیکری چینەکەی خۆی درێژتر بکات. خەیاڵپەسندی و کورتبینی و ڕاڕایی و خۆپەرستی کە لە تایبەتمەندییەکانی چینەکەی ئەون، هەمیشە لە زەین و هزری ئەودا دەمێنێتەوەو ئاسۆی هزرو بیری ئەو سنووردارو لەهەمان کاتدا خەیاڵاوی دەکات، با دژی بەهاکانی ئەم چینەش ڕابپەڕێ (هەڵبەتە، مادامێکی لەم ڕاپەڕینەدا هەوڵ دەدات بەتەنیا پشت بەخۆی یان (یارانی ڕۆشنبیری خۆی ببەستێ، بە گوتەیەکی دی، مادامێکی سەرچاوەی ئیلهامی ئەو کەم و زۆر لەنێو چینەکەی خۆدی ئەودا بێ.)

هەر بۆیە کە (ڕاپەڕینی ڕۆمانتیک) جمک و هاوتای گۆشەگیری و ڕاڕایی بیرەو لە گۆشەگیرییەوە دەست پێدەکات و، لە نائومێدیدا بەردەوام دەبێت و بە مەرگ کۆتایی دێت. هەندێ گۆڕانکاری ڕۆمانتیک لە شیعری فارسیدا نموونەی گەش و زیندووی لەو بۆچوونەن.

بڵاوبوونەوەی ڕۆمانتیزمی ڕەش- ڕۆمانتیزمێک کە جگە لە تاریکی و ترس و بێئۆقرەیی و نائومێدی و مەرگ چ ڕەنگێکی دی نییە- لە شیعری نوێی فارسیدا لە ڕوویەکەوە بەندە بەو نائومێدی و شکستانەوە کە چینی بورژوای ئێران لە ساڵانێکی زوو بەم لاوە دوچاری بووە و لە ڕوویەکی دییەوە زادەی ئەو ناکامی و بەد بەختیانەیە کە لەم سەروبەندو قۆناغەدا یەخانگیری شاعیرانی بێ کەس و بەفیزو لووتبەرز بووە. فەرەیدوونی تەوەللی کە ڕوو دەکاتە هونەرمەندو دەڵێت: «بڕۆ ئەی پیاو! بڕۆ! وەکو سەگی بەرەڵلاو پەڕاگەندە بتۆیە...» لە ڕاستیدا حاڵەتی ئازار بزوێنی هونەرمەندێک بەیاندەکات کە کۆمەڵ قەدری ئەوی نەزانیوەو ئەویش بەخۆی نەیتوانیوە ئایندەیەکی چاکتر بدینێ و چ مەفەڕێکی نییە تەنیا ئەوە نەبێ کە بە گریەو زارییەوە بڵێ.

**ئەناس بەسەر هەمووانا ڕۆیشتی و لە دنیادا**
**کەس زمانی تۆی نەزانی و دەروون و ڕۆحی نەناسیت**
**کۆسپ و بەردی سەرە ڕێ بوویت و جگە لە نەفرەتی**
**خەڵک نەبوو بەشت.**
**تاری غەم بوویت و جگە لە پەنجەی مەرگ کەس**
**نەیژەنیت.**

ئەو نائومێدی و ئارەزووانەی کە نوێنەرانی قوتابخانەی



نادری نادرپوور

ڕۆمانتیزمی ڕەش، تەوەللی و نادرپوور، لە شیعری خۆیاندا دەری دەبڕن چ لەباری چۆنیەتییەوەو چ لەباری شێوەی وەسفەوە، لەبازنەی بزاڤی کۆمەڵایەتی و گۆڕانکارییە فیکرییەکانی چینی بورژوای نیشتمانی ئێمەدا دەگیرسێتەوە، بەڵام ئەو ڕەنج و مەینەتەی کە ئەوان نمایندەین، تەنیا ئازارو مەینەتی چینایەتی نییە، بەڵکو ڕەنج و ئازاری هونەرمەندێکە کە نەک هەر لە کۆمەڵگەی هونەرنەناسدا، بەڵکو لەناو چینەکەی خۆشیاندا نەیانتوانیوە جێگەی شایستەی خۆیان بکەنەوە (هەرچەندە کە نائومێدی ئەوان بۆ خۆی دیاردەیەکی چینایەتیە.) (* پەراوێز دیارە شیکردنەوەی ڕەگ و ڕیشەی کۆمەڵایەتی ڕۆمانتیزم ناکرێ وەکو پرەنسیپێکی گشتی قابیلی گشتاندن سەیر بکرێ، چونکە بە گوێرەی ئەو هەلومەرج و بارودۆخ و حاڵ و ئەحواڵە جیاوازانەی کە لە کۆمەڵگەو قۆناغێن جیادا هەن، ئەم پرەنسیپە گشتییانە دەگۆڕێن. هەر ئەوەندە بەس نییە کە ڕۆمانتیزم بەدیاردەیەکی هونەری چینی بورژوا بزانین؛ دەبێ ئەوە ڕەچاو بکەین کە چینی بورژوا لە چ قۆناغێکی مێژوویی دایە، پێوەندییەکانی دەگەڵ چینەکانی دیدا چۆنەو تا چ ڕادەیەک دەستی لە بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵایەتیدا هەیە. لە ئینگلتەراو فەرەنسادا، ڕۆمانتیزم سەردەمانێ برەوی پەیدا کردو باوی سەند کە چینی بورژوا حوکمڕان بوو، لەکاتێکدا ڕۆمانتیزمی ئەڵمانی بە ساڵان بەر لە سەرکەوتنی چینی بورژواو لە ژێر گوشاری فیودالیزمی و حکومەتی کۆنەپەرستدا باوی سەندو ڕەونەقی پەیدا کرد. ڕەخنەگری ناودار، جۆرج بریندز بەم شێوەیە یەکێک لە فاکتەرەکانی سەرهەڵدانی ڕۆمانتیزمی ئەڵمانی ڕوون دەکاتەوە: «هۆی بنەڕەتی، تازەبوونەوەی ژیانی حکومەتی کۆنەپەرست بوو کە لە فەرەنسادا دەسەڵاتی کڵێسای کاتولیک و ڕژێمی پاشایەتی بۆربۆنەکانی جێگیر کردو لە ئەڵمانیادا بووە مایەی دیکتاتۆرییەتێکی ناجۆری ئەوتۆ کە بەهەمان ئەندازەی کاتولیزمی فەرەنسا، برەوی بە بازاڕی زوهدو ڕیادا، لاوانی هەواڵەی زیندان کردو باشترین نووسەرانی سەردەمی ئاوارەی غەریبایەتی کرد.» **«٢- سەرچاوە: جۆرج بریندز، ڕەوتە ئەسڵییەکانی ئەدەبیاتی سەدەی نۆزدە، بەرگی دووەم ل ٢٠١ (چاپی لەندەن).».**

خاڵێکی دیکە ئەمەیە کە ڕۆمانتیزمی ئەڵمانی بە پێچەوانەی ڕۆمانتیزمی فەرەنسی و ئینگلیزی، کە تا ڕادەیەک ئیهتماماتی ئازادیخوازانەی گرتبووە خۆ، لایەنی کۆنەپەرستانەی هەبوو وەکو دەزانین گۆتەو شیلەر، کە لەسەرەتادا کەڵکەڵەی ئازادیخوازانەیان هەبوو، سەرەنجام خۆیان خستە ڕیزی دوژمنانی شۆڕشی مەزنی فەرەنساوە. ئەم وەرچەرخانە کۆنەپەرستانەیە بە تەواوەتی دەگەڵ ڕەوتی کۆنەپەرستانەی چینی بورژوای ئەڵمانی، لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا یەک دەگرێتەوە کە بە دیکتاتۆرییەت لە دەرگای سازشەوە هاتە دەرێ و پشتی کردە ڕاپەڕینی ڕۆشنبیری و فیکری کە هێزو تاوی بە بزاڤی چینی بورژوای ئینگلستان و فەرەنسادا بوو.

هەروەها نابێ ئەوە فەرامۆش بکرێ کە کاتێ ئەرستوکراتییەت ڕوو لە نەمانە هەندێ هونەرمەندی ئەرستوکراتزادە، کە نەمانی شکۆو دەسەڵاتی چینەکەی خۆیان نزیک دەبینن، ڕۆمانتیزم بە باشترین هۆی بەیان و دەربڕینی حەسرەت و خەمی خۆیان دەزانن. شاتوبریان کە بە یەکێک لە پێشەنگانی ڕۆمانتیزمی فەرەنسا دەژمێردرێ، باشترین نموونەی ئەم تاقمە «ڕۆمانتیکە ئەرستوکرات ڕەچەڵەکانە»یە.

ئیعترازی نێگەتیڤانەی ڕۆمانتیکەکان لە سیستەمی نوێی کۆمەڵایەتی، ڕێچکەو ڕێبازگەلێکی ئەوتۆ لەبارەی ژیان ڕەوتی کۆمەڵایەتی گرتەبەر کە شەقڵ و لایەنی خەیاڵی و نا مێژوویی گرتەخۆی. چەند پیشەسازی و تازە پێشکەوت ئەوەندە سیمای زیندەگی تاریکترو ناشیرینترو ڕەزاقورستر دەبوو، ئیدی لەبەرانبەر ئەمەدا ڕەنگ و ڕوخساری ڕابردوو لە چاوی هونەرمەندی ڕۆمانتیکدا گەشترو لەبەردڵانتر دەینواند. کە توانای دەرککردنی زەروورەتی مێژوویی کۆمەڵگەی پیشەسازی و ناکۆکییەکانی کۆمەڵگەی پیشەسازی نەبوو، ئیدی ڕووی کردە سیستەمی سەدەکانی ناوەڕاست. «ڕۆمانەکانی سیروالتەر سکۆت کە زیندووکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاستە، نموونەی ئەوەن.»

لەسەردەمانێکدا کە هەراو هەنگامەو پاشاگەردانی کۆمەڵایەتی. نایەکسانی نابووری، ئاشوفتەیی ڕۆح، تاریکی بیرو نامۆیی و حەسرەت و تەنیایی سێبەری بەسەر هەموو شتێکدا کێشابێ، ڕابردوو باشترین هۆیە بۆ هەڵاتن لە غەمی ئەمڕۆ و سبەینێ. کەواتە هونەرمەند پەنای وەبەر دنیای ڕابردوو برد، ئەوێندەری کرد بە شوێنی هاتنەدی ئاوات و ئارەزووە بەدی نەهاتووەکانی خۆی، هەموو ڕەنج و دڵەخورپەکانی زەمانی خۆی لێ تاراندو بەم شێوەیە ناکۆکییەکانی نێوان ئاوات و ئارەزووەکان و واقیعی لابرد و لەو دنیا ئەفسانەییە «ماوەیەک بە ئاسوودەیی پاڵی لێدایەوە.» والپۆل-ی نووسەری ئینگلیز «سوودەکانی» پەنا بردنە بەر زەمانی ڕابردوو بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە بەمجۆرە شرۆڤە دەکات:

«دەزانی من هەمیشە چاوم لەسەرزەمینانی دوور بووە، جا لەبەر ئەوەی کە هێشتا بە ئەندازەی تەواو پیر نەبووم تا گلەیی لەو حاڵەی خۆم بکەم، وا دەزانم کە هیچ شتێک لەوە باشتر نییە کە مرۆڤ ئەو شتەی کە بە واقیع و حەقیقەتەکانی ژیانی ناوزەد دەکەن، بگۆڕێتەوە بە خەون، قوللەو قەڵاتانی کۆن،

وێنەیێن کۆن، مێژووی ڕۆژانی ڕابردوو، ڕازونیازی پێشینان، دەبێتە هۆی ئەوە کە مرۆڤ ژیانی سەدەکانی ناوەڕاست کە نابێتە مایەی نائومێدی و ئازار، جارێکی دی بدۆزێتەوە.

مردووەکان ئیدی توانای خەڵەتاندنی ئێمەیان نییە «ئێستا ئیدی دەتوانرێ متمانە بە کاترین دومدیسی بکرێ» ٣ (٣- **سەرچاوە: بڕوانە کتێبەکەی ف.ل. لوکاس، داڕووخان و کەوتنی بیری ڕۆمانتیک. ل ٣٧- ٣٨. چاپی ئەمریکا).**

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم «دەرمانە هونەرمەندانەیە» دەردی هونەرمەندی ڕۆمانتیکی دەرمان نەکرد؛ لە ئازارو عەزابی ڕۆحی نەخەلەسی، بەڵکو پێکدادانی فیکری تا ڕادەی شێتی دایە زیادی.

گۆتە، ڕۆمانتیزمی بە نەخۆشی و کلاسیزمی بە ساغلەمی زانیوە. ئێمە کارمان بەوەوە نییە کە مەبەستی ئەو لەم بەراوردە چ بووە؛ ساغکردنەوەی ئەوەی کە ئایا کلاسیزم بەڕاستی نیشانەی سەلامەتی بیرو ڕۆح کێشی ئەم کتێبەو کاری ئێرە نییە. لێ، ڕۆمانتیزم بەڕاستی دەکرێ بە جۆرە نەخۆشییەک بژمێردرێ. بەتایبەتی لەباری ئەو پێوەندییەوە کە لەنێوان هونەرمەندی ڕۆمانتیک و ڕەوتی کۆمەڵایەتی و ڕەوڕەوەی مێژووییدا هەیە. ڕۆمانتیزم لەبەر ئەوە نەخۆشییە کە تەنیا یەک لایەن لە کۆی ئەو پێگانە دەبینێ کە دەستەمۆی گرژی و ناکۆکین، لە لێکدانەوەی گۆڕانە مێژووییەکاندا تەنیا یەک فاکتەر لەبەرچاو دەگرێ، پشت بەو تاقە فاکتەرە دەبەستێ و فاکتەرەکانی دی فەرامۆش دەکات، ئەم چەشنە یەکلابینی و کورتبینی یە موبالەغە ئامێزە سەبارەت بە ڕەوڕەوەی مێژوویی، بەڵگەی نەبوونی هاوسەنگی فیکرییە کە ئەویش خۆی لە خۆیدا نیشانەی ڕۆحی نەخۆشە.

لە جیهانی ژیاندا، سەلامەتی بەدەنی لەسەر هاوسەنگییەک ڕۆنراوە کە لەنێوان مرۆڤ و ژینگەی تەبیعیدا هەیە. ئەم بەرانبەری و هاوسەنگییە لە ڕێگەی کەشفی بەردەوامی زەرووڕەت و دەرک کردنی دروستی یاسایێن سروشتی دێتە ئاراوەو بەردەوامییەکەی بە تەواوەتی بەندە بە پەرەسەندن و گەشەکردنی کەشف کردن و ناسینی تەبیعەتەوە.

شاعیرێک کە دڵبەندی مانگەشەوی زستانە بووەو لە حاڵی جەزبەو بێ ئاگاییدا بەپێی پەتی و سەری کوت لە ژوورەوە بۆ دەرێ سەڵانە سەڵانە دەخزێ، بێگومان سەرمای دەبێت، چونکە لە فاکتەرەکانی ئەو ژینگەیە تەنیا فاکتەری جوانی حەساو کردووەو فاکتەرەکانی دیکەی وەکو ساردی دنیای پشت گوێ خستووە. جا دەرککردنی زەرووڕەت و هاوسەنگی، لەمەیدانی سەلامەتی فیکری و ڕۆحیشدا هەمان دەوری هەیە. هەر کاتێک لە ئەنجامی ناکۆکی نێوان حاڵەتی ڕۆحی و واقیعی دەرەکیدا هاوسەنگی ڕۆحی ناوەژوو بێتەوە، ئەو قەیرانە فیکرییە کە دێتە ئاراوە. ئەگەر بەردەوام بێت، دەبێت بە نەخۆشی. مەخابن، کە هونەرمەندی ڕۆمانتیک ئەم هاوسەنگی و هاوئاهەنگییەی نییە. هونەرمەندی ڕۆمانتیک وەکو هەموو لایەنەکانی دنیای دەرەوە نابینێ لە زۆریشیان ڕادەکات و ئەو لایەنانەشی کە دەیانبینێ لە تەمومژی خەستی خەون و خەیاڵدا مەحوی دەکاتەوەو ونی دەکات، هەمیشە دەستەمۆی ئاڵۆزی و



گۆتە

پەشۆکاوی فیکرەو وەکو کەشتییەکی بێ سوکان بەم لاوبەولادا دەڕوات و سەرەنجام ناگاتە هیچ شوێنێک.

ڕابردوو بە دەستکەوت و غەنیمەت دەژمێرێ، بەڵام لە دەرککردنی مێژووی زەمانی خۆی دوادەکەوێ، واتە توانای دەرککردنی ئەم خاڵەی نییە، کە زەمانی ئێستا تەنیا بەری سەردەمی ڕابردوو نییە، بەڵکو تۆوی بەری سبەینێشی لە خۆیدا هەڵگرتووەو حەشارداوە. بۆیە کە ڕوانینی ئەو چ شتێکی سەمەربەخش لە زەمانی ئێستادا نادۆزێتەوەو نابینێ، ئیدی یان خۆی بە زەمانی ڕابردووی بێ گیانەوە هەڵدەواسێت یان هەموو ئومێدو هیوایەکی خۆی بە ئایندەیەکی خەیاڵی و ئەفسانەییەوە دەبەستێت.

بەڵام، تەنانەت ئەو تەسەوراتانەش کە ڕۆمانتیکانی سەدەی نۆزدە لەمەڕ ڕابردوو هەیانبوو، خەیاڵی و ناحەقیقی و «نەخۆشانە» بوو. ئەو سەرزەمینەی کە ئەوان وەکو «زێدی» خۆیان هەڵیانبژارد، ئیتاڵیای زیندووی واقیعی، بەو ژیانە پڕ لە شکۆ و قارەمانانەیە نەبوو. ڕۆمانتیکەکان وێرانەکانی ئیتاڵیا، مۆمیای کاتولیسزیزم و ڕۆحی سەرکوتکراوی خەڵکانێکیان ستایش دەکرد کە دیکتاتۆرییەت و زوڵم و زۆری کەشیشان لەژێر پەردەو سەرپۆشی جەهلدا ڕای گرتبوون. ئەوەی ڕۆمانتیکەکان لەم بوارەدا، وەکو بوارەکانی دی، دڵیان پێی خۆش بوو ئاهەنگی دوور و سڕینەوەی قۆناغ و سەردەمەکانی پێشین بوو کە لە وێرانەیەکەوە بۆ وێرانەیەکی دی تێدەپەڕی.

بەشێوەیەکی گشتی ئەو ئەزموونەی کە هونەرمەندی ڕۆمانتیک لەمەڕ مێژوو هەیەتی، دەبێتە مایەی ترس و بێزارییەکی نەخۆشانە لە ئێستا کە دیاریکردنی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی ڕۆژو ئێستا نامومکین دەکات، یان لە حاڵەتی ئیمکانی دیاریکردنی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی ئەمڕۆدا، ئەوا زۆر تەمومژاوی و ئاڵۆزو ناواقیعی دەکات ئەو وێناو تەسەورەی کە ڕۆمانتیکەکان لەمەڕ مێژوو هەیانە پتر لایەنی مەعنەوی و فەلسەفی هەیەو لەسەرچاوەیەکی عیرفانی مێژووییەوە هەڵدەقوڵێ (پەراوێز: Historical Mysticism) لە فەرهەنگی ئەواندا- ڕۆمانتیکەکان- هەموو دیاردەیەکی


شیلەر

مێژوویی دەرخەرو بەرجەستەی کۆمەڵێک یاساو پرەنسیپی گشتی و موتڵەقە کە بەهۆی هێزێن نادیاری لە دەرککردن بەدەرەوە دیاری دەکرێ، بۆیە تایبەتمەندی کۆمەلایەتی بزاڤی ڕۆمانتیزم لەمەدا نییە کە لایەنی پێشکەوتوخواز یان کۆنەپەرستی هەیەو هاوسۆزی دەگەڵ شۆڕشدا دەکات یان دژایەتی شۆڕش دەکات «وەکو هاوسۆزی ڕۆمانتیزمی فەرەنسی و ئینگلیزی و دژایەتی ڕۆمانتیزمی ئەڵمانی»

بەڵکو مەسەلەکە ئەمەیە کە هونەرمەندی ڕۆمانتیک لە هەردوو حاڵەکەدا بۆچوون و تیۆرییە مێژوویی و کۆمەلایەتییەکانی خۆی لە ڕێگەی خەیاڵی و نامەنتیقی و کەشف و کەرامەت ئاساوە بەدەست دێنێ. بە گوتەیەکی دی. جۆش و هەڵچوونی شۆڕشگێڕی و سستی و خاوی موحافەزەکارانەی ڕۆمانتیزم هیچیان لە دەرککردنی مێژوویی هەلومەرجێن واقیعی کۆمەلایەتی بەوە هەڵنەقولاون*.

**(پەراوێز: دڵبەندی ڕۆمانتیزمی ئەڵمانی بە کۆنەپەرستی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە لە پروس. بەچاکی نیشانی دەدات کە عەشقی کوێرانە بە ڕابردوو تا چ ڕادەیەک دەبێتە مایەی بێ ئاگایی لە ڕەوشی بارودۆخی ئێستا. ڕۆمانتیکانی ئەڵمانی کە شەیدایانی خستە دڵی سەدەێن ناڤین بوون، ڕەنگ و شێوەی سەدەێن ناڤینی حکومەتی کۆنەپەرست و ستەمکارانەی مەتەرنیخیان پەسند کردو زۆربەیان سەری تەسلیم بوونیان لەبەردەمی داخست و تەنانەت کار گەییە ئەوەی کە فەردریک ویلهم-ی چوارەمیان بە «ڕۆمانتیکێک کە لەسەر عەرشی تزاری دانیشتووە» لە قەڵەم دا!)**

هەم شۆڕشگێرانی فەرەنسا و هەم ڕۆمانتیکەکان خوازیاری ڕووخان و هەرەسی دابونەریت و تەقلیدە کۆنەکان و ئارەزوومەندی بونیادنانی دنیایەکی تازە بوون کە تەنیا تایبەتمەندییە مرۆڤانییەکانی بەهاو بایەخە ئەخلاقی و کۆمەلایەتییەکانی ئەو دنیا تازەیە دیاری بکات. وێڕای ئەوەش پیاوانی شۆڕش هەوڵیان دەدا کە هێزێن عەقڵ و مەنتیق ئازاد بکەن تا هەموو شتێک ئاوەژوو بکات و ئەوسا پرۆژەو نەخشەیەکی نوێ دابڕێژێ، بەڵام ڕۆمانتیکەکان هەموو شتێکیان بەناوی هەست و سۆز، ڕۆح، بەهرەو بلیمەتی هونەرمەندانە

و... تاد نابووت و وێران دەکرد و بینایان دەکرد. لە ڕوانگەی سەرانی شۆڕشی مەزنی فەرانسەوە، ئەقڵ و ئاوەز تاقە بۆتەیەکە کە دەتوانرێ هەموو پرەنسیپ و ڕێساو بەهاکانی تێدا بتوێنرێتەوەو سەرلەنوێ دروست بکرێتەوە ئەمە لە حاڵێکدا کە ڕۆمانتیکەکان ڕۆحیان بە تاقە گەرمخانەیەک دەزانی کە هەموو شتێک

دەدڵۆپێنێ و دڵۆپەی ڕوون زوڵاڵ و شیرینی جوانی لێ بەرهەم دێنێ.

کەواتە بەردەوام نەبوونی هاوسۆزی هونەرمەندانی ڕۆمانتیک دەگەڵ شۆڕشی مەزنی فەرەنسادا، سەیر نییە. ڕۆمانتیکەکان سەرباری «شکۆو جوانی سەردەمانی ڕابردوو»، «هەیبەت و شکۆی ناباو و نەناسراو و دەگمەنەکان»یانیش دەگەڵ کرێتی و ناشرینی و مەینەتباری سەردەمی ئێستادا بەراورد کرد. ڕۆمانتیکەکان بەتاسەو ئەڵهاوە کەوتنە تاقیب و عەوداڵی «نادیار» و «دوورە دەست»و هەرچییەک کە سەیرو ئەفسانەیی و بێ کۆتایی بوو، ستایشیان کرد. ژیانی واقیعی و جیهانی مادە لە دیدوبۆچوونی ئەوانەوە کرێت و قێزەوەرو بێزەوەر دەینواند، بۆیە بەرەی خۆیان لەژێر پێی «ئاپورای دنیا» دەرهێناو «دیاری ناجوان» و «جوانی ڕەوتەنی»یان لەخۆ دوورخستەوەو سەرگەرمی ستایش و پەرستنی «مەجهوولی جوان» و «جوانی جاویدان و ئەبەدی». وەکو چۆن (Elme-Marie Caro)ی تیۆریزانی قوتابخانەی ڕۆمانتیک دەڵێت: هونەر دەبێت جەزبەیەکی ئەندێشەیی وەهای هەبێ کە بەرەو جوانی و ئەستاتیکای مەعنەوی بفرێ؛ دەبێت سوود لە تەبیعەت و سروشت وەکو «پێگەیەکی هەڵفڕین» ببینێ و دەست بداتە پەروەردەکردنی «کەماڵ» کە لە هەموو لایەنێکەوە لە واقیع باڵاترە.٤ **(سەرچاوە: واینبرک، ڕیالزمی فەرەنسە، ل ١٣٠)**

لیکونت دولیل-یش لە ساڵی (١٨٥٢)دا پاش سەرکەوتنی دژە شۆڕش لە فەرەنسادا، دەوری شیعری بەوە زانی کە بریتییە لە (بەخشینی ژیانی کامڵ بە کەسانێک کە ژیانی واقیعیان نییە)و نوڤالیس باوەڕی وابوو کە شیعری ڕۆمانتیک «سەنعەتێکە کە هەموو شتێک بە شێوەیەکی دڵگیر، دەکات بەسەیر- سەنعەتێکە هەموو شتێک لەمەودای دوور دادەنێ بێ ئەوەی لە ڕەنگی ئاشناو جەزابییەتیان کەم بکاتەوە.» بەگوتەی ئەو دەتوانرێ هەموو شتێک شاعیرانەو ڕۆمانتیکانە نیشان بدرێ، «ئەگەر دوور لە دید دایان بنەین» یان «شتە ئاساییەکان ئاڵۆز نیشان بدەین، هەیبەتی مەجهوول بە شتە مەعلومەکان ببەخشین، و ئەوەی دیاری کراو و سنوردارە بێ کۆتایی و بێ سنوور نیشان بدەین»ە **(سەرچاوە- ا. هاوزر، بەرگی دووەم، مێژووی کۆمەلایەتی هونەر. ل ٦٦٤- ٦٦٥)**

ئەوەی نوڤالیس لەمەڕ «ڕۆمانتیک کردن»ی سروشت دەینووسێت، نیشانەی ئەوەیە کە هونەرمەندی ڕۆمانتیک تەنیا بە ڕۆمانتیک بوون قەناعەت ناکاو داناسەکنێ، بەڵکو بنەماو پرەنسیپەکانی ڕۆمانتیزم دەکات بە ئارمانج و بەرنامەی سەرلەبەری ژیان: نەک هەر هەوڵ دەدات کە واقیع بە شێوەیەکی ڕۆمانتیک وێنە بگرێ (خواری بکات، نهێنی ئامێزی بکات، تەقتیری بکات) بەڵکو خوازیاری ئەوەیە کە لەبری گونجاندنی

هونەر دەگەڵ واقیعدا، واقیع دەگەڵ هونەردا بسازێنێ و ژیانی واقیعی بکات بە پاشکۆی ژیانی خەیاڵی هونەر.

ئەم خاڵە لایەنی فەلسەفی قوتابخانەی ڕۆمانتیک ئاشکرا دەکات. ئەدەبیاتی ڕۆمانتیک لەسەر بناغەی فەلسەفەی ئایدیالیزم ڕۆنراوە. هەرچەندە نووسەری ڕۆمانتیک ڕواڵەتەکانی دنیای دەرێرا بە گووراوی زەینی خۆی نازانێ، بەڵام بە کەرەستەی خەیاڵ و هەستی خۆی دەزانێ؛ ڕووداوەکان بە گوێرەی ئارەزووی باتینی خۆی بەرجەستە دەکات؛ خەڵک بە پێی حەزو خواستە ڕۆحییەکانی خۆی بەرجەستە دەکات. بەکورتی لە بورجی هەست و سۆزی خۆیەوە دەڕوانێتە دنیای بوون، شاعیر-ی ڕۆمانتیک-یش «حاڵی» خۆی بەسەر هەموو شتێکدا دەسەپێنێ، تەبیعەت نەک بەو شێوەیەی کە هەیە بەڵکو بە گوێرەی حەزی دڵی خۆی وەسف دەکات، کاتێ کە عاشقێنی دەکات، گوڵ و جۆگەو ڕۆژو مانگ و ستێرانیش جۆش و خرۆشی ئاشقانەیان دەبێت. کاتێ کە ماشوقەش بێ مەیلی و جەفا دەکات، ئەوا ئەفسووس و خەم و پەژارە تەبیعەتیش دەگرێ. ئەو «شاعیری ڕۆمانتیک» کە لە چەقی دنیای بووندا وەستاوە، تەنیا ئەوە بە شایستەی گوتن دەزانێ کە لە بوونی خۆیدا بەرجەستە بوو بێ. «جێی من» هەمیشە لە گۆڕانییەکانی ئەودا لە شیعرەکانی ئەودا سەرووی مەجلیسە.، لە تۆ وایە تەنیا ئەو دەرک دەکات، تێدەگات و خەڵکانی دی شایستەیی غەم و شادییان نییە. ڕۆمانتیکەکان لەبری گۆشەگیری و دووری لە ژیانی کۆمەڵایەتی مافی ئەوەیان بەخۆدا بوو کە لە بەرهەمهێنانی بەروبوومی فیکرو خەیاڵی خۆیاندا ئەوپەڕی ئازادبن، بەڵام لە بازنەی ئەم مافەدا نەوەستان و تەنیا بە دروستکردن و خوڵقاندنی دنیایەکی خەیاڵی و ژیان لەو دنیا خەیاڵییەدا، قەناعەتیان نەکردو دانەسەکنان. جا بۆ دەستەمۆکردن و ڕامکردنی جیهانی واقیعی، لە قاوغی خۆ هاتنە دەرێ و هەوڵیاندا عەیاری واقیع بە عەیاری جیهانی ئەفسانەی خۆیان پێوانەو دیاری بکەن و بە کورتییەکەی خەون و خەیاڵ لە بری ژیان دابنێن.

نابێتە زیادەڕۆیی ئەگەر بڵێین مەبەستی ڕۆمانتیکەکان ئەمە بوو کە کۆمەڵگە بکەن بە «کۆڵۆنی ئیمپراتوریەتی هونەر»، چونکە تەنیا لە قەڵەمڕەوی هونەردا دەیانتوانی حوکمڕان بن.

لە ئەنجامی ئەو بێزاری و نەفرەتە بێ پایانەوە کە ڕۆمانتیکەکان لە واقیعیان هەبوو، هەرچی دیارو بەرچاوو ئاشکرا بوو، لەچاوی ئەواندا زبرو ناهەموارو ناشیرین و ناپەسەندو کۆن و سواو دیار بوو. تەنیا ئەو بەشەی جیهانی واقیعی کە نەغمە ئاساو ناهەنگدار یان ئاڵۆزو تاریک بوو شایستەی وەسف کردن بوو. هەر لەبەر ئەمەیە کە خەیاڵ و ویژدان و دڵی شاعیری ڕۆمانتیک تەنیا شەو دەهێورێ. زمانی ئەو کاتێ دەکرێتەوە کە ترسی تاریکی دەڕژێتە دڵی هەر زەڕەیەکەوە، پەردەی ئیبهام بەسەر سروشت دا دەدرێ، تەنیایی و بێدەنگی پڕ ترس دنیای بوون داگیر دەکات و ژیان و تەبیعەت بێ کۆتایی و یەکسان و بێ ئامانج دێتە بەرچاو.

بێگومان ئەم جۆرە بۆچوون و تێگەیشتنە لە ژیان و جوانی، سەرەنجام ژیان و ئەستاتیکا دەسڕێتەوە.



کیتس

شین و زاری هەمیشەیی و بەسوێی کیتس بە پێچەوانەی بۆچوونی خۆیەوە، لەبەر خاتری جوانی ژیان نییەو لە ڕاستیدا لە پێناوی جوانییەکی خەیاڵی و نادیار دایە کە لە جیهانی ژیاندا بوونی نییە. واقیع و ژیان هەمیشە لەدەسترەسی ئەو دوور دەمێنن و ئەوەی ئەو بەناوی جوانی و ژیانەوە بەو کەڵکەڵەو تاسەیەوە بۆی دەگەڕێ، تەنیا سێبەری ژیان و جوانییە.

ئازادی بێ پایانی بیرو خەیاڵ و شەپۆلی هەست و سۆز کە داهێنانی هونەرمەندی ڕۆمانتیکیان پێوە بەندە، ڕۆمانتیزم لە شێوەی سەرمەستێکی جاویدان و گیرۆدەی خەوندا دەنوێنێ. لە ڕاستیدا، ڕۆمانتیزم تەنیا خەون و پەریشان خەیاڵییەو هیچی دی. ڕۆمانتیکانی سەدەی نۆزدە، لە نوڤالیس و بایرۆن و شاتۆبریان-ەوە بیگرە تا هاینەو وردزورث و بودلێر، گەلێکی دی لە ماڵەکانی خۆیان لە کەناری شەقامێن خەون دروست کردووە. کولریج-ی شاعیرو نووسەری ڕۆمانتیک، دەڵێت: «خەون لە ژیانی مندا دەوری سێبەری نییە خەون خۆراکی من و مایەی ناکامییەکانی منە.». دیارە هونەرمەندێک کە جڵەوی بیروسۆزێن خۆی بە خەیاڵی بەرزە فڕ بسپێرێ و هەموو ئاواتێکی ئەوە بێ کە خۆی لە دەریای مکاشەفەتدا فەرامۆش بکات، ناتوانێ جگە لە خەون و خەیالپەرستی چ ئامانجێکی دیکەی هەبێ، جا ڕازو نهێنی ئەو تەسەوراتە ڕۆمانتیکییەی کە ڕۆمانتیکەکان لەمەڕ ڕۆشنبیری و شارستانیەتی مرۆڤانی هەیانە، لێرەدایە: **(پەراوێز: ڕۆمانتیکەکانی ئەڵمانیا، شارستانیەت و ڕۆشنبیریان بە زادەی چالاکی ئازادانەو هوشیارانەی مرۆڤ نەدەزانی و باوەڕیان وا بوو کە هونەرو شارستانیەت لە «زەرووڕەتێکی باڵا» وە هەڵدەقوڵێ ئەم «زەرووڕەتە» هێزێکی میتافیزیکییە کە بە شێوەی «ڕۆحی تەبیعی» هێزێن داهێنانی بەشەری ناهوشیارانە دەخاتە کار. وەکو دەبینێن ئەم بۆچوونە نزیکە لە تیۆری سوریالیزمەوە کە لەسەر بناغەی ڕەسەنایەتی خەون و کارو کاردانەوەی هەستی نائاگا، ڕۆنراوە.)**

تراژیدی ڕۆمانتیزم لەمەدا نییە کە هونەرمەندی ڕۆمانتیک لە واقیع هەڵدێ، زاڵی خەیاڵی و وەهم بەسەر واقیعدا، تراژیدی

بۆدلێر

واقیعی و ڕاستییە. حاڵی هونەرمەندی ڕۆمانتیک وەکو حاڵی پیاوێکە کە خواردن دەخوات، بەڵام ناتوانێ هەرسی بکات.

هونەرمەندی ڕۆمانتیک، دیمەن و ڕواڵەتی مەوزوعی و واقیعی جیهان لە خەون و خەیاڵەکانی خۆیدا دەتوێنێتەوە، کەچی هەر ئەو دیمەن و ڕواڵەتانەی کە ئەو پێی وایە ئاوێتەی خەیاڵەکانی خۆی کردووە، بەدەقی خۆیانەوە مکوم و سەرسەخت و پایەدار لەبەردەمیدا دەمێننەوە. لە کتێبەکەی جۆرج بریندردا هەندێ دەستەواژەی سەیر بەرچاو دەکەون کە لە وەسفی حاڵی هونەرمەندێکی نێوداری ڕۆمانتیکدا نووسراون، بەڵام نیشانەی تراژیدییەکی بەسوێیە کە تووشی هەموو ڕۆمانتیکەکان بووە:

«نوڤالیس هەموو شتێکی بۆ دنیای باتین دوور دەخستەوە. ئەم قەڵەمڕەوە سەیرە هەموو شتێکی- لە هێزێن شۆڕشەوە بیگرە تا دژە شۆڕش- لەخۆدا خڕ کرد بووەوە؛ هەموو شێرەکانی ڕۆح لە وێندەر بە زنجیر بەسترابوونەوەو هێزە کێو ئاساکانی مێژوو لە گۆشەکانیدا تەسلیم کرا بوون. شەو لە باوەشی خۆی گرتبوون؛ لەزەتی شەهوانی مەرگ و تاریکی هەر هەموویانی تەسخیر کردبوو. ژیانیان لە ژیانی ڕووەکان دەچوو. لێ سەرەنجام بوون بە بەرد. لەم دنیای باتینەدا هەموو سامان و پاشەکەوتی ڕۆح پەنهان بوو، بەڵام وەکو گەنجینەیەکی نێژراو وا بوو کە کەسێک کانگاو عەمارەکانی بە پێی یاساێن بیرکاری، وەستایانە بەرجەستە کردبێ، لە قالبە زێڕو زیوێک دەچوو کە لە چینەکانی ژێرەوەی زەویدا بن و شاعیر وەکو مەعدەنچی، لە قوڵاییدا دەکەوتە گەڕان و تاقیب و بەدیتنی ئەو هەموو سامانە نێژراوە حاڵی لێدەهات، بەڵام ئەو ماوەیەی کە ئەو لە بنکی زەویدا بوو هەموو شتێک لەسەر زەوی درێژەی بە ژیانی هەمیشەیی خۆی دەدا، دنیای لە دەرێی ئەوەی کە شاعیرو فەیلەسووف لە دنیای باتیندا وردی دەکردەوە، هەر خۆی شێلو نەکرد. چونکە شاعیرو فەیلەسووف لەبری ئەوەی وەکو میرابۆ یان ناپلیۆن واقیعی بابەتی بەجددی بەکار بێنن، لە دنیای ناوەوەی خۆیاندا کەوتنە شیکردنەوەو لێکدانەوەی باتینانەی دنیا، بەڵام کاتێ کە شەبەنگان، شاعیریان ئازاد کردو شاعیر دووبارە لە کانگە وەدەرکەوت و پێی وابوو دنیای دەرەکی نەماوە، سەیری کرد بەدەقی خۆیەوە ماوە. ئەوەی ئەو لە دڵی خۆیدا تواندبوویەوە، مکوم و قایم لە بەردەمیدابوو؛ جا چونکە هیچ کاتێ دڵی بەدنیای دەرەکییەوە نەبوو، چونکە بە خەیاڵی ئەو وەکو دنیای دەروون و ناخی خۆی تاریک و خەمێن و خەوهاوەر بوو، بوونی دنیای دەرەکی بە درکی سەر ڕێگەی خۆی نەزانی، گەورەیی کردو چاوپۆشی کرد کە هەروەکو خۆی بمێنێ ٦ **(سەرچاوە: جورج برندز، ڕەوتە ئەسڵییەکانی ئەدەبیاتی سەدەی نۆزدەیەم. بەرگی دووەم ل ٢٠١ چاپی لەندەن)**

ئاساییە کە کاردانەوەی نێگەتیف و دەروونبینانەی هونەرمەندی ڕۆمانتیک بەرانبەر بەدنیای دەرەکی، لەهەر جۆرە ئارمانجێکی پۆزەتیف و کاراو چەلەنگ خاڵی بێ. بێ هۆ نییە کە فردریک شلگل لە کتێبە بەنێو بانگەکەی خۆیدا، لوسیند، ژیانی ڕۆمانتیک بەبێ «فەزلی» تەمەڵی و سستی و پیری بە مەحاڵ بزانێ. واتە ژیانی ڕاستەقینەی ڕۆمانتیک بەهاوتای و پیری و تەمەڵی و لەشپەروەری دەزانێ، ئەویش وەکو گەلێک لە ڕۆمانتیکەکانی دیکە، بێکاری و تەمەڵی بە کلیلی گەنجی ئیلهامێن شاعیرانەو هۆی بەرینی بیرو خەیاڵ و وردبینی دەزانێ. گۆشەگیری و سستی، بێگومان پەراگەندەیی خەیاڵ و پەشێوی ئەندێشەی بەدواوەیە. لە ڕوانگەی هونەرمەندی ڕۆمانتیکەوە، ژیان لەسەر بناغەی یاساو ڕێسایەک ڕۆنەنراوە تا بتوانی خۆتی پابەند بکەی. بۆیە، شیعری ڕۆمانتیک لەباری بونیادی فیکرییەوە بە تەواوەتی نایەکگرتووەو تاقە فاکتەرێک کە یەکپارچەیی پێدەبەخشێت «حاڵ»و هەست و سۆزێن شاعیرە، کە ئەویش وەکو هەوری بەهار هەر ساتەی بەشێوەیەک دەردەکەوێ. نوڤالیس دەڵێت کە «شیعری ڕاستەقینە» پتر لە قۆناغە جیاوازەکانی خەون یەکپارچەیی و مکومی نییە؛ «ریتم و ئاهەنگ و وشەکانی جوانە، لێ لەهەر جۆرە یەکێتی یان مانایەک بەدەرە، لە کۆپلەێن پەراگەندەو نایەکگرتوو دەچێت کە هەر یەکێکیان لە جێی خۆی مانای هەیە، بەڵام بە شێوەی تێکڕایی چ مانایەکی تایبەتی نییە.» (سەرچاوە: نوڤالیس، ل ١١٦ کتێبی ڕەوتی ئەسڵی ئەدەبیاتی سەدەی نۆزدە- جورج بریندز.)

ڕۆمانتیکەکان تەنیا شتێک بە «زیندوو» دەزانن کە ئاڵۆزو نادیارو دوور لە تێگەیشتن و پەژموردە بێ. بەلای ئەوانەوە، ئەوەی ڕوونی و جۆش و خرۆش و تاسەو کەڵکەڵەو بەهرەو تواناو سەلامەتی فیکری تێدابێ و سەروکاری دەگەڵ جیهانی ماددەدا هەبێ، بێ گیان دەنوێنێ. ڕۆمانتیکەکانی ئەڵمان، گۆتە نەک لەبەر تواناو بەهرەی بەرجەستەکاری ئەو، بەڵکو لەبەر ئەو تەم و مژەی کە چارەو سیمای هەندێ لە قارەمانانی ئەوی؛ وەکو هارپرومیگنون-ی دەورەداوە، بەگەورەترین شاعیری ڕۆمانتیک دەژمێرن و لەلایەکی دییەوە، کەسانی وەکو لسینگ و شیلەر هەر بە شاعیر نازانن، چونکە خەیاڵ و ئەندێشەی بەهێزی ئەوان زۆر جاران بەرەو دنیای دەرێ هەڵفڕیوە.٨ (سەرچاوە: جورج بریندز، هەمان سەرچاوە ل ١٨٢)

ئەم جۆرە داوەریەش زادەی جۆری بیرکردنەوەی ئایدیالیستی ڕۆمانتیکەکانە کە گیان و ماددەو بەدەن و ڕۆح بە جیاوازو ناکۆک لە یەکدی دەزانن و وای دادەنێن کە بە شێوەیەکی ئەبەدی


بایرۆن

لە یەکدی جیان.

ئێستا جێی خۆیەتی کە باسی کاراکتەر سازی ڕۆمانتیکەکان و ئەو بۆچوونانەی کە ڕۆمانتیکەکان لەمەڕ سروشتی ئادەمی و ڕەوتی کۆمەڵایەتی و مێژوویی هەیانە، بێننە ناوناوانەوە.

نووسەری ڕیالیست ویستی بنیادەمی بەهۆیەک دەزانێ بۆ دروست بوون و بەرجەستەبوونی توخمە جۆراوجۆرە زهنییەکان، بۆیە لە شیکردنەوە ڕۆحییەکاندا جیاوازی و یەکێتی لفانەو جمک دەزانێ و دەبینێ. بەلای ئەوەوە ویست و بڕیاری عەمەلی ئینسانی نیشانەی توانەوەی ئەو ناکۆکییە زەینیانەیە کە لە ناخی تاکدا یان لەناو بیرکردنەوەی تاکدا، لەگەڵ کۆمەڵدا هەیە.

بۆیە، نووسەری ڕیالیست جیاوازی و ناکۆکی زەینی ئەم و ئەو بەو کۆسپ و تەگەرەیە نازانێ کە نەیەڵێت لە قۆناغی کارو پراتیکدا مرۆڤ وەکو بوونێکی چالاک و چەلەنگ و داهێنەر بەرجەستە بکات. نووسەری ڕۆمانتیک، بە پێچەوانەوە، ڕەگی کەسایەتی تاک دەباتەوە سەر ژیانی تاک و نەوەکانی دیکەو بەجۆرێ وێنەی دەگرێت وەک بڵێی بەر لەدایکبوون و پاش مردنیش ژیاوە بەمجۆرە کەسایەتی و فەردیەتی واقیعی ئەو لە نێو دەبات و ئەو لە تایبەتمەندییە ئەخلاقییەکانی خۆی مەحروم و بێ بەش دەکات و خەسڵەتی خەڵکانی دی بێ هیچ جۆرە پێوەندێکی زەمانی یان شوێنی دەداتە پاڵ ئەو و لەوی بار دەکات. بۆیە یەکێتی موتڵەق و خەیاڵی لەبری یەکێتی ڕێژەیی و واقیعی دادەنێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کە نووسەری ڕۆمانتیک توانای دەرک و وەسفی یەکێتی کۆمەڵایەتی و هاوپەیوەستی و هاوسەنگی و سازانی فکری تاکی نییە؛ بۆیە زۆر کەرەت لە کۆتایی کاردا قارەمانانی چیرۆکەکانی خۆی بەشێوەیەکی تایبەتی ئەوتۆ وێنە دەگرێ کە لەدنیای تایبەتی و سنوورداری خۆیاندا دێنە ئاراوەو هەوڵ دەدەن درێژە بە ژیان بدەن و سەرەنجام هەر لەوێندەر دەمرن. بۆیە ئەو قارەمانانەی کە نووسەری ڕۆمانتیک دەیان خوڵقێنێ یان تاکی موتڵەقن یان وەحدەتی موتڵەقن و ئەم ناکۆکییەش زادەی یەک جۆرە بیرکردنەوەیە، (نەک زادەو بەرەنجامی جیهانبینانی ناکۆک)و ئەویش جۆری بیرکردنەوەی نادروستی ڕۆمانتیکەکان لەبارەی مرۆڤ و ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ.

بە شێوەیەکی گشتی، قارەمانانی چیرۆکێن ڕۆمانتیک تڵپەو خەستەی ڕۆحن؛ کەش و هەوایەکی خەون ئامێزو تەم و مژاوی دەوراودەوری گرتوون؛ تاقە داوێک کە بەدنیای دەرەوەیان دەبەستێ زەروورەتی بەدەنییە. لێ ئەم زەروورەتەش هەندێ جار بە جۆرێک گوشار دەخاتە سەر ڕۆح کە نەبێ زۆر باشترە.

قارەمانی شاتوبریان بە جۆرێ ئاوێتەی دنیای خەیاڵاوی خۆیەتی کە تەنانەت هەندێ جار لەبەدەنی خۆی، کە بەدنیای واقیعییەوە دەبەستێ، بێزار دەبێت و هەوڵ و تەقەللا بۆ ئەوە دەدا کە ڕۆح لەم «قاڵبە خاکییە» ئازاد بکات.

بەدەگمەن قارەمانێکی ڕۆمانتیکی بەدەست دەکەوێ کە لە ژیانی پڕ هەراو هەنگامەی خۆیدا خاوەن ئامانجێکی پۆزەتیڤ و عەمەلی (پراکتیکی) بێت؛ تاقە داینەمۆیەک کە لەمەیدانی ژیاندا بەرەو پێشیان دەبات، گوشاری خەیاڵ و سۆزەکانی خۆیانە؛ هەر هەموویان بە تاسەوە عەودالی ئارمانجەکانی خۆیانن، لێ لە واقیعدا بۆی ناگەڕێن، بەڵکو لە سێبەری پڕ خەیالی واقیع و ڕووداوەکاندا بۆی دەگەڕێن، بێ ئەوەی ڕووداوو بارودۆخ و حاڵ و ئەحواڵی جیهانی مادە ببێ بە کۆسپی سەر ڕێگەیان. هەر بۆیەش ئارەزووە یاخی ئامێزو هەوڵو کۆششی تورەیان ناگاتە هیچ شوێنێ. ئەو حەقیقەتەی کە بۆی دەگەڕێن دەیدۆزنەوە، بەڵام لە خودی خۆیاندا. تاقە ئەستێرەی ڕێنوێنی ئەوان بوونی خۆیانە کە بە تەختی تەوێڵی جیهانەوە دەدرەوشێتەوە، بێ ئەوەی چ پێوەندییەکی بە بوونەوەرانەوە هەبێ. دنیای ئەوان، دنیایەکی پڕ ئارامی و ئاسوودەیی و خۆشی و بێ خەبەرییە، هیچ شتێکی کرێت و ناهەموارو نەگونجاوی تێدا بەدی ناکرێت، ئارەزوو کەڵکەڵەیان هەیە لێ ویستیان نییە، بیردەکەنەوە لێ بەدەنیان نادیارو هەوایییە. ئەو کاردانەوەو پەرچەکارەی کە بەرانبەر بەدنیای واقیعی دەریدەبڕن ئاوێتەی بێ توانایی و بێ ورەییە، یانی ئەوان چ شتێک ئەنجام نادەن، بەڵکو هەموو شتێک لەبارەی ئەوان ئەنجام دەدرێ. تاقە هەست و حاڵەتێک کە ئەوان بەرەو دنیای دەرەکی بەکێش دەکات «چاوەڕوانییە»، ئەویش مەرهەمێکی تایبەتییە کە لە حەزو پێویستی و بێ توانایی پێک هاتووە.

ویلهلم-ی قارەمانی گۆتە، هیچ هەوڵ و تەقەللایەک نادات و هەمیشە لە حاڵەتی چاوەڕوانیدایە. سەرەتا لەسەر شانۆ بۆ ئامانجەکانی خۆی دەگەڕێ و پاشان بە سۆراغی ژیانەوە دەڕوات.

چونکە بناغەی ڕۆمانتیزم لەسەر فەلسەفەی ئایدیالیزم ڕۆنراوە، بۆیە نووسەری ڕۆمانتیک بیر بە خوڵقێنەری ژیانی کۆمەڵایەتی دەزانێ، واتە ژیانی کۆمەڵایەتی بە زادەی بیران دەزانێ و لە ئەنجامدا گۆڕانی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی بە بەرەنجامی گۆڕانی فیکری و ئەخلاقی دەزانێت و مەرهەمی ڕۆحی دەکات بە شەفابەخشی نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکان. با نموونەیەک بێنینەوە: ژان ڤالژان لەسەرەتای بێنەوایان-دا پیاوێکی دێو«شەیتان» ڕەوشتەو دزی لەو کەسە دەکات کە پەنای داوە و خواردنی داوەتێ، قاپەکانی دەدزێ، لێ لە کۆتاییدا دەگۆڕێ و دەبێت بە فریشتەیەکی ڕەحمەتی ئەوتۆ کە ئامادەیە هەموو شتێکی خۆی بە قوربانی خەڵکی بکات. ئەو



کۆلیریج

فاکتەرانەی کە لەم گۆڕانکارییەدا دەوریان هەیە فاکتەری کۆمەڵایەتی نین، بەڵکو هۆکاری ڕۆحی و ئەخلاقی زادەی دیداری ژان ڤالژان و ئابەمیریل-ە کە «چاکەی موتلەق» لە بوونیدا بەرجەستەیە. لەبەر ئەمە چاکی لە دیدی هۆگۆ-وە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی نییە کە پەیوەست بێ بە قۆناغ و بارودۆخ و حاڵ و ئەحواڵی کۆمەڵایەتییەوە، بەڵکو تەجەلییەکی خواوەندییە لە ڕۆحی ئینسانیداو هەمیشەش هەر سەرکەوتووە.٩ (سەرچاوە: فاطمە سیاح؛ «موضوع رمانتیسم و رئالیسم» مجلە مهر شمارە ٣، ساڵ سوم، ص ٢٧٩- ٢٨٠

لە حاڵێکدا، نووسەری ریالیست چاکی و پاکی و تەقوا بە موتلەق و خوایی نازانێ و ئەوانە، وەکو ناپاکی و کرێتی و بەدکاری، بە زادەی ڕەوتی کۆمەڵ دەزانێ و لە ئەنجامیشدا تەقوا هەمیشە بە پیرۆز و سەرکەوتوو نازانێ. وەکو چۆن کە وترن-ی (قارەمانی ڕۆمانی باباگوریو-ی بەلزاک» کە بەرجەستەکاری ناشیرینی و کرێتییەکانی کۆمەڵگەی شارنشینە، بە پێچەوانەوەی ژان ڤالژان کە پاش ڕووبەڕووبوونەوە دەگەڵ وێنای چاکی موتلەقدا شکست دێنێ، لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستی ناک دا سەردەکەوێ و تەقوای ئەو دەبەزێنێ یان وەکو چۆن، ژولین سورل-ی «قارەمانی سوور و ڕەش-ی ئەستاندال» بەهەموو داوێن پاکی و ڕەوشت بەرزی و بەرزەفڕییەکییەوە، وێڕای ئەوەی کە چەند ساڵێک ئامۆژگارییە ڕۆحانییەکانی وەرگرتبوو، بەرە بەرە لە ناو ئەو جۆلاتەنەیەدا گیرۆدە دەبێ کە کۆمەڵ لە دەوری تەنیوەو بە دووی پلەو پایەو سەروەت و ساماندا وێڵ دەبێ و خل دەبێتە ناو نشێوانی نادیاری هەزار بە هەزارەوە.

نووسەری ریالیست، چونکە ژیانی ئادەمیزاد لە چوارچێوەی ڕەوتی مێژوویدا دەبینێ، قارەمانەکانی ئەو هەموویان خەڵقانی گەشەکردووی کۆمەڵایەتی و مێژوویین. لێ هونەرمەندی ڕۆمانتیک مرۆڤی سەرەتایی وێنە دەگرێت. بۆیە خۆی بە سروشت و دەورانی منداڵییەوە کە هێشتا ڕەنگ و ڕووی کۆمەڵایەتی بە خۆوە نەگرتووەو «نەلەوتاوە» مژوول دەکات تەبیعەت و سروشت لە ڕوانگەی ئەوەوە ڕەنگدانەوەی هەست و خەیاڵ و بیرەکانی ئەو و قارەمانەکانی ئەوە. هونەرمەندی ڕۆمانتیک گۆڕانی ژیان لەبەر تیشکی گۆڕانی ڕەنگ و بۆی تەبیعەتدا تەمەشا دەکاو دەبینێ: گۆڕانی وەرزەکان، شەو و ڕۆژ، مانگە شەوی خەمگین، ناڵەی بای سەرگەردان، هەیبەت و سامی کۆساران و قووڵی ئەفسوون ئامێزی دەریا، شادی و سەیرو سەفای لە دەست چووی منداڵی... هەر هەموویان پاژی ئورکسترێکی شکۆدارن کە سەمفۆنی چارەنووسی مرۆڤانی لێدەدات. لەبەر ئەمەیە کە قارەمانانی ڕۆمانتیک تەنیا لە باوەشی تەبیعەتدا بە بوونی خۆیان دەبەن و بیرو خەیاڵی خۆیان پەروەردە دەکەن و پەروباڵ لە تواناو بەهرە زەوی گیرەکانی خۆیان دەنێن. ئەوان (ڕۆمانتیکەکان) ڕێگە کۆمەڵایەتییەکان، کە تاقە چەکی دەستی مرۆڤە بۆ گەیشتن بە پەرەسەندن و ئازادی، بەداڵانی مەرگ و تێشکان دەزانن و لەبری ئەوەی لە ڕێگەی هەوڵ و کۆششی داهێنەرانەی ئینسانییەوە لە ڕەنج و پاشکەوتووی خۆیان کەم بکەنەوە، ڕوودەکەنە تەبیعەت و ڕابردووی دوورە دەست و بەتەواوەتی خۆیانی تەسلیم دەکەن.

لە کۆتاییدا: هەرچەندە ڕۆمانتیزم لە قۆناغەکانی هەوەڵیدا جۆرە گۆشەگیری و دوورکەوتنەوەیەک بوو لە ژیانی کۆمەڵایەتی و دنیای واقیعی،«لە ڕێگەی گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، پەنابردنە بەر تەبیعەت و سەردەمی منداڵی و... تاد» لێ لە قۆناغەکانی پاشتردا بە شێوەی گەڕانەوەی هونەرمەند بۆ ژیان و جیهانی واقیع دەرکەوت، بەڵام ئەم گەڕانەوەیە لەبەر ئەمە نەبوو کە هونەرمەندی ڕۆمانتیک ژیان و واقیعی پێ قەبووڵ بوو، بەڵکو مەبەستی ئەوە بوو کە بوون و واقیع بە پشتیوانی پێوەرە خەیاڵییەکانی و بە ئارەزووی خۆی قالب ڕێژی بکات «بەهۆی ئەوەی ڕەنگی ڕازو ئەفسانەیی لە واقیع بدات، ئاشکراو ئاشناکان، نادیارو تەمومژاوی بنوێنێ، بەدەن وەشێرێ و ڕۆح زیندوو بنوێنێ و ئەمری بە ژیان ببەخشێت و.. تادد».

خەتەر و مەترسی جیهانبینی ڕۆمانتیزم و هەر هەموو «ئیزم»ەکانی سەر بەهەمان سەرچاوە، لێرەدا پەنهانە.

دەبێ ئەوە بڵێین کە ڕۆمانتیزم، بەوەی کە بۆ چەند ڕۆژێکی کەم، بووە مایەی شکۆفەکردن و پشکوتنی بەهرەێن هونەری، ڕێگەی بۆ داڕووخانی کۆڵەکەکانی هونەری دنیای ڕۆژاوا کردەوە، ڕۆمانتیزم، ئازادی هونەرمەندو تاکپەروەری بێ پایانی بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ کردو ئەمەش بووە مایەی داڕووخان و هاتنە خوارەوەی پایەی هونەر. هونەری ئینسانی کە بە بێ تاکپەروەری و ئازادی تاک ناتوانێ پێ بگرێ. لە ئەنجامی توندڕەوی لە تاکپەروەریدا، لە پێ دەکەوێ، وەکو چۆن بەبێ بوونی باب خێزان دروست نابێ، بەڵام ئەگەر پاش دروستبوونی خێزان باب هەموو شتێکی هەر بۆ خۆی بوێ و بۆ خۆی تەرخان بکات، خێزانەکە لەبەر یەک هەڵدەوەشێتەوە، بڵاوبوونەوەی تاکپەروەری ڕۆمانتیک لە قوتابخانەکانی ڕەمزییەت و سوریالیزم و... تاد، بە جۆرێک دەبینین کە شایەدە لەسەر ئەم داڕووخان و لەبەر یەک ترازان ڕوو لە زیادیە..❖



# خواندنەکا نە تەمام بۆ هۆزانەکا نەتەمام بووی

د. عارف حیتو
(دهۆک)

خواندنا هۆزانێ، نە وەکو هەر خواندنەکا دییە، پشکداریبا هۆزانڤـانیـیـە دخـەم و ئاشـۆپ و ئاسـۆیێن دیتنا وی دا، هەرچەندە ئەگـەر دیتنەکا دی یا جـودا ژی دناڤـدا هەبیت، پێـحـەسـیـانا وان رامـانێن پشت ڕێزانە، ئەوێن ب پەیڤـێن بارکری و ب ڤەڕێژ دکەڤلوژانکەکێ دی یێ رامانیدا بەرهەست دبن. وەغەرەکا مورفینی یە د نەدیارییدا ژ بۆ ڤەگەڕەکا مشت ژ خوەشیێ و مـفـادارییێ (مفا.ـچ وەک خۆشی یان ژی وەک پێزانینێن نەپستمی).

هەلبـەت، مـەرج نینە، خواندنا هۆزانێ خـالێن پۆزەتیڤ و نێگەتیڤێن ئاڤاهیێ هەلبەستێ دەستنیشان کەت، چ ژلایێ روخـسـارێـڤـە بیت یان ناڤـەرۆکێ. هەروەسـا ژی، خـواندنا هۆزانێ، نە چاڤدێرییەکا سانسۆرییە ژبۆ خویاکرنا بوویەرو وێنەیێن دهۆزانێـدا دهێنە نەخـشـاندن و رویدان. نەژی شرۆڤەکرنەکا فەلسەفییە بۆ ناڤەرۆک و ئەلەمەنتێن هۆزانێ، بەلکو خواندنە و بەس....

بێ ژێدەر، بێ حـوکـمـێن رەق یان یێن نەرم، بێ هەلسـەنگاندنەکا رەخنەیی..بێ هەستێن ئوستادیێ و خوە ب ماموستا کرنێ.

خواندنا هۆزانێ دنڤیسینەکا هۆسادا مە مەرەم پێ ئاڤاکرنا دەقەکێ دییێ پەخشانکییە لسەر شەنگستێ پەیڤ و وێنەییێن هۆزانێ بخـوە، ڤـەکـرنا هندەک گـرێ یێن گـرچنە د بیـاڤێ دیدوبۆچوونێن ئاڤاکەرێ دووێ دا، دانپێدانەکا ئاشۆپییە د سەمایا هزرکرنێداو پاشی بەلاڤەکرنا ڤێ خوشییێ یە لسەر نەوێن دڤێن خوشیێ تامکەن.

دبیت جەوسەرێن خوشیێ ژ کەسەکی بۆ ئێکێ دی د جودا بن، لێ خرڤەکرنا ڤان جەوسەرێن خوشیێن جودا ژی خوشییەکا دی یا نە هەڤـسـەنگە، هەڤـسـەنگیـیا مـرۆڤی پێ د هێتـە پاراسـتن. ب کـورتی ئەم دکـارین بێـژین، خـواندنا هۆزانێ پاسـەپورتەکا رەسـەنە (نە یا سـەختـەیە) ژ بۆ کـو مـرۆڤ- ئاڤاکەرێ دووێ خواندەڤان- پێ بچیتـە دناڤ باخچەیەکێ پەرجانکریداو ل گورەی حەزو گیـوٚلێ خوە بێهن کەتە گولان. لێ دسـەر ڤێ هەمـیێ ژی را دەمێ مـرۆڤ دگـەهتـە دناڤ باخچەیێ گولان دا، دویر نینە کو خواندەڤان ژی هزروبۆچونێن خوەیێن تایبەت هەبن و هندەک جاران وێ رێ بدەتە خوە کو هندەک تشـتـان تامکەتن و ب ڤـەجـوتنێ و ب چاڤـەکێ رەخنەیی/ یان هەلسـەنگاندنەیی هێڤ کـەتێ ژبەرکـو مـە گوتیێ ئاڤاکەرێ دووێ، لەوا دێ شوین تبلێن وی ژی لسـەر دەقێ ئێکێ و ددەقێ دوویێدا دیاربن.

ژ ڤێ تفـتـانێ (منطلق) مـە لبـەرە خواندنەکا وەغـەرکـانە دناڤ ڕێزکێن هۆزانا (ماچ، گونەه، وەلات)دا بکەین، ئەوا ل گۆڤـارا پڕ خوشـتـڤی یا رامـان- هژمـار (٦٢)-دا لبن ناڤێ (تریفە دوسکی) بەلاڤەبوی. ناڤێ ڤێ نڤیـسینا خوەژی، مە کر. (خواندنەکا نە تەمام دهۆزانەکا نەتەمام بووی)دا، چونکو ب هزرا مـە ئەڤ خواندنا مـە لبەر نەیا تـەمامـە کـو هەمێ لاو کـوژێێن ڤێ هۆزانێ ڤـەگـریت و هەروەسـا ب هزرا مـە، ئەڤ هۆزانە ژی هێـشـتا نەیا تەمـامـە، چونکو ئەز هەست پێ دکەم هێشتا هندەک تشتێن ماین نەگوتین و دڤێت بێژیت.

هەلبـەت دەمێ مـرۆڤ دەقـەکێ داهێنەر دخـوینیت، ب شێوەیەکی یان ب ئێکێ دی شوین تبلێن خوە دناخێ مرۆڤیدا دهێلیت، یان ژی ب کێمی سەرنجا مرۆڤی رادکێشیتە هندەک بابەتێن ئازراندی.

*** بابەتێ جورنەتێ دهۆزانا (ماچ، گونەه، وەلات)دا:**

جورئەت وەکو بابەتەکێ سەرەکیێ ڤێ هۆزانێ، مینا منارێن گوندان لبەر چاڤێن خواندەڤانی- نەمازە ئەوێ شەرمین-زیق دبیت.

ئەو بخوە د بنەکۆکا خوەدا جورئەت پرۆسەیەکا نەکەهییە دناڤ پرانیا جڤاکاندا، ئانکو هاڤۆتنە دژی ڕێچوونا ئاڤا رویباری، بازدانەکا ویرەک و بێهودەیە لسەر هەڤبەندی یێن هەیی د جڤاکیدا و خولێدانا تشتەکێ نەدیارو نەجێرباندییە، لەوا ب فلی یان ب خوەشمێری دهێتە ل قەلەمدان. جورئەت ژی مینا سنجی ژ جڤاکەکی بویەکی دی دهێتە گوهورین، ئانکو ئەو تشتێ دجڤاکەکیدا ب جورئەت دهێتە نیاسین، دبیت دجڤاکەکێ دی دا تشتەکێ سروشتی بیت. ئەڤجا هەتاکو ئەم بکارین ئەلەمەنتێن جورئەتێ دەستنیشان کەین، فەرە ئەم جڤاکێ جورئەت تێدا روی دای بنیاسین و هەڤبەندی یێن وی یێن بەرهەمهێنانێ شرۆڤە کەین.

یا خویایە کو جڤاکێ کوردی ژ ئەگەرێ بن دەستیبا چەندین سالێن داگیرکرنێ و سەرکوتکرنێ و ژێکڤەقەتیانێ و پرت پرتکرنێ و گەفێن هەلوەشاندنا کەسایەتیبا کلتوریبا کەسێ کورد ئاکامەکا کویر کریبە سەر دەروونێ کەسانێ کورد، هەروەسا ئەگەر ئەم ب شێوەیەکی گشتی سەحکەینە جڤاکێن رۆژهەلاتا ناڤین کو دپرانیا جارو هەلوێستاندا ب میتافیزیکی و ئاشۆیی سەرەدەریێ دگەل ژیانێ دکەن، دبیت ئەڤەژی ژبەر هەڤبەندیبا موکم بیت دناڤبەرا کەسێ رۆژهەلاتی و ئایین و ئولداریێ ڤە، ئایین بخوەژی باوەرپێکرنە ب تشتەکێ غەیبی ژ بۆ هەڤسەنگ کرنا ژیارا سەخت، ئانکو گەرەوتژیکرنەکا دەروونییە ژ بۆ بەردەوامیا ژیانێ دپرانیا بارودوخێن دژواردا، خو قورتالکرنە ژ ئێشانێن سەتمێن و ترومایێن دەروونی، ئەگەر ئەڤەژی بۆ دەمەکی وەکو پێدڤییەکا ژیارێ بوو بیت و دئایبردەو رەوشەکا پیرۆزا پێدڤیدا گەشەکر بیت، بەرە بەرە دگەل بوون و ژیان و وەرارا خەلکی مەزن بوویە، هەتاکو بوویە شویرهەکا پۆلایین و دریکا هزرکرنێدا راوەستای (گونەه)، چونکو هەر تشتەکێ پیرۆز ڤالاو رویتە ژ گونەهان و هەروەسا ئەڤ پیرۆزییە یا کەڤنە، بەلکو کەڤنترینە، لەوا ل گورەی لۆژیکا ئەرستوتالیسی، هەر تشتەکێ کەڤن دبیتە ئاییردەکێ پیرۆزو نابیت خەلک خوە لێ بدەت یان ژی ب چاڤەکێ رەخنەیی سەحکەتێ (خوارق اللاشعور- د. علي الوردي).

بهزرا من، ئەڤ چەندەیە وەلێ دکەت کو دپرانیا جڤاکێن پاشڤەمایی دا هزرکرنەکا رابردوویی هەبیت و پێشبینی یێن ئایندەیی دبەرتەنگ بن. ژلایەکێ دیڤە ڤێ کەڤناتیبا پیرۆز چارچوڤەکێ بۆ هاتییە دانان و دجغزا سنجیدا هاتییە هەلگرتن، ئەڤجا سنج ژی پیرۆز دبیت، هەرچەندە پیرۆزیبا شێوازێ سنجی ژی ژ جڤاکەکی بۆ یەکێ دی جودایە، ئانکو ئەو تشتێ د جڤاکەکیدا سنجدار بیت، دبیت دجڤاکەکێ دی دا ب بێ سنجی بهێتە نیاسین. بڤێ چەندێ چەمک و تێگەها سنجی ژی ل گورەی هەڤبەندی یێن بەرهەمهێنانێ و


ترێفە دوسکی

سەرەدەریا دگەل جڤاکی و دەستەلاتێ دهێتە گوهورین و ئەڤ پیرۆزییە ژپاناڤەکێ بەرفرەه ئینایە خوارو کریبە دناڤ چارچووڤەکێ بەرتەنگتردا.

دجڤاکێن رۆژهەلاتیدا، نەمازە ئەوێن گشتوکالی (وەکو کوردان) دێ بینین کو بابەتێ سێکسی ئێکە ژوان بابەتێن هەرەگرنگ و هەستدارێن هەڤبەند ب پیرۆزیا سنجیڤە، ئانکو ل شوینا پاناڤێ بەرفرەهێ (راستگۆیی، جوامێری، ئەختویاری، نەدزیکرن و نەسیخوری و نەغەیبەتکرن.... هتد) بەرتەنگ بوویەو کەفتییە دناڤ جغزا سێکسیدا. بڤێ چەندێ ژی سێکس دبیتە بابەتەکێ پیرۆزو کەسەک نەکاریت یان نەوێریت خوە لێ بدەتن یان بەحس ژێ بکەتن، هەژی گوتنە، گەلەک کەس هەنە حەرامکرنا بابەتێن سێکسی (رەوشەنبیریبا سێکس) ددەنە پال ئایینێ ئیسلامەتیێ، لێ ئەگەر ئەم چاڤخشاندنەکا بلەز بسەر ڤی ئایینێ پیرۆزدا بینین خوارێ، دێ بینین کو سێکس بابەتەک بوویە ژوان بابەتێن گرنگێن دانوستاندن لسەر دهاتەکرن، ئەگەر ئەم ل فەرمودەیێن پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤ لێ بن) بزڤرین، دێ بینین کو هویرترین پرسێن رەوشەنبیریا سێکسی دحەزرەتا ویدا هاتینە بەحسکرن وەکو رێ نیشاندەرەک بوویە (دڤی واریدا) بۆ باوەردارێن ئیسلامێ. راما نا ڤێ چەندێ ژی ئەوە کو ئەڤ قەدەغەکرن و ڤەچغاندن و ترساندنا ژ بابەتێ سێکسی نەبەرهەمێ ئیسلامێ بوویە، لێ بەلکو بەرهەمێ ئیجتهادا دەستەلاتدارێن یەک لدویف یەکێن دیرۆکێ بوویە، ژ بۆ پاراستنا بەرژەوەندیێن خوەیێن کەسۆکی ب ناڤێ ئایینی یان سنجی یان ژی پیرۆزیێ ئەڤ پێدڤیبا گرنگا مرۆڤی هاتییە چارچویڤەکرن ب شێوازەکێ چەوت، چونکو ئەڤ چارچویڤەکرنە دبنەکۆکا خوەدا بوویە ئەگەرێ پەیدابوونا چەندین ئاییردەیێن چەوتێن جڤاکی کو ڤێرە نەجهێ بەحسکرنا وانە.

هەلبەت ئەڤ هەردوو بابەتێن ژێگوتی دبن کارتێکرن و پالدانا دەستەلاتێ بووینەو دناڤ پەنج و تەڤنێن وێدا وەرارو



موحسن قۆچان

گەشەکرینە، دەسەلات کو نوینەرا خودایی یە لسەر عەردی یان ژی خودان و زێرەڤانێ وەلاتییەو ب پیرۆزییا وەلاتیڤە دهێتە گرێدان و بڤێ چەندێ دەستەلات ژی پیرۆز دبیت و هەرکەسێ خوە لبەر دیوارێن وێ بهەلاڤێت یان ب چاڤەکێ رەخنەیی سەرەدەریێ دگەلدا بکەت، دێ کوفر بیت و ژ سنجی و بیروباوەرێن ئایینی هێتە شوشتن، ئەڤەژی مەرەما دەستەلاتێیە کو د قوناغێن دیرۆکیدا ئەڤ ئاییردە بەرجەستە بووینەو ئەو هەر سێ پیرۆزی یێن ژێکگوتی پێکڤە دهێنە گرێدان و سێتکەکێ بازنەیی ژێ پەیدا دبیت و لدور جڤاکی دزڤڕیت، دەسپێک و دوماهی یێن ڤی سێتکی دگەهنە یەک و دبیتە بازنە، ئەم دکارین بێژینێ بازنەیێ ب کوتەکیێ لدور جڤاکی هاتییە ئالاندن.




ئەڤ بازنەیێ هەیێ ئەزەلی بووی و دناڤ جڤاکێن پاشڤەمایی دا دبرسڤیت، پڕانیا خەلکێ ژبۆ هویبون و بەردەوامیا ژیانا خوەو سەرەدەریکرنا دگەل جڤاکی، خوە ژ لێدانا ڤی بازنەی دپارێزن و هەول ددەن دگەل ئاراستەیا بایێ بێدەرێ بدەنە بای، لێ هەر بازدانەکا وێرەکانەیا لسەر ڤی بازنەی بهێتە کرن ڤارێبوونە، لێ ئەگەر ب هویربینی و تێگەهشتییانە بهێتەکرن ب (جورئەت) دهێتە ل قەلەمدان. جورئەتە.. مرۆڤ مەلەڤانیا د نەدیاریێ دا بکەتن ژ بۆ بەرهەستکرن و بەرجەستەکرنا تشتێ دیار. جورئەتە.. مرۆڤ ژبۆ بەرهەستکرن و بەرجەستەکرنا تشتێ دیار. جورئەتە..

مرۆڤ ل گورەی پێدڤی یێن هەنوکەیی هندەک لبنێن نوی لسەر شەنگستێ شویرهێ ئاڤاکەت. جورئەتە.. مرۆڤ هزرەکا هەلسەنگاندنەیی د ئەندازەیی یا شویرهێن بلندا بکەت. جورئەتە.. مرۆڤ بیر ل مرۆڤانییا مرۆڤی و گوهارتنێ بکەت. جورئەتە.. مرۆڤ ژ کەڤلوژانکێ رابردووی دەرکەڤیت و پێشبینی یێن پاشەرۆژێ بکەت.

هەرچەندە ڤی بابەتی دویڤچوون و شرۆڤەکرنێن پێتر پێ دڤێن، لێ چەند پتر دناڤ بابەتیدا بچینە خوار، هەڤیرێ بابەتی دێ پتر ئاڤێ ڤەخۆت. ئەڤجا داکو ژ هێلێن سەرەکی یێن بابەتی دەرنەکەڤین، دێ زڤرینەڤە هۆزانا (ماچ، گونەه، وەلات) کو هەڤبەندییەکا موکم ب ڤان چەند رێزکێن ل سلالڤە هەیە.

دپڕانیا جاراندا وێنەیێن ڤێ هۆزانێ وەکو کلیلێن سحرینە ژبۆ ڤەکرنا دەرگەهێ قەلاتێ (هۆزانێ)، دێ بینین کو ماچ و گونەه و وەلات مینا سێگوشەیەکا ترسناک و ب سەهم لبەر دەرگەهێ هۆزانێ راوەستایەو سەرنجا خواندنەڤانی رادکێشیتە موغامەرەیەکێ دناڤ کولانێن ڤێ قەلاتێدا بکەت. هەر ژناڤێ هۆزانێ خویایە کو هۆزانڤانا گەنج دبێژتە مە دێ موغامەرەیەکا نەکری کەم و دێ خوە ل سێگوشەیا سێکس و ئایین و سیاسەتێ دەم.




یا خویایە کو ل گورەی پڕانیا فەرمەسیون و هزرمەندێن رۆژهەلاتی و رۆژئاڤایی، ئەڤ سێگوشەیا هزرتێکرنێ یا قەدەغەو مەرتالکرییە، هەرکەسێ هەولا خو لێکدانێ بکەت، دێ دبن دیوارێن ڤێ سێگوشەیێ دا ئاسێ بیت و دێ دچاڤێن جڤاکیدا نامۆ بیتن.

لێ هۆزانڤانا گەنج ڤیایە خوە بکەتە گایێ قوربانیێ و بابەتێن ڤێ سێگۆشەیا ب سەهم دانتە سەر کاغەزێ و روی کەتە بەردەستێ خواندەڤانان. ئەگەر ئەم ب هویری هۆزانێ بخوینین، دێ بینین کو ژ چەند وێنەیێن پێکڤە گرێدای و ژێکڤە قەتیای هاتییە رستن و ب ئەندازەیەکا دلینی کو د ئەنجامدا هەر وێنە جۆکەک برژیتە ناڤ رویبارێ درێژو بەردەوامێ هۆزانێ و ببیتە گوشەیەکا خوەسەرو بهەڤڕا میناکێ سێگۆشە ب سەهم ژێ چێکەت و ب چاڤەکێ رەخنەیێ هەلسەنگاندنکار سەرەدەریێ دگەل بکەت.

**پەریەکێ پێلا دەریای ڤەکر**
**و.. چوو ژڤانەکێ دگەل فریشتەکێ جل رەش**
**ل ژوورا ئاسمانێ هەفتێ یاری ب پەرتووکا گونەها هاتە کرن**
**دوو روح دلەشێ زڤستانەکا ساردا، و چیرۆکەکا هاردا گازی دکەن،**
**ستێرا ژ خەو رادکەن...**

رامان ٦٢ / بپ ١٢٥

ئەڤ پەرەگرافێ ها.. ژ چەندین وێنەیێن جوان و ژێکجودا و خوەسەر پێک دهێت، لێ هەمی بهەڤرا دهێنە گرێدان ژبۆ چێکرنا میناکێ سێگوشەیا (سێکس و ئایین و سیاسەت)ێ کو ئەڤ میناکە وەکو وێنەیەکێ هۆزانکیێ یەک بابەتی و یەکگرتی لبەر دەرازینکا قەلاتا هۆزانێ خویا دبیت.

**١- «دوو روح دلەشێ زڤستانەکا، ساردا، چیرۆکەکا هاردا.. گازی دکەن.....»**

زڤستان کو نیشان و جەڤەنگێ سەرماییێ یە دجڤاکێ مەدا، دەمێ دهێتە پەسنکرن ب هەمان پەسنێ هەیی، وەکو «زڤستانەکا سار»، هەرچەندە دبیت ئەڤ هەڤالناڤە «سار» ژلایێ قەتلازیا پەیڤانڤە د هۆزانێدا یا زێدە بیت، یان ژی، چ زێدەهی یێن دی یێن هەڤالناڤی لسەر زڤستانێ زێدە نەکەت، لێ ب هزرا من ئەڤ داکوکییە لسەر سارییا زڤستانێ هێمایەکێ سێکسیێ ئاشکرا ب خوەڤە هەلدگریت، نەمازە دەمێ دوو روح دناڤ ڤێ سەرماییێ دا گەرم دبن و بڤێ گەرمێ هار دبن. هەلبەت ئەڤ وێنەیێ سێکسی نە ژ بێ دەستێ کەفتییە یان ژی بەرهەمێ نەهوشگەهێ یان (فلاش باک)ەکییە، بەلکو ب هشیاری ئینایە و ددویڤدا هەڤۆکا (گازی دکەن) ڤێ کریارێ تازی دکەت و هەبوونا رەوایی یا سێکسی گوهێن خەلکی پێ بەل دکەت، کو ئەڤە بخوە د بنەکۆکا خوە دا بازدانەکە و وێرەکییە لسەر جڤاکەکی دهێتە کرن کو ئەگەر هەمی تشتێن وی د ئاشکرا بن، دڤێت بەحسکرنا کریارا سێکسی یا مژداربیت.

ژلایەکێ دیڤە داکوکی لسەر سارییا زڤستانێ بخوە، ئیشارەتەکە بۆ جڤاکێ مەیێ کوردەواریێ و کلتورێ وی یێ مشت، ژ بەحەسکرنا زڤستانێن سار، چونکو ئەگەر ئەم زڤستانێ ل گورەی هەیڤێن وێ حساب کەین، ل کوردستانێ یا سارەو ئالاڤێ گەرمکرنا ڤێ سەرماییێ ژی دکلتورێ کوردەواریێ دەڤوکیدا کریارا سێکسییە. ئەگەر ئەم ڤی وێنەی پرت پرت بکەین و هەر پرتەیەکێ جودا جودا سەرەدەریێ دگەل بکەین و ژنوی ئاڤا کەینەڤە:

**- دوو روح**
**- زڤستانەکا سار**
**- چیرۆکەکا هار**
**- گازی کرن**

ئەڤ پرتێن هەنێ ئالاڤێن کریارەکا سێکسینە، دوو گیانێن ئاشق و چیرۆکەکا گەرما ئەڤینێ ب هەڤرا دلەشێ زڤستانەکا ساردا کریارا سێکسیی دکەن، ژبۆ بەردەوامییا ژیانێ و خوە قورتالکرنێ ژ نەمانێ.. لێ دەمێ ئەڤ هەردوو روحە گازی دکەن و ستێرێن نڤستی ژ خەو رادکەن، هینگی. بابەتێ خۆشیا کریارێ ژی دهێتە پێش، ئەڤجا کریارەکا (خۆش.... مفادار.... رەوا) فەرە مرۆڤ خوە لێ بکەتە خودان.

**٢- «ل ژوورا ئاسمانێ هەفتێ یاری ب پەرتووکا گونەها هاتە کرن....»**

گونەهـ کو ڤەرێژەکا شەنگستەیی یا ئایینی یە، د چارچووڤێ پیرۆزیێ و پیرۆزییا نەگوردا دلڤلڤیت، هەر گوهورینەک یان هزرکرنەکا گوهورینکی دڤی چارچووڤەی دا بهێتە کرن بازدانەکا وێرەکە و لادانەکا گونەهە د دەرحەقێ پیرۆزیێ دا دهێتە کرن.

ئەڤجا دەمێ یاریکرن بڤی چارچووڤەی دهێتە کرن ئیشارەتەکا بەرچاڤە کو هەلسەنگاندنەکا رەخنەیی یا بۆ دهێتە دروست کرن و ب رێکا ڤێ هەلسەنگاندنێ ژی هەبوونەکا دی یا جوانتر ددەتە خودی (ذات) هەبوونا چارچووڤەی، لێ ب ئاوایەکێ دی یێ بەرفرەهترو ڤەکری تر، کو ل شوینا پیرۆزییا هەیی پیرۆزییەکا دی پەیدا دکەت، ئەوژی هەمە جورییا تێگەهان و رێزگرتنا ئازادییا هزرکرنا کەسۆکییە، بڤێ چەندێ ژی ئەز دکارم بێژم کو ئەڤ کریارە ئاڤاکرنەکا دییە لسەر ئاڤاهیێ هەیی دهێتە کرن کو تام و رەنگ و جوانییەکا دی ددەتە لەشێ هۆزانێ، داکو دگەل سەردەمێ ئەیوونێن هۆزانێ بگونجیت و خۆشییەکا دی یا نە سروشتی بگەهینتە خواندەڤانی. ئەڤ کریارا یاریکرنێ ب پەرتووکا گونەهان و ل جهەکی کو وارێ خوداوەندا و پیرۆزیێ یە (ئاسمانێ هەفتێ) د چیڤانۆکێن کوردیدا ب دەستێ پەهلەوانەکا چێکری ددەتە کرن، کو ب هزرا من، ئەڤ پەهلەوانە بخوە سیتافکا وێیە



**عەلی وەردی**

کەفتییە بەر کاغەزێ.

**«پەریەکێ پێلا دەریای ڤەکرو**
**چوو ژڤانەکێ دگەل فریشتەکێ جل رەش...»**

پەریێن تەناو دبەهەشتا بەرین دا خوە دهاڤێنە دەریایێن کویرو پێلێن هار ددەن و پەردێن تەناهیێ ددرینن. پەری کو سیمبولێ ژیانا نموونەیی و تەناهیێ و کریارێن چێکری یێن دەستنیشانکری خوە ل پێلێن دەریا ددەن و ڤەدکەن کو دەریا سیمبولێ نەدیاریێ و بەرزەبوونێ و خودا هێلانییە دناڤ قەرقەشەکا نەتەنادا. ئەڤ هەڤتەریبکرنا هەڤدژان جورئەتەکە هوزانڤان ددەتە خوە کو وێنەیان سەروبن کەت و بڤێ سەروبنکرنێ خوشیێ بدەتە وەرگری و بڤێ خوشیێ ئەو ژی خوشییەکا دی یا ژ تەرزەکێ دی ژێ دبینیت، خوشیا موغامەرەکرنێیە دبوویەرێن تەناو جێگردا. لێ ژبۆ داکوکی کرنێ لسەر ڤی شێوازی هەڤتەریبی یا هەڤدژان هوزانڤان وێنەیەکێ دی یێ وێرانکەرتر ددەتە پال ڤی وێنەیێ دەسپێکێ ژبۆ ئاڤاکرنا وێنەیەکێ تەمام، هەروەکو دڤێت بێژیت هەر ئاڤاکرنەک پشتی هەرفاندنەکێ بلند دبیت. فریشتە جلێن خوە یێن سپی ددرینن و جلێن رەش دکەنە بەرخوە، ئێک ژ ساخلەتێن فریشتەیان ژێڤە دکەت و بڤێ چەندێ ژی فریشتەیان دکەتە مروڤ.

نەڤە ژی ئیشارەتەکە بۆ بەهەشتەکا چێکری لسەر دنیایێ. بڤێ چەندێ ژی ئەلەمەنتێن بەهەشتێ دهێنە گوهورین و یێن دنیایێ ئاڤا دکەت، ئانکو بازدانەکە ژ هزرکرنەکا ئاشۆیی و لاهوتی بەرەڤ کەتوارو ژیوارێ جڤاکی.

**٣- «ستێرا ژ خەو رادکەن...»**

هەولا بەردەوام یا هوزانێ ژبۆ بەرجەستەکرنا هزرێن ئاشۆیێ و تێفرو سماندنا ڤان هزران لسەر کەتواری و چێکرنا وێنەیێن راستەڤینە ژ وێنەیێن وەهم (هەیارە)، بازدانەکە لسەر سیستەمێ تەناو زەنگلا ئاژاوەکرنا جڤاکییە. ئەڤ سەفەرا هوزانڤانێ ژ ژیواری بەرەڤ ئاشۆیەکا کەسوکی کری و پاشی ژ ئاشۆیەکا گەلەنپەری ڤەگەریایە ڤە ناڤ ژیوارەکێ سەتمی ب هزرێن نوی یێن وێرانکەرو دەغدەغەکرنا گلێزانکێن دەستەلاتا هەیی یە، کو ئەڤ دەستەلاتە ستێرێن بلندن ل ئاسمانان، دنڤستینە و خەلک د بەررا د خەو دچن.

هشیارکرنا ستێران، تێکدانا سیستەمەکێ تەنایە و بڤێ کریارا قەدەغەکری هەبوونا خوەیا یاخی دچاڤێن ستێراندا خویا دکەت، ژبۆ چێکرنا هەڤبەندییەکا دی یا ئاڤاکەرتر دناڤبەرا خوەیێ تاپۆکری و ستێرێن بلندێن چاڤدێر. هەژی گۆتنە کو ژبلی هندێ، ڤێ هوزانێ ناڤەرۆک و هزرێن وێرەک و پڕ جورئەت هەمبێزکرینە، هەروەسا وێنەیێن هوزانکی یێن جوان جوان و داهێنەر بخوەڤە دگریت.


سارتەر

ب هزرا من، ئەڤ پەرەگرافێ ژێگوتێ نوینەریا هەمی هوزانێ دکەت، لێ چونکو هوزان یاریکرنە ب پەیڤان و ڤاریبوونا پەیڤێ و رامانێیە، لەوا دێ بینین ژبلی ڤێ سێگۆشەیا دەرازینک لبەر دەرگەهێ قەلاتا هوزانێ، ل شوینا کلیلەکا ئێکانەو ب تنێ گەلەک کلیلان ددەتەڤ دەستێ خواندەڤانی داکو پرانیا دەرگەهێن گرتی یێن هوزانێ پێ ڤەکەت، ئەڤجا یەکە یەکە وێنەیێن هوزانکی یێن جوان و جارنا هاڤی و جارنا پێکڤە گرێدای، جارنا دکەهی و جار د کویڤی، جار ژ هوشگەهێ و جار ژ نەهۆشگەهێ، جار ب ئاگەهـ و جار بێ ئاگەهـ، جار دبەر هوزو جار نەبەر هوز رێز دکەت و هوزانا خوە پێ جوانترو تام خوەشترو سەرنجراکێشتر لێ دکەت.

**- هەناسا عەردی لەرزی و شەهوەت داعویرا.**
**- لەشێ پەریێ بو سەلە مێشک ژ فرینێ**
**- دناڤ گەمارا ڤێ شەرابێ دا حلیسی.**
**- لسەر دیوارێ هەلێ، سێتافک دلەبیزین.**
**- ئاسمانەکێ رویت سینگێ خوە بۆ شەری ڤەکر.**
**- سینگ هەلوەریا.**
**- ژەنگێ لێڤ گرتن.**
**- دەمژمێرێ دناڤ بەلگێن دارستانێ خوە ڤەشارت بوو.**
**- دەریاو رووبارا دەستێ یەک گرتن و سەماکر.**
**- روحەکا ماندی سەبەتەکا ماچا بۆ قەرەچەکا برسی هاڤێت.**
**- رویێ ماسیێ ب مۆرا خیانەتێ هاتە مۆرکرن.**
**- ماچ گونەهەکا دڕندەیە.**

هەرچەندە رێزکرنا ڤان وێنەیێن هوزانکی یێن یەک لپەی یەک گەلەک هەڤدژی و هەڤتەریبی تێدا هەنە و هەر وێنەیەک ب تەنا خوە جیهانەکا سەربەخۆیە، لا دانەکە ژ سەمتا وێنەیێن خزمەتکارێن وێنەیێ داویێ، هەلچوونەکا دلینیێ یە


کامو

دناڤبەرا بەرزی و نزمییێ دا، لێ ئەڤێ چەندێ ژی ل گورەی هزرا من و باوەریا من ب هۆزانا نووژەنا دەڤەرێ، خوشی و جوانییەکە لسەر هۆزانێ زێدە بووی، هەلچوونێن کەسانییا هۆزانڤانێیە، کو کارییە خوە ژ قەیدێن جڤاکی قورتالکەت و بۆ دەمەکێ هۆزانکییێ پوخت دگەل مرۆڤانییا خوەیا پوخت بژیت. نەزار قەبانی دنڤیسینەکا خوەیا دەربارەی چییاتی یا هۆزانێ دبێژیت (هۆزانڤان نە سکەیێ ترێنێ یە کو هەردەم لسەر هەمان رێبازو هەمان رتم برێڤە بچیت)، بەلکو هۆزانڤان ژی کۆمەکا هەستێن فیزیایی یێن هەڤدژو هەڤسەنگە تەڤلیهەڤ دبن و تێک دهێنە شێلان ژبۆ پەیداکرنا پاناڤەکێ دی یێ بەرفرەهتر بۆ ژیارێ و چێکرنا ستایلەکێ نوی تر بۆ سەرەدەریکرنێ، ئەڤجا ئەڤ وێنەیێن بۆری ژبلی هندێ کو شرۆڤەکرن و هەست پێکرنا دەرئەنجامێن بۆرییە، هەروەسا بەرهەست کرنا هەستێن نە بەرهەستە دچاڤێن جڤاکیدا.

چونکو پێنگاڤێن گوهورینێ و نویکرنێ دجڤاکە کێ مەنددا ب ئاوایێ پەییسکی دهێنەکرن و داکو ئەڤ لادانە نەبیتە گونەهەکا مەزن و ژ بژیێن هۆزانێ و هۆزانڤانێ ببارن، مەژیێ هۆزانڤانێ ئالاڤێن بەرگریا مەژی -Defense Me chanisim) بکار ئینانەو پەنا بریە بەر بەهانەکرنێ، ئەڤ میکانیزمە ژی میکانیزمەکا سروشتییا نە ئاگەهییە «لاشعور» ژ مەژی دا دبەزیتە ئاگەهێ (شعور)، لڤێرە مە دڤێت ئیشارەتێ بدەینە وێ چەندێ کو بەهانەکرنا گونەهان نە دابەزینەکا لاوازێ یە ژ کۆمتا جورئەتێ، بەلکو بەهانەکرن د بنەکۆکا خوەدا جۆرەکە ژجۆرێن جورئەتێ.

ئەگەر سەحکەینێ، دێ بینین کو ڤەگەریان و خوپاراستن ژ گونەهێ، گونەهەکا دی بخوەڤە دگریت، چونکو بریارا گونەهکرنێ یا د مەژیدا جێگربووی و هەر ڤەگەریانەک وەغەرەکا دییە بەرەڤ گونەهەکا دی.

**«فێر بووم گونەها بکەم**
**خوە ب بارانەکا رەنگین بشۆم و سواری بەلەمەکا ئاسمانی بم»**

دڤێ وەغەرا خوەیا گونەهکرنێدا، گەلەک دەریایێن تەنا د شەڤینیت و هلباسکی گەلەک چیایێن نەدیتی دبیت و بازدانەکێ لسەر رێڤەچوونا سروشتی دکەت. لێ، دەمێ ڤەدگەریتەڤە ب هەمان گەوهەر وتدارەکا چوویی نینە، چونکو (مرۆڤێ داهێنەر ژ جڤاکی یاخی دبیت و د وەغەرا خوەیا یاخیبوونێدا چەندین گوهورین بسەردا دهێن و پاشی ب شێوازەکێ نوێ چەکدارو بارکری دزڤریتەڤە ناڤ جڤاکێ ژێ چوویی... (د. علي الوردي/ اسطورة الادب الرفيع).

هۆزانڤانا مە ژی پشتی چەندین گونەهـ کرین و ڤەگەریایە ڤە. دڤێت خوە پاقژ کەت و ب بارانەکێ خوە تەعمید کەت، لێ، چونکو هزرا ڤەگەرێ جودایە ژیا چوویی، لەوا بریار دایە کو پرۆسا خوە تەعمید کرنێ ب بارانەکا رەنگین بیت، بارانا رەنگین ژی هێمایێ هەمە جۆرییا هزرکرنێ و باوەری یێن رێژەیی یە، ئانکو ئەو گوهورینێن ب سەر هزرا وێ یا هەیی دا هاتین بڤی رەنگینە

هزرا ئێک سەمتی ⟵ هزرا هەمە جۆر
باوەری یێن رەهایی ⟵ باوەری یێن رێژەیی
کەسەک بهێتە هاژۆتن ⟵ کەسەک هاژۆتنێ دکەت
کەسەک شەرمین و لاواز ⟵ کەسەک زرشەرم و ب هێز
خوە کێم دیتن ⟵ خوە بلند دیتن (خوە نیاسین)

ژلایەکێ دیڤە، ڤەگەرا وێ یا بارکری و مشت باوەری (غرورەکا محسن قوچانکی) یا بۆ پەیداکری دەمێ دبێژیت (هەر داهێنەرەکێ هندەک رەهێن غرورێ لدەڤ نەبن نەکاریت داهێنانەکا نایاب و کاریگەر بکەت). مەرەم ب غرورا قوچانکی ئازادیا هزر کرنێ و پاراستنا ئازادییا کەسۆکییە، لەوا پەهلەوانا ڤێ هۆزانێ دڤێت سواری بەلەمەکا ئاسمانی ببیت و ل فەزایەکێ بەرفرەهتر بگەریێت بۆ پێنگاڤێن خوەیێن ئێدی نەما عەردێ هەیی تێرا بکەتن. ئەڤ خوە گرێدانە ب ئازادییا کەسۆکیڤە و دەست ژێ بەرنەدانە لێگەریانەکا وێرەک و پر جورئەتە بۆ دیتنا جهێن نەدیتی و گوتنا پەیڤێن نەگوتی.

*** جورئەت وئازادیا کەسۆکی**

چونکو جورئەت ژ کەسەکی دەردکەڤیت و ب خوەیێ کەسیڤە گرێدایە و ل گورەی کەسایەتییا مرۆڤی وەرگوهێزکێن هەمە جۆرهەنە، ئەم دکارین بێژین کو جورئەت ب ئازادیێ ڤە هەڤبەندەو ئازادیا کەسۆکی ژلایێ هزرکرنێ ودەربرینێ ڤە ژێدەرێ سەرەکیێ جورئەتێیە.

بهزرا من، هەر جورئەتەکا ژ دەرڤەی چارچووڤێ هەبوونا ئازادیا کەسۆکی ب تایبەتی و ئازادیێ ب گشتی دەرکەڤیت،

دێ کەفتە دخانا پەیڤێن هیستیری و کاردانەوەیێن دلینی و هەنچونێدا.

ئەو بخوە د بنەکۆکا خوەدا ئازادی ژلایێ فەرمەسیونییێ ڤە هەبوونا مرۆڤییە، چونکو هەبوون ناهێتە دەستنیشانکرن ئەگەر ئازادی نەبیت و هەردەمەکێ ئازادیا مرۆڤی بهێتە سەرکوتکرن یان بەرزەکرن، هینگێ هەبوونا مرۆڤی ژی دێ بەرزە بیت و دێ هێتە ژ دەستدان. هەروەسا ژلایێ جڤاکیڤە ئازادیا کەسۆکی دهێتە پێناسەکرن کو بازدانەکە لسەر فەراتییێ، هەر مرۆڤەک دهەر جڤاکەکیدا دکاریت ژ تشتێ فەرو پێدڤی رزگار بیت و کونترۆل کەت و ژێ دەرباز ببیت، فکتەرێ سەرەکییێ ڤێ شیانێ ژی زانین و تێگەهشتنا خوەیێ ذ ت) فەراتییێ و یاسایێن جڤاکییە.

ژبۆ ئەنجامدانا ڤێ پرۆسێ ژی، تەناهییا مرۆڤی ژ دەست دچیت و دکەفتە دناڤ تۆرەکا پێکڤە گرێدایا هەڤرکی یێن جڤاکی و ئێشانێ و هەست ب نیگەرانی کرنێ ژ سیستەمێ هەیی بەری کریارا جورئەتێ و کونترۆلکرنێ و پاشی ژ شێوازێ سەرەدەریکرنا چێبووی پشتی کریارا جورئەتێ و حوبکرنا ئازادیا کەسۆکی وەکو تێگەهشتنەک بۆ خوەیێ فەراتییێ.




ژ بۆ شرۆڤەکرنا ڤێ هێلکاریێ نەچارین هندەک جاران ئاخفتنان دووبارە کەینەڤە، ئازادی هەبوونا مرۆڤییە، هەبوون ژ فەراتییەکا ژیانێیە، زانین و تێگەهشتنا ڤێ فەراتییێ جورئەتا دەربرینێ بۆ مرۆڤی پەیدادکەت، د هەمان وەختدا زانین و جورئەت کو دوو ئەلەمەنتێن بلندترن ژ ئاستێ جڤاکەکێ مەند، ئەڤجا دێ مرۆڤ تووشی هەڤرکییێن جڤاکی بیت. ئەڤ هەڤرکییە دی بەرێ مرۆڤی دەنە نیگەرانی و ئێشانێ، کونترولکرنا فەراتییێ و تێگەهشتنا یاسایێن جڤاکی یێن هەیی و دەم بسەردا چوی هەڤالجێتمکێ نیگەرانییێ یە و ئەڤ چەندەیە دبیتە ئەگەرێ هەست پێکرنێ ب گرنگییا ئازادیا کەسۆکی کو ئەڤەژی د بنەکۆکا خوّدا دبیتە ئەگەرێ ئێشانێ. هەتا مرۆڤ دگەهتە ڤێ یەکێ ژی بێدڤی ب هەرفاندن و ئاڤاکرنەڤەیان هەیە، ئاڤاکرن لسەر تشتێ هەرفاندی ب شێوازو مودێرن و نوی پەیدا دبیت (دەسپێکا هزر کرنێ، دەسپێکا هەرفاندنێ یە- البیرکامو/ (اسطورة سیزیف). دڤێ کریارا هەڤرکیا دێرینا هەرفاندن و ئاڤاکرنێدا مرۆڤ دکەڤیتە دناڤ بازنەیەکیدا کو جورئەت و بازدان لسەر مەندییا جڤاکی دبیتە فەراتییەکا دی لسەر فەراتیا سیستەمێ هەیی د جڤاکیدا.

**ماچ هیڤییەک بوو بۆ نێرگزەکا وەستیای ل هیڤیا بایەکێ کەسک**

**ماچ شعرەکا سەرمەدییە د سینگێ دەفتەرەکێدا**
**هەمی سپێدەیا ژ دایک دبیت**
**ماچ گونەهەکا پاقژە خودێ هاڤێتیە د بەریکا مندا..**

ڕامان ٦٢ /بپ ١٢٥

لڤێرە ئەگەر ماچ ≶ سێکس، ئو سێکس≶ حەرام... ئەڤ کریارا قەدەغەو حەرامکری، یا هاتییە زڤراندن بۆ هەچکو هەیی یا وێ یا بنەرەتی کو غەریزەکە ژ هەرسێ غەریزەیێن گرنگێن مرۆڤ پێ و بۆ دژیت (سێکیس، ژیار، پلەداری-اعتباری-) و بڤێ چەندێ بابەتی ب ئاوایەکێ نوی بەحس ژێ دکەت، ڤێ چەندێ ژی ب رێکا گشتیکرنێ ددەتە خویاکرن، ئانکو بابەت (سێکس) دهەمی مالانڤە دهێتە جووین و ڤەجوین و پاشی ب ئاوایەکێ ئاگەهێ دناڤ نە ئاگەهیدا دهێتە داعویران و ڤەشارتن.

زێدەباری ڤێ چەندێ ژی (ماچ≶ سێکس) نەکریارەکا بازدانەییا هەنۆکەییە، بەلکو دکویرانییا دیرۆکا دیرندا یا چاندییە، ئانکو ژ هەردوو لایێن ستوونی (دیروک) و شاقولی (گشتیکرنا دناڤ جڤاکیدا) یا بەربەلاڤە.

**ئاخ: کەلەخێ چەند ماچا لسەر تە ڕزینە؟...**

ڕامان ٦٢ /بپ ١٢٦

هۆسا بۆمە خۆیا دبیت کو نەڤا هۆزانڤان دبێژیت نە فلییەکا نوییە یان ئافراندنەکا دی یا جودایە ژ ئافراندنا هەیی و هەبوویی، لێ د سەر ڤێ چەندێ ژی را ئەڤ فنجانا وێ یا ڤەهوێ ژبو ئاگەهدارکرنا کەسانێن سەرمەست و شەیدایێن جڤاکی، مینا بازدانەکا یاخیبوویی یە بەرەڤ سەمتا نەژێیاتیێ (اللامنتمي).

**ماچ وەلاتەکە ئاسمانێ وی گولا نانیاسیت**
**ماچ فنجانەکا شەهوەتییە**
**نەهنگی دەزگرا خوە پێ گێژ کری....**

ڕامان ٦٢ /بپ ١٢٥

دبیت ژلایێ ڤالیکییا ڤێ دووانییا جوانی و گونەهێ دماچێدا کریارەکا هستیری یان هەڤجودابوون و ژێکڤە

قەتیانێ بخۆڤە بگریت، لێ ئەڤ دووانییە ژی، ب هزرامن، ئامـاژەیەکـە ژبۆ دەسـتنیـشـانکرنا چارەنڤیـسێ جـورئەتا دەسپێکری و خوەیێ ئازادیا هزر کرییە...

(نـەژێ- لامنتـمي- و ئازادی دپێکڤە گرێدانە، ئارێشا نەژێی هەر ئارێشا ئازادیێ یە، چونکو هزرکـرن دهەر (ئەرێ) یان (نە ء)ەکا دوماهیێ دا، هزر کرنە دکولەتی و ئازادییەکا رەهایی دا- کـولن ولسـون/ اللامنتـمي- بیـروت ١٩٦٩).

ئەڤ رێژەیی یا هۆزانڤان پێ د ئاخڤیت، رەتکرنا رەهاییەکا هەبینە و هەوڵدانەکە ژبۆ ئاڤاکرنا رەهایی یەکا دی، لێ دڤێ ئاڤـاکـرنا نوی دا، رەهایی- ئازادییـیـە، ئەڤـجـا رەهایی ل هەمبـەر رەهایێ ب شـێوازەکێ دی دبیـتـە ئازادی ل هەمبـەر کـولەتیێ، ئانکو ب کـورتی ئەم دکـارین بێـژین (رەهایی× رەهایی)=(پوزەتیڤ× نێگەتیڤ).

کـولەتی ⟵ رەهایی یەکـا نێگەتیڤ/ جـڤـاکی هەیی و قانعە.

ئازادی ⟵ رەهای یەکـا پوزەتیڤ / جـڤـاکێ نوی و یاخییە.

لێ، ب هزرا مـن، رەهایی یا پوزەتیـڤ ژی هندەک رەهێن نێگەتیـڤـیێ دناڤ خـوەدا دهەلگریت، چونکو رەهایی ب ج شێوازێ هەبیت یەک سەمت کرنا ژیانێیە و خۆ ئەگەر نوی ژی بیت دێ دەمەندیێ دا رزیت.

رەهاکرنا ئازادیێ دبیت ب کێر جڤاکێن مرۆڤایەتیێ نەهێت و باشـتـرین ئاگـەهدارکـرن بۆ ڤێ چەندێ گـۆتنا (سـارتەر)یە دەمێ دبێـژیت کـاریگەرییـا ئازادییـا من یا کـەسـۆکی دوێ چەندێدایە کو کار نەکەتە سەر ئازادییا ئەوێ بەرامبەر.

**گونەها ئاڤێ نینە رەنگێ وێ هاتییە دزین**
**گونەها ئەشکێ نینە هەست ئێخسیر بن**
**گونەها پەیڤا نینە خوە ل ڤینێ نەکەنە خودان**
**گونەها من نینە، ئەز دڤێ گەمیێ دا بووم....**

رامان ٦٢/بپ ١٢٥

ئەڤ ب هانەکرنا کـریارێن رێژەیی و خـوە شـویشـتنا ژ هزرا هەیی، ڤەدەربوونەکا بەر وەختە ژ جڤاکی بۆ زڤرینەکا دی یا رێژەیی کـو رەهایی یەکێ لسـەر ئاڤـاکـەت و دناڤ خـولگـەیا رەهایی یا خوەدا بژیت و بزڤریت، ئانکو ژ خەفکەکێ قورتال دبیت کو بکەڤتە دیەکا دی دا. ژ رەهایی یا کولەتیێ قورتال ببیت ژ بۆ کەفتنێ دناڤ رەهایی یا ئازادیێ دا.

**گونەهـ**
**گونەهـ**
**ماچ گونەهەکا دڕندەیە!!**
**گونەهـ ببوو ڕێبوورتاژەکا بێ دوماهیک**
**دروحەکا بێ شەرمدا دهاتە تۆمار کرن...**

رامان ٦٢/بپ ١٢٥

ئەڤ گـونەهێـن هاتینەکـرن و ئەوێن دهێنەکـرن و ئەوێن دێ هێنەکرن، دچارچووڤەکێ دیارکریێ جێگردا دبن و گەشە دکەن و دبنە سیـسـتـەم و ئازادییـا کـەسـۆکی یا کـەسـان پێ دهێـتـە زنجیـرکرن و هەر سـەرکوتکرنەکا ئازادییـەکێ ب چ شـێوەو ل هەرجهێ بیت، دەستەلاتا سیـستـەمێ جڤاکی بهێزتر لێ دهێت و بەرە بەرە ئەڤ دەسـتـەلاتە رەهایی دبیت و ئازادی دهێـتـە سەرکوتکرن و مرۆڤ دکەڤتە دگێژەڤانکا بازنەکیدا

**ماچ گونەهەکا دزڤرۆکەکێدا دژیت**

**ماچ...**
**وەلات ...**
**گونەهـ...**

**گونەهـ...**
**ماچ...**
**وەلات...**

**وەلات...**
**گونەهـ...**
**ماچ...**




رامان ٦٢/ بپ ١٢٦

ڤێ زڤرۆکێ ژی ل هەمبەر دەستەلاتا رەهایی یا سیستەمێ جڤـاکی ج دەسـتـەلاتێن هەڤـدژو ب هەمـان هێـز نینن، لەوا دەسـتـەلات ب رێک و سـەمـتـێـن پیـرۆزو حـەرامکـریێن ئاییـردەیێن جـڤـاکی داگیـر دکـەن، لێ مـەژیێ جڤـاکی وەکـو بەرسـینگ گـرتنەک نەئاگـاهی دێ کـەفـتـە دلێگەریانەک بەردەوامدا ژ بۆ دەستڤەئینانا هەڤدژێ وێ کو ئازادیا رەهایی یە، هەروەک مە بەری نهو ژێ خەبەردای، لێ ئەڤ پرۆسەیە- ئازادیا رەهایی ل هەمبـەر سـەرکـوتکرنا رەهایی- بهـزرا من، کاردانەوەیەکا هیـسـتیـرییا نە بەرپرسیـارە بەرەڤ ئاژاوەیێ. لەوا زۆر یا فەرە کو بازدان و یاخیبونێن ژ فراتییا سیستەمێن جڤـاکی و عـورف و عـەدەتێن هەیی بزانین و تێگەهشـتنەکا کـویر دەست پێ بکەت ژ بۆ مـسـوگـەرکرنا زڤرینێ، هەلبـەت تریفەخانێ ژبیر نەکرییە ئیشـارەتەکێ- ئەگـەر گەلەک یابلەز ژی بیت- بدەتە خواندەڤانی کو رێژگەها خوها وێ یا شەرمین نە جەوسـەرەکێ ئاژاوەیێ یە، بەلکو هلشکافتن و وێنەکـرنا جڤـاکـییە دناڤ جەرگێ دوهی و ئەڤرۆکەو سوباهیـدا، ب ئاوایێ گشـتیـکرنا بوویەران/ گونەهان، هەر گشـتیـکرنەک

نورمال کرنەکا دچاڤێن جڤاکیداو زەنگلا هشیـار کرنێیەو رونهیـا ئەلندەکا دی یە، ژ ناخەکێ یاخی دەردکەڤیت و یا نەراستەکرییە بۆ ناخێ وەرگری/ ناخێ بەرامبەر کو ب هەڤرا ب چاڤەکێ هەلسەنگاندنەکا رەخنەیی سەحکەینە ئەڤا بوویی و بۆری.

**بێهنا گونەهان ل هەمی قولاچا دهێت**
**وەرز ل دیوانا یەک رونشتنێ و گازندا ژ ئاسمانی دکەن**
**زستانێ بۆ پاییزێ دکرەگری و روندکێت وێ خویساریێ گرتن**
**لسەر دستێن دارستانەکا رویت دخەوچوو**
**ژڤانێ بهاریێ بوو دگەل هاڤینێ ل کێتشوەرەکێ سپی**
**ل ئاسمانی..**
**ب دستێت لەرزوکەکی و یێت پاشای دگەل قەرەچەکێ**
**هاتە نەخشاندن....**
رامان ٦٢/ بپ ١٢٦

ئەگـەر ئەم ژلایێ دەروونیـڤـە ژی سـەحکەینێ، دبیت ئەڤ گشتیکرنە خوە بێڤەگرێدانەکا جڤاکی بیت، هەروەکو یا دبێژتە خواندەڤانی کو هەرچەندە ئەز یاخیمەو نیگەرانم ژڤێ هەبوونا هەیی دسیستەمەکێ چارچووڤەکریێ جڤاکیدا، لێ ئەز ژی پشکەکم ژڤێ هەبوونێ، هەرچەند نە ب دلێ خـوە هاتیـمـە دنیایێ، لێ ب دلێ خوە هەول ددەم هوی ببمێ و سـەردەریێ دگەل بکەم، (ئەز دێ چەوا شێم ڤێ جیهانا پر هێز پشت گوهـ هاڤێم....، یان، ئەز نەکارم یێ کەیفخۆش بم ئەگەر دگەل جڤاکی نەبم- البیرکامو/ (اسطورة سـیـزیف). پـاشـی وەکهەڤکرنا تشتان گـشـتیـکرن و پشکداریکرنە دپرۆسەکا نەهەربەتیـدا و ژ ئالەکێ دیڤـە ژی ریژەیی کـرنا تشـتـانەو گرێدانە ب کویراتییا دیرۆکێڤە، ئەڤە ژی خوە کەهیکرنە دگەل جڤـاکی، یان ژی هەولدانەکـە ژ بۆ خـوە گـونجـاندنێ یان ژی گونجاندنا خەلکی دگەل خۆ. پشـتی ڤەگەریێ ژ وەغەرا یەکێ بەرەڤ لێگەریان و نەدیاریێ.

دڤێ هۆزانا مشت ژ وێنەیێن هۆزانکی یێن جوان و وێنەیێن نەهۆزانکی و هەڤـدژو بارکـری ب جـورنەتێ و بازدانێ و یاخیبوونێ... هۆزانڤـان یا شـەرەنیـخێ دگەل هندەک هزرێن ئاخلێڤە یان نەگەهشتی دکەت، چەند پتر ب کویری دچیـتـە دناڤ خـوەیێ هزرکـرنێـدا بازنێ نیگەرانی و ئالۆزیا وێ بەرفـرەهتـر لێ دهێت (هزرکـرن ب نیـگەرانی و ئالۆزیێ ڤـەگـرێدایە- د.علي الوردي/ مهزلة العقل البشري- ١٩٩٦). لێ باشـتـرین ئالاڤێ راهاتنێ یان هویبـوونێ دڤێ ئالۆزیا کۆژەک و مشت نیگەرانیدا ماندلاکرنا بوویەرانە، ئەڤ مـاندلاکرنە ژی ل گـورەی زانسـتێ رەوانناسـیێ پرۆسـەیەکـا سروشتییا ئالاڤێن بەرگریا مەژییە.

هەر مرۆڤـەکێ دکەشەکێ نەئێمن و ئالۆزدا دژیت، ئالاڤێن بەرگـریا مـەژی پتـر ب کـار دهینیت ژ بۆ هویبـون و راهاتنێ دگەل جڤاکی و بوویەران، هەروەک مەدا خـویاکرن کو پرۆسا هزرکرنێ و نڤیـسـینێ مرۆڤی دکەتە دناڤ کەشەکێ مشت ژ ئالوزی و لێگەریان و گـۆمـانێـدا. لێ ئەگـەر ئەم ب چاڤـەکێ ژیوارکی یان لۆجیکی سـەحکەینە مـاندلاکرنێ، دێ بینین کو ئەڤ ئالاڤـە (ماندلاکرن) نە قـورتال بوونە ژ بوویەری، بەلکو دەرەوەکە مـرۆڤ بەری هەمی کەسـان لخـوە دکـەتن و پاشی ل خەلکی و جڤاکی ژی دکەت. چونکو درەو ژی وەکو رەفتـارەکا نەیا هەڤسـەنگا جڤاکی دبەندک کورتن و نە دوم درێژن، لەوا دگـەل ئاڤـابوونا تیـروژکـێـن روژێ، ئاخـینـکێـن ڤێ درەوێ (گونەهێ) د چاڤێن خەلکیدا سەمایێ دکەن و چونکو هەمی خەلک ب هەڤرا پشکدارە دڤێ ماندلاکرنێدا- درەوێدا-، یا بوویە پشکەک ژ ژیانێ و هەر ژئەزەلدا خەلک دگەل دژیێن.

**دسپها تەدا**
**درەو سەرۆکە**
**راستی یا نخافتییە ب پەرێ دەفتەرا تە**
**شەڤ دنیاسیت**
**سپێدە دخەندڤینیت**
**ب رۆژو گاڤ و چرکە گونەهـ دهێنە تۆمار کرن**
**گونەهـ فێری پیاسا بوو لسەر پرا خەونێ**
**گونەهـ خەونا ژبەر دبەن**
**ئەو رۆژا من خوە نیاسی**
**من زانی گونەهـ تشتەکێ ئەزەلییە.....**
رامان ٦٢/ بپ ١٢٦.

# تیۆری هەڵوەشانەوە



بەختیار سەجادی
(زانکۆی ئازاد - سنە)

پێشەکی:

هەر وەک تێری ئیگلتۆن لە پێشەکی کتێبەکەیدا، بەناونیشانی تیۆری ئەدەبی:

پێشەکییەک (١)، ئاماژەی بۆ کردووە، زۆربەی هەرە زۆری رێبازو قوتابخانە رەخنەییەکانی سەدەی بیستەم لە فۆرمالیزم-ەوە سەریان هەڵدا، بەڵام سەبارەت بە تیۆری ئەدەبی و کولتووری فێردینان دو سو سور(٢) یەکەم کەس بوو کە شەمچەکەی داگیرساندو بەردی بناغەی چەشنە بنەماخوازییەکی سەرەتایی (Elementary Structuralism-) بنیات نا «یەکێ لە جیاوازییە بنچینەییەکانی فۆرمالیزم، واتە روخسارخوازی لە لایەکەوە و بنەماخوازی لە لایەکی ترەوە ئەوەیە کە روخسارخوازی زیاتر وەرچەرخانێکی ئەدەبی بوو دژی سەرجەم بۆچوونە نا ئەدەبییەکانی پێش خۆی (وەک بۆچوونی سوننەتی (traditional Approuch) و بۆچوونی مێژووگەری (Historicist)، کەچی بنەماخوازی خاوەن بناغە و رواڵەتێکی فەلسەفی بوو و پێوەندی و نزیکایەتییەکی زۆر لە نێوان فەلسەفەو تیۆری ئەدەبیدا هاتە گۆرێ، دریدا لەم بارەیەوە دەڵێ:

ئێستاکەش هەر لە ئەدەبدا، زمانی فەلسەفی بە شێوەیەک ماوەتەوە و لە ئارادایە، بەڵام بە جۆرێک خۆی بەرهەم دەهێنێت و ئاراستە دەکات کە دەڵێی لەخۆ نامۆ بۆتەوە یان جێگۆرکێ و شەقڵێک هاتۆتە پێشەوە. هەر ئەم شەقڵەش بەستێنێکی پێویست و بەرچاوی بۆ سەر لە نوێ پرسیارکردنەوە لە فەلسەفە خوڵقاندووە؛ یەکێک لەو هۆیانەش کە توانیم تیشک بخەمەسەر گرفتی (٤) نووسیار (٥) و وەکو هۆکاری سەرەکی هەڵوەشاندنەوە داینێم ئەوەبوو کە کەڵکەڵەیەکی زۆرم لە بارەی دەقە ئەدەبییەکان هەبوو (٦).

هەروەک چۆن دەکرێ لە رووی بیرو بڕوای بنەرەتی و بناغەی زمانی و فەلسەفییەوە ئەفلاتوون و دریدا وەکو دوو فەیلەسووف لەبەرچاو بگرین کە ئەم سەرو ئەوسەری مێژووی فەلسەفەی رۆژئاوایان گرتۆتەوە، هەر بەهەمان شێوەش دەتوانین سوسورو دریدا وەکو دوو بیرداڕێژ دەستنیشان بکەین کە روانگەکانیان لە بارەی بنەماخوازی، نیشانە، دال، مەدلوول و دەلالەت لێک جیاوازن.

لە نێوان سوسورو دریدا دا، کلۆدلیڤی شترۆس، رۆمەن یاکوبسن، چارلز پیەرز و رۆلان بارت لە چاو بنەما خوازەکانی دیکە گرنگتر و سەرنجڕاکێشتر هاتوونەتە بەرچاوو دریدا دژایەتی خۆی لەگەڵ بڕوا تیۆرێک و فەلسەفییەکانی هێندێکیاندا دەربڕیوە (٧).

بەرلەوەی بچینە سەر باسە سەرەکییەکە، پێویستە دوو خاڵی هەرە گرنگ وەبیرخوێنەران بهێنینەوە، یەکەم، بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لەسەر هەڵوەشاندنەوە یان بنەما شکێنی سەرەتا ناسینی بنەماخوازی پێویستە و دەبێ زانیارییەکی ئەوتۆمان سەبارەت بە سوسور، شترۆس، یاکوبسن، قوتابخانەی پراگ، رۆلان بارتی لاو، رەخنەی ئوستوورەیی و بەرهەمەکانی نورتراپ فرای و تەنانەت زمانەوانیی زانستیی- بنەماییش هەبێ (٨)، ئەگەر خوێنەر

کتێبە هەرە کاریگەرەکەی سوسور نەخوێنێتەوە یان لانی کەم، ئاگاداری بنەواشە سەرەکییەکانی زمانەوانی سوسور نەبێ، ئیدی ناتوانێ لەو قسانەی کە دریدا دژی سوسور گوتوویە تێبگات.

بۆ نموونە، ئەم ڕستانەی خوارەوە بۆ خوێنەری نا شارەزا تا ڕادەیەک شاراوەو ئەستەم دێنە بەرچاو: دریدا ڕەخنە لە سوسور دەگرێ، چونکە پێی وایە سوسور بۆ خۆی لە لۆگۆ سەنتەریزم-دا چەقیوەو هەر بەو بۆنە شەوە زیاتر بە قسەکردن بایەخ دەدات تا بە «نووسیار»؛ دریدا بەرهەمەکەی سوسور بە شێوەیەکی ڕەخنەگرانە، دەخوێنێتەوە و جیاوازی (difference)یەکەی سوسور دەگۆڕێ و دەیکات بە جیاوازی (differance)یەکەی خۆی و..... تاد.

خاڵی دووەم: ئەوەیە کە تاقمێ ڕەخنەگری ڕۆژئاوایی دوو زاراوەی هەڵوەشاندنەوە (Deconstruction) و پاش - بنەماخوازی (post- structuralism) وەکو یەک و لە بری یەک بەکاردەبران، کەچی لەم وتارەدا لێک جیاکراونەتەوە.

هۆی ئەم کارەش ئەوەیە کە هەر چەند پاش بنەماخوازی بە وتارەکەی دریداوە (١٩٤٤)یان بە کتێبی سێ / زێ (S/Z)ی بارت-ەوە (١٩٧٠) دەست پێدەکا، بەڵام پاش بنەماخوازی ئەو ڕاپەڕینە کولتوورییەی سیساڵی دواییەکە لە بەشەکانی تری زانستە مرۆییەکاندا شوێنی خۆی داناوەو چەند قوتابخانەیەکی تر، جگە لە هەڵوەشاندنەوە، هەر بەناوی پاش- بنەماخوازییەوە پەرەیان سەندووە کە لە شوێنێکی تردا ئاماژەم بۆ کردوون(٩).

**میتافیزیکی گشتی ئاسایی و سیستەمی بیرسالاری(١٠)**

کاتێک مرۆڤ بڕوای بە میتافیزیک یان چەق center) لە ئایینە کۆنەکاندا هەبوو، چەشنە ئیدیالیزمێکی ئاکاری ڕاستەقینەی بۆ وەدی هاتبوو و لە ئەنجامدا ئیتر بیری لە گۆڕانکارییە فەلسەفی و زانیارییەکان نەدەکردەوە و بەهۆی ئەوەی کە خۆی بە پێبەندی میتافیزیک و چەق دادەنا، ژیانێکی ساکارو نەگۆڕو چەسپاوی (static) بۆ خۆی دەستەبەر کردبوو، ئەم ـ ڕوودۆخە لە ڕۆژئاوادا لە دوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمی کەونارا لە ساڵی (٤٧٦)ی زایینی بەولاوە تا سەردەمی ڕۆنیسانس و شۆڕشی کۆپەرنیکی بەدی دەکرێت؛ بە واتایەکی ڕوونتر، بۆ ماوەی زیاتر لە هەزار ساڵ (چەرخەکانی ناوەڕاست) مرۆڤی ڕۆژئاوایی و زانستی ڕۆژئاوایی لەژێر ڕکێفی میتافیزیکی مەسیحی و ئوستوورەیی و پاپاکان و کەلیسادا بوو.

لە ڕۆژهەڵاتیشدا تا سەرەتای سەدەی بیستەم، هەر چەندە شێوازی جۆراوجۆری ئەدەبیمان لە بەرهەمی شاعیران و ئەدیبیاندا وەبەر چاو دەکەوێ، بەڵام جیاوازییەکی بنەڕەتی سەبارەت بە حەقیقەت و میتاقیزیک بە دەگمەن لەبیرو باوەڕەکانیاندا هەڵدەکەوێ بۆ نموونە، کلاسیزم لە ئەدەبی کوردیدا لە مەلای جزیری-یەوە دەست پێدەکا و تا سییەکانی سەدەی بیستەم دەخایەنێ (هەڵبەت ئەوەش بڵێین کە دوای ئەو مێژووەش دیسان شاعیری کلاسیسمان وەبەرچاو دەکەوێ کە لاسایی کلاسیزمی کوردی دەکەنەوە و هیوای سەرەکییان ئەوەیە بگەنە ئاستی نالی و سالم و کوردی!)، کەواتە یاساکانی کلاسیزمی کوردی زیاتر لە چوار سەد ساڵ بەرگرییان لەخۆ کردووە و خۆیان پاراستووە.

لە ئەدەبی فارسیش-دا، شێواز گەلی خوراسانی، عیراقی و هیندی هەرکامەیان بۆ ماوەی زیاتر لە دوو سێ سەدە پێڕەوی دەکران، نەک هەر لە ئەدەبدا، بەڵکو لە هونەرەکانی دیکەشدا ڕوانگەی میتافیزیکی ڕەنگ و دەنگی داوەتەوە. بۆ نموونە لە کلاسیزمی کوردیدا شێوەی ئەدەبی غەزەل پێڕەوی دەکرا کە یەکێ لە یاساکانی هەمان هاوکێش بوونی دوو دێڕی یەک کۆپلە بوو، چونکی چەقێکی میتافیزیکی لە نێوان دێڕەکاندا لە گۆڕێ دابوو، سەرەڕای ئەمەش، ناوەڕاستی دەمی یارو چاهی زەنەخدان و زوڵف ئەڵقە ئەڵقەی یارو پیتی «چ»ی ماچی لێوی یارو بەکارهێنانی زۆری دوانەلێکدژەکان بە نموونەی بەرچاوی کاریگەرییەتی بیری میتافیزیکی دادەنرێن، چونکە لە هەموویاندا چەقێک دەوری سەرەکی دەگێڕێ و بە باشی ڕەچاوکراوە(١١)!

**ئەتواری عیشق و مەستی، ئەسواری بوت پەرستی**
**تەحریری سەر ڕیوایەت ناکەت ل بۆکیفایەت**

مستفعلن فعولن مستفعلن    چەق    مستفعلن فعولن مستفعلن فعولن

**با یادی چاوی مەستی تۆیە وا پەیانە ڕەققاس    بە دەوری شەمعی ڕووتا دڵ وەکو پەروانە ڕەققاس**

**مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن    چەق    مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن**

لە هونەر گەلی شێوەکاری، بیناسازی، خۆشنووسی و پەیکەرتاشیشدا دیسان هەر ئاماژەی هوشیارانە یان ناهوشیارانە بۆ چەقێکی میتافیزیکی کردن (هەمان چەق کە دریدا پێی وایە بڕیارییە)؛ بۆ نموونە، لە بیناسازیی مزگەوتەکاندا لە نێوان مەنارەکانداو لە سەرووی گومەزدا چەق

بەدی دەکرێت:
لە بیناسازیشدا، نەک هەر ئاماژەکردن و گرنگی دان بە چەق، تەنانەت بنەواشە ئایینی و فیقهی و فەلسەفە میتافیزیکییەکانی دیکەش وەدیار کەوتوون کە لێرەدا هەرتەنیا چەند وێنەیەکی ئەو کاریگەرێتییە لە هونەری بیناسازیدا دەخەینە بەرچاو:





دوای شۆڕشی کۆپەرنیکی. میتافیزکی چەرخەکانی ناوەڕاست پەیتا پەیتا لەناو چوو، چونکە، بە بیروبڕوای کۆپەرنیک و هەروەها کە دواتر لە سەدەی بیستەمدا و زانستی فەلەکناسی وا دەرکەوت، گۆیی زەوی ئیتر چەق و سەنتەری کائینات نییە و بگرە کائینات هەر سەنتەریشی نییە. ڕەوتی فەلسەفەو بیری ڕۆژئاوایی دوای شۆڕشی کۆپەرنیکی ئاڵوگۆڕێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی و لەسەردەمی پاش ڕۆنیسانسدا چیدی کەشوهەوای نەگۆڕو وەستای چەرخەکانی ناوەڕاست بەدی ناکرێت؛ سەدەی شازدەیەم، ڕۆنیسانس و ئومانیزم و ڕیفورماسیۆن؛ سەدەی هەڤدەیەم. ئاوەزیاری و هزرخوازی دیکارت، فرانسیس بیکۆن، تۆماس هابزو جان لاک؛ سەدەی هەژدەیەم، بەرایی




گەری (Primitirism)ی ژان ژاک ڕۆسۆ و ڕۆشنگەریی کانت؛ سەدەی نۆزدەیەم؛ ڕۆمانتیسیزمی سەرەتای سەدە، ڕیالیزمی ناوەڕاستی سەدەو ڕێباز دژە ڕیالیستەکانی کۆتایی سەدە؛ سەدەی بیستەم: مۆدێرنیزمی نیوەی یەکەمی سەدەو پۆست مۆدێرنیزمی کۆتایی سەدە.

لە لایەکی دیکەوە ئەگەرچی نەریتی فیکری و ئەدەبی ڕۆژهەڵات لە سەدەی بیستەمدا خاوەن ڕواڵەتێکی بگۆڕو دینامیکە، بەڵام ئەو گۆڕانکارییانە کەمتر لەژێر کاریگەرێتی شۆڕشی کۆپەرنیکیدا بوون و زیاتر بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ئابووری سەردەم کاری لەسەر کردوون (١٢).

## زاراوەکانی تایبەت بە تیۆری هەڵوەشاندنەوە

زاراوە هەرە گرنگەکانی تیۆری هەڵوەشاندنەوە بریتین لە: مەرکەز، سەنتەر یان چەق (center) ئاپۆریا (aporia) دەق (text)، دوانە لێکدژەکان (binary opposi-tion)، دەنگ تەوەری (phomo centrism) گوتە تەوەری (logo centrism) «جیاوازی» بە مانا دریداییەکەی (differance)، بەرهەست کردنەوە (Concretization) خوێنەر (reader)، نێوان دەقی (inter textualiity)، لەبەر ئەوەی کە لەچەند وتارێکی تردا بە وردی ئاماژەم بۆ هەموویان کردووەو هەروەهاش هەر لەم وتارەدا بڕێکیان جێ دەکەینەوە، چیدی پێویست بە دووبارە کردنەوەیان ناکات(١٣).

## تیۆری هەڵوەشاندنەوە

لە لایەکەوە دەتوانین بڵێین هیچ شێوەیەک لە «هەڵوەشاندنەوەی کاربردی» لە ئارادانییە، بەڵام، لە لایەکی تریشەوە، جگە لەمە شتێکی دیکەیان نییە، چونکە هەڵوەشاندنەوە لە زنجیرەیەک لەبیرو بیرۆکەو ئامێرو یاسا و تەکنیک و میتۆدە جۆراوجۆرەکان پێک نەهاتووە.... هەڵوەشاندنەوە هەر لە گۆڕێدانییە، هەڵوەشاندنەوە خاوەن بابەتێکی تایبەتی نییە، ... بەڵام ئەگەر وترا «دریدا کاربردی» ئەوە ئیتر شتێکی دیکەیە.

**«ژاک دریدا»**

ئەگەر گەرەکت بێ هەڵوەشاندنەوە بناسێنێ کارێکی دژوارت لە پێشە.

**«وتەیەکی ئاسایی»**

دەمەوێ لەسەر ئەو خاڵە پێدابگرم کە هیچ بەرنامەیەک بەناوی هەڵوەشاندنەوە لە گۆڕێدا نییە کە پێتانی بناسێنم، هیچ چەشنە پرۆگرام، مۆدێل یان نیشانەیەک نادۆزرێتەوە کە

پێناسەیان بکەم و لەو ڕێگەیەوە هەڵوەشاندنەوە بە وێنەی تیۆرێکی کاربردی لە ئەدەبدا پیشان بدەم.

**«ژولیان وولفریز»**

ئەو قسانەی سەرەوە ئاماژە بۆ جیاوازییەکی بنەڕەتی نێوان هەڵوەشاندنەوەو قوتابخانە ڕەخنەیی و فەلسەفییەکانی تر دەکەن. یەکێک لە هۆیە سەرەکییەکانی ئەم جیاوازییە ئەوەیە کە هەڵوەشاندنەوە باسی گرنگترین بابەتی ژیان و فەلسەفە دەکات و لە مانای «ژیان» و «بوون» و «ڕاستی» و بەراوردی چاکە و خراپە دەکۆڵێتەوە. دریدا ئەو بنج و بناغانەی بیرو هزری مرۆڤ لەسەریان دامەزراوە هەڵدەوەشێنێتەوە، کەواتە باشتر وایە بڵێین دریدا سەبارەت بە هەڵوەشاندنەوە چی دەڵێ.

لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا ستراتیژییەکی نوێ بۆ شیکاری دەقەکان هاتە پێشێ:

ئەو شتەی دەقەکە پێی وایە دەیڵێ و ئەو شتەی بە ڕاستی دەیڵێ لێک جیاوازن.

هەردەقێک دەشێت ڕاڤەی جیاجیای لی بکرێت و بە شێوە گەلی جۆراو جۆر هەڵبسەنگێنرێ. دریدا بە توندی ڕەخنە لەو بیروباوەڕە میتافیزیکیانە دەگرێ کە بە «ڕاستەقینە» دانراون و دەیەوێ ئەو ڕاستی و باوەڕو گریمانە میتافیزیکییانەی مرۆڤ پێی وایە هەتا هەتایە بە شێوەیەکی نەگۆڕ دەمێننەوە، هەڵبوەشێنێتەوە.

بە پێی بۆچوونی فێردیناند دوسوسور زمان پێکهاتەیەک لە نیشانەکانە کە بەردەوام لە یاساکانی نێوخۆیی پێڕەوی دەکات. بە باوەڕی سوسور جیاوازی نێوان پیتەکان یان مۆرفیمەکان تەنیا هۆی ناسینیانە. بۆ نموونە، «دار» تەنیا لەبەر ئەوە «دار»ەکە «مار» یان «لار» یان «بار» نییە. واتە، جیاوازی نێوان «د»، «ل»، «ب»و «م» تەنیا هۆی ناسینی ئەو وشانەیە(١٤). پێشتر وادەزانرا زمان سروشتێکی لاسایی کەرەیی (mimetic) هەیە، بەڵام بە بیروبڕوای سوسور زمان لاسایی کەرەوەی نییە و تەنیا بەهۆی یاسا نێوخۆییەکانی خۆیەوە کاردەکات، ئەو یاسایانەش بە گشتی سێیانن:

دەنگناسی (phonology)، ڕێزمان (Grammar) و سینتاکس (Syntax).

هەروەک سوسور پەنجەی خستۆتە سەری، نیشانە زمانەوانییەکان بڕیاری و دانراوین؛ ئەوەتا باس لە دال Signifier) مەدلوول (Signified) دەکات.

دەلالەت (Signification)، واتە مانا کە هەمان پێوەندی نێوان دال و مەدلوولە بڕیاری و دانراوییە. کەواتە ئەگەر ئەو قسانەی سەرەوە پەسند بکەین، ئەم پرسیارە قوت دەبێتەوە کە مرۆڤ بە چ شێوەیەک لە ڕێگەی نیشانە زمانەوانییەکانی زمانەوە بە مانا دەگات؟

بۆ وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارانەی سەرەوە دریدا باس لە مەدلوولی ترانسێندێنتاڵ (transcendental Signified) دەکات کە ئەمە پێناسەیەکی: شوێن، شت یان خاڵێکی دەرەکیی سەرچاوەکان کە مرۆڤ چەمک یان فەلسەفەیەکی لەسەر بنیات دەنێ، چەند نموونەیەک لە مەدلووله ترا نسێندێنتاڵەکان ئەمانەن: هزر، بنەڕەت، بوون، ڕاستی، مرۆڤایەتی، سەرەتا، کۆتایی، خودو... تاد. هەر کام لەمانەش بۆ خۆیان دەوری چەق یان سەنتەرێک دەگێڕن کە مرۆڤ بەردەوام ڕووی لەم چەقانەیە، ئەم تایبەتمەندییەی دوایی:

بە گوتە تەوەری (logocentrism) ناوبردە دەکرێ. بە واتایەکی دیکە، مرۆڤ بەردەوام پێی وابووە کە مەدلووله ترانسێندێنتاڵەکان یان چەقە بڕیارییەکان لە چەمکەکانی تر باشترن و هەر بەم بۆنەشەوە هزرو بیرو کەسایەتی و زەینیەت (subjectity)ی خۆی لەسەریان بنیات دەنێ. بۆ هەر چەقێک دژە چەقێک لە ئارادایە؛ بۆ نموونە، خود (Self) بۆ خۆی لە دووبەشی جیاواز پێک دێ: خودی هوشیار (Conscions) و خودی نا هوشیار (unconscions)؛ یان لە بەرامبەر مرۆڤەوە گیانلەبەرو بوونەوەرو حەیوانەکانی دیکەن هەن. لە هەر کام لەم دوانە لێکدژانەدا چەقی یان چەمکێک بە باشتر لەوی دی دانراوە: پیاو لە ژن، مرۆڤ لە حەیوان، ڕۆح لە لەش و چاکە لە خراپە بە باشتر دانراوە. بە بڕوای دریدا مرۆڤ بەردەوام یەکێ لە دوو چەمکی دوانە لێکدژەکانی بە باشتر داناوەو ئەوی دیکەی وەپشت گوێ خستووە، «گوتە» (Speech) و «نووسیار» (Writing) دوو چەمکی یەکێ لە دوانە لێکدژە سەرەکییەکان پێک دێنن و دریدا بایەخی زۆریان دەداتێ. بە بۆچوونی دریدا، مرۆڤی ڕۆژئاوایی هەر لە سەرەتاوە (بەواتایەکی وردتر لە ئەفلاتوونەوە) گرنگی بە «گوتە» داوەو، «نووسیار»ی وەلاناوە. ئەم تایبەتمەندییەش بە دەنگ تەوەری (Phonocentrism) ناوبرکراوە. کەوترا (گوتە) و خێرا وەبیر «ئامادەبوون» (Presence) دەکەوینەوەو کاتێ وشەی «نووسیار» دەبینین، دەکەوینەوە «بیر نەبوون» (absense) دەنگ تەوەری ڕواڵەتێکی گوتە تەوەری لەخۆ گرتووەو هەر ئەمەش بە «میتافیزیکی ئامادەبوون» ناسراوە. دریدا تەوەری دوانە لێکدژی «گوتە» و «نووسیار» هەڵدەگەڕێنێتەوەو «نووسیار» دەخاتە لای سەرووی «گوتە»وە.

لە کتێبی لە بارەی ڕێزمانی نووسیار (١٥)دا، دریدا باس

لە «سەرنووسیار» (arch- writing) دەکات و لەسەر ئەو بڕوایە دایەکە زمانی ئاخاوتن بۆخۆی بەشێکە لە نووسیار، کەواتە، لە تیۆرو فەلسەفەی دریدادا نووسیار وەپشت گوێ ناخرێ و بە پێچەوانە، گرنگی دەدرێتێ (١٦).

هەروەک چۆن سوسور ئەو خاڵەی دەستنیشان کردووە کە پێوەندیی نێوان دال و مەدلوول بڕیاری و بگۆڕە، دریداش پێی وایە پێوەندی نێوان دوو بەشی دوانە لێکدژەکان بڕیارییەو دەتوانرێ جێگەکانیان بگۆڕدرێ، دریدا لەسەر ئەو باوەڕەیە کە لە نێوان دوانە لێکدژەکاندا خەمی تەواوکەر (Suplementaryelement) لە گۆڕێ دایە. بۆ نموونە، هەر کام لە «خراپە»کان تایبەتمەندییەکی جیاوازیی «خراپە» یان لەگەڵ دایە و هەر بە هەمان ئەندازەو بەو پێیەش لەگەڵ «چاکە» ناوەندییەکەدا بەراورد دەکرێن و بە دووریدا سووڕدەخۆنەوە.

یەکێک لە ستراتیژییەکانی هەڵوەشاندنەوە دەستنیشانکردنی توخمی تەواوکەرو گۆڕینی جێگای دوانە لێکدژەکانە، لە ئاوەها کاتێکدایە کە جیاوازی (differance) وەدی دێ. دریدا بە دوومانا چەمکی جیاوازی بەکاردەبات: یەکەم بە مانای جیاواز بوون، دەقەکان لێک جیاوازن یان ماناکانی دەقێک لێک جیاوازن؛ دووەم، بە مانای وەدواخستنەوەی مانا، واتە کە دەقێک دەخوێندرێتەوە ماناکەی بەردەوام وە دوادەخرێ و خوێندنەوەی جاری یەکەم هانمان دەدات بۆ خوێندنەوەی جاری دووەم.

ئەگەر بڕوامان بە مەدلوولی ترانسێندێنتاڵ نەبێ. دەتوانین بڵێین کە سەرجەم زانستەکان لە جیاوازییەوە هەڵقولاون وەک لە لێکچوونەوە یان لە «نەبوون»ەوە نەک لە «ئامادەبوون»ەوە گرنگی دان بە «نەبوون» و گۆڕینی جێگای دوانە لێکدژەکان، دوو ئەنجامی هەرە سەرەکی بە دواوەیە:

یەکەم، زانستەکانی مرۆڤ سەرجەم سەرچاوەیین (refrential)، دووەم، ئەگەر چاوپۆشی لە بوونی مەدلوولی ترانسێندێنتاڵ بکرێ، دەتوانرێ هەرچەشنە ڕاڤەیەک لە ژیان، شوناس و زانست بە ڕاستەقینە دابنرێ. سەبارەت بە شیکاریی دەقەکان لەم ڕوانگەیەوە، پێویستە بڵێین کە دەقەکان «ئامادەبوون» یان تێدا نادۆزرێتەوەو ناتوانن بە تەنیایی مانادار بن.

لە لایەکی دیکەشەوە، چونکە هەموو ماناو ڕاستەکان لەسەر جیاوازی بنیات نراون، هیچ دەقێک ئیتر یەک مانای نییە و لێرەوەیە کە باسی «نێوان دەق» (intertextuality)دێتە پێشێ.

گەڕان بە دوای مانایێ ڕاستەقینەی دەق یان مەبەستی نووسەری دەقەکە کارێکی بێ بایەخ وبێ کەڵکە، چونکە هیچ چەشنە ڕاڤەیەکی ڕاستەقینەی دەقەکان لە ئارادا نییە. چێژی شیکاری دەقەکانیش لە دۆزینەوەی ڕاڤە نوێکاندایە. بنەماشکێنەکان دوانە لێکدژەکانی نێو دەق دەشتنیشان دەکەن و جێگەیان دەگۆڕنەوە. ئەگەر لە ڕوانگەی مێژووییەوە بڕوانین بۆ دوانە لێکدژەکان، ئەو خاڵەمان بە ڕاشکاوی بۆ دەسەلمێندرێ کە دوانە لێکدژەکان بەردەوام ماناکان سنووردارەدەکەنەوەو مۆڵەتی خوێندنەوەی زۆرو ڕاڤەی نوێمان نادەنێ.

دەق ڕاست وەک خودی زمان مەدلوولی ترانسێندێنتاڵی تێدانییە و ئەو شتەی نووسەر پێی وایە لە دەقەکەدا دەری خستووە و ئەوشتەی بە ڕاستی نووسراوە لێکدی جیاوازن. هەر بەو بۆنەشەوە ڕەخنەگری بنەماشکێن لە دەقەکاندا وەدووی ئەو وشە دەستەواژانەدا دەگەڕێ کە نووسەر لەواندا خۆی لە باری دەروونییەوە تارادەیەک ئاشکراکردووە و بۆ خۆی وادەزانێ هەڵەی کردووە، کەچی وانییە (Slips of langnagle). دەرئەنجامی هەرە بایەخداری ئەو قسانەی سەرەوە ئەوەیەکە دەق هیچ کات یەک مانای دیاری کراوی نییە و بە پێچەوانەوە بە ژمارەی خوێنەرەکانی مانای هەیە، بەڵام، تەنانەت لەم ڕوانگەیەشەوە، نابێ یەکێک لە ماناکان وەکو مانای ڕاستەقینە دەستنیشان و دیاری بکرێ.

هەڵوەشاندنەوە پەنجەدەخاتە سەر شی کردنەوەی بنەماکانی هزرو بیری مرۆڤ و لە شێوەی بە دیارکەوتنی بنەما لە دەقەکان دەکۆڵێتەوە. بە واتایەکی تر، بە چ شێوەیەک بنەماکانی بیرو چەمک و بڕوا فەلسەفییەکان بە هۆی هونەرەکە لای (وئەدەبی)یەکانەوە لە زماندا شاردراونەتەوە، کە خوێنەر هەر ناتوانێ دەستنیشانیان بکات و هەر بەو بۆنەشەوە، بڕواو بیروباوەڕو تەنانەت بەهاکانیش بە ئاسایی و نۆرماڵ دادەنێ و پرسیاریان لێ ناکات، بیرەکان بە شێوەیەک لە زماندا حەشاردراون کە خوێنەر ناتوانێ هەستیان پێ بکات.

## قۆناخەکانی هەڵوەشاندنەوەی دەق

١- دۆزینەوەی دوانە لێکدژەکان.

٢- باسکردن و پێشنیاردان لەسەر چەمک و بەهاو باوەڕەکانی ئەو دیوی دوانە لێکدژەکان.

٣- گۆڕینی جێگەی دوانە لێکدژەکان.

٤- ڕەتکردنەوەی سەرجەم بیروبڕوا گەردوونییەکان و مانای چەمکە لە مێژینەکان سەبارەت بە دوانە لێکدژەکان.

٥- پەسندکردنی ئەو ڕاستییە کە هەر دەقێک خاوەن چەند ئاستی جۆراوجۆرەکە بەهۆی هەڵگەڕاندنەوەی تەوەری دووانە

ێکدژەکانەوە وەدی هاتوون.

٦- دەقەکان مانای جیاجیایان هەیە و هیچ کام لەماناکانیش دیاری پەسند ناکرێن.

## چەند نموونەی ڕەخنەی هەڵوەشاندنەوە

پێشتر میتۆدی باوی لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکان ئەوە بوو کە ڕەخنەگر هەوڵی دەدا مانای «ڕاستەقینە»ی دەقەکە بدۆزێتەوە و بیگێڕێتەوە بۆ خوێنەران (هەڵبەت ئەو مانایە کە ڕەخنەگرەکە پێی وابوو مەبەستی نووسەری دەقەکەش هەمانە، یان لانی کەم، ئەو مانایەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیی سەردەم پەسندیان دەکردو بە باشیان دادەنا، بەڵام لە لۆژیکی هەڵوەشاندنەوەدا ئاوا نەریتێکی ڕەخنەکاری بایەخی خۆی دەدۆڕێنێ، چونکە ئەگەر مانای جۆراوجۆر بۆ دەقێک لە بەرچاو بگیرێ و هیچ مانایەکی دیاری کراویش پەسند نەکرێ، هەتا هەتایێ ڕاڤەی نوێمان لە دەقەکان هەیە و ڕەنگە هەندێکیشیان دووبارەببنەوە. لە لایەکی ترەوە، لەوانەیە هیچ کاتێک نەگەین بە (ڕاستی)ی دەقەکان و لێیان تێبگەین.

هەڵبەت ڕەخنەگرانی بنەماشکێنی ڕێک وەک پۆل دورن، ج. هیللیس میلەرو جێفری هارتمان دژایەتییان لەگەڵ وەها نەهجێکدا دەربڕیوە.

لێرەدا چەند نموونەیەکی ڕەخنەی هەڵوەشاندنەوە یان بە واتایەکی تر، دابەزاندنی تیۆری هەڵوەشاندنەوە لە مەڕ دەق یان چەمکەکان لە ڕەخنەکاریدا دەخەینە بەرچاو:

١- ئەگەر دوانە لێکدژی نووسەر- ڕەخنەگر لەبەرچاو بگرین، ئەو حاڵەتەمان خێرا وەبیر دێتەوە کە نووسەر مرۆڤێکی داهێنەرەو لەبەرهەمەکانیدا هێندێ بیرو بڕواو فەلسەفەو وێنەی خەیاڵی و ...تاد. دەخولقێنێ. کۆمەڵگای مرۆڤایەتیش بەردەوام نووسەری لە لای سەرووی ڕەخنەگر داناوە هۆی وەها بایەخدانێک بە نووسەر ئەوەیەکە نەریتی بۆی تێڕامان و بیرکردنەوە بەو شێوەیەیە کەوا دەزانرێ، ئەرکی سەرەکیی ڕەخنەگر ئەوەیە کە بیرو بڕواو فەلسەفە و بۆچوونی تایبەتی نووسەر ڕوون بکاتەوەو دەوری پردێک بگێڕێ لە نێوان نووسەرو خوێنەردا، تەنانەت لە نێوان دەق و خوێنەردا، بەڵام ئەوەی مێژووی ڕەخنەی ئەدەبیی خوێندبێتەوە ئاگاداری ئەوەیە کە تاقمێ ڕەخنەگر خۆیان لە بازنەی داهێنان لە سنگەی ئەدەبەوە دەرباز کردووە و لە جیاتی ئەوە، لە چوارچێوەی بیرو ئەندێشەدا خەریکی بەرهەمهێنانی هزرن، بە واتایەکی دیکە، خەریکی داهێنانی تیۆرێکن.

لە لایەکی تریشەوە، تیۆرو ڕەخنەی ئەدەبی، ئێستاکانێ، تا ڕادەیەک لە خودی ئەدەب جیابۆتەوەو زۆرتر بەرەو لای فەلسەفە دەکشێ و، لە هێندێ وڵاتی ئەورووپیدا ڕەخنەی ئەدەبی وەکو بەشێکی سەربەخۆ لە زانکۆو ئەنستیتۆکاندا وەکو وانە دەوترێنەوەو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ توێژینەوەی فرەتری لەسەردەکرێ.

هەروەها، ئەگەر چاوێکی خێراو بەپەلە بە بارودۆخی بوارە جۆراوجۆرەکانی ڕۆشنبیری کۆمەڵگای خۆرئاواییدا بخشێنین، تێدەگەین کە ڕەخنەگران (بۆ نموونە، بارت لە بەرانبەر سارتەردا) لە تەشقی گفتوگۆ و مشتو مڕە ڕۆشنبیرییەکانیاندا ماناو ئەندێشەی تازە بەرهەم دێنن و ئاراستەی کۆمەڵگای دەکەن. کەواتە بەپێی قۆناغەکانی هەڵوەشاندنەوە دەکرێ ڕەخنەگر بخرێتە لای ژوورووی نووسەرەوە یان دیسان دەکرێش هیچ کام، نە نووسەرو نە ڕەخنەگر، لە سەرووی ئەویترەوە نەبێت، چونکە چەق یان سەنتەرێک لە گۆڕێدا نییە تاکو لە ڕوویەوە پێکەوە بەراوردیان بکەین و هەڵیان سەنگێنین.

٢- جۆن میلتۆن(١٧) لە دەستپێکی دەقە بەنێو بانگەکەیدا، بە هەشتی دۆڕاو(١٨)، بەخوێنەر ڕادەگەیەنێ کە مەبەستی سەرەکیی لە نووسینی ئەم بەرهەمە ئەوەیە تاکو عەدالەتی خواو ڕێگاکانی (چاکە)ی خوا بۆ مرۆڤ بگێڕێتەوە و باسیان بکات. میلتۆن لە دوا دێڕەکانی بەندی یەکەمی بەشی یەکەمی بە هەشتی دۆڕاودا دەڵێ:

بەباسکردن لەم بابەتە یەکجار مەزنەوە دەمەوێ پەنجە بخەمە سەر (شوێنی هەتا هەتایی) و بۆچوونەکانی خوا بەرانبەر بە مرۆڤ باس بکەم. (١٩)

بە واتایەکی تر، خودی نووسەر لە سەرەتای بەرهەمەکەیدا مەبەستی خۆی بە خوێنەر ڕادەگەیەنێ و، خوێنەر لەوە ئاگادار دەکاتەوە کە نووسەر دەسەڵاتی بەسەر بەرهەمەکەیدا هەیە، کەچی ئەگەر خوێنەر بەرهەمی ناوبراو لە نزیکەوە بە وردی بخوێنێتەوە، لە کۆتایی ڕەوتی خوێندنەوەدا بەو ئاکامە دەگات کە لە بەهەشتی دۆڕاودا، بۆچوونەکانی شەیتان بەرانبەر بە مرۆڤ پێشاندراون نەک ئەوانەی خوا، شەیتان پاڵەوانی سەرەکیی بەرهەمەکەی میلتۆن-ەو ئەوەندەی لەسەر ئاکارو کردەکانی شەیتان ڕۆیشتووە، کە سەدەیەک دوای نووسینی ئەم کتێبە، واتە لە سەردەمی ڕۆمانسیزمی ئینگلیزیدا، قوتابخانەیەک بەناوی قوتابخانەی شەیتانی (Satunic School) سەری هەڵداوە. ئەندامانی ئەم قوتابخانەیە، وەک لۆرد بایرۆن (١٧٨٨-١٨٢٤)، سرووشیان لە شەیتان-ەکەی بەرهەمەکەی میلتۆن-ەوە وەرگرت. خواو شەیتان دوانە لێکدژی بنەڕەتیی بەرهەمەکەی میلتۆن پێکدێنن و نووسەر، هەروەک بۆ خۆی پێی وایە لە بەرهەمەکەیدا گرنگییەکی زۆرتر بەخوا دراوە، کەچی پاڵەوانی

ڕاستەقینەی بەرهەمەکەی (شەیتان)ە.

بە واتایەکی دیکە، دوانە لێکدژی (خوا- شەیتان) لە ڕەخنەی هەڵوەشاندنەوەدا پێچەوانە دەکرێتەوەو دەبێ بە (شەیتان-خوا).

٣- ڕامان سێلدن لە کتێبی تیۆری ئەدەبی و ڕەخنەی پراکتیکیدا و لە بەشی هەڵوەشاندنەوە دا تیشکی خستۆتە سەر دوو شیعری ویلیام وۆردزوۆرس و ئیمیلی دیکنسۆن و پلە بە پلە ئەو شیعرانەی بە پێی ڕەخنەی هەڵوەشاندنەوە، بنەماشکێنی کردووە و لە کۆتاییدا مانایەک دژ بەو مانایەی نووسەر یان بیرو ئەندێشەی باوی سەردەم پێداگری لەسەر دەکەن، دەستنیشان کردووە.(٢٠)

**پەراوێز**

.......

**1- Literay Theory :An introduction (1983).**

**2- Ferdinand de saussure (1865-1915).**

٣- لە کوردستانی باشووردا ڕەخنەگران و وەرگێڕان بۆ زاراوەی (Structuralism) (بونیادگەری) یان (بونیادخوازی) بەکار دەبەن کە ئەمە هەڵەیە لەبەر دوو هۆی سەرەکی: یەکەم وشەی (Structure) لە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسیدا بە مانای بونیاد یان بنیات بەکارنابرێت و..

دووەم لە زمانی فارسیدا زاراوەی «بنیادگرایی» بۆ (Fundamentalism) دادەنێن کە ئەمە ڕاستەو، ئەگەر لە کوردیدا زاراوەی بونیادگەری بۆ (Structurlism) بەکاربردێ، لەوانەیە ئەو خوێنەرانەی سەرچاوەی خوێندنەکانیان بە زمانی فارسییە، تووشی سەر لێشێواوی بێن.

**4- Problematic.**

٥- زاراوەی نووسیار کە لە زمانی فارسیدا بە شێوەی (نوشتار) و لە زمانی فەرەنسی دا بە شێوەی (ecriture) بەکاردەبردێ. لە بەرگی سێیەمی کتێبی (مرۆڤ و دەوروبەر)، نووسینی مەسعوود محەمەد وەرگیراوە.

**6- Jacgues Derrida. Deconstraction and the other: Diologus with Jocgues Derrida,, in Diologues with conten porary Thin Rers: The Phenomenological Heritage.**

**ed. Richard Kearney. (man chester: Manchester UP, 1984). P. 109.**

٧- باشترین نموونە بۆ ئەو قسانە وتارەکەی دریدایە کە لە ساڵی (١٩٦٦) داو لە زانکۆی جانز هابکینزی ئەمریکی خوێندییەوەو لەوێ بە توندی ڕەخنەی لە کلۆد لیڤی شتراوس گرتووە.

جێگەی سەرنجە کە ئەم وتارە بە شێوەیەکی ناتەواو وەرگێڕدراوەتەوە بۆ فارسی و ئەو بەشانەی دریدا ڕەخنە لە شتراوس دەگرێ، تێیدا ون بووە. (ئەم وتارە لەلایەن د. فەرزان سوجوودی-یەوە کراوە بە فارسی و لە ژمارە ٣ی گۆڤاری بیدار داچاپ کراوە). بۆ دەقی لێدوانەکەی دریدا بڕوانە:

**Jacgues Derrida, STructure, Sign and Play in the Discoutse of the Human Sciences (1966) in Modern Literary Theory. PP. 149. 66.**

٨- لە بارەی پێوەندیی هاوبەش و دوو لایەنەی نێوان نورتراب فرای و ڕەخنەی ئوستوورەیی لە لایەکەوە و بنەماخوازی لەلایەکی ترەوە بڕوانە بۆ سەجادی، بەختیار (ڕەخنەی ئەدەبیی ئەستوورەیی و پێوەندی لەگەڵ بەشەکانی تری ڕەخنەی ئەدەبیدا) ئاوێەر، س٣، ژ٥٩ ل ١٢.

٩- بڕوانە: سەجادی، بەختیار (قۆناغەکانی ڕەخنەی دەقێکی ئەدەبی) سروە، ژ ١٥٤، ل٢٠-٢٥.

١٠- بڕوانە: حقیقت درویس وجود، نووسینی (د. حجت الله اسدیان)، بە شێوەی نامیلکە چاپ کراوە. وێنەکانی نێو ئەم وتارە لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراون.

١١- بڕوانە: گەردی، عەزیز کتێبی شیعری کلاسیکی کوردی (هەولێر چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ١٩٩٩).

١٢- بۆ نموونە سەرهەڵدانی پێنج بەرە لە شاعیرانی نوێخواز لە ئەدەبی هاوچەرخی فارسیدا و هەروەها گۆڕانکارییەکانی ئەدەبی کوردیی سەدەی بیستەم کە زۆر بە کورتی و هەر تەنیا وەکو سەردێڕ، بریتین لە: دوو دەیەی یەکەمی سەدەی بیستەم:

دوا چۆڕی کلاسیزم: سییەکان و سەرەتای چلەکان: ڕۆمانتیسیزم: پەنجاکان: ڕیالیزم (بە تایبەت لە چیرۆکدا): کۆتایی شەستەکان: هێما خوازی یان سەمبولیزم، سوارەی ئیلخانی زادە لە ئێراندا: حەفتاکان سێ قوتابخانەی ڕوانگە، کفری و هەولێر: هەشتاکان: ئەدەبی بەرگری و ڕێبازە جیاجیاکانی چیرۆکی کوردی: نەوەدەکان: لقە جۆراوجۆرەکانی ئەدەبی کوردی پاش ڕاپەڕین. بەو هیوایە لە دەرفەتێکی تردا بە وردی لێیان بکۆڵمەوە.

١٣- بڕوانە: سەجادی، بەختیار (لێکدانەوەی چەند زاراوەیەکی نوێ لە ڕەخنەی ئەدەبی هاوچەرخ دا) ئاوێنە، ژ٤-٣-٣-٤، بەهاری ١٣٧٩ و «ئاپۆریا». هێما. ژ١٩، ل٩-٣٨ و ڕەخنەی ئەدەبیی هاوچەرخ (٤)، ژاک دریدا، ڕامان ژ ٥٣.

١٤ (دەنگناسی) یەکێک لە قۆناغە سەرەتاییەکانی زانستی زمانەوانی پێکدێنێ: لە دەنگناسیدا هەر پیتێک خاوەن تایبەتمەندیی خۆیەتی، بۆ نموونە، پیتی (ب) بە (libidal) و پیتی (پ) بە (Explosire libidal) ناو بر دەکرێن.

15- of Grammatology (1967).

١٦- لێرەوەیە کە بۆ چوونی دریدا سەبارەت بە زمان، ئاوەزو هوشیاری ڕوونتر دەبێتەوە. بە بڕوای دریدا منداڵ تەنیا لە ڕێگەی زمانەوەیەکە ئاوەزو هۆشیاریی تایبەت بەخۆی وەدەست دێنێ (بەمانی نیئو مارکسیستییەکەی، واتە ئایدیۆلۆژیا) ئەگەر زمان نەبێ هوشیاریش نییە. لە شوێنێکی تردا دەڵێ: (هیچ شتێک لە دەرەوەی دەق نییە).

١٧- جۆن میلتۆن (John milton (1608-1674، شاعیری غەزەلبێژو حەماسە نووسی ئینگلیزی، تا بەر لە وتارەکانی تی. ئیس. ئیلیەت، بەگەورەترین شاعیری سەدەی حەڤدەیەمی ئینگلتەرا دادەنرا. میلتۆن خاوەن شێوازی لاتینی بوو وەکو شاعیرێکی ئایینی لە شەڕی ناوخۆی ئینگلتەرا (1642-1660) لایەنگری لە ڕابەری ئایینی ئەو شۆڕشە، واتە ئۆلیڤەر کرامۆیل، دەکرد.

18- Paradise Lost (1667).

19- Milton, John. Paradise Lost in the norton Anthology of English Literature. 6th ed. M. H. Abrams et al new york: w.w. norton, 1993. P. 1477.

٢٠- بڕوانە: سلدن رامان. نظریه ادبی و نقد عملی. ترجمه د. جلال سخنوروفریب زمانی (تهران، پویندگان روز، ١٣٧٥). ص ٧٨. ١٦٨.

سەرچاوە

......

Oerrida, Jacqnes. Of Grammatology. trans. G. Spivak (Baltimore: Johns Hopkins UP, 1976).

Fortier, Mark. Theory/ Theatre: An lntroxduction (London: Ront ledge, 1997).

Hanthorn, Jeremy. Contem porary Literary Theory. (London: Edward Arnold, 1992).

Kahnamoniponr, Jaleh et Nasrine Khattate. La Critigne Litteraire (Teheran: SAMT, 1995).

Lodge, David. Modern Critli(i)m and Theory (London: Longman, 1993).

Newton, K.M. Twentieth, Centuey Literary Theory (London: Macmi llan Press Ltd., 1997).

Peck, John and Martin Coyle. Literary Terms and Cridicism Zad ed. (London: Macmillan Press Ltd., 1993).

Tallack Donglas. Critical Theory: A Reader (New York) Harrester Wheatsheaf, 1995).

Webster, Roger. Studying Literay Theory (London: Edward Arnold, 1993).

Wol Freys, Juhanand Wilham Baker led.) Literary Theoriey Clondon: Macmillan Press Ltd., 1996).



# نەزەرگەی پیران و سێیەمین بەستێنی چۆم

سەلام مەفتی
(سلێمانی)

بەراوردی ئەمجارەمان لەنێوان چیرۆکێکی فۆلکلۆری کوردی بەناونیشانی- نەزەرگەی پیران-و چیرۆکێکی هونەری، ئەمەریکای لاتینی بەناونیشانی-سێیەمین بەستێنی چۆم لە نووسینی -مارائیس روسا-یوونس-ی رەزایی-ی بۆکانی لە فارسییەوە کردوویە بە کوردی..

## نەزەرگەی پیران

دەڵێن: پیاوێکی سۆفیلکەی ریش سپی- ناوی -قوربانی- دەبێ لە یەکێک لە گوندەکانی -وارماوا-دا دەژی، ژنێک و کورێک و کچێکی دەبێ، ژنەکەی ناوی-خەجیلان- دەبێ، کچەکەیشی- ئەستێ- کورەکەیش ناوی-هەیاس- دەبێ- قوربانی- مرۆڤێکی راڕاو فرەئیش دەبێ، بەڵام ئیشەکانی بە نیوە ناچڵی ئەنجام داوەو کەمتر باری گەیشتۆتە هەوار، لەگەڵ ئەوەیشدا دەبوایە هەموو رۆژێ بۆ ماوەیەکی کەمیش بێ زیارەتی -نەزەرگەی پیران-ی بکردایەو لێی بپاڕایەتەوەو نزایش بۆ باپیرانی خۆی بخوێنێ.. جارجاریش لەگۆڕستانەکەدا خەوی لێدەکەوت وخەوی بەمردنەوە دەبینی ساڵ دوای ساڵی دەست سپی و لەش بە بارو نەخۆش دەبوو لە نەزەرگەو گۆڕستانەکە زیاتر دەمایەوە، هەتا بوو ژیانی گوندەکەی لەبەر چاورەش دەبوو، رۆژێ هات بەسەریاو هەندێ رایەخی لەگەڵ خۆی بردو سووچێکی نەزەرگەکەی کردە ماڵی خۆی و بڕیاری دا هەتا هەتایە لەوێ بمێنێتەوە، ئەو کارە بووە جێی سەرسوڕمانی ماڵ و منداڵ و خزم کەسوکارو خەڵکیش... چونکە رۆژێ لە رۆژان چاوەڕێی ئەوە نەبوون و ئەوەیان بە خەیاڵدا نەهاتووە.. بەتایبەتی ژن و منداڵەکانی هەتا دوو رۆژیش ژنەکەی وایدەزانی وەک جاران نانی لەگەڵ خۆی بردووەو بە کەڵەکە بەردەکانی ناو زەوییەکەوە خەریکە..

-خەجیلان-ی خێزانیشی ئافرەتێکی بە هەڵپەو دەست رەنگین و بە توانا بوو هەمیشە تەونی بەدارەوە بوو، ئاگای لە مەڕوماڵات و خەڵەو خەرمانی بوو.

-هەیاس-ی کوڕی هەمیشە دڵی لای باوکی بوو، بەدزی و بە ئاشکرا خواردنی بۆ دەبرد ئەویش لێی وەردەگرت و سەری ماچ دەکرد.. بەڵام دایکی لەگەڵ ئەوەدا نەبوو خواردنی بۆ بەرن، لەبەرئەوەی بێتەوە بۆ ناوماڵ و منداڵی و واز لەو کارە بهێنێ و دەست بەسەری منداڵەکانیدا بێنێ، دوای کڵاوی بابردوو نەکەوێ..

رۆژێ ژنەکەی و کورەکەی و خزم و کەسوکارو مەلای گوندەکە دەچن بۆ لای و چاویان پێی دەکەوێ.. مەلای گوندەکە دوعای بەسەردا دەخوێنێ بۆ ئەوەی شەیتان و جنۆکەی لێ دوور خاتەوە، چونکە لای ئەو دەستیان لێ وەشاندبوو چوو بوو نە لەشییەوە ..

ئەوانی تریش پێیان وت: کارێکی باشت هەڵنەبژاردووە، ماڵ و منداڵت بە سەرکێدا بەجێ هێشتووە گەڕانەوەت بۆ ناو ماڵ و منداڵت کارێکی پێویستە، مانەوەت لێرە بێ سوودە..

قسە لە دارو بەردەوە هات لەوەوە نەهات و دەتوت گوێزی بۆ دەژمێریت ئەوانیش هەروا گەڕانەوە..

هەندێکیان لە رێگا وتیان:

- سەری لێشێواوەو حەزی لە نانی تەمەڵی و تەوەزەلییە

ئەوانی تریش وتیان:

- وازی لە دنیا هێناوەو خەڵوەتی هەڵبژاردووە، کێ دەڵێت

- خدری زیندە- نییە؟

چونکە خدر- هەر رۆژەی خۆی لە بەرگێکدا دەنوێنێ و رێگا نیشانی رێبوارو لێقەوماوان دەدات- قوربانی-یش

کابرایەکی نەفس بەرزەو دوور نییە پیاوچاک نەبێ.. ئەوەتا خواردن بە تەنیا لە کورەکەی خۆی وەردەگرێ..

-هەیاس-ی کوڕیشی خەمخۆری بوو، زۆری پێوەماندوو بوو، شەوانی بەفرو کڕێوە لە خەفەتی باوکی خەوی لێدەزڕاو دەیوت باوکە ڕەق دەبێتەوەو ئابڕوومان دەچێ دوای چەند ساڵێک بە باوکی وت:

-بابەگیان وا پیر بوویت ئەو هێزەت نەماوە، منیشت لێرە کەنەفت کردووە بەردەوام دڵم لاتە و ژیانم تاڵ بووە، تا ئێستا بێ ژن وماڵم، ئیتر بەسە کاتی هاتنەوەت هاتووە، لێرە چی دەکەیت...؟! وەڵامی نەدایەوە بەسەر ئاماژەی ڕۆشتنەوەی بۆ کرد.. ئەویش جامی غەزەبی پڕ بوو وتی: ناوچەوانم زەقەو خێر نەهاتۆتە ڕێگام، ئەو ڕۆژەی منی تێدا لە دایک بووم ڕۆژێکی ڕەش و شووم بوو.. تا بوو کۆسپ و قۆرتەکان لەڕێی ئەو خێزانەدا زیادیان دەکردو بەرەو هەڵوەشانەوە دەچوو، دایکەکە لە خەفەتدا مرد، خوشکەکە مێردی کرد، باوکەی سەرگەردان ڕەشەڕاهات و کەس نەیزانی بۆ کوێ چوو، بێسەرو شوێن.

بەتەنیا-هەیاس- مایەوە، ئەویش دنیای لێتەنراو پێی ڕێی دانەدەگرت بۆ هیچ شوێنێ بچێت و بڕیاری دا لەوێ بمێنێتەوە، کە مردیش لای گۆڕی باپیرانییەوە بینێژن..

## کورتەی چیرۆکی «سێیەمین بەستێنی چۆم»

باوکم پیاوێکی بەمشوورو قسە لەڕوو بوو، لە منداڵییەوە تایبەتمەندیی خۆی هەبوو، ئاغاو کوێخای ماڵ دایکم بوو، دایکم هەموو ڕۆژێ من و خوشکەکەم و براکەمی سەرکۆنە دەکرد خوداو ڕاستان ڕۆژێ باوکم بەلەمێکی بە دروستکردن دا.. بەڵێن وابوو گەمێکە لە چێوی ئاقاقیا سازکرێ و بەرگری بیست سی ساڵ بگرێ وتەنیا جێی کەسێکیش بێتەوە دایکم وای دەزانی مێردەکەی دەبێتە ماسیگر یان ڕاوچی، ماڵی ئێمە لە چۆمەوە دوور نەبوو چۆمیش لەو ئاستەدا قووڵ و بەرین بوو، ئەو بەری لێ دیار نەبوو...

ئەو ڕۆژەی بەلەمەکەمان وەرگرت باوکم هیچ سادییەکی دەرنەبڕی و ماڵئاوایی لێکردین..

دایکم پێی وت: ئەگەر دەڕۆی هەر لەوێ بمێنەرەوە ئیتر نەگەڕێیەوە ها..

باوکم وەڵامی نەدایەوەو بەسەر ئاماژەی پێکردم لەگەڵی پیاسە بکەم، پێکەوە بەرەو چۆم ڕێ کەوتین، هەستم بە بوێری کردو وتم: باوە منیش لەگەڵ خۆت نابەی؟ ماچی کردم و بە ئاماژەیەک تێیگەیانم بەرەو ماڵ بگەڕێمەوە، لە بن بنچکێک خۆم مەڵاس دا بۆ ئەوەی ئاگام لێی بێ چی دەکات.. باوکم سواری بەلەمەکە بوو دوورکەوتەوە نەگەڕایەوە، بەڵام بۆ هیچ



یوونس ڕەزایی

کوێش نەچوو، لە پانتایی چۆمەکەدا بوو...

خزم و کەسوکارو خەڵک هەموو دەهاتنە لامان تا لەو باسە بکۆڵینەوە.. دایکم قسەی کەم کرد، هێمن و لەسەرخۆ بوو، لەبەرئەوە خەڵک پێیان وابوو شێت بووە، هەندێکیش لایان وابوو باوکم ڕەنگە نەزری کردبێ یان تووشی نەخۆشییەکی ترسێنەری وەک گولی بووبێ لەبەر ئێمە ماڵی بەجێ هێشتبێ.. ئەوانەی لە چۆمەکەدا سەفەریان دەکرد دەیان وت باوکم بەشەوو ڕۆژ پێی نەناوەتە وشکانی، وەک ئاوارەیەکی بێ کەسوکار.. دایکم و کەسوکارم وایان دەزانی ئەو خواردنەی ناو بەلەمەکە تەواو دەبێ و ناچار چۆمی بەجێ دەهێڵێ و دەگەڕێتەوە، شوێنی خواردەمەنی باوکم من بووم، هەموو ڕۆژێ خواردەمەنیم بۆ دەدزی و بۆم دەبرد.. یەکەم شەو دوای ڕۆشتنی باوکە هەموومان چووینە قەراخ چۆمەکەو ئاورمان کردەوەو بانگمان کرد لێی پاڕاینەوە.. ڕۆژێکی تر خواردنم لەگەڵ خۆم بۆ بردو چوومە قەراخ چۆم ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانیم کرد، لە دوورەوە بەلەمەکەم دی، باوکمی تێدا دانیشتبوو، بەڵام هیچ ئاماژەیەکی پێ نەکردم..

خواردەمەنییەکەم نیشان داو بۆم لە قەڵەشی گاشەبەردی قەراخ چۆمەکە دانا...

ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ ئەو کارەم دووپات دەکردەوە، دواتر بەو پەڕی سەرسوڕمانەوە زانیم دایکم پێی زانیوە خواردنی لەو جێگایانە بۆ دادەنام کە دزینی ئاسانترە..

ڕۆژێ قەشە بە ویستی دایکم عەباکەی لەبەر کردو چووە قەراخ چۆم لەبەرئەوەی ئەو جنۆکەو شەیتانانەی چووبوونە مۆخییەوە دووریان خاتەوە..

ڕۆژێکی تر دایکم لەگەڵ دووچەکداردا بڕیاریان دا بیترسێنن، تێکڕای ئەوانە بێکەڵک بوون.. باوکم گەمێیەکەی بەرەو ئەو پەڕی چۆم و زەلکاوەکان سەوڵ دا، بۆ جێیەک وەک

بەری دەستی شارەزای بوو.. من تاکە کەس بووم لە باوکم حالی دەبووم، ئەوەی من تێنەدەگەیشتم ئەوە بوو چۆن بە شەوو بەڕۆژ لەژێر تیشکی هەتاو و ڕێژنەی باراندا لە سەرماو گەرمادا ڕاهاتبوو، هەرگیز پێی نانایە وشکانی. جارجار بەلەمەکەی دەبەستەوە هەتا سەرخەوێک بشکێنێ، جگە لەو هەندە خواردنە هیچی پێنەبوو ئاخۆ لەش و لاری چی لێهاتووە...؟! ئەی کاتی سێلاوهاتنی بەهار چۆن گیانی دەرباز دەکات...؟

خوشکم مێردی کرد دایکم پێی قایل نەبوو، چونکە کە خواردنی خۆشمان دەخوارد باوکمان بیردەکەوتەوە بە چەشنێک لە شەوانی سەرماو زریاندا لە توێی نوێنی گەرمدا دەخەوتین بیرمان لەو دەکردەوە.. هەتا بڵێی کزو نەخۆش و بێدالدەو سەراپا ڕەش و تاوە سووت، هەرچەند جارجار جلو بەرگم بۆ دادەنا، بەڵام ڕووت و قووت.. پێم وانەبوو ئێمەی لەبیر بێ.. بەڵام من خۆشم دەویست و ڕێزم بۆ دادەنا.. خوشکم کوڕێکی بوو پێی خۆش بوو باوکم نەوەکەی ببینێ، ڕۆژێکی خۆش چووینە قەراخ چۆمی، خوشکم جلە سپییەکەی بووکێنی لەبەردا بوو منداڵەکەی بەدەستەوە گرتبوو. مێردەکەیشی چەترێکی بۆ سێبەر بەسەردا داگرتبوو بە دەنگێکی بەرز هاواری باوکمان کردو چاوەڕوان ماینەوە بەدیار نەکەوت، خوشکم لەپرمەی گریانی دا، هەمووومان باوەشمان بە یەکداکردو گریاین..

خوشکم و مێردەکەی بۆ شوێنێکی دوور کۆچیان کرد، ماڵی براکەم چووە شار زەمانە گۆڕا دایکم پیر بوو بۆخچەی پێچایەوە بۆ ئەوەی لای زاواو کچەکەی ژیان بەرێتە سەر، هەر من مامەوە بەجێماو لە خێڵ و ناسیاو، نەیشم توانی بیر لە ژن هێنان بکەمەوە.. باوکی سەرلێ شێواو و بێکەسم پێویستی بە من بوو نەمدەزانی باوکە بۆچی وادەکات ئەم پرسیارەم لە خەڵک دەپرسی؟

ئەوانیش دەیانوت: باوکت باس و خواستی خۆی بۆ ئەو کابرایە گێڕاوەتەوە کە بەلەمەکەی بۆ حازرکردووە، بەڵام ئەو کابرایە مردووە کەسیش لەبارەیەوە هیچ نازانێ.. ساتێکیش کە باران بەخوڕ دەهاتە خوارێ، ئەم داستانە شێتانەیە دەهاتە گۆڕێ، باوکم وەک حەزرەتی -نووح- پیاوێکی زاناو هۆشیار بوو کاتێ زانیوبە سێلاو دێ بەلەمێکی بەدروستکردن داوە.. نازانم من چ تاوانێکم کردبوو باوکم بۆچی دەبێ بێسەرو شوێن بێ..؟! لەسەر من بارێ، چۆمیش هەر چۆم بوو لە تازەبوونەوە دابوو، هەتا بوو جارِس دەبووم، ئەویش بێ هێزو لاوازو نەخۆش نەیدەتوانی پێشی وەرگەڕانی بەلەمەکە بگرێ و بکەوێتە نێو لرفەی قورولیتەوە.

منیش هەتا بوو لە هێمنی و ئارامی خۆم دووردەکەوتمەوە.. تاوانم لە ئەستۆیە نازانم هۆکەی چییە...؟! ڕاستی بڵێ ئاخۆ شێت بووم...؟ نا.. لە ماڵی ئێمەدا ئەو وشەیە بە زاری کەسدا نەهاتووە، چونکە کەس شێت نییە یان ڕەنگە هەمووان شێت بن..

چوومە ئەوێ دەسرۆکەیەکم ڕاوەشان بەشکو ببینێ، خۆم ڕاگرت پاشان لە دوورەوە دەرکەوت لەسەر بەلەمەکە دانیشتبوو دوو سێ جارم هەرا لێ کردو هەتا هێزم تێدا بوو نەڕاندم و وتم: باوەگیان زۆر لە دەرەوە ژیاویت ئیتر پیربوویت بگەڕێرەوەو درێژە لەوە زیاتر بە کارەکەت مەدە، من لە جێی تۆ دەچم هەر کاتێ بڵێی سواری بەلەمەکە دەبم و جێت دەگرمەوە.

گوێی لە دەنگم بوو هەستایە سەرپێ، بەلەمەکەی بەرەو ڕادا بەقسەی کردم لەپڕ دڵم کەوتە لەرزین، چونکە ئەو دەستی هەڵهێنابوو ڕای دەوەشان..

دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو ساڵانە منیش هێزم لێبڕا بوو سام گەستە بەترس و سامەوە ڕام کرد، شێتانە هەڵاتم، چونکە دەتوت لە دنیایەکی کەوە دێ، منیش بە پاڕانەوە داوای لێبووردن دەکەم لە ترسان نەخۆش کەوتم.. دوا ئەوە نەکەس چاوی پێی کەوت نەکەسیش هەواڵی زانی، پاش تێکشکانێکی ئاوا ئاخۆ منیش خۆم بە مرۆڤ بزانم...؟ من ئەو شتەم نەدەبوو ببێ.. تازە زۆر درەنگەو دەبێ لە بیابانی ژیانمدا بمێنمەوە، هەر خۆیشم کۆتایی بەو داستانە دەهێنم، بەڵام کە ساتی وادەی مردنم بێ دەمەوێ هەڵمبگرن و بمنێنە پاپۆڕێکی بچووکەوە کە هەمیشە لەو ئاوە خوڕە دایە.. منیش بەرەو خوارووی چۆم لە چۆمدا ون بوو.. چۆم..چۆم..

### بەراوردی دەقەکان

-ئەو لایەنانەی دەقەکان لەیەکتر نزیک دەخەنەوە-

(١) باوک لە دەقەکاندا بێهۆش و کەڕو لاڵە، سەرگەردان و چەواشەیە لێپرسراو نییە ملهوڕانە سواری ئەسپێکی چەمووش بووە، لە شێوو کەندەڵان و دڕک وداڵ و زەلکاودا کوێرانە ئاوزەنگی لێدەدات، بێ ئەوەی بزانێ بەرەو کوێ مل دەنێ، بیر لە پاشەڕۆژی خۆی و ماڵ و منداڵی ناکاتەوە، لە باتی گوڵ و گەنم دڕکە کەڵەوێ و مووسنەک بە زەوییەکەیەوە دەکات لە ئاستی ئامۆژگارییەکانیش گوێی ئاخنراوەو قسە هەر قسەی خۆیەتی و گەڕانەوەو دابەزینی بۆ نییە.. لە کەری شەیتان نایەتە خوارێ، پێ لەو ئاوە دەخشێنێ کە باپیرانی بۆیان ڕشتووە.. ئەوەیش یاسایەکی نەگۆڕە لەو گوندانەداو هەر لە منداڵییەوە پەیڕەو دەکرێ.. باوک لە دەقەکاندا دوورە پەرێزو بێ ئومێدو بێ هۆشە، لە ناو دڵەڕاوکێ و چاولێکەریدا دەژی، ئاوارە و سەرگەردانە، هەڵس و کەوتەکان ماکی

کۆنەپەرستی و کۆیلەیەتی گەشەپێدەدەن و هەرەشە لە گۆڕانکارییەکان دەکەن.

(٢) کوڕ لە دەقەکاندا یاسای لاسایی کردنەوەی لە ئەستۆ گرتووەو کوێرانە هەنگاو دەنێ و بەکرەیی لە دروێنەی دڕک و داڵدا دەکات، شەوو ڕۆژ لە خەیاڵی باوکیایەتی و تووشی جۆرەها چورتم بووە.. هەوڵ دەدا بۆ ئەوەی بگەڕێتەوەو واز لەو ڕێگا سەختە بهێنێ، بۆ ئەوەی ئەویش بیر لە پاشەڕۆژی خۆی بکاتەوەو هەر بەوانەوە خەریک نەبێ، یاسای ژیانیش وا دەخوازێ کە کوڕ یاخی بێ وملکەچی دابونەریتی پووچەڵ و کۆنەپەرستی نەبێ، هۆشیارانە بۆ مەسەلەکان بچێت بڕوای بە گـــــۆڕانکاری هەبێ، لە باتی دروێنەی دڕک و داڵ ڕووی گوندەکەی بکاتە ڕۆژ.. بەڵام دەبینین لە کاری لاسایی کردنەوەی کوێرانەدا هەتا بینە قاقای ون بووە. بە موو لە ڕەوشتی باپیرانی لاینەداوەو وەک گای بنە بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوەو بستێک لە ئارامگاو گۆڕی باوکی جیانابێتەوەو هەنگاوی بۆ نانرێ..

(٣) دایک لە دەقەکاندا بە تواناو زیندووە، لە بەڕێوەبردنی ماڵدا کارامەو دەست ڕەنگینە، وەک دەڵێن ئاغاو کوێخای ماڵە، بیر لە پاشەڕۆژی خۆی و ماڵ و منداڵیان دەکەنەوە، ساویلکەیی مێردی لانەنگە، ساویلکەیی و سەرگەردانی ئەو جۆرە باوکە پێشێل دەکات.. ئافرەت لە هەردوو دەقەکەدا ڕۆڵێکی هۆشیارو لەبار دەبینێ. ئافرەتی کوردیش شان بەشانی ئافرەتی جیهان هەنگاو دەنێ و کاری دووره پەرێزی و باوک سالاری ڕەت دەکاتەوەو بڕوای بە ئیش کردن و پاشەڕۆژ هەیە.. تەنانەت پێی ناخۆشە کورەکەی خواردن بۆ مێردەکەی بەرێت لەبەرئەوەی بگەڕێتەوە ناو کەسوکاری و شان بداتە بەر ئیش کردن و لە ڕێی ژیاندا بجەنگێ..

دایک لە هەردوو دەقەکەدا لە سەرەتاوە بڕوایان نەدەکرد کە مێردەکانیان بەو شێوەیە بیر دەکەنەوە، ژنی دەقە بیانێکە وای دەزانی دەبێتە ماسیگرێکی بە توانا، لە کوردییەکەیشدا خزمەتی زەوییەکە دەکات.. لە لایەکی ترەوە هەوڵێکی زۆر دەدەن بۆ هاتنەوەی مێردەکانیان، ئەوەتا بەسەر خواستی هەردوو دایکەکە قەشەو مەلای گوند سەردانیان دەکەن و دوعایان بەسەردا دەخوێنن، بۆ ئەوەی شەیتان و جنۆکە لە مۆخ و لەشیان دوورکەوێتەوە، چونکە وا دەزانن دەستیان لێوەشاوە...

ڕووداوەکان کارێکی وا دەکەن دەبنە هۆی تێکشکان و پچڕانی خێزانەکە.. دایک لە کوردییەکەدا دەمرێ لە بیانێکەدا دەچێتە لای زاواو کچەکەی.

(٤)مرۆڤی ناو دەقەکان بەرانبەر بە ڕووداوەکان سەرسامن، لە جیهانی گومان و دڵەڕاوکێدا دەژین، ڕووداوەکانیان لا سەیرە! ئەوەتا کە باسی باوکی ناو چیرۆکەکان دەێتەکایەوە پێیان دەڵێن: شێت و سەرگەردان تەوەزەل و دووره پەرێزو خەفەت و مەراقیان بۆ خێزانیان بەجێ هێشتووەو ژیانیان لێ تاڵ کردوون.. ئەمە لەلایەک، لەلایەکی تریشەوە باوکی ناو دەقە کوردییەکە بە -خدری زیندە- لە قەڵەم دەدەن لەبەرئەوەی مرۆڤێکی پیرۆزەو دەچێتە بەرگی پیاوچاکانەوەو ڕێگای ڕاست نیشانی ڕێبوارو لێقەوماوان دەدات.. لەبارەی چیرۆکە بیانییەکەیش دەڵێن: باوک، وەک حەزرەتی نووح هۆشیارو زانایە زانیویتی سێلاو دێ بەلەمێک بەدروست کردن دەدات بۆ بەرگری لەلافاو، بەڵام هەر چۆنێ بێ تاقیکردنەوەی باوک لە دەقەکاندا کەمەو دوای کلاوی بابردوو کەوتوون و کۆمەڵ بەرەو زەلکاو دەبەن، کۆیلەیەتی زیندوو دەکەنەوە.

**ئەو خاڵانەی دەقەکان لەیەک جیادەکەنەوە:**

(١) ئەرزییەتی چیرۆکە بیانێکە ئاشنای پیشەسازییە وەک دروست کردنی بەلەم، بەڵام لەخاکی چیرۆکی -نەزەرگەی پیران-دا پیشەسازی کوورو بووە.. بەڵکو ئەرزییەتی چیرۆکەکە، پێوەندیی ئایینی و چاولێکەرییە کۆنەپەرستییە.

(٢) دایک لە چیرۆکە کوردییەکەدا نایەوێت نان و خواردن بۆ مێردەکەی بچێت، بەڵام لە بیانییەکەدا هەرچەندە پێیخۆش نییە، بەڵام جۆرە ڕەزامەندییەک بەدی دەکرێ.. ئەوەتا خواردنی لە شوێنی ئاشکرا بۆ دادەنێ بۆ ئەوەی بۆی بەرێ.

(٣) کوڕی چیرۆکە بیانێکە ئامادەیە لەگەڵ باوکی لە چۆمی بمێنێتەوە ئەوەتا دەڵێ -باوە لەگەڵ خۆت بمبە- بەڵام لەکوردییەکەدا ئەوە نابینرێ.

(٤) دایک لە کوردییەکەدا لە داخا دەمرێ، بەڵام لە بیانییەکەدا دەچێتە لای زاواو کچەکەی.

(٥) قارەمانی کوردییەکە ناودارن وەک هەیاس و خەجیلان و قوربانی و ئەستێ... بەڵام لە بیانییەکەدا ناویان نییە..❖

**سەرچاوە**

.......

**١- چیرۆکە فۆلکلۆرییەکەم لە خوالێخۆشبوو- حاجی مەلا ڕەحیم حەسەن-ی داریکەلی بیستووە.**
**٢- گۆڤاری -ڕامان- ژمارە ٤٩.**



**د. زوهدی داوودی:**

# کە لە بارەی جیهانی کوردەوە دەنووسم، ناتوانم شتەکان بە ڕەنگی گوڵ ڕەنگ بکەم

**لە شارەوە بۆ دێهات، لە دێهاتەوە بۆ شار، لەم شاریش بۆ ئەو شار، چیرۆکنووس و مامۆستا و پێشمەرگە و باوک، لە مێژووەوە بۆ فەلسەفە، لە فەلسەفەوە بۆ فەلسەفەی مێژوو، لەم وڵات و ئەو وڵاتە و لە ئەنجامیشدا بێ ئۆقرە و هەدادان لە هەندەران گیرساوەتەوە و تا سەر ڕەگیش کورد ماوەتەوە...! ئەگەر یەشار کەمال یا دەروێشیان یا سەلیم بەرەکات یا محیەدین زەنگنە، لە چیرۆک و ڕۆمانەکانیاندا، بۆنی کەشوهەوای کوردەواری بکەین و تۆزێ دڵمان داکاسێ، ئەوە چ لە نووسین و چ لە ڕۆمان و چیرۆکەکانیدا، سەد دەرسەد ئەو کەشوهەوایە و ئەو بۆن و بەرامەیە وڵاتی کوردو مرۆڤی کورد ڕەنگ دەداتەوەو بە تەواوی هەستێکی قووڵ بەو بەهەشتە خەواڵووەی نێو کوردەوارییە دامان دەگرێ و لەسایەیدا سەرخەوێکی شیرین دەشکێنین... نە ئەو لە ئێمە نامۆو نە ئێمە لە ئەو نامۆین، بابزانین لەم دیدارو پەیڤینە چی تێدایە...**

**ڕامـــــان:** لە دەسپێکەوە کوردەواری لە ژیان و لە ڕۆمانەکانتدا چۆن کەوتۆتەوە؟

**د. زوهـــــدی داوودی:** کوردەواری سەبارەت بە ژیان و نووسینەکانی خۆم زۆر شتە، واتە: جیهانێکی بێ سنووە و تا لە ژیان مابم کۆتایی نایێ. گەر هەر شتێ سەرەتای هەبێ، ئەوە هەست پێکردنم بەو سەرەتایە دەگەڕێتەوە بۆ شارۆچکەی (کفری)، چونکە منداڵیم لەوێوە دەستی پێکردووە و ئەوەی لە بیریشم مابێ وێنەی دەرگای ماڵەکەمانە لەسەر ئەو شەقامەی لە ڕۆخی ڕووبارەکە درێژ دەبێتەوە، ئەو گاڤە ئەو ڕووبارەم زۆر بەلاوە گەورەو پان و درێژ بوو، لەوبەری ماڵیشمان چیایەک هەبوو ناوەکەیم لەبیرنەماوە، هەر لەو ناوەشدا ئاسیاوێک هەبوو، هەموو هەنگاوەکانی منیش لە نێوان ئەو ئاسیاوەو دەرگای ماڵەکەمان بوو، لەبەر دەرگا دەوەستام سەیری ڕێبوارانم دەکرد، ڕۆژێکیان چەند سەربازێکی بیانیم دی گوتیان: ئەمانە ئینگلیزن، کە بەڕیزو بەرێکوپێکی و بەهەنگاوی سەربازانە ڕێیان دەکرد و گەڵای درەختیشیان هەڵگرتبوو، باوکم بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی بوو، جارناجار منی لەگەڵ خۆی دەربردە قوتابخانە، منیش لە ژووری ئەو دادەنیشتم، یاخۆم بەسەرەپاکەت یا بە وێنەکێشان خەریک دەکرد، یان بە کەیفی خۆم دەچوومە یەک

لە پۆلەکان و بێ ئەوەی هەراوهوریا بنێمەوە یاکەس ئازار بدەم لەسەر ڕەحلەیەک دادەنیشتم... هەر لەو تەمەنەشدا چێژێکی یەکجار زۆرم لەو سروودە کوردییانە وەردەگرت کە قوتابییان سەر لە بەیانییان دەیانچڕی، وەک: (وەتەنی من کوردستانە) یا (ئەی تۆپەکە فوتبۆڵەکە) یا (براینە بابچینە مەکتەب) یا (دنیای کەشف کرد ڤاسکۆ دی گاما) تاد..

ئەمە و ڕۆژێکیان کە دەرگای ماڵەوەمان کردوەوە چاوم بە گاڕانە ئاژەڵێکی فلامەرز کەوت، حەپەسام و زۆر ترسیام و بە پەلە دەرگـام کلیل داو هاوارم کـرد: «دێو.. دێو هات» دایکم بە دەنگمەوە هات و وایزانی من شێت بووم، کە دەرگای کردەوە تا بزانێ چییە، دەستی بە پێکەنین کردو گوتی: هەی ترسنۆک ئەمانە کەی دێون، ئەمانە گەلە حوشترن...! بەم جۆرە منداڵیم لە کفری لێواو لێوە لەو یادگارە شیرین و جوان و تاڵانە... چەند ساڵێ ئاوا بەمجۆرە، تا چووینە شارۆچکەی دووزخورماتوو، کە زێدی باوو باپیرانمە و چەندین خانووشمان لەوێدا هەبوو، هەر جارەی کە دەڕۆیشتینە شوێنێک و دەگەڕاینەوە لە یەکێک لەو سێ خانووانە ستارمان دەگرت. ئا لەم شارۆچکەیەی کە پاڵی داوەتە دۆڵی ڕووباری (ئاوەسپی) منداڵیم بە تەواوی گەشەی کردو تا ئێستاش ئەو ڕۆژانە خەونێکن لە نێوان نووستن و بێداری و لەبەرچاومدایە، هەر لەو ساتانەشدا بوو زانیم کە ناوی ڕاستەقینەی ئەو ڕووبارە پتر لە هەزار ساڵێک دەبێ، کە عوسمانییەکان هاتن ناوەکەیان گۆڕی بە (ئاق صو)ی تورکی، کەچی ناوە کۆنەکەی هەر وەک خۆی مایەوە، ئەو ڕووبارەی کە چەندین داستانی چارەنووسانەی لە دژی داگیرکەرە فارس و عوسمانی، هەروا ئینگلیزەکان دیوە، هەر لە منداڵیشمدا هەموو لەشم لەبەردەم مقامی (ئەڵڵاوەیسی)دا دەهاتە لەرزە، مامیشم زۆر شانازی بەوە دەکرد کە ئەو مقامە لەم دۆڵە هەڵقوڵاوەو ئەو کەسەی کە ئەم مقامەشی چڕیوە، خزمێکی خۆی بەناوی (خولەی ئۆمەر) بووە کە زۆر مقامبێژێکی ناودار بووە، سەیرە لەو ڕۆژانەدا خەڵک گۆرانیبێژ و شمشاڵژەن و دۆڵەنگیویان بە (لوتی) ناوزەد دەکرد، کەچی خولەی ئۆمەر جێگەی ڕێزلێنان بوو، بە پیاوێکی بەهرەدارو گەورەیان دەناسی، ئەم ناوەم لەبیر کردبوو تا ڕۆژێکیان لە دیدارێکی ئێزگەییدا هونەرمەندی گەورە (عەلی مەردان) گوتی: من یەکێک بووم لە قوتابییانی ئەو خولەی ئۆمەرە. ئا ئەو وەختە زانیم ئەو کەڵەپیاوە ئەو هونەرمەندەیە کە لە کانیی دۆڵی ڕووباری ئاوە سپی هەڵقوڵاوە، لە پاش ئەم قۆناغەی منداڵیم چاوم لەسەر گردو دۆڵی قۆرە توو و لە پاشان هۆرین و شێخان کرایەوە کە ڕووباری سیروانە شێتەو چیای بەمۆی سەرکەش لە باوەشیان گرتبوون، چونکە باوکم مامۆستا بوو لەوێوە گوێزرابووەوە بۆ



**مەحموود زامدار، د. زوهدی داوودی، ئازاد عەبدولواحید**

دەڤەری ئەترووش، تا ئەو ساتەش نەمدەزانی کوردستان مۆزاییکێکی ئەوەندە شیرین و جوانە، نەک هەر بە خەڵک و گۆرانییەکانی و بەس، بەڵکو بە سرووشتە دڵڕفێنەکەشی، ئا لەوێشدا ئاشنایەتیم لەگەڵ داربەڕوو و سەرو و سنەوبەر و چنار و دارە هەڵالووک پەیدا کرد، کە بە زستان بەفر هەموو شتێ دادەپۆشێ، هەر لەوێش گوێم بە (لاوک) زرینگایەوە، بەڵام (ئەڵڵاوەیسی)م لە بیر نەکرد، تا ئێستاش دەنگی خاڵە چچۆم لەنێو گوێچکەدایە کە شاخی بەروخ و سەرکەڤرێ ئەو دەنگەیان بە لاوکی (ئێرە قەسرا بابێ غەزالێ چەندە بلندا) دەساندەوە..

ئا ئەمە ڕەگوماکە کوردییەکەمە، کە هەموو دەمارو ماسوولکە و دڵ و دەروونی تەنیوەمەتەوە، ئەو ژینگەیەی کە ڕەگم بۆی درێژ دەبێتەوە و ناشتوانم هەست بە بوونی ڕاستەقینەی خۆم بکەم، مەگەر تەنیا بەهاران لەسەر گژوگیاکەی ڕاکشێم و هاوینانیش لەبەر سایەو سێبەری درەختەکانی بحەسێمەوە...!

**ڕامان:** ئەمەیان وا، بەڵام خۆ (گەرمیان) زێدی سەرەکیتە، ئەی ئەو شوێنەت چۆن لە ڕۆمانەکانتدا ڕەنگرێژ کردووە؟

**د. زوهدی داوودی:** ڕاستە... چونکە هەر لەوێدا چاوم بۆ ژیان هەڵێناوەو بەشێکی ڕۆژانی منداڵی و مێرد منداڵیم لەوێ بەسەر بردووە، هەر لەوێش خۆم و کەسوکاری خۆم و ناسنامەی کوردانەی خۆم دۆزییەوە، ئەوەشم بۆ ڕوون بووەوە کە خەڵکەکەی ئازاو مێرخاسن، داستانی ئەوان لە کفری و دژی ئینگلیز دیارو ئاشکرایە، هەروا بەرگرییان لە ئاوباریک و دەوروبەری دووزخورماتوو و کەرکووک دیارە، هەموویان چاوتێرو مەردو پیاوی ڕۆژی تەنگانەن و کوردی ڕەسەن و پاکن... هەر ئەو ناوچەیەش کاروانێک شەهیدی بەرێ کردووە، لەوانەش هەردوو برا مارف و حوسێن بەرزنجەیی، کە لەپاش کوودەتای (٨)ی شوباتی خوێناوی لە سێدارە دران... هەر لە هاوینی ساڵی (١٩٦٣)شدا بەم چاوانەی خۆم دیم کە

چۆن: دەبابەی بەعسییەکان گوندەکانی دەڕووخاند و قەڵاچۆی گیانی پیاو و ژن و منداڵانی دەکرد، لەگەڵ ئەوەش زۆر شۆڕشگێڕانە ڕووبەڕووی ئەو داگیرکەرانە بووەوەو کارێکی پێکردن با بە دەواری شڕی نەکردبێ... ناشبێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کە بەشی هەرە گەورەی (ئەنفال)ی بەدناو بەرگەرمیان کەوت...!

**ڕامان:** ئەی ئەکتەرو پاڵەوانی چیرۆک و ڕۆمانەکانت کێن؟ تۆ بۆ کێ دەنووسی؟

**د. زوهدی داوودی:** کەس و پاڵەوانانی چیرۆک و ڕۆمانەکانم ئەو مرۆڤ و جنۆکانەن کە لەسەر خاکی کوردستان دەژین، زۆربەیان ئەو کەسانەن کە لەمنەوە نزیکن یا لەبەر هەر هۆیەک ئاشنایەتیم لەگەڵیان پەیدا کردووە، بەتایبەتی ئەوانەی کە لەڕۆژانی منداڵی و مێرد منداڵیم خۆم بۆیان لە ڕوانگە نابوو، نەک تەنیا مرۆڤ و بەس، بەڵکو سێرەم لە یەک وێنەی سەرتاپاگیر دەگرت کە ئەو مرۆڤە و ناخی ناخەوەی، هەروا هزرو بۆچوون و خەونەکانی... شوێن و حاڵەتەکەی تێیدایە و پێوەندی ئەم وێنە بچووکەش بە وێنە گەورەو گشتییەکە. بە حوکمی ئەوەش کە من هەر لە منداڵییەوە متووی خوێندنەوە بووم، بۆیە هەندێ جار وا دەهاتە بەرچاوم کە بەڕاستی من لەنێو ڕۆماندا دەژیم، نەخاسمە کە لەپشووی هاویناندا دەچوومە لادێ و سەرم لەمامەکانم دەدا، هەر ئەو ساتانەش هیوام دەخواست ڕۆژێ لە ڕۆژان لە بارەی ئەم جیهانە سەیرەوە بنووسم، کەسانی ناو لادێکانی ئێمە لە دەرەوەی ڕۆژژمێری زەمەن دەژیان و ئەفسانە و واقیع و خەون و بێدارییان تێکەڵ بە یەکتر دەکرد، جیهانێکی بەرایی وا کە هەموو سادەو ساکاریی جیهانە بەراییەکانی لە تەک خۆی هەڵگرتووە. لەبیرمە جارێکیان لە لادێ بووم و لە ئەوپەڕی شادمانیدا بووم، یەکێک لە ئامۆزاکانم چوو بووە گوندێکی دی، دەشبوایە هەمان ڕۆژ بگەڕێتەوە، بەڵام نەگەڕایەوە و هەر ئەو شەوە زۆر شوێن گەڕان، بەڵام نەیاندۆزییەوە، کە ڕۆژی پاشتر هاتەوە زۆر نیگەران دیاربوو، کەلێشیان پرسی لەکوێ بووە، زۆر بەشێنەیی و بەو پەڕی ڕاستگۆییەوە گوتی: (بۆ ئاهەنگێکی بووک هێنانی خێوو جنۆکە بانگ کرابووم..!) لە پاشان زۆر بەتامووچێژەوە کەشوهەوای ئەو ئاهەنگەی گێڕایەوە، هەموو لایەکیش گوێچکەیان بۆ شل کردبوو، کەچی من حەپەسابووم، هەر ئەوساتە سەربردەکانی مامێکم هاتەوە یاد کە چۆن لەگەڵ دێوە زمەیەکی فلامەرزدا کەوتۆتە شەڕ و پێکدادان و زۆرانبازی. ئەم کاتە چوارده ساڵان بووم و هەمینگوای و گۆرکی و گۆگۆلم دەخوێندەوە، یەکەم و دووەمیان پەلیان دەکێشام بۆ ناو ژاوەژاوی شار، کەچی گۆگۆل بەتایبەتی لە ڕۆمانی (چەند بیرەوەرییەک لە نزیک گوندی دیکانکا)دا، نەک هەر بۆ لادێی پەلکیش دەکردم، بەڵکو بۆ ناو گوندەکانی مامەکانم ڕایدەپێچام، جا بڕوام بەو سەرگوزشتانە دەکرد یانا، ئەمەیان شتێکی تر بوو، بەڵام من بڕیارم دابوو کە ئەو شتانە بەشێکن لە ژیانی ئەو خەڵکانە. لەبیرمە جارێکیان کچێک لە کوڕێک، لە شارێکی ئەڵمانیادا ئامادەبوو، منیش چاپی ئەڵمانی ڕۆمانەکەی خۆم (أطول عام)م دەخوێندەوە بە تاسەوە لێی پرسیم: (تا ئێستاش ئەو خێوو جنۆکانە لە دۆڵی کەفران هەن؟) لە وەڵامدا گوتم: (بەڵێ لەگەڵ خەڵکی ئەو دۆڵە دەژین، ئەگەر ئەوان ئەنفال نەکرابن، بێگومان جنۆکەکانیش ماون و سەلامەتن!). بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەش کە بۆ کێ دەنووسم ئەوە بۆ مرۆڤ دەنووسم، هەر کەسێکیش خاسیەت و سیمای مرۆڤی هەڵنەگرتبێ، وا باشترە نووسینەکانی من نەخوێنێتەوە..!

**مێژوو هێمایەکی سەرەکی دەست نیشان کردنی ناسنامەی هەر گەلێکە**

**ڕامان:** لە ڕۆمانەکانتدا هەندێ وشەو ڕستەی تیژوو بڕندە هەیە، ئایا ئەم دیاردەیە ئاوەژووکردنەوەی ناختە، یا نوقلانە لێدانێکە بۆ دارمانی دەورووبەرەکەت؟

**د. زوهدی داوودی:** ئەو وشەو ڕستە تیژانەی جارناجار لە نێوان دێڕی ڕۆمانەکانم بەدەردەکەون، ڕەنگدانەوەیەکی دیالێکتیکانەی پێوەندیی شتەکانە لەنێو خۆیاندا، دارمانی دەوروبەریشم- وەک دەڵێن- بەندە بە هاوسۆزیی خۆمەوە، چۆن نا، گەر بە دوو چاوی خۆت ببینی ڕۆڵەکانی کورد یەکتری قڕو شەق و پیل دەکەن؟ من کە لەبارەی جیهانی کوردەوە دەنووسم، ناتوانم هەموو شتێ بەڕەنگی گوڵ ڕەنگ بکەم، چونکە وێنەکە کەموکورتیی تێدەکەوێ، بۆیە دەبێ دەردو نەخۆشییەکانی نێو کوردەواری فەرامۆش نەکەم. کۆنە زام و دوومەڵ و پفکەکان دەبێ بە خەنجەری دەبانی کوردی و بێ بەزەیی دەربدرێ، بەداخەوە کورد لەگەڵ یەکتری زۆر ناتەبان و دڵسەختن، بۆیە دەبێ ئەم دیارەو دابونەریتە پیسە بەسەختی لەناوبچێ.

**ڕامان:** تۆ لە کوێی شەپۆلە نوێکانی نێو جیهانی ڕۆماندایت؟

**د. زوهدی داوودی:** ئەم شەپۆل و پیلە ئەدەبیانە لە ئەنجامی بارێکی دیاریکراو دەردەکەون و زۆر هۆکاری زاتی و بابەتییانە، هەروا هۆکاری شوێنکات دەوری تێدا دەگێڕن، من خۆم لە کۆمەڵە چیرۆکی (الاعصار)دا کە لەساڵی (١٩٦٢)



د. زوهدی داوودی لەگەڵ خاتمە نووسەری ئەفریقایی «ئەلیزابێث نیابوکو»

بەچاپم گەیاند، ڕێبازێکی ریالیزمی هەبوو نەک ڕێبازێکی ڕەخنەگرانە، پێشم وایە ئەو ڕێبازەم ڕۆژ دوای ڕۆژ پەرەی سەندو خۆی لەنێو بۆتەی ریالیزمی سیحری و واقیعێکی تایبەتی و کوردستانیدا دۆزییەوە، واتە: لە واقیعی کۆمەڵایەتی و سروشت و ئەفسانەدا دەسووڕێتەوە، بۆیەش گەیشتمە ئەو ئەنجامە، تا مرۆڤی کورد لە هۆشی تایبەتی ئەفسانەیی چۆڵ نەکەم...!

**ڕامان:** ئەی ئەم قۆناغە پێداویستی بە چەندین چەشن و تایپ- نمط- چیرۆکنووسین نییە، تا باز بەسەر ئەم چەشن و تایپە باوانە بدات؟

**د. زوهدی داوودی:** ناکرێ چەشن و تایپ بە ڕواڵەتبازی دروست بکرێ، چونکە واقیع خۆی بەسەر نووسەردا دەسەپێنێ، ئەمەش مانای وانییە، مرۆڤی نووسەر سەرچڵ نەبێ و شتی تازە نەدا، من پێم وایە ئەم قۆناغە پێویستی بە نووسینێکە تا شۆڕبێتەوە نێو ناخی ناخەوەی مرۆڤی کوردو ژانوژوورو ئازارەکانییەوە، لە هەردووکارەساتی هەڵەبجەو ئەنفال-دا ون بوو، بێ ئەوەی گوتارێکی ڕۆمانامێز ببێ بە دروشمێکی ڕووکەشانەی سیاسی و بەس، پێم وایە ئێمە پێویستیمان بە چەشنە ڕۆمانێکی پڕ لە زاتوزاوەرو ئازایانە هەیە تا گیانی شەهیدان بە کاروانێکی درێژەوە زیندوو بکەوەو بئاڵێتە ملی ئەوانەی نایانەوێ دان بە مافی نەتەوەی کورددا بنێن تا چارەنووسی خۆی دیاربکات!

**ڕامان:** ئەی چۆن نەخشەی ئەو پاڵەوان و کەسانەی نێو ڕۆمانەکانت دەکێشی؟

**د. زوهدی داوودی:** ئەو کەس و پاڵەوانانە هەر لە منداڵی و مێردمنداڵییەوە لەناو هەست و نەست و زەینم-دان، واش نییە من هەڵیانبژێرم، بەڵکو خۆیان خۆیان بەسەرمدا دەسەپێنن.. ئەو کەسانە چەندین کەسایەتیی سلبی یا ئیجابین، ئازاو مەردن یا سەرشۆڕو نامەرد، ڕۆشنبیرن یا دزو ـشـەخـۆر...تاد. ئەو کەسانە کەسانی زیندوون و لەنێو بۆشایی بادا مەلەناکەن، خاوەنی کێشەی دیاریکراوی خۆیانن، هەن کەسی سەرەکین هەشن لە پەراوێزدان، بەڵام هەر هەموویان تەواوکەری یەکترین، کاتێک کە یەک لەو کەسانە ڕووناکی دەبینێ و دەور دەگێڕن یان دەوریان کۆتایی دێ، بەڵام لەنێو هەست و هۆش وزەینی من هەر دەمێنێتەوە، مەگەر ناڵێم یەکجارەکی دەوری نەمێنێ، واش دەبێ لە شوێنێکی تر سەرهەڵدەداتەوە، بەڵام لەشێوەو دەورێکی تازەدا، ئەویش لەبەر تیۆری (دۆناو دۆن بوون)دا.. بۆ نەخشە و وێنەکێشانی کەسەکانیش، من زۆر بایەخ بە دەرەوە نادەم، بەڵکو شۆڕ دەبمەوە نێو ناخییەوە، تا بتوانم بە تەواوی وێنەکەی بکێشم..!

**ڕامان:** ئەی بەڕای تۆ خوڵقاندنی خەوبینین و ڕوئیای ئەفراندن کارێکی ئاسانە؟ خۆت لەم بارەیەوە چیت پێیەو چی دەکەی؟

**د. زوهدی داوودی:** نەخێر ئاسان نییە و زۆریش قورس و گرانە، چونکە نەنووسەر نە شاعیر ناتوانێ هەر کاتێ ویستی کاری داهێنەرانەی خۆی ئەنجام بدا، تەنیا خواست و ئارەزووش بۆ ئەم کارە قورسە بەس نییە، چونکە ژانو ژوورێکی زۆر چڕو ئاڵۆزە و هەوێنێکە سەبرێکی زۆری دەوێ تا لەنێو سۆز و مێشک و هەستی داهێنەردا چڕۆ دەرکا... سەبارەت بەخۆشم بە هیچ شێوەیەک بڕیاری نووسینێک نادەم هەر لەبەر ئەوەی گەرەکمە چیرۆکێک بەرهەم بێنم، بەڵکو ئەو کەرەستەیەی کە لە ئامێژەن بووندایە لەنێو مێشکم ئەو بڕیارە دەدا کەی و چۆن بیهێنمە بەر دنیای ڕووناکی، ئا ئەو کاتە بمەوێ و نەمەوێ، دەبێ ملکەچی ئەو بڕیارەبم...!

**ڕامان:** ئەی لەگەڵ زمان چۆن ساتوسەوا دەکەی؟ چ وەک تێگەیشتن و چ وەک بەکارخستنی ئەو زمانە؟

**د. زوهدی داوودی:** زمان لەلای من وەک ڕەنگە لە لای نیگارکێش، چونکە لەڕێی ئەوەوە کەرەستەی داهێنەرانەی نێو جیهانی ناوەوە دێتە دەرەوە، ئەمیش بە گەلێ ڕوخسارو چەشن و شێوە وەک: کارێکی داهێنەرانەی سەر کاغەز، یا تابلۆیەکی ڕەنگین، یا هێڵکارییەک بە خامەی ڕەش، یا فیلمێکی سینەمایی، یان پارچە مۆسیقایەک... تاد، سەبارەت بە خۆشم، ئەوە چەشنی کەرەستەو بابەتەکە بڕیار لەسەر زمانەکەم دەدا، بەڵام چونکە هەر لە پۆلی یەکەمی سەرەتاییەوە بە عەرەبیم خوێندووە و لە پاشاندا بەشێوەیەکی ئەکادیمییانە لێی تێگەیشتووم، بۆیە بە عەرەبی دەنووسم، بەڵام کە لە بارەی لایەنێکی ژیانی کوردەواری دەنووسم، ئەوە بە کوردی بیردەکەمەوەو وەریدەگێڕمە سەر زمانی عەرەبی.. لە زۆر کەسیشم بیستووە گوتوویانە: کە ئەوان بەرهەمەکانی من دەخوێننەوە، هەست ناکەن بە عەرەبی دەیخوێننەوە، بەڵکو بە کوردی و هزرێکی کوردی...!

**ڕامان:** دیارترین ڕۆمانووسێک بەردەوام - عیراقی بێ یا

جیهانی- دەیانخوێنیتەوە؟

**د. زوهدی داوودی:** جاران زۆرم دەخوێندەوە، هەموو ڕۆمانووسێکیشم لە ئەوەی تر بە کەمتر یا بە زۆرتر هەڵنەدەگرت. ئێستاش کە دەخوێنمەوە دەبێ ئەو ڕۆمانە تەواو ڕامکێشێ و بمتاسێنێ، ئەگینا دەیخەمە لاوە، گەر بشمەوێ بەخوێندنەوەیەکی ڕەخنەگرانەوە ئەو ڕۆمانە بخوێنمەوە، ئەوە بە جۆرێکی تر دەیخوێنمەوە، تا لایەنی هێزو لایەنی لاوازی تێدا بدۆزمەوە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە خوێندنەوەی ڕێکوپێک پێداویستی بەوەختە، دەسخستنی وەختیش خۆی لە خۆیدا کێشەیەکی ترە....!

**ڕامان:** دیاردەی شوێن یا بەهەشتە خەواڵووەکەت - وەک ڕۆمانووسێک- لەنێوان تۆو مارکیز و نەجیب مەحفووزدا؟ ئەمەیان چۆن؟

**د. زوهدی داوودی:** جوانە زۆر جوانە دەستەواژەی (شوێن یا بەهەشتە خەواڵووەکە)... لەزۆر خوێنەری کوردو هەندێ برادەری عەرەب و ئەڵمانم بیستووە کە: من لە نیگارکێشانی ئەو شوێن و بەهەشتە خەواڵووەدا زۆر سەرکەوتوو بووم، هەندێ برادەر ئەو سەرکەوتنەم بۆ ژان و غەمی غەریبایەتی و دووره وڵاتی دەگەڕێننەوە، جیاوازیی نێوان جیهانی من لە (دۆڵی کەفران) و هەردوو جیهانی (ماکۆندۆ) و (زقاق المدق) ئەوەیە کە: مارکیز لە هەموو شوێنێکی ئەمریکای لاتین و ئەوروپا خوێنەری هەیە، مەحفووزیش کە پتر لە (٧٠) ساڵە دەنووسێ، خوێنەری خۆی لە میسرو لە گشت وڵاتە عەرەبییەکاندا هەیە و هەردوو کیشیان پتر لە دەوڵەتێک هاریکارییان دەکەن، بۆیە نووسەرێکی وەک زوهدی داوودی ناتوانێ خۆی لەبەردەمیان ڕاگرێ، بەڵام سەرەڕای ئەوەش (دۆڵی کەفران) حاڵەتێکی دانسقەو دەگمەنی کوردییە. هەندێ لە ڕەخنەگرانی کورد دەڵێن: کوردی نییە. هەندێکی تر لە ڕەخنەگرانی عەرەب دەڵێن: عەرەبی نییە، لە هەردوو حاڵەتیشدا ئەو دۆڵە- ڕۆمانەکە- وەک گەلی کورد وایە و کەس نییە بیپارێزێ...! لێرەدا پرسیارێک خۆی قوت دەکاتەوە: بۆ کێ دەنووسین؟ کوا ئەو خوێنەرانەی ڕۆمانی ئێمە دەکڕن و دەیخوێننەوە؟ ئەی کوا ئەو دەزگایانەی کە پشتگیریمان لێدەکەن؟

**ڕامان:** ئەی هەردوو موعادەلەی (شوێن- کات) لە ڕۆمان و چیرۆکدا چۆن خۆیان دەنوێنن؟

**د. زوهدی داوودی:** (شوێن لە بارەی فەلسەفییەوە دوو خاسیەتی سەرەکی هەیە:

یەکەمیان: شتێکی موتڵەق و ڕەها نییە و نسبییە، دووەمیان: شوێن بوونی زەمەن و پێوانەکانی دیاری دەکا، بەم پێیەش (شوێن- کات) دوو شتن و بە یەکەوە بەندن و لە یەک دانابڕێن، بەم چەشنەو بەو چەمکە ئێمە ناتوانین ڕۆمانێ بنووسین شوێن و کاتی تێدا نەبێ، باپشتیش بە لا مەعقوول و ئەبستراکتی موتڵەقیش ببەستین، چونکە بەم دووانەوە دەتوانین ئاوێزانی ئەم ئەستێرەیە و ڕۆژژمێرە زەمەنییەکەی بین...!

**ڕامان:** باشە.... ئەی چۆن درامای نێو چیرۆکی درێژو کورتە چیرۆکی زۆر کورت لێک دەدەیتەوە؟

**د. زوهدی داوودی:** دراما بەندە بە شانۆوە، بەتایبەتیش بە شانۆی کلاسیکییەوە. سەبارەت بە چەمکی هاوچەرخانەی ئەم وشەیەش چ لە ڕۆمان و چ لە چیرۆکدا، مانای بوونی (گرێیەک) دەگەیەنێ کە ڕووداوە جۆراو جۆرەکانی تێدا خول دەخواو گەشە دەکاو سەردەکەوێ، تا دەگاتە مەرگی پاڵەوانەکە و ژیان و سەرکەوتنی. باشترین نموونەش بۆ ئەم پرسیارو بوارە: ئەو گرێیەیە کە لە ڕۆمانی (تاوان و سزا)ی دیستۆیڤسکی-دا هاوشانی ڕاسکۆلینکۆفە تا کوشتنی ژنە سەرئاسنینەکە. مەرجیش نییە لە ڕۆمانی نوێدا پشت بە شێوەبەندی درامایی ببەستێ..

**ڕامان:** لە کولتووری کوردیماندا (چیرۆکی ئەفسانە ئامێز- چیرۆکی خورافە ئامێز- چیرۆکی سەربردە- چیرۆکی دانسقە) هەیە، باشە... چیروکنووسی ئەمڕۆی کورد چۆن دەتوانێ لەبەرهەمەکانیدا سوودیان لێوەربگرێ؟

**د. زوهدی داوودی:** هەموو ئەم چەشنانە من لەخانەی چیرۆکی ئەفسانەییان دادەنێم، ئەفسانەش ئەو پێوانەیە کە هێزو لاوازیی گەلێک لە بواری شارستانیدا دەستنیشان دەکا. بەڕای من ئەو گەلەی ئەفسانەی نەبێ، شارستانییەتی نییە. هەر لە دێرینەوەش ئەفسانە خۆراک و دڵ نەوازکەری گەلی کورد بووە لە حەشارگەی نێو شاخە سەرکەشەکانی، کە چەندین ئیمپراتۆرییەتی بەهێزی وەک: فارسی و ئاشووری و بابلی و بیزەنتی دەورەیان دابوو، بەڵام بێ ئەوەی بتوانن ئەو گەلە بەرزەفت بکەن و بیتاوێننەوە، بەڕەنگێکی وا گەلی کورد لەلای ئەواندا بوو بە ئەفسانەیەکی سەربەخۆ، بۆیە بە ئەهریمەنەکانی چیا و ئەرژەنگەکانی نێو ئەشکەوت و نەوەزای ئەو جنۆکانەی کەشوویان بە سەربازەکانی مەلیک سولەیمان کرد، ناوزەدیان کردووە...! سوود وەرگرتنیش لە ئەفسانە چ بۆ ڕۆمان و چ بۆ چیرۆک، پرۆسەیەکی زۆر قورس و

**هەندێ ڕەخنە وەک تەور داهێنان دادەپاچێ**

ئالۆزە، گەر بە کارامەیی و وردبینییەوە بەکارنەهێنرێ، ئەوە زیان بە ئەفسانەکە و بە چیرۆکەکە یا ڕۆمانەکە دەگەیەنێ، پێم وایە دەبێ بۆ ئەم مەبەستە بەوردی ئەدەبیاتی جیهانی بخوێنینەوە کە زۆر وردەکارانە: ڕۆمان و ئەفسانەی لەیەک گرێداوەو بنەمای ڕیالیزمی سیحرامێزی بۆ هەڵخستووە..!

**ڕامان:** ئەنفال وەک پرۆژەیەکی گەورە لەلای تۆدا چۆن دەکەوێتەوە؟

**د.زوهدی داوودی:** تاوانی ئەنفالی بەدناو، خۆی لەخۆیدا بەڵگەنامەیەکی گوناهکارانەی بەردەوامە بۆ ئەوانەی ئەنجامیان دا، بەڵام مخابن بزووتنەوەی کورد بەهەموو بەشەکانییەوە، بەهەموو دەسبالآیی وتواناپانەوە، تا ئێستا نەیانتوانیوە ئەم کێشە جگەربڕە لەبەردەم ڕای گشتیی جیهانی ڕووت بکەنەوە یا بیانگەیەنن. سەبارەت بە خۆشم ئەوە بەشێکی گەورەی لە ڕووداوەکانی ڕۆمانی سێیەمم (التحول) کە تەواوکەری ڕووداوەکانی (اطول عام) و (زمن الهروب)ە، لە دۆڵی کەفرانی چیا ڕوودەدەن، کە ئەو ئەنفالە لەبن و بۆتەکەوە هەڵیقەندو خاشەبڕی کرد، تائێستاش بەدوای شێوازێکی تازەدا وێڵم، تا بتوانم بەشێوەیەکی داهێنەرانە ئەو ئەنفالە هەڵبخەم، بەڵام دوور لە گوتاری ڕووکەشانەی سیاسی..خۆ دەشبێ بۆ ئەم کارە قورسە هەندێ شوێنی گەرمیان بگەڕێم کە بەندیوارییەکی ڕاستەوخۆی بەتاوانی ئەنفالەوە هەیە.

**ڕامان:** (چیرۆکی وتارامێز- بلیتەچیرۆک- چیرۆکی وێنە- چیرۆکی بەڵگەنامەیی) زیاتر بۆ کامیان لاردەبیتەوە؟

**د.زوهدی داوودی:** بۆ ئەو فۆرمەی کە بابەتەکە خۆی بەسەرمدا دەسەپێنێ.

**ڕامان:** بیرکردنەوە بەزمانی (عەرەبی- فارسی- تورکی- ئینگلیزی- ئەڵەمانی-ڕووسی -تاد) ڕۆشنبیری کورد دەخاتە دەرەوەی بازنەی ڕۆشنبیریی کوردی و کەتەگۆریای خۆیشی لەسەر دەسەپێنێ؟ ئەی خۆت نیازت نییە بەزمانی زگماک بەرهەمەکانت بنووسیتەوە؟

**د.زوهدی داوودی:** ئەگەر ڕووناکبیری کورد ڕەسەن بێ، ئەوە ئەو تێڕوانین و کەتەگۆریای خۆی بەسەر خەڵکانی تر دەسەپێنێ. هەربۆ نموونە: کتێبەکەی خۆم (کوردەکان) کە بەزمانی ئەڵەمانی نوسیمەوەو دووچاپیشی لەساڵانی (١٩٨٧-١٩٨٨)ی لێ چاپ کراو هەرهەموو ڕۆژنامەکانی ئەو وڵاتەش لەسەریان نووسی و لەپاشا کرایە تورکی و لە ئەستەموول چاپ و بلاوکرایەوە، هەرچەندەش لە تورکیا دەستی بەسەردا گیرا، بەڵام خۆی بەسەر بازاڕی کتێبدا سەپاند، ئایا ئەم جۆرەکارە هیچ لایەنێکی سلبییانەی هەیە؟ من وەک نوسەرێک خاوەنی کێشەیەکی نەتەوەییم و وڵات و نەتەوەکەم وەک وڵات و نەتەوەکانی دیکە نییەو چەوساوەو



د. زوهدی داوودی، زاویتە، بەهاری ساڵی (١٩٩٤)

بێبەشە، بۆیە ڕێگا بەخۆم دەدەم بەهەر زمانێک بێ، ئەو دەنگ و کێشەیەم بگەیەنە جیهان. سەبارەت بەزمانی زگماکیش، ئەگەر بوارم بۆ ڕەخسا ئەوە پێی دەنووسم. هەر لێرەشەوە داوا لە دەزگا ڕۆشنبیرییە کوردییەکان دەکەم هاریکاریی ئەو نووسەرە کوردانە بکەن، تا دەسنووسەکانیان ڕووناکی ببینێ.

**ڕامان:** دەڵێن: چاخی شیعر بەسەرچوو، ئێستا چاخی سەرهەڵدانی ڕۆمانە ئەی بۆچوونی تۆ؟

**د.زوهدی داوودی:** ئەم قسەوبۆچوونە لە ئەورووپاش هەیە، وادیارە ڕاستیش بێ، چونکە دەزگاکانی چاپ وبلاوکردنەوە دیوانە شیعر ڕەت دەکەنەوەو چاپی ناکەن، چونکە چاکترین دیوانە شیعری چاکترین شاعیر لە (٥٠٠)دانە لە شوێنێکی وەک ئەڵەمانیا ناڕوا و ناخوا. دیارە (Tv)و ڤیدیۆش دەورێکی بەرچاو لەم ڕووخاندنەی شیعر دەگێڕن، چونکە شیعر پێویستی بە خوێنەرێکی هەست ناسک و زۆر ڕووناکبیر هەیە. بەداخەوە زۆربەی ئەوانەی لەبەرنامەی جۆراوجۆری تەلەفزیۆنی جاڕس و بێزار دەبن، کتێبی سووک و بێ نرخ دەخوێننەوە، کە بەدەیان هەزار دانەی لێ چاپ دەکرێ، لەم حاڵەتەشدا کاری داهێنەرانە ون دەبێ. ئەم کێشەیە کێشەیەکی سەرتاپاگیری جیهانییە، چونکە کتێب بووە بە کووتاڵێک و بەس، بازاڕیش دەسنیشانی سەرکەوتنی ئەم نووسەرو ئەو نووسەرە دەکا، بەڵام لەپاڵ ئەوەش بەهیچ کلۆجێ لایەنی ڕووناکی کاری داهێنەرانە، بەڕەنگی ڕەش، ڕەنگ ناکرێ..!

**ڕامان:** ئەی دەوری ئافرەت و منداڵ لەنێو دەقی ڕۆمانەکانتدا لە کوێن؟

**د.زوهدی داوودی:** لە سەرلەبەری ڕۆمانەکانمدا ئافرەت و منداڵ دەوری سەرەکی دەبینن، بەیەک خوێندنەوە ئەوەتان بۆ ڕوون دەبێتەوە..بەڕای من ڕۆمانێک بەبێ ئافرەت و منداڵ، لە بنەماڵەیەک دەکا کە هەموویان پیاوبن، دیارە ئەم جۆرە



عەبدوڵڵا زەنگەنە، مەحمورد زامدار، د. زوهدی داوودی

بنەماڵەیە هەربوونی نییە، مەگەر ناڵێم لەو کۆمەڵگایانەی کە لە سێکسدا گومڕان و یەکتری مارە دەکەن، لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزم بۆیان..!

**ڕامـــان:** پاڵەوانەکانت وەک تۆ سازش لەگەڵ سێکس دەکەن؟ ئەی خۆشەویستی سێکس پەلکێش دەکا یا بە پێچەوانەوە؟

**د.زوهـدی داوودی:** پاڵەوانەکانی من مرۆڤن و هەرکەسەر بەشێوازی خۆی ئەو سێکس و ئەڤینە ئەنجام دەدا..ئەگەریش دەستیان نەکەوت ڕوو دەکەنە گەلێ ڕێگای نهێنی..منیش لە نووسینەکانمدا خۆم ناکەمە پێوانەیەک بۆ ڕەفتارو کرداری پاڵەوانەکانم، پێشم وایە چ سێکس و چ ئەڤین ئەم ئەو ڕادەکێشێ و ئەویش ئەم. لە کوردستانی ئێمەشدا خۆشەویستی زۆر بەهێزەو لەزۆر شوێنیشدا چاو لە خۆشەویست و دڵدارو دڵبەران دەپۆشرێ و دانیش بە شووکردن دەهێنرێ، بێ ئەوەی خوێنی پاک بڕێژرێ..!

**ڕامان:** ئەی ژیانی مێژوونووس خۆی مێژوونییە؟

**د.زوهـدی داوودی:** مێژووی هەر مرۆڤێک خۆی لەخۆیدا مێژووە، بەڵام ئەم مەسەلەیە لە یەکێکەوە تا یەکێکی تر دەگۆڕێ و بەمەش هەموو کەسێک لە پرۆسەی دروستکردنی مێژوودا بەشدارن..لێرەدا پرسیارێک خۆی ڕەپێش دەکا ئەویش: (مێژوو چییە؟) وەڵامەکەشی وادەکەوێتەوە: ئەوەی ئەمڕۆ بە سیاسەتی تێدەگەین سبەی دەبێ بە مێژوو، بەڵام نەک تەنیا مێژووی (دبلۆماسیزم)و پێوەندیی نێو دەوڵەتان و ڕووداوو جەنگ و شەڕوشۆڕو بەس، چونکە مێژوو ڕەشماڵێکە هەرهەموو چالاکیی مرۆڤ لە ڕۆژی سەرهەڵدانییەوە تا ئەمڕۆ لەباوەش دەگرێ و دایدەپۆشێ.

**ڕامـان:** ئەی دەکرێ باسی توخمە بنەڕەتییەکانی مێژووی کورد بکەی؟

**د.زوهـــدی داوودی:** بەڕاستی زانینێکی تەواومان لەم بارەیەوە بەدەست نییە، ئەگەر بشڵێین هەیە ئەوە بەدەستی خۆمان خۆمان دەکوژین. ئەو ڕەگەزو توخمانەش پێم وایە بەمجۆرەیە:

١- ڕابردووی باوەڕپێکراو کە بۆ ساڵی (٢١٥٠)ی بەر لە زایین دەگەڕێتەوە، لەیەک لەستوونە بەردینەکانی سۆمەری-دا ناوی بە (وڵاتی کوردا) هاتووەو ئێستا لە مۆزەخانەی لۆڤەری پاریس-دایە.

٢- قۆناغی بەرلەو قۆناغەی باسمان کرد، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ کۆنترین گوند لەسەرلەبەری دنیاداو ساڵی (١٩٧٣) لە (یارم تەپە)ی نزیک تلەعفەر دۆزاوەتەوەو تەمەنیشی (١٠) هەزار ساڵە.

٣- لە قۆناغی (یارم تەپە)وە بۆ چاخەکانی نیاندرتاڵی ئەشکەفتی شانەدەر و ئەشکەفتەکانی دیکە.

٤- قۆناغی نێوان ئیمپراتۆریەتی میدیا (٦١٢ پ.ز)و (١٥٥٠ پ.ز) کە قۆناغێکی تاریکەو پێویستی بەکاری ئارکیۆلۆژی هەیە.

٥- قۆناغی ڕووخانی ئیمراتۆریەتی میدیا تا بوونی کورد بە موسڵمان.

٦- لە بوونە موسڵمانەوە، تا دابەشکردنی یەکەمی کوردستان لە چاڵدێران (١٥١٤) تا دابەشکردنی دووەمی لە (پەیمانی سایکس پیکۆ- ١٩١٦).

٧- ئەو خاکە هاوبەشەی کە هەمووومان سنوورەکەی دەزانین.

٨- زمانی هاوبەش.

٩- شارستانی، دابونەریت و سایکۆلۆژییەتی هاوبەش. من پێم وایە ئەم خاڵانە بەشێکن لە (کرۆنۆلۆژیا)ی ئەو ڕەگەزو توخمانەی کە مێژووی کورد پێڕست دەکەن. هەروا نابێ ئەوەش لەبیر بکرێ کە شوێنەوارەکان باشترین بەڵگەو شایەدی مێژووی ئەم گەلەن، بەڵام بەداخەوە لەژێر دەستی گەلی کوردا نییەو هەر شتێکیش لەم بابەت و بوارەدا



بدۆزرێتەوە یەکسەر بۆ مۆزەخانەی ئەو دەوڵەتانەی دەبەن کە کوردستانیان دابەش کردووە. لەبیرمە ساڵی (١٩٧٣) راپۆرتێکی درێژم لەبارەی کاری ئارکیۆلۆژیستیی ناوچەی (یارم تەپە)م لە ڕۆژنامەی (التآخی) بلاوکردەوەو پێشنیارێکیشم دا بە کاک سامی عەبدولڕەحمان و کاک دارا تۆفیق تا هەرچی زووە کارێک بۆ دامەزراندنی مۆزەخانەیەکی مەرکەزی لە کوردستان بکەن..مێژوو یەک لە هێما هەرە سەرەکییەکانە بۆ دەستنیشان کردنی ناسنامەی هەرگەلێک، گەلی ئێمەی کوردیش خاوەن مێژوویەکی چڕوپڕو ڕازاوەیە، بەلام بەداخەوە بەشی هەرەزۆری ئەو مێژووە هێشتا لەژێر خاکدا نێژراوە..!

**ڕامان:** ئەی خاسیەتی مێژوونووسی باش لە چیدا دەبینی؟

**د.زوهدی داوودی:** لە دلازایی و ڕاستگۆیی و گیانی زانستییانەو خۆشویستنی ڕاستی.

**ڕامان:** ئەی ڕات لەبارەی (پاڵەوان لە مێژوودا)؟ بەتایبەتیش ئەو پاڵەوانە قارەمانەی کە لە ساتە تەنگانەکاندا دەورێکی دیاری لە ئاراستەکردنی ڕووداوی مێژووی دیوە؟

**د.زوهدی داوودی:** پێم وایە مەرج نییە، پاڵەوان هەر سیاسی بێ یا سەرکردەیەکی سەربازی، بەڵکو زۆر هونەرمەندو بلیمەت و داهێنەرو فەیلەسووفی وا هەیە، هەریەکەو لەبواری پسپۆریی خۆدا پاڵەوانە: ئەوە ئەرستۆ و ئەوە مایکل ئەنگیلۆو ئەوە شکسپیرو تاد...دیارە گرنگیی پاڵەوانیش لەوەوە هاتووە کە: لەساتی تەنگانەدا گوێی بۆ هاوارو بانگی گەلەکەی شل کردووەو بۆتە نوێنەری هیواو ئاواتەکانی ئەو گەلەو بیری لەبەرژەوەندیی تەسکی خۆی نەکردۆتەوە، سپارتاکۆس و گیڤارا، وەک دوو پاڵەوانی قارەمان سەریان نایەوە، بێ ئەوەی بگەنە ئامانجەکانیان..بەڵێ: پاڵەوانی ڕاستەقینە ویژدانی نەتەوەیە، سەرکردەی ڕاستەقینەش ئەو کەسەیە گوێ لەدەنگی ئەو ویژدانە دەگرێ..!

**ڕامان:** ئایا تۆ لەگەڵ ئەو تانەوتەشەرانەدای کە بەر پرەنسیپ و بزووتنەوەی خوڕەمی کەوتووە؟

**د.زوهدی داوودی:** نەخێر..نەخێر..بزووتنەوەی خوڕەمی بزاڤێکی شۆڕشگێرانە بوو، بەوپەڕی لە خۆبوردنەوە بەرەنگاری دەوڵەتی ستەمکاری عەباسی بووەوە..!

**ڕامان:** پێت وایە ڕەخنەگرەکان تەمەڵ و دابڕاو بن؟ ئەی ئەوان بە ئینسافەوە لەکارو بەرهەمەکانی تۆ دوواون؟

**د.زوهدی داوودی:** نەخێر من بە تەمەڵ و دابڕاویان نازانم، بەلام ئەوەی دەیزانم ئەوەیە کە: نابێ ڕەخنەگر تەمەڵ و دابڕاوبێ، بەڵکو دەبێ زۆر بخوێنێتەوەو ئینسکلۆپیدیایەکی گەورەی زانیاریش بێ و ئاگای لە قوتابخانە ئەدەبییەکان بێ و هەروا هەستی ناسک بێ..بەڵێ: هەندێ لە ڕەخنەگران بە ئینسافەوە لێم دوواون، هەندێکی تر فەرامۆشیان کردووم، دوور نییە لەبەر تەمەڵی و هەڵوێست وەرگرتن بووبێ..!

**ڕامان:** ئەی چی بە ڕەخنەگری سەلەفی دەڵێی؟ کە کۆنەپەرستانە لەبەردەم دەقی نوێخوازانەی چیرۆک و ڕۆمان دەوەستێ؟

**د.زوهدی داوودی:** ڕەخنەگری سەلەفی ناوی خۆی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووەو سەلەفییە، بۆچوونەکانی ئەو جۆرە ڕەخنەگرانەش ناچێتە خانەی ڕەخنەوە، بەڵکو تەورێکەو ئەنفراندن دادەپاچێ، نووسەری داهێنەریش نابێ ئەو بۆچوونە پووچانە بیهەژێنێ..دیارە کارو دیاردەکەش ململانێیەکی بەردەوامی نێوان کۆن و نوێیە. هەر گاڤێکیش نوێخوازی پێشکەوتووخواز لەبەردەم کۆنەخوازی دواکەوتوو پاشەکشەی کرد، ئەوە ئەو کۆنەخوازە دەسبەسەر هەموو شتێ دادەگرێت..!

**ڕامان:** وەرگێڕان..چۆنی سەیر دەکەی؟ ئەی وەرگێڕی باش و دەسپاک کێیە؟ ئەی خۆت لەبارەی ئەم بابەتە چیت کردووە- بەتایبەتی بە ئەڵمانی- تا بکرێ بە کوردی؟

**د.زوهدی داوودی:** وەرگێڕان پرۆسەیەکی یەکجار قورس و گرانە، بەلام زۆر زۆریش پێویستە، چونکە ئەگەر وەرگێڕان نەبێ کولتوورو شارستانییەتەکان بەیەک ناگەن و تێکەڵ نابن. دیارە وەرگێری دەسپاک و دەسبالاش ئەو کەسەیە کە لە نهێنیی هەردوو زمانەکە تێدەگا و تەنیا دەق وەرناگێڕێ، بەڵکو هەست و نەستی دەقنووسەکە وەردەگێڕێ، لەم بارەیەوەش من بەش بەحاڵی خۆم کتێبی (کوردەکان- مێژوو- شارستانی- خەباتی چارەنووسانە)و هەروا (أطول عام) بە چاکی دەزانم بکرێنە کوردی.

**ڕامان:** ئایا ئەم کوردەوارییە شایانی ئەوەیە ئەدەبێکی مەزن بەرهەم بێنێ؟

**د.زوهدی داوودی:** شایانەو زۆریش..ئەی بۆنا..!

**ڕامان:** ئەی چیت لە (گرووپی ئەدەبیی کەرکوک) لە



بیرماوە؟ ئایا ئەوان بە ئینسافانە لەو گرووپە دوواون؟ ئەی کاریگەریی ئەو گرووپە بەسەر بەیاننامەو گۆڤاری (٦٩)ی بەغدایی چەندو چی بوو؟

**د.زوهـدی داوودی:** ئەوەی لەبارەی ئەو گرووپەوە لەبیرم مابێ زۆر زۆرە، بەڵام ناکرێ بەدوورو درێژی باسی لێوە بکەم. ئەوەی گرنگە هەردوای نوشوستی دواساڵانی پەنجایەکان و سەرەتای شەستەکان، ئەو گرووپە کەوتە بەرشاڵاوی ڕژێمەوە، ئەوە بوو بڵاوەی لێکراو بەشێک چوونە بەغدا و ڕوویان لە خوێندن کردو هەندێکی تر لە دەوروبەری کەرکووک بوون بە مامۆستا، من لە گوندی(مامە)ی نێوان کەرکووک و دووبز دامەزرام، لەوێ مامەوە تا کۆوودەتای شوباتی ساڵی (١٩٦٣)و هەرلەوێش کۆمەڵە چیرۆکی (الاعصار)م نووسییەوەو نوقڵانەشم تێدا جاردا بە ڕووخانی دەسەڵاتی قاسم و هاتنی دەسەڵاتی بەعس. لەبیرمە دانەیەکم پێشکەشی عەبدولکەریم قاسم کردو ئاگاداریشم کردەوە کە باهۆزێکی ڕەش هەڵدەکاو هەرهەموو عیراق دەتەنێتەو دەیکا بە کێڵگەیەکی خوێن. سەیر لەوەدابوو، وەڵامەکەی قاسم هەر ئەوە بوو، یەک دەستە لە گوتارەکانی خۆی و کۆمەڵە وێنەیەکی خۆی و سوپاسنامەیەک لە سکرتێری ڕۆژنامەنووسیی ئەوەوە پێم گەیشت. لەپاش کوودەتاکە، زۆربەی گرووپەکە دەسگیرکران، بەڵام من دەرباز بووم و چوومە چیاو پاڵ پێشمەرگە، تا لە تەمووزی (١٩٦٤) لە دووزخورماتوو خانە بگیرکرام و گیرام و یەکسەر ڕەوانەی کەرکووک کرام و بۆ دوو ساڵ لە بەندیخانەکانی باقووبەو ڕومادی و حیلله مامەوە. لە پاشان لە ساڵی (١٩٦٧) لە عیراق لە ڕێی کوێتەوە دەرچووم و خۆم گەیاندە ئەڵەمانیای دیموکراتی-ی ئەوسا، بێگومانیش ئەو گرووپەی لە بەغدا مانەوە: (ئەنوەر- فازیل- موئەیەد) کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر بەیاننامەو گۆڤاری (٦٩) هەبوو، بەڵام بەداخەوە من



د. زوهدی داوودی، فازڵ عەزاوی، فریاد فازڵ - (٢٠٠٠)

دوور بووم و ئەوەندەش شوێن پێی شیعر نەکەوتبووم..!

**ڕامـان:** ئەی لەبارەی نەخشەی ڕۆشنبیری و ئەدەبی کوردی چیت پێیە؟

**د.زوهدی داوودی:** بەداخەوە شوێن پێ کەوتنم لەم بارەیەوە لاوازەو ئەویش، چونکە بەرهەم و گۆڤارەکانمان پێناگا، دیارە سەرباری ئابڵووقەی ئابووری لەسەر کوردستان، ئابڵووقەیەکی کوشندەی ڕۆشنبیریشی لەسەرە، بەهەرحاڵ ئەمجارەیان کە گەیشتمە کوردستان، هەستم بە تەوژمێکی گەورەو جوانی بزاڤی ڕۆشنبیری و ئەدەبی و هونەریی کوردی کرد.

**ڕامـان:** جوانترین (کورتە چیرۆک- سەما- سیمفۆنیا- ڕۆمان- فیلمێک) لەلاتدا چۆن و چی بووە؟ بۆ؟

**د.زوهدی داوودی:**

* کورتەچیرۆکی (ئەستێرە)ی نووسەری فەرەنسی ئەلڤۆنس دۆدێ، کە وێنەی هەستی مرۆڤێک دەکێشێ کە بەدوای ئەڤینێکدا وێڵە، بەڵام بێ ئەنجام.

* گۆڤەندی (ڕەشبەڵەک) چونکە دیاردەیەکی شارستانییەو تەنیا کورد خاوەنیەتی.

* سیمفۆنیای (شارەزاد)ی ڕمسکی کۆرساکۆف، چونکە لەسەربالی فریشتەکانەوە دەمباتە ڕۆژانی منداڵیم لە کوردستان.

* ڕۆمانی (پاڵەوانێک لەم سەردەمە)ی لێرمەنتۆف، چونکە ڕۆمانێکی سیحراوییەو بەزمانی شیعر هەست و نەستی مرۆڤ دەنوێنێ.

* فیلمی (شاژن و سەرباز)ە کە، فیلمێکی ئەڵمانییە لە


رحلة إلى بابل القديمة

رابطة الكتاب والصحفيين والفنانين الديمقراطيين العراقيين

دار المدى

ئەڤینی کچێکی نیمچە پەککەوتە دەدوێ کە لەگەڵ باوکێکی کەفتەکار دەژی، لاوێکی خۆشدەوێ کە لە مردن رزگاری کردووە، لە ئەنجامیشدا دوای ململانێیەکی زۆر، خۆشەویستی گرەو دەباتەوە.

**رامان:** ئەی دەتەوێ لە رۆژی مەرگت چ بکرێ و چۆن بێ؟

**د.زوهدی داوودی:** حەز دەکەم بێ ژاوژاوو گریان و بوکەرۆبێ..!

**رامان:** ئەی ناوی ئەو (ناوو شاعیرو باڵندەو گوڵ)انەی کە ئەڵهای دەکەی چین؟

**د.زوهدی داوودی:**

* ناوی (نەسرین): چونکە سروشت و بەهارم بیردەخاتەوە.
* (پوشکین)ی شاعیر، چونکە شیعری کردە سروشت و سروشتی کردە شیعر.
* باڵندەی (کەو): چونکە کوردستانی تێدا بەدی دەکەم.
* گوڵە (نێرگز): چونکە کوردستانم بیردەخاتەوە.

**رامان:** ئایا تۆ لەوانەی کە رەخنە لە رۆشنبیریی نێو رۆژنامە دەگرێ؟

**د.زوهدی داوودی:** نەخێر چونکە لەهەموو حاڵ و بارێکدا نە رۆشنبیری نێو تەلەفزیۆن باشترە، ناشکرێ دەست لە رۆژنامە هەڵبگیرێ، چونکە رای گشتیی پێداویستی پێیە..

**رامان:** بۆ جارێکی تر، ئایا ئێستا هەندێ ناوی گرووپی کەرکووکت بیر نەکەوتەوە، ئەوانەی مابن یا مردبن؟ کامیان بەردەوامن؟

**د.زوهدی داوودی:** زۆربەی زۆریان لەبیرم ماون:

* یووسف حەیدەری و مووسا عوبەیدی- مردوون.
* فازیل عەززاوی و مونەیەد راوی- لە بەرلین دەژین.
* ئەنودەر غەسانی- لە کۆستاریکا دەژی.
* سەرگۆن پۆڵس- لەنێوان ئەمریکاو ئەوروپا لەگەشتدایە.
* جان دەمۆ- لە لەندەنە.
* نووردین سالەیی- لە ئەڵمانیایە.
* یووسف سەعید- پێم وایە لە سوێدە.
* قەحتان هورمزی- لە تورکیایە.
* خۆزیا دەمزانی سەلاح فایق لە کوێیە.
* جەلیل قەیسی- لە کەرکووکە.
* محیەدین زەنگنە- لە باقووبەیە.
* عەبدوللەتیف بەندەرۆغلوو- لە بەغدایە.

لام وایە لە هەموویان زیاتر لەسەر کاری داهێنان بەردەوام بووبێ (فازیل عەززاوی)یە لە هەندەران و محیەدین زەنگنەشە لە ناوەوەی وڵات.

**رامان:** ئەی دەمامک لەلای تۆدا چۆن دەکەوێتەوە؟

**د.زوهدی داوودی:** من نازانم گەر هەر نووسەرێک دەمامکێکی تایبەتی خۆی هەبێ، بەڵام سەبارەت بەخۆم ئەوە هیچ جۆرە دەمامکێک بەکار ناهێنم، چونکە چی وا نییە لێی بترسم و نەوێرم قسەی لێوە بکەم..ئەوەی لە دڵمە لەسەردەمی خامەو زارمەو لە رەخنەش نەترساوم..پێم وایە، لە خوێندنەوەی هەردوو رۆمانەکەم هەستتان بەوە کردووە.

**رامان:** ئەی سەروسۆراخی بنکە رۆشنبیرییەکانی ئەوروپا؟ ئەی جالییەی کوردو هەواڵەکانی؟

**د.زوهدی داوودی:** لە ئەوروپادا ئەو بنکانە زۆرن، بەڵام بەداخەوە پەرش و بڵاون، دیارە ئەمە رەنگدانەوەیەکی ئاسایی بارودۆخی جوگرافی و سیاسی و هەروا زۆر و زەوەندیی پارت و گرووپی کوردی، کوردستان خۆیەتی، بەڵام چالاکییان سنووردارەو بەندە بەدەرکردنی چەند بڵاڤۆک و گۆڤاری وەرزییانە بە ئەڵمانی و بەهەردوو شێوەزاری کوردی، کە رۆشنبیری هەمەرەنگی کوردی بڵاو دەکەنەوەو خەڵکی ئەو وڵاتانە بە کێشەی رەوای کورد دەناسێنن و بەرگرییش لە حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکەن..سەرباری ئەوەش گەلێ رێکخراوی ئەڵمانی- کوردی هاوکۆ هەیەو ئامانجی سەرەکی هاریکاری کردنی گەلی کوردە، هەروا ئاموژگەیەکیش لە بەرلین هەیە کە فریاد فازیلی شاعیر کاری تێدا دەکاو تائێستاش چەندین کتێب و فەرهەنگی کوردی بەچاپ گەیاندووە.. سەبارەت بە جالییەی کوردیش ئەوە ئەو ژمارە زۆرەیە کە (١٠٠) هەزار کوردی کوردستانی عیراقی گرتۆتە خۆ، لە تەک نیو ملیۆن کوردی کوردستانی تورکیا.. هەر لێرەوە دەڵێم: ئەگەر کوردی تورکیا کێشەی تایبەتی خۆیان هەبێ، نازانم ئەم ژمارە بێ ئەندازەیەی لاوانی کورد لە هەندەران چی دەکەن؟ من گومانم لەوەیە کە ئەمانە بتوانن خزمەتی کێشەی نەتەوەکەیان بکەن!؟ خزمەتی راستەقینە لەنێو کوردستان-دایە..! هەر لێرەش دەمەوێ بڵێم: پێویستە حکومەتی کوردستان (کار) بۆ ئەم لەشکرە بێکارە بدۆزێتەوەو کارێکی واش بکا تا ئەو لاوانە بە ئاسانی و



ئاسوودەیی بگەڕێنەوە باوەشی کوردستان..!

**ڕامان:** ئەمانە بەیەک دێڕ:

**د.زوهدی داوودی:**

* ئەدوارد سەعید: ئازایەو بێ ترس دەنووسێ.

* شۆڕشی ئەیلوول: ئەو شۆڕشە نەبوایە، ئەم فیدرالییەی ئێستا نەدەبوو، بۆیە بارزانی-ی نەمر ئەو پاڵەوانەیە کە دەبێ لە ڕێبازەکەی دەرنەچین.

* مینۆرسکی: لەلای من ناوێکی نامۆ نییە، بەڵام بەداخەوە لە بیرم کردووە.

* بیکیت: نووسەرێکە خۆی خۆی پێگەیاندووەو شانۆی نوێ کردۆتەوە.

* هەمینگوای: وەک سالآنی پەنجاکان ئەو نرخ و بایەخەی نەماوە.

* سەلیم بەرەکات: نووسەرێکی داهێنەرە، بەڵام بەداخەوە پشت گوێ خراوە.

* ئاینشتاین: ئەستێرەیەکی بچووکی نێو کۆمەڵە ئەستێرەی دەوروبەری خۆرە.

* مەقامی ئەڵڵاوەیسی: باڵێکەو بەرەو ئاسمانی گەرمیان دەمفڕێنێ.

* لاوک: باڵێکی ترەو بەرەو کاکە شانی بادینان بەرزم دەکاتەوە.

* خاچادۆریان: لە پەنای (سەمای لاوانی کورد) ڕێگایەکی دیکەی لە کوردستان دۆزییەوە.

* کافکا: هێشتاو بەردەوام پڕ لە زیندەگییە.

* جێمس جۆیس: هەرەمێکی بەرزی نێو ڕۆمانی جیهانییە.

* تۆینبی: تیۆرییەکانی لە هیستۆگرافیا (مێژووی زانستی مێژوو) زۆر بەنرخە، بەڵام کەموکورتیی تێدایە.

* زوهدی داوودی: لەگەڵێ شت هەردوو جەژنەکەی لەدەست داوە، بەڵام لەو مام جەژنییە باشترە کە هەر بەجارێ لەهەردوو جەژنەکە بێبەش بووە.




**ناسنامە**

*** د. زوهدی داوودی:- ١٩٤٠- لە شارۆچکەی داقووق لەدایک بووەو لە تۆماری دووزخورماتوو تۆمار کراوە.**

*** لە هاوینی -١٩٥٩- بووە بە ئەندامی یەکیەتیی نووسەرانی عیراق.**

*** ١٩٦١- ١٩٦٣- لە گوندی (مامە)ی نزیک کەرکووک مامۆستای سەرەتایی بووە.**

*** ١٩٦٣-١٩٦٤- لە ناوچەی قەوالّی بووە بە پێشمەرگە.**

*** ١٩٦٤-١٩٦٦- لە بەندیخانەکانی کەرکووک و باقووبە و ڕومادی و حیللە بەندکراوە.**

*** ١٩٦٧-١٩٧٢- مێژوو و فەلسەفەی لە زانستگەی لایبزیک-دا خوێندووە.**

*** ١٩٧٦- دکتۆرای لە فەلسەفەی مێژوو وەرگرتووە.**

*** ١٩٧٦-١٩٧٩- مامۆستا بووە لە کۆلێژی پەروەردەی زانستگەی مووسڵ.**

*** ١٩٧٩-١٩٨١- مامۆستا بووە لە زانستگەی قاریونس لە لیبیا.**

*** ١٩٨١-١٩٩٢- مامۆستای یاریدەدەر بووە لە زانستگەی لایبزیک.**

*** ١٩٩٢-١٩٩٤- بێکار بووە.**

*** ١٩٩٤- ١٩٩٥- چێشتخانەی بابلۆنی لە لایبزیک کردۆتەوە، کەچی قەلاش بووە.**

*** ١٩٩٥- تا ئێستا نووسەرەو وەرگێڕان پیشەیەتی.**

**١٩٧٠- ژنی هێناوە، کچێکی بەناوی (ئەمیرە)و کوڕێکی بەناوی (سۆران) هەیە.**

**بەرهەمەکانی بە عەرەبی:**

**- الاعصار - مجموعة قصص - بغدا د- ١٩٦٢**
**- رجل في كل مكان- رواية- بيروت- ١٩٧٤**
**- الزنابق التي لاتموت (قصص)- موصل- ١٩٧٨**
**- رحلة الى بابل القديمة- لە ئەڵەمانییەوە- دمشق - ١٩٨٤**
**- أسطورة ملكة السيد- قصة طويلة- لايبزيك- ١٩٩٠**
**- أطول عام- رواية- بيروت- ١٩٩٤**
**- زمن الهروب- رواية- بيروت- ١٩٩٨- بە ئەڵەمانی-**
**- الاكراد- تاريخ- حضارة وكفاح مصيري- فرانكفورت- ١٩٨٧**
**- سعار - قصص - لايبزيك - ١٩٩١**
**- أطول عام - رواية- لايبزيك - ١٩٩٣**
**- وداعاً نينوى (ثلاث قصص طويلة) هيلدس هيم- ٢٠٠٠**

**هەڤپەیڤینی:**
**مەحموود زامدار - ئازاد عەبدولواحید**

## عەبدولقادر سەرچناری:

# زیاتر ئەو ڕۆمان و چیرۆکانە قسەیان لەبارەوە دەکرێ کە بە فەنتازیای شیعر ڕازاونەتەوە



**عەبدولقادر سەعید ناسراو بە عەبدولقادر سەرچناری یەکێکە لە شاعیرە لاوەکان کە لە هەشتایەکانەوە دەنووسێ و چەند کۆمەڵە شیعرێکی بە چاپ گەیاندووە. ماوەیەکە لە وڵاتی ئەڵمانیا دەژی، لە سەردانێکی ئەم دواییەی ئەم شاعیرە لاوە بۆ شاری هەولێرو لە چاوپێکەوتنێکدا ڕووبەڕووی چەند پرسیارێکمان کردەوە، تا خوێنەران بە بیروڕایەکانی ئاشنا بکەین لەبارەی تێگەیشتنی لە داهێنان و شیعرو کەناڵەکانی دیکەی ڕۆشنبیری و پێوەندییان بە جیهانی شیعرەوە..**

**ڕامـــان:** دیالۆگی داهێنەر، لەگەڵ خودو ناخی خۆی چۆن تێدەگەن..؟

**عەبدولقادر سەعید:** دیالۆگی داهێنەر لەگەڵ خودی داهێنەردا، سەرەتای ئەو دیالۆگەیە کە لەگەڵ دەرەوەی خوددا دەکرێ، تۆ هەمیشە بە ئاگاترین کەسی لە قەڵەمەکەتەوە، زۆر بەرچەو ڕوونتر دەتوانێ کەلێن و خەوشەکانی دەستنیشان بکا. هەمیشە ئەو خاڵانەی لە پێش چاون، کە پێداویستییە ڕۆشنبیرییەکان چاوەڕوانی دەکەن. پەنجەرەی ڕوانینی داهێنەر [illegible] دەقێک لەهەموو پەنجەرەیەکی دی والاترە، ئەگەرچی حەزنەت و بوێری داهێنەر بە شوێن کارەساتە لاوازەکانی دەقدا دەگەڕێ و دەتوانێ وردەکاری هەموو بنیادی دەق بپشکنێ و دواتر ناتەباییەکان بە ئەنجام بگەیەنێ. تەنیا لە ڕێگەی دیالۆگی خودی داهێنەر، بۆ خۆی ئەم حاڵەتە بەرجەستە دەبێ، کە هونەری داهێنان هێندە باڵادەستە زۆر ئاسایی داهێنەر دەقەکەی خۆی کە بەرهەم و زادەی بیری خۆیەتی دەخاتە بەرپرسیارەوە.

**ڕامان:** ئەی زەمەنی شیعر لە کوێوە دەستپێدەکا؟

**عەبدولقادر سەعید:** شیعر لە زەمەنێکی دیاریکراودا بەرهەم نایەت، بەڵکو بەرەنجامی دنیا بینییەکی فراوانترو درێژترە لەساتی لەدایکبوونی. پێم وانییە کەس بتوانێ کۆتایی شیعر دیاری بکات و سەرهەڵدانیشی بە پێوانەیەکی تەقلیدی بپێورێ.

زەمەنی شیعر زەمەنی هەست و ژانە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤە، سەرهەڵدانی و کۆتاییشی بەندە بەهەمان پرەنسیپەوە. زۆر لە ڕۆشنبیرانی دنیا لە ژێرکاریگەریی تەکنیکدا بانگەشەی شیعریان کرد، کەچی شیعر تا ئێستاش پڕ کەرەوەی کەلێنە قووڵەکانی ڕۆحی مرۆڤە. ڕەنگە مەسەلەی لاوازبوونی هەست و سۆزو ئەندێشە کە سەرجەم کایەکانی گرتۆتەوە.

شیعر بەشی شێری بەرکەوتبێ. شیعر کردەیەکی سیزیفی

نییە تا هەمیشە و بەهەمان دەستوور خۆی دووپات بکاتەوە، بەڵکو جۆرە قورساییەکە کە لەگەڵ ڕێڕەوە مێژوورییەکەی خۆیدا پەرە دەستێنێ و بەو کێوەدا سەردەکەوێ کە دنیابینی مرۆڤ، ڕۆژانە دەیاندۆزێتەوەو زەمەنێکی جوانتر بنیات دەنێ لەو زەمەنەی کە تێیدا لە دایکبووە. بەواتایەکی تر، زەمەنی شیعر زەمەنی لە دایکبوونەوەی هەمیشە بەردەوامی هەیە.

**ڕامان:** ئەی پێت وایە ئێستا چاخی شیعر تەواو بووبێ و چاخی چیرۆک و ڕۆمان دەستی پێکردبێ؟ ڕۆمانی کوردی و کێشەکانی؟ ئەی دیالۆگی ڕۆشنبیرانە؟

**عەبدولقادر سەعید:** لە دنیای دەرەوەی ئێمەدا، ڕۆمان جیهانێکی تایبەتەو شوێنی گرنگی پێدانێکی جیاوازترە لە ژانرە ئەدەبییەکانی دی، بەڵام هەمیشە لای خوێنەری وریای ڕۆژئاواش، ئەو ڕۆمان و چیرۆکانە قسەیان لەبارەوە دەکرێ کە بەفانتازیای شیعر ڕازاوەتەوە. من پێم وا نییە چاخی شیعر هەرگیز کۆتایی بێت، بەڵکو شیعر لە بەرگ و فۆرمێکی جیاوازتر لەجاران خۆی دەنوێنێ. سەرکەوتنی بەهای چیرۆک و ڕۆمانی سەرکەوتوو، کلیلی سیحرەکەی زمانە شیعرەکەیەتی، کە دەتوانێ ڕووداوو کارەساتەکان بە جۆرێ بخەملێنێ خوێنەر بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. ڕاستە دەقە زۆر جوانەکان دێر زەمانێکە نووسراون، بەڵام قۆناغەکانی پەرەسەندنی ئەدەب ژەنگیان پێهەڵناهێنێ، لە کاتێکا چێژو سەلیقەی خوێنەری شیعری ئێستا بە (١٨٠) پلە جیاوازترە لەوەی نەوەکانی پێشوو. بۆ خۆرئاوا ئەم مەسەلەیە شوێنی سەرنجدانە، مرۆڤ لەژێر بێڕەحمی تەکنیکدا چۆن دەیەوێ بپەیڤێ، بەڵام بۆ ئێمەی ڕۆژهەڵاتی هێشتا سیما سروشتییەکان دەتوانێ هەستونەستەکان زیاتر ببینێ و چەمکەکان شیبکاتەوە. ئێستا کەناڵە جیاجیاکانی گەیاندن هەمە جۆرو هەمە ئامانجن، کەچی تا هەنووکەش شیعر لە چڵەپۆپەی جوانکارییەکانی هەر دەقێکدایە، چونکە ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، شیعر پێوەری هونەریی داهێنانەو دەتوانێ لەبەرگی چیرۆک یا ڕۆمانێکی باڵادەستدا ڕۆڵێکی گرینگی هەبێ و ئاوەزو هەستەکان پێکەوە گرێبدات. من مەترسیم لەوە هەیە کە ڕۆمانی کوردی دەردی شیعری کوردی بەسەر بێ، واتە: تەنسیرەکان لە (١٠٠٪) شوێن پەنجە دابنێن و نەتوانی دەقێکی کوردی لە دەقێکی بیانی جیا بکەیتەوە، لەم ساڵانەی دواییدا زۆر بەرهەمی جۆراوجۆر کەوتنە کتێبخانەی کوردییەوە، ئەم دیاردە شارستانییە گرنگییەکی زۆری لە ڕۆشنبیریی کوردیدا هەیەو سەرەتایەکی سەرکەوتووە.

ڕۆمانی کوردی هەروەک چەمکەکانی تری ڕۆشنبیری کوردی وەک پێویست بەسەر نەکراوەتەوە. بۆ خۆم پێم سەیرە (ئێوارەی پەروانە)و (مەرگی تاقانەی دووەم)ی بەختیار عەلی وا لێکبدرێتەوە، دیارە ئەم قەڵەمە وەک نووسەر هەر دەقێک شوێنی ڕەخنەو لێکدانەوەی جیاواز لەڕای خەڵکانی ترە، بەڵام ناکرێ بەبێ پرۆسەیەکی نوێتر، قەڵەمێکی نوێخواز لەککەدار بکرێت و تاسەر ئێستاکان بریندار بکرێ. زۆر قەڵەمی جوان لەم دواییەدا بەرهەمی ڕۆمانی جوانیان پێشکەش کردووین. پێدەچێ ئەم سەرەتایە ئایندەیەکی گەشی بەدواوەبێ، چونکە بە ڕاستی بۆ ژانەکانی مرۆڤی کورد، ڕەنگە قەبارەو شێوە دەربڕین لە چیرۆکی زۆر درێژدا گونجاوترین پانتایی بێت. دیارە سەلیقەو توانای ڕۆشنبیری ڕۆماننووس جگە لە جۆرە جورئەتێک، پشت بەستنیشە بە ڕۆشنبیرییەکی گەورەو فراوان. ئێمە لەم دەروازەیەوە سەیری ڕۆمانی سەرکەوتوو دەکەین کە چەند سوودی لە فەنتازیای نوێ وەرگرتووەو تا چەند دەتوانێ خوێنەر ناچار بکات بیخوێنێتەوەو لەهەمان کاتدا چەند دیموکراتیانە ئەو دەقە خوێندنەوەی جۆراوجۆر دەخولقێنێ، ئەوکات کە ئەنجامەکە واشکایەوە، بێگومان ڕەخنەو لێکدانەوەی جۆراوجۆر دێتە ئاراوە، کە ئەمە بۆ خۆم بەدەرگای دیالۆگی ڕۆشنبیریی گرنگی دەزانم کە ڕۆمانی کوردی دەتوانێ ببێتە مینبەرێکی تر کە گوتارە جۆراوجۆرەکانی تێدا موناقەشە بکرێت.!!

## شیعری گەلانی دەرودراوسێ زیاتر کاریان کردووەتە سەر سەلیقەی شیعریی خوێنەری کورد

**ڕامان:** ئەی پێت وایە بڵاوکردنەوەی دیوانە شیعر بە خەتی شیعر خۆی قووڵترو شیرینتر بێ تا کۆمپیوتەر ئەی دەسکاری کردن؟

**عەبدولقادر سەعید:** جیاوازییەکی وا نابینم لە نێوانیاندا، چونکە شیعر لە دەرەوەی سێبەری هێڵەکان، سەربەخۆییەکی تەواوی هەیە، کە زۆربەی کات سێبەری نووسەر جێدەهێڵێ و زۆر ئازادانە دەدوێن و سەما دەکەن. هێزی شیعر لە دەربڕین و هونەرو پێکهاتەکەیدایە. ڕەنگە خراپترین کۆمەڵە شیعر لە ئەدەبی میللەتێکدا بە خەتی ناسراوترین شاعیر نەتوانێ قەناعەت بە جێژی خوێنەری زیرەک بکات و تەئسیری ئەم جۆرە فێڵانە ئەگەر هەشبێ زۆر کەم و کاتێ. بە پێچەوانەی کۆمپیوتەر هێزی داهێنانی ڕێکخستنی گەلێ باڵاترە لە خەتی شاعیرێک، کۆمپیوتەر دەتوانێ تەعبیرەکان ڕێکخات و خۆ بزوێنەرو هەژێنەر نییە، دیسان دیارە کۆمپیوتەر گوێڕایەڵ و

ڕێکخەرێکی بە توانایە.

**ڕامـــان:** ئەی خۆت، ڕەشنووسەکانی خۆت دەپارێزی؟ لەبەرچی؟

**عەبدولقادر سەعید:** زۆر جار وام کردووە، ئەگەر هاوڕێم جەزا چنگیانی ئەم کارەی بۆ نەکرد مایە بەمن نەدەکرا، بەهۆی سەفەری هەمیشەییمەوە لەم دێ بۆ ئەودێ و لەم شار بۆ ئەو شار و لەم وڵات بۆ ئەم وڵات. سەراپا ژیانم هێندە ئاڵۆزە بەرگەی ئەم سەلیقە وردە ناگرێ. لەو قەناعەتەم هەڵگرتنی دەسنووس زۆر پێویستە، بەڵام بەداخەوە بە من نەکراوە و ناکرێ. جاری وابووە بەرێککەوت بەرەشنووسێکمدا چوومەتەوە، کە دۆزیومەتەوە هەستم بە ناتەباییەک کردووە، جارێکی تر بە تێکستەکەدا چوومەتەوە و گۆڕانی گەورەم تێداکردووە، هەروەک لە (سەمفونیای خوێن و تراژیدیای مەرگی پاکیز)دا ڕوویاندا. زۆر جار لە ساتەوەختی چاپکردندا گۆڕیومن. ڕەنگە کۆمپیوتەر و تەکنیکی نوێ زۆر یارمەتیدەری ئێستای نووسەرین بۆ پاراستنیان، دواتر ببنە هۆی مشتومڕی ڕەخنەگرانە لەسەر مێژووی هەر دەقێک، پاراستنی ڕەشنووس وەک پاراستنی ئەلبوومی ژیانی خۆت وایە و ڕەنگە بە سوودتریش بێ، خۆزگە پێشی ئێستا ئەم ڕاستییەم دەزانی..!

**ڕامـــان:** ئەی چ جۆرە فۆرمێکی شیعر، لەگەڵ ڕۆحی خوێنەری ئەم سەردەمەی کورد زیاتر دەگونجێ؟

**عەبدولقادر سەعید:** ناکرێ ڕۆحی خوێنەری کورد لەم سەردەمەدا بە پێوانەیەک بپێورێ ئیدی کەسی دی مافی هەڵبژاردنی پێوانەیەکی تری نەبێ. تێڕوانینەکان جیان و لە هەمان کاتیشدا ئاستە ڕۆشنبیرییەکانیش جیاوازن ئایا دەتوانرێ سەلیقەی خوێندنەوەی شیعرێک لای جووتیارێکی ئەو پشت کێوە لەگەڵ کابرایەکی شارستانیدا جیانەکەیتەوە؟ ئەوانەیە کولتووری کورد لە حاڵی ئێستەدا جۆرە تەباییەک نەنێوان عەقڵەکان لەیەک نزیک بکاتەوە، بەڵام دیسان لە هەناوی کۆمەڵدا دەیان تەقینەوەی جۆراوجۆر هەیە.

بۆ نموونە: ململانێی نەوەکان کە هەندێ جار هەستدەکەم هەندێ لە ڕۆشنبیرانی نەوەی نوێ لە (١٠٠٪) لەنەوەکانی پێشتر لەخۆیان جیاوازن، یان بە پێچەوانەوە خوێنەری نەوەی کۆن سەریان لە سەلیقە و دنیابینی و چێژی نەوەی نوێ سوڕ دەمێنێ و لاقرتێ و هەندێ جاریش شێتانە بۆیان دەڕوانن.

ئەم حوکمی پێشکەوتن و تەکانەکانی ناو هەموو قۆناغەکانی پەرە سەندنە، فۆرمی نوێی شیعر هیچ ماناو سنوورێکی دیاریکراو ناگەیەنێ، ئەوەندە نەبێ تۆ تاچەند دەتوانی لە پەروەردە کردنی چێژی خوێنەردا کاریگەر بیت و ئەو زمانە نوێیە ببەخشی کە دەتوانێ هەر هیچ نەبێ سەرنجی سەرەتای خوێنەر ڕابکێشێ تاسبەی ببێ بە بەشێ لە ڕۆحی شیعریی خۆت، بۆ ئەم هەمەلایەنە کارکراوە، هەروا شیعری کوردی لەژێر تەئسیری ئەدەبی گەلانی دراوسێدا مەترسی تێکدانی زەوقی خوێنەری کوردی لە سەرە.

واتە: مەسەلەکە زیاتر تەئسیری شیعری گەلانی دراوسێ کاریان کردۆتە سەر سەلیقەی شیعری خوێنەری کورد، چونکە تایبەتمەندییەکانی زمان و تەنانەت جوانناسی کۆمەڵایەتیشمانی خستۆتە ژێر باڵی تێڕوانینی خۆیەوە. خۆ شێوەو فۆرمی پڕ لە فانتازیا هەن لەژێر تەئسیری دنیای دەرەوەی ئێمەشدان، بەڵام سەلیقە تێکدەرەکە نین، بەڵکو سەلیقە پەروەردە دەکەن.

مامەڵەکردنی لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی نەست و موعانات و زمان و کولتوورەکەماندا، زانستییانە توانیویەتی جێگای شیاوی خۆی بکاتەوە و سەلیقەی شیعریمان دەوڵەمەند بکات.

**ڕامـــان:** دوای ئەم ئەزموونەت، پاپۆڕەکانت لە زەریای شیعردا، گەیشتۆتە کوێ؟ ئەی بەندەری تازەت؟

**عەبدولقادر سەعید:** شیعر بۆ خۆی دنیایەکی بێسنوورە و هەموو تەمەن ناتوانێ لە سەرەتایی شیعرت تێبپەڕێنێ، ئەگەر چی تا ئەمڕۆ لە زۆر بواری جیاجیادا شیعر منی تاقی کردۆتەوە... دیارە ئەم ئەزموونە بۆ من جێگەی نیگەرانییە کە ناتوانم خۆم بە تەواوکەری ئەو ژانە بزانم، چونکە سەختی ژیانم زیاتر لەوەی دەوێ کە نووسیومە، لەو قەناعەتەدام بۆ لێکدانەوەی ئاڵۆزی هەستی مرۆڤ، پێویستی بەتەمەنێکی درێژتر هەیە، تا لەناو درکوداڵی شتە دزێوەکاندا جەوهەری ژیان بدۆزێتەوە. ڕەنگە ئەمە کرۆکی جوانناسیی شیعر بێ کە بەیەکەم ئەرکی دادەندرێ و تەنیا پێوەری شیعری داهێنەر نەبێ. ئەگەر ژیان بۆ من هەر فرمێسک و مەرگ و کۆتەڵ بووبێ، بۆ کەسانی تر هەوێنی ئومێدو شادی و سەما بووبێ، جیاوازییەکمان نییە لە هاوتایی ژیاندا، هەردووکمان تەمەنی ئەندێشەکانمان بە پێوانی زەمەن دەپێورێ.

گرنگ لێرەدا چۆنیەتی تەعبیرکردنە کە ئایا کاممان یا تاچەند توانیومانە ئەزموونەکانمان لە دەقەکانماندا بخەملێنین. شیعر بۆ من سەمایەکی زۆر باییانەیە کە دەتوانم لەناو هەموو ئەو تراژیدیانەدا بدوێم و هیچ نەبێ تەعبیر لە خۆم بکەم و پرسیار جێبهێڵم. ڕەنگە دۆگمای شیعریی مەترسیدارتر بێت لە دۆگمای سیاسی، بەو پێیەی ژیان لە دیدی شیعرەوە نەک هەر ڕاوەستاوە، بەڵکو مردارەوە بوو ببینم. ئازارو چەوسانەوەو ئاوارەیی بۆ من کەرەستەن و هۆی ژیانی نووسینەکانمن.

(مەرگی پاکیزو سەمفۆنیای خوێن) تەنیا دوو دەقی شیعریم نین، بەڵکو دوو ڕووباری سەر ئەو دەریایەن کە ژیانی

من هێندە بڕناکات تابتوانم گەشتێکی خێرای تێدا بکەم. بۆیە لای من چامەی درێژ تەنیا قەبارە ناگرێتەوە، بەڵکو بە ڕووبەرێکی تایبەت بە کارەساتەکانی دەزانم.

**ڕامان:** سەرچاوەکانی مامڵەکردنت لەگەڵ (ڕەنگ) لە شیعردا لە کوێوە سەرهەڵدەگرن؟ بۆ؟

**عەبدولقادر سەعید:** ڕەنگ لە شیعردا ئەو تێڕوانینە جیاوازانەن کە دەتوانرا دنیات بڕازێنێتەوە، خوێن و مەرگ ڕەنگی ئەو تارماییانەن هەمیشە لەسەر هزرت سێبەر دەکەن کاتێ قەڵەمەکەت تراژیدیایەکی پڕ کارەسات دەنووسێتەوە، بەڵام خوێن لەم ساتە وەختەیدا ڕەنگە وێنەکردنی خۆی لە مێشکتدا بە جۆرێک و لە مێشکی خوێنەردا جۆرێکی تر بنوێنێ. ئەمە سیحرو توانای داهێنانە.

کاتێ کازانتزاکی، زۆربا دەهێنێتە سەما، شکڵی سەما فەنتازیایەکی پڕ گەشبینییە، بەڵام لەم ساتەوەختەیدا نوقمە لە ئازارێکی قووڵ.

ڕەنگو سیمایەکان جۆرە تەباییەک پێکدەهێنن، خوێنەرو سەیرکەر قەناعەت پێدەکەن، وەک ئەوەی کازانتزاکی دەیەوێ، هەڵبژاردنی ڕەنگەکان لەژێر کاریگەریی بارە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکاندا دەگۆڕێ. ئەم نسبییەتە لە شاعیرێک بۆ یەکێکی تر جیاوازییان زۆرە. من بۆ خۆم ڕەنگە پایزییەکانم لە هەموو ڕەنگەکان پێ پەرەنگاریترە. هیچ جۆرە ڕۆمانسیەتێک لەوە بە جورئەتتر نییە تۆ بەرانبەر مەرگ، ڕەنگێکی پڕ لە ئەندێشە لەگەڵ چێژو هەستدا بگونجێنێ و هێندە بە دەسەڵاتەوە قسە بکەیت و ژیان ملکەچ بکەیت بۆ یاسا جوانناسییەکانی خۆت. ئەمە هونەری دەربڕین و فەنتازیای ئەدەبە کە شاعیرو داهێنەر بتوانێ دنیای ڕوانینی خۆی لە لۆژیکی ژیان جیابکاتەوە و ڕەهاییانەش بڕیاری جیاکردنەوە بدات و بە دیوێکی تری ژیاندا مرۆڤ بکاتەوە بە بەشێک لە دەق و جارێکی تر ژیان بە هەموو گۆڕانە جوانەکانەوە پێشکەش بکات.

**ڕامان:** ئەی حەز بە خوێندنەوەی کام شاعیر دەکەی؟

**عەبدولقادر سەعید:** پێت سەیر نەبێ ئەگەر بڵێم: دیارترین شیعری جیهانیی بۆ هیچ کەسێک ناتوانێ چێژی تۆ پڕ بکاتەوە. شیعر شەفافترین بەرهەمی هەستکردن و تەرجەمەکردنی ئەم هەستکردنە بەزمانی دەربڕین نەک هەر ئاسان نییە، بەڵکو ئەستەمە، تەنانەت ئەگەر بەو زمانەش بیخوێنیتەوە کە پێی نووسراوە، چونکە شیعر زادەو بەرهەمی کولتوورو ئاوەزو دنیا بینییەکی تایبەتمەندە بە جوگرافیایەکی تایبەتمەندەوە. تۆ بە دەر لەو دنیابینییە هەست بە غوربەتی هەست و لێکدانەوە دەکەی. من خۆم بەردەوام (نالی) و (مەحوی) و (نازم) و (سپێنەری)و (شاملو) دەمەجوولێنن. کارەساتەکانی (مایکۆڤسکی)و بەرەنگارییەکانی (نیرۆدا) و جوانناسییەکەی (ئەراگۆن) جۆرە پرسیارێکم لا دروست دەکەن و هەمیشە بۆ وەڵامەکانیان لە دەقە کوردییەکاندا دەگەڕێم و حەز دەکەم بونیادی دنیای دەرەوە لە چەمکە هەڵڕێژاوەکانی ئەدەبی میللەتەکەمدا بدۆزمەوە.

**ڕامان:** ئەی پێت وایە (ڕیالیزم) شیعر لاواز دەکا یا تێروتەسەل؟

**عەبدولقادر سەعید:** لێکدانەوەی ڕیالیزم لە ڕۆشنبیری کوردیدا جۆراو جۆرە. ئەگەر نیگارکێشانی واقیع مانایەکی بێت، ئەوە یەکسەر بۆ لاوازکردنی واقیعی مەبەستە نەک ئەو هەموو کارەساتانەی لە واقیعدا هەن و لێکدانەوەیان. شیعر بۆ خۆی دنیایەکی هێندە ئازادە کە بواری ئەوەی هەیە واقیع وابیبینێ کە ڕوانینی من و تۆ جیاوازە. مەسەلەکە لێرەوە سەرچاوە دەگرێ، ئایا شێتەڵکردنی هەر دیاردەیەک بە چەند جۆرو دنیابینی نابێتە هۆی دەوڵەمەندکردنی دنیای واقیعی؟ هەموو دەزانین خەیاڵی شاعیر جۆرە خەیاڵێکە بە هەزاران داو گرێدراوە بەواقیعەوە، بێ ئەوەی لە واقیعدا وجوودی هەبێ. واتە: خوێندنەوەی ئەو هەموو کون و کە لەبەرانەیە. (ژاک بریڤێر) گوتەنی: کە زۆرجار لە زمانی ئاخاوتندا پشت گوێ خراون، تۆ بە پەنجەی هونەرمەندانەی خۆت زیندووی دەکەیتەوەو دنیای واقیعی زیاتر پێدەڕازێنیتەوە، جیاوازی توانای داهێنەرانەی قەڵەمەکان لە نیگارکێشانی هەر دنیا بینییەکدا خۆی لەخۆیدا زۆر گرنگە. ڕەنگە من نەتوانم (گۆران) واتەنی: (ئەو خەیاڵەی پێی مەستم) بۆم بخرێتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستم، بەڵام کەسێکی بەهرەمەندو داهێنەرتر لەمن بتوانێ هەرهیچ نەبێ لەمن هونەرمەندانەتر ئیشی تێدا بکات، هەردووکمان لە واقیعێک دەدوێین و ڕیالیزم سەرچاوەمانە. پێم وایە ئەمجۆرە حوکمە سەپاوە، دنیای ڕیالیزمی لە ئێمە گوماناوی کردبێت، ئێمە بە نیگەرانییەوە نەک هەر لە قوتابخانەکە، بەڵکو لەوشەکە بترسین، لە کاتێکا ڕیالیزم خۆی لە خۆیدا سەرچاوەیە و تۆ دەتوانی لەناو ئەودا هەرجۆرە هەڵکۆڵینێکت هەبێ و ئیدی سەرکەوتن و نا

**تا ئێستاش شیعر کەلێن و بۆشاییەکانی ڕۆحی مرۆڤ پڕ دەکاتەوە**

سەرکەوتنی بەندە بە پێوەرە ڕەخنەییەکەوە، هونەرمەندو نووسەری بەهرەمەندو جوانناسی، لە واقیعدا زۆر کارامانە دەپەیڤن، بەڵام ئیشکردن لە دنیای ڕیالیزمدا ڕەنگە قورسترین ئەرکی داهێنان بێ، پێم وایە کەم کەس دەتوانێ دنیایەکی جوانتر لە دنیای ڕیالیزم لە دەقێکدا بەرهەم بهێنێ، چونکە تۆ ئەو دوو هێڵە تەریبە بەرەو هەر کوێیەک وەبەیت، ئەنجام خوێنەر پرسیاری هەیە و لە لێکدانەوەی مرۆڤانەی خۆیەوە ئەو دنیایەی تۆ تەتەڵە دەکا و ئەویش بەناچاری دەگەڕێتەوە سەر مێژووی واقیعێک کە ڕۆشنبیریی خوێنەرو ڕەخنەگرو داهێنەری بەرهەم هێناوە.

**ڕامان:** جگە لە شیعر، چ شتێکی تر خەریکی کردووی؟

**عەبدولقادر سەعید**: ڕەنگە بوێرم بڵێم: من دەمەوێ بە زمانی شیعر بدوێم، هەتا ئەگەر بمەوێ لە ئابووری یان سیاسەت یا هەر چەمکێکی تر بدوێم، خەمی شیعر بۆ من لە هەموو خەمێک گەورەترو پیرۆزترە. من لە پەنجەرەو دیدگای شیعرەوە دەدوێم و تێدەفیکرم بۆیە شیعر بۆمن سەراپای ژیان دەگرێتەوە.

**ڕامان:** ئەی ئەو ئافرەتە کێیە کە خۆی- بەسەر تۆ وەک شاعیر- فەرز دەکا؟

**عەبدولقادر سەعید:** ئەو ئافرەتەی کە خۆی لەسەر شیعر فەرز دەکا، ئەو تێڕوانینەیە کە شاعیر بۆ ئافرەت هەیەتی. (تراژیدیای پاکیزو دەروازەی سێیەمی مێژوو) دوو دەقی پڕ لە فرمێسکی یان بڵێم دوو قۆناغی پڕ ئەزموونی شیعریمن، جگە لە سۆزو ویژدانی هەژاوی من، دوو مەسەلەی فیکری و کۆمەلایەتین.

من ژیان بێ ئەڤین، بێ بەهاو نرخ دەبینم، پێتان سەیر نەبێ بڵێم- لای من- پێشەکی دیوانەکەی قوبادی جەلیزادەی هەوڕێم کە (نازدار)ی هاوسەری نووسیویەتی، هیچ لە بەهاو جوانناسی و مرۆڤدۆستی هەموو دیوانەکە کەمتر نییە. واتە: هونەری عەشق لە هونەری شیعر کەمتر نییە کە داهێنەر دەیکاتە چاوگی دەقێکی سەرکەوتوو، ئافرەتی سەرکەوتوو پشتیوانی دەکات و دەیپارێزێ. جوانی ئافرەتیش لەو دیدەوە دەبینم کە پێویستە پیاو عاشقانە دەبێ بیپارێزی و هەمیشە دەبێ خۆمان بە قەرزاری ئەو ساتانە بزانین کە ئافرەت تێیدا مانا بە ژیان دەبەخشێ.

**ڕامان:** ڕەخنەی ئایدیۆلۆژی بە ڕەخنەی مارکسی، ڕەخنەی فرۆیدی، ڕەخنەی بەراوردکاری، ڕەخنەی پراکتیکی کامیان؟

**عەبدولقادر سەعید:** ڕەخنە چاوگەیەکی گرنگە بۆ کاری داهێنان. تێڕوانینی هەرجۆرە ڕێبازێکی ڕەخنەیی، سیماو توانای سەردەم و ڕۆشنبیری باوی ئەو قۆناغەیە. لە مێژووی ڕەخنەی کوردیدا، هەمیشە مەسەلەکە واشکاوەتەوە.

تەوژمێکی ڕەخنەیی حوکمی زۆر لە پانتایی ڕۆشنبیری کردووە و دەسەڵاتێکی ساسیی لە پشتییەوە کاری کردووە. زۆرجار دیکتاتۆریەتی قەڵەمەکان بواری تێڕوانینی تری نەهێشتۆتەوە، لەکاتێکا ژیان بریتییە لەتێڕوانینە جیاوازەکان، ئەم تەوژمە ڕەخنەییانەی ڕۆشنبیری کوردی گرتۆتەوە، تا سەر هیچیان نەیانتوانیوە تەمریی خۆیان بپارێزن. بۆیە دەقی کوردی بەتایبەت و فیکری کوردی بەگشتی لە هەموو جۆرە پیل و تەوژمە ڕەخنەییەکان وەک پێویست ڕۆنەچوو، بە دیوێکی تردا ڕەخنە لە پەراوێزی فیکری کوردیدا کاری کردووە!

**ڕامان:** ئەی خەونەکانی مۆدێرنیزم- لە شیعردا- لای تۆ چین و چۆن دەکەوێتەوە؟

**عەبدولقادر سەعید:** ئەدەبی کوردی تا پێوانەیەکی فراوان لە ڕەحنە بەتاڵە...! هێزی داهێنان هەمیشە لەژێر ڕکێفی سەرنج و پێداویستی عەقڵە بەرهەم هێنراوەکانی تردا گەشە دەکا. ڕەنگە هەڵە بەمانا زمانەوانییەکەی، لەگەڵ ئەو هێڵە بەیانییەدا نەیەتەوە، کە وەزیفەی ئەدەب بەگشتی و شیعر بەتایبەتی، هێزی داهێنان هەمیشە تاک و غەوارەیە بەرامبەر (باو)، ئاسان نییە خەڵک سەرجەم تیڕوانینەکان بە (١٨٠) پلە بگۆڕن. هەڵەی گەورە ئەوەیە تۆ نەتوانی ئەو گۆشەو چەمکانە بدۆزیتەوە کە لێوەی دەچیتە ژوورەوە، واتە: دۆزینەوەی دەرگاو پەنجەرە لەسەر کەشفکردنی ئەو دنیایەی تۆ دەتەوێ بە دنیا بینییەکی نوێوە قسەی لە سەربکەیت، ئەم هەڵە زبرو گەورەیە زۆر لە شاعیرانی ئێستامان دەگرێتەوە، کە دەتوانم بڵێم: هەستکوژن و شیعر نامۆ دەکەن بە مرۆڤی کورد. ڕەنگە ئەم کارەساتە زۆر لەسەر قوربانیدانی داهێنەرانی کورد کەوتبێ. لێکدانەوەو شیکردنەوەی مۆدێرنیزم کارەساتێکی کەم نییە کە شاعیرانی کورد هیچ پرۆژە و پێناسەیەکی ئێستێتیکایی وانادەن بە دەست خوێنەرەوە، تا هەر لەسەرەتاوە پرەنسیپەکانی مۆدیرنە ئاشکراو دیار بێت بۆ گفتوگۆ، بۆیە دنیای ئەمڕۆی شیعری کوردی زۆر ئاڵۆزە، خوێنەری زیرەک و بە ئەزموون نەبێ شیعری چاک و خراپی پێ لە یەک جیاناکرێتەوە. جگە لەمە ئێمە تازە لە هەزار سەرەی سیاسەت بەسەر ئیحساسە مرۆڤانەکاندا قوتار بووین - ئەگەر بوو بێتیشین!- کەچی بۆ بەدبەختی مودێرنە بۆ ئ
خۆی بۆتە ئاڵۆزکردنی دنیای شیعر. پێم وابە
هەڵوەستە بکەین و بپرسین: ئایا ئێمە
ئەوی مۆدێرنیزم کێشەکە
گشتگیرییەکەی هە
دوێنێ هە

پەلی داهێنەر دەگری و لە کەنارەکانی دوور لە دەریای ڕوانینی خۆی فێرە مەلەیەکی تر دەبێت، تا بە جۆرێکی تر باس لە کارەساتەکانی هەمە ڕوانین بکاتەوە.

**ڕامان:** ئەی لەبەرچی کتێبی سێکس لەنێو خوێنەراندا زۆرباوەو ڕەواجی هەیە؟

**عەبدولقادر سەعید:** کتێب یا نووسراو لەسەر سێکس و بەرەواجبوونی مانای فراوانبوونی تێرامانە، مانای قووڵبوونەوەو تێگەیشتنە لە پێداویستە ئینسانییەکان. دیارە نووسین لەسەر سێکس بۆ خۆی جێی پرسیارە و لێکدانەوەی جۆراو جۆر هەڵدەگرێ، لەگەڵ ئەوەشدا کەس ناتوانێ ئەم غەریزە ئینسانییە ڕەت بکاتەوە، ئەوەندە هەیە لەئێستەی دنیای ڕۆژاوای شارستانی، سێکس جۆرێکی تری داگیر کردن و چەوسانەوەیە، بەتایبەت بۆ ئافرەتان دەبێ سێکس مانا ئینسانییەکەی بنرخێندرێ و بەها بەنرخەکەی دەستنیشان بکرێ. من بۆ خۆم ئەم ئاوڕدانەوەیەی ئەم ساڵانەی دوایی بەکارێکی شیاوو شارستانی و ئینسانی دەزانم، بەڵام ئەم سەرەتایە پێویستی بە ئاماژەدان هەیە و ڕێبازی زانستییانە و پشت بەستن بەنرخی مرۆڤەوە کە یەکسانی نێوانیان بە بەرزدەنرخێنێ. سێکس یەکێ لەو پێگە حەرامکراوانەیە کە: میلۆنەها مرۆڤ قوربانی لە سەرداوەو هەزارانی لەسەر تیرۆر کراوە، کە بەشێکی زۆر لە مێژووی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە. لێدانی ئەم دەرگا زۆر حەساسە و کەسانی پسپۆڕو شارەزا لە بوارەکانی کۆمەڵناسیدا، لێکۆڵینەوەیان هەبێ، قسە و باس لەسەر سێکس جۆرە ئەتۆمێکە کە ناوکی چێن لەسەر چێن، جورئەت داگیری دەکا.

بۆ ئێمەی کوردو ڕۆژهەڵاتی- بەلای کەمەوە- شکاندنی ئەو کەپتە داگیرکراوەیە کە بەرچاوی تاریک کردووین. هیوادارم ئەم بەشە گرنگە سەرەتایەکی ئینسانی و زانستی وابێ، بەرچاوی ئەم چەمکە حەرامکراوە ڕۆشنبیر بکاتەوە..!

**پێناسە**

* عەبدولقادر سەعید- ١٩٥٧- سلێمانی.
* لە سەرەتای هەشتاکانەوە دەنووسێ.
* ئەم بەرهەمانەی بڵاوکردۆتەوە:
- مەرگی بەختەوەری - شانۆگەریی شیعری
- دەروازەی سێیەمی مێژوو- درامای شیعری
- زیندان- شیعری درێژ
- سەمفۆنیای خوێن- شیعر
- ڕوانین- شیعر
- نامە کراوەکانی تاراوگە- شیعر
- ئەو ساتانەی نامانەوێ بلێێن بەڵێ
- ڕاگوێزان: بەرنامەیەکی داڕێژراو بوو لە چەند خاڵێکی ترسناکدا- لێکۆڵینەوە.
* لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی دەرەوە و ناوەی کوردستان بەردەوامی هەیە و لە شاری کۆڵن- ئەڵمانیا-ش دادەنیشێ.

**هەڤپەیڤینی:**
**مەحموود زامدار - ئازاد عەبدولواحید**

# تۆدۆرۆڤ بە تۆدۆرۆڤ-دا دەچێتەوە

## «چاوپێکەوتنێکی تایبەتی (الفکر العربي المعاصر) لەگەڵ تۆدۆرۆڤ-دا»

سازدانی: هاشم سالح
و: جەمال ڕەشید
(سلێمانی)

(١-٢)



تۆدۆرۆڤ

### ١- میتۆدیەتی بونیادگەری: پێداچوونەوەو چاوپێکداخشاندنەوە

(بەبۆنەی دەرچوونی وەرگێڕانی عەرەبی بۆ دوا کتێبی (نقد النقد)«١»، لەسەر داواکاری (مرکز الإنماء القومي) لە بەیرووت، چاوم بە تۆدۆرۆڤ کەوت کە لە کتێبخانەکەیدا بوو لە قوتابخانەی پراکتیکی خوێندنی باڵا لە پاریس، ئەمەش بۆ ماوەی یەک سەعاتی تەواو بوو. بۆنەیەکیش بوو بۆ ئەوەی چەند پرسیارێکی بەچێژی لێ بکەم: پرسیارێک کە پێوەست بوو بە میتۆدی ڕەخنەیی یا بە واتایەکی تر میتۆدە ڕەخنەییەکان، پاشان پرسیارێک کە تایبەت بوو بەو قووڵایی فیکرییەوە کە بەزەرووڕەت لە پشت گشت ڕەخنەیەکی بنەڕەتییە وە خۆمەڵاس ددا، پاشانیش پرسیارێک کە تایبەت بوو بەو ئیشکالیەتە بیرییە بنەماییانەوە کە گۆڕەپانی ئێستای ڕۆشنبیری ئەورووپای سەرقاڵ کردووە، بەڵام پرسیاری یەکەم تاڕادەیەک (شۆکیانە) بوو بەهۆی دوا هەڵوێستی تۆدۆرۆڤەوە لەسەر بونیادگەری، کە بوود جێگەی گەڕانەوەیەکی ئاشکرا لە هەڵوێستە پێشینەییەکانی. هەلیش ڕەخسابوو بۆی بە پێدانی مافی بەرگری کردن لەخۆی).

- چۆن ڕوویدا کە تا ئەم ڕادەیە تۆ بە بونیادگەری فریودرایت؟ ئایا نەدەتوانرا لەو کاتەوە پێشبینی کەم و کوڕی و هەڵەکانی بکەیت (واتە لەشەستەکانەوە)؟

**تۆدۆرۆڤ:** تۆ بە شێوەیەک پرسیارێکم لێ دەکەیت کە تایبەتە بە پێوەندیەوە بە دیراسەو فۆرمالیزمی و بونیادگەرییەکانی ئەدەبەوە. ئەم پێوەندییەش سانانییە لەنێو پێوەرێکدا کە بەدرێژایی چەند ساڵێک بە چالاکییەکی بینراو بەشداریم تێداکردووە. ئێستاش تاڕادەیەک هەڵوێستێکی ڕەخنەیی وەردەگرم، مەودایەک وەردەگرم، گەر بشخوازیت دەتوانم دووشت لەم بارەیەوە بورووژێنم کە بەشێوەیەک لە شێوەکان لە کتێبەکەمداخۆم لێداون.

یەکەم: بەرگری کردنە لەم جۆرە لێکۆڵینەوانە، واتە بەرگری کردن لە میتۆدگەرایی بونیادگەری لە ڕەخنەدا. بەڵێ بەرگری! من بە شێوەیەکی گشتی لەو وێنە بیرکردنەدام کە بەراورد کردنی ڕەخنەیی لەجێی هەوڵدانە بۆ ڕوونکردنەوەی واتای دەقێکی دەست نیشانکراو. ڕەنگە ئەو دەقە زۆر کورت بێت، وەک ئەوەی تاکە دەستەواژەیەک بێت. لەوانەشە قەسیدەیەک (چامەیەک) یا ڕۆمانێک، یا کۆ بەرهەمی نووسەرێک یا زیاتربێت: واتە جۆرێکی ئەدەبی بەتێکڕایی......، بەڵام چۆن دەگەینە ڕوونکردنەوەی ئەم واتایە؟ ئا ئەمەیە پرسیارەکە. لە ڕاستیدا ئێمە بۆ گەڕان بە شوێن ڕەوتێکدا (سیاق) بانگهێشت کراوین کە لە نێوان ئەم و دەقدا پێوەندییەک دابمەزرێنین و ئەم پێوەندییەشە کە مانا دروست دەکات. لەوەشدا کە تایبەتە بە باری لێکۆڵینەوە فۆرمالیزمی و بونیادگەرییەکانەوە، ئەوە دەبینین کە ئەم ڕەوتە سەر بە تەرزێکی دەست نیشانکراوە. ئەمەش ڕێرەوێکی هاو شێوەیە، مەبەستم ئەوەیە کە سەر بەهەمان سروشتی دەقە ڕەخنە لێگیراوەکە خۆیەتی. بۆ نموونە بۆ ئەوەی دێڕە شیعرێک لە چامەیەکدا شی بکەینەوە، تاوەکو باسی لێوەبکەین پێویستە (بیخەینە پێوەندییەکەوە) لەگەڵ دێڕەکانی تردا، واتە لە نێوان ئەم و ئەوانی تردا پێوەندییەک دروست بکەین. خۆ ئەگەر چامەیەکی تەواومان هەبێت، بۆ ئەوەی لە بونیادە پێکهێنەرییەکەشدا باسی لێ بکەین، پێویستە

لەسەرمان کە بیخەینە پێوەندییەوە لەگەڵ چامەکانی تردا. بۆ ئەوەی لە تێڕوانینێکی بونیادگەریانەشدا ڕۆمانێک شی بکەینەوە پێویستە لەسەرمان کە بونیادە پێکهاتەییەکەی ڕوونن بکەینەوە و پاشان بیخەینە دیدگایەکی ڕۆمانییانەوە: واتە یەکەم جار ڕۆمانە هاوچەرخەکان، یا ڕۆمانەکانی تری هەمان نوسەر، یان جۆرێکی ڕۆمانی بەشێوەیەکی گشتی. هەموو ئەمەش تایبەتە بە جۆرێکی دیاریکراوەوە لە چێوەیەکی نێوەندی دەوروبەر، واتە ڕێڕەوێکی هاوشێوەو هاو گونجاو.

- مەبەستت لە ڕێڕەوی زمانەوانییە؟

**تــــــۆدۆرۆف:** بێگومان، لەبەر ئەوەی لێرەدا قسە لەسەر شیکردنەوەی ئەو دەقە ئەدەبییانە دەکەین کە زمان وەک ئامرازێکی دەربڕین بەکاردێن، نەوەک قسە لەسەر هونەری وێنەکێشان و هەڵکۆڵین بکەین کە ئامرازی تر بەکاردێن، بەڵام کاری دووەم کە دەمەوێت بیوروژێنم ئەوەیە کە ئێمە هەڵدەستاین بە پەرچە کردارێک دژی مێژووی ئەدەبی یا تەقلیدی، کە بەپێچەوانەی ئەمەوە، گرنگی بە ڕێڕەوێکی ناهاوشێوە دەدا، واتە ئەو ڕێڕەوەی کە سەر بەسروشتی دەق نییە.

بۆ نموونە بۆ شیکردنەوەی دەقێک دەیانگوت کە ئێمە دیراسەی ژیانی نووسەر یا ململانێ کۆمەڵایەتییەکانی ئەو ماوەیە یان ئایدیۆلۆژیا باڵا دەستەکان یا گەشەسەندنی ئابووری کۆمەڵگا دەکەین... تاد، بەواتا دیراسەی ئەو شتانە دەکەین کە خۆیان وەک ڕەگەزێکی تێکستی پێشکەش ناکەن، بەڵکو وەک ڕەگەزێکی میتاتێکستی یا میتازمانەوانین، بەڵام هەموو ئەوەی پێشتر وتم لە وەسف کردنێکی بارودۆخەکان زیاتر نییە، ئەگەر لەسەر دروستی ئەم وەسفە ڕێک بکەوین ئەوا پرسیاری خراوەڕوو ئەمە دەبێت: چۆن دەکرێت موقارەبەیەکی (نزیکخستنەوە) فۆرمالی یا بونیادگەری هەڵبسەنگێنین؟

من دەڵێم ئەم موقارەبەیە بە تەواوەتی شتێکی پێویست و ڕەوایە. لەبەر ئەوەی ئەم پێوەندییە شێوەییە بونیادگەرییانە بابەتێکی هەبوو ئامادەیە و گرنگییەکی هەرە گەورەی هەیە لە دۆزینەوەی مانا یا پێکهاتنی واتایەکی تایبەت بەدەقێک، بەڵام ئەم لێک نزیک بوونەوەیەش بەس بەو مانایەی کە پێویستە لەسەرمان ڕێڕەوەکانی تریش (یا کۆڵەگەکانی تر) لەبەرچاو بگرین جگە لە ڕێڕەوی گۆکاری و زمانناسی. کەواتە لەنێو ئەم دیدگایەدا دەبینین کە هەردوو مەنهەجییەتەکە تەواوکەری یەکترن.

- بەڵام بۆچی لە کاتی هەڵچوونی شەپۆلی بونیادگەریدا ئەمەتان نەوت؟ بۆچی ئەم خاڵەتان پشتگوێ خست یا واتان لێکرد کە لەژێر پەردەی بێدەنگیدا تێپەڕێت؟

**تــــــۆدۆرۆف:** ئەوەی تایبەتە بەمنەوە، هەموو کاتێ ئەمەم گوتووە، بەڵام بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی زۆر بە پەرۆشم بۆ میتۆدییەتی بونیادگەری و فۆرمالیزمی لەوکاتەدا، ئەمە دەڵێم: کاتێ لە سەرەتای شەستەکاندا گەیشتمە فەرەنسا (ڕێک ساڵی ۱۹۶۳) کولتوورێکی جیاواز لە کولتووری فەرەنسیم هەڵگرتبوو«۲».

زۆرم سەر سوڕما کاتێ بینیم کە لە تاکە تەرزێکی نزیک بوونەوەی ئەدەبی زیاتری تێدانییە، واتە تەرزی دیراسەی ناهاو شێوەیی، هیچ گرنگیەکیشیان نەدەدا بە بونیادی گۆکاری و شێوازی ئەدەب. بە هەرحاڵ ئەم گرنگی دانە لە هەبوونێکی پەرش و بڵاو و پەراوێزی زیاتر نەبووە.

- بەڵام نەشیاوو ئاستەمە کە هیچ شیکردنەوەیەکی شێوەیی لە فەرەنسادا نەبووبێ؟

**تۆدۆرۆف:** بێ گومان کەسانی وەک ڕۆلان بارت هەبوو، بەڵام لەو ماوەیەدا شتێکی وای لە لایەنی بونیادگەرییەوە بڵاونەکردبۆوە کە باس بکرێ. هێشتا قۆناغی بونیادگەری (بارت)یش دەستی پێ نەکردبوو. هەروەها (جیرار جینیت)یش هەبوو، بەڵام تەنانەت یەکەم کتێبیشی دەرنەچووبوو. بێ گومان پێشینە کۆنەکانی وەک (پۆڵ ڤالیری و مارسێل پرۆست)یش هەبوو.

- خەریک بوو ئەوە بڵێم و نارەزایی بە (ڤالیری) دەربڕم وەک نموونەیەک لەسەر گرنگی دان بە کردەی ئەدەبی بهێنمەوە.

**تــــۆدۆرۆف:** بەڵێ، بەڵام ڕاکانیان نەخرابوونە نێو دیراسە ئەدەبییەکان و پرۆگرامەکانی زانکۆوە، بەڵکو بە واتایەکی تر دەستەواژەیەک بوون لەسەر تێڕامانەکان لەبارەی ئەدەب کە کاریگەریی لە نووسەرە داهێنەرەکان دەکرد، بەڵام نەدەچووە نێو دیراسە زانکۆییەکان و کاری تێ نەدەکردن. بابەتی باو لە زانکۆدا لە ساڵی (۱۹۶۳)دا مەنهەجییەتی مێژووی ئەدەبی ڕووت و پەتی بوو و بەشێوەیەکی داخاوی و سەرسوڕهێنەر بێ ئاگابوون لەو تیۆریە ڕەخنەییانەی لە وڵاتەکانی تردا ڕوویان دەدا جگە لە فەرەنسا. مەبەستم لەمە ڕووسیای فۆرمالیزمییە(واتە فۆرمالیزمە ڕووسییەکان)، بەڵام ئەمەش تاکە قوتابخانە نەبوو. بۆ نموونە کاری زۆر گرنگ لە ئەڵمانیادا ڕوویدا لە پێش جەنگی جیهانی دووەم و دوای جەنگدا.

- پاشان ئەو کاتە (ڕەخنەی تازە) هەبوو (The new criticism)، ئەنگلۆسەکسۆنی؟

**تــۆدۆرۆف:** بێ گومان، ئەو کات (ڕەخنەی تازە) هەبوو کە دەتوانین بە فۆرمالیزمەکانی ڕووسیا یا ئەوەی لە ئەڵمانیادا ڕوویدا بەراوردی بکەین. ڕەخنەی تازەی ئەنگلۆسەکسۆنی دەستەواژەیەک بوو لەسەر پەرچەکردار بەرووی میتۆدگەریی فیلولۆژیی پەتی دا: واتا دژی مەنهەجییەتی ئەو مێژووە ئەدەبییەی کە وەک زانراوە لانسۆن لە فەرەنسادا سەقامگیری کرد.«۳».

بەڵام ئەموتووە کە یەکێک لەم دوو میتۆدیەتە ڕاستەو ئەوی تریان هەڵەیە یا پێویست نییە. هەموو ئەوەی لە کارەکەدایە ئەوەیە کە کاتێ یەکێکیان لە بیرکراوو پشت گوێ خراو بووبێ ئەوا ئاسایی بوو کە گرنگی پێبدرێ و لێی خوردبیتەوە.

- بەڵام، بۆچی (لەگەڵ کۆمەڵێ بونیادگەری فەرەنسی-دا) لە جێی تاکە میتۆدتان داناوە؟

**تۆدۆرۆف** (بەتوندییەکەوە): من بە تاکە میتۆدیەتم دانەناوە. لە هیچ ڕۆژێکیشدا لەو بروایەدا نەبووم کە تەنیا خۆی بەس بێت لە دیراسە ئەدەبییەکاندا. کەواتە لەوەدا تایبەتە بەم خاڵەوە ڕام نەگۆڕیوە. ئەو ڕەخنەیەی لەدوا کتێبیشمدا (ڕەخنەگرتن لە ڕەخنە) ئاراستەی بونیادگەریم کردووە هەروەها لەسەر



سپینۆزا

مەنهەجییەتی مێژوویش پراکتیزە دەبێت و هەردووکیان پێکەوە لەخۆ دەگرێ و بە دوو لقی هەمان ئەو هەڵوێستەیان دادەنێت کە بەشێوەیەکی بنەمایی بە یەک باری دەمێنێتەوە. ئەم هەڵوێستەش (فەلسەفییانە) تاکە. ئایا ئەو هەڵوێستە کامەیە؟ وەک دەزانیت لە کتێبەکەمدا (نقد النقد) پشتم بە سپینۆزا بەستووە، ئەو فەیلەسوف و تیۆریستە گەورەیە....

– ڕاستە و سەرم سوورما بەوەی کە سپینۆزات بەیەکەم ڕەخنەگری نوێ داناوە، بەپێی زانیاریی من ڕەخنەی بونیادگەری شتێکی دواکەوتوو و سەردەم نوێیە، ئایا ناکۆک بوونێک نابینیێ لە خستنەپاڵیدا بۆ سپینۆزا؟

## ٢- سپینۆزا: دامەزرێنەری ڕەخنەی نوێ

**تۆدۆرۆف:** بەڕای من، هەردوو میتۆدیەکە، مێژووگەرێتی تەقلیدی و بونیادگەریی نوێ بنەڕەتی خۆیان لە سپینۆزادا دەدۆزنەوە.

ئەوەی سپینۆزا بە دەربڕینە گشتییەکان دەیڵێت دژی ڕاڤەکردنی دەقە ئاینییەکانی پێش خۆی، دەتوانرێت بە ڕەخنەیەکی مێژوویی یا گەر بتەوێت بە فیلۆلۆژیا ناوزەد بکرێت و دەشتوانرێت بەڕەخنەی بونیادگەریی زمانناسی ناوزەد بکرێت. ئەو قسەکت و پرۆسەرسوڕهێنە چی دەگەیەنێ؟ لێرەدا پێویستە بچینە وردەکارییەکانەوە. لێکدانەوەی دەقەکان تاوەکو نێوەڕاستی سەدەی حەڤدە مەحکوم بوو بە شێوازی ڕاڤەکردنی شوێن کەوتوو لە خوێندنەوەی دەقە پیرۆزەکاندا (واتە تەورات و ئینجیلەکان). وەک چۆن کولتوورێکی تەواوتان هەیە لە ڕاڤەکردنی قورئاندا، ئەوا لە کولتووری ئەورووپیدا ڕاڤەکردنێکیش بۆ تەورات هەیە. میتۆدییەتی ئەم ڕاڤە کردنەش لە سەدەکانی یەکەمی مەسیحییەتدا بە دەرکەوت لە لایەن باوکانی کەنیسەوە لە وێنەی ئۆریجین و کلیمان ئەسکەندەرانی و قەشە ئۆگەستین و زۆربەی تر جگە لەمانە. ئەم میتۆدییەتەش کۆمەڵێ ڕێنمایی دیاری کراوی هەبوو. ئەم ڕێسایانەن کە سپینۆزا ڕەخنەیان لێ دەگرێ و لە دواییشدا سەردەمێکی نوێ بۆ نێو لێکدانەوەیی دەکاتەوە، ئەو سەردەمانەی کە تا ئێستاش پێوەی پابەندین.

– کەواتە دیکارت واڵاکەری (دەستەپێکەر)ی نوێگەری نییە بەڵکو سپینۆزایە؟

**تۆدۆرۆف:** سپینۆزایە لەوەدا کە تایبەتە بەنێو لێکدانەوەییەوە، بەڵام سەبارەت بەفەلسەفە بێ گومان دیکارتە. دیکارت بوو لەجێی (سروشت)یاخوا مرۆڤی خستە چەقی گەردوونەوە، بەڵام وتارەکانی لەنێو لێکدانەوەییدا نەنووسی، لە کاتێکدا سپینۆزا ئەمەی لە وتارە تیۆلۆژییە- سیاسییەکاندا کرد کە زیاد لە نیوەی بۆ مەسەلەکانی نێو لێکدانەوە و ڕاڤەکردن تەرخان کرد.

ئەمانە گەر ئەم دەربڕینە بشێت وتارێکن لە بارەی ئەدەبییەوە، مەبەستم لە ڕەخنەی تەوراتی و ئینجیلی-دایە. سپینۆزا وای دادەنێ کە کەموکوڕی بنەماییانەی ڕاڤەکردنی کۆن ئەوەیە کە پێشتر گریمانەی ئەوە دەکا کە دەقی پیرۆز پێویستە ڕاست بڵێت و ناشێت لە ڕاستی زیاتر هیچی تر بڵێت، کەواتە تەورات یا (سەردەمی تازە)ڕاستەو ڕاستی دەڵێت. بەڵام ئەو گرفتەی لەمەوە دێتە ئاراوە ئا ئەمەیە: واتایەکی ڕاست هەیە نوێنەرێتی ئەوە دەکات کە لە ساتێکی دەست نیشانکراودا کەنیسە بەوەی داناوە کە ناوەڕۆکی بیروباوەڕی مەسیحییەت پێکدەهێنێ. ئا ئەمەیە دوا واتای گشتی و کۆتایی تێکستی تەوراتی و واتایەکی پیتی یاگۆیی هەیە بۆ دەقەکە وەک ئەوەی کە هەر خوێنەرێک دەیخوێنێتەوە قسەیەکی لەسەر گورگ و کاوڕ باخچەکان و پیاوان و ژنان... تێدادەبینێتەوە و هەموو ئەو دیاردە بینراوو هەستپێکراوانەش کە مەدلولێکی ئاینی ئاشکرایان نییە. کەواتە تێپەڕین بەم واتا پیتییەی تەوراتدا پێویست بوو، (مەبەستم سەردەمی کۆن و تازەیە بەیەکەوە)، بەرەو واتایەکی بیروباوەڕییانەی تیۆلۆژی وەک لە نووسینە یا بەرهەمە تیۆلۆژییەکاندا دەیبینین. گرنگی ڕاڤە کردنیش (بەوەی کە تەورات حەقیقەت دەڵێت) لە سەلماندنی چۆنیەتی ڕوودانی ئەم تێپەڕینەدایە:

واتە لە سەلماندنی ئەوەدا کە پێشتر سەلمێنراوە! لەبەر ئەم هۆیە میتۆدییەتی گەورەو پەسەندکراو کە لەو کاتەدا بەکارهێنرا میتۆدییەتی ڕاڤە کردنی خوازەیی بوو کە لەسەر خواستن و درکە ڕاوەستابوو. ئەو ڕاڤە کردنەی کە نێو لێکدانەوەی هەموو شتێک دەستەبەر دەکات لە مەدلولەوە بۆ مەدلوول تاوەکو دەگاتە پەردەلادان لەسەر حەقیقەت، بەو واتایەی کە مەسیحییەکان دەیدەنە ئەم وشەیە: واتە بیروباوەڕی مەسیحی. ئا ئەمە بوو حەقیقەتی سەراپایی باو لەو کاتەدا و پێویست بوو کە گشت شتێک بەمە کۆتایی بهاتایە. سپینۆزا هات بۆ ئەوەی ئەوە بڵێت کەواتاکەی بریتییە لە: من ئامانجم جێگرتنەوەی بیروباوەڕێک نییە لەجێی بیروباوەڕی مەسیحییەت کە وەک ئەوەی بۆ نموونە فەلسەفەی ئەفلاتوون یا ئەرستۆ تەنانەت دیکارت-ی هاوچەرخی سپینۆزاش لە جێگەی ئەودا دابنێم، بەڵکو دەمەوێت ڕاست کردنەوەیەکی ڕیشەیی و هەیکەلیانە لە هەردوو پرۆسەی ڕاڤەکردن و نێولێکدانەوەییدا بکەم ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە حەقیقەت ئەو پرسیارە ئاراستە کراوەنییە کە پێویست بێ لە کاتی شیکردنەوەی دەقدا بیخەینەڕوو. لە مڕۆ بە دواوە پێویست ناکا پرسیار لەوە بکەین کە ئایا ئەم دەقە

حەقیقەت دەڵێ یان نا؟ بەڵام تاکەشت کە پێویستە بیخەینەڕوو ئا ئەمەیە: ئایا کوتومت ئەم دەقە چی دەڵێت؟ کوتومت واتای ئەم دەقە چییە؟ بەڵام لەم کاتەشدا واز لەوە دێنین کە پێش وەخت ئەوە بزانین کە دەق چی دەڵێت. بەم جۆرە سپینۆزا دەستی کرد بە گەشەپێدانی کۆمەڵێ ڕێساو تەکەنییات کە تێپەڕینمان لە دەقێکی دیارو ئاشکرا یا هەندێ کات لە دەقێکی تاریک و تێ نەگەیشتراو بۆ دەرەخسێنێ بەرەو شتێک کە بانگەشەی ئەوەی بۆ بکرێ کە واتایەکی ڕاستە: واتە مانای کۆتایی و ڕوونی ئەو دەقە. ئا ئەوەیە ئەو ڕاتەکاندنە گەورەیەی کە سپینۆزا بەرپای کرد بەپێوانەکردنی بە ڕاڤە کردنێکی ئایینی تەقلیدی«٤».

تەکەنیاتەکانی سپینۆزا هەمەچەشن و زۆرن من ناچارم کە کەمێک ئاسانی بکەم لەبەر ئەوەی زیاد لە پێویست درێژەم پێداوە. ئەویش بەمانە کورت دەکرێتەوە:

١- تەکەنیەتی مێژوویی یا میتۆدیەتی مێژوویی: سپینۆزا وای دەبینێ کە پێش شیکردنەوەی دەق پێویستە لەسەرمان زانیاریمان لەسەر چاخەکە هەبێت و لەسەر نووسەرو ئەو زەمانەی کە لەوکاتەدا باو و تەواو بووە... تاد، ئا ئەمە بوو کە پێشتر بەڕێرەوی ناهاوشێوە یا دەرەکی دامنابوو.

٢- تەکەنییەتی بونیادگەری یا ناو خۆیی: پێویستە لەسەرمان لە دیراسەکردنی هەموو پارچەیەکی تەوراتدا بەگشت ئەو پارچانەی تری بەراورد بکەین کە قسە لەسەر هەمان بابەت دەکەن. کەواتە پێشنیاری هەڵسان بەجۆرێک لەشیکردنەوەی بونیادگەری و دۆزینەوەی نموونەی گەورەی بنەڕەتی و بابەتگەراییمان بۆ دەکا بۆ زانینی ئەوەی کە ئایا هەمەچەشنی یا ڕاستکردنەوە هەیە لە پارچەیەکەوە بۆ پارچەیەکی تر....

بەم جۆرە شیکردنەوەی بونیادگەری و شیکردنەوەی مێژوویی دروست بوون. لەبەر ئەوەش لە کتێبەکەمدا (نقد النقد) وتوومە کە هەردوو میتۆدییەتەکە لە هەمان بزووتنەوەوە سەرچاوەیان گرتووە لە هەمان منداڵدانەوە لە دایک بوون. ئا ئەمەیە ئەو شۆڕشە کۆپەرنیکییەی کە سپینۆزا دروستی کرد، کە لە لەلایەن کەسانی ترەوە دەگێڕدرایەوەو دووبارە دەکرایەوە تا دەگەینە سەدەی نۆزدە یا (کۆتایی سەدەی هەژدە و سەرەتای سەدەی نۆزدە) بەم جۆرەش فیلۆلۆژیا دادەمەزرێت. پاشان ئەم فیلۆلۆژیایە لە سەدەی بیستدا گۆڕاو مەنهەجییاتی تر لە دایک بوو وەک زمانناسی هەموو ئەمەش بۆ ئەوە باس دەکەم تا پێت بڵێم کە کامە هاوبەشە لە نێوان مێژوو و بونیاددا کاتێ کە لەدەقێکی ئەدەبی نزیک دەبنەوە کە ئەویش واتایە نەک حەقیقەت. ئەم دووانە بەشوێن حەقیقەتدا ناگەڕێن، بەڵکو بەشوێن واتادا دەگەڕێن، ئەو سەرزەنشتەی لە کتێبەکەشمدا ناڕاستەیان دەکەم (لێرەشدا دەگەمە کرۆکی بابەتەکە و دێڕی مەبەست) ئەوەیە کە ئەم دووانە زیاد لە پێویست پێیانە شوێن پرنسیپ و ڕێساکانی سپینۆزا کەوتن. گومانی تێدانییە کە سپینۆزا کاتێ ئەوەی کردووە ویستوویەتی ڕاڤەکاری لە کۆمەڵێ خووی خراپ و زۆر زەرەرمەند ڕزگار بکات. لەبەر ئەوەی گەر پێشتر بزانین کە دەق چی دەڵێت ئەوا بێ گومان بە شێوەیەکی ئاگادار و چاوکراوەیی نایخوێنینەوە«٥». کەواتە سپینۆزا هەنگاوێکی گەورە و ئاکامێکی زۆر پۆزەتیڤیانەی بەدەست هێناوە، بەڵام هەندێ کات پرسیار لەوە دەکەم کە ئایا پێویستە لە سەرمان تا ئەم ڕادەیە واز لە ترانسیدنتالی بهێنین.

مەبەستم لەمە واتای ئایینی وشەکە نییە، بەڵکو مەبەستم لە گشت هەوڵدانێکە بۆ دەرچوون لەو دەقە تایبەتە و پابەندنەبوون پێوەی بە شێوەیەکی ئیمانێنسیانە واتە دەست بەردان لە ڕاڤەکردن تەنها ئەوە نەبێ کە لەناو دەقەکەدا هەیە جا ڕێڕەوەکە (سیاقەکە) بونیادگەری یا مێژوویی بێ. لە هەموو بارێکدا پێویستە لەناو دەقدا بمێنینەوەو من دەپرسم: ئایا مافی ئەوەمان نییە کە بڕیار لەسەر دەق بدەین؟ بێ گومان من لەگەڵ گەڕان بەشوێن واتا و پوختەکردنی واتادام بەوردی، بەڵام پێویستە ئەمە کەڵکەڵەی حەقیقەتیشی لەگەڵدا بێ.

دەتوانیت وتووێژ لەسەر سروشتی ئەو حەقیقەتە یا جۆرەکەی بکەین، ئەمە مەسەلەیەکی ترە، بەڵام پێویستە بەشوێن حەقیقەتدا بگەڕێین. ئا ئەمەیە ئەو پێداگرتنە بنەماییەی کە داوای دەکەم کە لە ڕەخنەی بونیادگەریش یا ڕەخنەی مێژوویی و تەقلیدیدا دەستەبەر نابێت. ئەو پرسیارەی دەشێ خەمەڕوو ئەوەیە: ئایا ئەوەی دەق دەیڵێت ڕاستە؟ کامەیە ئەو هەڵوێستەی دەتوانین بەوە ناوزەدی بکەین کە ڕاست و دادپەروەرە؟ کامەیە ئەو هەڵوێستەی کە پێویستە منی خوێنەرێکی نێولێکدەرەوەیی وەری بگرم، بە پێوانەکردن بەوەی کە دانەری دەق پێم دەڵێت؟ من ئیتر ڕازی نابم بەوەی کە لە ئاستێکی کەمتر (یانزمتر) لە دەقە ڕەخنە لێگراوەکە شوێن گیربم، بەڵکو لە ئاستی ئەودا شوێن گرتە دەبم. ڕاستە من هەوڵی دووبارە ڕێکخستنەوەی مانا دەدەم، بەڵام هەوڵی ئەوەش دەدەم کە نووسەرەکەی ڕابگرم و لێی بپرسم: ئایا ئەمە نزیکە لە ماوەی سپینۆزاوە؟ ئایا ئەمە لەناو ئەو ماوەیەدایە؟ پاشان لێی دەپرسم: ئایا ئەوەی دەیڵێت ڕاستە؟ ئایا تۆ لەسەر حەقیت؟

## ٣- هیچگەرایی و گرفتی حەقیقەت

- بەڵێ، بەڵام بەپێی چ پێوەرێک بۆ حەقیقەت دەتەوێت بڕیار لەسەر ئەو دانەرو نووسەرانە بدەیت؟ قسەکانی پێشووت بەشێوەیەک لە شێوەکان ڕەخنەگرتنێک لە هیچگەرایی دەگەیەنێ بەبێ لێدوان لەسەرناوێک؟ لە کتێبەکەدا بینیم کە چەند پەڕەیەکی دووروودرێژت بۆ پرۆتێستۆکردنی پووچگەرایی نووسەرەکانی مۆدێرنێتە تەرخان کردووە لە وێنەی مۆریس بلانشۆ یا تەنانەت (ڕۆلان بارت)یش. ئەو حەقیقەتە چییە کە نووسەری لەسەر دادگایی دەکرێ؟ ئایا ئەو حەقیقەتە مەسیحییەیە کە باسی دەکەیت و دەڵێت کە پووکانەوەکانی خۆرئاوایی ڕادایە (دەریایەک لە هیچگەراییەوە) گەر دەربڕینەکە بشێت؟ یا حەقیقەتێکی تر هەیە کە دەتەوێت بۆ یەکەم جار بۆمانی دەربخەیت؟

**تۆدۆرۆف:** لە لاپەڕەی دووەمی کتێبەکەمدا وتوومە کە پرۆژەی من ئەوەیە ک لەو ساتانەدا کە تێیاندا لەگەڵ هیچگەرایی-دا دەجەنگم (٦) بەبێ باوەڕی (ملحد) بمێنمەوە. ئێستاش ڕەنگە پێویست بووبێ کە وشەیەکمان لەسەر هیچگەرایی بوتایە..

- بێ گومان، چاوەڕێی ئەمەشت لێ دەکەم لەبەر ئەوەی نیمرۆ بابەتەکە بەلای هەموومانەوە گرنگە و بە تایبەت بۆ ئەو

وەرچەرخانە ترسناکانەی مرۆڤی ئێستای پێداتێدەپەڕێ.

**تۆدۆرۆف:** هیچگەرایی یەکێکە لە دیدگاکانی عەقڵییەتی نوێ، بەڵام تاکە دیدگا نییە وەک هەندێک پێیان وایە. ئەمە یەکێکە لە دیدگا زۆر بەهێزو بەزەبرەکانی و هێندە بەسە کە چاوێک بخەینە سەر هەموو ئەدەبی نوێ لەخۆر ئاوادا بەدەست پێکردن لەکافکاو جویس و پرۆست و کۆتایی هاتنیش بە سامۆئیل بیکێت تاوەکو فێری ئەمەببین (واتە فێری هیچگەرایی ببین).

- پێویستە لێرەدا ناوی نیتشە و تیۆریزەکردنەکانیمان وەبیربێتەوە لەبارەی بابەتەکە؟

**تۆدۆرۆف:** بێ گومان، نیتشە گەورەترین فەیلەسوفی هیچگەراییە، بەڵام تەنیا نییە. لە ڕاستییدا ئێمە هەموومان پووچگەراین گەر خۆمان بە باپیران و باپیری باپیرانمان بەراورد بکەین. برێکی زۆر گەورەمان لە گومان و پرسیارکردن هەڵمژیوە تا ئەو ڕادەیەی هەموومان وەک هیچگەرایەک دەردەکەوین لە تێڕوانینی باوو باپیرانماندا. بەڵام هیچگەرایی- بەواتایەکی زۆر وردو زاراوەیی- بریتییە لە ڕەتکردنەوەیەکی ڕیشەیی تەنانەت بۆ تەنیا شیانی هەبوونی حەقیقەتێکی هاوبەش یا بەهای هاوبەشیش... ئا ئەمەیە ئەو هیچگەراییەی پرۆتستۆی دەکەم.

- مەبەست لە حەقیقەتی هاوبەش و بەهای هاوبەش ئەو حەقیقەتە گەردوونی یا بەها ڕەهایەیە کە بەسەر گشت مرۆڤدا پراکتیزە دەبێ و لە هەموو کۆمەڵگا و بارودۆخەکاندا یا...؟

**تۆدۆرۆف:** نەخێر، کوت و مت ئەوەنا، بەڵام ڕێگەم بدەپێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە پەڵپگریەت بدەمەوە با بەردەوام بم لە بابەتەکەدا و بنەڕەتی هیچگەرایی ڕوون بکەمەوە. بێگومان هیچگەرایی لە شکستی ئەو بیروباوەڕە هاوبەشانەوە دێت کە لە ڕابردوودا هەبوون، کاتێ ئایین ئەمەی ئەنجام دەدا چێوی مەرجەعییەتێکی هاوبەشی پێشکەش بەگشت کۆمەڵگا دەکرد. کە ئەمە ڕۆژێک لە ڕۆژان گەردوونی نەبووە لەبەر ئەوەی ئەوە دەزانین کە کۆمەڵگا (مەسیحی و ئیسلامی و بووزی و هیندۆسی و کۆنفۆشیۆسی و...تاد)ەکان هەن، کەواتە تەنانەت ئایینە گەردوونییەکانیش گەردوونی نین لەبەر ئەوەی نەیان توانیوە کە گشت دانیشتوانی گۆی زەوی بگرنەوە (ئەمە خاڵێکە)، بەڵام دەبینین کە لەناو گشت کۆمەڵگایەکدا چوارچێوەیەکی هاوبەش هەبوو بۆ حەقیقەت و بەها، بەڵام ئەو شتە تازەیەی بەهاتنی دیکارت و شۆڕشی پیشەسازی و گۆڕانی نوێی جیهانی ڕووی دا بریتی بوو لە لیندی فیدالیزم و شوناسە کۆمەڵییە گەورەکان دەستیان کرد بەلێک هەڵوەشانەوە تا تاکەکان جێگایان بگرنەوە هەموو تاکێک باش و خراپی بۆ خۆی هەڵدەبژارد و دەیگوت:

ئا ئەمەیە تەوەرەوکانگاکانم. دیموکراسییەت لە ئەورووپای خۆرئاواییدا لە دوای هەردوو شۆڕشی ئەمەریکی و فەرەنسییەوە دامەزرا لەبارەی جەختکردن لەسەر توانستی قوتاربوون لە هەموو کۆمەڵ یا کۆمەڵ بوونییەک. لیبرالییەکانی ئەو ماوەیە (کە زیاد لە لیبرالییەکانی ئێستا لیبرالیتر بوون) بەو ئەزموونی ترس و قەسابخانانە (سووتێنران کە دوای شۆڕش لە فەرەنسادا ڕوویان داو لەمەش ئەم وانەیەیان لێ دەرهێنا: پێویستە زەمینەیەکی دیاری کراو بۆ تاک تەرخان بکرێت کە نەتوانرێت دەستی لێ بدرێت. دەوڵەت دەتوانێت لە ڕێگەی دانانی یاساکانەوە دەست لە کاروباری خەڵک و ڕێکخستنی وەر بدات، بەڵام پێویستە ڕێزێکی تایبەت بۆ تاک بهێنێتەوەکە نەتوانرێت بیردرێت و تێک بشکێنرێت. لەم کاتەشدا تاک مافی خۆیەتی ئەوە هەڵبژێرێت کە دەیەوێت و بڕیاردەری چارەنووسی خۆی بێت. تاک ئازادە لە هەڵبژاردنی ئەو ئایینەدا کەدەیەوێت، ئازادیی بیرو دەربڕین و ئازادیی فێربوون و خوێندنیشی هەیە. هەندێکیش ڕقیان لەم ئازادییانە دەبووەوەو لەجێی ئازادییە شێوەییەکانی بۆرجوازیەتیان دادەنا،... تاد، بەڵام تێبینی ئەوەمان کرد کە کاتێ ئەم ئازادییانە ڕەت دەکرێتەوە ئەوا هەموو گەل کاریگەر دەبێت بەمە و بارودۆخیان دادەتەپێ و ژیانی مەدەنی کۆمەڵایەتی خراپ دەبێ.

- ئێستا بیر لە چ سیستمێک دەکەیتەوە؟

**تۆدۆرۆف:** بیر لە سیستمە دیکتاتۆرییەکان دەکەمەوە. لە هەموو دیکتاتۆرییەتەکان دا(جا شێوەو جۆریان هەر چۆنێک بێت) ئەم ئازادییە فۆرمیانە ڕەت دەکەنەوە وەک ئازادیی تاک لەگواستنەوە و گەشتکردن بۆ دەرەوەی وڵات، ئازادیی گۆڕینی ئەو شارەی تێیدا نیشتەجێیە یا ناردنی منداڵەکەی بۆ ئەو قوتابخانەیەی کە دەیەوێت.

- بەڵام لێرەدا بەلای خۆزگە خواستن بە دیموکراسییەتە بۆرژاوزییەکانی خۆرئاوادا دەچێت...

**تۆدۆرۆف:** جگە لەمە دەتەوێ چی بکەم؟ وایان وەسف کردووە کە دیموکراسییەتێکی بۆرژوازییە، بەڵام دوای سەرهەڵدانی دیکتاتۆرییەتەکان لە سەدەی بیستدا بۆمان دەرکەوت کە جگە لەمە شتێکی ترنییەو ئەوەی کە بەدیموکراسییەتە نا بۆرژوازییەکان بانگهێش دەکرێ لە دیکتاتۆرییەت زیاتر نییە. کەواتە ئەمە دیموکراسییەتی بۆرژوازی نییە، بەڵکو تەنیا دیموکراسییەتە و هیچی تر. ڕاستە هاودەمە بە تەرزێکی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری یا سۆشیال دیموکراتی یا لیبرالی یا..تاد، بەڵام تاکە شتی بنەمایی لەم دیموکراسیەتەدا بریتییە لە مافی تاک بۆ جیاواز بوون، مافی لە ئازادیی تاکەکەسیدا. ئەمە زۆر گرنگە و ناشتوانین نکۆڵی بکەین جا خراپەکارییەکانی سیستمی خۆرئاوایی و شێوازەکانی کارکردنی هەر چۆنێک بێت لە دەرەوەی وڵاتەکانیدا. ئەم پێداگرتنە دیموکراسییەشە کە تێکۆشانمان لەدژی (بەند کراوانی بیروڕا) بۆ دەستەبەردەکات لە گشت جیهاندا، (وتم بیروڕاو نەمگوت کاری چەکداری و توندوتیژی)، چونکە کەسانێک هەن بەند دەکرێن و ئەشکەنجە دەدرێن تەنیا لەبەر ئەوەی خاوەن بیروڕایەکی جیاوازترن لە بیروڕای ڕژێمەکانیان یاخود لەبەر ئەوەی سەر بەخێزانی ڕۆحی و ئایینی یا سیاسیی جیاوازن، بەڵام جەختکردنەوە لەسەر تاکێتی لە لایەکی ترەوە بووە هۆی پارچە بوونی بەستەرە کۆمەڵایەتییەکان و بەگەردیلەکردنی کۆمەڵگا تا ئەو پەڕی (واتە پەرشوبڵاوبوونی کۆمەڵگا). لەبەر ئەوەی کۆڕا لەسەر حەقیقەتێکی هاوبەش یا بەهایەکی هاوبەش نەماوە. هەر ئەمەشە کە لە دوایدا بەرەو فەلسەفەی هیچگەرایی دەچێت، کەتێیدا هەموو تاکێک خۆی بڕیار لەسەر ئەوە دەدات کە چاکە

یا خراپە.
- بەڵام کـۆڕایەک هەیە لەسـەر ڕێزگـرتن لەناکـامـەکـانی دەنگدانی گـشـتی بۆ نموونە ئەوانەی دژی زۆرینەی پەرلەمـانی تازەو سـەرۆکی هەڵبـژێردراو دەنگیـان دا باگـهێـشت کـراون بۆ ملکەچ بوون لە بەرامـــبـــەر زۆرینەو ڕێزگـــرتنی ئاکـــامی هەڵبـژاردنەکـان و دیموکـراسـیـیـەتدا.... (ئامـاژەیەکـە بۆ ئەو گۆڕانکارییە سیاسییەی کۆتایی کە لە فەرەنسادا ڕووی دا دوای شکستی سۆسیـالیـسـتـەکـان لە هەڵبـژادنەکـانی زسـتـانی ڕابردوودا).

**تـۆدۆرۆف:** بێ گومان، چەند فۆرمیولایەک هەیە کە کۆڕایی بەدی دێنێت، بەڵام دەنگدانی گشتی لە فەرەنسـادا شتێک نییە کە بەها-ت بەسەردا بسەپێنێ یا بەها-ت بەسەردا گۆش بکا، تۆ ناچاریت کە بەپێی یاساکانی ئێستای کۆمەڵگابژیت لەبەر ئەوەی هەڵبـژاردن بڕیاری ئەمەی داوە، بەڵام هەرگـیـز ناچارنیت تاوەکـو هاوڕایی کۆمـەڵگا بکەیت لە بەها هاوبەشـەکـانیـداو دەتوانیت کـە کەسێکی زۆر یاخی بیت، بەڵام ئەوەندە بەسـە کە یاسا پێشێل نەکەیت و نەبیریت بۆ ئەوەی لە سزابپارێزرێیت...
بەڵام هەمـوو ئەم گـشـتـێـتـیـیـانـە تارادەیەک لە بابەتە بنەڕەتییـەکـەمان دەباتە دەرەوە: کە ئەویش هیـچگەراییە. ئەم بابەتە جێگەیەکی بنەمایی داگیرکردووە لە کتێبەکەمدا وەک وتم تا ئێـسـتـاش لەسـەر ئاسـتـێکی فکری سـەرقـاڵی کـردووم... هیـچگەرایی بەشێکە لە دیاردەیەکی زۆر سـەراپایی کـە: تاک گـەراییـە. ئەمـەش ڕەتکردنەوەیەکی ڕیشـەییـە بۆ گـشت حـەقـیـقـەتێکی هاوبەش. لەو بڕوایە دانیم کـە ئەمـە تاکـە چارەسەربێت وەک زۆر لە نووسەرە خۆرئاواییەکان پێیان وایە. لەو بڕوایەدام کە چارەسەری تری شیاو هەبێت. لەو کتێبەکەشدا (ڕەخنە لە ڕەخنەگرتن) هەوڵی بەرگری کردن لە هێڵێک دەدەم کە مەبەستی نەرێ کردنێکی ڕیشەیی نییـە بۆ مۆدێرنێتـە، لە هەمان کاتیشدا تێپەڕاندنێکە لە هیچگەرایی و بۆ نموونە من پێشنیاری گەڕانەوە ناکەم بۆ سەدەکانی ناوەند یا چاخە کۆنەکان بۆ ڕزگـار بوون لە هیـچگەرایی و تاکگەرایی کـوشندە! بەڵکو هەوڵ دەدەم کە خۆم لەپەرگرییەکانی هیچگەرایی لادەم یا ئەوەی کەوا دیارە پەرگری یا قەبەڕۆیی بێت.

ئێستاش دەگەڕێمەوە بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە -یا بەواتایەکی تر پەڵپگرتنەکـەت- لەوەی کـە تایبـــەتە بەتێگەیشتنمەوە بۆ حەقیقەت. بێ گومان من حەقـیقەتێکی ڕەها یا حەقیقەتی کۆتاو دوایین حەقیقەتت بۆ نادۆزمەوە! گەر چاوەڕێی ئەمەش بیت ئەوا بێ هیوا دەبیت. من تەنیا تەسەوری خۆمت لەسەر حەقیقەت پێشکەش دەکەم....

لەو بڕوایەدام تایبـەت نییـە بە باوەڕهێنان بەبیـروباوەڕێکی دۆگمایی و دانانی هەموو ئەوانەش کە باوەڕی پێ ناهێنن لەجێی ئەوەی کـە دەکـەوێتـە کـەندەڵانەکـانی هەڵە و تاریکاییـەوە. ئا ئەمەشە کە لەگشت بیروباوەڕە ڕەهاکاندا ڕوودەدات جا کارەکە تایبـەت بێت بە مـەسـیـحـیـیـەت یا بەبیروباوەڕی لینینی یا هەر بیروباوەڕێکی تری داخراو لەسەرخۆی. ئێمە دەزانین کە جۆری سـەرقـاڵ بوون و مـیـکانیـزمی کـاری ناوخـۆیی لە هەردوو بیروباوەڕەکەدا یەکن، سـەرەڕای دژایەتی کردن و جیـاوازی لە ناوەڕۆک و پرنسیپەکاندا. لەهەردوو بەرەکەوە گوێڕایەڵی تەواو لە (باوەڕدارەکانیان) داواکراوە.

لەبەرامـبـەر ئەمـەشدا لەو بڕوایەدام کە دەتوانین پێناسـەیەکی ترو جێگەیەکی تر بدەین بە حەقیقەت، بەڵام پێویستە سەرەتا ئەو خـراپ تێگەیشـتـنە ناسـانە لابەرین کـە هیـوادارم تێی نەکەوتبم، ئەویش ئەوەیەکە: ئەو حەقـیقـەتەی لێرەدا قسـەی لەسەر دەکەین، ئەو حەقیقەتە هاو جووتەی وەسفکاری نییە کە دەشێت ئەزموونکارییـانە و زانستـیـیـانە بە دی بهێنرێت بۆ نموونە وەک ئەوەی بڵێین: تۆمارکەرێک یا کـتێبێک لەسـەر مێزەکەیە لە نێـوان من و تۆدا. وەک ئاشکرایە ئەم قـسـەیە ڕاسـتەو حەقـیـقـەتێکی هەستـپێکراو دەنوێنێ کـە دەتوانرێت ڕاسـتـەوخـۆ لەرێگەی دەست لێـدان و هەسـتـکردنەوە لێی دڵنیاببینەوە. میتۆدەکانی تێبینی زانستیشن کە بەر پرسیارن لە دۆزینەوەی ئەم حـــەقـــیـــقـــەتانە. ئا ئەمـــەیە بواری ئەپسـتـیمۆلۆژیای تایبەت بە زانسـتە وردەکانەوە، بەڵام ئەمە تەرزی ئەو حەقیقەتانە نییە کە لەسەری دەدوێین. ئێمە لێرەدا لەسەر تەرزی حەقیقەتە مرۆییەکان دەدوێین. هەموو ئەوەش کە دەمـەوێت بیـڵـێم ئەوەیە کـە دەتوانرێت حـەقـیـقـەت وەک پرنسـیـپێک بەکـاربهێنرێت کـەوتووێژ و گفـتـوگۆکـانمان ڕێک بخات. بۆ نموونە ئێستا من و تۆ ڕۆچووینەتە نێو گفتوگۆیەکی هاوبەشەوە، هەریەکەشمان قەناعەتی بە دروستی ڕاکانی هەیە و ئامادەشە بەرگریی لێ بکات، بەڵام بۆئەوەی گفتـوگۆکەمـان دەربڕینێک نەبێت لەسـەر (گـفـتـوگـۆی کـەرەکـان) بۆ ئەوەی گفتوگۆکەمان نەبێتە گفتوگۆیەکی خودی کە وەک دوو هێڵی تەریب بەلای یەکـەوە بڕۆن و بەیەکـدی نەگـەن، ئەوا پێـویسـتـە لەسـەرمـان شـتـێکی تر بدۆزینەوە کە جددیتـرو دەوڵەمـەندتر بێت. ئەو گفـتـوگـۆیەش کـە مـەبەسـتـمـە بەم تایبـەتمەندییـە جیـادەکـرێتـەوە: پێـویسـتـە من و تۆ بچـینە ژێر ڕێسـایەکی هاوبەشەوە کە لەسەر ئەوە داڕێژرابێت کە ئەگەر سەرنجێکت لا دروست بوو کە بەهانە عـەقڵانی و فکرییەکانم ڕازیت دەکەن، ئەوا ئامـادەبیت بۆ وازهێنان لە بیـروڕاکـانی خـۆت و خـۆشت بکەیتە هاوسەری بیروڕاکەسییەکانی من. پێچەوانەی ئەمەش هەر ڕاستە. کەواتە خۆمان بە ئامادەگی دەبینینەوە بۆ وازهێنان لە ئەفلاتوون گەر حـەقـیـقـەت ئەمە بخـوازێت. پەندێکی کـۆن هەیە دەڵێت: (ئەفلاتوونم خۆش دەوێت، بەڵام حـەقـیـقـەتم لە ئەفلاتوون خۆشتر دەوێت). پاشان گەر ڕازی بووین بەوەی کە ئەفـلاتوون لە خـاڵێکی دیاری کـراودا هەڵەی کـردووە ئەوا ئامـادەین بۆ شـوێن نەکـەوتنی. ئەمـەش هەمـوو ئەوەیە کـە لەکارەکەدا هەیە. بەنیـسـبـەت منەوە حەقیقەت لەم شتە زیاتر نییە. یا لە ڕێسایەک زیاتر نییە کە وتووێژەکانمان بەڕێوەدەبا و ڕێکیـان دەخـات. حـەقـیـقـەت ڕێسـایەکی مـیـتـۆدییـە و بوونەوەرێک نییەکە لەجیهاندا هەبێ و چاوەڕێی ئەوەبێ یەکێ دەستی بەسەردابگرێ و ببێتە زێوان یا پاسەوانی. ئا ئەوەیە حـاڵی حەقـیـقەتە ئەرسۆدۆکسییـەکـان لە گشت سیـسـتـمە ئایدیۆلۆژی و تیـۆلۆژییـە داخـراوەکـاندا. سـەبارەت بەمن حەقیقەت تەنیا ئەو کرانەوەو پەسەند کردنەیە بە ئاڵۆگۆڕکردنی ڕاو بەهانەکانمان.

پاشان لێم دەپرسی: ئایا حەقیقەت ناوخۆیی (خۆماڵی) یا نەتەوەیی یا جیهانی- گەردوونییە؟

منیش بەمە وەڵامت دەدەمەوە: گەر من و تۆ تا ئێستە کۆمەڵگایەکی بچووکی گفتوگۆکار پێک بهێنین ئەوا دەتوانین بگەینە حەقیقەتێکی سەراپایی دەست نیشانکراو و رایەکی هاوبەش لەبارەی بابەتێکی دەست نیشانکراوی ئاسان یا سەخت، پاشان دوای ئەمە دەتوانین بازنەی ئەم کۆمەڵگا بچووکە فراوان بکەین. ئێمە دەتوانین رووبکەینە گشت رۆشنبیرو هەموو جەماوەری خوێنەرە جاددەکان لە عەرەب و فەرەنسییەکان: واتە رووبکەینە نیشتمانێکی زمانەوانیی دەست نیشانکراو، بەڵام دەشتوانین بەتەمای بەجیهانی بوون و بەگەردوونی بوونیش بین. بێگومان سەختیشە لەسەرمان کە کردارییانە لە بڵاوبوونەوەی ئەم حەقیقەتە دڵنیابیینەوە لەلای گشت دانیشتووانی گۆی زەوی: واتە لای چوار ملیار کەس! ئەمە ئاستەمە، بەم جۆرە پێویستیش نییە، بەڵام لێرەدا نموونەیەک دێنمەوە ئەویش کانت-ی فەیلەسووفە کە ئامۆژگاریی زۆر گرانبەهای پێداوین و پێویستیشە لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر گوێی بۆ بگرین. کانت شتێکی دەگوت کە ئەمە ماناکەیەتی: مافی ئەوەت هەیە کە بابەتەکەت لەجێی راست دابنێیت گەرتوانیت بیکەیتە رێسا (دەستوور)یەکی گەردوون. واتە گەرتوانیت بەسەر هەمرواندا گشتی بکەیتەوە. ئەمەش جگە لە گریمانە کردنی یەکسانی لەمافەکاندا لە لای هەموو بوونەوەرە مرۆییەکانی شتێکی تر ناگەیەنێ: واتە مانای یەکبوونی رەگەزە مرۆییەکان دەگەیەنێ. لەدواییشدا مافی ئەوەمان نییە کە لەسەر بنەمای ئەوە مامەڵە لەگەڵ بەشێک لەم رەگەزەدا بکەیت کە لە ئێمە کەم بەهاترە (وەک گەلێک یا تایەفەیەکی ئاینی یا...تاد). بۆ نموونە ئیتر ناتوانین ئەو ئایدیۆلۆژیایەی سەروەر و کوێلە قبووڵ بکەین کە لەکاتەکانی رابردوودا باوبوو. لەبەر ئەوە دەتوانیت کە عەقڵییانە لە پێستی وتوێژ کارەکەتدا نیشتەجێ ببی و بپرسیت: ئایا دەگەمە رازی کردنی؟ ئەگەر بەشێوەیەکی هەستپێکراویش تەماشای بابەتەکە بکەیت و پرسیار لەچۆنێتی روودانی کارەکان بکەین لەچین یا هندستان و جیهانی عەرەبیدا ئەوا دەبینین کە پسپۆرەکان سی یا چل ساڵی تەمەنیان لەدیراسەکردنی رۆشنبیرییەکی ترداو رۆچوون تێیدا بەسەردەبەن. ئەوانە بە بەردەوامی گفتوگۆ لەگەڵ ئەو رۆشنبیرییەدا دەکەن وەکو نێوەندێکی خزمەتگوزارییانە لەنێوان هەردوو کولتووردا کاردەکەن هیچ ئاستەم بوونێکیش بۆ وەرگێرانی سەراپاییانەی نییە. بێ گومان هەموو پرۆسەیەکی وەرگێران یا نێوەندکردن دەبێتە هاودەمی ون بوون لەواتا و زانیارییەکاندا. حەقیقەت لە ئاستێک زیاتر نییە کە بەناراستەیدا دەرۆین بەبێ ئەوەی کە هەرگیز بە تەواوەتی پێی بگەین..❖

### پەراوێزەکان

..........

١- کتێبەکە لە (مرکز الأنماء القومي) لە بەیرووت دەرچووە، لەوەرگێرانی (سامی سویدان).

٢- تۆدۆرۆف لەبنەڕەتدا بولگارییە، کاتێ گەیشتە فەرەنسا تەمەنی لە (٢٠)ساڵ تێدەپەڕی، تا رادەیەکیش فەرەنسیی دەزانی و تەقەلایەکی زۆریشی دا بۆ لەبەرکردن و کۆنترۆڵکردنی کە بەهۆی ئەوە وازی لە زمانە بنەڕەتییەکەی هێنا: زمانی منداڵی و تافی لاوی لە سۆفیا. وا دیاربوو کە سەرەتا دەقەکانی بەزمانە بنەڕەتییەکەی دەنووسی و پاشان وەری دەگێرا بۆ فەرەنسی بۆ ئەوەی بڵاوی بکاتەوە، بەڵام ئێستا راستەوخۆ بە فەرەنسی دەنووسێ.

٣- مەنهەجییەتی لانسۆن لە سەرەتاکانی ئەم سەدەیەدا لەرێی (تەها حوسێن)و ئەو گەورە رۆشنبیرو زانکۆییە عەرەبانەوە گوێزرایەوە بۆ زانکۆکانی عەرەب کە هەلی دیراسەکردنیان لە خۆرئاوادا بۆ رەخسابوو. هەمووشمان ئاستی گەرم و گوڕی محەمەد مەندوور دەزانین بۆ ئەم مەنهەجییەتە لەدوای گەڕانەوەی لە پاریسەوە بۆ میسر لە سەرەتای پەنجاکاندا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانین بڵێین کە پراکتیزەکردنی ئەم مەنهەجییەتە لەسەر دیراسە عەرەبییەکان تا ئێستاش بەس نییە و بەشێوەیەکی وردو تەواو پەراوەی نەکراوە. پاشان دوای ئەمە و بەشێوەیەکی راستەوخۆ بازمان دا بۆ پراکتیزەکردنی مەنهەجییەتە بونیادگەری و فۆرمالیزمی و وامان دانا کە مەنهەجییەتی پێشوو کۆتایی هات و ئێمە هەموو توانستەکانیمان بەکاربرد، لە راستیدا ئەم جۆرە لە پەلەکردنەکە ئاکامەکەی باش نابێت، هەروەها پێویستە کە هەردوو مەنهەجییەتەکە یەک بخرێ و سنووردارێتی و توانستی هەریەکەشیان بزانین. دۆخی رەخنەی ئەدەبی عەرەبی هەرگیز رازیکەر نییە سەرەڕای هەندێ هەوڵی جددیش.

٤- ئەوەی تایبەتە بە لایەنی ئیسلامییەوە، خوێنەر دەبەینە سەر هەموو ئەوەی کە (محەمەد ئەرگۆن) نووسیویەتی و بەتایبەتی کتێبی (قراآت في القرآن) کە لەم دواییانەدا زۆربەی مادەکانیمان وەرگێڕاوە. ئەم کتێبە بۆ یەکەمین جار وێنەیەکی روون لەسەر راڤەکردنی ئیسلامی کلاسیکی و زانستی نێولێکدانەوەیی نوێ و دابڕانی جیاکەرەوەی نێوانیان پێشکەش دەکات.

٥- بۆ تێگەیشتنی رێکخراوەی مەعریفی (ئەپستیمی) کە رووبەرووی هەموو پرۆسەکانی نێولێکدانەوە دەبوونەوە لە چاخەکانی ناوەند دا پێویستە پەنا بۆ (الکلمات و الاشیاء)ی فوکو بەرین و بەتایبەت ئەو بەشەی بەناونیشانی (نثر العالم)ە. لە لاپەڕە (٣٢ بۆ ٥٩).

٦- تۆدۆرۆف بەیەک دەنگ لەم لاپەڕەیەدا دەڵێت: (بۆ ئەوەی بەخێرایی کاروبارەکان کورت بکەمەوە ئەوا دەڵێم کە ئەم کتێبە لەیەک کاتدا رووبەرووی وتووێژی واتای هەندێ دانراوی رەخنەیی سەدەی بیست دەبێتەوە پاشان توانستی رووبەڕووبوونەوەی هیچگەرایی بەر پەرچ دانەوەی بەبێ ئەوەی دەست لەبێ باوەڕیم هەڵگرم).

# لەگەڵ ڕۆحی سپی منداڵێکی بەساڵاچوودا

## «گفتوگۆیەکە لەگەڵ مامۆستا عومەر عەبدولڕەحیم ــ ی پەروەردەکارو نووسەری ئەدەبی منداڵان»



زەکەریا تامر-ی چیرۆکنووسی سووریایی لە وەڵامی پرسیارێکدا کە بۆچی ڕووی کردووەتە نووسین بۆ منداڵان و وازی لە گەوران هێناوە، دەڵێ: (بۆیە زۆرتر ڕووم لە منداڵان کردووە، چونکە لە گەورەکان هیوا بڕاو بووم، مەگەر ئەوان بتوانن لە ئایندەدا ژیانمان بگۆڕن و بەرەو باشتری ببەن).

مامۆستای خوالێخۆشبوو عومەر عەبدولڕەحیم یەکێکە لەو مامۆستا پێشەنگانەی کە لە چلەکانی سەدەی ڕابردووەوە بایەخێکی بەرچاوی بە ئەدەبیاتی منداڵان دا و لە ساڵی ١٩٥٨ یەکەم نۆبەرەی شیعری منداڵانی خۆی لەگەڵ خوالێخۆشبوو مامۆستا فەرەیدوون عەلی ئەمین بە ناوی (پاڵەوانی دوارِۆژ) چاپ و بڵاوکردەوە. ئەم مامۆستایە بە درێژایی نیو سەدە چ لە بواری پەروەردەکردنی منداڵ و چ لە بواری نووسین بۆ منداڵان خزمەتێکی گەورەو فراوانی بە منداڵانی کورد گەیاند. لە شاری سلێمانیشدا بەیەکێک لە مامۆستا سەرکەوتووەکانی وتنەوەی ئەلف و بێی کوردی ناسراوەو چەندان وەچەی پێگەیاندووە.

بە لای منەوە منداڵ باشترین و ڕاستگۆترین ڕەخنەگری ئەو نووسین و ئەدەبیاتەیە کە بۆیان دەنووسرێ، بۆیە ئەگەر منداڵان بکەینە پێوەر، ئەوە منداڵانی کورد باشترین گەواهیدەری سەرکەوتنی کارو بەرهەمەکانی مامۆستا عومەر عەبدولڕەحیم-ن کە هەمیشە هۆنراوە سادەو جوانەکانی وێردی سەر زمانی منداڵان بوون، لەو کاتانەشدا کە کراون بە گۆرانی هەمدیسان بە گەرمی پێشوازییان لێ کردوون و لە فراوانترین دەرگاوە چوونەتە نێو دڵە بچکۆلانەکانیانەوە، منداڵ چۆن پێوەری سەرکەوتنی کارەکان نییە، لە کاتێکدا نە موجامەلە دەزانن و نە بە دووڕوویی ئافەرینی کەسێ دەکەن و بە خاترو خۆترو گۆترەکاری ستایش و شاباشی کەس ناکەن.

ئەوەی لێرەدا دەیخوێننەوە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانییە لەگەڵ مامۆستا عومەر عەبدلڕەحیم کە بەر لە کۆچی دوایی بە چەند ساڵێک لە شاری سلێمانی ئەنجامم دا، کە تێیدا باس لە ژیان و ئەزموون و بیروڕای خۆی دەکات لەبارەی جیهانی پاک و وەنەوشەیی منداڵان. سەرەتا مامۆستا عومەر عەبدولڕەحیم لەبارەی ژیان و خوێندن و ڕۆڵی لە بواری پەروەردەو هۆگربوونی بە دنیای منداڵان وتی:

لە ساڵی (١٩٢٠)دا لە شاری سلێمانی لە دایک بووم، کاتێ کە فامم کردۆتەوە بە باوەشی باوکێکی دڵسۆزەوە بووم،

فرۆکەکانی ئینگلیز شارە خنجیلانەکەمیان بۆردومان دەکرد، بە (فتیلە)ی گڕاوی، گڕیان لە دارو پەردووی خانووەکان بەردەدا. کە سەرنجم لە دەورو پشتی خۆم دەدا لە خۆم بەو لاوە هیچ منداڵێکی ترم لەو ماڵەدا نەدەبینی، لەبەر ئەوە تامەزرۆی ئەوە بووم کەمنداڵانی وەکو خۆم، یان لە خۆم خوارتر بهاتنایە بۆ لام و بەیەکەوە یاریمان بکردایە، جگە لەوەی کە منداڵی یەک-دوو ساڵانم زۆر خۆش دەویست، زۆر بە زوویی لەگەڵ مندا ڕادەهاتن، هەمیشە ماڵەکەمان لەم جۆرە منداڵانە جمەی دەهات، گومان لەوەدا نییە خۆشەویستیم بەرامبەر بە منداڵ لەو کاتەوە دەستی پێکردووە.

کاتێکیش کە لە ساڵی ١٩٣٨-دا لە (دار المعلمین) وەرگیرام هاوینان کە دەهاتمەوە بۆ سلێمانی، خانووەکەمان کە بریتی بوو لە دوو ژوورو هەیوانێک، ژوورێکیانم دەکرد بە حوجرە و دەرسم بەو قوتابیانە تیا دەگوتەوە کە لە دەرسەکانیان (اکمال) دەبوون، ئەمەش ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو بۆ ئەوەی پەروەردەکردنی منداڵ و خۆشەویستییان لە ناخی دڵمدا جێگیر ببێ. کاتێکیش کە لە ساڵی ١٩٤٢-دا بووم بە مامۆستا هەژدە دانە ساڵ زمانی عەرەبی و خەلدوونییەو کوردی پۆلی یەکەمم گوتەوە، ئەمەش وەکو تاقیکردنەوەیەک وا بوو بۆ ئەوەی بچمە ناو ناخ و دەروونی منداڵەوەو بزانم چ ڕێگایەک بۆ فێرکردن و پەروەردەکردنیان هەڵبژێرم.

دوای ئەم هەژدە ساڵەش لە (دار المعلمین) و (دار المعلمات)، (اصول تدریس)ی عەرەبی و کوردیم گوتۆتەوە، کە ئەمەش هەر پێوەندیی بە پەروەردەکردنی منداڵەوە هەبووە. دوای ئەوەش شەش ساڵی تر تەنسیب کراوم بۆ گوتنەوەی زمانی عەرەبی لە (ثانویة الفنون البیتیة للبنات)، کە قوتابیان دوای ئەوەی شەش ساڵ لەم قوتابخانەیەدا دەیانخوێند دەبوون بە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی، ئێستاش کە خانەنشینم دەستبەرداری نووسین بۆ منداڵ و دەرس وتنەوەیان نەبووم و بە موحازەرات زمانی کوردی و عەرەبی لە قوتابخانە ناوەندییەکان و دواناوەندییەکاندا دەڵێمەوە، لەبەر ئەمانەی کە باسم کردن، هیچ کەموکورییەکی منداڵم لێ یاخی نابێ و زۆر بە ئارەزوو و شەوقەوە لە گەڵیاندا دەژیم، لەم ڕووەوە توانیومە کتێبێک دابنێم بە ناوی (پەروەردەو فێرکردنی منداڵ)ەوە کە بریتییە لە دووسەدو چل و هەشت لاپەڕەی گەورە کە ئێستا بە هیوای چاپکردنی دەمەوێ بیدەمە دەزگایەکی چاپ کردن.

دەربارەی وەڵامی پرسیاری کە خولیاو سۆزی ئەدەبیی مامۆستا عومەر عەبدلڕەحیم بۆچی دەگەڕێتەوەو لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە، وتی:

ئێمە لە کاتی منداڵیماندا، دوای تەواوکردنی قورئان لە حوجرەکاندا، (گوڵستان) و (بۆستان) و (ئەحمەدی)و گەلێک کتێبی ترمان دەخوێند، کە ئەمانە هەموویان شیعر



ئازاد عەبدولواحید - عومەر عەبدولڕەحیم لە کۆڕێکدا لە ساڵی (١٩٨٤) - سلێمانی

بوون، بە تایبەتی (ئەحمەدی) بە زمانێکی شیعریی وا نووسرا بوو کە هەموو منداڵێک حەزی دەکرد بیخوێنێتەوەو لەبەری بکات.

لە قوتابخانەی سەرەتاییشدا مامۆستای گەورەو خۆشەویستمان (حامید فەرەج) کە لە پۆلی چوارەم و پێنجەمدا وانەی کوردی پێ دەگوتین بەتاموچێژێکی ئەدەبی وا شیعرەکانی دەخوێندەوە، ناخی دەروونی دەهەژاندین و خولیای ئەدەبی تیا دروست دەکردین.

* کەی خولیای نووسینی شیعرت کەوتە سەرو ئەوانی لە سەرەتاوە هانیان داویت کێ بوون..؟

- لەساڵی (١٩٤٢)دا کە بووم بەمامۆستا دەمم لە شیعرو نووسینەوە دەدا بۆ منداڵ. مامۆستای خوالێخۆشبوو (بێکەس)ی شاعیرو مامۆستای خوالێخۆشبوو (أ.ب.هەوری)ی شاعیر زۆر هانیان دام بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزە کە شیعرو نووسینە بۆ منداڵان و شایەنی ئەوەن کە هەمیشە خۆم بە قەرزاریان بزانم و درووود و میهری خوایان بۆ بنێرم.

* ئەی بارودۆخی نووسین و ئەدەبیاتی منداڵان لەمڕۆکەدا چۆن هەڵدەسەنگێنن؟

- لە ئەدەبی منداڵانی کورددا چی هەڵبسەنگێنم؟ جێی داخە کە منداڵانی کورد لە چاو منداڵانی گەلانی تردا لەم ڕووەوە ئەوەندە هەژارن هەمیشە چاویان لەوەوەیە کە یەکێک هۆنراوەیەکی منداڵانە، یان چیرۆکێک یان مەتەڵێکیان بۆ بنووسێ، کە لەگەڵ قۆناغی تەمەن و پلەی خوێندنیاندا بگونجێ. خۆ ئەگەر بەرێکەوت گۆڤارێکی وێنەداری ڕەنگاوڕەنگیان بکەوێتە بەردەست ئەوەندە بە پەرۆشەوە دەیخوێننەوەو تەماشای وێنەکانی دەکەن دەڵێی لە ئاسمانەوە بۆیان هاتۆتە خوارەوە. ئیتر هیوادارم دامودەزگا لێپرسراوەکان و ئەو نووسەرانەی بۆ منداڵ دەنووسن لەم ڕووەوە پتر خۆیان ماندوو بکەن، تا منداڵانی کوردیش ئاهێکیان تێ بگەڕێ و بەچێژو تامی ئەدەبی سوودمەند گۆش بکرێن.

*پێت وا نییە ئەگەر ڕەخنەی لای ئێمە چالاک بێ، بتوانێ


عومەر عەبدولرەحیم – کەریم سەعید زانستی
بە کامێرای «ئازاد عەبدولواحید»

دەست بداتە بن باڵی ئەو ئەدەبە ساوایەو خزمەتێکی پێ بگەیەنێ؟

– ئەدەب بە هەموو جۆرەکانییەوە وەکو منداڵێکی ساوای بێ باوک و بێ دایک وایە، هەر ڕەخنەیە کە دەبێ بە باوک و دایکی ئەدەب و بە شیری پاک و بێگەردی خۆی ئەم ساوا ناسکۆڵەیە پێ دەگەیەنێ و دەیگەیەنێتە ڕادەیەک لەناو ئەدەبی گەلاندا بە پۆشتەو پەرداخیی خۆی بنوێنێ، ڕەخنەی (بناء)و ڕەخنەگرەکانیان دوورن لە هەموو لایەنگری و ناسیاوی و دەستیاوییەک، بەڵکو تەنیا نووکی قەڵەمەکانیان بۆ خزمەتی ئەدەبی منداڵ بەکار دەهێنن، بەڵام جێی داخە کە ئەم جۆرە ڕەخنەو ڕەخنەگرانە تازە لای ئێمە کەوتوونەتە گاگۆڵکێ و دارە دارەو پێویستیمان بەوە هەیە لەلای ڕەخنەگرە ناودارەکان ڕەورەوەیان بۆ بکرێن، تا ڕەخنەش لەلای ئێمە پێ بگرێ و بکەوێتە ڕاکردن و تەراتێن لەناو مەیدانی ئەدەبی منداڵدا.

* واقیعی ئەدەبیاتی منداڵان لەمڕۆکەدا چۆن دەبینی...؟

–هەرچەندە بەلای هەندێک کەسەوە بەرهەمی منداڵانەمان زۆرەو بازاڕی لێ سیخناخ کراوە، بەڵام بەلای منەوە لەم ڕووەوە زۆر هەژارین و خێرمان پێ ڕەوایە. یان ئەگەر چەردەیەکیشمان ببێ ئەوە هەندێکیان زۆر کرچوکاڵن و بۆ ئەوە ناشێن کە ناویان ببرێ بە ئەدەبی منداڵ.

(هەرچی کەوشی سووری لە پێدا بوو هەمزاغا نییە)، چونکە ئەدیب و ئەدەبی منداڵ مەرج و شەرتی تایبەتی خۆیان هەیەو ئەگەر ئەو مەرج و شەرتانەیان تیا نەبێ، زیانیان لە سوودو قازانج پتر دەبێ و ئەدەب لەبەر چاوی منداڵ دەخات، ئەوسا دەبێ بڵێین (بۆ ڕیش چووین، سمێڵیشمان نایە بانی).

* بەپێی ئەزموون و تاقیمانەی خۆت لە بواری نووسین بۆ منداڵان، ئەو ئەدەبەی سەرنجی منداڵان ڕادەکێشێ کامەیە..؟

– ئەو ئەدەبەی کە منداڵ بەلایەوە خۆش بێ و بیقۆزێتەوە، دەبێ ئەم مەرجانەی تێدابێ:

أ– دەبێ ڕستەکانی قورس و گران نەبن کە دەموپلی ناسکۆڵەی منداڵ ماندوو بکەن.

ب– ئەدەبی منداڵ چ شیعر بێ و چ چیرۆک و مەتەڵ، دەبێ بەو ڕستەو وشانە بنووسرێن کە منداڵان لەناو خۆیاندا بەکاری دەهێنن. بۆ نموونە: ئەگەر گوتمان نەوزاد و سیروان سەرو میزەڵدانێکیان بە دەستەوە بوو نەوندە فوویان تێکردبوو، یەکی بە قەدەر یەک ترۆزی زل ئاوسا بوون، لە پڕێکدا میزەڵدانەکەی نەوزاد تەقی و گوتی: بم م م، نەوزادیش یەک دانە بست لە عەردەکە بەرز بووەوە، سیروانیش بە دەم قاقاو تریقەی پێکەنینەوە گوتی: نەمگوت ئەوەندەی فوو تێ مەکە، دەبڕۆ ئەوە دەردت بێ. ئەگەر بمانگوتایە میزەڵدانەکەی نەوزاد تەقی و وشەی (بم م م)ی لەگەڵدا نەبوایە، بەلای منداڵەوە بێتام دەبوو. یان بمانگوتایە نەوزاد بستێک لە عەردەکە بەرز بووەوە، وشەی (یەک دانەی)ی لەگەڵدا نەبوایە، ئەوە تاموچێژی خۆی نەدەبوو، چونکە منداڵ لە شەش – حەوت ساڵیدا وشەی (دانە) زۆر بەکار دەهێنێ و دەڵێ: باوکم یەک دانە بەرخی بۆ کڕیم، یان دەڵێ دایکم یەک دانە قاتی شینی بۆ کڕیم، لەبەر ئەمانە بوو کە ئەم وشانەمان بەکار هێناوە.

* ئەو نووسەرو شاعیرە کوردانەی بۆ منداڵان دەنووسن و بەلاتەوە سەرکەوتوون و لە جیهانی منداڵان نزیک بوونەتەوە کێن بەلاوە پەسندە..؟

– ئەو نووسەرانەی کە ئێستا بۆ منداڵانی کورد دەنووسن و لە نووسینەکانیاندا سەرکەوتوون ئەمانەن: ع.ع.شەونم- کاکەی فەللاح- فەرەیدوون عەلی ئەمین- محەمەد ڕەشید فەتاح- دایکی سۆلاف- جەزا عەلی ئەمین- لەتیف هەڵمەت-سەلام مەنمی- تایەر ساڵح سەعید- حەمەڕەحیم ڕەمەزان- عەبدوڵڵا کوردی- جەمال نووری- ڕۆستەم باجەلان و گەلێکی تریش هەن کە ناوەکانیان نایەتەوە یادم و داوای لێبووردنیان لێ دەکەم.

* هۆی بایەخ نەدان و دواکەوتوویی ئەدەبیاتی منداڵان لە چیدا دەبینن..؟

– ئەدەبی منداڵ بەشێکە لە ژیان، بەشێکە لە دوارۆژ، بەشێکە لە پێشکەوتن، بۆیە هیوادارم و تکاکارم لەو نووسەرە بەڕێزانەی کە بۆ منداڵ دەنووسن ڕۆژ بەڕۆژ گەشەو گۆڕان بە نووسینەکانیان بدەن و شتی تازە تێکەڵ بە نووسینەکانیان بکەن، چونکە هەموو جۆرە ئەدەب و نووسینێک ئەگەر شتی تازە بابەت و نوێی تێکەڵ نەکرێت وەکو گۆماوێکی وەستاو وایە کە ئاوی پاک و پوختی نەیەتە سەر، لەئەنجامدا قەوزە هەڵدەهێنێ و بۆگەن دەکات.

* هۆی چییە بەشێوەیەکی قووڵ و جدییانە ڕوو ناکرێتە نووسین بۆ منداڵان، هەندێ زۆر بەسەخت و قورسی دەیگرن خۆیان لە قەرەی نادەن، هەندێکیش ئەرکەکە بە ئاسان و ڕووکەش وەردەگرن و کاری سەرپێیی لەسەر دەکەن؟

– جاران وا دەزانرا کە نووسینی ئەدەب بۆ منداڵ کارێکی ئاسانە و لە توانای هەموو خوێندەوارێکدا هەیە کە بۆ منداڵ



عومەر عەبدولڕەحیم - ١٩٤٠

بنووسێ، نەختێر ئەوە وا نییە، ئەو نووسەرەی کە بۆ منداڵ بنووسێ دەبێ شـارەزایی تەواوی لەم لایەنانەی خـوارەوەدا هەبێ.

نووسـەری ئەدەبیـاتی منداڵ دەبێ سـەرنج لە هەمـوو هەڵسـوکەوتێکی منداڵ بداو بە وردی لێی بکۆڵێتـەوە. بۆ نموونە باوک یان دایک ئوتومۆبیلێک بۆ منداڵەکەیان دەکڕن، بەڵام هێندەی پێناچێ منداڵەکە ئوتومـۆبیلەکـە پارچە پارچە دەکـات و تایەو بورغـوەکـانی لەو ناوەدا فـڕێ دەدات. ئەم منداڵە خۆ شێت نەبووە کە ئەوەی کرد! نەختێر ئەم منداڵە (حب الاسـتطلاع) وای لێکردووەو دەیەوێ بزانێ ئەم ئوتومۆبیلە چۆن دروست کراوە؟

جا ئەگەر دایک یان باوک لەسەر ئەم کارە لە منداڵەکە تووڕە نەبوون پاش ئەوەی سێ چوار ئوتومـۆبیل دەشکێنێ، ئەوسـا هەوڵی ئەوە دەدات کـە چۆن چاکی بکاتەوە. دیارە ئەمەش کارێکی پیرۆزەو منداڵ لەمەوە فێری شت دەبێ.

یان تەمـاشـا دەکـەین دایک و باوک گـۆڤـارێکی ڕەنگاوڕەنگی منداڵانە دەدەنە دەست منداڵەکـەیان، دەبینین پاش ئەوەی کە بێ تاقەت دەبێ لە تەماشا کردنی نیگارەکانی (شێر، شێر) دەیدڕێنێ و دەیکا بە تۆوی ژوورەکە، چونکە حەز لە دەنگی شێرەکەی دەکات، پاش ئەوەی کە پێنج شەش گۆڤارو ڕۆژنامە پارچە پارچە دەکات ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین دەبینین هەر ئەم منداڵە دەیەوێ پارچەکـانی بەیەکـەوە بلکێنێتەوەو نیگارەکانی لێ دروست بکاتەوە. هەروەها دەبێ بگەڕێین بەدوای ئەوەدا کە بۆچی هەندێک منداڵ ورک دەگرن و هۆی ورک گـرتنەکـەیان بدۆزینەوە، یان هەندێک منداڵ دەست لە هاوڕێیـانی خۆیان دەوەشێنن، یان هەندێک منداڵ حەز لە بەعزە خواردنێک ناکەن، یان هەندێک منداڵ شت لە دایک و باوک دەشارنەوە.

جا ئەگەر نووسەری منداڵ لەمانەی کۆڵییەوەو هۆیەکـانی دۆزییـەوە، دەتوانێ چیـرۆک و هۆنراوە لە بارەیانەوە دابنێ و چارەیان بۆ بدۆزێتەوە.

نووسەری منداڵ دەبێ چیرۆک و هۆنراوە بەو زمانە بنووسێ کـە منداڵ لە ناو خـۆیاندا پێی دەدوێن. هەروەها دەبێ نووسـەری منداڵ شـارەزای قـۆناغـەکـانی تەمـەنی منداڵ بێ و بزانێ کە منداڵ لە قۆناغی سێ ساڵییەوە تا قۆناغی شەش ساڵی و حەوت سـاڵی زیاتر حەز لەو چیـرۆک و هۆنراوانە دەکات، باسی گیانلەبەرو باڵندەو دەنگەکانی تێدایە.

لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە تا تەمەنی دە ساڵیی حەز لەو چیرۆک و هۆنراوانە دەکات کە باسی ئازایەتی و پاڵەوانیەتی تێدایە.

لە تەمەنی دە ساڵییەوە تا تەمەنی پانزە ساڵی زیاتر حەز لە چیرۆکی خەیاڵیی دەکات، چونکە ئەم قۆناغە لەلای منداڵ قۆناغێکە لە قۆناغەکانی خەیاڵ.

لە تەمەنی پازدە ساڵیی تا تەمەنی هەژدە ساڵی حەز لەو چیـرۆک و هۆنراوانە دەکـات کـە خـۆ بەخت کـردن و نیشتمانپەروەری و دڵداریی ڕاستەقینەیان تێدایە. بە کورتی دەبێ نووسـەری منداڵ بزانێ بۆ کـام قـۆناغ لەم قـۆناغـانە دەنووسێ.

* ئەگەر نموونەیەک لەو بارەیەوە بهێننەوە..؟

- انظر فرخ البط
فرخ البط عوام
سابحا في الشط
ينشد الأنغام
وق، وق، وق، وق، وق
وق، وق، وق، وق، وق

ئەم هۆنراوەیە کە بۆ منداڵێکە لە تەمەنی چوار ساڵییەوە تا تەمەنی شەش ساڵی، ئەگەر بە زۆر بدرێ بەسەر منداڵێکی تەمـەن دە سـاڵیدا، ئەوە جگە لەوەی کـە گـاڵتـەی پێدێ، هۆنراوەشی لەبەرچاو دەکەوێت.

* ئەی بە ڕای تۆ نووسـەری ئەدەبیـاتی منداڵان چۆن پێش دەکەوێ؟

- نووسەری منداڵ وەکو هەنگ چۆن بەدوای گوڵی جواندا دەگەڕێ و شیلەکەی دەمژێ، ئەمیش دەبێ کتێب و سیپارە، گـۆڤـار بەگـۆڤـار، ڕۆژنامـە بە ڕۆژنامـە بگەڕێ بەدوای ئەو شـتـانەی کـە بۆ منداڵ نووسـراون یان لەسـەر منداڵ و پەروەردەکردنیان نووسراون.

**هەڵپەیڤینی:**
**ئازاد عەبدولواحید**

# ناسینی ڕۆشنبیرو دیاردە ڕۆشنبیرییەکان

## (٣-٢)

بەشداربووان:
ڕێبین ئەحمەد هەردی، د.ڕەشاد میران، عوسمان یاسین، ئاسۆ جەبار، مەهاباد عومەر خۆشناو، ڕێبین ڕەسووڵ ئیسماعیل، تاریق کاریزی، شیرین ئیبراهیم حەیدەری، ئیسماعیل کوردە، دیار عەزیز شەریف.

**لە دنیای ئەمڕۆدا ئاخاوتن و وتوویژ لە بواری ڕۆشنبیریدا بەسەر زۆربەی بوارە هەمەجۆرەکانی دەروونی و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا باڵ دەکێشێت، هەر لەبەر ئەمەو بەمەبەستی تاوتوێ کردنی دیاردەو گرفتەکانی ڕۆشنبیری، دەکرێت جگە لە توێژی ڕۆشنبیران خەڵکانی دیکەی پسپۆرو شارەزا لە گفتوگۆکاندا بەشداربن.**

**گۆڤاری (ڕامان) لە ژمارەکانی ڕابردوویدا و لەم ژمارەیەو ئەوانی داهاتووشیدا چەند پرس و ڕایەکی لە شێوەی مێزگرددا بۆ وروژاندن گەڵاڵە کردووە، بۆ ئەم جارەشیان چەند کەسایەتییەک لە ئەهلی قەڵەمی ناو کۆمەڵگەی کوردی لە کەشوهەوایەکی هەمەڕەنگی فیکری و تیۆریدا دێنە ئاخاوتن.**

**ڕامان:** تا ئێستا لە کوردستاندا توخمە کاریگەرەکانی پەیامی ڕۆشنبیری کورد بزرە، واتە ڕۆشنبیر نازانێ بەتەواوی باس لە چی دەکات و باس لە چی ناکات، کێ بەرپرسە لە دۆزینەوەو خستنە سەر ڕێی پەیامێکی ڕۆشنبیری؟

**ڕێبین هەردی:** من نازانم مەبەستی تۆ لە توخمە کاریگەرەکانی پەیامی ڕۆشنبیر چییە؟ بەڵام دەزانم تاکە کەسێک بەرپرسیاری ئەو دۆخەی ڕۆشنبیری بێت، ڕۆشنبیر خۆیەتی. کێشەی ژیانی ڕۆشنبیری ئێمە ئەوە نییە کە کۆمەڵێ هێزی تاریک سەرقاڵی سەرکوتکردنی هەموو جۆرە تازەکردنەوەیەکی ڕۆشنبیریی بن، بەڵکو کێشەکە لە پێناسی خودی ڕۆشنبیر و لەناو خودی ئەو نەتەوەیەدایە کە ناومان ناوە ڕۆشنبیر. گەر ڕۆشنبیری ئێمە قسە ناکات، گەر دنیایەک لەبەردەست و چاویدا دێت و دەچێ و ئەو ڕستەیەکی لەسەر ناڵێت، گەر ژیانێک لەبەردەمیدا وێران دەکرێت و ئەو ئاخێکیش هەڵناکێشێ..

لەبەر ئەو شمشێرە گومانکراوە نییە کە لەسەر ملیان داناوە بۆ ئەوەی قسە نەکات.. ڕەنگە ئەم دۆخە تارادەیەک لەسەردەمی داگیرکردن و چیرۆکی ڕەشە کوژییەکانی بەعسدا ڕاست بوایە، بەڵام هەنووکە پاش کۆتایی هاتن بە دەسەڵاتی بەعس لە کوردستاندا، ئەم شمشێرە گومانکارە تەنیا لە خەیاڵی نەخۆشی ئەو کەسانەدا ماوە کە توانای بینینی هەموو ئەو گۆڕانکارییانەیان نەماوە کە ڕوویداوە. پێم وایە ئەوانەی قسە لەم جۆرە لۆژیکە دەکەن لە ڕاستیدا بەهانە بۆ قسە نەکردنێک دەدۆزنەوە کە لەبنەڕەتدا پێیان نییە تا بیڵێن. دڵنیابە ئەو ڕۆشنبیرەی دەڵێت ڕێگەم نییە قسە بکەم و سەرکوتم دەکەن، لە ڕاستیدا قسەی پێ نییە تابیکات، چونکە پڕ ئاشکرایە ڕۆشنبیر بە پێناس کەسێکە چاوەڕێی ئیجازە وەرگرتن لە هیچ کەسێک جگە لە خۆی و عەقڵ و ویژدانی ناکات بۆ ئەوەی


ڕێبین ئەحمەد هەردی

بکەوێتە قسە. ئەو دەمەی ڕۆشنبیر بە هانەکانی قسە نەکردن دەخاتە دەرەوەی توانا و دەسەڵاتی خۆی، لەوە دەکەوێت ناوی ڕۆشنبیر بێت، ڕۆشنبیر بە پێناسە ئەو کەسەیە کە مافی قسە کردن بەخۆی لە هەموو بوارێکدا دەدات، مادام بە شایستەی قسەکردنی دەزانێت.

ئیدی لەوەش ناپرسێت ئەو قسەکردنە کێ زویر یان خۆشحاڵ دەکات. لە پاڵ ئەم نەغمەی شانەخاڵیکردن لەبەرپرسیاریدا کە ڕۆشنبیرانی ئێمە بۆ قسەنەکردن دەیهێننەوە، ئەمڕۆ نەغمەیەکی دی لە دەمی هەندێک ڕۆشنبیرەوە دەبیستین کە دەیەوێت ڕۆشنبیری وەک بوارێکی دابڕاو لە ژیان تەماشا بکات. وەک پیشەیەک دەیبینێ کە تەنیا سەرقاڵی بوارەکەی خۆیەتی و دەم لە بواری دییەوە نادات. زمانحاڵی ئەمانە دەڵێت: ڕۆشنبیر ئەرکی نووسینی شیعرو چیرۆکە و پێوەندیی بە سیاسەت و ژیانی گشتیی خەڵکەوە نییە. پرسیاری ڕۆشنبیر ئەوە نییە ئایا ئێمە لەسەردەمێکی عەدالەتخوازدا دەژین یان لەسەردەمێکی پڕ لە ناعەدالەتیدا؟ ئایا کەس غەدری لێ دەکرێ یان غەدری لێ ناکرێ؟ ئەمانە هیچی پێوەندیی بە ڕۆشنبیرەوە نییە، ئەوەی پێوەندیی بەوەوە هەیە نووسین و شیعرو چیرۆکەکانێتی نەک هیچ شتێکی دی. ئەم دیدە فەقیرە کە هێشتا لەسەردەمی پێش زۆلا و دریفۆسدا دەژی، نازانێت بە درێژایی مێژوو ئەوەی قسەی لە عەدالەت و ناعەدالەتی کردووە ڕۆشنبیران بوون، بێ ئاگایە لەوەی تاکە گرووپێک بەردەوام سەرقاڵی ئەم باسانە بووبن ڕۆشنبیران بوون و بگرە هەر لەبەر ئەم دەستتێوەردانەش ناوی ڕۆشنبیریان بۆ داناون.

ڕۆشنبیر نابێ بە ڕۆشنبیر گەر بە پێناسە دەست لەو بوارانەوە نەدات کە بواری ئەونین، قسە لە نا دادپەروەرییەک نەکات کە لە جێگەی دی و لە بواری دیدا ئەنجامدراوە. بە مانایەک لە ماناکان ڕۆشنبیر ویژدانی کۆمەڵگاکەیەتی و هەر ئەو دەمەی ئەم ویژدانەی لە دەستدا، لەوە دەکەوێت ناوی ڕۆشنبیر بێت، بەڵام کێشەکە ئەوەیە ئێمە لەسەر یەک شت لەم شتانە ڕێنەکەوتووین... هیچ پێناسێکی دیاریکراومان بۆ ڕۆشنبیر نەبووە، ئەمەش ئەو سەرگەردانییەی هەنووکەی دروستکردووە کە وڵات پڕ بێ لە ناوی ڕۆشنبیر و کەچی خاڵی بێت لە هەموو کاریگەرییەکی ڕۆشنبیری. ئازیزەکەم دەبێ ئەو ڕاستییە تاڵە بزانین کە نەبوونی کاریگەریی ڕۆشنبیر لەسەر ژیانی ئێمە، لە بنەڕەتدا پێوەندیی بە نەبوونی پێناسێکی بابەتی و دروستەوە بۆ ڕۆشنبیر خۆی هەیە، پێوەندیی بەوەوە هەیە خەڵکانێکی زۆر بە ڕۆشنبیر ناونراون کە ڕۆشنبیر نین و ناشبن، نەک بەوەی ئێمە لە جیهانێکی وا دیسپۆتیزمدا بژین کە کەس ناوێرێت قسەی تێدا بکات. جیهانی ئێمە سەرگەردان و بێدەنگە، بەڕاستی نەک لەبەر ئەوەی برادەران گەروویان گرتووین و ناهێڵن نووزەمان لێوەبێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی بە ڕاستی توانای قسەکردنیان لە جیهانێکدا نییە کە قسەکردن تێیدا پێویستی بە زەخیرەی فکری و ڕۆشنبیری و شەونخوونیی ناو کتێبخانەکان هەیە. ئەمە دەڵێم و بێ ئاگا نیم لەو هەوڵی سانسۆرانەی لە هەندێک ناوەندی ڕاگەیاندنی حزبییەوە بۆ دەنگی ڕەخنەگر دەکرێت، بێ ئاگا نیم لەو بێزارییەی هەندێک لێپرسراوی حزبی و دەوڵەتی پێشوازیی نووسینێکی ڕەخنەگرانەی پێدەکەن... وە لێ هەموو ئەم شتانە پێوەندیی بە قسەکردنی ڕۆشنبیرەوە نییە. ڕۆشنبیر قسە دەکات و گەر تووشی کێشەیەکیش بوو هەر بەو تووش بوونە جارێکی دی کۆی سیستەمەکە دەخاتە ژێر پرسیار. ڕەنگە هەر یەکێک لە ئێمە لەسەر نووسینێک بگیرێین یان سەرکوت بکرێین، بەڵام بڕیار نییە ژیانی ئێمە ئەم ئەگەرە خراپانە کۆنترۆڵی بکات.

ئەوەی ژیانی ڕۆشنبیر کۆنترۆڵ دەکات ویژدان و هۆشیاری و ڕادەی خوێندنەوە و نەخوێندنەوەیەتی، نەک ئەو ئەگەرانەی دەشێ ڕووبدەن یان ڕوو نەدەن. من پێمـوایە کەس هێندەی ڕۆشنبیر لەم دۆخەی خۆی بەرپرسیار نییە. ئێمە پێویستمان بە سەرلەنوێ پێناسکردنەوەی ڕۆشنبیر و ئەو ئەرکانەوە هەیە کە دەبێ ڕۆشنبیر ئەنجامی بدا.

**د. ڕەشاد میران:** من بە ڕادەیەک لەگەڵ ئەو ڕایەدا نیم. ڕۆشنبیر باش دەزانێ باس لە چی بکات و دەتوانم چەندین نموونەی ڕۆشنبیرانی کورد بێنمەوە کە لەسەر باسکردنی «تابوو»ی سیاسی یان ئایینی یان کۆمەڵایەتی نووسیویانەو تەنانەت هەندێکیان گیانیشیان لە دەستداوە لە سەر ئەمە، بەڵام ئەمە تاکە تاکە، هەرچی ڕۆشنبیرانن بە گشتی من لەو ڕایەدام کە هێشتا وەکو توێژێکی کۆمەڵایەتیی خاوەن



د. ڕەشاد میران

هەمومی هاوبەش خۆیان نەنواندووە، بۆیەش تاکو ئێستا قورسایی و هەیبەت و کاریگەریی خۆی لەناو کۆمەڵدا نەچەسپاندووە تا دەسەڵات حسێبێکی بۆ بکات. کاریگەریی ڕەوش و قۆناغی ئێستاکە، ئەوەی لە پرسیاری یەکەمدا ئاماژەم بۆ کرد، ڕۆشنبیرانی لێک داپچڕاندووە، تەنیا لە کۆمەڵگایەکی مەدەنیدا کە سەربەخۆیی ئابووری و پیشەیی زامن دەکات ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕ و توێژی کۆمەڵایەتیی ڕۆشنبیران دروست دەبن.

**ڕێبین ڕەسووڵ ئیسماعیل:** ئەم پرسیارە ئیشکالییەتێکی زۆر دروست دەکات، لە هەمان کاتیشدا کۆمەڵێک پرسیاری تریش بەرهەم دێنێت، پرسیاری وەکو: مەبەست لە توخمە کاریگەرەکانی پەیامی ڕۆشنبیری کوردی، چییە؟ ئایا ڕاستە پەیامی ڕۆشنبیری بزرو نادیارە؟ یا بە شێوەیەکی تر، ئایا پێویستە دەستنیشانی ئەو ڕاستە هێڵە بکرێت کە دەبێت ڕۆشنبیر کاری لەسەر بکات؟ کێیە ئەوەی ئەم بابەتانە دیاری دەکات کە دەکرێت لە ئەمڕۆدا باس بکرێن؟ ئەو بابەتانە چین کە دەبێت باس نەکرێن؟ کێ بەرپرسە لەم بارودۆخەدا؟ من پێم وایە هیچ ڕۆژێک پەیامی ڕۆشنبیری کوردی بزرو نادیار نەبووە، ئا لێرەدا ڕێک من بە پێچەوانەی تۆ بیردەکەمەوە، ڕۆشنبیری کورد کەسێکە لە ئاست ئەو لێپرسراوێتییە مێژووییەدایە کە کەوتۆتە ئەستۆی، پەیامە ڕۆشنبیرییەکەشی زۆر ڕوون و ئاشکراو دیارە، گەشەدان بە کولتووری کوردی و فەرهەنگ و زمان، خەبات کردن لەپێناو زیاتر ئازاد بوون و درێژەدان بە ئەزموونی سەربەخۆیی و ئازادیی ڕاپەڕینی ئاداری (٩١)، هەوڵدان بۆ زیاتر دەستەبەرکردنی مافەکانی مرۆڤ و بونیادنانی کۆمەڵگایەکی مەدەنیی پێشکەوتوو و هاوچەرخ، بەرقەراکردنی زیاتری ئازادیی ڕادەربڕین و نووسین و بڵاوکردنەوە،....تاد.

ئەمانە هەمووی ئەو پەیامەن کە ڕۆشنبیری کورد بە درێژایی ئەم سەدەیە خەباتی لەپێناودا کردوون، ئێستاش نەوەیەکی نوێ هاتۆتە بوون، نەوەیەک پڕاو پڕە لە ڕەخنە و لێکدانەوەو خوێندنەوەی تازە، نەوەیەک خاوەنی ڕامان و جیهانبینیی تازەیە و سەرقاڵی ئەوەیە کێشە فیکرییەکان لەنێو دەقی کوردیدا بەرهەم بێنێت.

لەم ڕوانگەیەوە پێم وایە ڕۆشنبیری کوردی ئەگەرچی لەنێو فەوزایەکی گەورەدا گوزەران دەکات، بەڵام خودی ئەم فەوزایە گەورە دەرگای زۆری لە بەردەمدا واڵا کردووە، ئەوەش یەکێکە لە خاسیەتە چاکەکانی فەوزا، کە بەردەوام فرە ڕێگاو فرە ڕووگەیە. لەم حاڵەتەدا پێم وا نییە کەسێک هەبێت باوکی ڕۆشنبیری کوردی بێت و بەرپرس بێت لە دۆزینەوەو خستنەسەر ڕێی پەیامێکی ڕۆشنبیری، ئەوەی باسی لێوە دەکەیت دەشێت لە نێو سیستەمێکی تۆتالیتاریدا پیادە بکرێت، بەڵام ڕۆشنبیری کوردی، بەتایبەتیش نەوەی دوای ڕاپەڕین، ئەو سەرچاوەو مەرجەعییەتە قەبووڵ ناکەن! ئێمە نەوەیەکین پڕین لە ئاژاوەو هەرەپاسی، ناتوانین مەرجەعی فیکری و ڕۆشنبیری قەبووڵ بکەین، پێمان وایە هەرکەسەو خەریکی کاری خۆیەتی، لە ئەنجامدا بەهەموومان شتێک بەرهەم دێنین کە لەسەر کولتووری کوردی حیساب دەکرێت، من خۆم ناتوانم ئەو مەرجەعییەتە قەبووڵ بکەم، ڕێزم بۆ هەموو ڕۆشنبیران هەیە، بەڵام پێم وایە کەس بۆی نییە پەیامی ڕۆشنبیریی من دەستنیشان بکات، چونکە لەو حاڵەتەدا من وەکو کەینوونەیەک ون دەبم، من وەکو ڕەمزێکی ماتماتیکی بوونم دەبێت، (ئەگەر دەتانەوێ ڕەشم بکەنەوەو بسڕنەوە بخەنە نێو سیستەمێک، من ڕەمزێکی ماتماتیکی نیم، من منم)- ئەوە قسەیەکی کیرکیگۆردە-

**دیار عەزیز شەریف:** لەبارەی بزربوونی پەیامی ڕاستەقینەی ڕۆشنبیری کوردی، لەگەڵتاندا مە، کە هۆکارەکەی بۆ ئەو فەوزایە دەگەڕێتەوە کە لەسایەی هەندێ فاکتەرەوە، دەیان کەس بەناوی ڕۆشنبیر خەریکی وتار نووسین و دەربڕینی بۆچوونی بەردەوامدانە، بێئەوەی ساتێک حیساب بۆ شێوەی قسەکانیان بکەن، کە ئایا ئەوەی دەیڵێت دەچێتە ژێر چ پێناسەیەکەوە؟!

لە ڕاستیدا زاڵ بوونی ئایدیۆلۆژیای حزبی لە دە ساڵی ڕابردووەوە هۆکاری یەکەمی بەرهەمهێنانی ڕۆشنبیری نائەکتیف و بێ پەیامە، چونکە ئەو جۆرە ڕۆشنبیرە لە قاڵبدراوە، دواجار لە شێوەی کەسێتییەکی سەربەخۆدا شوناسی (ڕۆشنبیر)ی بەرناکەوێت. لەبەر ئەوەی ئەو کەسێکە پەیڕەوکەری ئایدیۆلۆژیای حزبێکە، بەڵام لە کەشێکی شەفافدا.

لێرەوە ئەگەر ڕۆشنبیری کوردی خۆی بە ڕۆشنبیرانی دنیا بەراورد بکات، ئەوکات تێ دەگات ئەو کەسێکە لە دەرەوەی سیستەمەکانەوە، قسە لەبارەی سیستەمەکان دەکات، بە مانایەکی تر پەراوێزێکی نێو سەنتەرێکە، ئەگەر ئەوە ڕوون بکەمەوە، بەم شێوەیە: خۆی لە پێگەی دەسەلات یا ڕاگەیاندندایە، بەڵام کوا گوتارە ڕۆشنبیرییەکەی؟!

لەسەردەمی ئێستادا بە پلەی یەکەم دەسەلات بەرپرسە لەبەردەم دۆزینەوەی پەیامێکی ڕۆشنبیری، ئەمەش لەبەر ئەوەی لەسەر دەسەلاتە زەمینەیەکی لەبار خۆش بکا بۆ ڕادەربڕین بەوپەڕی ئازادییەوە، ئەمەش ناکرێ تا ئەو کاتەی خودی دەسەلاتی کوردی جۆرو شێوەی ڕۆشنبیرانی کورد لەیەکتری جیانەکاتەوە، مەبەستم ئەوەیە تا ئێستا لەسەر هەر دوو ئاستی کۆمەلایەتی و سیاسی کوردی، ڕۆشنبیران بە تەواوی نەناسراون، هەرلەبەر ئەوەشە ڕۆشنبیرانی جددی تا ئێستا لە پەراوێزدا دەژین. ئەو کەسایەتییە بەهرەمەندانەی لەنێو واقیعی ونبوونی پەیامی ڕۆشنبیریدا، بە پێچەوانە خاوەنی گوتارێکی مەعریفیی نوێن.

دواجار هاتنەکایەوەی گوتارێکی ڕۆشنبیریی کاریگەر پەیوەستە بەخستنەگەڕی هەردوو توانای بابەتی و خودی، کە دیارە هی یەکەمیان ئەرکەکەی لە ئەستۆی دەسەلاتدایەو دووەمیشیان دەکەوێتە سەرشانی ڕۆشنبیر خۆیەوە.

**شیرین ئیبراهیم حەیدەری:** بێگومان ڕۆشنبیر خۆی وا دەناسێنێ کە هەڵگری پەیامێکە و هیچ مەبەستێکی تایبەتی یان سوودێکی ڕاستەوخۆی لەم پەیامە نییە، هیچ مەبەستێکی لەوەدا نییە تەنیا داکۆکی کردنە لە شتە پیرۆزو موقەدەسەکان. بەدرێژایی مێژوو هەندێک لە ڕۆشنبیرانی کورد لە پێناوی ئازادی و ڕۆشنگەریی ئەم کۆمەڵگایەدا خەباتیان کردووە زۆریش ماندووبوونە، کەچی بەداخەوە لەبەر پەیدابوونی نوخبەیەکی دیار لە ڕۆشنبیران کە بۆ ئامانج و


شیرین ئیبراهیم حەیدەری

مەبەستی تاکە کەسی کار دەکەن ئەم تاکە کەسە کەرەستەو سەرمایەی تایبەتی خۆی هەیە، ئەم جۆرە ڕۆشنبیرانە بە ڕێگەی تایبەتی خۆیان و بەکارهێنانی سەرمایە لەوتنەوەی هەق لادەدات و دان بە ڕاستییەکان نانێ، ئەم چەشنە ڕۆشنبیرانە لەناو ئێمەدا گەلێک زۆرە، ئەوانە پەیامبەری حەقیقی نین، بەڵکو ڕۆشنبیری تاکە کەسین بۆیەک کەس کار دەکەن، بۆیە سەیر دەکەین کەوا گرفتی ڕۆشنبیری کورد جگە لەوەی باسمان کرد گرفتی لە فیکرەکانیدایە گرفتی لە گۆشەگیری و تەنیایی و لە تێگەیشتندایە ڕوانینێکی کورتی بۆ واقیع و بۆ ڕووداوەکان هەیە، بۆیە هەمیشە تووشی ڕووداوی چاوەڕوان نەکراو دەبێ، دەرئەنجام بەرپرسیاری تەنیا لە خودی ڕۆشنبیرانەوەیە کە خۆیان ناتوانن لە ئاراستەیەکدا بدۆزنەوە، بەڵکو بە شێوازی پەرش و بڵاو کاردەکەن.

**ئیسماعیل کوردە:** ڕۆشنبیریی کوردی بەدرێژایی مێژووی گەشەسەندنی، ڕۆشنبیرییەکە کەمتر بە بونیادە مەعریفییەکان تەیار کراوە، ئەمەش وایکردووە ئەگەر پەیامێکی هەبووبێت بەهەدەری داوە لە ناتوانایی خۆی لەجیاکردنەوەی لە پەیامە سیاسی و نەتەوەییەکانی. لەلایەکی دیکەوە کە پەیام بوونی هەبێ بوونی ڕۆشنبیریش وەک هەڵگرێک گرنگ بووە، لێرەشەوە خودی ڕۆشنبیر خۆیشی جێگای باس و لێکۆڵینەوە بووە لەسەر پێوەندییەکانی و گومانیش وایکردووە ڕاڤەکردن کەسایەتییەکەشی بگرێتەوە. گومان و خستنە بەرباسی پێوەندیی ڕۆشنبیر بە دەسەلاتەوە، بە کۆمەڵگاوە، بەشۆڕش و ناشۆڕشگێڕییەوە، بە گوتارو ئایدیۆلۆژییەتەوە، بە گوتاری نەتەوەیی و نانەتەوەیی بوون،...تاد. لەناو ئەو هەموو پێوەندی و ڕایەلانەدا پەیامێکی بێ خەوشی ڕۆشنبیریی نەبووە، ئەمەیان ڕاستە. توخمەکانیشی بزرن، ئەمەیان پێوەندیی بەخودی ڕۆشنبیر بەرلە هەموو کەسێکەوە هەیە.. کە نەیتوانیوە لەبوارە کۆمەلایەتی و سیاسییەکاندا لەکایە ڕۆشنبیری و زانستییەکاندا پەیامێک جیا لە پەیامی سیاسی بەرهەم بێنێ. بەردەوام پەیامێکی هەبووە، وێنەی بەسەرچووی خۆی بووەو دووبارەبۆتەوە. بەرهەم هێنەوەی چەندین بونیادو عەقڵییەتی نامەعریفی و نامەنتیقی بووە.

لەلایەکی دیکەوە خۆشوناسکردنی ڕۆشنبیران لەسەرجەمی بوارەکاندا لەهەمبەر واقیع و دەزگاکانی کارکردندا شوناسێکی لەرزۆک بووە، ئەمانە هەموویان وایان لەکەسی ڕۆشنبیر کردووە کە نەتوانێ خودی بدۆزێتەوەو نەشزانێ باس لە چ کایەیەکی مەعریفی و میتۆدو پەیامێکی فیکریی خۆی بکات، ئەمەش بەرهەمهێنانی ئەو ڕۆشنبیرەیە کە وەک وەسفتان داوە نازانێ باس لەچی بکات. لەو دە ساڵەی دواییشدا ڕۆشنبیران، بۆ ئەوە ڕۆشنبیر نین کە توخمە

کاریگەرەکانی مەعریفەو فیکر بدۆزنەوەو کاریگەرین بەسەر کۆمەڵگادا یان لێکۆڵینەوە لەمەڕ لایەنە شاراوەو نادیارەکانی بونیادو واقیعیان بکەن، یان بۆ ئەوە ڕۆشنبیر بن کە خاوەنی پەیامێکی ڕەخنەگرانە بن، بەڵکو بۆ ئەوە شوناسی ڕۆشنبیریان هەڵگرتووە کە بەردەوام بن لە موراوەغەکردنی زەمەنی و ڕازیکردنی دەسەڵات. ڕاستە ڕۆشنبیری کورد نازانێ باس لەچی بکات؟..بەڵام دیوەکەی تری ئەو پرسیارە ئەوەیە کە باش دەزانن نابێ باس لەچی بکەن، ئەوەی دەسەڵاتی سیاسی و پەیامی سیاسی بە سنووردارو موقەدەسی بزانێ، ئەوەی ئەو ئۆرگانانەی ئێمە کاری تێدا دەکەین هێڵە سوورەکانی کێشابن، دەزانین نابێ باسیان بکەین..کە دەڵێین پەیامی ڕۆشنبیری بزرە، بەشێک لەبەربەستەکان ئەوانەی سەرەوەن و بەشەکەی دیکە ڕۆشنبیران خۆیانن کە لەژێر ئەو بارو هەلومەرجەدا نایانەوێ بزانن باس لەچی دەکەن؟ واشی لێ هاتووە لەگەڕان بەدوای هیچدا هەموو تواناکان سەرف بکرێن..ڕۆشنبیر دەژێت، کەواتە پێویایە دەبێ زۆرتر بژێت و کەمتر بزانێ چی دەڵێ!!

کێ بەرپرسیارە لە خستنەسەر ڕێی پەیامێکی ڕۆشنبیری؟! ئەمەیان پرسیارێکە چەندین پرسیارو وەڵامی جیاوازیش هەڵدەگرێ. لەوێوە ئەگەر پەیامی ڕۆشنبیریمان جیا نییە لە پەیامی سیاسی و خۆی لە پەراوێزی دەسەڵاتی سیاسیدا نەبێ گەشە ناکات بێ شک نابێ دوودڵ بین لەوەی کە دەسەڵات یان حکومەت بەرپرسیارە لە بەڕێوەبردن و ژیاندن و خستنەسەر ڕێی پەیامێک بۆ ڕۆشنبیرمان کەخۆی دەیەوێت و میلیشایی ڕۆشنبیران خۆیان توانای یەکلاییکردنەوەیان بۆ پەیامەکەیان نییە. بەم شێوەیەش پەیامەکە لەجیاتی ڕۆشنبیری بێت، تۆتالیتاریانە دەخرێتەڕوو.

ئەگەریش ڕۆشنبیران هوشیارن و جیاوازی دەکەن بەوەی دەبێ پەیامێکی ئازادو ڕەخنەگرانەی مەعریفە ئامێز بێت و پشت بەست بێت بە میتۆدە فیکری و فەلسەفییەکان ئەوا دەبێ بڵێین ڕۆشنبیران لەدیاریکردنی بەرپرسیارن، بەڵام چۆن؟ ڕۆشنبیران خاوەنی دەزگاو میدیای سەربەخۆن؟ لەناو چوارچێوەی کامە ئازادیدا دەژین؟ پێدراو یان ئازادیی خودی خۆیان؟ لەپێناو پەیامێکدا کە کاریگەریی بەسەر هەموو کایەکانی دیکەدا هەبێ، ئامادەن زیندانی بکرێن، بکوژرێن..؟ یان گەرانی ئێمە لە پانتایی ڕۆشنبیریدا بریتییە لەگەڕان بەدوای بەرژەوەندییەکانمان.

**عوسمان یاسین:** دیارە گومان لەوەدا نییە کە تاکو ئێستا کە لە کوردستاندا توخمە کاریگەرەکانی پەیامی ڕۆشنبیری کوردی بزرە، ناشکرێت هۆکاری سەرەکیی ئەم حاڵەتە نەگەڕێنینەوە بۆ ئەو بارودۆخە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەی کە لە کوردستاندا لە ئارادان. هەرچەندە دڵنیاشین لەوەی پەیامی ڕاستەقینەی ڕۆشنبیران تێپەڕاندنە لەو بارودۆخە نالەبارەی کە لە ڕووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا پێیدا تێدەپەڕێت، بەڵام ئێمە ئەگەر ڕۆشنبیران کە توێژێکی چالاکی کۆمەڵگان ڕاستەوخۆ پابەندی بارودۆخەکانی کۆمەڵگا بکەین ئەی چالاکی ئەو توێژە لە چیدا بەدی دەکەین. ئەگەر ڕۆشنبیران ئەو نالەبارییەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری کۆمەڵگا یەکدییان هەزم ئەکەن و نەتوانن بە هەوڵ و کۆششی جددیانە لەبەرامبەریاندا بووەستن بۆ زاڵبوون بەسەریاندا لە پێناو گەیاندنی پەیامەکەی خۆیان چۆن دەتواندرێت پێیان بگوترێت ڕۆشنبیر؟ پەیامە سەرەکییەکەی لەوەدایە بتوانێت بە عەقڵێکی ڕەخنەگرانەی بونیادنەرانە نەک ڕووخێنەرانە لە ناو کۆمەڵگادا ڕۆڵی خۆی بگێڕێت. جا لەبەر ئەوە هەرچەندە ڕۆشنبیران لە بارودۆخێکی نالەباری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریدا بژین نابێ ئەمە ببێتە بیانوویەک بۆ سستی و ناچالاکییان، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەکرێت ڕۆشنبیران لەو بارودۆخە ئاڵۆزەدا بتوانن خۆیان دەربخەن و پەیامە ڕاستەقینەکەی خۆیان ڕابگەیەنن. بۆیەکە دەتوانین بڵێین خودی ڕۆشنبیران خۆیان بەرپرسیارن لە دۆزینەوەو خستنەسەر ڕێی پەیامێکی ڕۆشنبیری. ئەو پەیامەش کە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە ڕۆشنبیران شێلگیرانە بتوانن لایەنە شاراوەکانی ئاشکرا بکەن و ڕووی دزێوی دیاردە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان بخەنەڕوو و بە عەقڵێکی ڕەخنەگرانە توخنیان بکەون هەرگیزیش بەو بارودۆخە ڕازی نەبن لە ئارادان، بەڵکو هەمیشە خوازیاری بارودۆخێکی لەبارترین بۆ کۆمەڵگاکەیان.

**مەهاباد عومەر خۆشناو:** هەموومان بەرپرسین، چونکە کۆمەڵگا لەهەر هەموومان پێکدێت، من بۆیە دەڵێم بەرپرسین لەبەر ئەوەی هەموومان ترسنۆکین، کەسمان ناتوانین بیروڕای



مەهاباد عومەر خۆشناو

خۆمـان بەڕاست و دروسـتی دەربـبڕین، لەوانەیە تاک تاکـە خەڵکمـان لێ هەڵدەکـەوێت کـەوا شـتێکی نوێخـواز لەسـەر ڕێگەی ڕاستەقینە بێنێتە کایەوە، جا لەلایەنی زانستی بێت یا لەلایەنی ڕۆشنبـیری و ئەدەبی بێت، بەلام ئێـمـە وەکـو کۆمەڵگای کوردەواری ئەم شتە چاک و نوێخوازە بە خۆمانەوە هەڵناگرین، لە جیـاتی هانی بدەین بۆ بەرەوپێشـچوونی، هەڵدەستین بیر لە لەناوبردنی دەکەینەوە، جا بەهەر ڕێگایەک بێت، گرنگ لامان ئەوەیە ئەو مرۆڤە پاک و پێشکەوتووخوازە بەردەوام نەبێت، بۆیە لێـرەدا سـیـسـتـەمی کـۆمـەڵایەتی بەرپرسیاری سەرەکییە.

جـا ئەمـانەش هەمـوویان هۆکـاری سـەرەکین بـۆ بزرکـردن و لەناوبردنی توخمە کاریگەرەکانی پەیامی ڕۆشنبیری کوردی، هەر بەهەمان شێوەش ڕۆشنبیر نازانێت باس لەچی بکات، یا بە شـێـوەیەکی تر باس لەچی نەکـات، جـا بـۆ لەناوبردن و نەهێشتنی ئەو شێوە ڕەفتارانە پێویستـە لەسـەر ئێـمـە هەر هەمـوومـان هاوکـاری جیـهـانی ڕۆشنبـیـری کوردی بکەین تا بتـوانین کـاریگەری خـۆمـان بخـەینە سـەر بەشـەکـەی تری کـۆمـەڵگای کـوردی و هانی ئەم کـردارانە بدەین بۆ بەرەوپێشـەوەچوونی کـۆمـەڵگاکـەمـان و هەنگاونان بەرەو ژیانێکی باشـتـرو جیـهـانێکی پێشکەوتووتر، جا بۆ ئەوەی بتوانین پەیامێکی ڕۆشنبیری جددی بخەینە سەرە ڕێ، دەبێ بەپلەی یەکەم ئاستی زانستی کۆمەڵگاکەمان بەرزکەینەوە جا ئەگەر ئێمە ئاستی زانستیمان بەرز بۆوە ئەوە دەتوانین ئاستی ڕۆشنبـیریشـمـان بەرز بکەینەوە، لە کـۆمـەڵگای ئێـمـە بە پێچەوانەوە ئەو مرۆڤانەی کەوا خۆیان بە زانسـتیخواز دەزانن زۆر دوورن لەو پەیامە پیرۆزە (پەیامی ڕۆشنبـیـر)ی، ئەگەر تەنیا بڕوانینە دەزگایەکی وەکو زانکۆ بەداخەوە ئەوە دەبینین کـە زانکۆ دەبێ شـوێنی فـێـرکردنی زانست و بەرزکـردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری بێت، کەچی لە وڵاتی ئێـمـە زانکۆ تەنیـا جـێـگای خـوێندنێکی ڕۆتینیـیـە، جگە لەوەش زۆر لە فێرخوازانمان ناسنامەی تایبەتی خۆیان لێ ون دەبێت واتە خۆیان لێ دەگۆڕێت و ناتوانن بە پێی پێویست بەشداری لە پێشکەوتنی کۆمەڵگاکەمان بکەن.

**ئاسۆ جەبار:** وا بزانم مەبەستی ئێوە بە تەواوەتی، گەر بە هەڵەدا نەچووبم، هەمان مەبەستی پرسیاری پێشووە، بەلام لە دەروازەیەکی دیکەوە، لێرەدا دەکرێ بوترێ ئەرکی ڕۆشنبـیری کـوردی چیـیـە، نەوەک پەیام، کـاتێ تەواوی ئەو ئەرکـە ڕۆشنبیرییانەی خۆمان ڕووندەبێتەوە ئەو کاتە دەبێت بیر لە پەیامـێکی دیاریکراو بکەینەوە، گـەر ئەو پەیامـە هەمـان دروشـمی نەوەکـانی پێشـوو بێت، ئەوا ناگـەینە هیچ و لە دەروازەی هیچ وێرانەیەکەوە ناگەینە مەبەست. لێرەدا مەبەست



تاریق کاریزی

لەوە نییە ئەرک و ماندووبوونی نەوەکانی پێشخۆمان بە هەند نەگرین و موجامەلەیان بکەین، بەڵکە پێویستە تەواوی ئەو مـیـراتـیـە بخـرێتـە بەر ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی ورد، ئەوەی بۆ ئێمە عەیب و شەرمە ئەوەیە کە ئەو میراتە بڕێکی هەرە زۆری یاداشت و بیـرەوەری و سەرگـوزەشـتـەی ڕۆژانەی خۆیان بووەو هیـچی تر، ئەو مـیـراتە شـتێکی تێدا نییـە ناوی ناکۆک و ناتەبا بێت، هەمووی لە هێڵێکی گشـتـیدا یەکدەگرێتەوە، بەکـەمێک جیـاوازی زۆر بچووکـەوە، هەڵبـەت ئەوە بۆچوونی زۆر ڕەخنەیی ڕوانینەکـانی خـۆمـە لەسـەر ئەو کـەلەپوورە ڕۆشنبـیرییـەی بۆمـان بەجـێـمـاوە. بەڕای من باریگرانی ئەو بەرپرسـیـاریـیـەتیـیـەش ناکـەوێتـە سـەرشـانی ئەوان و میراتەکەیان، بەڵکە دەکەوێتە ئەستۆی ئێمەی هەتیوی دابڕاو لەدنیـای ئەمڕۆ و بێ بەش لە مێژوو و ئایندە. هاوکات قسە لەسەر ئەوەش هەیە کە ڕۆشنبیر نازانێ بە تەواوی باس لەچی بکات. ئەوەی ئەو دنیـایەی داخستووە بەسەر ئەو ئاستەدا نا تایبـەتمەندی و ناتوانایی زۆرێک لەو بەناو ڕۆشنبـیـرانەیە، هاوکـات ئەوەی جـێی سـەرنجی منە لێـرەدا تێکەڵکردنێکی ناکارامە لە ئارادایە لە تێکەڵکردنی ڕۆشنبیری و کۆمەڵگەو پانتاییە کۆمەڵایەتی و هۆشیاری و کولتووری و فەرهەنگی و سیـاسی و ئاینییـەکـان لەنێو کۆمـەڵگەی کوردیدا، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ گەمژەیی کۆمەڵگەو کەرەستە سەرەتاییەکانی ڕۆشنبـیـری بۆ خـوێندنەوەو بەدوا گـەڕانی ئەو پێـوەندی و کـاریگەری و بەرپرسـیـاریـیـەتیـیـانە. واتە کـەرەسـتـەی ڕۆشنبیریمان کە لە یەک کاتدا بەکاری دەهێنین بۆ خوێندنەوەو ڕاڤەکردن و ڕەخنەگرتن تەواو سەرەتایین و بەکەڵکی ڕۆژگاری ئەمڕۆ نەماون.

هاوکـات ڕۆشنبـیـری کـوردیش لە دەرەوەی کـۆمـەڵگەو کـولتـوورو کـەلەپووردا ناژی، زادەی ئەو کـولتـوورو


ئاسۆ جەبار

بیروباوەڕانەیە، یان بە ئاگاییەوە یان بۆ خۆی دەسخەرۆی نائاگایی کۆمەڵایەتی بۆتەوەو ناتوانێت لەو ترادسیۆنە کۆمەڵایەتییە دەرباز بێت و گوتاری جیاوازو خوێندنەوەی جیاوازو بیرو ڕوانین و هەڵوێستەی لابەلا وەربگرێ، ڕۆشنبیری کوردی پێی وایە گەر هەڵوێستەیەکی دژی هەبێت بەرامبەر کۆمەڵگەو کولتوورو کەلەپوورەکەی، یان کەمێک ڕەخنەگرانە بڕوانێتە ئەو پێکهاتەو کایە کۆمەڵایەتی و کولتووری و ئایینی و سیاسییانە دەکەوێتە پەراوێزەوەو فەرامۆش دەبێت، بەڵام بێ ئاگایە لەوەی کە ئێستا کە کەوتۆتە نێو ئەمبارێکی پەراوێزو فەرامۆشەوە، واتە تا هەماهەنگ بێت لەتەک بیروباوەڕی نەوەکانی پێشوودا، تا دەسخەرۆی نائاگایی کۆمەڵایەتی بێت، تا ملکەچی ئەو دامەزراوانەبێت کە باوەڕیان وایە بەبێ گەڕانەوە بۆ ترادسیۆنی باوی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایینی و کەلەپووری مەحاڵە لەم سەردەمەدا بژیت ئەوا زیاترو زیاتر دەکەوێتە پەراوێزەوەو فەرامۆش دەبێت تا ئاستی لەبیرچوونەوە.

ئەوەی باسی لێوە دەکەن، کە ڕۆشنبیر لەمڕۆدا نازانێت باسی چی بکات، ئەوە قەیرانێکی دیکەیە، بەڕای من دەرئەنجامی ئەوانەی سەرەوەیە کە باسم لێوە کرد. هاوکات، بەڕاستی هەمووماں بەرپرسین لە دۆزینەوەی شارێکانی پەیامی ڕۆشنبیری نوێ و ڕەخنەگرانەو ئەکادیمییانە، بەڵام دەکرێ پرسیارێکی دیکەش بکەین، ئایا کێ بەرپرس نییە؟ کێ بێ ئاگا دەبێت لەم پرۆسەیەو بەناوی ڕۆشنبیرو ڕۆشنبیری و ڕووناکبیری و دیاردە هەرەهەستیارەکانەوە قسە دەکات و خۆی بەخاوەنی ئەو کەلەپوورە ڕۆشنبیرییە دەزانێت و هاوکات خۆی بەخاوەنی ئێستاو داهاتووش دەزانێ؟...بەڕای من ئەوەی لەم بازنەیەدا دەخولێتەوە خاوەنی هیچ نییەو بێ ئاگایە لەدنیای ڕۆشنبیری و نوێگەری و پاش نوێگەری و سەرجەم قوتابخانە فیکری و فەلسەفی و ئەکادیمییەکان و هاوکات تەنیا دێڕێکیشی بۆ نامێنێتەوە شانازی پێوە بکات، چونکە ڕەهێڵەی لێکۆڵینەوەی نوێ بەڕێوەیە ڕەنگە تەڕو وشک پێکەوە ڕابدات.

**ڕامان:** لەهەر زەمان و قۆناغێکدا ڕۆشنبیرانی کورد بە مۆدێل دوای فیکرێکی باو یان تیۆرێکی دیاریکراو کەوتوون و ئەم خەسڵەتە وای لێ کردوون تاکڕەهەندانە لەڕووداو و کێشەکان بڕوانن، چۆن دەتوانرێ خۆ ڕزگار بکرێ لە کولتووری باوی تاکلایەن و چۆن بەهەموو ئاراستەکاندا مامڵەت لەگەڵ فیکرو دیاردەو کایەکانی زانیندا دەکرێت...؟

**تاریق کاریزی:** ناوەڕۆکی ئەم پرسیارە بەم ڕەهاییە نییە، هەرچەندە چوونە نێو بۆتەی هزرو بیرو تیۆری و ئایدیۆلۆژیایەکی بە ڕەونەق و باو لەنێو ڕۆشنبیرانی کورددا بووەتە مۆدێل و حاڵەتێکی گشتی، هەروەک چۆن ئەم پەتایە لەنێو هەموو گەلێکی هەژار لە ڕووی هزرو بیردا دیاردەیەکی چاوەڕوان کراوە، نەمازە لە نێو ڕۆشنبیرانی گەلانی ڕۆژهەڵاتدا. با ئەوەشمان لەیاد نەچێت بەرلە چەند سەدەیەکی کەم تیخ و شمشێری تاک ڕەهەندی لە هزرو بیردا لە ئەورووپا هێندە بەکارو بڕندە بوو، کە زانای سروشتناس و فیزیکیان سووتاندووە، لەم ڕووەوە سەدو یەک خۆزگە بە ڕۆژهەڵات. ئەمڕۆش لە ئەورووپاو ئەمریکای باکوور نەبێ، کوێ هەیە نازی پێکەوە ژیانی هزری جۆراوجۆرو لەیەک جوداو با بڵێین پێک ناکۆکی ڕاگرتووە. ئەورووپاش- کە بەلای ئەورووپاییەکانەوە سەنتەری ژیارو شارستانییەتە- کارەساتی وەک بۆسنەو کۆسۆڤۆو چیچانی تێدا ڕوو دەدات.

من پێم وایەو لە خوێندنەوەی مێژووشدا هەر ئەوە دێنێتە بەر زەین و سەرنجمان، کە کوردەواری و وڵاتی کوردستان دەکرێ شایستەترین شوێنێک بن لە ئاسیای خۆراوادا بۆ سازکردنی زەمینەی پێکەوە ژیان و هەڵکردنی ڕەهەندی جیاجیای هزرو بیر، هەروەها پێکەوە ژیانی نەتەوەو ئایینی جیاجیا. بۆ نموونە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەمیش بەدواوە خەڵکی موسڵمان و کریستیان و جوو و ئێزدی و جۆرەها ئایین و ئایینزای دیکە، بە تەباو ڕەبایی پێکەوەو بێ گرفت لە کوردستاندا ژیاون، جار ناجارێکیش گەر گرفت و ئاژاوەیەکی ڕووی دابێت، لە سۆنگەی دەستێکەوە بووە کە بۆ ئاژاوەگێڕی و چاندنی تۆوی دەمارگیری لە دەرەوەی کوردستانەوە هاتووە. هەروەها مێژوو پێمان دەڵێ خەلیفە موعتەسەمی عەباسی شاری سامەڕای بۆ تایەفەی خاڵوانی و لەشکرو خەڵکی تورک دروست کردو کردییە پایتەخت، ئەویش پاش ئەوەی تورک هێندە زۆر ڕژانە نێو بەغداوە کە شارەکە نەیدەگرتن، کەچی ئێستا تۆ بۆ هەوێنیش تورک زمانێکی بە ڕەسەن

بەغدایی یا سامەڕڕایی نابینی، بە پێچەوانەی کوردستانەوە، لەو شوێنانەی تورک و تورکمان ڕوویان تێ کردووە تا ئێستاش نەوەکانیان ماون و زۆر بە تەبایی هاوشانی کورد ژیاون و دەژین.

**ڕامان:** ئەمڕۆ ڕۆشنبیری کورد کامە ئاراستە وەربگرێ باشە، تا ئاستی ڕۆشنبیری بەرەوپێشەوە ببات؟

**ڕێبین هەردی:** لێت ئاشارمەوە من لەم پرسیارە گشتییانە زۆر سڵدەکەمەوە...من دەتوانم پێشنیار بۆ خۆم بکەم، وەلێ ناتوانم پێشنیار بۆ کەسانێکی دی بکەم. ناتوانم نەخشەیەکت بدەمێ کە بریتی بێت لە ئەلف و باء و جیم و بڵێم پەیڕەو کردنی ئەم بەرنامەیە بەرەو بەهەشتمان دەبات. پێموایە سەردەمی پێشنیارەکان تێپەڕین. ئەمڕۆ دەبێ کەمێک خاکیتر بین و لەم جۆرە پێشنیارانە دوور کەوینەوە. بێگومان دەتوانین قسە لە کۆمەڵێ هێڵی گشتی بکەین کە دەتوانین هەموومان لەسەری کۆک بین، بەڵام ئەوەی ناتوانین قسەی لەسەر بکەین پێشنیارکردنی ئاراستەیەکی دیاریکراوە. دەکرێ ئێمە بەزیاد لە ئاراستەو ئاستێکدا کار بکەین. دەتوانم بەگشتی بڵێم هەموو ئەو ئاراستانەی بەرەو پێناسێکی تازەو دەورێکی تازەمان بۆ ڕۆشنبیر دەبات، هەموو ئەو ئاراستانەی بەرەو دنیا دەکرێتەوەو پێشوەخت و بەرلە ئەناسین بڕیاری چاکە و خراپەی بەسەردا نادات، پێویستمان بەو ئاراستانەیە کە ئێمە زیاتر بەدنیای تازە ئاشنا دەکات و لەم ئەشکەوتە تاریکە دەرمان دێنێ کە پڕە لەو بەناو ڕۆشنبیرانەی کە هێشتا هیچیان نەنووسیوەو نەکردووە، وڵاتیان پڕ کردووە لە ترس لەو هێزە وەهمییانەی گوایە خەریکە دەیانکوژن، پێویستمان بەو ئاراستانە هەیە کە چییدی ڕۆشنبیر وەک پیشەی دکتۆری تەماشا ناکات و هەموو کێشەی بوارەکانی ئەم ژیانە بە کێشەی خۆی دەزانێت، پێویستمان بە گێڕانەوەی حورمەت بۆ کتێب و خوێندنەوەو نووسین هەیە، پێویستمان بە ڕۆشنبیرانێک هەیە کە بەر لە نووسین ناپرسن ئایا بەم قسانە دەگیرێین یان نەء، بەڵکو دەپرسن ئایا بڕوامان بەم قسانە هەیە یان نەء، کە هەشیان بوو، بێ دوو دڵی دەینووسن و دەیڵێین و بڵاوی دەکەنەوە، بەدەر لەوەی دەرئەنجامەکانی چی دەبێ. وابزانم شانسێکی ژیان بۆ ڕۆشنبیری ئێمە نییە گەر بەجددی نەکرێتەوەو ئەم ساتەوەختەی ژیانی بە ساتەوەختێکی گرنگ و زیندوو نەزانێت. گەر بە جۆرئەتەوە لەو پێست و قاڵبە دەرنەچێت کە لەسەردەمی بەعسەوە هێچنەوتنی کردووە بە پیشەی.

**د. ڕەشاد میران:** مەعریفەی زانستی، ئەمڕۆکە، بووە بە مەرجێکی پێویست لە ژیاندا بەگشتی و مرۆڤی ڕۆشنبیریش دەبێ بڕێکی باشی ئەو مەعریفەیەی هەبێت، بەتایبەتیش بۆ کۆمەڵگایەکی وەکو هی ئێمەی کورد کە تا ئەوپەڕی پێویستی بە هۆشیارکردنەوەو گەشەپێدان هەیە. بۆیە جەختکردنە سەر وەدەسهێنانی مەعریفەی زانستی باشترین دەستەبەرە بۆ پێشکەوتن.

**مەهاباد عومەر خۆشناو:** بەڕای من ڕۆشنبیر گەر ڕۆشنبیرێکی ڕاستەقینە بێت، دەبێت هەوڵی ئەوە بدات کەوا لایەنە زانستییەکان لەهەموو لایەنەکانی تر زیاتر بایەخی پێبدرێت بۆ ئەوەی کۆمەڵگای کوردی بەرەو پێشەوە بەرین، چونکە لە ڕێگای زانستەوە تۆ دەتوانیت شارەزایی لەسەر داب و نەریتی وڵاتی تری جیهان پەیدا بکەیت، لەهەمان کاتیشدا دەتوانیت هەر لەم ڕێگایە داب و نەریت و کولتووری خۆت بە هەموو جیهان بناسێنیت، بۆ نموونە باوبوونی ئینتەرنێت و ڕێگاپێدان بە بەکارهێنانی و فێربوونی کۆمپیوتەر کە ئێستا بە پێشکەوتووترین لایەنی زانستی دادەنرێت، پەرەپێدان بەم لایەنە هەنگاوێکی زۆر گەورە بەسەر کۆمەڵگای کوردی دادەهێنێت، چونکە تۆ دەتوانیت لە ڕێگای تۆڕی ئینتەرنێتەوە پێوەندی لەگەڵ کۆمەڵگاکانی دنیاوە بکەیت، لەهەمان کاتیشدا دەتوانیت هاوکاری لە زۆر شوێن وەدەست بێنی، جگە لەوەش دەتوانین هەر لەم ڕێگایەوە ناسنامەی خۆمان بەهەموو جیهانەوە بناسێنین، هەر بەم ڕێگایەش دەتوانین هەست و سۆزی وڵاتانی تر بەرانبەر بە کۆمەڵگای کوردی وەدەست بێنین، چونکە لەم ڕێگایەوە ڕۆشنبیرانمان دەتوانن لەگەڵ ڕۆشنبیرانی وڵاتانی تر بدوێن و یەکتر بناسن و زانیاریی نوێتر وەربگرن، کەواتە تۆ بەم ڕێگایە دەتوانیت کۆنترۆڵی بەشێکی زۆر لەپێشکەوتنەکانی جیهان بکەیت..

**ڕێبین ڕەسووڵ ئیسماعیل:** ڕەنگە سانا نەبێت وەڵامێک بۆ ئەم پرسیارە دەستنیشان بکەین. تەنانەت من چۆن مەرجەعییەتم قەبووڵ نییە، ئاواش قەبووڵ ناکەم ببم بە



ڕێبین ڕەسووڵ ئیسماعیل



دیار عەزیز شەریف

مەرجەع، ئەم پرسیارە زۆر مەرجەعییانەیە، من لە شوێن و پێگایەکی ئاوادا نیم بتوانم رۆشنبیری کوردی ئاراستە بکەم، بەڵام پێم وایە ناکرێت هیچ لایەنێکی رۆشنبیری فەرامۆش بکرێت، ئێمە دەبێت هەوڵبدەین فرەیی و جیاوازی بخەینە نێو رۆشنبیری کوردییەوە، سەرجەم بوارە مەعریفی و تیۆری و ئەپستمۆلۆژییەکان، سەرجەم ژانرە ئەدەبییەکان، بواری زانستە مرۆڤایەتییەکان و زانستە حەقیقیییەکان، لۆژیک و فەلسەفەو کیمیاو فیزیاو ئینتەرنێت و کۆمپیوتەرو ...تاد

بۆ ئەوەی ئەم پرۆسە فرەیی و جیاوازەش سەرکەوتوو بێت دەبێت پشت بە زانکۆ ببەستین، چونکە بەشێک لەم پسپۆری و تایبەتمەندییە تەنیا لە نێو زانکۆکاندا بوونیان هەیە، بە مانای ئەوەی دەبێت زانکۆکان ئەو رۆڵە بگێڕن کە لەسەریانە، کەچی لە واقیعدا ئەوە بەدی ناکەین، زانکۆ نەیتوانیوە ئەو رۆڵە ببینێت، پسپۆڕانی زانکۆ ناتوانن لە دەرەوەی پۆلەکانی خوێندندا بوونی خۆیان بسەلمێنن و بێنە نێوکایە کولتووری و رۆشنبیرییەکان. ناتوانن زمانی ماتماتیک و ئەندازەو بایۆلۆژیاو کۆمپیوتەر بکەن بە زمانی نووسین و رۆشنبیری بەشێوەیەک کار بکاتە سەر رووگەو ئاراستەی رۆشنبیری.

**دیار عەزیز شەریف:** کاتێ وشەی (ئەمڕۆ) دەخەینە پێشەوەی پرسیارێکی ئاوا، ئەوە دیارە، مەبەستمان ئاخاوتنە لەبارەی ئەوەی نوێوە، واتە بەگشتی ئەوەی دوای راپەڕین، یانیش ئەو رۆشنبیرانەش دەگرێتەوە کە جاران و ئێستاش لە پرۆسەی داهێناندا بەردەوامن. بەهەرحاڵ، پێم وایە رۆشنبیری کورد بەسەر زۆر ساتی تێرامان و بیرکردنەوەدا بازی داوەو ئینجا هاتووە خۆی راگەیاندووە.

ناکرێ باس لەبوونی ئاراستەیەک بکرێ بۆ بەرەوپێش بردنی ئاستی رۆشنبیری، ئەگەر یەکەمجار رۆشنبیری کورد خودی ویرانەی رۆشنبیریی نەخوێنێتەوە. لەبەر ئەوە شارەزابوون لە بنەمای کێشەکان ئەرکی یەکەمینی هەر رۆشنبیرێکە، بەڵام بەگشتی دەمەوێ ئاماژە بەدوو ئەرکی بنچینەیی بدەم، ئەوانیش: خەمی نەتەوەیی لەلایەک و مەینەتییەکانی کۆمەڵگەی کوردی لەلایەکی ترەوە. بەراستی بە حوکمی قورسی کێشە مێژووییەکان، رۆشنبیر لەبەردەم لێپرسراوێتییەکی مەزندایە. کەواتە یەکەمجار دەستنیشان کردنی ئاراستەی پرۆسەکە گرنگە بەو مانایەی دەبێ لە ئاست خوێندنەوەی واقیعی ژیان کۆمەڵایەتیدا بێت، بەڵام بیرمان نەچێ کارێکی ئاوا پێویست بەبوونی کەسایەتییەک دەکات کە لە خاڵی دەسپێکەوە، رۆشنبیر دەبێ خۆی پێگەیاندبێ و خاوەنی بیرکردنەوەیەکی نوێ بێت.

**شیرین ئیبراهیم حەیدەری:** دەبێ رۆشنبیر سەرەتا گشت ژیان و گیانی خۆی بۆ ئەو پیشەیە تەرخان بکات، هەروەها دەبێ رۆشنبیران خۆیان بۆ ئەگەری چەندین حاڵەت ئامادە بکەن، وەک تیرۆرو دەست درێژ کردنە سەر، بۆیە دەبێ رۆشنبیران ئازایانەو بێ دوودڵی لە دژی ستەمی زۆرداری و ترسان و تۆقان بوەستن، رۆشنبیرانی ئەمرۆکە دەتوانن هەموو کات قسەی هەق بڵێن بەرامبەر شتە نادروستەکانی کۆمەڵ و دەسەڵات. پێویستە رۆشنبیران مامەڵە لەگەڵ سەرجەم ئەزموونە زیندووەکاندا بکات، لە پێناوی ئازادی و دادپەروەری و سەربەخۆیی بجەنگێ، هەروەها پێویستە رۆشنبیران وتەکانیان راشکاوانە ئاراستەی دامودەزگاکانی دەوڵەت بکەن، تێروانینەکانی خۆی بۆچوونەکانی دەربخات سەرباری هەرکۆسپ و تەگەرەیەک، هەروەها مرۆڤی رۆشنبیر دەبێ هەمووکات فیکرەکانی خۆی بۆ جەماوەر روون بکاتەوە ئینجا بەدەرکەوتن لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن یا خود بەوتن بێ یا بە نووسین بێ هەروەها پێویستە ئازاو جەسوورانە ئیلتیزامی هەبێ بەرامبەر شتە نامەئلوفەکان، بەردەوام بۆ ئاشکراکردن و ریسواکردنی دەمامکەکان و بیروباوەڕی لە قاڵب دراو کار بکات هەروەها بەردەوام هەوڵی ئەوە بدات کە خواست و ئامانجە فیکرییەکانی خۆی بە جەماوەر رابگەیەنێ. خاوێن و پارێزگاری لە پەیامەکەی باشترین فاکتەرە بۆ برەوپێدانی رەوتی کارەکەی.

**ئیسماعیل کوردە:** دوان لە ئاراستەیەکی دیاریکراو، پرسێکە دەبێ لەوەوە بێینە ناوی کە ئاخۆ لەناو رۆشنبیریی کوردیدا فرەئاراستەیی هەیە (جگە لە چەند گوتارێکی دەگمەن)، تاوەکو بتوانین وەک مەدارسی فیکری، مەعریفی، ئەدەبی، فەلسەفی، دیاریان بکەین و لەسەر ئەو بنەمایە ئاراستەیەک هەڵبژێرین.

رۆشنبیریمان کە خاوەنی کایە فیکری و فەلسەفییەکان نییە، زمانمان زمانی فیکر نییە رۆشنبیرانمان هێشتا ناتوانن خۆیان


عوسمان یاسین

لە فۆرمە داخراوەکان بێننە دەردوە، یان پێناسەیەک بداتە خۆی و کەشفی دیوە شاراوەکانی خودی خۆی و جیهانی دەردوەی بکات، چۆن بتوانین ئاراستەیەکی ڕۆشنبیری دیاری بکەین.

هێشتا ڕۆشنبیریمان نەبۆتە مەرجەعێکی ناوخۆیی فیکرمان، مەعریفەمان، ئامانجمان، لەگەڵ ئەمە ڕۆشنبیریمان ژێرباری کولتوورو ڕۆشنبیری و فیکریی ئەو ئاراستانەیە کە لە ڕۆشنبیری ئەوروپاو عەرەبی و فارسییەوە...تاد نەشمانتوانیوە، بەشێوەیەکی زۆر چاک سوودی لێ وەرگرین.

بۆیە جارێ ئاراستەیەک گەرەکە کە کولتووری خۆی، ڕۆشنبیری و هەژارییەکەی خۆی، پەیامی خۆی، شوناسی و زمانی خۆی، یان هێزو توانای ئاوێتە بوونی خۆی بزانێ لەگەڵ کولتوورەکانی دیکەدا. ئاست و پێکهاتەی عەقڵی و مەعریفیی ڕۆشنبیرەکانی بزانێ تاوەکو بزانێ ئاراستەیەکی ڕۆشنبیری ئەگەر بەو شێوەیە لە قووڵایی مەعریفەدا لێی بە ئاگانەبین، دەبێتە ئاراستەیەکی ئایدیۆلۆژییانە.

ڕۆشنبیریی کوردی هێشتا هەژاری پێوە دیارە، کامە فەلسەفەو فیکرو مەعریفەو ئەدەب هەیە لە دنیادا بەهەموو قوتابخانەکانیانەوە کە بەرەو لای ئێمە هاتبێ و بمانویستبێ سوودی لێ وەرگرین، سەقەتمان نەکردووە، یان ویستوومان بە عەقڵ و بیرکردنەوەی ئێمە بێت نەک وەک خۆی. یان ئەو گفتوگۆیانە دەبنە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆی ڕۆشنبیران، لەجیاتی دایەلۆگی عەقلانییانە، کە بتوانێ ئاستێک، هۆشیارییەک، مەعریفەیەک بەرهەم بێنێ، یان ببێتە هۆی بونیادنانی کایەیەکی ئیجابی بۆ دیاریکردنی ئاراستەیەکی ڕۆشنبیری کوردی.

**عوسمان یاسین:** لەسەر ڕۆشنبیری کورد ئەمڕۆکە پێویستە ئاراستەیەکی وا وەربگرێ کە بگونجێت لەگەڵ ئەو بارودۆخەی کە تێیدا دەژێت، لەگەڵ ئەو بارودۆخەی کە ڕۆشنبیرانی جیهانی تێیدا دەخولێنەوە، چونکە مەحاڵە بتواندرێت هیچ پێشکەوتنێک لەبواری ڕۆشنبیریدا بکرێت ئەگەر ڕۆشنبیریی هەر نەتەوەیەک لە تەوژمی ڕۆشنبیریی جیهانیدا داببرێت.

بەرچاوترین و بێ خەوشترین ئاراستەیەک کە ڕۆشنبیری جیهانی گرتوویانەتە بەر، ئاراستەی بیرکردنەوەیەکی کراوەیە، واتە پێویستە ڕۆشنبیر بۆ ئەوەی لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا ڕێگا ببڕێت، بەوپەڕی دڵفراوانییەوە پێشوازی لە هەموو بیروبۆچوونێک بکات لێیان بگات، ئینجا پاشان شەن و کەویان بکات و هەڵوێستیان لەبەرامبەردا وەربگرێت، واتە نابێت پێشوەختە فیکرێک ڕەفز بکاتەوە، یا خود کوێرانە وەریبگرێت بەپێی ئەوەش نەیداتە بەر لێکدانەوە تایبەتییەکانی خۆی.

**ڕامان:** هەمیشە ڕۆشنبیران گازندە و گلەیی لە سیاسەتمەداران دەکەن لەسەر ئەوەی لە کاروباری بەڕێوەبردن و دەسەڵاتدا دەمارگیرن و ڕای پێچەوانە لە یەکتر قبووڵ ناکەن، باشە ڕۆشنبیران خۆیان لەناو کایەکانی زانین و لە ئاست پێوەندیی نێوان خۆیاندا چەندە گونجاون و ڕاو ڕای بەرانبەریان لەیەکتر قبووڵ کردووە، ئەگەر نەیانتوانیوە ئەم کارە «واتە کاری یەکتر قبووڵ کردن» ئاسان بکەن، ئیتر چۆن سیاسییەکان دەکەنە بەهانەو هۆکاری دروست نەبوونی کەشوهەوای هەمەڕەنگی...؟

**تاریق کارێزی:** ئەم گرفتە ڕاستگۆیی ڕۆشنبیر خانەبەگومان دەکات، وەک وتم ئەم بۆچوونە هەر دەبێ لە چێوەیەکی ڕێژەییدا وەرگرین، چونکە توێژێکی گەورەو فراوانی ڕۆشنبیران، کە ڕاستگۆن و کەسایەتییەکی دروست و پتەویان هەیە، ئەوە نەک هەر لە کوردستاندا بنەمای (یەکتر قبووڵ کردن) پیادە دەکەن، بەڵکو هزری مرۆڤانەی ئەوان دوورتر بەرەو ئاسۆیەکی جیهانی و گەردوونی تیشک دەداتەوەو دەڕوانێ.

هەرچەندە گازندەو گلەیی ڕۆشنبیران لە سیاسەتمەداران لە فۆرمێکی لۆجیکی و ناوەڕۆکێکی جوان و ڕەوان و دروستدا دێتە بەرچاو، هەموو ئەقڵ و هۆشێک قبووڵی دەکات و دەیسەلمێنێ، بەڵام گەر ڕۆشنبیر لە جێی سیاسەتمەداردا بێت، لەو باوەڕەدام بۆ داکۆکی کردن لە دەسەڵات و دەسکەوتەکانی خۆی-واتە دەسەڵات و دەسکەوتەکانی سیاسەتمەدارێک- کەمتری نەدەکرد. وێڕای ئەوەی لۆژیک و ئەقڵ پاڵپشتی ئەون کە دنیای هزرو ڕۆشنبیری دەبێ دنیایەک بێت خواستی (کەماڵ)و خۆ بە گەورەتر زانین لە دەسکەوتە کاتی و ماددییەکانی تێدا باڵادەست بێت، یا بە واتایەکی دی خواست و دەسکەوتە ماددییەکان بەدەر لە سنووری پێویستییەکاندا،

هەرگیز نابنە کارو مەبەستی لە پێینەی ئەهلی قەڵەم.

**ئاسۆ جەبار:** هەرگیز ڕۆشنبیری کوردی ناگاتە دۆزینەوەی ئاراستەی دیاری خۆی لەبەر ئەوەی کەرەستەکانی زۆر سەرەتایی و دواکەوتوون. هاوکات تا ئاستی ژیاری نەگاتە گۆڕان و ئاڵوگۆڕکێی شارستانی ئاستی ڕۆشنبیری ئەو قۆناغەی ئێستای تێناپەڕێنێ. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ڕەهەندی بیرکردنەوەی ئێمە ڕەهەندێکی سایکۆ سیاسی سەرەتایی ڕۆژانەیەو ڕابردوو و ئێستاو داهاتوومانی پێ ڕاڤە دەکەین، نەگبەتییەکەش لەوەدایە!!

**ڕامان:** دەگەڕێینەوەو ئەم پرسیارە لە کاک ئاسۆو ئەوان دەکەین تا بزانین ڕۆشنبیری کاریگەر لەناو کۆمەڵگەدا کامەیە، چۆن کەسانی خوێندەوار لەکەسانی ڕۆشنبیر جیا دەکرێتەوە..؟

**ئاسۆ جەبار:** هەڵبەت لێرەدا مەبەستمان لە کۆمەڵگای کوردییە، کەواتە پێویستە زۆربە ئاگاییەوە بڕوانینە ئەم بابەتە. ئەوەی لێرەدا من دەخاتەوە بەردەم بەرپرسیارێتی و گفتوگۆوە ئەو دەروازەیەیەکە بەسەر کۆمەڵگەدا دەکرێتەوە، دیارە کۆمەڵگەی کوردی کۆمەڵگەیەکی کراوە نییە، هاوکات ناچێتە ڕیزی کۆمەڵگە پێشکەوتووەکانی دنیاوەو تازە پێشکەوتووش نییە، هەروەها تەواو کۆمەڵگەیەکی دواکەوتووش نییە، نە کۆمەڵگەیەکی پیشەسازییەو نەتەواو کشتوکاڵییەو نەتەواو پشتی بە بازرگانیی گشتی و بازاڕی ئازاد بەستووەو هاوکات کۆمەڵگەیەکی سەربەخۆ نییە. لەڕووی ئابوورییەوە تەواو ژێرخانێکی وێران و بێ میرات و بێ کۆڵەکە هەیە، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کاریگەریی خۆی لەسەر کایەو دامودەزگاکان و بونیادی تەواوی کۆمەڵگەو سیاسەت و ئایین جێبهێڵێ. سەرباری ئەوەش زیاد لەچەند سەدەیەکە کورد شوناسی دیاریکراوی خۆی نەبووەو بەردەوام لەبەردەم هەڕەشەی لەناوچوون و فەوتان و جینۆسایدو وێرانکاریدا بووە، هیچ ئەمارەت و نیمچە دەسەڵاتێکی ئاسەر بڕی نەکردووەو نەگەشتۆتە کۆکردنەوەی ئیداری و دەسەڵاتی خۆی و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەکەی، هەر لەسەرەتای شارستانییەتەوە تا ئەم سەروەختە کۆمەڵگەی کوردی بە داخراوی خۆی ماوەتەوەو بەردەوام لە خۆ بچووککردنەوە و پەراوێزیدا بووە، لەم کەنارەوە بۆ ئەو کەنار، تا ئەوپەڕی داخران دەروازە شارستانییەکانی دنیای بەسەردا دادەخراو لە دەرەوەی بزاڤی ژیاری داو لە دەرەوەی یاسای گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و کولتووری خۆیدا ژیانی بەسەر دەبرد، لێرەدا کە باس لە دەرەوەی بزاڤی ژیاری دەکەین، مەبەستمان بێ ئاگایی و نابەرپرسیاریەتی گەلێکە بەرامبەر کۆمەڵگەو پێشکەوتن و گۆڕانکاری و کەلەپوورو کولتوورو ڕۆشنبیری و هۆشیاری و



ئیسماعیل کوردە

ئایین و هاوسەنگی هێزو دەسەڵات و کایە گۆڕاوەکانی ژیاری، ئەوەش بۆ خۆی دابڕانێکی سەرتاسەری ژیارییە لە بەرپرسیارێتی و بەشداریکاری قۆناغەکانی گەشەکردن.

ڕۆشنبیریش زادەی ئەم کۆمەڵگەو کولتوورو کەلەپوورو ئایین و سیاسەت و ئابووری و ژیارییە، لەبەر ئەوە کاتێک باس لە ڕۆشنبیری دەکەین دەبێت باس لەوانەی سەرەوەش بکەین، چونکە پێوەندییەکی زۆر سەرتاسەری هەموو یەکێک لە مانە بەیەکەوە دەبەستێتەوە، ڕەنگە من لێرەدا تەنیا لەڕووی ئەنترۆپۆلۆژییەوە ئاماژە بدەم لە ڕۆشنبیری و کاریگەرییەکانی. ڕۆشنبیری یەکەیەکی دانەبڕاوی ژیارییەو ئامادەبوونێکی سەرتاسەریشی هەیە لە ژیانی ڕۆژانەو گوزەران و گۆڕانکارییەکاندا، هیچ گۆڕانێک نییە لە گۆڕانکارییە ژیاری و سیاسی و ئابووری و ئایینییەکانی دنیا باکگراوندێکی ڕۆشنبیری بە هەموو پێکهاتەکانییەوە لە پشتەوە نەبێت، کەواتە شتێک نییە ناوی ڕۆشنبیری ڕووت و داماڵراوبێت. هاوکات ناوێکی تەنیا نییە بۆ ناو لێنانی کایەیەک لە کایەکان، دیاردەیەک لە دیاردەکان، دنیایەک لە دنیاکان. لەم دەروازەیەوە دەگەینە سەر پێوەندی و ئەرکی ڕۆشنبیری لە نێو کۆمەڵگەدا . پانتاییە بەرین و بەرتەسکەکەی ژیاری کۆمەڵایەتی لەنێو خۆیدا پێوەندیگەلێکی شاراوەو نادیارو ئاشکرای حەشارداوە، ئەم پێوەندییانە تەواوی ئەو ڕەهەندانە دیاریدەکەن کە لە نێو خودی ئەو پێوەندییانەدا ئەرکی کاریگەری یان جێگری خۆیان بەسەر کایەدا یان پانتاییەکەدا جێدێڵن. کەواتە ئەرکی ئەو پانتاییانە چییە لە کۆمەڵگادا؟. شوناسی ئەو پێوەندییانە چییە؟ کاری کۆمەڵایەتیی کایە ڕۆشنبیری و ژیارییەکان چییە لەسەر ئاستی گەشەکردنی کۆمەڵگەو قۆناغە ژیارییەکانی دامەزراوە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوورییەکان؟ لێرەدا

تەنیا دەتوانین باس لە ئەرکی ڕۆشنبیری بکەین لە نێو پانتاییە کۆمەلایەتییەکاندا. لە دەروازەی سەرتاسەریگەرایییەوە بۆ ڕۆشنبیری بەو پێوەندییانە ئاشنا دەبین، ڕۆشنبیری بە دیوێکدا ڕاگەیەندراوە کە بۆ خۆی ئەو ڕووە دیارو ئاشکرایەتی کە ئامادەبوونێکی بەردەوامی هەیە لە ژیانی کۆمەلایەتی و ژیاریدا.

هاوکات ڕووە نادیارو دیوە نائاشکراکەی ئەو ڕۆشنبیرە ڕانەگەیەندراوەیە کە ئامادەبوونێکی نادیاری هەیە لەنێو نائاگایی کۆمەلایەتی و ئایین و کولتوورو کەلەپووری ژیاری و سیاسیدا. پێوەندیی ئەو دوو پانتاییە ڕۆشنبیرییە ئەرکێکی سەرتاسەرییان لە ئەستۆدایە بۆ تەوزیفکردنی کایە ڕۆشنبیرییەکان و هزری ترادسیۆنی کۆن و نوێ. سەرباری ئەوەش سەرجەم ئەو کەرەستە ڕۆشنبیری و ژیارییانە دەخاتە ژێر ئەزموونەوەو مامەڵەیان پێوە دەکات و خۆی دەخاتە ململانێوە لەگەڵ نێوەندو کەناری ئەو پانتاییە کۆمەلایەتییانەی کۆمەڵگادا. دەرئەنجام هاوکێشەکە دەبێتە کارلێکێکی هەمیشەیی کە تێیدا شوناسی پێوەندییەکانی تاکە تاکەو کۆمەڵگە لەگەڵ تەواوی ئەو پێکهاتە ڕۆشنبیری و کولتوورییانەدا کار لێکدەکەن و دەکەونە نێو ململانێ و بە ڕێککەوتنەوە. ڕەنگە دوابەرهەمی ئەو کارلێکە تەنیا کۆی ئەو پێوەندییانەی مرۆڤ بەرجەستە بکات بە کایەو پێکهاتە کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیرییەکانەوە، یان لەوانەیە دامەزراوەکان دوا بەرهەمی ئەو ململانێیە بێت، بەلام لێرەدا ئەوە دێتە ئاراوە کە ناکرێ بگەینە بێگومانێکی بێسنوور دەرهەق بەو ناکۆکییە گەوهەرییەی کە لە نێو خۆی ئەو پانتایی و پێوەندییانەدا گەلاڵە بووە. کەواتە بۆ دەرچوون لەو هاوکێشەیەی بەردەوام دووبارە دەبێتەوەو سەراپا ڕۆتینێکی وێرانکارە پێویستە، بەلایەنی کەمەوە؛ ڕۆشنبیر خۆی لە تۆڕی کۆی ئەو پێوەندییانە قوتار کات کە بەرجەستەی دەکەن لە پانتاییەکی ترادسیۆنیدا، واتە دەکرێ تۆوی یاخیبوون لە ناخی ئەو پێوەندییانەدا بچێنێ، هاوکات ڕەخنەو هەنووکە ڕێژی ڕەخنەیی ڕوانینەکانی گەلاڵە بکات گەر ئەو ڕایە ئاراستەیەکی پەروەردەیی یان ئامۆزشی وەرنەگرێ، ئەوا ڕەخنەی هاوچەرخ و بێ ترس و ناتەباو ناهاوشێوەو دوور لە ترادسیۆنی باو ئەو کاریگەری و بوون بە بابەتییە دەخولقێنێ. هەرچەند کۆمەڵگە داخراویش بێت، بۆ نموونە ئەوەی بۆ ئێمە ماوەتەوە لە میراتی فەلسەفەی یۆنانی ئەو گومان و ڕەخنەو پرسیارانەیە کە تائەمرۆ بە شێوازی جیاجیا ڕاڤە دەکرێ و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێتەوە. هاوکات دنیای سیاسەت و ئابووری و کۆمەلایەتی و کولتوورو ڕۆشنبیری بەسەرجەم بوارەکانییەوە بەردەوام لەبەردەم ڕەخنەو لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەو ڕاڤەکردنی نوێ و جیاوازدان، ئەوەی ئێمەی کورد جیادەکاتەوە لە جیهان نابەرپرسیارێتیمانە بەرامبەر خودی خۆمان و ئەدەب و فیکرو سیاسەت و دنیای ڕۆشنبیریی خۆمان و نابینایی ڕەخنەو خوێندنەوەکانمانە، ئێمە نەگەیشتووینەتە جیاکارییەکی ئەکادیمی و توێکاری بۆ پولێنکردنی دنیای ڕۆشنبیری خۆمان لەبەر ئەوە تا سنوورێکی نادیار کاریگەریمان لەسەر کۆمەڵگەوکایەو پێکهاتەکانی تەواو دیارنییە، ڕەنگە هۆکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەو میراتە شەقوشڕەی کولتووری ڕۆشنبیریمان کە بۆی بە جێهشتووین، ڕەنگە هۆکەی بگەڕێتەوە بۆ پەرتەوازەیی و ناتایبەتمەندی ڕۆشنبیری کوردی، هەڵبەت نەبوونی ڕەخنەش لەو نێوەندەدا یەکێکە لە هۆکان، بەلام ئەوەی لێرەدا مەبەستی من دەسپێکی ئەوەیە کە تا ئەوڕۆکە نەتوانراوە لەڕووی کۆمەڵناسی هاوچەرخەوەو لەڕووی ئەنترۆپۆلۆژییەوە لێکۆڵینەوەیەکی سەرتاسەری زانستی بکرێت لەسەر کۆمەڵگەی کوردی و کایەو پێکهاتە ڕۆشنبیری و کولتووری و فەرهەنگییەکەی، ئەوەش دەکەوێتە سەر ئەستۆی کەسانی زۆر تایبەتمەند لەو بوارەدا.

**مەهاباد عومەر خۆشناو:** پێم وایە ڕۆشنبیری کاریگەر لەناو کۆمەڵگادا ئەو کەسەیە کەوا وتەو ڕەفتاری وەکو یەکە، واتە تەنیا قسەکردن نەبێت، بە هەڵسوکەوتیش دەبێت ئەوە بسەلمێنێت کە مرۆڤێکی وشیارو ڕۆشنبیرە تا بتوانێ بوونی خۆی لەنێو کۆمەڵگادا جێگیر بکات، هەموو ڕۆشنبیرێک خوێندەوارە، بەلام مەرج نییە هەموو خوێندەوارێک ڕۆشنبیر بێت، کەسی ڕۆشنبیر کەسێکی وشیار و چاوکراوەیە، بەردەوام چاودێری شتەکان دەکات، ئەو خاوەنی دیدگایەکی هزری و ڕەخنەییە، من پێم وایە یەکێک لە سیفاتەکانی ڕۆشنبیر ئەوەیە کە دەبێت ڕاستگۆ بێت، بەتایبەتیش لەگەڵ خودی خۆیدا، چونکە ئەگەر لەگەڵ خۆی ڕاستگۆ نەبوو ئەوا لەگەڵ کەس ڕاستگۆ نابێت، قەناعەتێکی تەواوی بە بیروڕای خۆی هەبێت، ئینجا کاری پێ بکات، جگە لەوانەش، جیاوازی نێوان ڕۆشنبیرو خوێندەوار جیاوازییە لە کارو چالاکی، جیاوازییە لە تێڕامان و بیرکردنەوە.

**ئا: ڕامان**



# مۆرە بچکۆڵەو توغرای شەرەفخانی بەدلیسی

عەبدولڕەقیب یووسف
(سلێمانی)

یەکەمین دانەی دەستنووسی «شەرەفنامە»ی دەستخەتی «شەرەفخانی بەدلیسی»ی دانەر خۆی کە ئێستا بە ژمرەی (٣١٢) لە نامەخانەی «بۆدلیان»ی زانکۆی ئۆکسفۆردە، بیست تابلۆی هونەریی هەن. ساڵانی هەشتای سەدەی ڕابردوو لێکۆڵینەوەیەکم لەبارەی ئەو تابلۆیانەوە ئامادە کرد، کارەکە زۆر سەخت بوو. ئەو لێکۆڵینەوەیە هێژا (عەلی شێر) کردی بە زاری کرمانجیی سەروو و پیتی لاتینی و وەشانخانەی «ژینا نوو» ساڵی ١٩٩١ لە سوید بەچاپی گەیاند.

ئەوکاتە بەتەواوی بۆم ساخ نەبووبووەوە کە ئەو تابلۆیانە کاری دەستی شەرەفخان خۆین. ساڵانی نەوەد دیسان کەوتمەوە لێکۆڵینەوەیان و ئەمجارە تەواو بۆم یەکلایی بووەوە کە تابلۆکان قەڵەمکێشی شەرەفخانن و دەرکەوت شەرەفخان هونەرمەندێکی وێنەکێش «رسام»ی گەورە بووە. بە بێ بەڵگە سەلماندم تابلۆکان هی خۆین. وەزارەتی ڕۆشنبیری لە هەولێر ساڵی ١٩٩٨ ئەو لێکۆڵینەوەیەی بە (٢٥٤) لاپەڕەو زاری کرمانجیی خواروو لە چاپی دا.

لەو بەڵگانە چەند نووسینێکی زۆر ورد بوون، لەوانە توغرا (طغراء)ێکی زۆر ورد کە نووسینەکەی زۆر قورس و پێوانەی (١/٥ × ٢/٥ ملم)، یانی یەک ملیمەترو نیو بە دوو ملیمەترو نیو بوو. ئەو تورڕە (طغراء)ە بە تێهەڵکێشی بە پیتی خەتی «ديواني الجلي» و خەتی «كوفي» نووسرا بوو. ئەمە لە تابلۆی هەژدەیەمدا بوو کە وێنەکەی لە خوارەوەیە:

ڕەشاییەک لە تەنیشت دەستە چەپ و نزیکی مۆرەکە بە پێوانەی یەک ملیمەترو نیو درێژو نیو ملیمەتر تا یەک ملیمەترو نیو پان هەبوو. ئەوەم بە نووسین زانی. وێنەی توغراو مۆرە بچووکەکەم نارد بۆ مامۆستا «یوسف ذوالنون»ی شارەزای گەورەی خەتی عەرەبی لە عیراقدا بۆ شیکردنەوەیان. مامۆستا لە نامەی ڕۆژی (١٤/١٠/١٩٩٦)یدا، توغراکەی بەتەواوی بۆ ساخ نەبووبووەوە، ئەگەرچی شێوەی خوێندنەوەی خۆیشم بۆ ناردبوو، ڕای یەکجاریی نەدابوو. بۆ ڕەشاییە چکۆلەکەش، نووسیبووی: ڕەنگە پڕکردنەوەی بۆشاییەکی تابلۆکە بێ، نەک نووسین. ئەوکاتە ڕەشاییەکەم بە وشەی (صح) خوێندبووەوەو گومانیشم لێی هەبوو، وەک لە (ل ٦٢)دا نووسیومە، بەلام ئێستا دڵنیا بووم کە ئەوە وشەی (یا ولی)یە. وەلی (ولـي) یەکێکە لە ناوەکانی خواو لە (أسماء الحسنى)یە. هەروەها (ولـي) مانای خاوەن (صاحب)یشی هەیە کە وشەیەکی عەرەبیی بڵاوە. (یا ولی) واتە (یا خودا). جا شەرەفخان



وشەی «یا ولی»ی کردووە بە مۆرو نیشانەیەکی پێوەندیدار (علامة) بە خۆی و بەم شێوەیە نووسیوە:



نووسینەکە لە شێوەی چراو بڵێسەی ئاگری چرا نیزیکە پیتی «یا» دەکەوێتە دەستە چەپی پیتی «و» لە ناوەڕاست و لەبەشی خواروودا. پیتی «لام»ی ئەووەلی (أوّلي) لە دەستە ڕاستە و پیتی «یاء»ی پێوە بەستراو (مربوطة)ە، لە خوارووی (و)ە و لە نێو (و)دا لەگەڵ (ل)دا بەستووینییەوە. پیتی «ی»شی بە شێوەی هەڵگەڕاوە بۆ دواوە (الیاء الراجعة) نووسیوە. واتە «ل»و «و» و «ی»ی هەر سێ پێکەوە نووسیوە. ئەمەش نووسینەکەیە کە پاش شیکردنەوەی بە هۆی زەرەبینەوە بە کۆمپیوتەرم گەورە کردووە بۆ بڵاوکردن لەم وتارەدا.

ئەم مۆرە چکۆلەیە کەوتووەتە دەستە چەپی تووڕە (طغراء)ی شەرەفخان. پێویستە بزانین مۆر- موهر (مهر) بەمانای (ختم)ی عەرەبییەو مەرج نییە ناوی ئاشکرای خاوەن مۆرەکە لەنێو نووسینی مۆرەکەدا هەبێ. جاری وا هەیە ناوەکە هەیەو جاری واش هەیە نییە. هەندێ جاریش ئاماژەیەک لە نووسینی مۆرەکەدا بۆ ناوەکە هەیە. بۆ نموونە، لەسەر مۆری سلێمان پاشای بابان نووسراوە: «انه من سليمان وانه بسم الله الرحمن الرحيم» کە ئایەتێکی قورئانە لەبارەی سلێمان پێغەمبەرەوە، وەک لە بەڵگەنامەیەکی شێخانی چوێسەدا لە پێنجوێن هاتووە کە خوالێخۆشبوو شێخ عەبدولقادری چوێسە دابوویە کاک تەها بابان و ئەویش دای بە من. ئەمە سلێمان پاشای کوڕی خالید پاشایە کە بە «سلیمان پاشا الكبير» ناسراوەو ساڵی (١١٧٨ ک= ١٧٦٤ ز) بە دەستی فەقێ ئیبراهیمی تاوانبار لە قەڵاچوالان کوژرا، بەڵام نووسینی ئیمزاکەی وەهایە: «سليمان متصرف بابان».

یانی مۆرو ئیمزاکە لەیەکتر جیاوازن و مۆری سلێمان پاشای ئەوڕەحمان پاشای بابانیش جیایە لە هی ئەم سلێمان پاشایەی پێشوو. ئەمە وێنەی مۆرەکەیە:



مۆری ئەحمەد پاشای بابانیش ئەمە بووە: احمد الله على ما أنعم» کە ڕستەیەکی عەرەبییە؛ وشەی (احمد) «فعل مضارع»ە بۆ «متكلم»، بەڵام لەهەمان کاتدا ئاماژەیە کە ناوی خاوەن مۆرەکە (احمد) بووە. مۆرێکیش ئەگەر «یا علی»ی لەسەر بێ، ئاماژەی ئەوەیە کە خاوەن مۆر ناوی (علی) بووە. مۆری «المتوكل»ی خەلیفەی عەباسی «على الله توكلت» بووەو هی خەلیفە «المعتمد» «اعتمادي على الله وهو حسبي»و، هی «القادر بالله» «نعم القادر القادر» بووە. جار هەبووە پاشا تەنیا ڕەمزێکی کردووەتە نیشان بۆ خۆی.

ئەم نووسینانەی سەرەوە لەسەر ئەنگوستیلە (خاتم)یان هەڵکەنرا بوون و دەخرانە سەر نامەو فەرمانەکانیان تا ببنە جێی بڕواپێکردن. مۆر بەمانای «توقیع»ی عەرەبی نییە، چونکە (توقیع) و (ختم) لە سەردەمی ئیسلامدا لەیەکتر جیاواز بوون، (توقیع) بریتی بوو لەو ڕستەو نووسینە کورت و پڕ ماناو کاریگەرانە کە لەسەر پارچە کاغەز دەنووسران، واتە ئەو ئەرزو حاڵانە کە پێشکەش بە خەلیفەو سوڵتانەکان دەکران و کاتبەکانی ئەوانیش بە فەرمانی خۆیان بە چەند نووسینێک وەڵامیان ئەدانەوە کە دەزانرا وەڵامەکە چییە. وشەی «توقیع» بەناوی (ئیمزا)ی ئێستا نەبووە.

پاشان (توشیح) پەیدا بوو کە ئەو نیشانە (علامة) یان نووسین یان ناوە ئاشکرایە بوو کە پاشاکان خۆیان بە دەستخەتی خۆیان لەسەروو یان لە کۆتایی نامەو فەرمانەکانیاندا دەیاننووسیی و عوسمانییەکان پێیان دەگوت «خەتی هومایۆن». لەبارەی (خاتم- ختم)ەوە بڕوانە: «مقدمة إبن خلدون، ل ٢٦٤- ٢٦٦»و، «إبن الأزرق» لە «بدائع السلك في طبائع الملك، چاپی بەغدا، ١٩٧٧، ل ٢٧٥»و «تاريخ التمدن الاسلامي، ب ١، ل ١٣٦»ی «جرجي زيدان». لەبارەی (توقیع)یشەوە، بڕوانە هەمان کتێبی إبن خلدون (ل ٢٤٧)و هی «جرجي زيدان» (ب ١، ل ٢٥٤).

میرانی کوردیش بە گشتی مۆرو ئیمزایان لەیەکتر جیاواز بوون، ئەم مۆرە بچووکە، بەڕای من، هی سەر ئەنگوست (گوستیلک)ی شەرەفخانە. گەرچی بە نووسینی دەست و گەورەتر لەسەر هەندێ کاری خۆیشی نووسیبێ، یانی وشەی «یاولی»ی بۆ کردووەتە نیشان. ئەم مۆرە بچووکەش جیایە لە مۆرە ئاسایی کە شێوەی هێلکەییەو پێوانەی (٣×٢ سم)ەو، لە چاپی کتێبەکەماندا (ل ٦١) بە هەڵە پانیی بە (٢ ملم) نووسراوە. ئەم مۆرەش لەسەر پشتی عەریزەیەکیەتی کە بۆ سوڵتان مورادی سێیەمی نووسیوە، وەک وێنەی عەریزەکە لە (ل ٢٢٥)دا هەیە. وێنەی مۆرە ئاساییەکە لەسەری نووسراوە «راجي لطف الهی شرف»و لە (ل ٦٢)دا هەیە. شەرەفخان هەروەک (رسام)ێکی لێهاتوو بووە خۆشنووس، (خطاط)ێکی چاک بووە.

شایانی باسە، شا ئیسماعیلی سەفەوی (١٥٠٢- ١٥٢٤ز) وشەی «یا ولی»ی کردووەتە نیشان، یانی مۆر، بۆ خۆی و، بەچەند شێوەیەک نووسراوە، وەک:



تووڕە «طغراء»ی شەرەفخان

لە (ل ٦٠-٦٢)دا باسی تووڕەی شەرەفخانم بە «مۆر»و ئیمزای شێوە «طغراء» ناوبردووە. ئەو قسەیەم هەڵەیەو، دەبوو یەکسەر بە «طغراء» ناوم بهێنایە، چونکە ئیمزا و مۆر نییەو چونکە شێوەی نووسینی خۆی جیایەو نووسینی تووڕە تێکەڵێکە وشەکانی تێدا تێهەڵکێش دەکرێ، وەک ئەو توغرایە کە لەسەر پارەکانی کاتی سوڵتان عەبدولمەجید هەیەو زۆر جاریش دەبینین خۆشنووسەکان «بسم الله الرحمن الرحیم» بە تێکەڵی و لە شێوەی توغرادا دەنووسن.

تووڕەی شەرەفخان بە پیتی شێوە خەتی «دیواني الجلي»و خەتی «کوفي» و بە تێهەڵکێشکراوی و بە دەستی شەرەفخانی خۆشنووس و هونەرمەند نووسراوە، بۆ خوێندنەوە زۆر گرانە بەتایبەت بەو پێوانە بچووک و وردەیەوە (بەپێی وێنە چاپکراوی چاپەکەی سوید) کە دوو ملیمەترو نیو بە یەک ملیمەترو نیوە (٢/٥×١/٥ ملم)و بریتییە لە سێ وشە کە ئەمەیە:

(الحقیر بندە شرف).

نووسەری بەڕێز مامۆستا ئەنوەری سوڵتانی پتر لە جارێک بە داوای من چووەتە نامەخانەی بۆدلیان تا هەندێ لە شارەزاکانی ئەم نووسینە وردانەمان بۆ بخوێننەوە. لەوێ پێیان وتبوو: نێرە کەسی وای لێ نییە بتوانێ شتی وا ورد بخوێنێتەوە. مامۆستا ئەنوەر لە نامەی ڕۆژی (١٥/١٠/١٩٩٦)یدا بۆ من، ئەوەی نووسیوە.

خوێندنەوەی چەند نووسینێکی زۆر وردی ناو وێنەکانی شەرەفنامەو لەوانە ئەم مۆرو تووڕەیە، کارێکی ئەوپەڕی قورس بوو و شانازی بە شیکردنەوەیان دەکەم. هاوکات شانازی بە لێکۆڵینەوەی وردو قووڵ و فراوانی هەر بیست تابلۆکەوە دەکەم و لە باشترین کاری خۆمی دادەنێم. زانای ئەنسکلۆپیدی «موسوعی»ی گەورە شەهید مامۆستا مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی کە شەوی ٢٦-٢٧/٣/٢٠٠١) بەدەستی کەسانێکی تاوانبار لە بەغدا تیرۆر کرا، شانازی بەو بیروڕایەوەی دەکەم کە لە نامەی ڕۆژی (١٢/٤/١٩٩٩)یدا بۆی نووسیوم و وتوویە: «خودا ئەزانێ ئەو وردەکارییەی تۆ دەربارەی تابلۆکان نیشانت داوە خودی نەقاش -یانی شەرەفخان- بە خەیاڵیا نەهاتووە. ئەمە لەوە ئەچێ: جارێک ابو نؤاس بە تەک قوتابخانەیێکا ڕائەبورێ، مامۆستا شەرحی بەیتێکی ابو نؤاس ئەکات:

ألا فاسقني خمراً وقل لي هي الخمرُ

ولا تسقني سرّاً اذا أمكن الجهرُ

مامۆستا بە قوتابیان ئەڵێ: کوڕانم بۆیە ابونؤاس ئەڵێ: «وقل لي هي الخمرُ» بۆ ئەوەی بە گوێچکە ناوی (خمر) ببیستێ گوێی لەززەت وەرگرێ، ئەڵێ (ولا تسقني سرّاً) بۆ ئەوەی بە ئاشکرا شەرابەکە ببینێ و چاوی لەززەت ببات. ئەبو نؤاس ئەچێتە ژوورەوە ئەڵێ زۆر سوپاست ئەکەم. خوا ئەزانێ ئەم هەڵبەستەم لەکاتی سەرخۆشی یا وتومە ئاگام لە خۆم نەبووە ئەم وردەکاریەم بە بیرا نەهاتووە، خۆی پەیدا بووە».

هەروەها مامۆستای ڕەحمەتی، لەم نامەیەدا نووسیویە: مێژووی لەدایک بوونی شەرەفخانت بەهەڵە نووسیوە (بە یەکی ذی القعدة ٩٤٩ لە دایک بووە..» ئەو خۆی نووسیویە لە بیست (٢٠)ی ذی القعدة لەدایک بووم. تۆ بەم وردەکارییەوە چۆن هەڵەی وەها ئەکەی. زۆر گورج لە ڕۆژنامەکان بنووسە ئەوە هەڵەی چاپییە (یەک) نییە (بیستە).

منیش تەماشای (ل ١٧)م کرد، دیم وەها نووسراوە «لەیەکی ذی القعدة)ی ٩٤٩ی ک= ٢٥ی شوباتی ١٥٤٣ی زادا... لەدایک بووە».

مامۆستا مەلا جەمیل زانیویە هەڵەی چاپە، چونکە «٢٥ شوبات» وەک نووسیومە، دەکاتە بیست (٢٠)ی ذی القعدة...» نەک یەکی ذی القعدة.

مامۆستا هەروەها نووسیویە: هەڵقە لە گوێ نیشانەی دڵسۆزییە. نووسیویە: وشەی «دەربار» بە «دەربارە» مەنووسە، هەڵەیە، چونکە «دەربار» کە لە باسی پاشاکاندا دەنووسرێ، لە دوو برگەی (دەر)و (بار) پێکهاتووە. (بار) لە زاراوی ئێرانیدا بەمانای کات (موعد) وەرگرتنە بۆ شەرەفمەند بوون بە دیداری شا. ئیدی (دەربار) بەمانای دەرگای کات وەرگرتنە..❖

# دەڤەری کەرکووک و ناوچەی شوێنەوارییەکانی

ئا: خالید سابیر
(سلێمانی)

کەرکووک لە شارە دێرین و گرنگەکانی کوردستانی باشوورە، لەسەرچاوە ئارامییەکاندا بە (کەرخا) (کرخا- د- بێت سلۆخ) هاتووە کە بەواتای (شاری سلۆقی)یەکان دێت کە کورتییەکەی بە (کەرخ سلۆخ) دەنووسرێت، ئەم شارە لەسەردەمی سلوقییەکان لە عیراقدا «٣١٢-١٣٥» پێش زایین، گەلێک بووژاوەتەوە بەوەی کە فەرمانڕەوای سلوقییەکان (سلۆقس) شوورەیەکی بەدەوری شارەکەدا دروست کردووە، ئەمەو سەرەڕای دروستکردنی بینای جۆراوجۆرو کردنی شارەکەش بە سەنتەری فەرمانڕەواییەکەی کە تا سەردەمی پارسی و ساسانییەکان بەردەوام بوو. هەندێکی تر ڕایان وایە کە وشەی کەرکووک زۆر پێوەندیی بە وشەی (گڕگڕ)ەوە هەبێت کە بەواتای (بڵێسەی ئاگر) دێت کە کەوتۆتە دەرەوەی شارەکە، مێژوونووس (یاقوت الحموي) شاری کەرکووک بە کەرخینی (کرخيني) ناودەبات کە کەوتۆتە نێوان دوو شاری (داقووق)و (ئەربیل) کە لەسەر گردێکی بەرز بنیات نراوەو وشەی ناوبراو بە زۆری لەسەدەی حەوتەمی کۆچیدا بەکار هێنراوە، هەروەها (إبن الأثیر)ی مێژوونووسیش هەمان وشەی بەکارهێناوە، (عەلی یەزدی)ی نووسەریش لە کتێبەکەیدا (زەفەرنامە- ظفرنامە) کە لە سەدەی نۆیەمی کۆچیدا دایناوە، شوێنی شارەکەی بە نزیک لەشاری داقوق داناوە، لەو دەپ (لوح)ە کۆنانەی کە لەناوچەکەدا دۆزراونەتەوە، کەرکووک بەناوی (ئارابخا) وەهاتووە کە کەوتۆتە سەر گردێک، ئەو دەپە دۆزراوانە کە ژمارەیان (٥١) دانە بووە، لەساڵی (١٩٢٣)دا بەشێوەیەکی ڕێکەوت دۆزرانەوە، کە مێژووی نووسینەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی هەزارەی دووەمی پێش زایین و لەسەردەمی (حامورابی)شدا وشەی ناوبراو بۆ کەرکووک بەکارهێنراوە.

هەروەها لەسەرچاوە ئاشوورییەکانیشدا بە شوێنی پەرستنی خوا(أدد) هاتووەو لەسەرچاوە گریکییەکانیشدا بەناوی (ئارابخیوس Arapkhius)ەوە ناوی هاتووە، لە نەخشەی ڕێگاکانی ئیمپراتۆری ڕۆمانیدا (نەخشەی بۆتینگر) لەسەدەی دووەمی زاییندا دانراوە، کەرکووک بەناوی (کۆن کۆن Con Con)ەوە ناوبراوە هەروەها لە نووسراوەکانی جوگرافیناس (بەتلیمۆس)دا، بەناوی (کورخورا Kork-houra)وە ناوی هاتووە. ناوبراو دووریی نێوان ئەربیل و کورخورای بەدوو ڕۆژە ڕێ داناوە. لەکاتی تێپەڕبوونی (ئەسکەندەری مەکدۆنی) بەشارەکەدا، بەم جۆرە وەسفی کەرکووک دەکات «شارێکە بڵێسەی ئاگری لێ بەرزدەبێتەوەو شوێنی پەرستنی خودای فارسەکان (ئەناهیتا)یە کە هاوشێوەی (عەشتار)ی خودای بابلی-یە». (١)

بەڕێوەبەرێتیی شوێنەواری گشتیی عیراقی لەساڵی (١٩٤٨)داو لەکاتی هەڵکەندن و بناغەدانانی دروستکردنی گەرەکی کرێکاران لە (عەرەفە)دا، بڕێک شت و مەکی کۆنیان دۆزییەوە کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شارستانێتی سۆمەرییەکان لە چەرخی بەردەبیانی سولالەکان لە (٢٦٠٠) ساڵ پێش زاییندا، ئەو شتانەش پێکهاتبوون لە چەک و ئامرازی لە مس دروستکراو و دەفری گڵێنەیی. لەسەر قەڵای شاری کەرکووک (تا نزیکەی سەدەی هەژدەیەمی زایینی خانووەکانی شارەکە هەرلە ناو قەڵاکەدا دروست دەکران) مزگەوتێکی بچووکی لێیە بەناوی (مزگەوتی دانیال-ی پێغەمبەر)، خەڵکی ناوچەکە وا دەگێڕنەوە کە گۆڕی ئەو پێغەمبەرە لەوێدایە(٢). مزگەوتەکە لەسەر شێوەی

کەنیسەیەکی کۆن دروستکراوەو لەناو مزگەوتەکەدا گۆڕی سێ خواپەرستی لێیە بەناوی (حەنانیاو عەزراو میشائیل)، هەر لەناو قەلاکەدا، مزگەوتێکی دێرینی تری لێیە بەناوی (ئولو جامع) واتە (مزگەوتی گەورە) کە هەندێک جاریش پێی دەڵێن (مزگەوتی مریەمانە). شوێنەوارناس «هرتسفیلد» مێژووی بنیاتنانی مزگەوتی ناوبراو دەباتەوە بۆسەدەی سیزدەیەمی زایینی.



وێنەی قەلاّ مێژووییەکەی شاری کەرکووک

**لەناوچە شوێنەوارییەکانی کەرکووک:**

**١- نـــووزی:** کەوتۆتە دووریی بیست و دوو کیلۆمەتری باشووری ڕۆژهەلاتی کەرکووکەوە، شوێنەوارێکی کۆن بەناوی (یۆرغان تەپە) لە نزیک گوندی ترکەلان (تەرکلان)ەوە هەیە کە شوێنی دێرینی شاری (نووزی)ە. لەو پشکنینانەی کە لە سالانی (١٩٢٥-١٩٢٦)دا لەلایەن مۆزەخانەی عیراق و قوتابخانەیەکی ئەمریکیی بۆ لێکۆڵینەوە ڕۆژهەلاتییەکان، ئەنجام دراو نزیکەی پەنجاو پێنج دەپی قوڕینیان دۆزییەوە، هەمان دەستەی پشکنین لە سالی (١٩٢٧)ەوە تا سالی (١٩٣١) بۆ جارێکی تر دەستیان کردەوە بە پشکنین بە یارمەتیی زانکۆی (هارڤاد)ی ئەمریکی، لەئەنجامدا لە دەرەوەی گردەکە چەندین خانوو و کۆشکی لە قوڕ دروستکراویان دۆزییەوەو لەناو گردەکەشدا، پەرستگاو کۆمەلێک دەپی لە قوڕ دروستکراویان دۆزییەوە کە هەندێکیان نامەیان لەسەر نووسرابوو و هەندێکی تریشیان دەقی ئابووری و بەلگەنامەی یاساییان لەسەر نووسرابوو، ئەو نووسراوانە ئەوە دەردەخەن کە نووزی ئۆردووگا (مستوطن)یەکی حۆری-ی گەورە بووە لە نیوەی هەزارەی دووەمی پێش زاییندا، هەرلە گردەکەدا دەفری گلێنەییان تێدا دۆزییەوە کە لە شێوەی پێچاوپێچدابوون و بە ڕەنگی سپی و بۆر ڕەنگ کرابوون و ناوی (نووزی)شیان لەسەر نووسرابوو، جگە لەمانە شتومەکی تری تێدا دۆزراوەتەوە کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ پێش سەردەمی حۆرییەکان، واتە بۆسەردەمی سۆمەری و ئەکەدی «نیوەی هەزارەی سێیەمی پێش زایین» کە لەو سەردەمەدا نووزی ناوی (گاسوور GA-SUR) بووە. هەرلەو دەپانەدا نەخشەیەکی کۆنی شاری نووزی-ی تێدا بووە کە بە کۆنترین نەخشە دادەنرێت لەو شێوەیەداو مێژووەکەشی دەگەڕێتەوە بۆسەردەمی ئەکەدییەکان لە عیراقدا (٢٣٠٠ سال پێش زایین). هەر لە نزیک (نووزی)یەوە، گردی بچووکی تری لێیە کە زۆربەیان شوێنی نیشتەجێی خەلک بوون لە پێش زاییندا، لەو گردانە گردی (قادش)ی گەورەو (قادش)ی بچووکن.

**٢- حەویجە:** لەو دەشتەی کە کەوتۆتە نێوان کەرکووک و حەویجەوە، هەندێک شوێنەواری کۆنی لێیە کە دەگەڕێتەوە بۆ چاخی (عەبید)، لەو شوێنەوارانە (تل ماحوز)ە کە بەزمانی ئارامی بەواتای (شار) دێت، (٣) بەڕێوەبەرێتی شوێنەواری گشتیی عیراقی لە سالی (١٩٣٧)دا، چەند پشکنینێکی لەو شوێنەدا ئەنجام داو لە ئاکامدا بڕێک بوتلی شووشەو دەفری گلێنەییان تێدا دۆزییەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پارسی و ساسانییەکان.

**٣- تووز خورماتوو:** ئەم شارۆچکەیە کەوتۆتە باکووری چیای حەمرینەوە بەدووریی چل کیلۆمەتر، ئەو نووسراوە کۆنانەی کە لەم شارۆچکەیەدا دۆزراونەتەوە دەریدەخەن کە شوێنی ناوبراو ئۆردووگایەکی کۆنی لێبووە بەناوی (خەرشیسو) کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بابلی کۆن و پاشان بەدرێژایی ڕۆژگار ناوەکەی گۆڕاوەو بووە بە (خانیجار) کە بە فارسی بەواتای (خانی قیر) دێت.

**٤- داقـــووق:** ئەم شارۆچکەیە کەوتۆتە باشووری شاری کەرکووکەوە بە دووریی بیست و هەشت میل. بەپێی ئەو نووسراوە مێخییانەی کە لە نزیک شارەکەوە دۆزراونەتەوەو مێژووەکەشیان دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی هەزارەی دووەمی پێش زایین، ئۆردووگایەک بەناوی (لبدی)یەوە هەبووە. (٤) لەشارەکەداو لەسەر گردێک کە کەوتۆتە شوێنێکەوە کە پاشماوەی شوێنەواری کۆنی لێماوەتەوە، منارەیەکی بەخشت دروستکراوی لێیەو بەرزییەکەی (١٧/٨٠)مەترە، پێ دەچێت (موزەفەرەددین کۆکبری) دروستی کردبێت. (٥) لە سالانی (١٩٥٥-١٩٥٦)دا، پاش چاکردنەوەی منارەکە لەلایەن بەڕێوەبەرێتی شوێنەواری گشتیی عیراقییەوە، لەو ناوچەیەدا پشکنینێکیان ئەنجام دا، پاشان بڕێک دراویان

دۆزییەوە کە هەندێکیان دەگەڕێتەوە بۆسەردەمی تەیموری لەنگ (١٣٦٩- ١٤٠٤) زایین، کە لەسەر ئەو دراوانە ناوی ناوبراویان لەسەر نووسراوە، کە لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆیەمی کۆچی حوکمڕانی عیراقی کردووەو مێژووی دروستکردنی هەندێکی تر لە دراوەکان، دەگەڕێتەوە بۆسەردەمی فەرمانڕەوایی (قەرەقۆیونلو)یەکان(٦)، کە لەسەدەی نۆیەمی کۆچیدا لەناوچەکەدا دەسەڵاتدار بوون.

**٥- (تل مەتارە- تل قرەیتاغ):** گردی مەتارە- گردی قەرەیەتاغ بە دووریی دوو کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژئاوای داقووقەوە، شوێنەوارێکی کۆن بەناوی گردی مەتارە (تل مەتارە)وە هەیە کە بەناوی گوندێکەوە ناونراوەکە لە نزیک شوێنەواری ناوبراوەوەیە هەندێک جار بە گردی قەرەیەتاغ (تل قرەیتاغ)یش ناو دەبرێت، چەند شوێنەوارناسێکی زانکۆی شیکاگۆی ئەمریکی لە ساڵانی (١٩٤٨- ١٩٤٩)دا ئەو ناوچەیەیان پشکنی و لەئەنجامدا پاشماوەی شوێنەواری چاخەکانی مێژووی سەردەمی (حەسوونە)و (سامەرا)و (عەبید)یان تێدا دۆزییەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ (٥٠٠٠ -٤٠٠٠) ساڵ پێش زایین.

**٦- تازە خورماتوو:** لەم شارۆچکەیەدا، گردێکی شوێنەواری لێیە کە دەگەڕێتەوە بۆسەردەمی ئاشورییەکان لە ناوچەکەدا، بەڵام شوێنی ناوبراو بەتەواوی پشکنینی تێدا نەکراوە تا وەکو بزانرێت لەناو گردەکەدا چی تێدایە.

**٧- ئاڵتوون کۆپری- پردێ:** پێش گەیشتن بەم شارۆچکەیە لە ڕێی کەرکووکەوە، دوو گردی شوێنەواری دێرین بەناوی (باش تەپە) و (یارمجە) هەن، پاش ئەوەی پشکنین لەو دوو شوێنەدا کرا. گەڵێک دەفری گڵێنەیی دۆزرانەوە، کە مێژووی دروستکردنەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ (٣٠٠٠) ساڵ پێش زایین، ئەو دەفرە گڵێنانە بەدەفری گڵێنەیی چینی پێنجەمی نەینەوا ناسراون. دوای ئەو دوو شوێنە، گردێکی شوێنەواری تر بەناوی (گۆک تەپە)وە دێت کە بەرزترین گردی ناوچەکەیەو لەسەردەمی خۆیدا لە ناوەندی ئۆردووگایەکدا دروستکراوەکە شوورەیەک دەوری داوەو پێدەچێت بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاشوورییەکان کە لەو ناوچانەدا باڵادەست بوون.

ئاڵتوون کۆپری لەسەردەمی ئاشوورییەکاندا لە نزیکی چەند ئۆردووگایەکدا بووە، هەندێک لە لێکۆڵەرەوە شوێنەوار ناسەکان وای بۆ دەچن کە ئۆردووگایەکی ئاشووری کۆن بەناوی (شمورو) لە شارۆچکەی ناوبراودا هەبووەو هەندێکی تریش لە لێکۆڵەرەوان لەو ڕایەدان کە ئەو ئۆردووگا کۆنەناوی (زبان) بوو بێت کەکاتی خۆی پاشا «سەرجۆنی دووەمی ئاشووری (٧٢١- ٧٠٥ پێش زایین) لە شاڵاوی هەشتەمیدا بۆسەر ناوچەکە باسی لێوە کردووە». (هرتسفیلد) لەم بارەیەوە نووسیویەتی «لە ئاڵتوون کۆپریدا شارێک بەناوی (شاە قرد) یا (شهرقرد) هەبووەو بەرلە چەند سەدەیەک پێش زایین گەشەو پێشکەوتنی بە خۆوە بینیوەو شوێنەکەشی کەوتبووە نێوان سەرەڕێی شاری ئەربیل و شارەکانی باشووری عیراق» لە نووسینی هەندێک لە مێژوونووسە عەرەبەکاندا، ئاڵتوون کۆپری بە (القنطرة) هاتووە هەروەک ئەوەی لە کتێبی (معجم البلدان)ی (یاقوت الحموي)دا نووسراوە. لەسەردەمی سوڵتان (موڕادی چوارەم)داو لەکاتی تێپەڕبوونی بەشارەکەدا لە ساڵی (٦٣٨) زاییندا بەرەو گرتنی شاری بەغدا، ناوبراو فەرمانی بەدروستکردنی پردێک داوە لە ئاڵتوون کۆپریدا.

(هرتسفیلد)یش کە لەساڵی (١٩١٦) زاییندا چۆتە ئەو ناوچەیە وێنەی هەردوو پردەکەی بە کامێرا گرتووە، لەبارەیانەوە دەڵێت «پردە گەورەکەیان مێژووی دروستکردنەکەی دەگەڕێتەوە بۆسەدەی نۆیەمی زایینی و پردە بچووکەکەشیان دوای ئەو لەسەردەمی سوڵتان موڕادی چوارەمدا دروستکراوە».. ❖



وێنەی منارە دێرینەکەی داقووق

پەراوێزەکان

.......

١- لە دوو سەرچاوەی کلدانی کۆندا، کەیەکێکیان- ناوی نەهێنراوە- لەلایەن (مەتران نادی شێر)ەوە لەساڵی (١٨٩٦)زاییندا دەکرێت بە تورکی و لە کەنیسەی کلدانییەکان لە کەرکووکدا دەپارێزرێت و کتێبی دووەمیان کە ناوی (أخبار الشهداء)ە لەلایەن قەشە (پۆلس بیجان) لەشاری (لایبزیگ)ی ئەڵمانیادا لە چاپ دەدرێت، ناوی کەرکووک بەم شێوەیە هێنراوە «پاشای ئاشوورییەکان- سودناپال- ئەو شارەی دروستکردووە لەوکاتەی کە ئەفسەرێکی میدییەکان- مادەکان- کە ناوی (ئەرباق) دەبێت لە حکومەتەکەی هەڵدەگەڕێتەوەو پەنادەباتە بەر ئاشوورییەکان، پاشای ئاشووریی ناوبراو پلەی ئەفسەریی پێنادات و فەرمانی دروستکردنی شارێکی بەسەردا دەدات کە پاشان ناوی دەنێت (کەرکووک) لە گوندی (باجرمی)داو پاشان یەکێک بەناوی (کرمی) دەکەن بە فەرمانڕەوایی شارەکە پاش ئەوەی لەگەڵ خۆیدا هەزار ئاشووری دەهێنێت و لەشارەکەدا جێگیریان دەکات».

٢- بەڵگەیەکی تەواوی وابە دەستەوە نییە کە گۆڕی پێغەمبەر (دانیال) لەو مزگەوتەدا بێت، بەڵکو بەشێکی زۆر لە مێژوونووسان و شوێنەوارناسان دەڵێت «دانیال-ی پێغەمبەر لە خۆزستانی ئێران مردووەو لەشاری (شوشتر) نێژراوە». گەرچی خەڵکی ئەو ناوچەیە وا دەگێڕنەوە، بەلام بەڵگەی تەواویش بۆ ئەمەیان لەبەردەستدانییە.

٣- هەر لە شوێنی گردی ماحووز (تل ماحوز)دا، شارێکی دێرینی ئارامییەکان بەناوی (تل ماحوزە)وە هەبووە، کە کەوتبووە ڕۆژهەلاتی زێی بچووک- زێی خواروو-وە.

٤- شارۆچکەی داقووق بەناوی ئەو گوندە دێرینەوە ناونراوە (داقوقا) کە پاشان شاری داقووقی لێ دروستکراوە، هەندێک جار بە داقووق دەڵێن (طاوق) کە بەزمانی تورکی بەواتای مریشک دێت.

٥- موزەفەرەددین کۆکبری، فەرمانڕەوای شاری هەولێر بووەو لە ساڵی (١١٣٢)ی زایینی لە دنیا دەرچووەو منارەیەکی بەناوی خۆیەوە دروستکردووە کە کەوتۆتە ڕۆژئاوای شارەکەوە.

٦- یان (بەرخی ڕەش) بەو تورکمانانە دەگوترا، کە بەهۆی سەرکردەکەیانەوە (قەرە یووسف) لەدوای مردنی (تەیموور لەنگ) توانییان حوکمڕانیی تورکیاو بەشێکی عیراق بکەن لە ساڵی (١٣٧٥) تا ساڵی (١٤٦٨)ی زایینی، لەدواییدا بەدەستی کۆمەڵێک- خێڵێک- تورکمانی تر کە پێیان دەگوتن (ئاق قۆیونلو) کە بەواتای (بەرخی سپی) دێن حوکمڕانییەکەیان کۆتایی پێهات و ئەمانیش بەدەستی فارسەکان و بەفەرمانی شا (شێخ صفی)و لەژێر فەرماندەی (لالاحسێن)دا حوکمڕانییەکەیان کۆتایی پێهات.

سەرچاوەکان

..............


١- (الرافدان)، تاليف (سيتون لويد). ترجمة (طه باقرو بشير فرنيس).

٢- (العراق القديم). تاليف (جورج رو). ترجمة (حسين علوان حسين) ١٩٨٤ بغداد.

٣- (موجز تاريخ البلدان العراقية) تاليف (عبدالرزاق الحسني) الطبعة الثانية. ١٩٣٣ سوريا.

٤- المُرشد الى مواطن الآثار و الحضارة. تاليف (طه باقر و فؤاد سفر) الرحلة الرابعة ١٩٦٥. والرحلة الخامسة ١٩٦٦. بغداد.

٥- (فتوح البلدان). تاليف (أبو حسن البلاذري). ١٩٨٨ بيروت.

# هێندێ لە لایەنەکانی زمان لە شیعری مەحوی-دا

**وریا ڕەحمانی**
**(بۆکان)**

بەر لەوەی کە باسی مەحوی و چۆنایەتی و نەخشی زمان لە شیعرەکانیدا بکەم، قامک دانان لەسەر ئەم خاڵە پێویستە کە نەتەنیا لە شیعری مەحوی-دا، بەڵکو لە شیعردا بە هەموو جۆرەکانی خۆیەوە. بەرەنگاربوونەوەو شکاندن و دەرزمانی جوولانەوە لە زماندا، واتە، بە دژایەتی ڕەوتی شەپۆلەکانی زمانی مەلەکردن و شکاندنی بنەما باوەکانی زمانی و دەربازبوون لە چوارچێوەو یاسا کۆنە سروشتییەکان، ئەگەر شیعریش، خۆیان بەشێکن لە زمان و لە کەناری گەمە زمانییەکانی دیکەوە، دەبن بەهۆی چوونە سەری دەسەڵاتی هەر زمانێک لە نووسیندا.

پێداگری مەحوی بەسەر زمان تا ئەو ڕادەیەبووە کە زۆر جاران مانای، وەها لە زماندا دەتواندەوە کە جیاکردنەوەیان دژوارو ڕەنگە هەر نەشکرابایەو ئەوە پێداویستییەک بوو کە بۆ گەیشتن بە کەنارەکانی مانا لە ناو زەریای زمانەوە تێپەڕین و لەڕێی زمانەوە بڕۆین. ئەوەش یانی ئاوێتەبوونی عەقڵیانەی دال و مەدلوول، واتە فۆرم و ناوەرۆک لە شیعردا، بەرە و چەند لایەن بوونەوەی ماناو گەیشتن بەهەناسەی شیعر. هەر ئەو شتەی کە دریدا-ش لە وتاری دیفرێنس-دا، باسێکی زۆری لەسەر بووەو بە یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی نووسینی باشی دەزانی. خودی مەحوی-ش لەم بوارەدا ئاوا دەڵێ؛

**تشویش حال من، تو ز تخلیط من بفهم**

مەحوی، هەرگیز لەگەڵ زمان وەک ئامێرێک نەجووڵاوە و هەمیشە وەک ئەرزشێکی چاولێ دەکرد، بۆیەش لە شیعرەکانیدا گەیشتن بە پێچ و پەناکانی زمان یانی گەیشتن بەخودی شیعرو ڕەنگە لە تەواوی دیوانەکەیدا دێڕێکی وای تێدانەبێ کە بتوانین بە قامکێکی پێداگرانەوە ئاماژەمان بە نەبوونی کارکردێکی زمانی بێ.

ئەو شاعیرە، هەرگیز خۆشی لە دڕدۆنگی و دووڕوویی نەهاتووە و ئەم حاڵەتەش بە فرەیی لە شیعرەکانیدا هەیە؛

**نەناوی ڕۆژو مەە بردن. نە باسی سەدرو شەە کردن**
**مووەححید هەر دەبێ هەریەک بناسێ هەر لەیەک دەدوێ**

بە بڕوای من، مەحوی زۆر مامۆستایانە لە زمان بۆ پتر کاریگەربوونی شیعر کەڵک وەردەگرێ. تەماشاکەن کە لە ڕستەی یەکەمی ئەم دێڕەدا، چۆن بە ئاوەڵابوونەوە و ڕەهاکردنی زمان، واتە زمانێکی بێ دەربەست. بێ بایەخی ئەوشتانە و لە ڕاستیدا هەموو دنیا دەگەیێنێ و وێڵی دەکا، بەڵام لە ڕستەی دووەمی هەر ئەم دێڕەدا، بە کۆکردنەوەی زمان و ئیستفادە لە وشە و جوملەگەلێکی توندو پێداگرانە لەسەر خاڵێکی تایبەتمان ڕادەگرێت و بەرەو ڕاستییەکی ئەوتۆمان ڕادەکێشێ. زمانی ئەم شیعرە پێ بەپێی ناوەرۆکەکەی، خود بێژەری سووربوونەوەیەکە. بۆ بەڵگە سێ جوملەی ئەمری بە ئەوەڵ وشەی «هەر»ەوە کە دوا بەدوای یەک لە ڕستەی دووەمی دێڕەکە داهاتوون، تەنانەت گەر بۆ کوردی نەزانێکیش بخوێندرێتەوە ڕەنگ بێ لە ڕووی مۆسیقای توندو پێداگرانەی وشە و ڕستەوە بەو قەتعییەت و ئەنجامە بگا.

یەکێکی دی لە دەستکردە جوانەکانی مەحوی لە شیعردا، گۆڕینی مانای قامووسیی وشەکان بە مانای زێمنی یا دەقییەوەیە کە دەلالەتی چەمکیشی پێ دەڵێن. وەک دەزانین مانای وشە لە شیعردا لەگەڵ زمانی ئاسایی جیاوازییەکی زۆری هەیە و بە دەورەی کە لە ڕستەدا دەیبێ مانای جیاواز وەخۆی دەگرێ و تەنانەت زۆرجار بەرەو ئاشنای زودایی، واتە ئاشنایی سڕینەوە دەخوشێ و لەوانەشە مانایەکی دژی مانا باوەکەی خۆی هەبێ، کە سەرجەمی ئەوانە دەسەڵاتی شاعیر بەسەر زمان و شیعردا دەگەیێنن و زۆری بە بایەختر دەکەن. بۆ نموونە با بڕوانینە گۆڕینی مانای وشە لەم چەند دێڕەدا؛

**١- ئەرێ دڵ بێ شەرابی لە علی گوڵ ڕەنگت لە گوڵ چبکا؟**
**کە جیلوەی گوڵ لە گوڵشەندا نەبێ، بولبول لە چڵ چبکا؟**
**٢- دڵ لە ئیدارکی حەقیقەت بێ بەشە بێ داغی عیشق**
**«مەحویا» دانا دەبێ بەم چاوە بینایی بکا**



مەحوی

**٣- دیدە عەینی جارییە، دڵ پڕ لە ناری موورقەدە**
**ئاب وتابی حوسن ئەدەم بەو گوڵ عوزاری موورقەدە**
**٤- وەک بولبول ئەو دڵە بە گوڵی ڕووکەڕوو دەکا**
**پەروانەیە زیارەتی شەمع ئارەزوو دەکا**

ئەگەر بە چاوێکی وردبینانە لە مانای وشە لەم دێڕانەدا خوردبینەوە، ئەو شتەی کە پێشتر باسمان کرد زۆر بە جوانی دێتە سەلمان. بۆ وێنە: دڵ، شەراب، لەعل و گوڵ لە دێڕی یەکەمدا، چاو و بینایی لە دێڕی دووەمدا، دیدەو گوڵ عوزارو موورقەدە لە دێڕی سێیەمدا و دڵ و گوڵی ڕوو لە دێڕی چوارەمدا کە هیچ کامیان لە مانا قامووسییەکەی خۆیاندا نەهاتوونەتەوە.

من پێم وایە شیعری مەحوی بایەخی چەند جار خوێندنەوەیان هەیە و شیاوی سەرنج دانێکی تایبەتن. چوون دوای هەرجار، چێژێکی تر بە خوێنەری خۆی دەدات و بناغەی تێفکرینێکی دووبارەی لەسەر ڕاوە دادەمەزرێ و لەگەڵ ئەوەی مانا بەسەر مانادا دەڕوخێ لە ئاکامدا سەرکەوتنەکە بە زمانە. ئینجا ئەگەر لە هێندێک لە شیعرەکاندا، هێندێک وشە بێ کەڵکن و تەنیا بۆڕێک بوونی وەزنی یان پیتێ ئارایییەکی ناپێویستانە لە دێڕێکدا بوون، بەڵام لە زۆربەی شیعرەکاندا وشە ئەرکێکی سەرەکییان لەسەر شانەو بوونەتە هۆی دەوڵەمەندبوونی شیعرەکان. بۆ نموونە لەم دێڕەدا:

**کە دڵ دەتوێتەوە بۆ تۆ، دەکەی ئەو ڕۆژە تۆ بڕوا**
**کە خۆ دەرخەی وەکو و خۆر، دڵ وەکوو شەونم لە خۆ بڕوا**

لە ڕاستیدا ئەو شتەی کە چاو دەیبینێ دڵ بۆی دەچێ و ئەو حاڵەتەی کە بۆ دڵ دێتە پێشێ لە چاودا دەبیندرێ. لەم دێڕەدا بۆ دڵی یەکەم توانەوەی دڵ دەتوانێ مەجازێکی سەبەبی بێ بۆ ئەشکی چاو و بۆ دڵی دووەمیش دڵ دەبێتە خودی فرمێسک کە هەر چاوە بە مەجاز خواستنەوەیەک لەدڵ هێند پڕ دەبێ کە تەواوەن دەبێتە گۆمێکی خوێن لە فرمێسک و دیسان ئەوەش پێوەندایەتی زۆر نزیکی چاو لەگەڵ دڵەکە پاش گریان سوورهەڵدەگەڕێ و لە ڕاستیدا ڕواڵەتێکە لە دەروونی ئینسانەکان، بەڵام خاڵی گرینگ و سەرنج ڕاکێش لەم دێڕەدا ئیهامێکی یەکجار سەیرە کە لە ئیستلاحی، «لەخۆ بڕوا»دا هەیە، محەمەدی مەلا کەریم لە پەراوێزی ئەم دێڕە، لە دیوانەکەی مەحوی-دا تەنیا ئاماژەی بەیەک مانا کردووە کە «لەناوچوون خۆڕانەگری دڵ» بێ و هەر پێ بە پێی ئەم بۆچوونەش دوو وشەی «خۆ»ی کە بە مانایەکی جیاواز لە یەک وەرگرتوون جیناس داناون، کەچی من پێم وایە «لەخۆ بڕوا» لێرەدا چەند مانای دیکەشی هەبێ. وەک ١- لەخۆ دەرچوون ٢-بێخود بوون یا لەسەر خۆچوون ٣- ڕووان کە لێرەشدا دوو «خۆ»یەکە دیسانیش جیناسیان هەیە ٤- لەخۆ بردوویی، واتە خۆفیداکردن کە شەونم فرمێسکی گۆڵەو وەک چۆن فرمێسک خۆفیداکەرانە دەڕژێ بۆ ئارامی و سووک بوونەوەی ئەو کەسەی کە دڵی پڕەو نارەحەتە. ڕەنگە هێندێک مانای تریش.

لەم دێڕەدا و لە زۆربەی دێڕەکانی دیش، وشە وەها پێویستانە لای یەکەوە داندراون کە بە لابردن و گۆڕینی جێی هەر کامێکیان تەواوەتیی دێڕەکە دەچێتە ژێر پرسیارەوەو دەبێتە هۆی شێوانی ئەو تەواوە یەکگرتوویە.

شتێکی تر کە لە هێندێک لەم شیعرانەدا بە جۆرێکی یەکجار سەرنج ڕاکێشانە دێتە بەرچاو، تەواو نەدرکاندنی مەبەستە لە شیعردا و تەنیا ئاماژە بە ڕواڵەتێک لە لایەنەکانی شتێک و هەڵبەت دانەدەستی کلیلێک- دوان زیاتر لە ڕێی زمانەوە بۆ چوونە ناو بەحری دەق و پەی بردن بە ڕۆحی شیعر. ئەوەش یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی دەقێکی کراوەیە بەرەو توێژینەوەی زیاتر.

**هەتا حەق ناصیرە هەر حەقمە مەنظور**
**وەکوو مەنصور ئەگەر بمکەن بە دارا**

لەم دێڕەدا لەنێوان دوو وشەی «مەنظور و مەنصور»دا جیناسێکی ناتەواوی زۆر جوان و بەکەڵک هەیە کە بۆ پشکنینێکی پترمان بەم دێڕەدا ڕادەکێشێ.

هەتا کوونێ ماناگەلێک زیاتر و ڕەنگە جیاوازیش لەو شتانەی کە زۆرکەس لە خوێندنەوەی یەکەم و ڕەنگە لە خوێندنەوەکانی دیکەدا بۆی چووبن، بدۆزینەوە باسی من ئەوەیە کە ئایا ناتوانین لە هێنانە کن یەک، واتە لە تەک یەکدا ڕاگرتنی ئەم دوو وشەیە پرسیارێکی وەک «مەنظوری مەنصورچی بووە؟» وەدی بێنین؟ لەوەش گرینگتر ئەوەیە پاش وەدی هاتنی ئەم پرسیارە، هەر دیسانیش پێ بەپێی خودی دێڕەکە وەرامان چییە؟

من پێم وایە کە دوو وەڵامی شیاوی ئەم بڕوایەم لە ناخی دێڕەکەدا توانیوە کە بدۆزمەوە: یەکەم ئەوەی کە مەنزووری مەنسوور لە هێنانە سەر زمانی قسەی «أناألحق» لە ڕاستیدا حەقیقەتێکە بە باوەڕو بە گەورەیی خودی ئینسان کە چوون لە ڕۆحی خودایە، دەتوانێ بەشێک بێ لە خودا و دووەم ئەوەی مەنسوور ویستوویەتی بەم کارەی خۆی و تەنانەت خۆدانە بەر سێدارەی نا ئەهلانەوە ڕێگای دروست- بیرکردنەوە و حەقیقەتێک بۆ هەمیشە، هەڵبەت لەپێناوی ڕەهەند لێدان، واتە گەڕانەوە بۆ ناو دەروون و گەیشتن بە خۆناسی بە لەپاش خۆی هاتووانی ڕێبازەکەی نیشان بدات.

مەحوی ئەگەر خۆشی لە چەند مانابوون و لێڵ کردن و درەنگ خۆ بە دەستەوەدانی شیعریشی هاتبێ و بۆ ئەو

مەبەستەش پێویستانە لەگەمە زمانییەکانی کەڵک وەرگرتووە، بەڵام هەرگیز نەیهێشتووە کە لە بواری ماناییەوە لە جەغزی بیرکردنەوەی خۆی بچێتەدەر کە پێم وایە لە هێندێک و بگرەڵانی زۆری شوێنەکاندا تارادەیەک داسەپێنەرانە بووبێ، زمانی شیعری مەحوی بڕێک ویشک و قوورسە و لە زۆر جێدا بە پیت گەلێک وشە ئارایی کراوە کە یەکجار توندو ڕەقن و لەم حاندەشدا لە «کینایە» زۆر باش کەڵک وەرگیراوە. ئەوەش ڕەنگە بگەڕێتەوە سەر ناکۆکی و چەرمەسەرییەکانی سەردەمی ژیانی و لەوانەشە کارکردێکی ڕۆحیانەتی سۆفیانەی تێدا هەبێ یان زۆر دەلیلی تریش. لەو زەمانەی ئەو شاعیرەی تێدا دەژیا، شیعر زیاتر بە فارسی و عارەبی دەنووسران و ئەویش لەگەڵ ئەوەی بەسەر هەردوو ئەو زمانانەدا زاڵ بوو، کەچی هەرگیز نەیدۆڕاندو دڕۆی لەگەڵ خۆی نەکردو لە دژی ڕۆحییاتی خۆی نەجووڵاوە، چوون دەیزانی کە زمانی هەر مرۆڤێک ڕیشەی لە دەروونیدا هەیە و بۆخۆی دەڵێ؛

**کوردی زوبانی ئەصڵمەگەر تەرکی کەم بە کوڵ**
**بۆ فارسی، بە کوللی ئەمن دەبەبێ وەفا**

هەروەکو دادائیزمەکان کە لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە، تێکڕووخاون، وێرانی بایەخەکانیان لە ڕووخان و وێرانی لە فۆرمدا نواند، لە زۆربەی شیعرەکانی مەحوی-شدا ئەم حاڵەتە دێتە بەرچاو، هەڵبەت بە ڕوانینێکی ترەوە جودا لە دادائیزمەکان. کاتێک دێنێ لە شیعرەکانیدا و بەتایبەت بە یەکێک لەم شیعرانەدا بە سێ زمانی فارسی و کوردی و عارەبی دەدوێ و بۆخۆشی بە ڕاشکاوییەوە بە دژایەتی لەگەڵ شیعر گوتن- یان باشتر ئەوەیە بڵێین نووسین- بە زمانێکی جیاواز لە زمانی زگماکییەوە هەڵدەستێ، ئەم بۆچوونە زیاتر دەسەلمێندرێ، ئاخۆ بڵێی ئەم شێوازە شیعرییە خود جۆرێک بەرەنگاربوونەوە و بەرهەڵست دانەوەی ئەوە نەبێ کە بایەخ و تایبەتمەندییەکانی زمانێکی وەکو کوردی خرابێتە ژێر چەپۆک و هەنگاو گەلی دەسەڵاتی دوو زمانی فارسی و عارەبی؟. گەر بمەوێ لەم بوارەشدا شتێک وەک فاکت یان وێنەیەک بێنمەوە بۆچوونەکەی لیۆتار-ە لەمەڕ شەڕی کەنداوی فارس یان هەمان کەنداوی عەرەب کە پێم وایە پێویستیشی بەشی کردنەوەیەکی ئەوتۆ نەبێ. مەحوی لە شیعرەکانیدا لەگەڵ خووڵقاندنەوەی زمان وا بەلایەک بەسەر زماندا دەهێنێ کە خۆ لە قەرەدان و بەرامبەربوونەوەیان وێرانێکی زۆری دەوێ و وردبوونەوەیەکی تایبەت. بۆ وێنە تەکنیکە تەرکیبییەکانی هێندە جوان و هێندە بەڕێ و جێن کە وشە لە ناو ڕستەدا وەک یەکیەتییەکی ئۆرگانیزم وا لە پەنای یەکەوە چنڕاون کەڵێک کردنەوەو هەڵوەشاندنەوەیان سەختەو لەوانەیە بە دەرکێشان یان گۆڕینی جێی هەرکامیان تەواوەت بوونی دێڕەکە بچێتە ژێر پرسیارەوە، جا چ لە بواری زمانییەوەو چ لە بواری ماناییەوە. بۆ وێنە دەڕوانینە هونەری تەرکیب لە ڕستەی ئەم دێڕانەدا؛

**١- ئابڕوو یەکجاری چوونی غونچەیەک دەم خەندە بوو**
**گەر حەیات ئەی دڵ دەوێ شیوەن کە مادام الحیاة**
**٢- ئەو نەهاتن دەردە، داغی ئەو نەهاتن دەردەها**
**کەس بەدەردی من نەچێ وەک من نەبێ تووشی نەهات**
**٣- بڕوانە سووتنم، وەرە بڕواکە من نەمام**
**پەروانەم ئیترم نییە پەروا، کەمن نەمام**
**٤- بەشمە پێی قانیعم و بەسمەداغ و دەردی سەرمەدی**
**سەربەدەردین ئێمە، بێ دەردی لە ئێمە سەرمەدە**

ئەگەر بەدڵەوە سەرنج بدەینە وشەی «یەکجار» لە دێڕی یەکەمدا کە چەند بەجێ دزەی کردۆتە نێوان دوو بەشی ئابڕوو چوونەوە یان گواستنەوەی پاشگری «م» لە وشەی «نییە»وە بۆ «ئیتر» لە دێڕی سێیەمدا کە چۆن بۆتە هۆی چوونە سەری باری مۆسیقایی شیعر و ئەو پیت ئارایی و پێوەندایەتییەی زۆر نزیکی وشە لەگەڵ یەکتر لە دێڕەکانی دیکەشدا، سەرجەم پێشان دەری شێوەیەکی یەکجار جوانن لە تەرکیب و لە زمانی شاعیرانەکە ئێمە هەست بەوە دەکەین، وەک مۆریس بلانشۆ دەڵێ، ئەم شیعرە تەنیا لەم شێوە دەربڕینەدا مانای هەیە و هەر بەوەی کە لەم شێوە دەربڕینەی خۆی بێتە دەرێ، دەبێ بە هیچ یان لانی کەم شیعرییەتی خۆی نامێنێ.

ئەگەر وەک چۆن ڕۆمەن یاکوبسن دەڵێ «شیعر کارکردی جوانی ناسانەی زمانە»و بمانەوێ وچانێکمان لەسەر ئەم باوەڕە هەبێ، بەم خاڵە گرینگە دەگەین کە ڕەنگە زمانی شیعرێک خود ناشیرین و بەڵام کارکردێکی جوانی هەبێ و ببێتە هۆی وەدی هاتنی شیعرێکی باش. هەر ئەو شتەی کە لە هێندێک لە شیعرەکانی مەحوی-شدا ئێمە ڕووخسارێکی زمانەوانی جوان نابینین، بەڵام کاتێک کە نووقمانە دەچینە ناو قووڵایی شیعرەکانەوە دەگەین بە بنەماکانی زمانی، ئەو کاتەیە کە لایەنە جوانەکانی شیعرمان بۆ دەردەکەون. مەحوی، ئەگەر لە پاش ڕق هەستانێک، بێزاری یان ماندوویەتییەک، دەست بۆ خامەی نووسین دەبا، بەڵام هەرگیز هەودای شیعرییەتی شیعر لە دەستی ڕانەپسکاوەو لەگەڵ ئەگەر درکاندنی لایەکی بیریشی بەردەوام لە چۆن درکاندن هەربووەو قەت، زمانی فیدای مانا نە کردووە، بۆ نموونە؛

**١- ڕەقیب ئەو دامەنەی دی سەوزە وەک گا لرفی بۆ هێنا**
**نەبوو حاڵی لە لەفزی عەیبە عەیبە، تاوتم؛ وەح وەح**
**٢- تا سەر نەبۆتە گۆ، دە لە دنیا دە تۆشەڵێ**
**هەر ئەو شەقە بەکارە کەوا هەڵدرێ لە هیچ**

هیوادارم کە توانیبێتم هێندێک لە بۆشاییەکانی زمان لە شیعرەکانی مەحوی-دا تارادەیەک ڕوون بکەمەوەو لە ئاکامدا بە پێویستی دەزانم کە دێڕە شیعرێکی ئەو شاعیرە بلێمەتە وەکو قەرزدانەوەیەک پێشکەش بە ڕۆحی پیرۆزی بکەم کە لە بواری ماناییەوە خود هاو دەنگی قسەکەی هیوم-ە کە دەڵێ؛ «ئێمە نازین، لە ئینتزاری ژیان داین».

**بە ئاوی تێگەیشتنێ ئێمە دنیا هەر سەرابێ بوو**
**هەموو دەشچن بە خنکان و لە وشکیشە مەلەی مەخلووق.**

# بیری پۆست مۆدێرن

ڕامین جهانبگلو
و/ لە فارسییەوە: عەولا بەهرامی
(بۆکان)

پۆست مۆدێرنیزم وەرگێڕاوی کوردیی وشەی ئینگلیزی postmodernity و post- Modernite ی زمانی فەرەنسییە. ئەم وشەیە بە پێی ئەو بەکارهێنانە باوەی لە بوارەکانی بیناسازی، ئەدەبیات، کۆمەڵناسی یان فەلسەفەدا هەیەتی. چەمکی سەرەکی و بنچینەیی مۆدێرنیتە بەواتای سەربوردەی بیر لەخۆ کردنەوەو خۆسەقامگیرکردنی مرۆڤ وەک بابەتێکی عەقڵانی هۆشیارو مێژوویی لە ئاراستەی بیناکردنی یاساو ئازادی جیا نییە. بەواتایەکی دیکە هەر چەشنە هەوڵدانێک بۆ جێهێشتنی مۆدێرنیتە یان ڕەخنە لەوە، پێویستی بە بەکارهێنانی ڕێ و شوێن و بنەما بنچینەییەکانی هزری مۆدێرنیتە هەیە.

بەم شێوەیە پێشگری (پۆست) لە وشەی پۆست مۆدێرن بەتەواوی بەمانای قۆناغێکی مێژوویی نوێ نییە کە دوای قۆناغی مۆدێرن شکڵی گرتبێ. کەواتە دەتوانین بڵێین کە پۆست مۆدێرنیزم بۆ خۆی شکڵێکی پەرە پێدراوی هزری مۆدێرنە کە بە شوێن وەرگرتن لە شوێنەواری ڕەخنەیی و ئازادیخوازیی مۆدێرنیتە، بیرو باوەڕو بنەماو ئاواتە فەلسەفی، زانستی و جوانناسیی جیهانبینی مۆدێرن دەخاتە بەر ڕەخنەو هەڵیان دەسەنگێنێ. هەر بۆیە کاتێک باس لە پۆست مۆدێرنیزم دێتە گۆڕێ، مەبەست دابڕانی تەواو نییە لە هزری مۆدێرن، بەڵکو ڕەنگە بتوانین بڵێین درێژەی مۆدێرنیتەیە لە ڕێگای ئاشکراکردنی قەیرانەکانییەوە. ژان فرانسوا لیوتار دەڵێ: (هەر شوێنەوارێک بۆ ئەوەی مۆدێرن بێ دەبێ لە پێشدا پۆست مۆدێرن بێ) کەواتە دەتوانین پۆست مۆدێرنیزم بەجۆرە حەقیقەتێکی مۆدێرنیزم بزانین، چونکە دەبێتە هۆی وەدیهاتنی پێداویستییە پێنەگەیشتووەکانی بیری ڕەخنەگرانەی مۆدێرنیتە بەشێوەیەکی دیکە، پۆست مۆدێرنیزم دەربڕی هەمان هزری ڕەخنەگرانەی سەرەکیی مۆدێرنیتەیە، بەم جیاوازییە کە ئەمجارە پرۆژەی مۆدێرنیتەیە کە دەبێتە ئامانجی سەرەکیی ڕەخنە. لەم ڕوانگەیەوە پۆست مۆدێرنیزم نەدەربڕی گەڕانەوەیە بۆ ڕابردوو نە دیاریکەری قۆناغێکی مێژوویی نوێ، بەڵکو پرسیارێکە سەبارەت بە ئاکامەکانی ڕابردووی مۆدێرنیتە.

ئیهاب حەسەن لە وتارێکدا لەژێر سەردێڕی (فەرهەنگی پۆست مۆدێرن»دا لەو بڕوایەدایە کە وشەی پۆست مۆدێرن بۆ یەکەمجار بەهۆی (فیدریکۆ دواوئیس) لە ساڵەکانی (١٩٣٥)دا وەک دژە کردارێک لە بەرانبەر مۆدێرنیزمی ئەدەبیدا کەڵکی لێ وەرگیراوە.

هێندێکیش ئارنۆڵد توینبی-ی مێژوونووسی ناسراوی ئینگلیزی بەداهێنەری ئەم وشەیە دەزانن. توینبی لە بەرگی نۆیەمی کتێبی (لێکۆڵینەوەیەک سەبارەت بە مێژوو)، سەردەمی پۆست مۆدێرن بەدوایین قۆناغی مێژووی شارستانییەتی خۆرئاوا دەزانێ کە لە ڕاستیدا دەربڕی ڕووخانی شارستانییەتی ئەورووپا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمی زایینی و دەسپێکردنی دوو شەڕی گەورەی جیهانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدایە. لە ڕوانگەی ئارنۆڵد توینبی-یەوە، پۆست مۆدێرنیزم بەواتای سەردەمی پووکانەوەی فەرهەنگی ئەورووپاو پەرە ئەستاندن و زاڵبوونی بڕوانەهێنان بە عەقڵ لە مەیدانی فەلسەفەی خۆرئاوادا. توینبی لە لێکۆڵینەوەکەی خۆیدا پێشگری (پۆست) بەمانای (دوای) بەکار دێنێ. بەم پێیە لە ڕوانگەی توینبی-یەوە پۆست مۆدێرن قۆناغێکی مێژووییە کە بەکۆتایی هاتنی سەردەمی مۆدێرن دەست پێدەکات. بەواتایەکی دیکە لەلای توینبی پۆست مۆدێرن و دوای مۆدێرن یەک واتایان هەیە.

ئێمە جارێکی دیکە لە ساڵەکانی (١٩٦٠)دا لە نووسراوو بەرهەمی نووسران و هونەرمەندانی نیویۆرکی وەک (بورروز، جان کیج، ئوورینگ هاوو، فیلدەر، ئیهاب حەسەن، سوزان سوونتاگ)دا ڕووبەڕووی وشەی پۆست مۆدێرن دەبینەوە. (ئوورینگ هاوو) لە کۆمەڵە وتارێکدا لەژێر ناوی (The Decline of the new) لە وشەی پۆست مۆدێرن بەواتا نێگەتیڤەکەی

کەڵک وەردەگرێ و پۆست مۆدێرنیزم بە ئایدیۆلۆژیای کۆمەڵگای بەکاربەری پۆست سەنعەتی دەناسێنێ.

لەساڵەکانی (١٩٧٠ و ١٩٨٠)دا لە ئەوروپاو ئەمریکادا لەبوارەکانی (ئەدەبی، مۆسیقی، بیناسازی)دا لە چەمکی پۆست مۆدێرنیزم کەڵکی زیاتر وەرگیرا. لە لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکانی ئەو دەیەیە لەبواری پۆست مۆدێرنیزم-دا دەتوانین ئاماژە بکەین بە کتێبەکەی ئیهاب حەسەن لەژێر ناوی (بەرەو ئەدەبیاتی پۆست مۆدێرن). لە ڕوانگەی ئیهاب حەسەن-ەوە لەم کتێبەدا پۆست مۆدێرنیزم نیشاندەری شێوەیەکی ئەپستمۆلۆژیکیی نوێیە لە بواری هونەرو ئەدەبیاتدا کە بە شوێن گۆڕانکاری لە دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی ئەوروپادا شکڵی گرت.

ژان فرانسوا لیوتار لە کتێبی (پێگەی پۆست مۆدێرن)دا ئەم بارودۆخە نوێیە بەجۆرە قەیرانێکی جیهانی دەشوبهێنێ کە بۆتە هۆی لەرزۆکبوونی بنەماو بنیاتی ڕەوایی ناسین لەبوارە زانستی و فەلسەفییەکاندا. لیوتار پێی وایە پێگەی پۆست مۆدێرن بۆتە هۆی سەرهەڵدانی بارودۆخێکی نوێ لەبواری هزری مۆدێرندا کە لەو داهاتنە خوارەوەی زانیاری بەزانست بە شێوەیەکی بنەڕەتی ڕێگای لەهەر چەشنە ناسینێک بەستووە. لیوتار بە سرووش وەرگرتن لەبەرهەمەکانی ئادۆرنۆو هۆرکهایمەرو بەتایبەت کتێبی (دیالێکتیکی ڕۆشنگەری)، پێگەی پۆست مۆدێرن وەک ڕێگایەکی فەرهەنگی و فەلسەفی بۆ ڕاڤەو هەڵسەنگاندنی هزری ڕۆشنگەری پێناسە دەکاو ئاشۆتیس بە نیشانەی کۆتایی هەموو پێشکەوتنەکانی مرۆڤ لە بوارە زانستی و هونەری و سیاسییەکان دەزانێ.

لیوتار لە وتارێکدا لەژێر ناوی (کەڵک وەرگرتنی بەجێ لە پۆست مۆدێرن) دەنووسێ: (لە کۆتاییدا ئەونیشانێک کە بۆتە کۆتایی ئەواتەکانی مۆدێرن: (ئاشۆتیس) هەروەها لە کتێبێکیشدا بەناوی


هیگل

شیکردنەوەی پۆست مۆدێرن بۆ منداڵان لێی زیاد دەکاو دەڵێ: (ئاشۆتیس ناوی پێناسەیەکە بۆ هەموو تراژیدییەکانی مۆدێرنیتە). کەواتە مەبەستی لیوتار لە هێنانە گۆڕی بابەتی پۆست مۆدێرنیزم پێداگرتنە لەسەر ڕاستیی ئاشۆتیس وەک قۆناغی کۆتایی لۆژیکی ڕاستەقینەی یان جیهانی ڕۆشنگەری و لەوانەشە وەڵامێک بێت بۆ ئەم ڕستەیەی ئادۆرنۆ کە دەڵێ: (کەواتە ئاشۆتیس شاعیرێکی بێ مانایە).

هەروەها لیوتار سەرکەوتنی بوورژوازی زانست و تەکنەلۆژی و جیهانی بوونی ڕاستیی مێژوویی، ئەویش وەک بەڵگەیەک بۆ قەیرانی ڕەوایی ناسین هەڵدەسەنگێنێ. بەواتایەکی دیکە، هەڵسەنگاندنی لیوتار دیانەی مۆدێرنیتە ناوەرۆکێکی ئەپستمۆلۆژی هەیە، بەڵام لیوتار هەوڵدەدا هاوکات لەگەڵ خستنە ژێر پرسیاری بنەمای ئەپستمۆلۆژی مۆدێرنیتە بیر لە ڕەهەندە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی بارودۆخی پۆست مۆدێرنیش بکاتەوە. هەر بەم هۆیەوە لیوتار لەگەڵ هاوڵاتییەکەی خۆی ژان بۆدریار- کۆمەڵناسی فەرەنسایی- لە وەک یەک زانینی پۆست مۆدێرنیزم و کۆمەڵگای پۆست سەنعەتیدا هاوبیروڕایە.

لە ڕوانگەی لیوتار-ەوە کۆمەڵگای پاش سەنعەتی کۆمەڵگایەکی تەکنەلۆژی پێشکەوتووە کە لە ودا زانستی کۆمپیووتەری دیاریکەری


نیچە

ڕەوتی سەرەکیی کۆمەڵە. لێرەدا لیوتار بە ئیلهام وەرگرتن لە بیروبۆچوونەکانی کۆمەڵناسانی ئەمریکایی و دانیال بێل، پۆست مۆدێرنیزم بەژێر بێژیی فەرهەنگیی کۆمەڵگایەک دەزانێ کە لە قۆناغی پۆست سەنعەتیدایە. بەم پێیە ئەو قەیرانانەی کە پۆست مۆدێرنیزم لەباری هزری و سیاسییەوە لەگەڵیان بەرەو ڕوویە، قەیرانەکانی کۆمەڵگای پۆست سەنعەتی مۆدێرنن.

ژان بۆدریار-یش بە نۆرەی خۆی کۆمەڵگای پۆست مۆدێرن بە کۆمەڵگایەک دەزانێ کە پێکهێنەری کەش و هەوای وەک یەک دیتن (زانین)و هاوشێوەکردنە. لە ڕوانگەی بۆدریار-ەوە وەک یەک زانین لە کۆمەڵگای پۆست مۆدێرندا ئەو پێگە کۆمەڵناسییەی هەیە کە بابەتی بەرهەم لە کۆمەڵگای سەنعەتیی مۆدێرندا هەیبوو. بە بۆچوونی بۆدریار ڕەوتی هاوشێوەکردن بە زاڵبوونی بەسەر ڕاستەقینەی کۆمەڵگای مۆدێرن. ئەم کۆمەڵگایە بەرەو جۆرێک (بان ڕاستەقینە) (hyper realite). دەبا. بۆدریار دەنووسێ: (بان-ڕاستەقینە یانی کاتێک کە ڕاستی تەنیا ئەو شتە نییە کە لە توانایدا هەیە سەرلەنوێ بەرهەم بێتەوە، بەڵکو ئەو شتەیە کە هەمووکات بەرهەم دێتەوە).

لە ڕوانگەی بۆدریار-ەوە بۆچوونە پزیشکییەکانی دکتۆر ئیسپاک یان بەیانی لەو هاوشێوەکردنانەن کە بە بەردەوامی لە کۆمەڵگای بان

ڕاستەقینەدا دەچنە پلەی (ڕاستەقینە)وە. هەر بۆیە بۆدریار گۆڕەپانی کۆمەڵایەتیی پۆست مۆدێرن وەک دنیای نیهلیستی و بەدەر لەمانا پێناسە دەکات.

بۆ دریار شکانی ئایدیۆلۆژیاکانی سەدەی نۆزدەیەم و کۆتایی هاتنی فەلسەفەی مێژووی هێگڵ- مارکس بەیەکێک لە هۆکارە گرنگەکانی نەبوونی مانا لەدنیای پۆست مۆدێرندا دەزانێ. بۆدریار پێی وایە پۆست مۆدێرن ناراستەو مانای مێژوویی لەدەست داوەو هەر بەم جۆرەش شێوەیەکی نەخۆش ئاسایە لە کۆتایی هونەر. لەو جێگایە کە لیوتار نەبوونی مانا لەبەرهەمدا دەکاتە هێمای ڕوانگەی پۆست مۆدێرن و باس لە پلەی سفری فەرهەنگ دەکا، بۆدریار قسە لە پلەی سفری سیاسەت دەکاو دەڵێ: (یەکێک لە هێماکانی هەڵکەوتەیی پۆست مۆدێرن لە لێک جیابوونەوەو لێک بلاوبوونی بکەری کۆمەلایەتیدایە). هەڵکەوتەیی پۆست مۆدێرن کە جێگای سەرنجی بۆدریار-ە، لە جیاتی تەواوی ماناو عەقڵ ئامرازی واتە دابڕانی نێوان زهنییەتی تاک و ژیربێژیی ئابووری و سیاسیدا. لیپوتسکی کۆمەڵناسی هاوچەرخی فەرەنسایی لە چاخی پووچیدا دەنووسێ:

(کۆمەڵگای پۆست مۆدێرن واتا یەکدەستییەکی نوێ، لەوەها کۆمەڵگایەکدا هیچ ئایدیۆلۆژیایەک ناتوانێ کۆمەڵەکان هەڵفرێنێ).


لیوتار

کەواتە پۆست مۆدێرن لە ڕوانگەی کۆمەڵناسەکانی وەک بۆدریارو لیپوتسکی-یەوە لە جیاوازیی تەواوی نێوان چوارچێوەی گشتی و چوارچێوەی تایبەتیدا کورت دەکرێتەوە. ئەم گەڕانەوەیە بۆ چوارچێوەی تایبەتی هاوئاهەنگە لەگەڵ شکستی سیاسەت بەواتای پرۆژەی ڕێکخستنی کۆمەڵگاو سەرکەوتنی ئاوەزی تەکنەلۆژی و ئامرازی بەسەر شێوەکانی دیکە لە ژیانی ئینسانیدا. کەواتە ئەگەر بمانەوێ لە کورتی بیبڕینەوە دەتوانین بڵێین کە هزری پۆست مۆدێرن لەشەش بنەماکە بە جۆرێک دیاریکەری جۆرێک لە بیرکردنەوەو ڕوانین کورت بکەینەوە:

١- مەسەلەی ڕێژەگەرێتی و لێ نەبڕاوی لەبواری ناسیندا.

٢- شکانی بۆچوونی پێشکەوتن و کۆتایی یەکجاری، کۆتایی گەرییە مێژووییەکان.

٣- هەڵوەشانەوە سوژەی کۆمەڵایەتی و تایبەتی بوونی ڕەهەندی سیاسەت.

٤- هەڵسەنگاندنی چەمکی دنیاگەرایی فەرهەنگی مۆدێرن و گرنگی پەیداکردنی بیری ناسنامەی فەرهەنگی.

٥- قەیرانی ژینگە، پێشکەوتنی ئامرازەکانی پێوەندیی گشتی و سەراپاگیر بوونی ستراتیژیی ئابووری.

٦- هەڵوەشانەوەی تەواوی سوژەی هیگڵ-ی بەدوای هەڵسەنگاندنی نیچە-یی و فرۆید-ی سەبارەت بە بنەمای ڕاستەقینەی ئاوەزگەری.

هەروەک دەبینین پۆست مۆدێرنیزم بەرلەوەی مۆدیلێکی ڕۆشنبیری لە ئەوروپاو ئەمریکا بێ، بەرهەمی ڕەوتێکی فیکری و فەلسەفییە کە زیاتر لەسەدەیەکە لە گۆڕەپانی هزری مۆدێرندا لە گۆڕێدا بووە. ئەو پرسیارانەی کە هزرمەندانی وەک هایدگەر (لەبواری هەڵسەنگاندنی تەکنیکدا)و نیچە (لەبواری ڕاستەقینە سەرپاگیرەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری)و فرۆید (لەبواری هەڵوەشاندنەوەی سوژەی دیکارت-ی) هەرکامە بەشێوەیەک لەنێو پرۆسەی مۆدێرنیتە دژی مۆدێرنیتە هێنایانە گۆڕێ. خاڵی بزووتنی هزری ڕەخنەگرانەی پۆست مۆدێرنە. لەئاکامدا، بەبڕوای خاوەن بیرانی پۆست مۆدێرن (بۆدریار، بیوتار، ڤاتیمۆ) ڕۆڵی ڕۆشنبیر لە مەیدانی کۆمەڵایەتیی ئێستای خۆرئاوا گۆڕاوە. ئەگەر سەردەمێک ڕۆشنبیرانی وەک ئەمیل زۆلاو ژان پۆل سارتەر بە ئیلهام وەرگرتن لە خاوەن هزرەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری باسیان لە ڕاستەقینەکان دەکردو بەناوی ئەو بنەمایانەوە قسەیان دەکرد کە بێ ئەملاوئەولا دنیاگیرن، ئێستا خاوەن بیری پۆست مۆدێرن دوابەدوای ڕمانی ئایدیۆلۆژیای ڕێ نیشاندەرانەی مۆدێرن و ڕەوانەوەی ئەفسانەی بڕوای (چوونە پێش بەرەو بەهەشتی ونبوو) خۆیان بە پێکهێنەر یا هەڵگری هیچ چەشنە ئەرکێکی مێژوویی نازانێ.

وەک مارس دۆگلاس لە کتێبی (هێز، کردەوەو بڕوا)دا دەڵێ: (ڕۆشنبیرانی پۆست مۆدێرن بەهۆی بێ توانایی لە چارەسەرکردنی پرسەکانی جیهانی ئەمڕۆ دەستەو داوێنی جۆرێک ڕێژەگەریی فەرهەنگی و نیهلیستی بوون)، بەڵام ئەم ڕێژەگەرییە فەرهەنگییە بۆ خۆی بونیادنەری پلۆرالیزمی فیکرییە، بەواتای کۆتایی زاڵبوونی شارستانییەتی ئەوروپایی.

لە ڕاستیدا وەک گیانی ڤاتیمۆ دەڵێ: (بە پۆست مۆدێرن بوونی جیهان، دیالۆگ و تووێژێکی قووڵتر لەنێوان شارستانییەتەکانی ئەمڕۆ دەست پێدەکات کە بنەمای وەگەڕکەوتنی خۆی لە هەڵسەنگاندنی هزری هێرمینیۆتیکیدا دەدۆزێتەوە).❖

**سەرچاوە:**

.............

**مدرنیتە، دموکراسی و روشنفکران**

# دایالۆگێک لەگەڵ (ئیروین)دا

و/ لە ئینگلیزییەوە: ئازاد خدر

بە بڕوای من سیمبول (ڕەمز) بابەتی ئەندێشەیە کە ئەویش گوزارشتە لە ئامادەبوونی خودی هزر لەنێو بووندا، بەڵام جیاوازیی نێوان هزرو هەرجۆرە بیرکردنەوەیەکی دیکە چییە؟.

(ئیروین) وتی: یەکانگیری یونیڤێرسال (گشتی)و پەرتیکولار (تایبەتی)، ڕاستە، ئەگەر بمانەوێ جیاوازیی دیکە بدۆزینەوە لە نێوان سیمبول و هزردا (نەک لەبەرئەوەی کە هەر یەکێکیان خۆی لەخۆیدا شتێکی جیاوازە، بەڵکو چونکە شێوەی بیرکردنەوەمان وا دەخوازێ پێوەندییەکانی یەکێکیان جیاکەینەوە لە جەوهەرەکەی) ئەوا یەکانگیری (گشتی)و (تایبەتی) ناو لێنانێین سیمبول، کاتێ ئاماژەی پێ دەکەین لە گۆشەنیگای تایبەتییەوە، بەڵکو ناوی لێدەنێین هزر، لەو کاتەی کە ئاماژە بە یەکانگیری دەکەین لە گۆشەنیگایەکی جیهانییەوە وتی، ڕاستە من وتم ئەمە باشترین ڕێگایە بۆ سازدانی ئەم جیاوازییە، ئەمەش ڕاستە کە گشت هونەر بەپێی ئەم بۆچوونە سیمبولییە، بەڵام تەنیا لەم گۆشەنیگایەوە.

سیمبول نە ئیشارەتێکی ڕەمەکییە (arbitrary-sign)و نە لاساییەکە بۆ ڕەچەڵەک، کە جیاوازیی ڕەها هەیە لەنێوانیاندا، بەڵکو ئاشکراکردن و ئیلهامێکی (Revelation) ڕاستەقینەی هزرە، چونکە لە ئیلهامدا بیرکردنەوەی ناوەکیمان دەخرێتە نێو دیاردەیەکی دەرەکی کە مەحاڵە لێک جیا بکرێتەوە. بەم جۆرە ئەگەر یەکێک لێمان بپرسێ: ئەگەر هەڵبژاردنی بابەتی دەرەکیی تایبەتی بە شێوەیەکی جەوهەری کە هزر دەیبەخشێ پێمان و کە لەوانەیە هونەرمەندێک هەڵیبژێرێ و بابەتە ناوەکییەکەش ڕەتکاتەوە، ئەوا وەڵامی ئێمە چ دەبێ؟ ئەو وتە، هەمان وەڵام، چونکە لای ئێمە ئەم هونەرمەندە دەبێتە گوزارشتکەر لە ڕێلم (Realm: مملکة)ی ئەندێشە: ئەو چرکەیەی کە کردەوەی ڕۆح لەنێو ترووسکە ڕاستەقینە ناوەکییەکەی بوونمان سەرهەڵدەدا، ئەم ترووسکەیە لەم کاتەدا بەرجەستەی فۆرم و بابەتەکەی دەکات، لەم بۆچوونەوە لەهەر خاڵێکەوە سەیری سەنتەرو رووی بابەتەکە بکەیت، هەمیشە سیمبولێکی تەواو دەستەبەر دەکەیت- ئەو شتە چۆنایەتییە کە لەهەمان کاتدا بیرۆکە ناوەکیی و گشتگەرەکەی خودی ترووسکە ڕووناکییەکەیە.

لەڕاستیدا هونەرمەند لێرە لەناو سروشتە جەوهەرییەکەی خۆیدا شتە ڕاستەقینەکە دەخوڵقێنێ. ئێمە ئەوە دەزانین، بەڵام چۆن ئەو جەوهەری سروشتییە لە هەمان کاتدا بوونە ڕاستەقینەکەیەتی و بریتییە لە بەدیارکەوتنی ئەو پێوەندییانە کە لە نێو تاریکیی ڕواڵەتدا لەگەڵ شتەکانی دیکەدا بەدیار دەکەوێت بە شێوەیەکی هەڵکەوتی accidental؟ ئەمە ڕاستە، بەڵام ئێمە ئەم کردەوەو داهێنانە وەک پرۆسەیەکی سەرهەڵدان سەیری ناکەین پێش ئەوەی بوونی پێ ببەخشرێ، چونکە تەنیا لەبووندا لەنێو بووندا کاری ئیستێتیکی ڕوودەدات. واتە ئەگەر سەیری پرۆسەی داهێنان بکەین بەشێوەیەکی ئەبستراکت ناتوانین بزانین هونەر چۆن بابەتەکانی هەڵدەبژێرێ ئەگەر داهێنانی ئازادانەی هونەرمەند نەبێ: بەهەمان شێوە، لەلایەکی دیکەوە، هەر کەسێک سەیری بابەتەکە بکات لە ڕووی دەرەوەیدا وا دەزانێ شتێکی هەڵکەوتییە (صدفة)، چونکە وای دەبینێ کە تەنیا یەکێکە لەسەدان بابەتی دیکە کە پەرش و بڵاون لەنێو جیهاندا. لەبەر ئەوە گومانی تێدا نییە کە هەر ئەم ڕوانگەیە هونەر

جیادەکەنەوە لە سیمبول و ڕاڤەیەکی شتێکی دیکەی جیاواز دەکات. ئەگەر هونەرمەند ڕەمەکییانە بابەتی خۆی هەڵبژێرێ، ئەوا نابێتە هیچ شتێک، بەڵکو دەبێتە وێنەی (Image) ئەو هزرە کە دایهێناوە: ئەگەر جەوهەرە کوێرەکەی هەڵکەوت ببەخشرێ پێی، ئەوا دەبێتە ڕاستییەکی گۆشەگیر بەبێ واتایەکی جەوهەری یان تێگەیشتنێکی جەوهەری، بەپێچەوانەوە، هونەر ڕاستی دەدرکێنێ، چونکە بەرزترین بیرۆکە بەشێوە ڕاستەقینەکەی بۆ هونەرمەند بەدیاردەکەوێت نەک بە شێوەیەکی دیکە، چونکە بەرزترین بابەت هەڵنەبژێرراوەو ئازادانەش سەری هەڵنەهێناوە، بەڵکو بەهۆی حەتمییەتێکی ڕۆحییەوە:

Mystirious inevitability: هەردووکیان لەهەمان کاتدا بەرجەستە دەکات و ناکات. لەبەر ئەوە دەبینین لە هونەری ڕاستەقینەدا جۆرە ئاساییەکانی (بابەتی خود) ئاوا گشتگەرن: بوونێکی زیندوویان هەیە لەنێو باوەڕێکی گشتیدا، هەرلەکاتی لەدایک بوونی هونەرمەندیشەوە دەورەی دەدەن. بەم جۆرە ئەستەمە بتوانین بڵێین لای هونەرمەنددا جیهانی ئەندێشەو جیهانی ڕاستەقینە یەک شت و هەمان شتن، چونکە لە نێو ڕیلمی (میرنشین) ئەندێشەدا خودی ڕاستییە، بەڵام لەنێو جەوهەرە ڕاستەقینەو بوونەهەرە بەرزەکەیدا. ئەمە لەوانەیە بە شێوەیەکی ڕوونتر لە چیرۆکەکانی -جینۆکەیی شیعریدا: poeticfairy بەدی بکرێ، کە لەوانەیە بۆ یەکەم جارو لە بەرایییدا گوزارشت بن لەم یەکانگیرییە وەک ژیانێکی ڕانەبردووی ڕاستەقینە. شاعیر شتە هەرە ئاسایی و نائاساییەکانی (Marvellous) ڕۆژانە یەکانگیر دەکات وەک ئەوەی کە هەردووکیان لەنێو هەمان جیهاندا بن. ئەم سروشتە سەیرو سیحرییەی سیمبول، (ئیروین) وتی، بێگومان سەرچاوەی ئاڵۆزیی شتە ناکۆکەکانە کە لەنێویدا دەتوانین بخرێنە نێوی ئەگەر هەوڵمان دا جیاوازیی نێوان ئەو شتەی کە بۆ هونەرمەند ڕاستییەکی (بەخشراوە) بەواتا ئاساییەکەی ئەم وشەیەو ئەو شتەی کەسەر هەڵدەدا لەنێو ئەندێشەکەیدا بدۆزینەوە. من وتم، چونکە ئەم جۆرە هەوڵە تەواو ناشەرعییە illeyitimateو هیچ نەبێ هیچ جۆرە ڕاستبێژییەک (intuition) نایەڵێ بچێتە ناو کاری داهێنانەوە، چونکە لە سیمبولی ڕاستەقینەدا بابەتی دەرەکی بەهۆی تروسکەی ڕووناکیی جەوهەری ناوەکییەوە دێتە ئاراوەو بە تەواوی یەکدەگرێ لەگەڵیدا، بەم جۆرە ئەم ڕووناکییە ناوەکییە لەوانەیە خۆی بدۆزێتەوە بەشێوەیەکی تایبەتی، نەک لە ناوجەرگەی شتەکاندا، بەڵکو بەیەکسانی لەگەڵ ڕووالەتە ڕەهاکەیدا؛ لەوانەشە بتوانین بڵێین کە ئەمە ئەو باجەیە کە هونەرمەند دەبێ بیبەخشێ تاکو جیهانی ناوەکیی شتەکان بگۆڕێ بۆ جیهانە دەرەکییەکەیان. لێرەدا تۆزێک وەستام و لەم کاتەشدا (ئیروین) بەرقەوە سەیری (بیرنهارد)ی برادەری کردو وتی، (بیرنهارد) تۆ ئەم گۆشەنیگایە لەوانەیە ئێستا تەرخانی بکەین بۆ دووبارە دارشتنەوەو شیکارکردنی بیروبۆچوونە کۆنەکانت، چونکە (ئادالبیرت) هەر ئێستا بەتەواوی ڕوونی کردەوە کە هونەرمەند جیهانی ناوەکی وەردەگێرێ بۆ جیهانی دەرەکی؟. (بیرنهارد) وەڵامی دایەوە، لەوانەیە، ئەگەر هات و ئەوەم تێبینی نەکردبایە، وەک ئەوەی بەم دواییە کردم کاتێک لەبارەی (sublim: سام) دواین، کە وێڕای ئەوەی سوودم لە دەستەواژەکە وەرگرت، بەڵام نایخەمە نێو چوارچێوەی ئەو هزرە کە لای من شتێکی نامۆیە، چونکە من وادەبینم ئێمە ئێستا قسە لەبارەی جیهانێک دەکەین کە هەروەک (ئادالبیرت) ئاماژەی بۆ کرد کەوتۆتە نێوان ڕووناکیی ناوەکیی شتەکان و تاریکیی ڕووی دەرەوەیان. من وتم، نەک هەر ئەوەندە...تۆ نەتبیستووە کە جیهانی هونەر هەموو شتێک لە باوەش دەگرێ؟ ئایا نە ڕووناکیی خواوەند بە خۆوە دەگرێ کەهەر لەیەکەم سەرهەڵدانیدا شێوە (هیولی: corporeal)یەکەی پێدەبەخشێ و نە جەستەیەکی تایبەتی کەهەر ڕووناکییەکە کاری تێدەکات؟ (بیرنهارد) وتی، ئا لێرەدایە سەیرترین شت و زۆر کەمیش دەگونجێ لەگەڵ بیرۆکەکەی مندا. من تاکو ئێستا لەگەڵدا بووم و لە سیمبولەکەت گەیشتم کە هزرو دیاردە یەکانگیر دەکاو بەیەکسانی مافیان پێدەبەخشێ- کەهەر بە تەواویش ناگونجێ لەگەڵ گۆشەنیگاکەی دیکەی من بۆ دیاردە. من لەوانەیە هەمان ڕاستی نەبەخشمە دیاردەو هزر. (ئیروین) وتی، بەڵێ، من دەبێ دان بەوەدا بنێم کە منیش هەروەها لە سیمبول گەیشتومەو وەک (بیرنهارد)و تۆ هەردوو شتەکەتم، (خواوەند)یی ڕەهاو بابەتە تایبەتییەکان) لە ڕاستیدا خستە نێو ڕیلمی هونەرەوە. لەوانەیە لە جەوهەردا ئەمە ڕاستبێ، بەڵام کێ بەتۆی گوتووە ئاوا میکانیکییانە کاریکەو بیرۆکەو پارتیکولار بەشێوەیەکی ئەبستراکت لە ناوەڕاستدا گرێیان بدە؟ لە بیرت نەچێ، هەر وەک من ئێستا وتم، کە (خودی سوری- خواوەند) شتێکی ڕاستەقینەیە هەروەک چۆن هەر شتێکی ئینندیڤیجوال (تاک) ئەمرو

جەوهەرییە یاخود پێویستە (essential). ئەو وەڵامی دامەوەو وتی، ئەمەش گۆشەنیگاکەی منە؛ بەهەموو بڕوامەوە دەڵێم، زۆر ئاسانە لەنێو ئەم شوێنە جەنجاڵ و سەیرەدا کە بەپێی خۆمان چووینە ناویەوە، ڕێگای خۆمان ون کەین. دەمەوێ بڵێم، لەبەر ئەوە هەمیشە گومانێکی سەیر باڵی بەسەرمدا دەکێشێ، کە بتوانین دەستەبەری زانینێکی تەواوی هەردوو ئەم شوێنە بکەین- کە یەکەمیان پەیوەستە بەهزرو بونیادی دیاردەکەی بەشێوەیەکی ڕەهاو میتافیزیکی و تەواو- خواوەندیی و مرۆیی، ئاسمانی و زەمینی - ئەوی دیکەش ئەو شوێنەیە کە تێیدا کاری داهێنان دروست دەبێ و لە شوێنی یەکەم دادەبڕێ، وەڵامم دایەوەو وتم، بەختەوەرم لەم سەرنجانەی تۆدا ئەوە بەدی بکەم کە تۆ دەسبەرداری ڕێگای ڕاست نابی، ئێمە لەسەرەتاوە پێناسەی سیمبولمان کرد، ئێمە ئەو (تێرم)انەمان هەڵبژارد بۆی کە دەستدەدەن بۆ جیاکردنەوەی لە شتی تری پێوەندیدار. ئێمە تاکو ئێستا تەنیا لەیەک ڕووەوە سەیرمان کردووە. تۆ بە هەڵەدا نەچووی کە دەڵێی لەهەر شوێنێکدا سیمبول و هزر تێکدەئاڵێن، هەرچەندە من ناتوانم لەگەڵدا بم لەوەی کاری داهێنەر تەنیا لەم تێکەڵەیەدایە. ئەو وتی، ڕاستە من نەموتووە تەنیا لەوەدایە هەرچەندە بەگشتی لەوێدا کاری داهێنەر گوزارشت لەخۆی دەکات. من وەڵامم دایەوە، ئەمەم پێ باشترە، بەڵام ئایا هەر ئەم کارە خۆی لە خۆیدا بریتییە لە جوانی Beauti-ful؟ ئایا ئێمە نەمانوت کە دەبێ بچینە ناو جیهانی ڕاستەقینە ئەگەر جوانی بیەوێت ببێتە ڕیالیست؟ ئەو وتی، لەڕاستیدا وایە، بەڵام ئەم کارە ڕیالیستە هونەرە، وانییە؟ من وتم، بەڵێ هونەرە، واتە زۆر جیاوازە لە سیمبول؟ وێڕای ئەوە کە سیمبول نییە، هەر وەک تۆ ئاماژەت پێکرد، ئایا تەنیا بەتەواوی لەنێو کاری هونەریدا گوزارشت دەکرێ؟ دەمەوێ بڵێم ئەوەی لەناو هونەردا بەدی دەکرێ دەبێ لە ناو سیمبولیشدا هەبێ. بەم جۆرە سیمبول تەنیا نابێ وەک بەرهەمێکی تەواوی تواناکانمان بەدیار بکەوێت، بەڵکو دەبێ هەروەها وەک ژیان و کارەکانی خودی ئەم توانایانە بەدیار بکەوێت. تۆ دەڵێی چی؟ ئەو وتی، من وا دەبینم کە ئەمە ڕاڤەیەکی تەواوە بۆ ئەم دیالۆگەمان، بەڵام من بەتەواوی تێناگەم مەبەستت چییە لێرە. وەڵامم دایەوە، مەبەستم ئەوەیە کە تا ئاوا سەیری کاری داهێنان بکەین، ئەوا ئێمە وا دیارە هێشتا بەتەواوی دانەبڕاوین لە بۆچوونی ئاسایی و گشتی بۆ هونەر کە تائێستاش هەڕەشەمان لێدەکات. چونکە کاتێک کە کاری هونەری وەک سیمبولێک سەیری دەکەین، هەروەک پێشتر سەیرمان کردووە، یان کاتێک شتی ڕاستەقینە کە لەنێوان هزرو دیاردەدایە یەکانگیر دەکەین، ئەوا ئێمە بێ ئەوەی بزانین بەبێ دەنگی پاڵ بە ئەندێشەوە دەنێین- وەک کارێکی زیندوو- بۆ ناو پاشخانەکەی Back groundو دایدەبڕێنین لە بوون. دەبا ئێستا بەهەمان شێوە پاڵ بە ئەندێشەوە بنێین بۆ ناو هەتاوی ڕووناکی خۆر، بۆ ناو بوونی ڕاستەقینە: چۆن بەدیار دەکەوێ ئێستا لەبەرچاومان، کاتێک ئەو ڕیلمە پیرۆزە پڕ دەکات؟ ئایا ئێستا تاوناداتە ناو ڕیالیستی: واقیع /ڕاستی وەک هێزێکی خواوەندی؟ ئایا ئێستا و لەمەودوا ناتەقێتەوە لەنێو ڕووناکی پیرۆزی پیرۆزەکاندا: Holyof Holies؟ لەلایەکی دیکەوە ئایا ئێستا هەڵۆ ئاسا نافڕێ بەسەر شتەکاندا و پاکیان ناکاتەوەو بەرزیان ناکاتەوە بەرەو ڕووناکییەکە؟ ئایا ئەمە ئێستا (pneuma)ی خواوەندیی نییە، وەک ژیانێک و بزاوێک و بوونێک لەناو جیهانێکی پیرۆزدا، وەک خودی کاری هونەری و ئامادەبوونی ڕاستەقینەی جوانی؟. لێرەدا (ئیروین) وتی، ئێستا مەزەندەی من بۆ دوورترین ڕۆحی جیهانی هونەر بەشێوەیەکی سەرسوڕێن فراوان بوونەوە. بەڵێ ئەمە تاکە ڕێگایە لە بەردەم جوانی تاکو سەرتاپای بپەڕێتەوە بۆ نێو ڕیالیستی، بەڵام من نازانم چۆن ئەم ژیربێژییە ناوەکییە، کە ڕاستگۆییەکەی لە ناخەوە دەمهەژێنێ، بخەمە نێو دیاردە، چونکە تائێستاش دەمەوێ بزانم شێوەی دەرەوەی کارێک چۆنە کە لە نێویدا ئەم هێزە- بەخشراوەی- ژیان بەدیار دەکەوێت لای من، ئەمەش وام لێدەکات بترسێم لەوەی کە بگەڕێمەوە دواوە بۆ ڕوانگە کۆنەکەم بۆ سیمبول. وەڵامم دایەوەو وتم، ئەمەش خۆی چارەسەر دەبێ لەو کاتە کە تۆ بیر لەوە دەکەی، ئەگەر بمانەوێ شێوەی بوونی ڕاستەقینە بزانین، دەبێ خۆمان بە تەواوی ئازاد بکەین لە کۆتی تێگەیشتنی هەستی و تەنیا چاومان ئاراستەی ئەندێشە بکەین. چونکە ئەم شێوەیەی کە لەڕێگای ئەندێشەوە دەبینرێ بابەتە ڕاستەقینەکەیە، ئەو بابەتەیە کە تێیدەگەین بە ئەزموونە ئاساییەکانمان لە ڕێگای ئامرازێکی هزریدا جگە لە هەست، کە بەهێزترین نمایشی ناوەکیی شتەکانە. واتە ئەو کارەی داهێنانەکە خۆی لە خۆیدا ژیانە داینەمیکییەکەی ئەندێشەیە وەک گشتگەرێک، دەبێ لەهەمان کاتیشدا ئیلهامی Rev-elation ئەم ئەندێشەیە بێت لە شێوەی بابەتێکدا. تەنیا ئێستا ئەم کارە یونیڤێرساڵە (گشتگەرە) پڕ دەبێ لەبابەت/

کێشەکە لە بەراییدا لە ناو سیمبولدا بابەتەکە وا دیار بوو تەقینەوەیەکی بەهێزە. ئێستا تێم گەیشتی بەتەواوی؟. وتی، بەگشتی ئێستا لە ڕێچکەی هزر گەیشتم و دڵنیاشم لەوە کە ئەمە تاکە ڕێگایە کە لە نێویدا جیهانی ئەندێشە بەخودی خۆی تەواو پڕ دەبێ و جیهانی ڕاستەقینەش نەک هەر تەنیا پڕ دەبێ بە بوونی خـــۆی، بەڵکو پڕیش دەبێ لەهێـــزە داهێنەرەکـەی خـۆی، بەڵام بەخـتــەوەرتر دەبم ئەگـەر بۆم ڕوونبکەیتـەوە چۆن ئەم بیـرۆکـەیەت لە نێـو ئەزمـوونێکدا پراکتیزە دەکرێ. وتم، بەر لەهەمـوو شتێک ئەم بیرۆکەیەم بە تێرمەکانی ڕێچکە پێشووەکەی هزر ڕاڤە دەکەم بۆت، چونکە ئەگەر ئەزموونەکان پراکتیزە بکرێن بۆ بابەتەکانی فەلسەفە پێش ئەوەی پرینسیپەکان و فەندە مێنتالەکان (بنەڕەتییەکان) بە تەواوی ڕوون بینەوە، ئەوا دەبێتە مایەی شێواندنی هزر.

واتە لە ڕاڤەی پێشوومـاندا، کاتێک سەیری جوانیمان کرد وەک ئەوەی لە هونەردا دەژێتەوە، وەک سیمبولێک، بینیمان کە ئەم جوانییـە گـشت جیـهـانی ئەندێشـە پڕ دەکـات هەر لەسـەرەتاوە، وەک بوونێکی تەواو، بەتێکەڵاوی لەگەڵ هێـزو کـارو کردەوەی خۆیدا. ئەو شتە بوو کە تۆ پێت دەوت هزر لە پلە هەرە بەرزەکەی ڕیالیستیدا بەدیار دەکەوێت نەک هەروەک ئامادە بوونێکی تەواو و یەکجارەکی، بەڵکو دەخرێتە نێو ئەم ئامـادەبوونەش بەتەواوی (perfection: کـامل) خـۆی، بەبێ یارمـەتی شـتێکی دیکە. لەبەر ئەوە لێـرەدا بەرزترین پێرفێکشنی بوون یەکدەگرێ (بە ڕێگایەک کە بەهیچ جۆرێک ڕوونادات لەناو جیـهـانی ئاسـایی دیاردەدا) لەگەڵ ئەو پەردە پیـرۆزو ناسکە کە لە نێـویدا پێوەندییە ناوەکـییەکەی هزرو دیاردە درەنگ لانادرێ و ئاشکرا نابێ، بەڵکو هەر یەکسـەر وەک ئەوەی کە بەهێزترین باوەڕ لە ڕاستـیی ئامـادەبووندایە، بەڵام ئەمە بە ئاشکرا دەبێتە بابەتێکی جیاواز ئەگەر لەناو ئەم جیـهـانەدا (تێکڕای جیـهـان)، سـەیری خودی کـارو کردەوەی داهێنان بکەین. ئەمە لەناو هونەریشـدا نابێ بەبێ بابەتێک یان فۆرمێکی ڕاستەقینە، بەڵام ئایا هێزێک و هەژموونێک نییە لێرە لەهەر فۆرمێکدا کە دەبێـتە هۆی ئەوەی فۆرم لەنێو خۆیدا پێچەوانەکەی بەخۆوە بگرێت؟ چونکە کـاری هونەری یاخود ئیستێتیکی تەنیا ئەو کاتە دەزانرێ کە کاریگەرییەکی تایبەتی دەبێت بەسەرماندا بە ئاراستەکردنمان ئاراستەیەکی تایبەتی بۆ شتێکی دیاری کراو، ئەم ئاراستەیەش ڕۆڵی خۆی ون ناکات و هەر بەفاکتەری سەرەکی دەمێنێتەوە هەتا ئەگەر هات و کارە هونەرییەکە شێوەیەکی تایبەتی بەخۆوە بگرێت.

بەم جۆرە دەتوانین بڵێین هۆی خزانی جەوهەری خوداوەندیی بۆ نێو فـۆرمێک بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، ئەم جەوهەرەو ئەم فـۆرمە تەنیـا بەکـارێکەوە بازدەداتە ناو بوون و لەنێـو توانا لەبن نەهاتووەکەی و کردەوە ڕەهاکانیدا جیـهـانی ئیندیڤیجوال و تایبەتی (پارتیکولار) یەکانگیر دەکات، بەهەمان شێوە تاک بەشداری لەم ژیانە دەکات، تەنیا لە ڕێگای ئاراستـەکردنی خۆی و ئیلهـامـەکەی بۆ نێـو ڕووناکـییـە بەرزو مـەزنەکەی خوداوەند. ❖

سەرچاوە

..............

**From Erwin, or Four Dialogues on)**
**(Beauty and Art**
**کارل سۆلگەر**

# سەلیم بەرەکات
## -لە دەیەی سێیەمی ئەزموونی خۆیدا- (*)

کەریم دەشتی

(١)

قامیشلی شارێکی بچووکە دەکەوێتە ئەو پەڕی باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریە، هەر لە بیستەکانی ئەم سەدەیە دامەزراوە، لە باکووری چیای (تۆرووس)ەو لە ڕۆژهەڵاتیشیەوە کوردستانی عیراق، لە خوارووییەوە بادیەی شامە،قامیشلی شوێنی کوردەکانەو زۆربەشیان ئیزەدین، هەروەها ئەرمەن و سریانی و ئاشووریشی تێدایە.

(٢)

سەلیم بەرەکات لە ساڵی (١٩٥١) لەشاری قامیشلی لەدایک بووەو شەهادەی ناوەندی لەوێ وەرگرتووە، پاشان چۆتە دانشگای دیمەشق، بەشی زمانی عەرەبی لە (١٩٧٠) تەواو کردووە، پاشان بۆ یەکجاری لە دیمەشق نیشتەجێ بووە، یەکەمین شیعری خۆی لە گۆڤاری هەفتەنامەی- الطلیعة-ی سووری بلاوکردۆتەوە، هەر لە ڕێگەی ئەم شیعرەوە سەرنجی هەموو گەنجەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا، ئەو کاتە شاعیرانی وەک عەلی جوندی، مەمدووح عەدوان، عەلی کەنعان، مەحموود سەید، محەمەد عومران، لە گۆڕەپانەکەدا بوون، هەروەها هەندێ شاعیری تریش کە لەوان گەنجتر بوون هەبوو لەوانە، نەزیە ئەبو عەفەش، عادل مەحموود، بەندەر عەبدولحەمید...تاد.


سەلیم بەرەکات

(٣)

هەر لەم دیمەنە شیعرییەدا، شیعری سووری کەوتبووە ژێر کاریگەرێتی ئیستاتیکیی شیعرەکانی -محەمەد ماغووت-ەوە بە تایبەتی دیوانی شادی پیشەی من نییە،


محەممەد ماغووت

هەروەها کەوتبووە ژێر کاریگەریتی هەندێ شاعیر کە قەسیدەی پەخشانیان دەنووسی، لەوانە-سولەیمان عەوواد، سەنییە ساڵح، ئیسماعیل عامود، بەڵام سەلیم بەرەکات کە هاتە ناو مەیدانەکەوە ئەو پێکەوە ژیانەی نەوەکانی لە نێو ئەو دیمەنەدا لە ڕەگەوە هەڵتەکاند، ئەوسا شیعرێکی بە ناوی- ئەوە ڕوخساری هاوچەرخی منە- بڵاوکردەوە کە ئەمە دەقی شیعرەکەیە:

(٤)

وا من هاتم
با هەموو گەداشایەک لەسەر زەمینی هەڵگەڕانەوەدا
چاوەدێریی ئەوە بکات کە خەنجەر وەشان لە کوێوە دێت
لە لێواری غوربەت و گلێنەی منداڵان و جۆگەلەکانەوەیە
من زەمەنی ترساو لە چاوی ژنانەوە کورت دەکەمەوە
زەمەنێکی قەرشی تێ دە ئاخنم..
نە فرمێسک ئەو کۆچە خاوەدەکاتەوە
نە خوێن لەبەرچوونی هەژاران
با چاوەدێرین بزانن کە خەنجەر وەشان لە کوێوە دێت
من بێ سۆڵە بەرەو وڵاتی فارس و میسرییەکان و ڕۆمەکان کۆچ دەکەم
ئەوە ڕوخساری هاوچەرخی منە
ڕوخسارم لە ڕووی زوڵمەت بەرز ڕادەگرم و پرسیاری لێدەکەم پرسیاری لێ دەکەم
پرسیار لە هەردوو قاچە خوێناوییەکانم دەکەم
کە بەسەر زەویی کوێرو پەسپەسی شەمشەکوێرە سەمانییەکانەوەن
بەهەموو ئامادە بوونم لە ناو دەستی غوربەتدا هاوار دەکەم
ئەی خەڵکی شام
ئەسپەکانی جەنگ لەبەر دەرگای کەعبەدا دەحیلێنێ
هەر بە تەنیانم خۆم
سێبەری بەردە ڕەشەکان بۆ پەنابەران تەخت دەکەم
لە میانی سینەی کراوە بۆ خەنجەرو ڕمی تێنوو قەقاغە دەگرم
شەقارێ دەخەمە مەلەکووتی ترس
کە داشقەی زەمانی ڕاکردوو لە پێش خۆم و لە پاش خۆم لێکدەکاتەوە
وەک پشکۆ بە هاسەی کەعبەوە هەڵدەچم
کە بیابان هەڵیدەکێشێ گاگۆڵە دەکات
بەستەی خێڵەکان هەڵدەگرێ ڕووەو قافیەی جەنگ
لە نێو جەرگەی جەنگدا ئەسەبی پیادە لە سوارو ڕاکردوو لە جێگیر پڕ دەکەم
تا ئەو کاتەی ئەو دارخورمایەی شین و شەپۆڕ دەکات
باڵی فرمێسک بەسەرمدا شۆڕدەکاتەوە..
من بەڵێن تازە دەکەمەوە کە لە نێو جەنگی ڕمەکاندا
لە پێناوی بەیداخی خۆم
وەک نائومێد خۆم دەدەم لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوادا
تاوەکو ڕوخساری یەکەمم دەکەوێ
دووبارە دەپێکم ڕوخساری دووەمم دەکەوێ
حەجاجەکان وەک غوبارێ دەخەمەوە عەرەفات
تا لە ژێر سمی بای لاوازو پەلدەر وردوخاش دەبێ
ئەوسا دەمرین بۆ ئەوەی خەون ببینین
تێهەڵدەچینەوە تا خەون ببینین
پاشان پەنا دەبەینە بەر دەزوولەکانی خوێن
تا خوێنی هاتنی درەختەکان بەدی کەین
لەگەڵ هاتنی ڕۆژی دوایی
بەرەو شادی و ڕووبارەکان دەچین بەسەر چەقیەکانەوە.

(٥)

هەموو شتێکی تازەو نوێ لە نێو ئەم شیعرەدا زاڵە کە بریتین لەسەر هەڵگەڕانی درامی-ی ڕاناوی قسەکەر، سەلیم بەرەکات لە بیستەکانی تەمەنی خۆیدا، ئەم شیعرەی نووسیوە، ئامادەگیی ئینسانی ئەو مرۆڤە کوردە کە لەو سەری باکووری ڕۆژهەڵاتەوە هاتووە، خۆی و جەستەیێکی لاوازو خەت و خاڵ دارو ڕوخسارێکی منداڵی، لەوێوە دەستی کرد بە ئانەوەی فیتنەیێکی جەماڵی ناناسایی لە نێوەندی ئەدەبیدا لەسەرتاسەری هەفتاکانەوە، پاشان شیعری -نێرراوی پەپوولەکان- ، -قونسولی منداڵان- ، داواکردنی جەستەی

بەپوولەییێکی غەریب- بلاوکردەوە.

(٦)

پاشان ئەوەندەی نەبرد هەتا سوریا جێگەی قەڵەمی ئەو ڕەمبۆ کوردییە سەرکێش و جوانەی تێدانەبۆوە، بۆیە چوو بۆ بەیروت، لەوێ شیعری -دینوکا بریفا وەرە بۆ خەنجەر تێدانێکی هێمن- یاخود بۆ وەشانێکی هێمن-و-ئەو ئەستێرانەی بەرەو چیا هەڵدێن-و-من ئەو خەلیفەیەم کە هیچ دەستوپێوەندێکم نییە- نووسی. هەموو ئەو شیعرانە بەهێزەوە ڕووی سەلیم بەرەکاتیان وەدەرخست و ئاوێکی ساردو تەزی بە ڕووی عورفی نووسینی شیعری عەرەبیدا کرد لە ناو سەنتەری بەیرووت-دا، کە پێتەختی هەموو بزاوتی نوێخوازی عەرەبی بوو. لە هەمان ئەو کاتەی بە ناوونیشانی بابەتە کوردییەکان لە مێژووو جوگرافیاو حیکایەت و ئەفسانە لەو نێوەندە دەتەقییەوە، ئەدۆنیس-ی گەورە شاعیری عەرەب و سەرنووسەری گۆڤاری هەڵوێست -الموقف- هەر زوو باوەشی بۆ یەکەم کۆمەڵە شیعری سەلیم بەرەکات کردەوەو گوتبووی:

- ئەو دەنگە نەک هەر نوێییەو بەس بەڵکو دەنگێکە ڕەت دەکەو شەق دەکاو لە هیکەوە دامانەگرێ-.

(٧)

زۆربەی بابەتەکانی سەلیم بەرەکات بریتییە لە کورد، هەروەها هەندێ مەسەلەی ئاشووری و چەرکەسی.. هەروەها زۆر لە ناوی رووەکەکان لە شیعرەکانی سەلیم بەرەکاتدا هەن وەک ترێ و مێو و گوڵەهێرۆو دیسان باڵندەی وەک کەراکی و ڕەشۆڵەو هەویردەو قەتێ، کە لە ناو زمان و دەرەوەی زمان و لەو وێنەو سەرەوەی وێنەدا لە ئیقاعێکی ڕێک و پەرش و بڵاودا دەتەقییەوە...

ڕەخنەگرەکانی عەرەب زۆر لەسەر ئەم چەند دێرەی عەرەبیی ئەودا وەستان و سوبحی حەدیدی کە نووسەرو وەرگێڕێکی سووریەو لە پاریس دادەنیشێ دەڵێت: «جوانترین ڕستەی عەرەبی کە لە ڕێگەی نووسینی شیعری عەرەبییەوە بەرهەم هاتووە بریتییە لەو پارچە شیعرەی خوارەوەی سەلیم بەرەکات:

**عندما تنحدر قطعان الذئاب في الشمال وهي تجر**
**مؤخرتها فوق الثلج**
**وتعوي فتشتعل الحظائر المقفلة وحناجر الكلاب**
**أسمع حشرجة دينوكا**
**في حقول البطيخ الأحمر المحيطة بالقرية، كانت**
**السماء تتناثر كاشفة عن فراغ مسقوف بخيوط**
**العناكب و قبعات الدرك، حيث تخرج دينوكا عارية**
**تسوق قطيعا من بنات آوى الى جهة أخرى خالية من**
**الشظايا.**

(٨)

لە بەشەکانی دیکەی شیعری سەلیم بەرەکاتدا -سەختی و سەرسامی- دەست پێدەکات لە شیعری -قونسولی منداڵان- کە لە یەکەم کۆمەڵەی شیعری ئەودایە، جۆرێک لە شیعری ئاوێتەیی لەسەر ئیقاعی جازو یەک لە دوای یەکی سەمفۆنی دەنووسێ و ئەزموون دەکات، لە شیعری (ڕوناشتا بکوژن) کە لە کۆمەڵە شیعری -ئا بەم جۆرە مۆسیسانایەرش دەکەم-دایە لەساڵی (١٩٧٥) چاپ بووە، بایەخ بە دیمەنی شانۆیی و کۆرس و نەرم و نیانی نەغمەی و ئیحاو تەشقی کەرنەڤاڵی و جەنازەیی و سروت دەدا.

لە شیعری -پۆلینەکانی مەعدەنی-داو لە هەمان کۆمەڵە دووبارە لە پەخشانە نزیک بۆوە- بەڵام لە شیعری -سیناریۆیی بۆ شیعرو سیناریۆیێ بۆ بەفرو-دەشتایی-و -چەند پەپوولەیەک بۆ پێتەختەکان-دا کە هەموویان لە کۆمەڵەی- بۆ تۆزو بۆ شەمدینان-دایەو لە ساڵی (١٩٧٧) چاپی کردووە، هەوڵی داوە ڕستەیێکی شیعری وا پێشکەش بکات کە نیشانی وەستان و تەرتیبی چاپ و دێڕی شیعر تێکبشکێنێ و شێوەی ئەندازەیی لاپەڕە تەژی بکات لە درێژدادڕی مەلحەمی و تەغریبیدا لە لەفز.

(٩)

هەر لە کۆمەڵەی- الجمهرات-دا لە (١٩٧٩) سەلیم بەرەکات شیعرێکی دوورودرێژمان پێشکەش دەکات کە پشتی بەستاوە بە نووسینی پەخشان و دێڕی شیعری کورت کورت، هەروەها شیعرەکەی بە حەوت سروود کە تەفعیلە یان تێدایە کۆتایی پێ دەهێنێ، لەوێدا کارامەیی سەلیم بەرەکات لە ڕووی زمانەوە بەدەردەکەوێ، پێوەندییێکی قووڵ لە میانی وێنەی چاوو وێنەی زەینی دەخوڵقێنێ هەروەها لە میانی ماناسازیی مەجازی و ماناسازیی فەرهەنگیدا. لە (کراکی) (١٩٨١) کە ئەوەش شیعرێکی درێژی دوو بەشە باس لە حەکایەتی (ئیلاناو دیرام) دەکات.. کە حیکایەتی عەشقی میانی دوو عاشقە لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا، پاش دوو ساڵان سەلیم بەرەکات دیوانی- بە هەمان پەنجەرەو بە هەمان ئەو گورگانەی کە پێشەنگی با دەکەن- و بریتییە لە (پێرستی هەبوو و هەبووە زیندووەکان لەم دیوانەدا بایەخێکی زۆر بە چەمکی ئاژەڵان دەدا. شیعری -ئاسن- لە هەمان ئەو کۆمەڵەدایە، کە لە نیقۆسیا لە ئاداری (١٩٨١)ی نووسی

باس لە کۆچی سەلیم لە بەیرووتەوە دوای هێرشی ئیسرائیلییەکان لە ساڵی (١٩٨٢)و ڕاگوێزانی فەلەستینییەکان لە لبنان دەکات، هەر لەو سەردەمەدا سەلیم خۆی پەیوەست کرد بە بزاڤی ڕزگاریخوازی فەلەستین و ڕۆژانەی- کەنیسەی جەنگاوەر-ی نووسی، پاشان لە (کرمل) لەگەڵ مەحموود دەرویش کاری کردووە.

کەواتە(ئاسن) یەکەم شیعری سەلیم بەرەکاتە پاش ئەوەی لە نیقۆسیا جێگیر بووە.

(١٠)

شیعرەکانی دیوانی-بازیار-(١٩٩١) گوزارشت لە گەڕانەوەی جۆرێک لە هێمنی ستیلی شاعیرە، هەروەها گەڕانەوەیە بۆ ڕامان لە مێژووی کەس و کۆزاکیرەو دەوروبەری جوگرافی.. لە بارەی خۆی دەنووسێ لە (دیلەکان زێرو زیو لە میانی خۆیان دابەش دەکەن- هەروەها لە -تەگبیری خانەوادەیی- هەروەها لەبارەی نەتەوەی خۆی -کورد- دەنووسێ لە شیعری- مەهاباد-. سەلیم بەرەکات لە شیعرێ کە بۆ مەحموود دەرویش نووسیویەتی دەڵێت:

-ئەو هەڵکردنەی لە تۆدا هەیە... هەڵکردنی پەڕەسێلکەکانە-

(١١)

صامۆئیل تایلۆر کولرێدج لە (١٧٧٢-١٨٣٤)دا دەڵێت:

«هیچ کەسێک ناتوانێ بەسەر سێبەری خۆیدا باز بدات

بەڵام شاعیرەکان بەسەر مەرگەوەش بازدەدەن»

سەلیم بەرەکات لە شیعری- پۆلبەندییەکانی تاڵان- کە سەرەتای هەشتەم کۆمەڵە شیعرێتی بە ناوی -ووشتی یاقوت- ئەزموونێکی تازە دەبەخشێ و چەمکی مەرگ زاڵە بەسەریدا، لەو ئەزموونەدا زمان بەشێوازێکی غەریب دەچێتە ناو پێوەندییە دەلالییەکان واتە سەلیم لەم شیعرەدا هەوڵی داوە بەسەر سێبەری خۆیدا باز بدات. فۆرمی کراوە یەکێکە لە دیارترین ستراتیژی شێوازی سەلیم بەرەکات

**«دینوکا... دینوکا**

**من ماندووم... دەنگت نابیستم و شاخ و داخ و**

**عارەبانەی پڕ لە کای کوردەکان دەبینم»**

(١٢)

مێژووی دەسکەوتەکانی تاک دەرسێکی گەورەمان فێر دەکات، ئەویش ئەوەیە کە کارەکانی ئەدیبە گەورەکان بەیەک لەم دووانەی خوارەوە هەڵساوە یا ئەوتا شێوازگەرێکی تازەیەو شێوازێکی تازەی بونیات ناوە یاخود بووەتە هۆی ئەوەی کە شێوازێکی کۆن ڕابگرێ، کە لە هەردوو ئەنجامدا حاڵەتێکی تایبەتەو ئەدەبی سەلیم بەرەکات-ی کوردیش نموونەیێکی زۆر بەرزی ئەم حاڵەتە تایبەتییەیە لە دیمەنی شیعری عەرەبی هاوچەرخدا، هەروەها ڕۆمانەکانیشی دنیاییێکی گێڕانەوەی زیندووکردۆتەوە کە شتە عەجایبەکان بابەتی گەورەی دروست کردنەوەی جیهانی فیعلین.

سەلیم بەرەکاتی کورد بە زمانێکی عەرەبی ڕوون و پڕ لە ڕەوانبێژی و نەرم و نیان و کاریگەر ئەدەبی نووسیوە، بۆیە ئەمڕۆکە بۆتە جێگەی سەرنجی هەمووان..❖

*** ئەم باسە نوێشکی دووورودرێژی - صبحی حدیدی-یە و لە ئەنتەرنێت وەرگیراوە، نووسەری بابەت سوورییەو لە پاریس دادەنیشێ، بە پێویستم زانی کە نووسەری کوردیش ئاگادار بێت.**

# ڕەخنەی ڕۆشنبیری
## خوێندنەوەیەک لە نەسەقەکانی ڕۆشنبیریی عەرەبی

دانانی: دکتۆر عەبدوڵلاالغوزامی
لەسەرنووسینی: د. ڕەمەزان بەستاویسی محەمەد
و/ کەمال غەمبار

پێشەکییەک: ئەم کتێبەی کە لەسەری نووسراوەو وا ئێمەش دەیکەین بە کوردی، گرنگی و تایبەتمەندیی خۆی هەیەو تا ڕادەیەک نزیکە لەو بوارو ڕێچکە ڕەخنە سازییانەی کە هەندێ لە توێژەرو ڕەخنە گرەکانمان پێڕەوی دەکەن و ئەو جۆرە تیۆریانەی کە لە ڕەوتی کتێبەکەدا هاتوون، خزمەتی ڕەخنەی ئەمڕۆی کوردی دەکەن. هەرچەندە بە داخەوە ئەو جۆرە کتێبە بەنرخانە بە ئێمە ناگەن کە بیانخوێنینەوەو لەسەریان بنووسین، بەڵام دکتۆرێکی شارەزای وەک ڕەمەزان بەستاویسی توانیویەتی ڕووناکی بخاتە سەر لایەنە گرنگەکانی و بەم کارەی نووسەری کورد پەلکێش دەکات کە بە دەست بۆچوونەکانی خاوەنی کتێبەکە بوەستێ و جۆرە بەراوردییەک لە نێوان ڕەخنەی ڕۆشنبیریی عەرەبی و کوردی بکات.

**«وەرگێڕ»**

کتێبەکە چەندین پرسیار لەبارەی ڕەوشتکارییەکانی ڕەخنەو خوێندنەوە دەورووژێنێ و کاری ڕەخنەگرانە بە زانستەکانی تحویل (لێکدانەوە)و ڕەخنەی گوتارو مۆرکی پێوەندکاری و بە دەست و ئەو دەستکردنی ئەدەب دەبەستێتەوە، هەروەها ڕەخنەی چەمکە سەرەکییە بڵاوەکان پێشکەش دەکات کە ڕەخنەی هاوچەرخی عەرەبییان لەسەر بینا دەکرێ و، ئەو قەیرانەی ڕەخنەی عەرەبی کە لە کۆنترۆڵی چەمکەکانی پەیوەندیدار بە ئایدیۆلۆژییەتی سیاسی بانگەشە بۆ کراو دایە، ڕوون دەکات. ئەم کتێبەی کە لە مەڵبەندی عەربیی ڕۆشنبیری لە (دار البیضاء) لە مەغریبساڵی (٢٠٠٠) دەرچووە، لە ئەزموونێکی ڕابەرانەی هزری لە هزری هاوچەرخی عەرەبیدا خۆی دەنوێنێ، چونکە دیراسەتکردنی دەقە ئەدەبییەکان دەکاتە ئامرازێک بۆ شیکردنەوەی نەسەقە ڕۆشنبیرییەکانی عەرەبی و ڕەخنەیەکی واقیعی ئەمڕۆی عەرەبی لە ڕەهەندە جیاجیاکانیدا، ئەویش لەڕێگەی نموونەیەک لە کاری ڕەخنەیی کە پێی دەگوترێ (ڕەخنەی ڕۆشنبیری) کە میتۆدێکە لە ڕەخنەو لەسەر ڕایەک بینا دەکرێ بۆ ئەوە دەچێ کە دەبێ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی تەنیا بە لێکدانەوەی ئیستێتیکی یان فۆرماڵی یان دیراسەی شێواز واز نەهێنێ، بەڵکو لەوە تێپەڕ کات بۆ لێدوان لە مێژوو و لێکۆڵینەوەکانی کۆمەڵایەتی و فەلسەفە، چونکە هەر یەک لەوانە لە پۆلێنکراوەکانی ئەدەبیدا پێچەوانە دەبنەوەو لە ڕاستیدا دیراسەکردنی ئەدەب ناتوانێ لە ئاست ڕەهەندی ڕۆشنبیری و مێژوویی و فەلسەفی خۆی نەزان بکات، هەروەها بۆ نموونە فەلسەفە ناتوانێ بەرامبەر نووسینەکانی نووسەران خۆی نەزان کات، چونکە دەبینی ڕۆشنبیرییە بەناویەکداچووەکان لە هۆشی نەتەوەدا دەبینێ کە گوزارشت لە چەند توێژێکی فرە کۆمەڵایەتی دەکەن کە ئامادەباشی ئەم تەوژمە سیاسی و کۆمەڵایەتییانە بەپێی مەودای نزیکیان لە گوتاری ڕۆشنبیری باو جیایەو کارە ئەدەبییەکان وەزیفەی پاراستنی کولتووری ژیانی ڕۆژانە دەبینن کە نە نووسراوەو لە ئاکامدا بە سەرچاوەی ناسینی فەلسەفەی ژیانی ڕۆژانە لەکۆمەڵگەیەکدا لە قەڵەم دەدرێن، هەروەها گوزارشت لەو قەوارە کۆمەڵایەتییانە دەکەن کە دەکەونە سەر لایەکانی نەخشەی سیاسی و جوگرافی کۆمەڵگەی عەرەبی.

## ناوەرۆکەکانی لێکۆڵینەوە سنووردارە

کتێبەکە لە کێشەیەکی زۆر گرنگ ئاگادارمان دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە کە ڕەخنەی ئەدەبی باو لە دیمەنی ڕۆشنبیریی عەرەبی حەخت لەسەر لایەنە شکڵییەکان لە ئەدەبدا دەکاتەوەو ڕادەی دەستکورتی لەو ڕەفتارە ڕەخنەسازییانە لە ڕووی بابەت و میتۆدەوە روون دەکاتەوە، لە ڕووی بابەتەوە ئەم دیراسە ڕەخنەسازییانە دیاردە سەرنجڕاکێشەکان ژیانی لە لێکۆڵینەوەدا دوورخستۆتەوەو گوزارشت لە کۆمەڵگەی عەرەبی لە قۆناغی ئێستای دەکات وەک دیاردەکانی ژیانی بەربڵاو، وەک گۆرانی و درامای بە چاوبینراوو ئەو ئامرازە هاوچەرخانەی کە پێوەندکردن وەک ئەنتەرنێت دەیهێننە بەرهەم کە ڕەخنەی وا لێکردووە بەندبێ بەو دەق و نووسینانەی کە هەڵبژاردە دەیهێننە بەرهەم و خۆ گێل دەکەن لە تاکە دەقی ژیانی ڕۆژانە کە پڕە لە چەندین دەق و لە چەند زمان و شێوەی هەمەجۆر پێشکەشیان دەکات و لە ڕووی میتۆدەوە نووسەری کتێبەکە ڕەخنە دەگرێ کە دیراساتی ئەدەبی تەنیا بەندن بە گەڕان بەدوای ماناکانی دەقەکان و دەلالەتیان و داوایان لێدەکات کە سنووری وەزیفەی ڕاستەوخۆی ئەم دیراساتانە ببڕن بەرەو مەسەلەی جەوهەری زۆر گرنگتر لەوە. لەو مەسەلانە: پێوەندیی دەقە ئەدەبی و شیعری بە نەسەقە ڕۆشنبیرییە عەرەبییەکان چییە؟ بە واتایەک ئایا ئەم دەقانە مژدە بەخشی دەربڕینی خواستەکانی کۆمەڵگەی عەرەبین لە ئازادی و عەدالەت و جوانیدا یان خۆیان -لەڕاستیی هەندێ ڕێبازەکانیان- درێژبوونەوەی هەندێ نەسەقی پێشووی ڕۆشنبیرین کە لەگەڵ بەهاکانی پێشکەوتندا ناکۆکن و لەسەدە پێشووەکانی مێژوودا هەبوون و؟ داوا لە دیراسەی ئەدەبی دەکات کە تێڕوانینە دیارەکان و شاردراوەکان لە دەقی ئەدەبیدا والا بکات و دەبێ ڕەخنە چەند پرسیارێکی لەم جۆرە بکات: پێوەندیی ئەوەی ڕەخنەگر دەینووسێ بەو ڕۆشنبیرییەی کە نووسەر سەر بە ئەوەو بۆچی بۆ خەڵک دەنووسێ و؟ چۆن هزر نەشونما دەکات و پێش دەکەوێ و؟ ئەو پەراوێزی ئازادییە چییە کە نووسەر هەیەتی سەبارەت بە ژینگەکەی و سەبارەت بە ڕابردووەکەی و سەبارەت بە تێڕوانینە خودەکانییەوەو؟ پێوەندیی نێوان ئەو ئاسۆیەی کە دەقەکان و ئارەزووە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی ئێستای عەرەبی دەیخەنە ڕوو چییە؟.

کتێبەکە بانگەشەیەکە بۆ ئەوەی ڕەخنەی ئەدەبی ئەو سنوورە تەسکانە ببڕێ کە مامڵەکردنی لەگەڵ دەقەکان تەنیا لەسەر جوانی و ڕەوانبێژییە، نووسەر بانگەشەکەی لە (١٩٩٧)دا دەستپێکردو کتێبەکە ئەڵقەیەکی گرنگە لە پرۆژەیەکی ڕەخنەسازی خوازیار کە سوورە لەسەر بیناکردنی لە ڕێگەی



نزار قەبانی

کتێبەکانی پێشوو و ئەمەی لە کتێبەکەی پێشووی روون کردەوە کە مەرگی ڕەخنەی ئەدەبی تەقلیدی و لە دایکبوونی ڕەخنەی ڕۆشنبیری جاڕدا. ئەم کتێبە لەدایکبووی ساتەوەخت نییە، پێوەندیدار نییە بە پوختەی نووسراوەکان عەبدوڵڵا لغوزامی، بەڵکو بەشێکە لە پرۆژەیەکی خوازیار ئامانجی ئەوەیە کە ڕەخنە بکاتە ئامرازێکی کاریگەر لە ڕەخنەگرتنی ڕۆشنبیریی باوو چێژی لەکارکراوی ڕەخنەو نووسەریش مەبەستی هەڵوەشاندنەوەی بەردەستی ڕەخنەی ئەدەبی عەرەبی نییە، بەڵکو ئامانجەکە گۆڕینی ئامرازی ڕەخنەسازییە لە ئامرازێک بۆ خوێندنەوەی جوانیی تایبەت و پاساو بۆ کردنی و لە کارکردنی (ئیستیهلاک) بە چاوپۆشی لە خەوشە نەسەقییەکانی، واتە بۆ ئامرازێک بۆ ڕەخنەی گوتار کە دەق بەرجەستەی دەکات و والاکردنی نەسەقی فیکری کە گوزارشتی لێدەکات، ئەوە وای لە نووسەری کتێبەکە کرد کە تەقەلا تیۆرییەکانی لەمەڕ چەمکی ڕەخنەی ڕۆشنبیری پێشکەش بکات، هەروەها پێوەندییان بە چەندین کایەی مەعریفییەوە وایانکرد کە ڕەخنەگر سوود لە زانستەکانی تەئویل و ڕەخنەی گوتارو شیکردنەوەی وەرگێڕ و ڕەخنەی ڕۆشنبیری بەشداری لە وتووێژی دەقە ئەدەبییەکان کرد، بەو سیفەتەی وێنەیەکی پێچەوانکردنەوەی هەندێ تەوژمەکانی کۆمەڵن و دەبێ ئاوڕ لە دەقی تر بدرێتەوە، نووسراوو غەیری نووسراو لە واقیعی عەرەبیدا، ئەمە بووە هۆی فراوانکردنی چەمکی ڕۆشنبیری، بۆ ئەوەی هەموو ڕەفتارێکی ڕۆژانەی ژیان و ئەو دیاردانەی دیکەی کە لێوەی دەردەچن و دەکرێ هەندێ لەم دیاردانە بابەتی دەرسی ئەدەبی بن کە تەنیا بەندن بە دیراسەتی دەقە ئەدەبییەکان کە گوزارشت لە توێژەکانی کۆمەڵگەی عەرەبی دەکەن. بەڵام گوزارشت لە هەموو کۆمەڵگە ناکەن.



ئەدۆنیس

## ڕەخنەی ڕۆشنبیری لە ڕووی تیۆرو پراکتیکەوە

نووسەر تەنیا بە ڕەهەندی تیۆرییەوە نەوەستاوە، بەڵکو شیکردنەوەی ئیجرائی تیۆری ڕۆشنبیری پێشکەش کردووە، واتە ئەوهۆکارانەی پێشکەش کردووە کە ڕەفتاری بە کردەوەی ڕەخنەی ڕۆشنبیری وا لێدەکەن کە توانای خوێندنەوەی دەقەکانیان هەبێ، کتێبەکە بە پلەوپایەی دەرسێکی تیۆری و پراکتیکی ڕەخنەیی ڕۆشنبیری لە قەڵەم دەدرێ، شیکردنەوەیەکی ئەو نەسەقە ڕۆشنبیرییە عەرەبییانەی پێشکەش کردووە کە لە ڕواڵەتی ئیستێتیکی شێوەیان وەرگرتووەو لە ڕێگەی ئەوەوە دزەی بۆ هۆشیاریی هاوچەرخی عەرەبی کردووە، بۆ ئەوەی بەردەوامی و چەسپاندنی بۆ دەستەبەر بکەن، وەک هەندێ دەقی شیعری کە بوونەتە نەسەقێک ئیدعای ئەوە دەکەن کە دەربڕی نوێخوازیی عەرەبین لە ساتەوەختی ئێستای. نووسەر ڕەخنەیەک لەبارەی ئەم نەسەقە شیعرییە پێشکەش دەکات کە لە شیعری نەزار قەببانی و ئەدۆنیس-دا خۆی دەنوێنێ، نووسەر ڕوونی کردەوە کە ئەو کرۆکی نوێخوازییەی هەردووکیان مژدە دەربڕینە، نەسەقێکی ڕۆشنبیری کۆنی تێدایە چەمکی کەڵییەتی (فحولة) دەچەسپێنێ و بۆ وێنەی ستەمکار لە چەمکی سیاسیدا تەرخان دەکرێ، چونکە هەر یەک لەو دووانە خودی ڕەهای خۆی دەکاتە ژێدەرێکی سەرەکی لەتەرخانکردنی ئایدیۆلۆژییەتی خود، نووسەر لێکدانەوەکەی بەرەو دوورتر پاڵ دەنێ و لەو ڕایەدایە کە هەندێ دیاردەی سیاسی کە واقیعی عەرەبی تێیدا دەژی، وەک ستەمکاری سیاسی ڕەنگە بۆ سەرەوەری ئەم نەسەقە سیاسییانە بگەڕێتەوە کە ئەم هەڵبەستانەی برەویان پێدەدەن کەوا ڕەخنەی ئەدەبی مامەڵەتکردنی لەگەڵ ئەم دەقانەدا بەندبوو بەو ڕەهەندە ئیستێتیکییانە، بێ ئەوەی لەو نەسەقە ڕۆشنبیرییانە بدوێ کە ئەم کارە ئەدەبییانە لێیانەوە والابوون و نووسەر ڕوونی دەکاتەوە کە ئەم دەقانە زۆر ڕەفتارکارییەکانی ژیان لە واقیعی عەرەبی والا دەکەن کە لەگەڵ هۆشمەندی ڕەخنەسازی بە کێشەکانی واقیعی عەرەبی ناکۆکن، بەڵگەش بۆ ئەوە ئەوەتە کە شاکارە تیۆرییەکانی ئەدۆنیس و قەببانی ڕەخنەیەکی تیژی واقیعی ئەمڕۆ والا دەکەن کە نووسەر لەگەڵیاندا کۆکە، بەڵام شاکارە شیعرییەکانیان بەرەو هەمان ئەنجام نین و بۆمان ڕوون دەکاتەوە، ئەوە دەکرێ لە ڕێگەی ڕەخنەی ڕۆشنبیرییەوە والا بکرێ.

ئەگەر نووسەر لێرەدا پێی لەسەر هەندێ دەقی شیعریی داگرتبێ کە لە پێشکەشکردنی تێڕوانینەکانیان پشت بە گوتاری ئیستێتیکی و ڕەوانبێژی ببەستێ، ئەوە خۆی بەڵێنی پێمان داوە کە ئەو دەقە هزرییە هاوچەرخانە پشت بە عەقڵانییەت دەبەستن لە پێشکەش کردنی تێڕوانینیان لە واقیعی عەرەبیدا شی بکاتەوەو ئەو نەسەقە ڕۆشنبیرییانە کە گوزارشتیان لێدەکەن لە لێکۆڵینەوەکانی ئایندەییدا بۆ والا بکات. ئەمەش واتای ئەوەیە کە عەبدوڵلالغوزامی ئەرکی ڕەخنەگری ئەدەبی کە دیراساتی ئەدەبی دەکاتە بوارێک بۆ والاکردنی خودی عەرەبی و شیکردنەوەیەک بۆ گوتارەکان و نەسەقە ڕۆشنبیرییەکانی بەکارهاتوو لە هزری هاوچەرخی عەرەبیدا، ئەو ئەرکەی بەرەوپێش بردووە. لێرەدا گرنگیی کتێبەکە دەردەکەوێ.

کتێبەکە لە پێشەکییەک و حەوت بەش پێکهاتووە، لە بەشی یەکەمدا مێژووەکی زاراوەی (ڕەخنەی ڕۆشنبیری) لە هزری ڕۆژئاواو ئەدەبیاتەکەی و چۆن دیراساتی ڕۆشنبیری بە شیکردنەوەی کۆمەلایەتی بۆ دیاردە ڕۆشنبیرییەکان پێشکەش دەکات کە لە پاشاندا گۆڕا بۆ ڕۆشنبیرییە لە کارکردنەکان و دەسەلاتدار بەسەر جەماوەر لە سایەی بەرەو پێشچوونی ئامرازەکانی پێوەندی و ڕاگەیاندن و توانایان لەکۆنترۆڵکردنی مرۆڤ و داڕشتنەوەی هۆشمەندییان لەمەڕ جیهان، نووسەر ڕای ئەو هزرمەندانەی کە بەشدارییان لە بیناکردنی تیۆری ڕەخنەی ڕۆشنبیری کردووە نیشان دەدات، وەک (قوتابخانەی فرانکفۆرت) و ڕۆڵەکەی لە ڕەخنەی ڕۆشنبیریی باو لە ڕێگەی شیکردنەوەی دیاردە ڕۆشنبیرییە هەمە جۆرەکاندا، وەک تەلەفزیۆن و شوێنەوارەکەی و نووسەر دیاری خست کە دەقە شیعری و ئەدەبییەکان، مۆرکێکی دیاریکراویان لە کارتێکردنی سەر کۆمەڵگە هەیە لە چاو هۆکارەکانی دیکەی سەدەی ئێستامان. ڕەخنەی ڕۆشنبیری لە ڕەخنەی ڕۆشنبیرییەوە بۆ ڕەخنەی ئەو دەزگایانەی بەشداری لە بەرهەمهێنانی ڕۆشنبیری دەکەن هەنگاوی نا. هەروەها ڕەخنەی ڕۆشنبیری ئەو فرە لایەنییەی والاکرد کە لە ناو یەک

کۆمەڵگەدا لە ئەنجامی فرەلایەنی ئەو نەسەقە ڕۆشنبیرییانەی کە لە دەقە بە ناویەکدا چووەکان لە دەقی ژیانی ڕۆژانەدا خۆیان دەنوێنن، نەشونوما دەکەن. بۆ نموونە دەبینین (ڕۆشنبیریی تەلەفزیۆن) بەرامبەر ڕۆشنبیری کتێبی خوێنراوە، ڕۆشنبیری دیکە هەن کە دەبنە فرەلایەنی بە فرەلایەنی کردنی هۆکارەکانی پێوەندیی لە ناو یەک کۆمەڵگەدا.

## تێڕوانینەکانی ڕەخنەگر

لە ئاست ئەم پێشکەوتنانەدا، ڕۆڵی ڕەخنەگری ئەدەبیش پێشکەوت، بۆ ئەوەی ببێتە ڕەخنەگری مەدەنی کە لە دەقە ئەدەبی و غەیرە ئەدەبییەکاندا گوزارشت کردن لەتەوژمە جیاجیاکانی واقیعی ڕۆژانەدا دەبینێ، ئەویش لە ڕێگەی پێوەندیی نێوان دەق و نەسەقە ئەدەبییەکانی عەرەبی و لێرەدا ڕەخنەگر دەبێتە هزرمەندێکی سیاسی خەمخۆری کێشەکانی نیشتمانەکەی و بەو هیوایە دەژی کە کۆمەڵگە لە ساتەکانی تێپەڕ کات.

لەبەشی دووەمدا نووسەرتیۆرو میتۆدی تایبەت بە ڕەخنەی ڕۆشنبیری پێشکەش دەکات و نیشانی دەدا کە چەمکی نەسەقی ڕۆشنبیری واتە خولقاندنی گواستنەوەیەکی جۆریی کاری ڕەخنەیی، بەشێوەیەک کە گواستنەوەیەک بێت لە زاراوەو وەزیفەو پراکتیک، ئەمەش بە شیکردنەوەی دەقەوە دەبێ بەو سیفەتەی پەیامێکە وەزیفەیەک لە نەسەقی ڕۆشنبیری دەبینێ لە ڕێگەی شیکردنەوەی درکەو ئیدیۆمی ڕۆشنبیری و دیاری کردنی جۆری ئەو دەلالەتەی کە دەقەکەی تێدایەو شیکردنەوەی زمان یان ڕستەی جۆری یا ڕۆشنبیری و مۆرکی شاراوە لەو دەقەی نووسەری دوولایەن والا دەکات و نەسەق لە ڕێگەی وەزیفەکەیەوە دیاری دەکرێ. نەک تەنیا لەڕێگەی بوونە ڕووتەکەیەوەو نووسەر لە دیاری کردنی مەرجەکانی دەقیع جەماوەری مەبەستی والاکردنی فێڵەکانی ڕۆشنبیرییە بۆ تێپەڕکردنی نەسەقەکانی لەژێر دەمامک و هۆکاری شاراوەو گرنگترینی ئەم فێلانە، ئەو فێڵە جوانکارییەیە کە لە ژێرەوەیدا ترسناکترین نەسەق و توندو تۆڵترینیان بە ناوماندا تێدەپەڕێ.

لە بەشی سێیەمدا، دەست بە شیکردنەوەی تیۆری ڕەخنەی ڕۆشنبیری دەکات، پەنا دەباتە بەر پراکتیزەکردنی ئیجرائی، نەسەقی هەڵوەشێنەرو داهێنانی (کەڵ) پێشکەش دەکات و مەبەستی ئەو نەسەقە ڕۆشنبیرییەیە کە شیعر لە حیسابی خۆیدا دەردەکات وکار بۆ دەرخستنی وێنەی شاعیر دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی لەبەرچاو ونبوونی گوتاری ئازاد یان گوتاری عاقڵ و شکۆدارکردنی عەقڵی خودی و لە بەشی چوارەمدا نووسەر نیشانی داوە چۆن ساختەکردنی گوتار و گۆڕانی سیستەمی ئاکاری دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی نەسەقێکی گوتاری کە دوو لایەنە، لایەنێکیان شاردراوەیەو گوزارشت لە شکۆدارکردنی ئەو ستەمکارە دەکات کە لە نموونەی ئەلموتەنەبی و ئەو شاعیرانەی بە پاشاو سوڵتانەکان هەڵدەڵێن و ئەوی دی ڕاشکاوە کە گوزارشت لە جوانکاری و ڕەوانبیژی دەکات.

لە ئاست ئەو ڕۆڵەی کە هەندێ نموونەی شیعر لە ساختەکردنی گوتارو شکۆدارکردنی هەر شتێ کە بڕەوی هەیە، بێ دەنگی دەبێتە تاکە ڕێگەیەک بۆ گوزارشت کردن لە نەسەقییەتی بەرهەڵستکاری ئەمەش لە توندو تیژی ڕەمزی بە چەند شێوەیەکی جیا سەرهەڵدەدا، نووسەر دەیتوانی زیاتر لەسەر ئەو جوانکارییانەی بێ دەنگی بڕوات کە لە دەقی تردا دەردەکەون بەو سیفەتەی کە گوزارشت لە گوتاری سەرکوتکراوو خەفەکراوو بێ دەنگکراو لە بوونی دەسەلاتێک دەکەن، ئەمەش نووسەر ویستوویەتی لە دوانەکەیدا لە بارەی نەسەقییەتی بەرهەڵستکاری لە بەشی پێنجەمدا پێشکەشی بکات.

لەبەشی شەشەمدا، جاحظ وەک نموونەیەک وەردەگرێ کە لە لایەنی شاردراوە بدوێ، هەروەها لایەنی ئاشکرا لەو نەسەقە ڕۆشنبیرییەی کە تەمسیلی دەکات، ئەویش لە ڕێگەی شیکردنەوەی دەقێکی جاحظ لە بارەی گۆچان و چۆن ناوەڕۆکەکە لەگەڵ پەراوێزەکەدا ناکۆکە، نووسەر پەنا دەباتە بەر چەند نموونەیەکی کولتوور بۆ بە ڕەسەنایەتی کردنی نەسەقی ڕۆشنبیری و دوای ئەوە (نەسەقی فێڵباز) پێشکەش دەکات کە دەرچوون لە ناوەڕۆکی گوتاری ڕۆشنبیری باو



بەرجەستە دەکات و لە بەشی حەوتەمدا مل مـلانێی نەسەقەکان لە ناو گوتاری هاوچەرخی عەرەبی پێشکەش دەکات کە لە دوو دەقی سەییاب و نازک ئەلمەلائیکەدا خۆی دەنوێنێ و ئەو نەسەقە ڕۆشنبیرییەی کە لە ناو دەقەکەی ئەدۆنیس و نەزار قەببانی-دا خۆی نواند بوو و ئەوەی لە نەسەقەکەی دواییدا لە ناکۆکییەکان لەگەڵ نوێخوازیدا والا دەکات و چۆن بەرجەستەی جوانیی شیعری و هەروەها بەرجەستەی دژێوی ڕۆشنبیری دەکەن و نووسەر گوتاری عەقلانی لەم دەقانەدا والا دەکات و لە ئاکامدا دژی کرۆکی نوێخوازین و پرۆژەکەیان گۆڕینی درکە بووە، بەلام حەقیقەتیان نەگۆڕی و شیعرەکانیان بە ئاماژەکردن بۆ حەقیقەتی شکۆدارکردنی خودو ستەمکار مانەوە.

## چەند ئامانجێکی دی

ئەمانە چەند ڕوخسارێکی سەرەکی کتێبەکە بوون کە چەندین پرسیار دەورووژێنن، لەوانە چەند پرسیارێک لە بارەی ئاکارییەکانی ڕەخنەو خوێندنەوە، بە واتایەک: بەرپرسیی ڕەخنەگر لە خوێندنەوەی دەقدا چییە؟ ئایا بەرپرسە لەو کوێرییە ڕەخنەسازییەی کە نووسەر لیی دوا کە مەبەستی وەستانی ڕەخنەگرە لە ئاست ئیستێتیکیداو چیتر نا، بێ ئەوەی بەو نەسەقە ڕۆشنبیرییەی ببەستێتەوە کە گوزارشتی لێ دەکات؟ ئەمەش ئاماژەیە بۆ بابەتێکی نوێی لە بارەی ئاکارییەکانی ئەو خوێندنەوەیەی کە هەندێ ڕەخنەگر حیسابی ئەوەی بۆ دەکەن کە سەبارەت بەوانەوە لە ئارادا نییە. لەبەرئەوە سەیر نییە لەوەی کە هەندێ خوێندنەوەی ڕەخنەسازی بینە شکۆدارکردنی هەندێ دەق لەبەر وەدەنگەوە هاتنی کۆنترۆڵییە ئیستێتیکییەکانی، بێ ئەوەی پێگەیان لە ڕۆشنبیریی عەرەبیدا بەشێوەیەکی گشتی یان گفتوگۆکردن لەسەر ئەو نەسەقە ڕۆشنبیرییەی کە ئەم دەقە یا ئەو دەقە گوزارشتی لێ دەکەن هەبێ. لەبەرئەوە کتێبەکە بانگەشەیەکە بۆ ئەوەی ڕەخنەگر بەرپرسە ئاکاری و سیاسی و کۆمەلایەتییەکەی لە ئەستۆدا بێ.

کتێبەکە هەوڵی بەستنەوەی کاری ڕەخنەسازی بە زانستەکانی تەئویل و ڕەخنەی گوتارو مۆرکی پێوەندیکاری و ئەم دەست و ئەو دەستی ئەدەب دەدا، ڕەخنەی تەئویل (لێکدانەوە)ی دەقە، ئامانجی چەند مەبەستێکی دیاریکراوە کە نموونەکەی وەک دەقێکە پەیامێکی ڕۆشنبیری بەخۆوەدگرێ، دەیەوێ بۆ خوێنەری بگوێزێتەوەو پەیامەکە چەندین ئاستی تێدایەو لە ڕەخنەگر داوا دەکرێ -کە لەڕێگەی دیراسەکەیەوە- ئەو ئاستانە دەرخات کە ڕەنگە ناکۆک بن لەگەڵ ئەو ڕایانەی نووسەری دەقەکە بانگەشەیان دەکات و دانەری کتێبەکە نیشانی دا کە ئەوەی دەقێک پێشکەش دەکات و لافی نوێخوازی لێ دەدات، ڕەنگە شیکردنەوەی نەسەقە ڕۆشنبیرییەکەی لە باتی بەرهەلستکارییەکەی لە بەهاکانی نوێخوازی و ئازادی و عەقلانییەت والا بکات و کتێبەکە سوود لە زانستییە کۆمەلایەتییەکان لە تێگەیشتنی سروشتی پێوەندیداری ئەم دەست و ئەو دەستکردنی ئەدەب وەردەگرێ، ئەویش لە ڕێگەی شیکردنەوەی زمانەکەی و تێگەیشتنی ئەو ڕستە ڕۆشنبیرییەی کە دەقەکەی تێدایەو ئەمەش گواستنەوە لە ڕەوانبێژییەوە بۆ ڕۆشنبیری دەرەخسێنێ و دەتوانین ئەو گوتارە شی بکەینەوە کە دەقی شیعری تێدایە.

کتێبەکە ڕەخنەیەک لەو چەمکە سەرەکییە بلاوانەی کە ڕەخنەی هاوچەرخی عەرەبی وەک ئەدەبییەتی ئەدەب و جوانکاری لەسەر بینادەکرێ پێشکەش دەکات و گوتاری ڕەخنەسازی لە دیمەنی ڕۆشنبیری عەرەبی والا دەکات و نیشانی دەدا کە بێ ئاگایی نەسەقی ڕۆشنبیری کە دەق گوزارشتی لێ دەکات دەبێتە هۆی جۆرێک لە کوێریی ڕەخنەسازی و ڕەخنە دەکاتە پاساوێک بۆ دەق،نەک شیکردنەوەی.

کتێبەکە ڕاڤەی ئەوە دەکات کە قەیرانی دەقی عەرەبی لە دەسەلاتی خودی چەند چەمکێکدا شاراوەیە کە بەو ئایدیۆلۆژییەتە سیاسییەوە بەستراوە کە بانگەشەی بۆ دەکات و نووسەر دەیەوێت ڕەخنە بە ژیانەوە ببەستێتەوە بەو شێوەی ئیدوارد سەعید لە نووسینە ڕەخنەسازییەکاندا کردی کە نێوان دەق و نەسەقی ڕۆشنبیری جیاناکەنەوە، ئەو بەوەوە گەرەکییەتی کە ڕەخنە دەورێکی سیاسی و کۆمەلایەتی هەبێ و بەشداری کردنی باش و قووڵی لە فیکری هاوچەرخی عەرەبیدا هەبێ.

شیکردنەوەی دکتۆر عەبدوڵلا بۆ ڕەخنەو دەورەکەی، دیراسەی ئەدەبی دەکاتە ئامرازێک کە گرنگیی زیاتر بێ لەوەی پێشوو، چونکە دەبێتە ئامرازێک بۆ ڕەخنەیەکی سیاسی و کۆمەلایەتی ئەو پرۆژانەی ڕۆشنبیرە هەلبژاردەکان پێشکەشی دەکەن. (*). ❖

*** بڕوانە: العربي، العدد ٥١٤، جمادي الآخرة ١٤٢٢هـ- سبتمبر ٢٠٠١م.**

# گشت شتەکان بسڕەوە



سەلاح شوان
(نەرویج)



کچۆڵەی زریانت دیوە
چۆن سوخمەو ژێر کراسەکەی
لەسەر بەفر هەڵدەخات و خۆی دەکوژێت
کاروان مەکە
کاروان مەکەو مانەوەشت دیسان مەرگە
کاروان مەکە
زەردووی دارستان خوێنەکەت دەفەوتێنێت
لە جێگاکەی خۆت کپ بە
تا ئەم خولەش تەواو دەبێت
ئەوساکە دەگەڕێینەوە
دەگەڕێینەوە منداڵیی لە پەڵەیەکی ڕووناکدا هەڵدەگرین
گەورەی دەکەین تا دەبێتە دەریایەک لە گلێنەدا
یان دەبێتە خاڵێک لە ناوکی لەزەت
کاروان مەکە چونکە مانگ ئالەم شەوەدا
خۆی لەسەر درەختی غەمی پەمەیی ڕووت دەکاتەوە
ئەوسا ئێمەش بڕیار دەدەین بمرین یان نەمرین
گشت شتەکان بسڕەوە
ئەوسا سەیری خۆت کە بوویت بە گشت شتێک
تێکەڵی ئاورنگی خەونی بەیانیان دەبیت
دەریا شەق دەبات
دەنگی دڵدارەکەت بەرگوێ دەکەوێت
لە بازاڕی کۆیلە فرۆشانەوە بانگت لێ دەکات
کاروان مەکە
کاروان مەکە

(دەسا ئەی وەنەوشەی سەرسام باپیس نەبیت بگەڕێرەوە ناو دڵی سەهۆڵبەندان چونکە گەرما گیان و لەشت بۆگەن دەکات لەبیریشت نەچێت زەوی خولێکی تریشی ماوە غەم کۆترێکە گشت ڕۆژێک سێ جار بە خوێنی بەفرەکە خۆی دەشوات و بەفرەکەش ناتوێتەوە)

# جەژنوارەی فەنا



نەوزاد ڕەفعەت

به باوەشێک ئاورەوە
به ڕێی سووتاوی تارەوە
به شەوقەوە..
دەچمە بەر گوڵبارانی با
دەچمە بەر مەمکی چلچرای سۆز و سەفا
شکا.. شکا..
شکا.. تەوق و تەشقی دێفا
ئاو به هەنگوین و شیرەوە
به مێرخوزاری خێرەوە.. هاتووەتەوە
دڵ/ گزنگدان
هەست/ بخووری داپڕان له شوێن و زەمان
چاو/ چەخماخەی جیلوەی ئاسمان
لووت/ پەرداخی پڕ بۆنی یار
گوێش/ ناڵەو جەزبەی بەردو دار
شریخەی شار.. دەخواتەوە
دەف ژەنینه..
خەوبینینه..
مەی نۆشینه..
نۆشینی پەلکەزێڕینەی له هۆش چوونه
گمەی ویردی کۆتره یاهوو و زەیتوونه
بۆکرووزی موریدانه
کرنووشی ئافەریدانه
ئەمشه و هەڵقولانی وەجدی دڵدارانه
مەستیی دەرەوەی خمخانەی بەدکارانه
مەستیی زیکری تاقه جوانه
چەشتنی نووری دێرینه
جەژنوارەی فەنابوونه
فەنابوونی گریاوانه
فەنابوونی گولاوانه
فەنابوونی (فەرهاد)ی تاقی (شیرین)ە..

شەوی بارانی
١ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠١



# دڵۆپەکانی ئاو

# دڵۆپەکانی ئاوێنە



ئەحمەدی مەلا
(ئیسپانیا)



(١)
گەمەیەک بوو لە درزی ئاوێنەوە
شەوی دەکردە دەسەسڕێک
گوڵێک بوو تا تەمەنی خۆی دەنووسییەوە
شڵەژانێک بوو
چڵەژانێک بوو لەنێو دەستی من
لەنێو جوێباری جەستەی من
ئەم مەرجانە لەشی ئاوە
ئەمە مەرجی تەواوی ژانە

(٢)
گەمەیەک بوو لە درزی ئاوەوە
خەونی دەکردە بەرەبەیان
شکۆفە بوو توانای نەبوو عومری خۆی بخوێنێتەوە
دڵەژانێک بوو
فرینی خۆی پێشکەشی هەوا دەکرد
هەواش لەنێو مەمکۆڵەکانم خەوی لێ کەوتبوو

(٣)
گەمەیەک بوو لە درزی ڕۆژئاواوا
لە درزە تاریکەکانی مێخەکێ

بۆنی شەوی دەدا لە یەخە
لە نێو کاژێ ئاوا دەبوو

(٤)

ئاوا دەبووە خەونی من
دەترنجایە حەوزێکەوە
کاتێ کە کازێوە هەڵیدەستاند
حەوز دەبووە حەزێ

(٥)

ترووسکایی لە خەو هەڵسا
شەوی لێ دادەچۆڕی
تریفەی بەردبوو کزرو فێنک

(٦)

کەلایەکی تەنک لە سەر عەقڵی ئاو
خەوی لێ کەوتبوو
کراسی شەوی لەبەردەکرد

(٧)

چۆڕێ شینایی سەر لێ شێواو
بەردی دڵی کۆدەکردەوە
خەرمانەی داببوو تەواو

(٨)

مەچەکی سپی وەک گەردنی داو
قاسپەی بەردی دەخواردەوە
کەستەک دڕکاوی
گەوەی شاخ شێواو

(٩)

گەردی سەحەر مەست
غوباری کۆچەران
دەلکانە لەشی دڕک و داڵەوە

(١٠)

مرواری جەستە
زنگوڵ زەنگوڵ
ماندوویی دەشتی دەخوێندەوە

(١١)

پیاڵەیەک لەرزۆک وەک هۆشیاری
شەوی لێ جودا دەبووەوە
خەونی دەتۆرا و
لەشی حەرفی تۆمار دەکرد

(١٢)

بەردێکی غەریب
لاتەریک و نەخوێندەوار

(١٣)

دوو کڵۆ بەفری بێ زاکیرە
لە هەیوانی کەشکۆڵێ
خەویان لێ کەوت
توانەوە

(١٤)

ئەو دوا دێڕەی کە خوێندمەوە
قرتانی نینۆکێک بوو
لە نێو بێدەنگییەکی موتلەق
زەنگوڵی کڵێسایەکی دەلەراندەوە

(١٥)

لە پەراوێزی هەندێ شیعردا
شەوی سپیم لکاندبووە قەدی
هێشووە شەو بوو شکۆفەی دەدا

(١٦)

سەمای پێشوولەم دەنووسییەوە
حەرف بوو جریوەی دەهات!

(١٧)

لە قەراغ بەرگی کتێبێکی سەد لاپەڕەیی
چزووی دووپشک بوو وەک بەیان
دوو جزووە پرسیار بوون لە گومان
دەدرەوشانەوە

(١٨)

گومانم خواردەوە تاڵ بوو
عەقڵم بینی ساردو سڕ
پرسیارم بینی گەرداو بوو

تەمەنیش خاو هەر وەکو داو

(١٩)

ئەو دووکەڵەی لەو گێژاوەوە هەڵدەستێ
پرسیارێکی چەواشەیە
ئەو کڵپەیەی کە خەونی خۆڵەمیش بوو
خۆڵەمێشێکی سادەیە

(٢٠)

دوێنێ ئێوارە پرسیارێکم لەبەر دەکرد
گوڵێ هاتە وەڵام

(٢١)

ڕێگایەک تەنها لە توخمی ئاو بوو
شەپۆلێک هزری گەمی دەناسی
ڕچەیەکیش بوو بەرەو سنوور
گومانێک بوو پرتاو

(٢٢)

گرمەی ئاسن بوو غلۆردەبووەوە
هاژەی تاڤگە بوو بە هێوری
شەڕی نێوان چرووسکە بوو
ڕەنگی لێ دەباری

(٢٣)

سبەینێ بڕیارە بچمە ژوانی بێدەنگی
بچمە ژوانی کاشەبەردێک
بێدەنگ باسی عەشقی گیا کەم
باسی عەشقی با کەم بێدەنگ

(٢٤)

هەمیشە لە تەنیشت ژنێک
زاکیرەی ژنێ دەبووژێتەوە
هەمیشە لە تەنیشت ئاوێک
زاکیرەی خۆڵ دەبوورێتەوە

(٢٥)

ئەو تەپ و تۆزەم خۆش دەوێ
کە دەور لە جوانی دەدەن
ئەو تەمەش هەر بۆ پەرستنە
کە پێش هەنگاوی هەتاو دەکەون

(٢٦)

ئەو سێبەرە وەکو لاولاو هەڵدەگەڕێ
بەرەو پەنجەرەیەک کە دادەخرێ
ئەو کەرتە مانگەش دەکەوێتە نێو سەرابەوە
کە پەردەی گومان دادەڕێ

(٢٧)

پەنجەی گیای کێوی
هەر وەک پەنجەی ئاوە
تەمەنیش کورت وەکو زاکیرەی خوناوە

(٢٨)

مێوەی زۆر پێگەیشتوو
مایەی توورەیی چڵە
مێوەی خرچ و کاڵیش
ئاسۆی خاک و گڵە

(٢٩)

ئەو گوڵانەی کە هێشتا ناویان نییە
عاشقی بەردو خۆڵن
ئەو گوڵانەی هەمیشە لەسەر زارن
تەنها کاغەز بۆنیان دەکا

(٣٠)

بڕیارە سبەی بچمەوە نێو میحرابی تاریکیی
جارێکی دیش بپرسم لە بێدەنگی
بۆچی گەورەترین گوڵەو شکۆفە دەکا

(٣١)

کاتێک ڕۆدەچمە ناو ناخی شەوەزەنگ
لەشم دەبینم گردەگرێ
سەرم دەبێتە ئاو و
گەمی ڕۆحمیش پڕ دەبێ

(٣٢)

دوێنێ تەنها بووم
بە ئاسپاییش لەشم جریوەی دەهات
کە گوێم ڕاگرت لە بێ دەنگی
گڕێ بوو چرووسکە دەهات

(٣٣)
هەردوو بازووم سپی بوون
پشتم خاکی کاکی بە کاکی
لە ئاستوە ڕووباری
ئاو شەفەقی داگیر دەکرد

(٣٤)
لەشم حەوزێ بوو پڕ لە خەون
گەردوون تیایا شەقی دەبرد
خۆڵەمێشیش وەک گردۆکە
بەیاری مارە دەکرد

(٣٥)
پەنجەکانم لقەدار بوون
هەر وەک لاولاوەی برسی
لە بێدەنگی دیواریان دەپرسی

(٣٦)
ئەو ئەشکەوتەی هەموو شەوێ دەکرایەوە
ئەو جەستەیەی لە نێو لمدا نغرۆ دەبوو
ئەو خەونەی لێک نەدەدرایەوە
لە مەتنی ئیبن سیرین گیردەبوو

(٣٧)
کەروێشکێک وەک کەرتە مانگ
لەو دۆڵەدا بزر دەبوو
تانجییەک وەک برووسکە
لە ڕەژووی درەختێ گیردەبوو

(٣٨)
ئەستێرەیەک ڕژایە بیرە قووڵەکەی ماڵمان
پەرییەک پێی لە دەوەن گیردەبوو
نوور بوو خەونی دەبینی

(٣٩)
شەو مامزە
هەنیەی تاریک چەپەری سارد
کەمەی ڕووباری لەبەر دەکرد

(٤٠)
ئەو مافوورەی لە بەرەبەیانەوە
تا ئێوارە ڕادەکشێ
چیرۆکی چەند گوڵێکی بێ هەناسەن
لە پێی شاژن گیردەبێ

(٤١)
پەردەیەک مۆسیقای لێ دادەچۆڕێ
بەسەرهاتی پەنجە بوون

(٤٢)
ئەو ئاوێنەیەی کە وەک بەرد ڕاستگۆیە
مێژووی ڕوخسار دەخوێنێتەوە
ئەو ئاوێنەیەی کە وەک ئاو بە شکۆیە
مێژووی ڕوخسار دەنووسێتەوە

(٤٣)
لاڵانەوەی گیام بیستووە
گوێم لە پرسیاری بەرد بووە
گوێم لە سترانی گەرد بووە
شیعرم بینی نوستووە



(٤٤)
قوبەی مزگەوتم بینی ئاڵ
زەنگی کڵێساش بەتاڵ
گوڵە پشکۆم بینی لەسەر مافوور
تەزبیحی ئاویش خاڵخاڵ

(٤٥)
باخچەی هەتاو شەتاو بوو
ئەستێرەش میوەی بەهەشت
لقە چیا گەرداو بوو
لە زاکیرەی دەشت

(٤٦)
تاڤگەی ئاوێکی هەرزەکار
زەریا پیرێکی نوورانی
جۆگەلە ژنێکی بەشەهوەت
کانیاو خەمی مرواری

(٤٧)
گۆماو پیرو ئوفتادە
جوێبار شەکەت و ماندوو
گۆلاو شاکاری سەراب
سەراب عاشق و تینوو

(٤٨)
گەر مرواری بێ ئەرک
مرواری دەستی باژێن
تاجەو لەش دادەپۆشێ
هەر وەک فەریکە ئۆخژن

(٤٩)
لەش شەهوەت و گۆرانی
ڕۆح ئاوێکی تەنیا
سپی هەڤاڵی سیا
بنچکە گیاش لە دەوریا

(٥٠)
ئاو ڕەحەت بێت دەریایە
لەش نەزۆک بێت مانگە

(٥١)
لەش ڕەحەت بێت هەتاوە
نووستنی چەویش گۆرانی
کانیاو لە خەو هەڵسێ دەنگە
دونیاش بۆ خەونی وی تەنگە!

(٥٢)
شەفەقی گەڵا ڕەگە
شەوی ئاو سروە

(٥٣)
خۆڵی مێژوو بەرگی ئینسانە
مێژووی ئینسانیش ئاگر
خەونی بەردە وا دەپشکوێ

(٥٤)
خەونی ئاگر دوو جەستەیە

(٥٥)
جەستەی ئاگر شیعرە

(٥٦)
غلۆر دەبێتەوە لەبەردەمم
شەمامەی زەمان
یەک یەک دەکەونە حەوزی عەدەم
هەر وەک حەرفی زمان

(٥٧)
شۆڕ دەبێتەوە پەرچەمی شەو
بە نێو لەشما بووسکەی دێت
ئەم لەشە بۆچی وا نغرۆیە

(٥٨)
کڤڤەی دێ وشە لە ناو لەشما
وەک خوێنێکی تاڵ
کڤەی دێ ڕستە
لە جەستەی بەتاڵ

(٥٩)
جەستەش وا دادەچۆڕێ بەسەر کاغەزێ
هێڵ دەسڕێتەوە

ڕەش و سپی دەکەونە جەنگ
ڕەنگاوی دەنگ وا دەزێ

(٦٠)

ئیمشەو لەسەر ئەم دەفتەرە دەنووم
ب هەتاو هەڵمسێنێ

(٦١)

سبەینێ خەونێک هەموو تەلیسمەکان ڕاڤە دەکات
درەخت ناو لە خۆی دەنێ
ئو لەسەر کۆشی هەتاو دەنوێ

(٦٢)

غوبار کاغەز داگیر دەکات
لەش بە تەنها شۆڕدەبێتەوە
گەڵا ئاواز لەبەردەکات
سەراب لە ناو وشە شی دەبێتەوە

(٦٣)

عەقڵ تۆ دوورکەوە لێم
من خەریکی شیعر نووسینم
بەڵام وریا بە
تەنها لە دوورەوە تێم بڕوانە

(٦٤)

دڵ دەسەڵاتی خۆت ئاشکرا کە
بە بێ شعوور غەزووم مەکە
ئەگینا شیعرم دوات دەکەوێ

(٦٥)

زاکیرە وەکو قارچک سەری خۆت بکەرە سەیوان
با بارانی جۆش و خرۆش
هیشکایی نەخاتە نێو پەیڤەکانتەوە

(٦٦)

لەش وەک گەمژە
سەر مەخەرە نێو گیانمەوە
با ئەم کانییە وشک نەکات

(٦٧)

شیعر تۆ ناکەمە قوربانی
دونیا بێ تۆ هیشک دەکات

(٦٨)

هەر پێنج هەستەکانم ڕەپ بوونە
هێشتاش شیعرێکیان پێ نانووسرێت

(٦٩)

مێژوو وەرە تەنیشتم دانیشە
مێژوو بگەڕێوە دواوە
ئەگینا شیعر نانووسرێت

(٧٠)

ئەم درەختە دەیان لقە زمان
دەیان چڵە ئاوو و
دەیان گوڵ باران دەگرێت
لە نێو تونێلی زاکیرەوە دەردێت

(٧١)

چیا هەرگیز ناتوانێت شیعرەکانم بخوێنێتەوە
چونکە ڕووی هەمیشە لە خوایە
خۆڵ تۆ هەموو شیعرەکانمت لە بەرە
چونکە بەرگ و پێستی پەیڤەکانمی

(٧٢)

دەتوانن وشەکانم لە ئەشکەوت ئێشک بگرن
دەتوانن لە بەردەم هەتاو فرمێسک بڕێژن
وشەکانم لە ساراش خەون دەبینن
بەڵام ئەی بۆچی نابنە ئاو؟

(٧٣)

ئاگرم لە حەرفێک بەردا
هەتاو گریا
حەرفێکم ئاشت کردەوە
ئاو زریکانی

(٧٤)

شەوم شێلا
ڕۆژم هیشک کردەوە
خەونەکانم بوونە هۆش و
ساتەکانم هێوربوونەوە

(٧٥)
گرمەم لە ڕستەیەک هەڵساند
وێرگولێ کەوتە گۆرانی
خاڵێکم نغرۆ کردە ناو سپێتی
بوو بە ئاواز تا بەیانی

(٧٦)
شەوم لە ڕۆژ مارە کرد
پرچی هەتاوم بە لقە ئاو هۆنییەوە
شەوغم لەبەر هەیوان هیشک کردەوە
ڕایەڵم بۆ ئاواز تەون کرد

(٧٧)
شەقم لە برگە هەڵدا
سەروا تووشی پەرکەم هات
حەرفم لە زیندان دەرهێنا
بوو بە لاپەڕە سارا

(٧٨)
نووزەم خستە ڕۆحی بەردەوە
ئاوازم لە نێو هیشکایی چاند
لەشم بە گڕ هێورکردەوە
ڕۆحم بە توخمی زوقم دەرپەڕاند

(٧٩)
بێدەنگیم وەک ڕست هۆنییەوە

(٨٠)
تەنافم هەڵخست بۆ وشە
پەرەسێلکە مانیان گرت
پەنجەرەم بۆ مانگ کردەوە
ئەستێرەیەک لە حەزمەتا مرد

(٨١)
ڕەمم کردە دەزگیران
مەمکۆڵەکانی مژم هەڵگلۆفی
لەسەر ڕایەخ نووستم و
هەر خێرا بوو بە گوڵگیران

(٨٢)
ناو لەپم وەک دەشتایی دەکەمەوە
دەفڕن مانا
شتێ دەنیشێتەوە
قامکم مەست و بازووم تەنیا

(٨٣)
سەمام بە وشکایی کرد
شێم خستە نێو لینگی وشەوە
جەستەم بە شەوق سیخناخ کرد

(٨٤)
دڵم وەک عەقڵ کردەوە
هۆشم پڕ لە نا-هۆشیاری بوو
عەقڵم وەک گوێزان تیژ کرد
بۆ ئاسۆی لەش کوێرایی بوو

(٨٥)
دونیام لەسەر کۆشم دانا
جوانی هەر وەک هێشووە جریوە
دانە دانە
هەڵدەپرووکان

(٨٦)
غەمم پیادە کرد
خۆمیش وەک ڕەنگ سواری با بووم
هەور لە نێو بازوومەوە فڕەی دەهات
قژم جەستەی سایەقە بوو

(٨٧)
دەمم وەک ئاو هاتە دەم
تاڤگەم لە قوڕگا گیر بوو
وشە وەکو لافاو
لە جەستەما قەتیس دەبوو

(٨٨)
پیتێ لێم زویردەبوو
ڕەش پۆش دەبووم
پیتێ بەرەو ڕووم دەتریقایەوە
سەرخۆش دەبووم

(٨٩)
تەمەنم تەنها مشتێ بێهودەییە

نە هەموو جۆگەلەیەکیش ئاودەخواتەوە
تەمەنم سەحرایەک ژیرییە
ئاسمان تەڵەی بۆ دەنێتەوە

(٩٠)

هەموو خەڵکم وەک بەرد خۆش دەوێ
هەر بۆیە بە زەحمەت دەبمە خۆڵ
حەزیشم دەکرد بەردێ بم
غلۆرم کەنەوە بەرەو دۆڵ

(٩١)

حەزم دەکرد درەختێ بم
ئاسۆم لێوە دیار نەبێ
بەڵام هەورێک بکەمە لەچک
لەگەڵ ڕەگما تێکەڵ بێ

(٩٢)

ڕەگم دەخەمە سەرشان
تاریکیی دەمخواتەوە
ڕەگم دەکەمە ئاسۆ
ڕووناکیی دەمشواتەوە

(٩٣)

من و ڕووناکیی وەکو دوو دوژمن واین
بۆیە هەمیشە بە وریاییەوە
بیر لە یەکتر دەکەینەوە

(٩٤)

من سێبەرم
سێبەری درەختێک
وەک گوڵەبەسێبەر
بە دەور ئاسۆ دەخولێتەوە

(٩٥)

ئەگەر ئاسۆ بوومایە
هەموو ڕۆژێ دوور دەکەوتمەوە
بۆ ئەوەی زستان بە ئیسراحەت پاڵ نەداتەوە
هەرینیش وا زوو بۆگەن نەبێت

(٩٦)

ئەگەر پایز بوومایە
بە ڕێزەوە ماڵئاواییم لە هاوین دەکرد
بە دەسماڵی گڕیش دەچوومە پێشەوازی
باران

(٩٧)

حەزم دەکرد
کراسێکم هەبوایە لە با
پانتۆڵێک لە ئاو و
چاکەتێکیش لە خۆڵ
ئینجا دەمتوانی بە ناو گڕا پیاسە بکەم

(٩٨)

ئاگرم لە کاغەز بەردا
ئینجا شیعرێ هاتە زوبان

(٩٩)

ئاورشێنی وڵاتم دەکرد
بوو بە ئاگران باران

٢٠٠١/٨/٢٨
سیوداد ڕیال

# دالغێن قەرەچکی



موحسن قوچان
(دهۆک)

خولیەکا سارو
بیرهاتنێن نەگەهشتی،
یێن تەمری وەکو ئێشا
لڤی شینواری بێ دەستنڤێژ
پشیکەکا ژبیرکرینەو
کۆمێن مێشا
جەمبازیێ دکەن لسەر لاوازیا گلێشا
ڤێ قەرەچێ یا بارکری...
بارکرو چوو
نەکەس خەما وێ هەلدگریت، بۆ دکەت گری
نەبر بەزانا زارۆکا لپەی دبیتە جۆ
قەرەچەو چوو
تەڤنێ کالێ تەڤنپیرکا، براسیا وێ تەمبیرا
داڤ لێ ڤەتیای و هەلوەریای ڤەدمالیێ
شوین کماخێن بەژنەکا خاڤ
لوێ شوینا قەرەچ دروینێت
کێلیا گورەک ژ هێز کەتی یە
نەشێت سینگێ دەمێ کۆژەک بوەربینیت
بەلاڤ بوونا دەنگێ سترانێت قەرەچکی زێمارەکە
دبێ دەنگیێ دا دخەندقینیت و
دتوز گەڤزکا کەوێ رکێ دا
بێ کەس و خۆی و..بێ رەنگ دمینیت
قەرەچەو چوو...
لولی، لولی شەمی
کەسک و روین و پەپی
بۆ رۆژا ئێک شەمبی
ڤەلیچێ..بابەلیچێ..شکەڤ ئالیسێ...
قەرەچەکێ مالا خو لڤێرێ دانا
هەسپێ خۆ لڤێرێ گرێدا
کونێ خۆ لڤێرێ ڤەداو
مشوتا خو هەلگرت و چوو..
چوون ماچیکرنا ئاسۆیەکێ سەرابییە،
بشاڤا دێمێ ئەورانە
دناڤ ڤەرێژا سەربەستی یێ
چوون نویکرنا ئەبەدی یە
وەک بدەستڤە ئینانا هیڤی یێ
دشیفکادا
ئامیش بلێڤێت جوبارا ڤە گلیزەنە
ل بهارێن پیر
کولیلک و پرچا قەرەچێ هەڤگیان و تلۆڤەنە
ژ دەنگێ بەڤا ئاوازەکێ هەلنگفتی تێت ڤەهاندن

کۆچەراتی...هەی بارکرنا ژ نشکان ڤە
بێ دەستویری و خاترخواستن
هەر ئەڤ هزرا نەخشەکرنا پێداچوونێ
تلێن پێخاس ئێفلنج دکەتن
ڤیانەکا دەسپێکێ یە دسینگێ مەدا چریسکا ددەتن و
دمەهیتن
سترانەکا قەرەچکینی
دبن لیڤێن قەشاڤی ڤە ژدایک دبیتن
هەکو قەرەج نێزیک دبن عەشقێ بکەن
تریفەو گولێن شەڤبا بێهورەیی گەلێ دکەن
وستانەکە ژ گەریانا لبەر دەرگەها...ژخاستنێ بوویە پەشک
دسەروبەریا خەنا دستاو تیکێن پیادا دپەژنیت
بەژنێن لاواز دهەلپسێرنە ژبیرکرنێ
ژبیرکرنا بەژنێن خویل و دێمێن تەڕ
پێن ڤان رەوشتێن قەرەچکی
خۆلبەر سینگێ کری چەپەرو
ژبیرکرن
سمێن هەسپێن کوچەراتی پالدەت کراس گوهرینێ و...
رۆندکا ژ دێمێ دزینێ

* * *

قەرەچەکێ مالا خۆ لڤێرێ دانا
کونێ خۆ لڤێرێ ڤەدا
هەسپێ خۆ لڤێرێ گرێدا
مشوتا خۆ هەلگرت و چوو...چوو...چوو
غەوارە بوو کویر..کویر، دناڤ توخیبێن دەمی دا
دەم...توڤچینە وەکو شۆڤا
دەم...ئاڤزیە ژهەمی تۆڤا
ژتشتێن بەهی
ژ پێن نەکەهی،
بێهنا سۆتنا بازێرڤانیاو نهێنی و رازێن مرۆڤا
نەڤێن ل نێزیک دشکەفتا ڤەژیباین
پرتێن رەژیێ،
شکەلێن شکەستی و هەلامەتا باشی دنیاسن
دەنگ: هەستیکێن وی کەسێ هەنێ دەستڤەنەدەن
نڤێژێن وی وفیرنەونی ژ ئاخەکێ نە
دەنگ: لوێ بیابانا هەیا سار
کونژڤیرکا مرۆڤانە شلخا ددەتن
هولاکۆیە هەسپێ خۆ پێ داگیرکرنێ پێ زین دکەتن
دەنگ: گرنژینێن وەکو تەرگێ
:- کاڤێن بوونێ و ژ بیرڤە چوونێ
:- قیژیێن تەزی ژ زیندانا

دەنگ: پێلێن عەشقێ نەرم دیارن وەکو بارینا سترانا
تیڤەرێزکێن کاروانێن رێکا ئارمیش
دەنگ: شێرێ لاتێ و
هۆڤێ بیشی
دەنگ: گەشت و دەری
دەنگ: هەردوو شاخێن ئەسکەندەری
دەنگ: نالە نالا دەنگێ خەزا تەفشیێ وێ قەرەچا هە
دگەل کەڤوتێ
پرتێن (مادێ) بەلاڤ دکەتن لسەر مشوتێ
دەنگ: مرنا رەشا رۆژ ئاڤای دخۆت
بارکرنا رەڤەندەکی
بارێ گران و شاخێن گای دکەتە جۆت
دەم یەمزیکە کەڤرا دسمیت...
مالا بار دکەت و



رەملکا وێ قەرەچا ئەم نەناسین
رویدانێن چوین بناڤێ ڤەدخوێت
لێ ئەوێن تێت دکەتە مەسین
ڤژانکا بدەمی درانیت
ئەڤ قەرەچە یا ژبیردانکا دەمی کەتی
یابوویە جانیا ماهینێ
ناترسیێ ژ گەهێن دەمی.
ژ هەرفتنا باژارڤانیاو بەهینێ
لێ ترسا وێ تنێ ئەوە
دەنگەکێ بۆر ئەحمەقیا وێ هشیار کەتن
ڤیانا وێ بسپیندارائە بەلی ببیت و
هێشتا (حەمو) ژراڤە کەوێ نەڤەگەریای
سۆلتان (محمد الفاتح) مالا وێ ژ ڤیراجێ بارکەت
رڤشتا سەی دزیکەرمو مشوتا وێ دێ تالان کەت

*   *   *

قەرەچێ بارکرو چوو...
بلەز دچوو
لرەخێ رێکێ
برێن مێشێن هنگڤینی تێهنێ دابوونە پەسارێ
ل جۆکا کەفزین نوباڤێ دکەن...ناڤێ ڤەدخوێت و
خەیالا ڤێ قەرەچێ یا بوویە کاش
ڤاچکەکێ نەرمێ ددەڤی داو
لاچلاچکێن وێ یێن کرین ئاش
ڤیانەکا دخولیا سار را لپاش خۆ هێلای
تیگالێن خەونا رێزکرن
ئێدی نەما فەهم بکەت دگەل بیهوکا بکەتە کەنی
نەوان دەڤێن لدێمێ ئەسمەر
ژ دژواریا تەحرێ بدەت پاش
قەرەچەکە وەک تەڤ کودیکێن قەرەچا
زیانێ دکەت
ڤیانێ دکەت
حەزا دیێ و گەریانێ دکەت
عەشق دسەری دا دمەهیێ
گلیزانکێن پەرێن کولیا ددەستێن بای دا
دچاڤێت وێ دا دبنە شاباش
ما کی دزانیت!
هەکو قەرەچ دمینن بتنێ و کپ دبن پێژن
کاکچکێن وان چ هزر دکەن
چ رەملکا بو خۆ ددانن..کاچ دبێژن؟
کا خەونێن وان وەکو مەنە
دنێک سەمتی نە
یان پڕ رەنگ و هێژو هێژن؟
من روندکا وان یا ڤەخاری
وەکو روندکا مەیا شورە
هەکو هەمێ ژکەڤری کەتی و
بنەمالەکا قەرەچا بتەڤشیا بناڤک کەتی
تویهیرک ژناڤ بیر بن کەتن و
من نەزانی کا برینا وان یا شینە یا سورە
ئەڤ قەرەچا ژنوی بارکری
چاڤ زلکانێ دگەل دەرگەهـ و دیواری دکەت
دگەل خواستنێ
نیڤا سینگێ وێ رویس دبیت...و...
:- ئەز خودام...ڤۆچالی...
ئەو بخۆ دزانیت درەوەکە یا بێ سەهم
نە ڤۆچالی لکو ل هێلاینە
نەژی بشکۆژێن مەمکێ وێ
بێهن دکەنە شیرێ گەرم
ئەڤ خەونا مە یا پیڤازی ژڤی دەرگەهی و دەرگەهێ هە دبیتە هەلم
ل ڤەگەریانێ و
ل بارکرنێ
ل مژیلانکێن قەرەچا مە تۆز دباریت
ژ هەلەمۆرا مرنێ
:- ئەم دێ مرین
ئەز...تو...قەرەچ و
ئەو بچویکێ لسەر بێدەرێ بووی حاجی رەشک
ئەو کولیلکا لبەر لێڤ ئاڤێ سەما دکرو
لبەر پێ هەسپێ قەرەچ -خانێ بوویە کەربەشک
مرن... جوانیە لناڤ ئاقارا
مرن..خۆشیە وەک پێکەها عەشقا رویبارو چنارا
لێ پسیارا کرێت...کرێت
د پاخلاوێ دا ئاگرە
گەلۆ ب کیژ رەنگێ مرنێ ژ مرنەکا دی جوانترە؟

٢٠٠١ /٧ /١٢

# دارستانی ئۆرگازموزو

## باران.. باران.. باران
## باران..باران
## باران



زانا خەلیل
(ئەڵمانیا)

نم
نم
شەو پڕێن و
نوێژو
دوڕباران و
(بارانبارانده‌کرێن)
لەو مەوسیمی یاسەمین و
غوبارو غیلمان و
گەرداوەدا
گەلا گەلای جەستە تێنووە لماوییەکان و
گوڵشەنی گۆڕەکانی سەرابیبوونمان
نم
نم
نم نم نم نم نم
نم
نم
نم
ڤاینی سەر پەسیرەی مەمکە ئۆرستۆکراتییەکان
دەنۆشین و/ گوێ بۆ سەرخۆشیی
گوتاری لێوی ژنە ئەشرافەکان
هەڵدەخەین و هەڵدەخەین و
هەڵدەخەین
و
.
ئاه و ئاه و ئاه
ئاه و ئاه
ئاه
بۆ سەدای شەهێندۆستی نەر بورکانی هانکەیە
جارێکیتر
نم
نم نم نم
نم نم نم نم
نم نم نم نم نم
نم نم نم نم نم نم
سینەی مسین و ئەڵماسیاری فریشتەکان
دادەبارن
لەو سەرزەمینی نەبارینەدا
نەبادا هەتاوی مەمک
بکاتە چاوی ئاسمان و

نیتر بۆ تا ئەبەد ڕۆژ بسڕێتەوە
دوو مەرکانی غەزەلزادەی لە وەنەوز
لە نێو لماوی گەلاڕێزانی عوسرو
چرۆی باڕێزەو
خێوەتی نەسیم
لەسەر لۆکەی گەلاو خاک و باران ڕاکشاون
بە پەلکەزێڕینەی گوناح دادەپۆشرێن و
دەڕۆنە باوەشی جەنگی شەهوەتەوە
دوو پێکی بێمیحنەتی مولحید لە دارستان
دوو پێکی دیندار بە تەوراتی ستاتیکا
دەبن بە ناگرێکی تاقانەی ڕووت
لەو ساکەوە
خوناوی خۆرو دۆزەخی خەون خەوتوو
لەو ساکەوە
خولانەوەی ئەستێرەی زەناو بارانیش
مەیتەری ئەسپی لاولاوەکانن
ئاه
ئاه و ئاه
ئاه
لەو فیردەوسی چرۆو عەترو شەراب و ستیپیانەدا
چەندین جار
لەنێو ئەو زریانی
سوتان و
مەرگ و
ئۆرگازموزەدا
بە مردوویەتی ژیاوین
؟



بیلەفێلد ۲۰۰۰

# سەمفۆنیای بەیانییەک



ڕۆژە حەسەن
(سلێمانی)

کە بەیانیباشی لێ نەکردین
لەوە نەچوو لە کۆڵانەکانی گەڵاوە هاتبێتەوە
عەشقێک بێت لە شەونم
ئەو بارانێکی چەند ڕووت بوو
بەسەر جەستەی پەنجەرەی شەوەوەو
بەفر ئاساو بێ دەنگ
هاواری سپێتی ئەکردو
منیش هەمووجار لەنێو چاوە دەریاییەکانییەوە
ئەورسێک بووم
بە هێمنی و شەرمەوە
نوێژی زینم دائەبەست
تاڵە قژەکانی عەشقم شانە ئەکردو
گۆرانی بەخشندەییم بۆ ئەچڕی
کە بەیانیباشی لێ ئەکردین
لە ماچی ئێوارەی هەتاوێک و
بەهارێکی مەست ئەچوو
ئەو لەنێو بەیانییە کریستاڵییەکانی
موحیبەتەوە
نیگابارانی ئەکردم و
حیکایەتی کەنارییەکانی منداڵی بۆ ئەگێڕامەوە
ئێمە بەهارمان خۆش ئەویست
کەچی لەبەردەم درەخت-دا
شەرمان لە عەشقی گوڵ ئەکردو
نزای پەپوولەمان ئەخوێند
ئێمە شەرمن بووین
شەرمان لە دەریا ئەکرد
هێندە گەورەی ئەکردین
ئەورەس گومانی لە سپێتی خۆی ئەکردو
ماسییەکان ئەیانوت
چ سەرابستانێکە ئێرە
کە بەیانیباشی لێ ئەکردین
چاوێک پڕ لەسەمای حەسرەت و
کانییەک تێروانین بوو
ئەو لەنێو چاوە ئاسمانییەکانییەوە
هێمن هێمن
گۆرانییە شینەکانی بۆ ئەهۆنیمەوەو
وشە بزربووەکانی منداڵی
لە حیکایەتە دۆڕاوەکانی
با ئەسەندەوە
بێ دەنگ ئەیوت
سبەینێ وەرە
لەماڵی هەتاو چاوپێکەوتنی هەورەو
گۆرانی باران ئەڵێ
بەڵکو لە ماڵەکانی شەونم
تێر ماچ بین
ئێمە شەرمن بووین
ڕەنگە تاکۆتاش بێ دەنگ بین
* * *
بەو درەختانە بڵێن
بەیانیباشی منیان بۆ چییە
کە لەبەر ئاوێنەی هەتاودا
بە پەنجە یاقووتییەکانی کۆترێک
قژیان شانە ئەکەن
شەوباشی منیان بۆ چییە
ئەوان بێ دەنگ
لەنێو گەڵاکانی خۆیاندا
مانگ حەشار ئەدەن و
حیکایەتی گومان بۆ ئەستێرە
ئەگێڕنەوە
ئێستا من لەنێو ماڵی ئێرگزەوەو
لەنێو بەیانییەکی بریقەی منداڵی-دا
ئەڵێم بەیانیت باش
ئەی ئەو کانییە چاوکاڵەی
ئێوارەی خەمە تۆخەکانمت
پێچایەوەو
سپاردتە شەپۆلە شینەکان
بەیانیت باش
ئەی ئەو ئاخەی
بە دزی ماڵە بێ حەیاکانی ترێ ڕەشەکانەوە
سەبەتەی هێشووە شەرمنەکانمت
پڕکرد لەترێ سپییەکانی پاکیزەیی
گەرەکمە
لەنێو بێ دەنگییە پیرەکانی تۆوە،
بەهەموو بەیانییە شەرمنەکانی
منداڵیمەوە
بڵێم
بەیانیت باش
بێ دەنگترین سەمفۆنیا
بەیانیت باش.....
٢٠٠١/٦/١٦

## شیعری هاوچەرخی فەرەنسی

# ڕۆژێ ژیرۆد Roger Giraud

و/ لە فەرەنسییەوە: د. فەرهاد پیربال

(١)

ڕزامەوە هێندەی هەر لێرە بم، وەکو کوترێک لە قەراغ دنیادا.
دەست پڕ لە دەنگ، لە بەفر، لە سەرسامییەکان. لە قووڵایی خۆمەوە گوێ بۆ دیمەنێکی خەیاڵاوی ڕادەگرم. ئەوەتا ئەمەش سپیاتییەکە کە بەسەر دەمارەکاندا دادەبارێ.

(٢)

ئاخاوتن، ئەوەتا لەم ساتەدا، خۆی کردۆتە پاکیزەی سێبەرەکان و ژنە خواوەندی شەو و لێرە نەبوونی و ڕۆح..
هەر لە کانگای خۆشمانەوە لێی ڕادەمێنین
لەو کاتەی کە پێیدا ڕۆدەچین.
کاتیش دەگوزەرێ، بەتەنیاییەکی تەڵزماوییەوە.
بەتاقی تەنیا لەو شوێنەدا سەقام دەگرێ کە دیمەن
سەدەفێکی زۆر جوان زیواڵ زیواڵ دەکات،
سەدەفێکی زۆر بێ سوود.
ئەمەش دەروازەی گلکۆ..

(٣)

ئەمە چ شوێنێکە کە قسەم لەگەڵ ناکا،
کە نازانم هیچ شتێکی لەبارە بڵێم.
تۆ بڵێی لە جیاتی دڵ هەست بە چاڵێک بکەم
کە لە دەستم هەڵدێ؟

ئەی ئەم دەنگە چییە، کە لە قووڵاییمەوە دەخەوێ،
کە لە کانگای وەنەوزو لە گەرمایی بەرزترین و قووڵترین دەنگەوە قسە دەکات و
هیچیشی لێ نابیسم؟

کێی تر جگە لە دەنگی خۆم دەتوانێ بڵێ کە من دەژیم،
کە من خەون دەبینم یان کە من گومانی لێ دەکەم؟
قسەکردن ژیان نییە،
ژیانیش لە دەرەوەی دەنگی خۆمەوە بۆ من وەک دوو جاران
مردن وایە.

ئەگەر بمرم،
کێی تر هەیە پێ بزانێ، جگە لەو دەنگەی

که قسه ده‌كات و هیچیش نامبیستێ؟

(٤)

ئاسمان له میانه‌ی په‌نجه‌كانمه‌وه خۆی پارچه پارچه ده‌كا
منیش چیتر نه سێبه‌رم ماوه، نه به‌فر
نه ڕوخسار، نه ئاو....
خه‌ونیش داماوه له‌وه‌ی كه
سه‌رتاپای ده‌فری مرۆڤێک پڕ بكاته‌وه.
بێده‌نگیش له ئاستانه‌ی په‌یڤێكی نسكۆداراو
به‌سه‌ر ڕوخسارێكی دیكه‌وه كه من هیچ حه‌سانه‌وه‌یه‌كم تێدا به‌دی نه‌كرد
به‌جێم ده‌هێڵێ.
لێره نه‌بوونیش ئه‌وه‌نده ئاسک ده‌بێته‌وه
كه سه‌رتاپای په‌یكه‌ری خۆمی له خشتێكدا تێدا ده‌بینم
قووڵ و ئه‌نگوسته چاو..

(٥)

كازیوه به‌ر هه‌ڵدایه،
ئه‌وخه‌یاڵانه‌ش كه له كانگای په‌رده‌ی چاومه‌وه دوور ده‌كه‌ونه‌وه
له‌سه‌ر ڕێگای جیهانی ئه‌نگوسته‌چاودا
به‌خۆڕی جمكانه‌ی مه‌رگ ده‌كه‌ن.

كازیوه ڕه‌شه،
منیش ڕه‌نگی خوێنی خۆمم بیرده‌چێته‌وه.
ئاسێن و پێوانه‌ی ئه‌و سه‌ده‌یه ده‌دۆڕێنم
كه ئێستا وا به‌ڕێوه‌یه.
دسته په‌لوپۆلێ ڕوواوه‌كانم، بێ سوود به هه‌واوه،
هه‌ر له ئێستاوه جڵه‌وی ئه‌فسانه‌كه‌میان له دسست گرتووه.

(٦)

ناوه‌ڕاست ڕه‌شه،
په‌یڤیش كوڕوویی ڕوخسار ناكوژێنێته‌وه.
هێزی ئه‌و له ده‌ره‌وه‌ی بازنه‌كه‌دا ده‌ترووسكێته‌وه،
له قه‌راغ ئه‌ستێره‌یه‌كی بێ گه‌رماییشدا وه‌رده‌كه‌وێ،

ئه‌وه‌تا شه‌و، هه‌رسهێنانێكی ئاڵۆز.
ئاسمانیش له‌ناو ئه‌و دسته‌ی كه له دڵ دوور ده‌كه‌وێته‌وه
چه‌رخ ده‌دا.



ڕۆژێ ژیرۆد (١٩٢٥-١٩٧٤)، شاعیری نوێخوازی فه‌ره‌نسا، له‌ژێر كاریگه‌رێتیی بزووتنه‌وه‌ی په‌خشانه شیعری فه‌ره‌نسی Poeme en Prose و شیعری نوێی ساڵانی چل و په‌نجاكاندا، شێوازێكی جوانی تایبه‌ت به‌خۆی هێنایه ئارا. ئه‌م شه‌ش پارچه شیعره له دوو دیوانی (دره‌خت، كات L, Arbre, Le Temps و (كاته‌كه‌ی تر L, Autre Temps) وه‌رگیراون كه له پاریس له ساڵی (١٩٧٠) چاپكراون. لاپه‌ڕه‌كانی ٩٩، ١٠١، ١٠٢، ١٠٥، ١٠٧، ١٠٩.



# سەفەری سۆر

**جەبار جەمال غەریب**

زوو زانیم هیچ دەسەلاتێکم نییەو دەبێ بڕۆم، بەلام هومێدێکی دوور، دوور کاڵ لە سێبەر کالتر پێی دەوتم:

-«برایەکانت دێن و ڕۆژژمێری هەموو ئەو سالانەت دەدەنێ بەدزی بە لاتدا تێپەڕین، تۆش بەکەیفی خۆت لەنێویاندا بگەوزە.»

خاکی نەرمی ئەو ولاتانە پێیەکانمی ختوکەداو هەوای لەسینەمدا گەمەی کردو ئاوی ڕژایە ناخم و کچەکانی باوەشم.

هەر یەکەم ڕۆژ هەموو هەناسەکانم، هەموو وردە ئەشکەکانم لە ژوورێکی تەنگ و نەوی لە خانووی پیرێژنێکی بێکەسدا بەندکردن و بە ئازادی جەستەیەکی بیست و سێ ساڵ، هاتمە نێو شەقام و کۆلان. هەستم کرد منداڵێکم و بە بیست و سێ سالی لەدایک بووم، بەوەش زۆر دلخۆش بووم کە ئەوە جوانترین تەمەنە پیاو تێیدا دەست بە ژیان بکات.

سەرەتا کزەی بەیان و جا شەونم و هەتاو خۆیان تێهەلسووم و لە بۆنی کێوی پێستم سلەمینەوەو دواتر پێکەنین. پێکەنینی بەیان ڕۆژێکی پڕ خەندەت پێدەبەخشێ. ئەو ولاتانەی پێیاندا تێپەڕیم، سنگیان بۆ من نا، بۆ دنیا ئاوالاکردبووەوە، من نەمدەزانی سلاویان لێبکەم و بەشەرمەوە بەلایاندا تێدەپەڕیم، ئەو شارانەی ناسیمن ئای مرۆی پیریان تێدان، پیرییەک لە چەرمی دەستیان و نینۆکی فڕێدراوی پێیان و هەناسەی ساردیان دەباری، سەردەمێکی زۆر لەگەڵ گەنجێتی ئەو ولاتانە دووا بووم و گەنجێتییەکەیانم خۆشویستبوو، فیلمە ڕەنگەکانیان منیان مژیبوو، ئەو فیلمانەی بەخۆیان و مێرگە بەرین و ئاوە سپییەکانیانەوە هاتنە ناخم و نەمتوانی ڕێیان لێبگرم، ئەو ولاتانەی کچیان بە باوەشی جنس و دەمی گولیانەوە وەک هار لە جەستەم بەربوون.

چاوەڕێم، براکانم بێنە پێشوازیم، ئەوان پێیان گوتبووم:

-«مێرگەکانت بۆ ڕادەخەین و سالاکانت دەخەینە بەرپێ.»

من بێ ئەوەی ئاگام لە زەمەن بێت، بەو شارە کپ و ترسناک و زەبەلاحانەدا تێپەڕیم، وەک لەسەر ڕووبارێک لەسال بم، سالەکانم فڕێدەدایە نێو هەوا، ئای کە خۆش بوو وەختێک سالەکان بەخۆیان و ڕێزە عەلقە دەوریان پێک دەکەوتن و شریخەیان دەهات، منیش دەمگوت:

-«با ئەو سالانەی کونە مشکێکیان نەدامێ تێیدا بژیم، بتەقن.»

ئەو سالە گەچلاوانەی لەگەڵ خۆم هێنا بوون، ئەو سالە پڕ خەم و تێکشکانانە، ڕۆژە خۆشەکان لەبەردەمم بوون، جاری ڕەنگەکان خۆیان نەکردبووەوە، بۆنەکان نەڕژابوونە بەر پێم، هەستم دەکرد کچەکان لەو دیو دارستانەکان و لە پەنا درەختەکان خۆیان مات داوە، من دەشتە دوورو درێژو ئاوە قوولەکانم بڕی بوو، گەیشتبووم، ئیدی ئەو شوێنە بوو براکانم دەبوو بێنە پێشوازیم، هاورێکانم لە نامە دوور و درێژەکانیاندا بۆیان نووسیبووم، من هەموو وەرزو سال و زەمەنی خۆم فڕێدابوو، من ئاوو زانست و حیکایەتە کۆنەکانی خۆم فڕێدابوو، من پەیمان و

خۆشەویستی کچە سادەو خوێن پەمەییەکەی هاوڕێم تەسلیم دوا چۆلەکەکانی وڵاتەکەی خۆم کردبوو، ئەو چۆلەکانەی هەمیشە بە چاوەکانیان و دندووکە لێو زەردەکانیان پەیامە دوورەکانیان بۆ دەهێنام، هێندە بەسەرسامییەوە تەماشایان دەکردم، من لەبن گومانداا شەتەک دەبووم، ئەو چۆلەکە ڕەنگ زەعفەرانیانە هەموو دیاری و یادگارەکانی کچە شەرمنەکەی هاوڕێمیان بردەوە، دواتریش یەکە یەکە نامەکانی عەشقیان لە دڵ دەرکێشام و بەسەر سنوورەکاندا پەراندییانەوە، ئەو نامانە بە ئاسانی بە دندووکەکانیانەوە دەبوون، وەک مووێک لە دڵم دەرکێشن، سەرەتا دڵخۆش بووم و وام دەزانی بەبێ ئەو نامانە سووکترم و دەتوانم زۆر بڕۆم.

ئەو چۆلەکە شەیتانانە شارەزای شوێنی نامەکانی نێو دڵم بوون، هەر بۆ خۆیان ئەو نامانەیان بۆ هێنا بووم، هەر بۆ خۆیان لە ڕۆژی باران و شەوی بەترسدا دەهاتن و لەسەر شان و دەستم دەنیشتن و نامەکانیان بە دندووکە جوانەکانیان، وشە وشە لەسەر توێیەکانی دڵم دەنووسییەوە، هەستم کرد بە دندووکێکی زۆر بێڕەحمانە یادگارو نامەکان دەردەکێشن و وشەو هەناسەیەک بۆ من ناهێڵنەوە، سەرەتاتکێ و چاوبازی ئێوارانیشی لێستاندمەوە، وەک جاسووسێک شوێنی هەموو یادگارەکانم پیشانی چۆلەکەکان دەدا بەو نیازەی وەفایەکی زیاتر بۆ براو هاوەڵە دوورەکانم بنوێنم، ئەوان پێیان گوتبووم:

-«وەرەو ساڵە کۆنەکان لەبەر خۆت دارنە.»

ئەوان پێیان گوتبووم:

-«وەک منداڵێک وەرە، خوێنێک لەگەڵ خۆت مەهێنە نیشتمان ڕەشی کردبێ، چاوێک لەگەڵ خۆت مەهێنە پڕ خەم و کەسەر، دڵێک لەگەڵ خۆت مەهێنە بۆ کەس لێبدات و کەسی لە بیر بێ، دەستێک لەگەڵ خۆت مەهێنە شەقار شەقار بوو بێ، هەناسەیەکی سواو لەگەڵ خۆت مەهێنە.»

من بۆ خۆم لەو شتانە بێزار بووم، ئەو شتانە تەمەنیان بە ماتەم ئاخنی بووم، هەتا پێم کرا بوو لەنێو چڵپاوی کۆڵان گەوزی بووم، بە جێشکانەکانی سەرم دەمانزانی چەند شەڕە گەڕەکمان کردووە، پیرێژنە دەست و دڵ پڕ چرچەکان هەموو ڕۆژێ زەمبیلە قەدیمەکانی خۆیان پێهەڵدەگرتم و وەدوو خۆیان دەدام، بێ ئەنداز لەگەڵ دوکاندارەکان دەدوان، بێ ئەوەی ئاگایان لەوە بێ منی باڵا بچووک و ناسک لە بن زەمبیلە قورسەکانیان خەریکە برمێم، دەبوو لەگەڵ پیاوە وەرگن و دەنگ زلەکان بچمە مزگەوت و تات و هەیوانە دوورو درێژەکانی نوێژکردنیان بۆ بشۆم، دواتر فێر بووم بە دوای مجێوری مزگەوتەکەدا، لە وەختی دوعا دوورو درێژەکانیان خۆم بگەیەنمە سەربانی مزگەوت و خۆم لە بەڵەک و سنگ و باسکی ڕووتی کچ و ژنان مات دەم، تاکە لەزەتی ئەو تەمەنەم ئەو دزە نیگایانە بوو، ئەو کچە قەیرەو بێوەژنانەی تەنیاتر لە من سنگو بەرۆکی بۆ شنەبایەک، بۆ هالاوی دوعاو فێڵی پیاوەکان دەکردەوە. من بێ ئەنداز لێدانم بەدەست مامۆستا مۆن و توورەکانم خواردبوو، من نەمدەزانی بۆچی لێم دەدەن و بیانووم پێدەگرن، هەرگیز ڕێک نەکەوتبوو یارییەک، گاڵتەیەک بکەم و مامۆستایەک یان فەراشێک گوێیە سوورو تەنکەکانم نەگرێ و هەتا ژووری فەلاقە نەمبا. ئەوەی هەرگیز بیرم ناچێتەوە دەرسی



هەرە بەتام و خۆش وەرزش بوو، تەنیا وانەی وەرزش بە مەکتەبەوە دەبەستمەوە، ئەگەر وەرزش نەبا کەس نەیدەتوانی گوێ بۆ ئیعرابە دووروودرێژو بێ مانایانەی زمانی عەرەبی بگرێ. تاکە حەسرەتم ئەو ڕۆژە بوو مامۆستا گوتی، ئەوەی جلی وەرزشی پێنەبێ نابێ بەشداریان بکات، دەرپێیەکی وەرزش دەیتوانی وام لێبکات هەرگیز ئەو وڵاتم لەبیرنەچێتەوە، من چی لەو هەموو دنیا ڕەنگاوڕەنگە بکەم، وەختێک پەڕۆیەکم دەست ناکەوێ بیکەمە دەرپێی وەرزش.

ئەم دەویست جارێکی دیکە لەو دنیایەدا بژیم و پێی بتلێمەوە، پێیان گوتبووم «زەردەخەنەو عەشقەکانت فڕێدە؟؟» پێیان گوتبووم « ناوی برادەرەکانت و دۆستە هەرە نزیکەکانت فڕێدە، ناوی ئەو شێخ و مەلایانە فڕێدە نوشتەیان بۆ لە ئاو هەڵدەکێشای، ناوی شارو گەڕەک و مزگەوتەکان مەهێنە بۆ ئێرە، بە ئاویان دادەو لە بن بەردیان نێ»

منیش نەمدەویست ئەو تەمەنەی لە دوای بیست و سێ ساڵیم دەست پێدەکات، بەو ناو و یادگارانە تەڵخ کەم.

منیش دەمگوت «دەبا گریانەکانی منداڵیم گوزەرکەن، ئەو ژوورە تاریکانەی تێیاندا بەند دەکردم تا ژێر بمەوە، ئەو ژێرییەی هەرگیز سەری لێنەدام، چاوەکان لە تاریکدا لێم موور دەبوونەوە، دەستەکان هەڕەشەیان لێدەکردم، من لە کادینێکدا دەگریام بۆ شێ و بۆنی میزی ئەسپە یەختەکراوەکانی لێدەهات، دەموچاوی پڕ ترس و نامۆو سەد قەڵش لە کەلێن و سووچ و تاریکییەکاندا دەهاتنە دەرو دانە درێژو زەردو تاکو توکەکانیان لێ گردەکردمەوە»

ئەوان گوتبوویان:

-وەرە ئێرەو خەونەکانت وردوخاش کە، وەرە ئێرەو بیرەوەرییەکانت بدڕێنە، تەزو و سۆزە سەد پارچەکانت بسووتێنە، بەس تەنیا بۆ خۆت وەرە، بۆگەنی شارە ماندووەکان لەگەڵ خۆت مەهێنە، نەکەی ئامان ئەو ڕیش و سمێڵ و دەموچاوە پڕ کەسەرەت بێنی، ئێرە زبڵخانە نییە، دەفتەر نفووس و وێنەی کچەکەی عاشقت فڕێ دە.

پێش ئەوەی ئەو هەواڵەم بۆ بنێرن، دە ساڵ بوو دەفتەر نفووسم ون کردبوو، بەڵام وێنەی ئەو کچە وەک بۆن و ئولفەت لێم نەدەبووەوە، ئەو جارەش کە لە سەفەرێکی ڕۆحدا بەجێم هێشت، نامەیەکم بۆ نووسی، نامەیەک با بڵاوی کردەوە، هەناسە گەیاندنی، نامەیەک بە هەزاران جار کۆپ کراو چووە نێو دەفتەری عاشقان، کوڕو کچانی تازە باڵق و پیاوی دڵتەڕ لە دەفتەرەکانی بەر باخەڵیان شاردیانەوە، پیاو و جادوبازە دڵڕەقەکان، بە لووتی سەگەوە بە دوای ئەو نامەیەدا گەڕان و لە ناو جانتا و لیڤیکسی قوتابییانی زانکۆ دەریان هێنان و دڕاندیانن و شار بەجارێک بووە پارچە کاغەزی دڕاو، ماڵ و دوکان و جادەکان لەنێو ئەو هەموو کاغەزە دڕاوانەدا ون ببوون، ئێستاش پێش ئەوەی کۆترە چاوبرسییەکان بێن و ئەو نامەیەم لە دڵ دەرهێنن، دەبێ جارێکی دیکە بیخوێنمەوە، ئاخر من ئەو نامەیەم بەخوێنی دڵم نووسی بوو، دواتر ئەو نامەیە لەنێو گەنج و هەرزەکاران بە «دڵی ئاسن» ناسرا، دوای چەند ساڵ لاشەی کچێک لە قەراغ شار دۆزرایەوە کە ئەو نامەی منی وەک نیشانەی ئەتک و حەیا چوون لێگیرابوو، کچە دوای ئەوەی ئەو نامەیەی پێدەگات، بیست و سێ جار لە دەفتەری کیمیا، ئەو نامەیەی نووسی بووەوە، لاپەڕەکانی هەموو بەڕەنگێکی مۆری کاڵ ڕەنگ کرد بوو، توانیم یەکێ لەو لاپەڕانە لە پۆلیسێکی گەنج بکڕمەوە، من تەنیا ئەو بەشەی نامەکەم دەست کەوتەوە....

## دڵی ئاسن

وەک شەوقێک لە پەپوولە، وەک خەیاڵێک لە گوڵ، لەنێو چوار دیواری پڕ تەم و نادیاری ژوورێک بەجێمهێشتی، بەجێمهێشتی بە دڵێک لە ئاسن و هەستێک لە بیابان، بە نیگایەک لە ئاو و ڕوانینێک لە هەناسەو نوور، تێپەڕیم من، تێپەڕیم و دنیا بووە بێستانی زەعفەران شار بووە ماڵی زەعفەران، ڕەنگی ئینسانەکان بووە تەمی زەعفەران من تێپەڕیم و دنیا بەسەریەکدا تەپی.

بە دڵێکی وەک ئاسن، خەیاڵی نووری جەستەت و شەوقی ڕووتم بەجێهێشت. نەفرەت لە ئاسن و نەفرەت لە من، نەفرەت لە ئاسن و نەفرەت لە دڵی من کە لەو کوورەی عاشقەدا ناتوێتەوە.

ببوورە ئەی شەوقی پەپوولە ببوورە.. من تێپەڕیم و دڵی وەک ئاسنم کەوتە خوار، من تێپەڕیم و دڵی وەک ئاسنم کەوتە بەر پێت، تکایە لەو ژوورە تەنگەی خۆت و ریا برۆ، دڵی من وەک لوغم چێنراوە، با پێت بەر ئەو ئاسنە گەرمە نەکەوێ، ئەوە لوغمی عەشقە، با پەنجە ناسکەکانت لەو دڵە سەختە دوور بن، ئەی کانگای خۆشەویستی و کانگای خەیاڵ.. من لە جادە دووروودرێژەکاندا دەڕۆم و خەڵک و گڵۆپەکان نابینم، دەڕۆم و گوێم لە دەنگی دڵمە لە ژوورە پڕ عەشقەکەی تۆدا دەزرینگێتەوە، دەڕۆم و گوێم لە ئاخی پڕ عەشقی تۆیە لە هەناسەتدا دەدرەوشێتەوە، لە چاوەکانتا خۆم دەبینم و لەگەڵ فرمێسکەکانت دەڕژێمە سەرکوڵمت، لەگەڵ فرمێسکەکانت

بەنێو بژۆڵتدا دەڕژێنم و بەدیواری لووتی هەرە شیرینتەوە دەنووسێم، دەڕژێمە سەر ئەو لێـــوانەی هێندە ناسکن ناتوانم ماچیان کەم، نەک بتوێنەوە.

* * *

ئەو نامـــــەیەم بەدیار ئەو وێنەوە نووسی، ئەو وێنەیە لێدانی دڵمی ڕێک دەخست، ئەو هەر وێنە نەبوو، تەنیا وێنەیەک نەبوو لەسەر پارچە کاغەزێک، ڕەنگ و شـــێــــوەو هەست و تەزووی گەرمی کچە لەو کاغەزە جیا دەبووەوە، لێـوەکـانی دەجـوولاَن و ژوورەکـەمی پڕ دەکرد لە نەغمە، من لەسەر شەپۆلی ئەو نەغـمـانە ڕادەژام، پەنجـە باریکەکـانی دوای ئەوەی لە وێنەکـە دەهاتنەدەر، بە تەرمی ڕۆن و مـێــو دەخـزێنە نێـو مـووەکـانی سنگم وپێـستم وەک مـار لەبەرمـدا دەکـشێ و لەزەت تا قـورگم دەهات، چاوەکـانی وەک کـانی ژیان تێکەڵ چاوم دەبوون، تاڵێک لە قژی کە بەسەر چاوی چەپیدا لوول پێچ هاتبووە خـوار لەنێـو چاوان و بژۆڵم دەخـشاو تەنگەنەفـەس دەبووم و هەناسـەیەکم پێنەدەمـا بۆ ژیان، من دەمـزانی ئەو هەناسانەی من بۆ ئەوە خەڵق بوون خۆ لەو تاڵە قـــژانە هەڵواسن و ژیان بەجێهێڵن.

پێش ئەوەی هەناسە بڕبم، لێـوەکـانی وەک بای بەهەشت لە هەناسـەم نزیک دەبوونەوە، هەستم دەکـرد سـیـیـەکـانم لەسـەر ئەو لێـوانە لێـدەدەن، لە هەر دەنگێکی نامۆ دەسڵەمیمەوەو کچە دەفـڕییـەوە نێـو وێنەکـەو بەشـەرمـەوە چاوەکـانی لەبەر نیگای پیـاو لادەدا، هەمـوو ئەوەی لە ژیانـدا فـێـری ببـووم، ئەوەی مـامـۆسـتـا بێ ڕەحم و زاناکـانم فێریان کردبووم، ئەوەی لەگەڵ نان خوارد بووم، بە ئاسانی فڕێم دان و خستنە نێو جـۆگـەلە بۆگـەنەکـان و ئاسـووده بووم، بەلاَم ئەو وێنەیە وا چەسپی بوو نەدەکرا لێکرێتەوە، برادەرە خەمخۆرەکانم بۆیان نووسی بووم:

-«هێندە منداڵ مـەبە، نەعلەت لەو دڵە کـە لێـدانەکـانی وێنەیەک ڕێکی دەخا»

وێنەکـەم لە دڵم پچـڕاندو توێیـەکی دیواری دڵمی پێـوەهات، پێشـتـر زۆر دڵخۆش بووم، کاتێک کچەکە وێنەکەی دامێ وتی:

-ئەگەر دڵیشت بووەستێ ئەو وێنەیە لە شوێنی لێدەدات.

بەلاَم براکانم بۆیان نووسیبووم:

- «لە خـــەمی دڵ مـــەبە، لێـــرە پێویستت بە دڵێک نییە پێوەی بژی.»

* * *

دوا چۆلەکـە لە کـاتی خـۆی یەکـەم نامـــەی بۆ هێنا بووم، بە لەنگینی باڵەکانی لە ئاستی چاوەکانم وەستـاو بەو چاوە بچـــووکـانەی کـە هێندەی دەریایەک ترسی هەبووو لێی ڕوانیم، بە چاوی وڵاتێکەوە تەمـاشـای کـردم، وڵاتێک کە چاوی کچەکانی خۆی لەو دیو دیوارەکـانەوە دەکـوژێنێـتـەوە، بە چاوی وڵاتێکەوە کـە هیچ نیگایەک دیوارەکـانی نابڕێ، من بە هەیبـەت و لووتبەرزی خۆمەوە نەمتـوانی لە چاوی ئەو تەیرە بڕوانم، دواتر ویستی لەسـەر بەرە دەسـتـەکـانم بنیـشێ و گـەرمی و هەست و لەزەت و شـــوێن پەنجـــەی کچەکـەم لەسـەر پێست هەڵگرێتـەوە، دواتر ویستی گەشکەو ڕاچەنینەکانم لە خـوێندا دەرهێنێ، دەیویست زمـان و لێـوەکـانم بسـڕێتـەوەو ئەو خـۆشی و لەزەتەی بە دزی لەوانـدا شـاردبووەوە، وەختێک نەرمەی گوێی سپی و نەرمی کچەی خۆشەویستم مـاچ کـردبوو، من ئەو مـاچانەم لەبیـر ناچێ، گـوارەیەکی باریکی بچـووک لەگەڵ نەرمـەی گـوێی هاتە نێـو لێـوەکـانم و خـۆشیـیـەکی پڕ سـیـحـر لە بن سـپـیـای تاو نەدیوی گوێیەکانی چاو شارکێی لەگەڵ دەکردم و بەنهێنی پێی گوتم:

-«سوپاس.. بۆو لێوە گەرمانەت.»

سـوپاسـەکـەیم خـواردەوەو بێ ئەوەی کچە ئاگای لێ بێت پێم گوت:

-«هەسـتـەو دنیـا ببـینە... من هەمیشە چاوەڕێتم.»

ئەو گوتی:

-«مـادام هەناسـە گـەرمـەکـانت چاوەڕێمـن من هەرگـــیـــز خـــەوم لێناکەوێ.»

یادگارێکم لا بەجێـهێشت و شێوەیم لەسـەر لێـوم نەخشـاند، من گـوتبـووم وێنەی ئەو گـوێیـانەم هەرگـیـز لە یاد ناچێ، هیچ تەلار و مـێرگ و کـچێکی ئەو وڵاتانەی پێیاندا تێدەپەڕم، لەزەتی ئەو گـوێیـەم لەبیـرناباتەوە. ئەو تەیرە بەدفـــەرە دەیـویست ئەو لـەزەتانـەم لێبسـتێنێـتەوە، تەنیا جارێک پشتە دەستم بەر نەرمایی مـەمکی کەوتبوو، مـووەکـانی پشـتـە دەسـتم شـانازیان بەخۆیانەوە دەکرد، ئەو تەیرە بێ وەفایە دەیوست بە زمـانە باریک و تیـژەکـەی ئەو مـووانەی بلێسـێتـەوە، زمانی ئەو تەیرە وەک خـەنجـەر مـووەکـانی شـەق دەکـردو ئەوانیش دەلەرزین، من تەنیـا دڵم بەوە خـۆش بوو، برادەرەکـانم بۆیان نووسیبووم:

-«وەرەو لەرزین و دڵەڕاوکێ لەگـەڵ خۆت مەهێنە، عەشق و سـۆز مـەهێنە، لێرە ژیان عەشق و سۆزی ناوێ.»

ئەو تەیرە چی پێ نەکردم! هەمـوو ئەو شـتـــانە لە بازگـەو برادەرو خـــۆمم شـاردبووەوە، هەمـووی دەرهێنان و بێ ڕەحـمـانە لێی سـتـاندمەوە، نەمـتـوانی بەرگری بکەم، ئەو تەیرە چاوێکی نەبوو بیدوێنێ، وەک پەڕی باڵی مریشکێک لە سنوورەکـانم ئاوا بووم، ئاوا بووم و دەمـزانی ئێسـتـا چ لە پێشـوازیم دایە، نەک من، هەر کــــەس چاوەڕێی ئەو پێشـوازییە بکات، هەسـتەکـانی خـۆی دەسڕێتەوەو لە نوێ دەست پێدەکاتەوە.

یەکـەم درەخت هاتە ڕێم و بەناوێک

بانگی کــــــردم لـه من نـەدەچوو، مـن کـوڕێکی باریکی، باڵا ناوەنجی، مـوو زەرد بووم، لێوم پڕو قژم زەرد، چاویشم زەرد، ئەو تەیرە بەشی زۆری لەزەتەکانی زەردی لێستاندمەوە، لە نامەیەکدا بۆ کچەی تەمەنم نووسیبوو،

تــەیـرێــکــی زەرد... زەرد وەک چاوت....

تەیرێکی زەرد... وەک هەناسەم

هەموو وشەو ڕەنگەکانی لەسەر زمان هەڵگرتەوە، من نەمـتـوانی ئەو ناوە لەبەرکەم کە دارەکە لێینام، هەرچەند زۆر لە زەرد نزیک، دواتر پیـاوێکی یەک دەست کـە شـەپقـەیەکی تووکنی لەسەر بوو پێی گوتم:

-«بەداخەوە تۆ ناوێکت نییە.»

هاوەڵەکانم بۆیان نووسیبووم:

-«هیچ ناوێکت با نەبێ، لێــرە هەرگــیـز ناوێکی تایبـەت بەخـۆت پێویست نییە.»

من بۆ خـۆم دەمـزانی باری ناو بە من هەڵناگیرێ، با وەک زەنگیـانەیەک ون بم، وەک قـالۆنچـەیەک بشـاردرێمـەوە، بەڵام کابرا گوتی: «دەبێ ژمارەیەکت بۆ دانێم.»

دەبوو ژمـارەیەکی دووررودرێژم بدەنێ، من حـەزم لێ بوو ڕۆژێ ببـمـە خـاوەنی ژمارەیەک، کە نەکرا ئۆتۆمبیلێکی ژمارە درێژ یان تەلەفـۆنێکی دوازدە ژمـارەییم هەبێ، خۆ ئەوەتا دەتوانم بۆ خـۆم ببـمە خاوەنی ژمارەیەکی دووررودرێژ.

ئەو پیـاوە یەک دەستە بە قـەڵەمـێک کـە لە شـێـوەی دندووکی هەڵۆدابوو، ژمارەیەکی نووسی، پێی گوتم:

-«دەتوانی بڕۆی، تۆ مـیـــوانی، ئـاگـــاداری یاســـا بە، نـەک وەک برادەرەکانت...»

من حەزم کردووە هەمیشـە میوان بم، لەلای سەرەوە دانیشم و زەردەم بێتێ، مردم ئەوەندەی پێڵاوی میـوانان جووت کـەم، مــردم ئەوەندەی چا بۆ پیــاوە مـاقـووڵان دانێم، دەمـوێ هەوڕێکانم ببینمەوە، براکانم بێنە پێشوازیم، با .. بمبینن، با شاگەشکە بن، ئێستا دەتوانن هێندەی ئارەزوو بکەن خـزمـەتم بکەن، ئێستا دەتوانن هەموو نامەکانیان لەسەر من بنووسنەوە، بیرەوەرییەکم نەهێناوە غـەمـبـاریان کـات، ناوی شـارێکم نەهێناوە بیـــانـتـرسـێـنێ، تەزوو ئولفـەتەکـانم ڕایاننـاچڵەکـێنی، ژنێک بەناوێک یان ژمارەیەک بانگی کردم کە لێی حاڵی نەبووم، گوتی:

-«وەرە سواری شەمەندەفەرێک بین، هێندەی تەمـەن و سـەد هێندەی نامـەی برادەرەکانت درێژ.»

بە شـەرمـەوە سـوار بووم و ئەو لە تەنیشتم، بەنەرمی ڕانی چەپی خستە سەر ڕانم، نازانم بۆ ئەژنۆم لەرزی و ئەو گوتی:

-«بۆ ئێـوەی مـوسـڵـمـان لە ژن دەترسن؟.»

من نەمـزانی لەگـەڵ منیـەتی، چونکە من ترسـێکم لەگـەڵ خـۆم نەهێنا بوو، دەستی ڕاستم بێ مەبەست لەسەر ڕانی چەپی داناو گوتم:

-«ببوورە، دڵێکم پێ نییە تۆی تێدا هەڵگرم.»

ئەو پێکەنی، گوتی:

-«دیارە کـوردی! نازانی ژن لە دڵدا هەڵناگیرێ و لە باوەش دەکرێ.»

من زمـان و بیـرەوەری و یادگـارێکم لەگەڵ خۆم نەهێنابوو، ئەو چووزانێ من کوردم، هەستم کرد ئەو دەستەی لەسەر ڕانیم دانابوو، شـەلالی عـەرەقـەیە، بن پەنجـەکـانم لینج و کـەلێنەکـانی پێکەوەنووساو، هەوا لەناو سنگی بێ دڵمـدا فـرکـانی بوو، دەنگی دەدایەوەو لوورەی دەهات، ژنە ڕانەکـانی زیاتر نزیک کـردنەوە، جگەرەیەکی بۆنداری تەڕی ئاگـردا، بۆن و شـێی جگەرەکـە کانیاوێکی لە هەناوا تەقاندمەوە، بێ ئەوەی قـسـەیەک بکات یان هەست و شـەمـەندەفـەری بێ گـرنگ بێت، لێی دەڕوانیم، لەو دیو دووکەڵێکی تەنک، دەم و چاوی پەمـەیی و لێوی گۆشتنی، دوور دیار بوون، وەک دەسـتم لەنێـو گـۆزەی هەنگوین پێکەوە نووسـابێ، یەکیگرتبوو، نازانم چۆن قـوپچـەکـانی سـەرسنگم کـرابوونەوە، دەسـتێک بە سیحری مـار لەزەتڕێژی دەکرد، سەرم کەوتبووە نێوان هەردوو مەمکی، هەستم کرد شـەمـەندەفـەرەکـە زۆر بە خـێـرایی بەسـەر لێـواری شـاخـێکدا دەڕوات و دواتر خێـراتر گلۆردەبێـتـەوە، من توندتر خـۆ دەگـرم، ئەوە چ ئـاخـر زەمـانێکە، نەخـۆر هاتۆتە خـوارو نەدنیـا بۆتە بیابان،مۆخی نێو ئێسکم وەکوڵ هاتوون و خـەریکە گـڕبگرم، هەست دەکـەم شەمەندەفەر لەنێو دووکەڵ و هەودا ون دەبێت و کـەس نازانێ ڕوو لە کـوێ دەکات، ژنە لە حاڵێکدا نییە بیدوێنم، من لە حـاڵێکدا نیم قـسە بکەم، باش بوو هیـچم نەهێنابوو، هەرچیم پێـبـا لەنێو گێژاوی ئەو ژنەدا دەسووتا.

ئەو ژنە شـوێنکارێکی لەسـەرلێـوو سنگ و ڕانم جـێنەدەهێـشت، تەیرێکی نەدەویست نامــەکــانیم بۆ بێنێ و لەزەتەکـان بەرێتـەوە، ئەو ژنە هەمـوو هەست و تەزوو و لەزەتی لەش و ڕۆح و جـەسـتـــەی دەمـــژی و وەک ئاوێـک بەســەرمــدا دەڕژاو هەمـــوو شــتـی دەمـاشــتــەوە، وەک خـوڵ لە ناویدا توامەوە و بە ڕووباری لەزەتی داچووم و لە خۆم ون وبووم، نەمزانی لەچدا غـەرق بووم، نەمزانی شەمـەندەفـەر یان ژن یان نامـەی هاوڕێکانم کـامـیـان درێژترن، کامیان ئینسانگرترو کامیان پڕ ڕقترن.

تەنیـا ئەوەندەم دەزانی کـە ئەو ژنە توندو بەگـوڕەی منی کـردبووە سـیـپـاڵ نەدەبڕاو کـۆتایی نەبوو، دەمـویست هەر بەو شەمەنەفەرە خێرایە بچمە نێو دڵی، ئەو پێشتر پێی گوتبووم:

- من دڵـم هەیە، بەڵام من چاو و دەم

و سنگم ئاوەدانە، ڕوو لەو تاریکییە مەکە.»

* * *

سەردەمێک نامەی هاوڕێکانم لەزەتی ژنیان دەدا، نامەکانیان پڕ بوون، لە بۆن و هەوەس، پێش ئەوەی ژنە بە ئاگا بێتەوە هەستم کرد شەمەندەفەرەکە بەنێو دەریایەکدا دەڕوا، شەپۆلەکان وەک کۆتک، ڕووکاری پەنجەرەکان و چاومان دەکوتن، وەک مار دەریای شەق دەکرد و دەریاش دواتر بەگوڕێکی دیکەوە تێکەڵ دەبووەوە، من نەمدەزانی دەریایە یان ژنە بەسەرمدا دەڕژێت، ژنە وەختێک وەک ئاسنی سوورەوە بووی نێو ئاو چزەی دەهات، وتی:

-«ئێرە تونێلی ئاوە، توند خۆتم پێبگرە.»

هێزی خۆگرتنم نەما بوو، هەرچەند بێهومێدانە پێیەوە نووسابووم، نازانم لە چ خاڵێکدا بوو دنیا ڕوون و لوورەی بای سنگم و لرفەی ئاو و شەمەندەفەر نەما، ژنە وەک دەرپێیەک لە خۆی داڕنیم و بە پارێز پێیەکانی لەنێو باسکم دەرهێناو وتی «سەفەرێکی خۆش.»

ئای من لە سەفەردام! دەبێ براکانم بدۆزمەوە، دەبێ ساڵە پڕ گوڵەکانیان نێودەرگرم، ئەوان بۆیان نووسیبووم:

-«گوڵێکت دێنینە پێشوازی تا لە جیاتی عەرەق عەتر دەردەی، تۆ جارێ نازانی ئەو گوڵانەی ئێرە بە چ هەناسەیەک دەبنەوە.»

پۆلیسێکی عفریت شانی گرتم و وەک دەوڵی نێو بێستان ڕاستی کردمەوە، بە بێزەوە گوتی:

-«دابەزە .. ئێرە دوا مەنزڵە.»

گوتم:

-«دەمەوێ تاوێک بنووم.»

ئەو گوتی:

-«ئێرە باوەشی ژن نییە.»

ئەوەتا لەو دیو پەنجەرەکانەوە برادەرەکانم وەستاون، برایەکانی خۆم دەناسمەوە، ئەو پەنجەرە نەعلەتییانە بۆ هێندە ئەستوورن، من لەترسی دەرگا داخراو و پەنجەرە کپەکان هەڵاتووم، من لە ترسی شارە بێ دەنگ و مرۆڤە یەک ڕەنگەکان هەڵاتووم، من لە ترسی سیاناوی هەولێر هەڵاتووم، جوبەی درێژ و زمانی درێژو فەرمانە پیاوانەکانی ژنەکان منیان وەدەرنا، ئەو زمانەی هی خۆیان نەبوو، زمانی پیاوێک بوو بەهەیبەت و درندە، ئەو پیاوە نەعلەتییە لەو دیو هەیکەلی قوتابییەکی دە ساڵان لێم دەهاتە قسە، ئەو پیاو نەعلەتییە لەو دیو مانتۆی کچێکی تازە باڵق لێم توورە دەبوو، ئەو پیاوە نەعلەتییە لە بن زمانی کچەی دەزگیرانم دەهاتە قسەو سووک و ڕسوای دەکردم، هەرگیز لە بیرم ناچێ، بەیانییەک پێش ئەوەی کەس وەئاگا بێ، چووم و بەدیار گوڵێکی تازە پشکووتوو دانیشتم و دەرگاکانی دڵم بۆ خستە سەرپشت و ئەویش زۆر فێڵزانانە هەموو نهێنییەکانی مژی، زانی من منداڵێکی چەتوون و ترسنۆک بووم، دواتر گەنجێکی سەرتەڕ و عەیار بووم و خۆم لە کچان مات داوە، ئەو گوڵە ناسکە کە هەوەڵ ڕۆژی تەمەنی بوو، سڵەمییەوەو زۆر بە توندی دوای ئەوەی هەنگاوێک لێم دوورکەوتەوە گوتی:

-«دوو بێ شەرەفی وەک تۆ پیاویان سووک کردووە.»

من ئەو دەنگەم ناسییەوە، ئەو پیاوانەی لە بن دیواری مزگەوت دامەیان دەکردو خەریکی لووتیان بوون، هەموو ڕۆژێ پێیان دەگوتم:

-«ئەتوارێکی پیاوانە بکە، دەنا کەس کچی خۆیت ناداتێ.»

ئەو پیاوەی لە بن نوێنەکانم خۆی مات دابوو، ئەو پیاوەی لەو دیو نامەکانی دەزگیرانەکەم فشەی سمێڵی دەهات، منی وەدەرنا، شەوێک پشتییە نەرمەکەم، ئەو پشتییەی، تەمەنێکی پڕ گریان و کەسافەتمان بەیەکەوە هەبوو، پێی گوتم:

-«هەناسەی قاحپەیەک سێ هێندەی هەناسەی تۆ دەماری پیاوەتی تێدایە.»

* * *

کابرای پۆلیس وەک جانتایەکی پەڕۆی بەتاڵ بە دەستەوە گرێ: هەڵی گرتم و فڕێی دامە سەر شۆستەکە، باران بەنێو تەمێکی بێ ئەنداز ئەستووردا دەهاتە خوار، سەیر بوو باران ئەو تەمە ببڕێ و ئێمەش بتوانین هەڵیمژین، نەک گیرفانەکانم، ئاو خەریکە دەچێتە نێو پێستمەوە، ڕەنگی نامەی برادەرەکانم تێکەڵ بوون و بەسەریەکدا توانەوە، ساڵەکان ڕەنگی گوڵەکانیان خواردەوەوە گوڵەکان سڵاو و خۆشەویستییان بەسەردا ڕژاو من هومێدی ون بوون، هەموو نامە تەڕەکان لە پایەی وێستگەیەکی شەمەندەفەردا بەو نیازەی وشک ببنەوە یان بتوانم هەر چۆنێ بێت ناونیشان و ژمارەی تەلەفۆنەکانیان بخوێنمەوە. خەڵکێکی بێ ئەژمار بەخۆیان و پێڵاوە قورسەکانیان بەلامدا تێدەپەڕین و کەس هەستی بە بوونی من نەدەکرد، توانیم دوادێڕی نامەیەکی برا ناوەنجییەکەم بخوێنمەوە کە نووسیبووی:

-«لە هەموو وێستگەیەکی شەمەندەفەر دەتوانی ئێمە بدۆزیەوە.»

من نەمپرسی ئەوان بۆ هەمیشە لەو وێستگانەن، ئەو وێستگانە زوو دەگۆڕێن و ڕەنگێک ناگرن، وەک ئاش مرۆڤەکان هەڵدەمژن و وەک باران دێنەوە سەری. بەرانبەر نامەکان دانیشتم، بەو نیازەی یەکێکیان چاوی پێم بکەوێ، دووچاوی نەرمی کۆترێک لەودیو دێڕەکانەوە نهێنگرانە بۆی دەڕوانیم، من نەمدەویست بیبینم و چاوم پەنا دەدا، من لە پەنادانی چاوەکانم شارەزام، وەختێک قسەیان بۆ

دەکــردم و ئامــۆژگــاری دەکــرام، دەبوو تەمـاشـای بەرپێی خـۆم کـەم و چاو هەڵنەبرم، دەبوو لە ڕاست باب و مـەلاو پیـاوانی گـەورەک چاو بڵندنەکـەم و دەسـتـەو نەزەر ڕاوەسـتم، نەمـتـوانی ئازادانە چاو لە چاوی ژنێک کـەم، من لە ترسـان و لە شـەرمـان هەمـیـشـە چاوەکـانی خـۆم پەناداوە، بەڵام ئەو نامانە ئاو شۆردنیەوەو پێویستیان بە دندووکی کۆترێک نییـە بیانسـڕێتەوە، سـاڵەکـانی تەمـەنم و نامـەکـانی دەزگـیـرانەکـەم و وێنە زیندووەکـەی و پارچەکـانی دڵم و هەر هەمـوو خـەونە شـیـرین و پڕ شـەرمـەکـانم دا بۆ ئەو نامـانە، ئەو نامـانەش بێ پەروا بەڵێنە شیرین وڕەنگینەکانی خۆیان دەدامێ و خـەنیـیـان دەکـردم، هێندەم لەزەت لە بەڵێنی نێـو ئەو نامـانە وەرگـرتووە، هەرگیز ژیان بە هەموو فێڵەکانییەوە، بە هەموو خەوە شوان هەڵخەتێنەکانییەوە هێندە خۆشییەی نەداومێ، هیچ مەلاو قـەشـەیەک هێندەیان لەزەت لە خـەون و بەڵێنەکـانی بەهەشت وەرنەگـرتووە، ئەوەتا دەگەمە ئێرە و بارانی بێ وەفا بێ ڕەحم هەمـوو بەڵێنە جوانەکـان و خـەونە ئەبەدییەکان دەتلیسـێنێتـەوە، بارانێکی هێند بێ ڕەحم ژمـارەیەکی نەهێشـتـەوە خــەونی پێــوە ببــینم، شــەوێک لەو شـەوانەی لێـوەکـانی کچەی عـاشـقم لە وێنەی سـەر دیوارەکـە جـیـا بووەوە بەلێومەوە نووسا، لێوەکانم سەرەتا وەک گوڵ گەشانەوەو لەزەتێکی گەرم و نەرم پڕ ئاوی کردن و ترس و شـەرمیش سپی هەڵگـەڕاندن و دواتر وەک بەفــریان لێهات، ئەو دوو لێوە هەڵفریوانە لەسەر نەغمە ئەڤین پێیان گوتم:

-«من جـوانتـرین خـەونم کـە هاتوومـە دی دنیا لەوە قەشەنگتر نابێ.»

من گوتم:

-«دیارە نـامــــەکـــەی ئـەوڕۆم بۆ نەخوێندوویەوە.»

ئەو گوتی:

-«ئەو بەڵێنانە لەو ژوورەداو بە دیار منەوە جوانن.»

مـن ئـەو بـەڵـێـنـانـەم لـەو ژوورە دەرکـێشـاو هێنامن، بەو نیازەی ئەگـەر براکــانیـــشم نەبینمـــەوە، ئەگـــەر هاوڕێکانیشم خیـانەتم لێبکەن، ئەوە بەو بەڵێنانـەوە بژیم، دەکـــرا ئەوان خــیـانەتم لێــبکەن و بەڵێنەکـانم بۆ بەجێبهێڵن، بۆ هەمیشە گوێ لە زەنگی تەلەفۆنەکانیان بگرم، با چەندی دەکرێ چاوەڕێی زەنگەکانیان بم، با دڵنیاش بم کەس وەڵام ناداتەوە، تەنیا با بەهێڵی دوورو درێژی تەلەفۆنەکـاندا تێـپەڕم، نازانم لەو دیو بەڵێنە سڕاوەکـانەوە یان لەو دیو دەنگی زەنگە ونەبووەکــانەوە بوو، ئافرەتێکی کامڵ بەخۆی و بۆنێک کـە لە تاڵەکـانی قـژی بڵاوی دەتکا، دەستی گرتم و بێ ئەوەی ئاگـام لەوەبێ دەستـەکانم بوونە شـەختە، هەسـتم کرد دەسـتم دەسـووتێ، نەدەبوو ئـافـرەتـێک دەسـتم بگرێ کـە وەک ئاگـرە، دەبوو لەزەتێکی شلەتێن بەنێـو پەنجـەکـانمدا تێپەڕێ، ئاخر من هەر لە منداڵییەوە لە گـەرمی لە ناکـاو ترسـام، دوای ئەوەی دەسـتـوپێـیـەکـانم دەیبـەسـت، دەبوو ئاوێکی شلەتێن بەهۆشم بێنێـتـەوەو لەگـەڵ گـەرمی ئاشـتم کـاتەوە، بەڵام ئەوەتا ئەوڕۆ لەنێو سڕبوونێک دەستێک دەرم دەکـێـشـێ، هەناسـەیەکم بەسـەردا دەڕژێ، بـۆنـێـک لـێـم دەئـاڵـێ، وەک ئاسنی نێو کورە سووربوونەوە، هەستم دەکرد وەک قوڕ لەنێـو جـەسـتـەی وەک کورەیدا شەق شەق دەبم، وەک گوتی لە دەنگی شەق بوونم بێت، گوتی:

-«بە تۆزە ئاوێک دەبیەوە قوڕ.»

وەک منداڵێک هەڵـیـگرتم و قـــژی بەسـەر سنگ و لاملمدا شۆڕبـووەوە، هەستم دەکرد هەناسـەکانی، هەناسە پڕ ڕەنگەکـانی بەنێـو سـمێـڵی زەردمـدا دەتێپەڕێ و لێوم پڕ ئاو دەبێت و زمان سەد شەق، ئەو بەنێو ڕەهێڵەدا وەک با دەفـــڕێ و مـن گـــوێـم لـە دەنگی پێیـەکانیـەتی،گـوێم لە دەنگی «با»یە لەسـەر لا بەنێـو لینگ و بن باڵـیـدا تێدەپەڕێ، تێدەپەڕێ و بە بوغزەوە لە من دەڕوانێ، من خەمی ئەو ناونیشـان و ژمـــارەی تەلەفـــۆنانەم بە دیوارەم هەڵواسی بوون و چاوەڕێ بووم وشک ببنەوە.

ئەو گوتی:

-«سـەغـڵـەتی ئەوە مـەبە، هەمـوو پایەکـانی ولاتی ئێـمـە بەو نامـانە داپۆشراون»

من وتم:

-«دەتوانم بیانخوێنمەوە.»

ئەو گوتی:

«ئەو نامـانە هەرگـیـز وشک نابنەوە، خەتەکان تێکەڵ بوون.»

من وتم:

-«خـــەتی براکــانم لەســـەر ئاو دەخوێنمەوە.»

ئەو گوتی:

-«تـۆ هـەڵـەی، تـۆ مـنـداڵـێـکـی تاقـانەی، لە داوێنی شـەمـەندەفـەر بەربوویتەوە.» ❖

هەولێر
٢٠٠١/١٠/٢٣

# چۆن نەدانەدەست!!



مەولوود ئیبراهیم حەسەن

کە گەیشییە نزیک کابینەکە، دوو ئافرەت لەژێر سێبەری درەختەکانی نێو باخچەی بەردەم کابینەکە لەسەر کورسی دانیشتبوون، یەکێکیان ئاوێنەو مووکێشی بە دەستەوە بوو، هەنگژابووە رووی خۆی و مووی هەڵدەکێشا! ئەوەی تریان گۆڤارێکی رەنگاورەنگی بەدەستەوە بوو، لە شێوەی چاپ و پەڕەکانی لەوە دەچوو گۆڤارێکی بیانی بێ.

لەسەر رەوشتی شاگردو بەردەستی یانەو ئوتێلە گەورەکان چوویتە بەردەمیان و بە نەرمی و لەسەرخۆ گوتت: «فەرموون! چ کارێکتان هەبوو؟»

ئافرەتە ئاوێنە بەدەستەکە بە مووکێشەوە هەر خەریکی مووهەڵکەندن بوو، تی چاوێکی پڕ نازی دایتێ و خۆی لە گوورە نەبرد!!

ئافرەتە گۆڤار بەدەستەکەش بە نازو خانمانە سەری هەر بە سەر گۆڤارەکەوە بوو گوتی: «بۆچی درەنگ هاتی؟»

گوتت: «ببوورن! خاتوون، لە خوارەوە کاری ترمان هەبوو، پێ رانەگەیشتین»

بە نازو خانمانە هەڵساو پێشت کەوت، هێندە بە نازو بێ باکانە دەڕۆیشت کە نازو جوانی و مێینەیی لە هەموو بالای دەچۆڕایەوە.

پێشت کەوت!! دەوڵەمەندەکان ژن و پیاویان زۆر حەز دەکەن پێش ناو ماڵ و ئیشکەرەکانی خۆیان بکەون و ئەوانیش ملکەچ و دەست لەسەر سینگ بەدوایانەوە بن.

تۆش بە هێمنی و بەردەستانە بەدوای کەوتی و سەیری هەڵسوکەوتیت دەکرد. لە رۆیشتنەکەیدا دوو مانات هەڵدەکراند. یەک: ئەوەی دەیوست، خاتوونی و گەورەیی و خانەدانی خۆیت بەسەردا بچەسپێنێ و واقیعی حاڵی خۆی و خۆتت بخاتە بەرچاو!! واتە ئەوی خاتوون و خانمی دەوڵەمەندو بە دەسەڵات! تۆش هەژارو کرێکاری بەردەست. دووەم: بیرکردنەوەی گەنجانەت بوو کە پێت وابوو نازی ئافرەتانەو جوانیت بەسەردا دەکێشێ.

رێگاکە کورت بوو، هەردووکتان گەیشتنە بەر دەرگای کابینەکە، دەرگا هاوینییەکەی کردەوەو گوتی: «فەرموو!!» وا لە نێو دەرگا کە وەستا بوو نەتدەتوانی بچیتە ژوورەوە، گوتت: «ببورن خانم، ئێوە فەرموون» بە لەنجەو خۆبادانەوە چووە ژوورەوە، گۆڤارەکەی بە کراوەیی لەسەر مێزی ناوەڕاستی هۆڵەکە داناو چووە ئەو دیوی مێزەکە، تۆش بەدوایەوە بووی، بە دەست خۆت نەبوو، تی چاوێکت دایە گۆڤارەکە، لەنێو لاپەڕەکانیدا وێنەی ئافرەتێکی رووتت بینی کە بە (مۆدێل) بۆ هونەرمەندێکی سەرورێش توکن، بە رووتی لەسەر قەنەفەیەک پاڵ کەوتبوو. وێنە رووتەکە موچرکێکی بەگیانتدا هێنا، ئەوە یەکەمجارت بوو لە هەموو ژیانتدا وێنەی رووتی ئافرەت لە دەست ئافرەت ببینی و لە ژوورێکدا هەر خۆت و ئافرەتەکەو وێنە رووتەکەش بن.

خانمەکە زانی سەیری وێنەکە دەکەیت، تی چاوێکی پڕ نازو بێ باکانەی تێ کردی و زەردەخەنەیەکی ئافرەتانەی پڕ مانای هێنایە سەر لێوان. دڵت بە پەلە کەوتە لێدان و سەرت دانەواند.

ئافرەتەکە دەستی گەیاندە (ریکۆردەر)ەکەو(کاسێت)ەکەی گۆڕی و دوگمەکەی داگرت، ئاوازێک بەرزبووەوە کە بە دەست خۆت نەبوو، لەگەڵ بیستنیدا هەستت کرد، خوێنی هەوەس و گەنجانە لە دڵترا بە هەموو گیانتدا پەرت بوو. چووە بەردەم چاڵە بەفرەکەو دەستی خستە سەر دەسکی دەرگای چاڵە بەفرەکەو گوتی: «چی دەخۆیتەوە، بیرە یان خۆشاو؟!»

کە گوتی: «بیرە!!» راچەنیت و زمانت تێکگیراو دەمێک هیچ وەڵامێکت بۆ نەدرایەوە.

دووبارە گوتی: «نەتگوت! چی دەخۆیتەوە؟»

گوتت: «ببوورە، درەنگمە حەز دەکەم کارەکەم پیشان دەی!»

گوتی: «درەنگ هاتووی، دەشتەوێ زوو زوو بڕۆیتەوە؟»

گوتت: «ببوورە کە درەنگ هاتووم!»

بە دەنگێکی بەرزو پڕ لە نازی ئافرەتانەو خانمییەوە گوتی: «نەتگوت چی دەخۆیتەوە، بیرە یان خۆشاو!!»

زۆرجار حەزت دەکرد، تۆش جارجارەش سەری خۆت بە پێکی بیرەیەک گەرم کەیت و لە پەنای سەرگەرمی و خواردنەوە، تەوقی زۆر خەم و ڕەوشتی بەرەواژی و نابەجێی نێو کۆمەڵ تێکبشکێنێ! بەڵام، حەزی هەژاران لەم ڕۆژگارو هەوارە وەک خەونی بەهاران وایە، ڕەنگاوڕەنگ و دوورە دەست. نەتدەویست و نەتدەتوانی وا بکەی کە زۆرتر چاوەڕێت بکات یان ڕاستتر خۆت بۆ نەگیرا، چۆن چاوەکانی بە ئاشکرا هەڕەشەیان لێ دەکردی، گوتت: «کە هەر دەبێ بخۆمەوە ئەگەر بە زەحمەتی نازانن، با خۆشاو بێ! من ئێستا وەختی کارکردنمە، لە کاتی کارکردن خواردنەوە کارێکی نابەجێیە!»

لە نێو چاڵە بەفرەکەدا شووشەیەکی مامناوەندی و ڕەنگاوڕەنگی دەرهێناو لەگەڵ قوتیەک بیرە! شووشە خۆشاوە پرتەقاڵییەکەی بە نازو لووت بەرزییەکەوە بۆ تۆ درێژ کرد، قوتیە بیرەکەشی سەرهەڵگرت و قرپەیەکی لێوە هێناو کەفی هەڵچوو، زۆر بە نازو شارەزاییەوە لێوە ناسک و سوورەکانی خستە سەردەمی قوتیەکەو لەسەرخۆ کەوتە هەڵمژینی کەفی بیرەکە، زۆر بێ باکانە و بەبێ ئەوەی یەخەو بەرۆکی خۆی ڕێک بخات، داهاتەوەو لەسەر مێزەکە پاکەتە جگەرەکەی هەڵگرت و دوو جگەرەی دەرهێناو یەکێکی بۆ تۆ درێژ کرد.

گوتت: «ببوورە جگەرە ناکێشم.»

لێوێکی هەڵقرچاندو هیچی نەگوت. جگەرەکەی داگیرساندو مژێکی قووڵی لێداو دووکەڵی جگەرەکەی دەردا، دووکەڵ وەک خەرمانە دەوری مانگ لەسەروچاوی ئاڵا.

دەنگی ڕیکۆردەکەی هەر دەهات و ئافرەتەکەش نەرم نەرم لەگەڵ دەنگی مۆسیقاکە خۆی دەلەراندەوە. لە پڕ وەک شتێکی گرنگی بیرهاتبێتەوە، بە پەلە خۆی کوتایە ژووری نووستن و پاش کەمێک گەڕایەوە! لەگەڵ گەڕانەوەکەیدا بۆنێکی تازە بەنێو هۆڵەکەدا پەرت بوو، بەدەست خۆت نەبوو، هەناسەیەکی قووڵت هەڵکێشاو سینەی خۆت لەم بۆنە تازەیە پڕ کرد، بۆنەکە لەم بۆنانە بوو کە لە دوورەوە نێچیر دەگرێ و پەلکێشی دەکات. هەستت بەوەکرد لەگەڵ بۆنە تازەکە دەنگی مۆسیقاکە پتر کارت لێ دەکات. هەر دووکیان پێکەوە دەماری گەنجانەو هەوەسیان دەبزواندی، ئافرەتەکە لەسەر قەنەفەیەکی نەرم دانیشت و قاچی خستە سەر قاچی و چۆک و لاڕانی بە ڕووتی لە ڕۆبە هاوینییەکە هاتنە دەرەوەو لەگەڵ دەنگی مۆسیقاکە بە نزم دەیلەراندەوە، بەدەم جگەرەکێشان و بیرە فڕکردن کەوتە پرسیارکردن، گوتی: «تۆ لەوە دەچی ئەندازیار بی..وا نییە؟»

لەڕەنگ و ڕوویدا لەوە دەچوو حەز بکات بە (بەڵێ) وەڵامی بدەیتەوە، ئەگەرچی تۆ پێت وابوو چاکیش دەیزانی کە تۆ لە کرێکارێک زیاتر نی!! بەڵام، دیاربوو، خاتوون دەیویست لە پێستی خۆتت بێنێتە دەرەوە، ئەگەر لەسەر درۆش بێ!! ئەوسا ئەوەی دەیەوێ لەگەڵتی بکات، بەڵام تۆ لەوە ڕانەهاتووی درۆ لەگەڵ خۆت و خەڵکدا بکەی و شەرمیشت بەم کرێکارییەی خۆت نەبوو، بۆیە بەدڵنیایی و شانازی بەخۆکردنەوەی گوتت: «ببوورن ... من کرێکارم ئەندازیار نیم خانم!!»

گوتی: «ڕاست بڵێ، درۆ مەکە تۆ لەوە ناچی کرێکاربی!!» کە گوتی: «درۆ مەکە» تووڕەییەکی لە ناکاو هەموو گیانی داگرتی، بەڵام، تووڕەییەکە لەنێو ئاو و بای هۆڵەکەدا توایەوە، ناچار بەسەر خۆت نەهێناو گوتت: «پێویستم بەدرۆ نییە خانم!!» خۆشاوەکەت تەواو بۆ نەخورایەوە، هەرچەندە تامێکی وای لێدەهات کە تۆ لە هەموو ژیانتدا ئەمە یەکەمجار بوو خۆشاوی ئاوا خەست و بە تام بخۆیتەوە، بیرت لەم هەموو نازو خۆشییە دەکردەوە کە دەوڵەمەندەکان تێیدا دەژین! خانووی گەورە.. ماشێنی تازە... ناومالّی خۆش و جوان.. پارەو موڵکی زۆر.. ئافرەتی ناسک و تەڕ.. بۆنی خۆش و دڵڕاکێشەر...ئاوازی خۆش و دڵبزوێن.. خواردن و خواردنەوەی زۆرو بە تام... بەرگی جوان و گران و پڕ قیمەت.. گەشت وگوزار.. ئەمانە هەمووی کە ئێوەی هەژارەکان هەر تەنیا بە بەهەشتییەکانی ڕەوا دەبینن، پێتان وایە لەسەر دنیا کەس نییە، زاتی ئەوەی هەبێ لەم هەموو خۆشی و جوانییە بپۆشی و بنۆشێ!! لەبەر خۆتەوە گوتت: «بەڕاستی هەبوویی خۆشە!! ئەرێ چی دەبوو خەڵک هەموو هەبوو بوایە؟ نەک وەکو ئێمە هەندێ لە خانووی کرێ

دابنیشێ ونانی لەسەر کرێکاری بێ و بە زگێک تێرو بە دووان برسی؟! هی واش هەبێ...!!

ئافرەتەکە هەستی کرد کەوتوویتە نێو دنیای خەیالات.

گوتی: «دالغە لێ مەدە خۆشاوەکەت بخۆوە!»

گوتت: «سوپاس خانم درەنگمە حەز دەکەم کارەکەم پیشاندەی!!»

گوتی: «نازانم بۆچی پەلەتە؟!»

دەنگی مۆسیقاکە هەر دەهات و بۆنە خۆش و هەست بزوێنە نێچیرگرەکەش زیاتر جێی خۆی لە نێو دەمارەکانتدا خۆش دەکرد. جوولە و نازی جوانی ئافرەتەکەش دەیویست دەستت لێ بستێنێ، چەندی دەتکرد بیرو ئارەزووت ڕێک نەدەکەوتن!!

خاتوون دواجۆری بیرەکەی هەلداو جگەرەکەی لەنێو تەپلەکەدا کوژاندەوەو گوتی: «دوام کەوە!»

بە پەیژەکەدا سەرکەوت بەرەو ژووری سەرەوە، تۆش بەدوایدا خشی. لە ناوەڕاستی پەیژەکەدا ڕاوەستا، تۆش ناچار ڕاوەستای، سەیری سمت و لەشی چاویان داگیرکردی!! ئەم لەشە نەرم و جوانە لەژێر ڕۆبی تەنک و پەمەیی، سەد ئەوەندەی تر جوان و دلگرو سەرخۆشکەر بوون، بۆنی خۆش و ژنانەی تەواو سینەی تەنیبوویەوە، مۆسیقاکە یەک بێن تانیان دەدای. ئافرەتەکەش بە هەلسوکەوت و نازو گفتی ڕێگای بۆ خۆش دەکردی، بەلام چەندی دەتکرد نەتدەتوانی، خۆ بە گەورە زانین و لووت بەرزی دەولەمەندانەو نازی ژنانەی لێک جیابکەیتەوە! کارکردن لەم جۆرە شوێنانە، جلەو قایمی دەوێ، کەمترین هەلە ئابڕوچوون و نانبڕانی بەدواوەیە! تۆش بە ئاسانی لەم هاوینە، ئەم کارەت لەم شوێنە بەدەست نەکەوتووە! هەستی نانپارێزی وەک چاودێرێکی هەمیشەیی و موکڕ، لە هەموو شوێنێک، لە هەموو کاتێکدا بەسەر سەرەتەوە بوو، لێکدانەوەو بیروبینینی واقیع زوو زوو

پلەی گەرمی لەشیان دەگۆڕی و لەژێر ئاوو ئارەقەیان دەخستی و دەیانهێنایتە لەرزین!!

ئافرەتەکە لەسەر دوا پێی پەیژەکە ئاورێکی لێ دایتەوە، تیشکی چاوەکانی پڕ لە حەزو نازو وەک تیشکی کارەبا دلی داخورپاندی!

دواجار خۆت لەنێو ژووری نووستنی سەرەوە بینییەوە، تۆو ئافرەتەکە بوون، پرسیت:

«زەحمەت نەبێ خاتوون، نەتگوت کارەکەتان چی بوو؟!»

بە نازو بێ باکییەوە گوتی: «ئەم ئێرکوندێشنە هەواکەی کەمەو ژوورەکە سارد ناکات!!»

لە پێش ئێرکۆندێشنەکە دانیشتی و خەریک بووی قەپاغی پێشەوەت دەکردەوە، بینیت بەفری گرتووە،

گوتی: «چییەتی، چاک دەبێتەوە؟!»

گوتت: «بەلێ خانم، هیچ نییە بەفری گرتووە!»

خەریک بووی بورغی قەپاغەکەت شل دەکردەوە، گوتت: «دەبێ ماوەیەک لەسەر گەرم کار بکات! تاکو بەفرەکەی دەتوێتەوە، پاشان ئیسفەنجەکەی خاوێن دەکەینەوە.»

دەنگی مۆسیقاکە نەرم نەرم دەگەیشتە ژووری سەرەوە، بەلام بۆنە خۆش و دلڕاکێشەرەکە لەگەل ئافرەتەکە سەرکەوتبوو، بە هەردووکیان ژوورەکەیان پڕکردبوو.

بەچاکی بیرت لەسەر کارەکەت جێگیر نەدەبوو، هەلسوکەوتی ئافرەتەکەت شی دەکردەوە، چەندجار «جەرنافیز»ەکەت لە دەست هەرزەلی !! بورغییەکانت بۆ شل نەدەکرایەوە. کاتێکت زانی دوو دەست لە پشترا لە ملتەوە ئالان و گرانایییەک کەوتە سەر هەردوو قۆلنجت، هەستت کرد سینگی ئافرەتەو گرتی مەمکەکانی لە پشتت گیر بوون، هیچت بۆ نەگوترا، بە هێواشی خۆت لەنێو باوەشی دزیەوەو لەسەر خۆ گوتت: «زەحمەت نەبێ ماوەم بدە ئێرکوندێشنەکە چاک کەمەوە!!»

کە ئاورت دایەوە، چۆکێکی گەیاندبووە عەردی و چۆکەکەی تری لە کەلەنی ڕۆبەکەی هاتبووە دەرەوەو ناو گەل و ڕانی بە ڕووتی و ڕوونی دیار بوو، مایۆ سوورەکەی هێندەی تر دلکێش و هەست بزوێن تر بوو، بە ئانقەست سینگی خۆی نیوە ڕووت کرد بووەوە، لەژێر شەوقی گلۆپە سوورەکەش هێندەی تر دلگرو هەست بزوێن و دەمار پڕخوێنکەر تر دەبوون.

چاوەکانی پڕ نازو حەز بوو بە منەت بەسەرکردنەوە دەدووان! خۆی بۆ نێو باوەشت شل کرد. تۆش دەستت دایە بەر سینگی و بە پشتدا ڕەتت کردەوە، چەند تۆ گران دەجوولایی و ڕێت لەو دەگرت، ئەو هێندەی تر جلەوی خۆی لە دەست دەداو بە تاوتر بۆت دەهات! لێوی لە لێوت سوی، هەستی گەنجی و برسییەتی ئەم هەموو تەمەنەو هاندانی مۆسیقاو بۆنی خۆش و نازو خۆنواندن و هاتنە پێشی ئافرەتەکە، هەموویان پێکەوە لە تاری گەنجانەیان دەدای و قەپاغی سەر ئەم هەموو تەپسکردنەو غورورییەیان هەلدەدایەوە! دەمارەکانت پڕ خوێن بوون و دەتویست وەک مندالێکی ساواو نەدیتکە بکەویتە ڕنینی بێستانی ئەم ئافرەتە!! ئەمانە هەمووی خواستی هەوەسی گەنجی و تەوژمی تەپسکردنەوەبوون، بەلام هەست و بیروباوەڕو جۆری پەروەردەو شەرەفی (کوڕ)انەو خودی کەسایەتیت، جلەوی (شەیتانلغاو) یان لەسەر نایی و پەلبەستیان کردی!!

ئافرەتەکە، کارێکی ئامێرکارانەی لە تۆ دەویست، ئەو دەیویست ئێرکوندێشنەکە، ژوورەکەی بۆ ساردبکاتەوە، تۆش ژوورەکەی بۆ گەرم دابێنی!!

دیسان دەستت بە سینگییەوە ناو ویستت لە خۆتی دوور بخەیتەوە، کەچی دەستی گرتی و خستییە سەر مەمکەکانی و پتر لێت هاتە پێش، بەهێزترو تووڕەتر لە خۆت دوور خستەوە، لە دوورەوە کە دەستی

دەگەیشتە مل و گەردنت دەستی لە بناگوێت گیرکرد. لەم کاتەدا وات هەست کرد کە تۆ ئافرەتێکی هەژارو خاوەن هەتیوی لە ماڵە دەوڵەمەندێک بەرەنجی شان کار دەکەیت و بژێوی منداڵەکان بەکارکردن بەدەست دێنی، کەچی خاوەن ماڵی ملەوەز سمێڵ فش فرسەتی بەدەست هێناوەو دەیەوێ دەماری هەوەسی لە باوەشی تۆ خاو کاتەوە، بەدەست خۆت نەبوو، هەوەسی گەنجی و غوردی، گۆڕا بە ڕق و تووڕەیی، تووڕەو بێزارتر ئافرەتەکەت لە خۆت دوور خستەوە! دەتویست خۆتی نەدەیتە دەست. ئاخر دەوڵەمەندەکان ژن و پیاویان کە تێر دەخۆن، دڵدەگیرێن و دەیانەوێ دەماری هەوەسی خۆیان بە (کارەکەر)و (ناوماڵ)ەکانیان خاوکەنەوە.

هیچ بیر لەوە ناکەنەوە، ئەم ئافرەتە منداڵی ساواو برسی لە ماڵەوە بەجێ هێشتووە، ئەم کوڕە دایکێکی نەخۆش و بێ دەرمانی لە ماڵەوە چاوەڕێی دەکات.

ئافرەتەکە وا گەرم داهاتبوو، سەر کوڵمەکانی پڕ خوێن ببوون و وەک گوڵ گەش داهاتبوون، چاوەکانی حەزو ئارەزوویان لێ دەتکایەوەو چەندی دەیکرد خۆی بۆ نەدەگیرا، دیار بوو چاوەڕوانی ئەوەش نەبوو کە تۆ بە دەنگییەوە نەچی! ئەمانە هەمووی وای لێکرد پتر بە نازو حەزو منەتەوە سینگ بێنێتە پێش.

تۆش خراپت لێ بەسەر هاتبوو، لەنێوان حەزی گەنجانەو فرسەتی بەردەست و باوەڕی کوڕانەو خودی کەسایەتی خۆت کەوتبوویتە کێشە، هەرێکەو بەلایەکدا ڕایدەکێشای!!

ئافرەتەکە هەستی ڕاگرت، تێگەیشت بۆی ناچێتە ژێر بارو خۆی نادەیتە دەست! کشایەوەو دابەزییە خوارەوە کە گەیشتە خوارەوە هەستت کرد، دەنگی مۆسیقا هەوەس بزوێنەکە بەرزتربووەوە، دیسان ترپەی پێی لەسەر پەیژە دارینەکە هات و سەرکەوتەوە، هات پێش و دەستەیەک (دە) دیناری فڕێدایە پێشت و گوتی: «هەڵیگرە بۆ خۆت!!»

بەتووڕەیی و ڕقەوە تەمەشایەکی ئافرەتەکەت کردو لە دڵی خۆتدا گوتت: «بەڵێ!! دەوڵەمەندەکان تەنیا ئەو (چەک)ەیان هەیە پێی بنازن و لە هەموو جەنگێکدا دەستی بۆ بەرن و پشتی پێ ببەستن، ئەوان خۆیان هەموو شتێک لە پێناو بەدەست هێنانی ئەم (چەک)ەدا دەکەن، پێشیان وایە هەموو کارێکیش لەگەڵ هەموو کەسێک و لە هەموو شوێنێکدا هەر بەم (چەک)ە دەکرێ!!»

تۆ لەم خەیاڵاتانەدا بوویت ئافرەتەکە لێت هاتە پێش و ویستی خۆی باوێتە باوەشت! ڕێت لێ گرت و ڕەتت کردەوە، دیسان دەستی خستە بناگوێت و پەنجە ناسکەکانی لە مل و گردنت هەڵسوی و بەنازەوە زللەیەکی نەرمی خستەوانده بناگوێت!! ئەمجارەش وات هاتە بەرچاو کە (تۆ) کچێکی هەژاری و لە ماڵ یا کارگەی دەوڵەمەندێک کاردەکەی و خاوەن ماڵ و کارگەش تی کردوویەتییەوەو دەیەوێ پڕت داتێ! کە تۆش پاش ئەم هەموو هەوڵ و بەرتیل کارییە خۆی نادەیتە دەست، دەیەوێ بە لێدان ناچارت بکاو ئابڕوت بەرێ!!

وەک شریتی سینەماو لە یەک چرکەدا، ئەم هەموو ئافرەتە هەژارو ئابڕۆ براوانەت هاتەوە بەرچاو کە لەبەر هەژاری و بێ کەسی دەوڵەمەندو زۆردارەکان پڕیان داونەتێ و ئابڕۆیان بردوون و لە پاشاندا لە پێش خەڵک جوێنیان پێداون و بە سووکیان ناوبردوون «ڕقی هەموو ئەم ئافرەتانە لە گیانی (تۆد)دا کۆبووەوە، ئەویشت لەلا بوو بە هەموو ئەو پیاوە ملەوەزو دەوڵەمەندانە کە پارانەوەو گریانی ئێوە مانان هیچ کارێکیان لێ ناکات!!»

تۆش هیچ ڕێگایەکت نەبوو بۆخۆپاراستن، تووڕەیی و بێزاریت گەیشتە ڕادەیەک، دەتویست بە یەک زللە ئەم هەموو هەقە لەم دەوڵەمەندە ملەوەزە بستێنییەوە! کە ئێستا دەیەوێ ئابڕۆت بەرێ! بۆیە بە هەموو هێزتەوە دەستت ڕاوەشاند، بەڵام، (ئەو) خۆی کێشایەوە، بە ئاستەم سەری پەنجەکانت بەر ڕوومەتی کەوت. بە ڕق و بێزاری و دۆڕاوییەوە لێت دوورکەوتەوەو زریکاندی و گوتی: «موخەبەل»

ئەمەی گوت و دابەزییە خوارەوە، تۆش هەناسەیەکی سەرکەوتووانەت هەڵکێشاو لە ئاوێنەکەدا سەیری خۆت کرد، لەژێر ئاوو ئارەقەدا بووی!

پاش کەمێک، تۆش دابەزیتە خوارەوەو لە دەست شۆرەکە هەندێک ئاوت بەسەرو چاوو مل و گەردنی خۆت داکرد، ڕێکۆردەکە هەردەسووڕایەوەو دەنگی مۆسیقاکە دەهات، بەڵام دەنگەکە وا دەهاتە بەرگوێت کە دەتگوت ڕیکۆردەکە تێکچووەو فرەفریەتی. دەنگێکی وا کە پێت وابوو، چەکوچەو لە مێشکتی دەدەن! نەک دەنگە هەوەس بزوێنەکەی دەمێک لەوە پێش بۆنی خۆشی گوڵاوەکەش گۆڕا بوو، وەک بۆن بۆگەنییەکی پیس سەرو دڵتی پێ هەڵدەچوو، ڕەنگ و ڕووی ئافرەتەکەش شل و لوچاوی و خاوو هەڵبزرکاو ببوو، دەتگوت هەر لەم ماوە کورتەدا دەیان ساڵ گەورە بووە و پیری، جوانی و ناسکییەکەی لێ ستاندۆتەوە! ڕەنگ و ڕووی تەماشاکردنی نەمابوو، بەڕاستی هەر ئەو دەم تێگەیشتی کە هەستی واقیع ناسی و بیرو باوەڕی تووڕەیی چۆن تام و بۆن و ڕەنگ و ڕووی خۆشی کە لەسەر ڕیشەی دزی و زوڵم و زۆری و ناپاکی پێگەیشتبێ، دەگۆڕێ و لەبەرچاو و دڵی دێخێ!!

کەسەرو چاوی خۆت سڕییەوە، چوویتە بەر دەرگاو بۆ دواجار سەیرێکی ئافرەتەکەت کرد، بینیت سەری خستووەتە سەر مێزەکەو پرچی بەسەر گۆڤارەکەدا پەرت بووەو تەنک وێنە رووتەکەی داپۆشیوە! بەردەوام هەنسکی دێتێ، دەرگاکەت بەدوای خۆتدا ڕاکێشاو بە تەنیاو خەمەوە بە جێت هێشت!!

**هەولێر – ١٩٨٥**

# من و پیاوە ڕۆبۆتەکە

یاسین بانیخێلانی
(سوید)

ئەوە دوو مانگە هاتوومەتە ئێرە، هەرچەند دەکەم و هاوکارەکەم قسەیەکم لەگەڵدا ناکات، ئاخر ڕاستە ئەوە کێشەی منە، بەڵام من لەدەست تەنیایی و بێدەنگی هەمیشە هەڵدێم، چونکە ترس دەخەنە دڵمەوە. زۆرجار بیر لەوە دەکەمەوە ڕەنگە چارەی من یا چارەی بێگانەی بەگشتی بەدڵ نەبێت، بۆیە نەک هەر قسەم لەگەڵدا ناکات، بەڵکو زۆر جاران بۆ ئەوەی بیهێنمە قسە لەبارەی کارەکەی خۆمان پرسیاری ئاراستە دەکەم...کەچی بە سەرهەڵتەکاندنێک یا مل ڕاوەشاندنێک وەڵامم دەداتەوە. لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە تەنانەت لەو کاتژمێرە پشووەی خواردنی نیوەڕۆشدا لە گۆشەی ژوورەکە دادەنیشێت و وەک هەموو ڕۆژان دوو پارچە سەموونی بەکەرە چەورکراو، کە پارچەیەک (شینکن)(١)ی تێ ئاخنراوە لە جانتاکەی دەردەهێنێت هێواش هێواش دەست بە خواردنی دەکات. ئەم بێدەنگیی کابرا بەڕاستی نازارم دەدات!. بڕواناکەم لە ژیانمدا هێندەی ئەم دوو مانگە بێدەنگی کاری تێکردبم، بەتایبەتی لەسەر کار، کە کاتژمێر ئەڵێی بە کۆڵی کەری شەلەوەیە ڕێناکات. ئاخر زۆرە دوو مانگ لەیەک ژووری کارکردندا ژوورێکی بچووک ڕۆژی نۆ کاتژمێر بەربتە سەر بێئەوەی گوێت لە دەنگی مرۆڤێک بێت وەک ئەوەی لە بیابانێکدا بژیت یا قسەیەک بکەیت، ئاخر قسە لەگەڵ کێدا بکەم؟ ڕۆژێک ناهەستانە لە خۆمەوە گۆرانیم دەگوت، کابرا بە گومانەوە تەماشایەکی کردم و سەرێکی ڕاوەشاند، بەمەش وێنەی ترس شەرمێکی تر ڕۆچووە ناو نەستمەوە، ئێستا لەهەر جێگەیەک گۆرانی بێتە سەر زمانم یەکسەر ئەو وێنە ناشیرینەی کابرا دێتەوە بەرچاوم، بڕواتان هەبێت ماوەیەکە وام لێهاتووە لەگەڵ دەستگا میکانیکییەکاندا قسە دەکەم، قسەی چی؟ زۆرجار لێیان توورە دەبم، چەکوش و دەرنەفیزیان پێدا دەدەم، دەزانم ئەمەش جۆرێکە لە شێت بوون، بەڵام چی بکەم من قەت لەگەڵ تەنیایی و بێدەنگیدا ڕانەهاتووم، چونکە لەناو خێزان و کولتوورێکدا پەروەردە بووم دەبێت هەمیشە لەگەڵ کۆدا بم، بۆیە تەنیایی هەمیشە هەڕەشەم لێدەکات.

دوێنێ زۆر ماندوو بووم. ڕەنگە هۆ سەرەکییەکەی بگەڕێتەوە بۆ گرێی ئەو بێدەنگییە، کە ساتێک ناتوانم بیری لێنەکەمەوە. جگە لەوەی ڕۆژبەڕۆژ ڕقم بەرامبەر کارەکە و کابرا، کە هێشتا نازانم ناوی چییە ئەستوور دەبێت. کاتژمێر دوانزەی نیوەڕۆ بۆ پشوو گەڕاینەوە ژووروچکەی دانیشتن و بیرۆ، بەهەمان شێوەی ڕۆژانی پێشوو لە جانتاکەی دوو پارچە سەموونە بەکەرە چەورکراوەکەو شینکنەکەی ناوی لەگەڵ بیرەیەکدا دەرهێنا. هەموو هەڵسوکەوتەکان دووبارە بوون، بەتەنیا بیرەکە شتێکی نوێ بوو، پاش دوو قەپاڵە لە سەموونەکەی ناودەستی، کەمێک وەستاو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو چاوی بڕییە ئەو وێنەیەی بە دیوارەکەوە هەڵواسرا بوو، ماوەیەکی زۆر لەو سەرسامییەدا مایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دڵۆپ دڵۆپ فرمێسک لە چاوەکانی بەردەبوونەوە. ئای خوایە گیان! من وام دەزانی هیچ هەستێکی مرۆڤانە لە ڕۆحی ئەو پیاوەدا نەماوە، کەچی ئێستا دەبینم دەگری، گریان لای من لەبزواندنی هەستە مرۆڤایەتییەکان زیاتر هیچ واتایەکی نییە. کاتێک هەستە مرۆڤایەتییەکانی ناو مرۆڤ دەبزوێت فشارێکی دەروونی بۆ مرۆڤ دەهێنێت، ئەو کاتە بۆ خاڵی کردنەوەی ئەو فشارە مرۆڤ پەنا دەباتە بەرگریان. منیش یەکێکم لەوانەی کاتێک هەست

بەو فشارە لە جیهانی دەرەوەی خۆشمدا بکەم یەکسەر لەناومدا ڕەنگدەداتەوەو دەمکاتە گریان. هەرچاوی لەسەر وێنەکەیە، وێنەی پیاوێک ئەوەندە بەتەمەن نییە لە باوکی بچێت هێندەش گەنج نییە بە کوڕی!. بەدەم ئەم چاولێکردنەوە هەندێ جار سەر ڕادەوەشێنێت و هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەمژێت. تۆ بڵێی: چی بەیاددا هاتبێت یاچی کێشەیەکی هەیەو بەدەستییەوە دەناڵێنێت، ئەی پەیوەندی بەو وێنەوە چییە؟!. ئەمانە هەموو پرسیار بوون لای من، بەڵام چۆن وەڵامم دەستگیر ببێت، خۆ ئەو بە هیچ شێوەیەک قسە ناکات. لەو کاتەدا ڕووی لە وێنەکە لاداو جگەرەیەکی داگیرساندو بەهەموو توانایەوە قومێکی قووڵی لێدا. ڕووی بەلای مندا وەرگێڕاو زەردەخەنەیەک، کە مرۆڤ خۆشیی تێدا بەدی نەدەکرد گرتی. وەک هەموو جارەکان سەرە لەقەیەکی کردو گوتی: من ئێستا بەختەوەرم، زۆر بەختەوەرم.

- سوپاس بۆ خوا ئەوە لەگەڵ مندا قسە دەکات (لەبەر خۆمەوە ئەمەم گوت).

بەردەوام درێژەی بە قسەکانی دەداو زوو زوو ڕستەی : من ئێستا زۆر بەختەوەرم-ی دووبارە دەکردەوە، لەو کاتەدا دەمویست لەم فرسەتەدا هەرچی پرسیارە پەنگخواردووەکانی دەروونم هەیە هەڵیرێژمە بەردەمی، ئەو گوتی: دەزانی بۆ؟!. تەمەنم ئێستا شەست و سێ ساڵە. چل و پێنج ساڵە ئا لێرە، ئا لەم ژوورەدا کار دەکەم، چل و پێنج ساڵە ڕۆحم بە شێوەیەک تێکەڵاوی ئەو مەکینانە بووە، کە نازانم ئەوان منن یان من ئەوانن، بەڵام ئەوەندە دەزانم زۆرم خۆشدەوێن...چل و پێنج ساڵ...بەڵێ چل و پێنج ساڵە من هەموو بەیانییەک کاتژمێر پێنج لە خەو بیدار دەبمەوە، چل و پێنج ساڵە هەموو بەیانییەک کاتژمێر شەش لێرەم، ڕەنگە بپرسیت ئەی ڕۆژانی شەممەو یەکشەممە؟ زۆرجار بەهۆی زۆریی کارەوە شەممان هاتوومەتەوە بۆ کار، بەڵام ئەو شەممەو یەکشەممانەش کار نەبوون، نەمتوانیوە بێدار نەبمەوە زۆربەی شەممەو یەکشەممەکان کاتژمێر شەش لێرە بووم و بەدەوری کارگەکەدا ڕاوێچکەم دەکرد..چل و پێنج ساڵە کاتژمێر نۆی شەو لەناو جێگەدا بووم...چل و پێنج ساڵە شەو و ڕۆژێک چوار کاتژمێر کاتم هەبووە بۆ هەموو پێداویستییەکانی ژیانم، هەربۆیە نەمتوانیوە خۆشەویستێکم هەبێت. پێش ئەوەی بێمە ناو جیهانی کارکردنەوە، کچێکم خۆشدەویست، ئەویش هەروەها. ئەو سەردەمە زۆر بەختەوەر بووین، لە هیچ شتێک بێ دڵیی یەکمان نەدەکرد، خاوەنی عەشقێکی زۆر سەیر بووین، بەڵام پاش کارکردن هەردوو ساڵ توانی لەگەڵمدا بژی، بۆیە جێی هێشتم، لەو کاتەوە من تەنیام و خەون بە عەشقێکی ترەوە دەبینم. چل و پێنج ساڵ کارکردن ڕەنگە پێت سەیر بێت گەر بڵێم: جگە لەو مەکینانە زیاتر پەیوەندیم بە هیچ شتێکەوە نەمابوو...

پێش دە ساڵ ڕۆژێکی پێنج شەممە لە نەخۆشخانەیەکەوە زەنگیان بۆ دام، کە دایکم زۆر ناساغەو دەیەوێت بتبینێت. منیش ئاگادارم کردن، کە ڕەنگە ڕۆژی شەممە بتوانم سەردانی بکەم. ئەو دەمە ساڵێک بوو دایکمم نەدیبوو ئەگەرچی لەم شارەشدا دەژیا، نازانم ڕەنگە پێویستیشی نەکردبێت بیبینم، ئەگینا بۆ؟ ئەو ماوە هەموو پەیوەندییەکمان تەنیا جار بەجارێک تەلەفۆنکردن بوو، کەچی بەداخەوە ڕۆژی هەینی زەنگیان بۆدام، کە دایکم مردووەو دەبێت بچم بەسەر وەختییەوە. ئای کە ئێستا بەختەوەرم، ئەو پیاوە (دەستێکی بۆ وێنەکە درێژ کرد) خەونی بەم ڕۆژەی منەوە دەدی، کەچی پێش ئەوەی خەونەکەی بێتەدی بەهۆی تۆزی ئاسناوی و ئەلەمنیۆماوییەوە تووشی نەخۆشیی شێرپەنجەی سی بوو پاش ماوەیەکی کورت کوشتی. من و ئەو چل و یەک ساڵ پێکەوە ئالێرەدا لەو ژووری کارکردنەدا کارمان کرد، ئەو هەمیشە خەونی بەوەوە دەدی، کە کەی بچێتە خانەی پیرانەوە؟.

ئێستا تێگەیشتی، کە بۆچی و چەند بەختەوەرم، بەڵام ڕەنگە چل و پێنج ساڵم بوێت بۆ ئەوەی ڕابێم بەیانییان درەنگ بێدار ببمەوە!



١- شینکن der Schinken
گۆشتی لارانی بەرازی دووکەڵ دراو.

# ئازراندن



عسمەت محەمەد بەدەل
(دهۆک)

ئاڤریێن وی یێن جادویی جیهانا نەهشیا وێ سمتبوون و، نەحەویانەک تێدا ئازراندبوو،دەمێ پشت بدوماهی هاتنا ئاهەنگا بووک ڤەگەهاستنێ دگەل ئەندامێن دی یێن خێزانێ ب ترۆمبێلا تی یێ وێ ڤەدگەڕیانە مال. لەشێ وێ هێشتا د خاڤیا پێکڤەنووسیانا مل و دەستێ وێ دگەل مل و دەستێ وی دا ل گەرمە دیلانا بەر دەنگێ موزیکا پر دەنگ و دورا ئاهەنگێ بەنگ ببوو. ترومبێل لە بەر دەرێ مالا وان راوەستیا، هەموو ژێ پەیابوون و قەستا ژوورکرن، وێ ب لەز بەرێ خوە دا ژوورا خوەیا ڤالا ژ تێهنێ، دەر ل پشت خوەگرت و پشتا خوە پێڤە پان کر، چاڤێن خوە دانانە سەرێک و شداندن، پێکول کر د خەیالا خوەدا درێژیێ بدەتە وێ رەوشا شرین و خوەشا بەری بێهنەکێ تێدا دژیا، بەلکو گرێ دژوارێ لەشێ وێ یێ هێشتا تەڕ گرتی سار نەبیت، هەموو هزرا خوە ئێخستە سەر وی لەشێ هندە سالە گیانێ وێ تێدا زیندانکری، ژ هەر حەز کرنەکا مێینیا خوەرستی بێ بەهر. دەمەکی چاڤێن خوە ڤەکرن ئێکراست ب وێنێ وێ یێ بووکینیێ دگەل هەڤژینێ وێ کەفتن، لێ نێزیک بوو و هوور هێڤکرێ، جارەکا دی چاڤێن خوە نقاندنەڤەو بیرا خوە ل وان گاڤا ئینا دەمێ ددرێژە شەڤێن زڤستانێ یێن تێر باران دا، لەشێن وا مینا دوو مارێن ل هەڤ ئاشق خوە تێک دئالاندن، دناڤ لەشێ هەڤ دودا دبوهژین و هەڤدوڤین دکرن لێ لەشێ وێ چ بەرسڤدان بۆ وان بیرئانینان نەدکر، وان دوو چاڤێن ب نێرینێن خوەیێن خەونکی دکارین د تاریاتیا چاڤێن وێ یێن نقیایدا زل بن و بهێلنە دوێ خوەشیا تێدا، پێ حەسیا خاڤیەک شرین ب سەر سینگێ وێ دا دهێت، ل خوە زڤری و ل هەمبەر خودیکا مێزتەوالێتێ راوەستیا، دەست هاڤێت گرێکا لەونەدیێ و مەیکا فیستانێ زیتونی ڤەکرن، جلکێن خوە ژبەر خوەکرن، دەستێ وێ یێ راستێ بێی وێ هێدی هێدی خوە ڤەدزی و بلندبوو سینگێ ژ مێژ وەرە نەهاتیە هەنگافتن، ل دور خوە زڤری وهێڤ کرە لەشێ خوەیێ تێر عشق و ژیان و تێهنیاتی و خەریبی، ل بەر خودیکێ رونشت و دێمێ خوە یێ گەشاتیا جاران تێدا کزبووی، پرچا خوەیا هندەک موێێن سپی دناڤدا د تەیسن مێزەکرن، هزرکر هەروەکو وێ رۆژێ خەون رۆژکێن وێ یێن ژێ بێزار بووی ببوونە ڕاستی، دناڤ دەنگێ موزیک و سترانێن ئاهەنگێ دا نقوم ببوو، دیلان ژ دل شاراندبوو. مینا سۆفیێن دزکریدا د حال دچن لێ هاتبوو، دەمێ ژ خافلەتیڤە چاڤێن وێ ب دو چاڤان کەفتین ل ئالیێ دیێ دیلانێ ب نێرینەکا نەهێسایی هێڤ دکەنێ، تەزیلانکەکا خاڤ ب لەشیدا هات، هژیان و خوەهلاڤێتنا پارچێن لەشێ وێ تەژی دگەل سەلیقا سترانێ پیچەکێ تێکچوو، لێ بەرێ شەپلینا وێ خویا ببیت و هەڤالا وێ یا ل دەستێ وێ یێ چەپێ تێبینت دەر، خورتی ل خوەکر دا بڤەگەڕت سەر حەمدێ خوە، لێ نەکاری وەکو بەرێ دیلانێ بشارینت، وان ئاڤریێن پڕی رامان گیانێ وی داگیرکربوو، هزرکر ئەڤ نێرینە گازیێن دژوارن ژ جیهانێن نەدیار د گوهی دا دەنگڤەددەن، هێزەکا ئەفسانەیی وێ پالددەت دیلانێ بەردت و بێی هزرێ بۆ کەسێ بکت قەست کەتێ، پێکڤە سەمایەکا هۆڤانە بکن، پاشی دەستێن خوە دبن کەفشێن وی را ببەت، ب سینگێ خوەڤە بشدینت و پێکڤە نووسیای ل بەرچاڤێن هەموان بگەڤزنە نیڤا خەلەکا بەرفرەها دیلانێ.

«هەرودکی ئەڤ چاڤێن هە نە دغەریبن، من دیتینە، دگەلدا ژیایمە،

دناڤ ئەسمانێ وا دا بەرزە بوویە ما دبت ئەڤە ئەو لاوە بت یێ ل دەمێ هێشتا ئەم سنێلە، هەیامەکە خوەش ب میهڤانداری هاتیە تاخێ مە، دەمێ ل وێ ئێڤاریا هاڤینی من ل سەر بانی نڤینێ ددانان و من ل سەر جادێ دیتی، هنگی ژی هەر ب ڤێ دژواریێ هێڤ دکرە من دەما من ژی ب گرنژین بەرسڤا وی ددا، رووینێ وێ ژ شەرمادا سۆر دبوون، سەرێ خۆ شۆردکر وپیاساخۆ ب هەڤالان رە تمام دکر، پاشی ژی هەڤدیتنێن مەیێن دوور دووبارە دبوون،دبوون ژڤان و سوحبەت وسۆز، تا رۆژەکێ بێی خاتر خواستن بەرزەبووی، ما دبیت ئەڤە ئەو بیت؟ ب راست چاڤێن ڤێ ژی مینا یێن وی د هنگڤینە».

- تە خێرە تۆ وەسا سست بووی؟

- ئەز واستیام، بەسە دا بەردەین.

- راوەستە جارێ، ئەڤە بووک و زاڤا ئینان داوەتێ.

پاشی دیلان بۆشتر لێ هات، گەرمتر لێ هات، کەس و کارێن زاڤای ل پێشیا وی و بووکێ سەمایەکا گەرم دکرن، دناڤ وێ حەشامەتێدا جارەکا دی سەرێ خوە بلند کرەڤە دا نێرینەکێ ل وان دوو چاڤێن جادویی بکەت، بەلکو سەر هلبیت، ئەڤە کی یە ڤێ شەڤا بەهاری رەوشا وێ یا دەروونی دشلقینت؟ ڤەدکێشت جیهانەکا ژ جە و دەما رەهاکری، لێ هندی چاڤێن خوە گێران دناڤ داوەتیادا بەرزە ببوو، بو کەسەرەک مەزن ددلی دا و ترسیا نەبینتەڤە. وێ گاڤێ خوە دیت سنێلەکا ژ نوو گەهشتی، دلتەڕ، پاش دەمەکی هەڤژینێ وێ یێ ئەڤە چەند سالەکە ژێ دوور هاتە پێش چاڤان یێ ل وەلاتەکی هەمی تشت تێدا دەستووردای د هەمبێزا ژنەکێ دا، ژ هەر گرێدانەکێ هاتیە ئازاکرن.

«من ئەڤرۆ خێرە وەسا خوە ژبیرڤە دبم، چ تشتا بۆ خوە ناکەمە خەم، ب دوی حەزا دلێ خوە دکەڤم؟».

دەمەکێ پێ حەسیا دەستێ وێ یێ راستێ ب نەرمی یێ دهێتە گڤاشتن، دملدەست لێ زڤری کانێ ئەڤە کی یە ژ نوو هاتیە دەستی، ڤەجنقی دەمێ چاڤێن وێ ب وا هەردوو چاڤان کەفتینەڤە، تنێ بهۆستەکێ ژێک ددوورن:

-هەیلا ل منێ، ئەڤە ڤی کەنگی خوە گەهاندە ڤێرێ!؟.

دەستێ وێ وەکو سڤیانکەکا د ئاڤێ هلاندی خوە دناڤ دەستێ وی مراندبوو، جارجار ژی پانیا دەستێ وی ب پانیا دەستێ وێ ڤە دهاتە هوسین، هەردوو لەش دناڤ گەرما ئاواز وستران ودیلانێ دا پێکڤە د حەلیان، لەشێ وێ یێ مینا ئاخەکا هەموو بوویە کەلشتە ژ هشکاتیێ دبوو گۆڕیەک ئاگری، دخفویریا، لێ دزڤری ب ئاڤرێێن خوە یێن پری مێیاتی چاڤێن وی مێزە دکرن، مەست دکرن، د هێلانە دناڤ گێژەڤانکەکا بێ دوماهی دا، دیلان د بوو یار گوزەل، گەرم دبوو، هەر کۆمەکێ جودا بو خوە خەلەکەکا دیلانێ گرێدابوو، هەموو کەفتن دناڤ مەستیەکا نەهشیێ دا، دەمەکی پی حەسیا سینگێ وێ یێ دهێتە گەستن، تەزیلانکەکا شرین هەموو گیانێ وێ گرت، و دەما دیلان ب دوماهی دهات، هندی چاڤێن خوە ل دەوروبەرێ خوە دگێران، وەکی ئەجنیا چ شوونواری ژی ل دوی خوە نەهێلابوون.

ژ پێش خودیکێ رابووڤە، بەر ب تەختێ خوەیێ دوو مێرە چوو، خوە ل سەر پشتستانکر، هەتا خەوێ کێشایە ناڤ جیهانا خوە ژی، هێشتا ئەو دو چاڤە ژ خەیالا وێ بەرزە نەببوون و درژد بوون د خەونێ دا لێ بن مێڤان.. ❖

**تیرمەها ۲۰۰۱ێ دهوک**



# بەسەر دڕکەوە



ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی
(سلێمانی)

دەستەکانی بەرزکردەوەو ملکەچ و داماو، بەو پەڕی لەخۆبوردەییەوە، ملی بەلارەوە نا، بەرەو ژوور ڕوانی و کەوتە پاڕانەوە.. بەکوڵ؛ لەوەی کە دوارۆژو کۆتایی هۆر بۆ خۆیەتی و حوکم و یاساکان هەر لە لای ئەو دەمێننەوە.

فێنکاییەک بە دڵی زامداریدا هات و وەک ڕووناکاییەک تەنکە شەپۆلێکی بزە بەسەر ڕوویدا هات و کەوتەوە یادی کە (هەقی بزنی بێ شاخ بەسەر شاخدارەوە ناهێڵێ)و هەر کەس هەقی خۆی وەردەگرێ.

(لە پیکاسۆیان پرسی خوا چییە؟ وتی خوا ئەوەیە کە سمۆرەش و فیلیشی دروست کردووە، بە هەر یەکەشیان جێ و ڕێی خۆیانی داونەتێ.)

کە هونەرمەندەکە ئاخر جگەرەی بەبادا، هەر بە توتیی دەرپێیەک خۆی بە ژێر بە تانیەکەدا کردو ڕاست و چەپ سەرینەکەی لەژێر سەریدا گرت و چۆوە دنیای پڕ لە ڕەنگ و ئەفسووناویی ئەو تابلۆیەی هێڵە سەرەکییەکانی هێشتا نەکێشا بوو....نا، بگرە پارچە خامەکەشی بە چوارچێوەکەدا دانەکوتابوو، بەڵام لەسەرەوە بۆ ئەو سەر دیمەنەکانی لە ئەندێشەدا دەهێناوەبردو خۆی وەک (خەلیفەی بە خەیاڵ) لە ناو دیمەنەکاندا دەهات و دەچوو.. بزەو تووڕەیی و وادەی بێ بارمتەی بەم و بەو دا دابەش دەکرد.

(بەرەڵلایەک بوو، ڕامبۆیان پێدەوت)، خۆ تەمەن ڕیی ئەوەی نەدا ڕووکاری خۆی بەدی کات و سەری داوە دەرزوویەک، لەو ئاڵۆسکاوانەی ناو هەست و نەستی بدۆزێتەوەو کشتەکی توندو قایمی ژیانیان لێ بادات. ئەو بەو تەمەنە کورتەیەوە تەنیا شێوەی شتەکانی دەستنیشان دەکردو- ڕەنگە گەرمەکانی- دیاری کرد.

بەڵام ئەم : (سەرگەردانێکە، ..؟..ی پێدەڵێن)، کشتەکی تەمەن بە پەنجە توتەی قاچی ڕاستییەوە گرێ دراوەو لەگەڵ هەنگاوەکانیدا بەردەوام کێشی دەکات.

ئەی کەڵملی چاو بەڵەک
ئەی ئەستێرە ئەسرەوتەکە
تا بەرەبەیان
ئەی ئافرەتە بێ دەنگەکەی:
ڕابوردووت دەسخست و
داهاتوشت دۆڕان
دەم و لێوت، گەردن و باسک و قەدت
هەمووی، وەک ئەم سەردەمە
هەرزانفرۆش کرد.. بۆ خۆیان

لە نێو تیشک و چڵ و لاسک و گەڵا یەک ڕەنگەکاندا، لەسەر شانۆ بەرزەکەی دەیڕوانی بەسەر ئەوانەی بت ئاسا تەماشایان دەکرد: ڕامبۆو لۆرکای تەریق دەکردەوە، هەزار پەڵی بە دوی ئەزرا پاوندا دەدا.

* * *

زنجیرە وردەکەی لاتەنیشتی ڕاکێشاو دوگمەی سەرەوەی کراسەکەی داخستەوەو دەستێکی بەسەرو قژیدا هێنا. دوایی جانتا ڕەشەکەی کردەوەو لە ئاوێنە بچووکەکەی ناوی ڕوانی. لێوی برد بە ناواو ددانەکانی سەرەوەی توند پیا هێنا.. قەڵەمە ڕەشەکەی بە وریایی بەمسەرو ئەوسەری قنچکی چاوی کەژاڵیدا هێنا...

لەوەی بەرامبەری مۆڕ بۆوەو.. بەر لەوەی بیڵێ، گورج ئەو چاویلکەکەی دانایەوەو وتی:

-تۆ... منیش نەبم، بەو قەڵەمەی دەستت...!!

گورج پێی بری و پیا هەڵشاخا:

-حەددت نەبێ، (ئەموستی بۆ دیمەنی ڕایەڵەی سەتەلایتەکە درێژ کردو): ئەمڕۆ نەبێ تۆو مەیموونی سەر ئەو کورسییە لەیەک کەمترە؟ قەڵەمە نووک ڕەشە چەورەکەشی هاویشتێ.

- ژن، ئامێرێکی ئازاردانی خۆشن..

ساردو تیژو دەم گەرم.
-وتم حەددت نەبێ.
جانتاکەی لە شان ناو شەققەی درگەی ژوورەکەی لە دووی خۆیەوە بۆ بەجێ هێشت.

* * *

لە دیدارێکی ڕۆژنامەییدا لێیان پرسی:
- جەنابت، بە حوکمی ئەم هەموو پەپوولانەی وان بەدەورتەوە، بیرت لەوە نەکردۆتەوە کە هەڵبەستێ یا چیرۆکێ یا با بڵێین ژنێکی قورس و گران، لەوەی لێت یاخی بووبێ و بۆت نەهاتبێتە دەست... بکێشی؟
-گرنگ لەوەدایە وشەکان بەدەستمەوە نەلەرزن. دیمەنەکان بچووک نەبنەوەو وایان لێنەیەت بەکونی دەرزییەکەوە نەچن، سەردانەواندن و ملکەچی تێدا نەبێ...
- بۆکێ؟!
- بۆ...بۆ... مەبەستت چییە؟
- ملکەچی و سەردانەواندنەکە؟
- بۆ ئەوەی لە کارە هونەرییەکەمدایە.
- فەرموو، بەردەوام بە.
- چاوە ڕەش و بەڵەکەکان نەخەمە سەر شلکەی ڕانەکانی و گوڵە پەمەییەکەش لەسەر سنگی دانەنێم، هەر شتەو لە جێی خۆی.
- بە پێی پسپۆری...
- ئا، بەڵێ..
دوای کەمێ بێدەنگی!
- دەزانی هەڵەوەریت، گاڵدەم بە شەق بتکەنە دەرەوە.
ئەو هیچی نەوت، لەوە زیاتر قەڵەم و کاغەزەکانی پێچایەوەو لەشی دەلەرزی..دوایی:
- گەورەم، سەغڵەت مەبە، سەغلەت مەبە.
(ناهەقی نەبوو، نان براو دەبوو)

* * *

هونەرمەندەکە هەر بە خەیاڵی جوانیی ناو تابلۆکەیەوە، لە پرخەی خەودا بوو، ناوە ناوە شنەی بزەیەک دەم و لێو و سمێڵە تەنکەکەی دەبزواند؛ لەوانەیە خەونە خۆشەکان بن ئاوا سەر بکەن و جارجار لەوێوە کوکوختێ ئاسا بدەن لە شەققەی باڵ.
کە بەیانی دایکی نان و ماست و چایەکەی بۆ دانا، ئەو سەرنجی لەو لەتە ڕۆژنامە کۆنە دەدا کە نانەکەی لەسەر بوو؛ شیعری شاعیرێکی بێزار... بۆ خۆی و بۆ شارێک دەگریا.
دیسانەوە چۆوە بیرو ئەندێشە پاکە ڕۆحییەکەی، لەوێوە بە ئاسمانەکاندا وێڵ بوو بە دووی ئەو پانتاییە بچووکەی ساتێ لەسەری بگیرسێتەوەو چێژی حەواندنەوەیەکی دەروێشانەی لێ بکات...

**تابی ٢٠٠١**

# خەونی ئەو کیژانەی لە خۆر دزران



**ئەحمەد قادر سەعید**
**(سلێمانی)**

هەر جارێ کە تەنیایی، بەردەم پەنجەرەکەی بۆ دەکردە ڕوانگەی نیگا دوارەکانی، ئاوا لەگەڵ خۆیدا دەدوا:

«من لەناو دەروونی گەردوونێکی سەردا دۆزراومەتەوە، لە ناخمدا نهێنییەکی شاردراوەم هەڵگرتووە، گەلێک سبەینان، بوومەلێڵ دەدەم بە کۆڵمداو بەدەم شنەبای نشێوانەوە، وەک باڵندەی دڵ پڕ لە خۆزگە، باڵەکانم والا دەکەم و بە پێدەشتاندا دێم..دێم و بەرەو بەندەنان بەرزدەبمەوە، زۆر نابات دەگەمە بڵندایی ترۆپکی چیای ئاوات تێکەڵ بەجەستەی باڵانمای شەماڵ دەبم..لەو ڕێڕەوی بەرزبوونەوەو تێکەڵ بوونەدا، دەیان دەرگای نهێنی لەبەرامبەر گیانی سرکم والا دەبن، کامێرای چاوەکانم دەکرێتەوەو وێنەی سەدان لەو دیمەنە نامۆیانە دەگرێت کە ئەو بروسکەکاتەدا بەرەو ڕووی دێن، وێنەکان دەگرێت و لەناو ئەلبوومی هەستە تەریوەکاندا هەڵیاندەگرێت، هەر دوای ئەوە هەست دەکەم وردە وردە شێ دەبمەوەو دەگۆڕێم بەو دڵۆپە ئاونگانەی بەر لەهەڵاتنی خۆر، بەسەر دەشتی فەرشی نێرگزە جاڕی سەرەتای بەهاردا دادەبارێن، من و شەماڵ و شێ دەبینە هەوێنی لەنجەی باڵای نێرگزو لەو نمایشی خۆنواندنەدا، لەگەڵ تاڵە زێڕینەکانی خۆردا، خەندەیەکی ناسک بۆ سروشت دەکەینە دیاری..»

وەک چۆلەکەیەکی هێلانە لێ ونبوو، سەری بەسەر کۆشی خۆیدا بەردابۆوە، تینی خۆری ئەو چێشتەنگاوەی کەمێک گەرمای زاندبووە گیانییەوە، دەرگای ئەو پرسیارانەی لە بەرامبەردا ئاوەڵەدەکردەوە کە سەرەتاکەیان بۆ پازدە ساڵ بەر لەوکاتە دەگەڕایەوە. «بژیان» ئێستا تەمەنی پازدە ساڵە، پازدە بەهار لێرەوپێش ئەو لە هەناوی دایکیدا گۆشتپارەیەکی بێگیان بووەوە، یەکەم چەکوشی ئەو پرسیارە ئاڵۆزەی سەری هێنایە ژان و لە گێژاوی گوماندا لوولی دا، کچە هاوەڵەکەی بەسەریدا کێشا. ئەو لەوساتە وەختەدا، نەیدەزانی هەموو پرسیارێک وەڵامێکی خۆی هەیە، لەبەر ئەوە کە بەگوێیدا چرپاند: «دەزانی تۆکچی کێی و باوانت لە کوێن؟» لە دەروازەی هیچ وەڵامێکی نەدا.. کەچی زۆری نەخایاند، پرسیار بوو بەڕووبارێکی کەف چەڕێن و خستییە بەردەم شەپۆلە سەرشێتەکانی و هەر زوو لە خۆیاندا لوولیان دا، بە جۆرێک هەژاندیان تا چاوی لێلایی بەسەر داهات و لە هۆش خۆی چوو، ئەو کاتەی هۆشی بەبەردا هاتەوە، خۆی لەسەر ڕۆخی دەریایەکی تاچاو بڕکات فراواندا بینی..پانتاییەکی فراوانی گومان ئامێری بۆ کردەوە، لەوەدا بوو ها ئێستا یان تاوێکی دی داخزێ و لەناخی خۆلەبیرچوونەوەدا بزربێ و بخنکێ. کە لەسەرەخۆ هاتەوە بەردەم ئاوێنەی بینینی ڕاستییەکان، بەخۆیدا هاتەوە. نیگای ئاراستەی باڵای پرسیارەکە کرد کە تا دەهات لەبەر دیدەیدا وەک دارچنار باڵای دەکرد، دەستی خستە ناو پرچە ڕەش و ئاڵۆزەکانی و سەرنجی لە باڵای چناری پرسیارەکاندا چڕ کردەوە.

«بژیان» بەرلەوەی وەڵامی هیچ

پرسیارێک بداتەوە، دەبێ بۆ سەرەداوی تێکئاڵاوی کلافەی تەمەن بگەڕێ، تابتوانێ ڕایەڵەی وەڵامە سەرەکییەکە جیا بکاتەوە، سەرەتا دڵەڕاوکێی هەستە شەرمنەکانی، ئاراستەی گەڕانەکەی نیشان نەدەدا، ئەویش هەر ئەوەندەی بۆ دەکرا بەدیار حەزە تەریوەکانی دەروونییەوە کە نەیدەزانی کەی چاو هەڵدێن، دانیشێت و بە گۆلمێک خوناو ئارامییەکی کاتی بۆ خۆی پەیدا بکات و لەگەڵ دەست لە ملکردنیدا خەوی لێ بکەوێت، بەڵام لەدواجاردا بڕیاری دا، باوکی بکات بە گوێی زەمەن و لەڕێی ئەودوە سەری وەڵامە سەرداپۆشراوەکان هەڵداتەوە و تاسەی حەزەکانی ئەو هەموو ساڵانەی لە فەرامۆشیدا بەسەری بردبوون بشکێنێ و لەو دەستەوەستانییەی گیان و دەروون و بیری ڕەها بکات.

ئەو لەباوکی نزیک بۆوەو بە ئەسپایی پێی گوت:

– «بابەگیان، لە پێشەنگی ئەو پرسیارە سەر بەتەمەدا، دەبێ وەڵام بکەی بە شارێی سەرفرازی، دەبێ پەنجەرەکانی هەناسەتم بۆ بخەیتە سەرپشت تا بە ئارەزووی دڵی خۆم هەوای ئەو سینە پڕ لە سۆزەت هەڵمژم..دەبێ وەڵامم بۆ بکەیتە ئەو سەرچاوە ڕوونەی، بەردە وردیلەکانی گەمە لەگەڵ چرپەی ڕۆیشتنی دەکەن..دەبێ هەرچی زووترە دەمی وەڵامدانەوەتم بە ڕوودا بکەیتەوەو لەو شەکراوی سۆزی باوکایەتییە بێگەردەت، چەند دڵۆپێک بتکێنیە ناو ئەوکی وشک هەڵاتووم و گڕی هەناوی داگیرساوم دامرکێنیتەوە..دەی باوەگیان خۆ من ئێستا منداڵەکەی جاران نیم، ڕێی چوونە قوتابخانەم لێ تێک چێ و شەرم لە تێکەڵاوی هاوڕەڵەکانم بکەم..ئەها چۆن باڵام کردووەو چەند گەورە بووم؟»

«ڕێبوار» لەبەردەم ئەو پرسیارە چاوەڕوان نەکراوەدا، سەری سوڕما، چاوەکانی لە مۆڵەقدا وەستان..پاشی کەمێک هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا..شریتی ڕووداوەکان بوو بە بروسکەی ئازارێکی ناوەخت و هەموو گیانی تەنییەوە، سەرەتا ویستی ئازارەکان بە فەرامۆشی بسپێری و شڵەژانی ڕواژەی، بەسەر خۆی نەهێنێ، کەچی تاسەی بەزەیی پاڵی پێوەنا، تاوەکو بە قووڵی بە چاوانی «بژیان» ڕامێنێ و لە دەروونیشدا بەو جۆرە لەگەڵی بدوێ:

– «کچە شیرینەکەم: بۆ نازانی تۆ لە باخچەی پڕ لە گوڵزاری دایە «نازە»دا پەروەردە بوو وی؟ و بۆ منیش بوویە ئەو هیوایەی دەیان خۆزگە لە باوەشیدا چاو دەڕێژن؟ ئەو هاوەڵەی تۆی ناو ناوە «کچی خۆر» ڕاستدەکات، تۆ لە کچی خۆریش نەشمیلانە تری..ئەو ڕۆژەی خۆر ژانگرتی، بەهار چاوی ئەویندارى بەڕووی سروشتی بژوێندا هەڵنەهێنابوو و گۆنای ئاسۆ دەمێک بوو لە دەمی ڕامووسانی سبەینان بێبەشکرا بوو. لەوکاتەدا تۆی مەلۆتکە لە ناوهەگبەی سەفەری خۆردا بووی بە تۆێشەبەرەی سەردەم و وەک جوانترین خەڵات بە من بەخشرای.

ڕەنگە بڵێی بابە ئەوە لەدایکبوونێکی ئاسایی بوو یان منیش وێنەیەکی تڵخی تری تاوانەکانی زەمەن بووم و تۆی دڵنەرم دەستی ئەو تاوانەت بڕیوەو وەکو فریشتە بەهانامەوە هاتی؟

– «دەی بابەگیان.. هانام بۆ تۆ هێناوە، بامن کچی خۆریش بم..بەڵام» وشەی «بەڵام» بوو بەو حەسرەتەی چاوی بە ڕێبوار نووقاند، خستییە ناو تاریکییەکی شەوە زەنگ ئاسوە،



خوناوی تاسبردنەوە ڕژایە ناو قەپێلکی چاوانی و سەرەڕێژی کردن، زۆری نەمابوو بداتە پرمەی گریانێکی بە کوڵ..ڕەنگی سوور هەڵگەڕا، بەجۆرێک پەنجەی بەر بکەوتایە خوێن لەسەر گۆناکانی فیچقەی دەکرد، بۆ خۆشی نەیزانی چۆن وا لەناکاو داخزایەوە ناو ڕووداوەکانی پازدە ساڵ لێرەوپێش. لەدیدەیدا گۆمی داخزانەکە شڵەقا.. هاژەی کرد، بوو بەرووبارێکی خوڕی شەپۆل هاوێژ، ڕووبار هەستاو بوو بە لافاو، ئەو وەک لەش پەلی دەکوتاو دەیویست لەو گێژاوە خۆی قوتار بکات، کەچی بەرۆح گیرۆدەی کارەساتێکی کردەوە کە دەمێک بوو لەیادەوەرییەکانیدا خامۆش ببوو..یادەوەری کارەساتێکی دێرین لەو دەمەدا، ڕێی چوونە ناو گەلێک لە باسەکانی دیکەی کردەوەو ئاوا دەروونی بۆ خودی خۆی خستەسەر پشت:

- «بژیان ڕاست دەکات، ئەو ڕۆژە کە خۆر ئەوی کردە دیاری سروشتی ژاکاو و لە ئامێزی مندا جێی بۆ کردەوە، ڕۆژێکی سەخت و دژوار بوو..هەر شیرینی ئەو دیارییەیە وای لەمن کردووە، نەتوانم چاوی ئەو حەزانەی پێ بپشکوێنم کە ئەمڕۆ ئەو بە دوایدا وێڵە..بژیان خان دەمویست ئەو خۆزگانە لەگەڵ خاکدا ئاوێتە بکەم، نەکا ڕۆژێک هەستی کیژایەتیت برووشێنم و چێژی شیرینی هاتنی تۆم لەدەمدا تفت بێ و تاڵی ڕۆژەکەشم لێ ببێتە تاڵی سەرە مەرگ، خۆ زامەکانی لەشی شیرینی هاوەڵیشت هێندە کەم سوێ نین، وا تۆی خستۆتە سەر کەڵکەڵەی ئاگادار بوون..شیرینیش ناهەقی نییە، چونکە ئەویش سۆمای تکاوی کارەساتێکی نامۆیە کە ڕێکەوت لە هەناویدا پاراستی و کەچی بێ خواستی خۆی، کرایە پەپوولەی دەم ڕەشەبایەکی سەرشێت و سێبەری ژێر دەواری ژیانی باوانی پێ ڕەوا نەبینی..»

- «بابەگیان.. چاو هەڵێنەو لەدیدی پرسیارە سەرسوڕماوەکەم بۆم بڕوانە با کەمێک ئارامی بزێتە ناو دەروونی لەهەست تۆراوم..دەمەوێ بزانم من لەکەیەوە کچی خۆرم..هەرمن یان ئارامی براشم کوڕی خۆرە؟ دەشێت ئێمە هەردووکمان لە هەناوی ئەو کەوتبینەوە؟».

هیچ جارێک ڕێبوار بەو شێوەیە تەنگەتاو نەکرابوو وابۆ پازدە ساڵ دەچێت لە کوانووی بیریدا ژیلەمۆی ڕووداوێکی خەفەکراوی شاردۆتەوە، کەچی ئەو جارەیان لە بری ڕووداوێک دەیان ڕووداو بەردەرگای پێگرتووەو دەشبێ بەهانای هەموویانەوە بچێت. هەر لەوکاتەدا کە کفنی حەشری دەشتی ئەو مەحشەرەی کرایەوە بە بەردا، گەڕایەوە بەردەم تاکە نەخۆشخانەکەی شارەکەیان:

«چێشتەنگاوێکی درەنگ وەخت، جەنجاڵی حەشاماتێکی زۆر ئەو ناوەی تەنی بوو..هەرچیت دەدی گۆڕمی لەپێیەکانی دەخواست و خۆی دەکرد بە گۆڕەپانی نەخۆشخانەکەداو لە شوێنێک خاوی بەسەردا دەهات و ئارامی دەگرت و ڕادەوەستا لەوکاتەدا گۆڕەپانی نەخۆشخانەکە ببوو بە گۆڕستانێکی بەرین، کەس جوولەی بۆ نەدەکرا، هەموو وەک پەیکەری بەرد بن و لەوێ دانرابن وا بوون، خۆ ئەگەر جارێک پەیکەرێک جوولەی کردبا، ئەو نیگای ڕووەو ئاسمان بەرزدەکردەوەو بەدوای ئەو نهێنییەدا دەگەڕا کەکەس نەیدەزانی لە چ جێیەک خۆی حەشارداوە. ئەویش وەک سەرجەمی ئەو حەشاماتە بێ جووڵە کە لەتەک «سامان»ی هاوەڵیدا وەستاو بە دیققەتەوە کەوتە تێڕامانی دوا نیگای هەمووان و لەگەڵ جەنجاڵییەکەشدا چاوەکانی هاتوچۆی دەکرد، تا چاکتر تێڕامانەکانی سەقامگیر دەبوون، قووڵتر شۆڕدەبووەوە ناو قووڵایی ڕووداوەکان، بەجۆرێک لەو دەریای مەلەی تێڕامانەدا ڕۆچوو، بەتەواوی بیری پەرت بوو، هەستی کرد ئەوا پێیەکانی شل بوون و ئەژنۆکانی وەک مێژووک دەستیان بە لەرزین کرد، بەجۆرێک هەر ئەوەندەی بۆ کرا، دەستەو دامێنی پشتێنی سامان بێ نەوەکو بەدەمدا بکەوێ.

مێکرۆفۆنی ناو نەخۆشخانەکە، بانگەوازێکی تری بە گوێی مرۆڤە بە پەیکەر بووە بەردینەکانی ناو گۆڕەپانەکە ڕاگەیاند: «ئاگاداری بەڕێزانی ناو گۆڕەپان و شارە خۆشەویستەکەمان دەکەین، هەر ئێستا دە گۆڕی تازە هەڵکەنن.» ئەو خەڵکەی هەتا ئەو کاتە وەک مێخ بەزەوییەکەدا چەقی بوون، سەریان بەرزکردەوەو هەموو پێکەوە جووڵان، ناو گۆڕستانەکە جەنجاڵییەکی مەترسی ئامێز تەنی بووی. ڕێبوار هەتا ئەو کاتە حەوت دەیی تری، لە بانگەوازی گەرووی مێکرۆفۆنەکە ژمارد بوو، بەهۆی هوروژمی خەڵکە داخ لە دڵەکان و قاوقیژی ژنانی حەسرەت خواردوو، هەستایەوە سەرپێ. لەوکاتەدا مێکرۆفۆنەکە بانگەوازێکی تری ڕاگەیاند:

-«ساوایەکی نەشمیلانەی جوانە، تەمەنی زۆر لە ساڵێک کەمتر، هەر ئێستا لەو هەڵوەرینی گەڵای ژیانەدا، دایکی کەوتە دووی کاروان. ساواکە دەم بۆ گۆی مەمکی دایکی دەگێڕێ، هەر کەسێک دەتوانێ ئەو ساوایە لە کاروان بەجێماوە، بەرەو مەنزڵگای سۆز بەرێ و باڵی باوکایەتی بۆ بکاتەوە، ڕێی بۆ چۆڵ بکەن بابێتە پێشەوە، با خۆیمان پێ بناسێنێ..»

ڕێبوار خۆی ڕاپسکاند، سەرەگێژەی لە بیرچۆوە، دری بە حەشاماتەکە دا، شەپۆلی جەنجاڵییەکەی وەک

مەلەوانێکی کارامە بڕی، ڕانەوەستا هەتا خۆی گەیاندە بەردەم ساوایەکی پێچراوە، سەری بەردایەوە، ئەوجا کەم کەمە نووشتایەوەو لەسەر چیچکان دانیشت، مەلۆتکەکەی هەڵگرت و کردییە باوەشی و لە دواییدا هێدی هێدی بە ناو ڕەشایی چارشێوی ژناندا هات، بێ ئەوەی چاو لە تەوێڵی فریشتەیی بتروکێنێ، بەسنگی خۆیەوە نووساند، لە چاولێکردنێکا کە هوورژمی فرۆکە ژیان ئەستێنەکان، لەسەر پەردەی بینینی ساواکە دەبینران، هەموو شتێکی بۆ ئاشکرا بوو، فرمێسکی چاوەکانی سەرەڕێژ بوون، دەبوو هەتا زووە ئەو دیارییە بگەیەنێتەوە ماڵێ و گۆی مەمکی دایکی میهرەبان باوێتە ناو دەمییەوە، تا جارێکی تر لە ئامێزی دایکێکی دڵ گەورەدا چاوی ئارامی بخاتەوە سەریەک و خەوی لێ بکەوێتەوە..»

-«دەی بابە ئەوە بۆچی چاوەکانت فرمێسکیان تێزاوەو خەریکە بدەیە پرمەی گریان؟ ئەوە بۆ هەر هەنیسکان دەهاوێیەوە ناو دەروونی خۆت؟ بابەگیان، لێگەڕێ با دووچاری گرفتی ناخۆش نەیەی، دەبا بێم، دەی ڕێم بدە با خووناوی چاوانت بسڕمەوە، لێم ببوورە خەمەکانتم دووچەندانە گەورەکردن و بارێکی دیکەشم هاویشتە سەر کۆی دڵتەنگییە ناوادەکەت.»

هوورژمی سەختی ڕووداوەکە هێندەی نەمابوو دەمی ڕێبوار واڵا بکات، بەڵام پێی بە جگەری خۆیدا ناو، بەچاو لە نیگاکانی «بژیان»ی دەڕوانی و لە دڵیشدا دەیگوت:

-«نا گوڵەخان..بژیانە جوانەکەم، هەر تۆ بەتەنیا کچە دزراوەکەی خۆرنی، ئەی شیرینی کچی کاکە حەمەش لەو کچانە نییە؟ ئێوە هەردووکتان لەچاوی دوو وەرزی لەیەکتر جیای شەرمندا لە دایک بوون..تۆ هەوێنی خەمێکی گەورەی نەتەوەیەکی پەراگەندەی، ئەویش سۆمای چاوی بەیانییەکی لێڵ بووە، گوێم بۆ ڕادێوە، هەر ئێستا مێژووی تراژیدیای هەنیسکەکانمت بۆ دەکەم بە ملوانکەو لە ملتی دەکەم، تابزانی ئەوە ملوانکەی گەلێکی ستەمدیدەیە..ئەوکاتەی شیرین مەلۆتکە بوو سەرەتای پاییزێکی سەروەشێن بوو، کاکە حەمە بۆکڕینی دوو تەغار گەنمی باراش لەگەڵ دوو هاوەڵیدا ئاوای ئەو دیوسنوورە دەستکردەکە بوون. زۆری نەبرد سێ وڵاغدار خۆیان کرد بە شارێکی سەر سنووردا و شەویان لێ ڕۆژکردەوە، دوو هاوەڵەکەی کاکە حەمە، بە خۆیان و باراشیان گەڕانەوە و ئەویش ئەو ڕۆژە دواکەوت و بەجێ ما.. لەڕۆژی دووەمدا ژنێکی چارشێو بەسەر لەبەردەم ماڵی خانە خوێیدا چاوەڕوانی ئەوی دەکرد، ئەو دەیزانی کاکە حەمە پیاوێکی نەناسە. کەمێک لێی نزیک بۆوە:

-«سلاو کاکە، خێرە بەو سبەینە لێرە وەستاوی؟..»

-«ئێرە ماڵی خانەخوێمەو زۆر نابات بەجێی دەهێڵم..»

-«دیارییەکی بە نرخم پێیە..بڕسێتی وام لێدەکات پێت ببەخشم..»

-«من تۆ ناناسم..دەشێ پیلانێکت لەژێر سەردابێت.»

-«پیلان نییەو ترسی ناوێ، فەرموو ئەوەش دیارییەکەیە.»

-«باشە من چی لەو ساوایە بکەم..»

-«هەرچی لێی دەکەی، بۆت هەیە..»

کاکە حەمەش گەڕایەوە، سەرباری باراشەکەی مەلۆتکەیەکی ساوا بوو، بۆیە هەر زوو هاوەڵانی دەنگداو تێی ڕاخوڕین، ئینجا ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە..

هەر سێ هاوەڵ بەرەو ئاوایی گەڕانەوە، کاکە حەمە سەرباره نەشمیلانەکەی کردە دیاری و بوو بەو دیارییە شیرینەی ناوی شیرینی بە باڵا بڕا. ئەوە ئەو شیرینەیە هەموو ئێواران لەبەرامبەر کەل ڕادەوەستێ و هەرکە مانگ سەری هێنایە دەرێ، تکای لێدەکات و لێی دەپاڕێتەوەو پێی دەڵێت:

مانگە دڵگیرەکەم، تۆ هەموو دەمان لەگەشتی بەردەوام دای، ئەگەر لەو ڕێڕەوی هاتوچوونەت چاوت بەدایکم کەوت، پێی ڕابگەیەنەو پێی بڵێ: «کچە جوانەکەت لە سویی چاوەڕوانیتدا هێندە چاوی بڕیوەتە خۆر، تا ڕەنگی خۆری لێ نیشتووەو هەموو بەیانییان لە میوانداری ئەودا چاو دەکاتەوە، ئەگەرچی ناشزانێ شێوەی ڕەنگ و ڕوخسارت چۆنە..»

ڕێبوار لەدوا وتەی «شیرین»دا چاوی هەڵێنا، خۆشی لێی ڕوون نەبوو، چۆن بەو ئاراستە ڕاستە لەبەرامبەر «بژیان»دا وەستاوە، هەر زوو بەرەو ڕووی چوو و لە دوای ماوەیەک دەستێکی بەسەریدا هێناو بەدەم بزەیەکی باوکانەوە پێی گوت: «بژیان چیدی خەم داتنەگرێ لە زووترین کاتدا هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم و ئەو چیرۆکەت بۆ دەگێڕمەوە کە تۆی واڵیکرد لە هەناوی خۆرێکی دزراودا لەدایک ببی..»..❖

# لاواندنەوەیەک بۆ ژاڵەو بکوژەکەی

ئەبو تورابی خوسرەوی
و: لە فارسییەوە: نەجیبە ئەحمەد
(سەقز)

ڕۆژنامەی (کەیهان)ی بیست و پێنجی گەلاوێژی ساڵی سی و دوو، هەواڵێکی تێدایە سەبارەت بە کوشتنی ئافرەتێک لە شەقامی جەلایر-دا بەناوی ژاڵە م. ، بەڵام ناوی بکوژ یان بکوژەکانی نەبردراوە. ئەمە بابەتی چیرۆکێکە کە نووسراوە، بەڵام هەمیشە لە شوێنە نهێنی و نادیارەکانی چیرۆکدا جۆرە ڕووداوێک لە دەرەوەی مەنتیقی چیرۆک گەڵاڵە دەبێت کە بە خستنەڕوو یان بنەڕەتی چیرۆک دەشێوێ. لەبەر ئەوەش کە ئەم چیرۆکە گێڕانەوەی شوێنە نهێنی و نەدۆزراوەکانی چیرۆکەکەیە، بۆیە کارەساتی کوشتنی ژاڵە م. بیانوویەک دەبێ بۆ نووسینی ئەو وتووێژانە یان ئەو ڕووداوە نەوتراوانەی ناو شوێنە نەدۆزراوەکانی چیرۆکەکە. هەروەکو وترا لە ڕۆژنامەی (کەیهان)دا ناوی بکوژ نەبردراوە، بەڵام گومانی تێدا نییە کە بکوژ کاووس د.-ی مولازمە کە بەپێی زانیارییەکانی ناو دۆسییەی دامەزراندنەکەی لە بنەڕەتدا کرمانی-یە و لە مانگی بەفرانباری ساڵی سی و یەکدا کۆلێژی پۆلیسی تەواو کردووە. مولازم کاووس-د. ئەفسەرێکی ئیستخباراتە(١)و ڕادەسپێردرێ کە لەبیست و یەکی گەلاوێژدا، یەکەمین ئەرکی خۆی بەجێبهێنێ، کوژراویش خاوەنی هەمان ئەو شناسنامەیەیە کە لە- کەیهان-دا بڵاوکراوەتەوە.

ئەوەشی کە دەبێ وردتر بوترێ ئەوەیە کە لە بەڵگەنامەکاندا بەم نیشانانەی لای خوارەوە ناسراوە، ژاڵە موعین- ناوی باوکی فەرامەرز- لە دایکبووی نەورۆزی (١٣١٣)، ژمارەی شناسنامە (١٥)، قوتابی ساڵی دووەمی بەشی مۆسیقا لە زانکۆی هونەرە جوانەکان. کۆپییەکی حوکمی ئەو ئەرکەی بە مولازم کاووس-د. سپێردرابوو لە لاپەڕەی سێسەدوبیست و هەشتی کتێبی مێژووی تیرۆرە سیاسییەکانی ئێران-دا هاتووە:

لە کۆمیتەی چالاکییەکانی دەزگای دووەمەوە بۆ مولازم کاووس د. ژمارەی (١٨٧/٣٢٢١)ی ف. م. بابەت ژاڵە م. بەپێی ئەو ڕاپۆرتانەی گەیشتوون، ژاڵە م. بەرپرسی ئەو کۆڕ کۆبوونەوانەی کە دژ بەئێران و بە پشتیوانی خۆفرۆشان بەڕێوە دەچێ، لە تاران دایە. بۆ کەڵک وەرگرتن ئەدەرسی ناوبراو ئاشکرا دەکەین. (شەقامی جەلایر- بینای ١١١- نهۆمی سێیەم ژمارەی ٨٧) لێپرسراوی کۆمیتەی چالاکییەکانی دەزگای دووەم سەرهەنگی دووەم مەنوچیهری پاشایی. پێدەچێ بە دەرکردنی ئەم فەرماننامەیەیە کە ئەرکی کوشتنی ژاڵە م. دەکەوێتە ئەستۆی مولازم کاووس د. ئەویش پابەند دەبێ بەوەی لە هەر جێیەکدا بێ بیکوژێ. مولازم قەت ژاڵەی نەدیتبوو. دەزگای ئیستخبارات وێنەیەکی دەخاتە بەردەستی مولازم. وێنەکە وێنەیەکی ڕوون و ئاشکرایە، سیمای ژاڵەم لە ئاساییترین شێوەدا خۆی دەنوێنێ.

دووچاوی گەش، دووبرۆی کێشراو، لۆچێکی توورەییش لەنێوان لێوەکانی و لووتە قنجەکەیدایە. خاڵێکی درشت بە قەرایی دراوێک لە خوارگوێچکەی ڕاستییەوەیە. وێنەکانی ژاڵە م. و مولازم کاووس د. کە لە کتێبی مێژووی تیرۆرە سیاسییەکاندا تۆمار کراوە بەشێوەیەکی سەیر لێک دەچن. ئەوە نەبێ کە چەناگەی کاووس د. پانترە. بۆ ناسینەوەش ئەم وێنانە بەسن. بەم وەسفانەوە ئەگەر بێتو خوێنەرانیش هاوبەشی ئەو کۆبوونەوانە بکەن کە بڕیارە لە چیرۆکەکەداو لە گۆڕەپانی

بەهارستان-دا بکرێ، ئەوا بەکەمێ لێوردبوونەوە دەیانناسنەوە. هەرچەندە مولازم کاووس د. بەو وێنەیە ژاڵە م. ناناسێتەوە. بەو جۆرەش کە مولازم بەژاڵە دەڵێ گوایە وێنەکەی خستووەتە جزدانەکەی بەر باخەڵییەوەو لەوماوە دوورودرێژانەی نێوان چەندبارە نووسینەوەی نووسراوەکاندا کە ژاڵە م. لە خەوی وەرگیرایە ئەم سەیری دەکات.

لەیەکەمین نوسخەی چیرۆکەکەدا کە مولازم کاووس د. لەگەڵ ژاڵە م.-دا ڕووبەڕوو دەبێت، بێگومان بەهۆی دیداری پێشوویان لە ڕووداوە سەرەکییەکەدا، یەکتر دەناسن. بەپێی نووسراوەکەی کەیهان بکوژ، ژاڵە م. کە ئەندامێکی چالاکی فلانە حزبە دەئانگێوێ و هەڵدێ. وا دیارە مولازم کاووس د. ئەوەندە بە پەلەپروزێ ژاڵە م. دەکوژێ کە بواری هیچ جۆرە بیرکردنەوەیەک بۆ گوێگر ناهێڵێ. لەوانەیە هۆی پەلەکردنیش لەم کوشتنەدا نەشارەزایی مولازم بووبێ لە ئەنجامدانی ئەرکەکەیدا، لەوانەشە جوانییە بێ وێنەکەی ژاڵە م. وای دەتۆقێنێ کە ناچار، دەمودەست کاردانەوەی دەبێ.

هەر جۆرێک بێ بکوژ کەسێکی بێ ئەزموون بووە، بەڵام هەروەکو دەیبینین لە دووپاتە بوونەوەی نووسینەکەدا دەگاتە کامڵبوون و کرداری کوشتن لە ئەوپەڕی دڵنیایی و ئارامیشدا ئەنجام دەداو مەودای خەیاڵکردنیش بۆ ئێمە دادەنێ. چاکتر وایە نوسخەی یەکەمی چیرۆکەکە کە لەوێدا بکوژ لەکردەوەی کوشتندا هێشتا بە پلەی کامڵبوون نەگەیشتووە، دووبارە بخوێنینەوە. هەڵبەتە ئەوانە تازە بەرەو سەرزەمینی چیرۆکەکەمان کۆچیان کردووەو هێشتا جێی خاڵی و سپیان بۆ وتوویژەکانیان نەدۆزیوەتەوە.

هەمیشە کۆبوونەوە لە بیست و سێی مانگی گوڵان و لەساڵی سی و دوو دا ڕوو دەدات. شوێنی کۆبوونەوەکە دەکرێ بگۆڕدرێ، بەڵام چاکتر وایە هەر گۆرەپانی بەهارستان بێت. بەمجۆرە کاروبارە مێژووییەکان دەپارێزرێن.

دەیان پلاکارد بەدەستی زیاتر لە دەهەزار لاوی لایەنگری حزبەوە دەشەکێتەوە، ئەو ڕێگایەشیان بەستووە کە بەرەو پەرلەمان دەچێ، پاسەوانەکان بەخۆیان و خودەی نیلی و حەیزەرانەکانی دەستییانەوە وەستاون، هەرچەند دەقیقە جارێک بەجۆرێک کشومات و بێدەنگ دەبن، دەڵێی باڵندەش لەو گۆرەپانەدا باڵ لێک نادا. دواییش گۆرەپانەکە بە شالاوێکی هاوئەهەنگی خەڵکەکە دەتەقێتەوە، مولازم کاووس د. بەرلە هەموان دێت بۆ گۆرەپانەکە. بێگومان چەکدارێشە. هەمان دەمانچەی (بێدەنگی) پێنجی بیست و سێ کە لە مێژووی تیرۆرە سیاسییەکاندا باسکراوە، لە گیرفانی چاکەتەکەیدایە. لەسەر تەختێکی بەردین، لە قەراغ باخچەکەدا دادەنیشێ. باخەوان لە باخچەکەدا دانیشتووەو خەریکی ناشتنی قەڵەمی گوڵەقەوان و مێخەکە، قژەڕەشەکەی بەدەم شنەی شەماڵەوە دەئالۆزێ. شنەی شەماڵ گەلای چنارەکانی قەراغ گۆرەپانەکە هەڵدەوەرێنێ و سپێتی و سەوزییە تێرەکەی گەلاکان لێکتردەخشێن. دوو زیل سەرباز خەریکن بە دەوری گۆرەپانەکەدا دەسووڕێنەوە. زیلەکان چادریان پێوە نییە، ڕیزی سەرباز بە خۆیان و خودە نیلییەکانیانەوە لەودیو تەختەبەندی پشتەوەی زیلەکانەوە دیارن. چەند گەنجێک قاتی ڕەشیان لەبەرەو دەگەنە ئەوێ. هەندێکیان شەپقەیان(٢) لەسەرەو هەندێکیان ڕۆژنامەیان بەدەستەوەیە. پەرە ڕۆژنامەیەک لەسەر تەختەکان ڕادەخەن و دادەنیشن.

لەگەڵ هەر شەپۆلێکی ژاوەژاوەکەدا کاربەدەستان دوو هەنگاو دێنە پێشەوەو حەیزەرانەکانیان ڕادەوەشێنن. فۆردێکی ڕەش، سێ پیاوو ژنێکی تێدایەو لەبەری ڕۆژهەڵاتی گۆرەپانەکەدا وەستاوە. شۆخ و شەنگی ژاڵە م. دەبێتە هۆی ئەوەی زوو بناسرێتەوە. پێدەچێ ئەوەندەی شێفتەو ئەبڵەقی جوانییەکەی بووە. ئەوەندە دڵخۆشی دووبارە بینینەوەی نەبووە. ژاڵە م.-یش لەناو خەڵکەکەدا ئەو دەدۆزێتەوە.

گەنجێک لە فۆردە ڕەشەکە دادەبەزێ، ئالای سوورو سپی حزب بەرز دەکاتەوە. بە بۆنیتی فۆردەکەدا دەچێتە سەرێ و لەسەر ئۆتۆمبیلەکە ڕادەوەستێ و ئالاکە دەشەکێنێ و هەور ئاسا دەگرمێنێ، سروودی حزب. بیناکانی دەوروبەر لەناڵەی سروودەکە دەلەرێنەوە. سروودەکە چەند جارێک دووبارە دەبێتەوە. پیاوێکی تریش لە بۆنیتی فۆردەکەوە دەچێتە سەرێ، لەسەر فۆردەکە ڕادەوەستێ و هاوار دەکا: من ڕێک و ڕاست دەڵێم کاربەدەستان پێچەوانەی یاسا تەقەلە خەڵکی بێ گوناح دەکەن، ئەگەر ئەم بارودۆخە بەردەوام بێت کەس ناتوانێ ئەزمو یاسا بەرقەرار بکا. جەماوەرەکە هوڕای بۆ دەکێشن، پیاوەکە بەردەوام دەبێ. دەستەکانی بەرز دەکاتەوە.

فۆردەکە دەکەوێتە کار، مولازم بەرەو لای خوارووی گۆرەپانەکە دەڕوا، سواری ماتۆڕەکەی دەبێ و بەلاڕێیەکاندا بەرەو شەقامی جەلایر دەچێ. لەپشت دار چنارەکان، لە جێیەکی نزیک بینای (١١١) دەوەستێ و چاوەڕێ دەکات. ئیتر خەریکە خۆرئاوادەبێ. چرای سەرشەقامەکان دایسێن. سەعاتێک لە کۆبوونەوە تێپەڕیوەو ژاڵە م. هێشتا نەگەیشتووە. شەماڵی فێنکی ئێوارە هەڵدەکا. ئۆتۆمبیلێک لەوسەری شەقامەکەوە دێت. چراکانی ڕووناکاییەکی سەیریان هەیە. لەبەردەم بینای (١١١)دا دەوەستێ. مولازم

کاووس د. لە پشت درەختەکانەوە پێ هەڵدەگرێ. ژالە م. لە ئۆتۆمبیلەکە دادەبەزێ. چاو بەسێبەرە ڕووناکاکاندا دەگێڕێ. بە پلیکانەکانی بیناکەدا سەردەکەوێ فۆردەکە دەکەوێتە کار، مولازم کاووس د. لە ناوەڕاستی ڕاڕەوەکەدا وەستاو لەبەر ڕووناکاییە سپییەکەی چراچوارگۆشەکانی بنمیچەکەدا ژالە م. دەبینێ.

ژالە م. دەڵێ: «بە شوێنتاندا گەڕام.»

مولازم دەڵێ: «دەبینی کە هاتووم»

ژالە م. بە چۆکدا دێت، مولازم بەرامبەری دەوەستێ و سێ جار لەسەریەک تەققە لەناوەڕاستی تیشکە لوولەکانی قژی دەکات.

ئەم سەردەمی ئاشنابوونە یان، کاتی ڕوودانی کارەساتە ڕاستەقینەکە بووە کە مولازم چەناگەی ژالە م. هەڵدەبڕێ و دەپرسێ: «تۆ ژالە موعین-یت؟ خۆ بە هەڵەدا نەچووم؟» ژالە سەیرێکی دەموچاوی مولازم دەکات و دەڵێ: «بە هەڵەدا نەچوویت، من ژالە موعینم.» ئینجا پێڵووەکانی لێک دەنێ و دەمرێ، بەڵام ئەمجارەیان کە مولازم چەناگەی ژالە هەڵدەبڕێ، ژالە دەڵێ: «جەنابت هەمیشە پەلە دەکەیت، لە هاتندا، لە کوشتندا، بواری هیچ کارێک نامێنێ.

ئەمە دووەمین جارە کە مولازم کاووس د. پەنجە بەناو خەرمانەی قژە ئاڵتوونییەکەی ژالەدا دەکات و پەی بەو هەستە گەرموشەهوانییە دەبا کە لەسەری پەنجەکانیدایە.

بڕێ ڕووداو لە دەسەڵاتی نووسەردا نییە، نووسەر ناخوازێ هیچ پێوەندییەک بە بکوژێکی ون بوو و کوژراوێک کە ساڵانێکە کوژراوە وێنا بکات، بەڵام لێرەدا کەسانێکی وەک مولازم کاووس د. و ژالە م. خۆ لە قالبە گڵێیەکەی خۆیاندا نین. ژن و پیاوێک لە ڕەگەزی وشەن و بەشێوەی خودی ڕووداوەکە دەردێن. لەبەر ئەوە هیچ ڕووداوێک لەژێر دەسەڵاتی نووسەردا نییە، مێشکێک لەناو کەللەسەرە سوورییەکانی (٣) ئەواندایە کە لەناوچوون قبووڵ ناکات و هەموو شتێکیش تەناتەت ئەو هەستی شەهوانی بوونەش دووبارە دروست دەکەنەوە.

ئەمجارەش مولازم کاووس د. بەرلە هەمووان دێت بۆ گۆڕەپانی بەهارستان، بەڵام ئیتر گەنج نییە و کامڵ دیارە، بێگومان چەکداریشە. دەبێ هەمان دەمانچەی «بێدەنگی» پێنج و بیست و سێ لە گیرفانی چاکەتەکەیدا بێ.

لەسەر تەختە بەردینەکەی قەراغ باخەکە دادەنیشێ و سەیری باخەوانەکە دەکات کە خەریکی ناشتنی قەڵەمی گوڵەقەوان و مێخەکە. هەتاو خەریکە دادەچێ و با-ش قژەماش و برنجییەکەی باخەوانەکە و سپێتی و سەوزییە تێرەکەی گەڵای دارچنارەکان هەڵدەوەرێنێ. ژاوەژاوێک لە دوورەوە دێت. دوو زیل سەرباز بەدەوری گۆڕەپانەکەدا دەسووڕێنەوە. ڕیزی خودە زەیتونییەکان لەودیو تەختە بەندی پشتەوەی زیلەکانەوە بەرچاو دەکەون. هەمان ئەو چەند پیاوە دەگەن، ئەوانیش ئیتر گەنج نین، هەندێکیان دەستی کوروکچەکانیان گرتووە، لەسەر تەختە بەردینەکان دادەنیشن، مولازم دەستیان بۆ ڕادەوەشێنێ. یەکێکیان دەپرسێ، کەم دەردەکەوی؟

مولازم دەڵێ: لەسەفەر بووم.

فۆردە ڕەشەکە دەگات، نەفەرەکانی سێ پیاو و ژنێکن. فۆردەڕەشەکە بە دەوری گۆڕەپانەکەدا دەسووڕێتەوە، مولازم کاووس د. ژالە م. دەناسێتەوە، ژالە م. لەچوارچێوەی پەنجەرەی ئۆتۆمبیلەکەوە دەستی بۆ ڕادەوەشێنێ. پیاوەکان لەسەر تەختەکان هەڵدەستن و هوڕای بۆ دەکێشن. مولازم کاووس د. پێشبینی جێگای وەستانی فۆردەکە دەکات. لەوێ، لەژێر شۆڕەبییەکەداو لەبەری ڕۆژهەڵاتی گۆڕەپانەکەدا فۆردەکە لە جێگەیەکی دیاریکراودا دەوەستێ.

ژاوەژاوی خەڵکەکە نزیک دەبێتەوە، واژەکان، دروشمەکان ڕوون و ئاشکرا بەرگوێ دەکەون، دەستەیەک بەرەو گۆڕەپانەکە دێن. مولازم بەدەوری گۆڕەپانەکەدا دەسووڕێتەوەو بە شۆڕەبییەکە دەگات. ژالە م. لە فۆردەکە دادەبەزێ. کۆستمێکی خۆڵەمێشی لەبەردایەو خەرمانەی قژە ئاڵتوونییەکەی لەژێر لەچکەکەیەوە هاتووەتە دەرێ. چاو دەبڕێتە چاوی مولازم کاووس د. و دەپرسێ: «قوربان شقارتەت هەیە؟» مولازم چڵە شقارتەیەک هەڵدەکاو لە ناو کاسەی دەستیدا بۆی ڕادەگرێ.

ژالە م.-یش دەنووشتێتەوەو جگەرەکەی دادەگیرسێنێ.

ژالە دەڵێ: «گۆڕاویت!»

مولازم دەڵێ: «بەڵام تۆ هیچ نەگۆڕاویت.»

ژالە م. دەپرسێ: «من هەروا کوژراوم.»

مولازم دەڵێ: «حوکمی کوشتنی تۆ هەمیشە لە گیرفانی من دایە. ئەم کۆبوونەوەیە لە بەراییەکانی مەرگی تۆیە.»

ژالە م. دەگەڕێتەوەو لە فۆردەکەدا دادەنیشێ، هەموو شتێک وەکو ڕۆژی کارەساتەکەیە. دەنگدانەوەی سروودەکە گۆڕەپانەکەی هێناوەتە لەرزە.

ئەو وتەبێژەی لەسەر فۆردەکە دەوەستێ، دەنەڕێنێ: «ئێمە هێشتا هەرلە قوربانیدان داین، بە دزییەوە تەقەمان لێدەکەن و خوێنمان یەکسەر دەڕژێتە سەر زەوی، من لە ئێوەم، دەپرسم کەی ئەزموویاسا بەرقەرار دەبێ؟»

ژاوەژاوێک گۆڕەپانەکە دەگرێتەوە. پاسەوانەکان بە حەیزەران و قەڵغانی شووشەییەوە دێنە پێشەوەو دەکشێنە دواوە.

مولازم کاووس د. سواری ماتۆڕەکەی دەبێ و گۆڕەپانەکە بە جێدەهێڵێ و بەرەو شەقامی جەلایر دەڕوات. هەروەکو بڕیاردراوە لە جێگای دیاریکراودا خۆی دادەشارێ، چونکە ئیتر خۆرئاوا بووەو چراکان خەریکن هەڵدەبن و ژالەم-یش دەبێ بێت. فۆردە ڕەشەکە دەگات. چراکانی یەکجار پرشەوقن، لەبەردەم بینای (١١١)دا دەوەستێ. ژالە م. دادەبەزێ. لە پلیکانەکان دەچێتە سەرەوە، مولازم کاووس د. لە ناوەڕاستی ڕاڕاوەکەدا وەستاوە. لەبەر ڕۆشنایییە سپییەکەی چراچوارگۆشەکانی بنمیچەکەدا ژالە م. دەبینێ.

ژالە م. دەڵێ: «ئەمجارەیان نابێ پەلە بکەیت.»

ئەوسا دەستی مولازم دەگرێ و لە پلیکانەکان دەچێتە سەرەوە. ژالە م. دەڵێ: «یەکەمجار کە دەتکوشتم سەیری چاوانتم کرد، خەریک بووم بیرم لێدەکردنەوەکە چەندە جوانن، مردم، لەهەموو ئەو ماوەیەی مردندا بیرم لە جوانی چاوەکانت دەکردەوە، خۆزگەم حوکمەکەت دەدرێ.»

مولازم کاووس د. دەڵێ: «بیرت نەچێ کە ئەم حوکمە ئەنجام دراوەو تۆش لە خاکدا رزیوی، ئێستا ئێمە تەنیا وشەین کە لەو پلیکانانەوە سەر دەکەوین.»

ژالە م. دەڵێ: «هەمیشە و لەهەر جێیەکدا بین، شوێنگەلێک هەیە کەسی لێ نییە و دەتواندرێ بۆ چەند چرکەیەکیش بێت تەنیا بین.»

ئینجا ڕێگا چۆڵ و سپییەکەی پلیکانەکان نیشان دەدا.

دەشڵێ: «تەنانەت دەتوانی بێی بۆ ماڵەکەم و بۆ سەعاتێکیش بووە لە چاوی کاردساتەکە گوم بین.»

ئەوسا لە ڕێگا چۆڵ و سپییەکەی پلیکانەکانەوە دەچنە سەرێ و دەگەنە ئەوسەری پلیکانەکان.

مولازم کاووس د. دەمانچەکە لە گیرفانی چاکەتەکەی دەردەهێنێ و ژالەم-یش بە چۆکدا دێت، چەناگەی لەسنگیدا دەشارێتەوە، دەستەکانی مشت کردووەو نەرمایی گوێچکەکانی دەگوشێ. خەرمانەی قژە ئاڵتوونییەکەی بەسەر شانەکانیدا پەخش دەبێتەوە. مولازم کاووس د. سێ جار لەسەریەک تەققە لە ناوەڕاستی تیشکە لوولەکانی قژەکەی دەکات. شانی ژالە م. دادەچوڕێ، بەسەر زەوییەکەدا خل دەبێتەوەو چاوەکانی شوێن پێیەکانی مولازم کاووس د. دەپێون.

بێگومان کاتێ ژالە م. بەتاسەوە چۆک دادەداو لە «مەسلەخ»(٤) دادەنیشت، دەزانێ شتێک لە چیرۆکەکە ماوەو نەوتراوە. شتێک کە دەبێ بوترێ، شتێک کە نووسەر هەست بە لە دەست دانی دەکات و دەبێ بینووسێتەوەو دووبارە لە وشە دروستی بکاتەوە، تاکو ئەگەر بێ ژالە م. شتێ زیاتر لە ژیان، تەنانەت وشەیەکیش بەدەست بهێنێ، لەبەر ئەو شێوە گوم بوونەیە کە دەبێ دووبارە بنووسرێت و مولازم کاووس د. و تێکڕای دروشمە نووسراوەکان و حەیزەرانەکان و زیلەکان و دەنگەکان ئیحزار بکرێن، هەرچەندە ئەوانە ئیتر بەو شێوەیە نین کە بوون. بوونەتە وشەی کۆن و سواو تەنیا بیانووی ئامادەبوونیشیان سازدانی بەرایییەکانی مەرگی ژالەم-ە کە هەروا نادیارە.

ژالە م. بەسواری ئەو فۆردە ڕەشە دەگاتە گۆڕەپانی بەهارستان. مولازم کاووس د. لە هەمیشە پیرترەو لەسەر تەختە بەردینەکە دانیشتووەو لەباخەوانە پیرەکە ڕاماوە کە خەریکی ناشتنی قەڵەمی گوڵەقەوان و مێخەکەکانە. هەتاو خەریکە دادەچێ. شنەی شەماڵ قژە سپییەکەی باخەوانەکە دەئاڵۆزێنێ و سپێتی و سەوزییە تێرەکەی گەڵای پیرە چنارەکان هەڵدەوەرێنێ. دوو زیل سەرباز هەروا خەریکن بەدەوری گۆڕەپانەکەدا دەسووڕێنەوە. چەند پیاوێک هەمیشە خاو و خلیچک و هێواش دەگەن. هەندێکیان سەریان ڕووتاوەتەوەو تاڵە قژەکانی ئەملاوئەولای سەریان سپی بووە. فۆردە ڕەشەکە لەبەری ڕۆژهەڵاتی گۆڕەپانەکەداو، لەژێر شۆڕەبییەکەدا دەوەستێ کەلەبەر پیری لەرزە لەرزی گەڵاکانی دەگاتە زەوی.

مولازم لە ژنەکەی ناو فۆردەکە ڕادەمێنێ. ژالەم-یش سەیری ئەو دەکات، وەکو نیشانەی ئاشنایەتیش بزەیەکی دێنێ.

پیرەمێردێک لە فۆردە ڕەشەکە دادەبەزێ، ئاڵایەکی کاڵەوە بووی بەدەستەوەیە، بەسەخت لە بۆنیتی ئۆتۆمبیلەکەوە سەردەکەوێ، لەسەر ئۆتۆمبیلەکەوە هاوار دەکات: بە دزییەوە تەققەمان لێدەکرێ، لە خوێنی خۆماندا دەگەوزین، هیچمان لەدەست نایەت، جگە لەوەی کە ڕۆژێک نەزمویاسا بچەسپێ. ژاوەژاوێک گۆڕەپانەکە دەتەنێ. ژالە م. بەسواری ئەو فۆردە ڕەشەو لەناو واژەگەلی ئەوشارە سواوەوە دەگەڕێتەوە. شەقامەکانی شاردەپێوێ و مولازم کاووس د-یش ڕەوتی هەموو ئەو دووپاتە نووسراوە ئەزلییانە دەبڕێ و لە شوێنی دیاریکراودا چاوەڕێ دەکات. ژالە لەهەموو کاتێ زووتر دەگات. ئەمەیان دەتواندرێ لە ڕووی ئەو چرایانەوە بنووسرێ کە هێشتا دانەگیرساون. ژالە م. ئەمجارە ڕەنگی پەڕیوە، کاتێ لە فۆردەکە دادەبەزێ لە هەمیشە هەڵە داوانتر بە پلیکانەکاندا سەردەکەوێ.

مـولازم وەکـو هەمـیـشـە وەسـتـاوەو چاوەڕێی دەکات.
ژاڵە م. دەڵێ: «پەلەم کـــرد، بەڵـکو زیاتر لەگەڵت بم»
ژاڵە م. دەڵێ: «لە ڕێگا هەر بیـرم لە تۆ دەکردەوە»
مولازم دەڵێ: «لە مەرگیش.»
ژاڵە دەسـتی مـولازم دەگـرێ و بەرەو پلیکانەکان دەڕوات.
ژاڵە م. دەڵێ: «دەکـــــرێ تۆ بـەبێ حوکمی مەرگی من بێیت؟»
مولازم کاووس د. دەڵێ: «ئەم حوکمە هەر بووەو هەر هەیە» ئیـتر گرنگ نییە کەی بێ، ئێسـتـا یان هەزار ساڵی تر. «من بۆ ئەوە خوڵقاوم کە بکوژی تۆ بم»
ژاڵە م. دەڵێ: «کە شـتێ نانووسـرێ تۆ لە کوێی.»
مولازم دەڵێ: «گوم دەبم، سەرگەردان دەبم.»
ژاڵە دەستی مولازم لە دەستی خۆیدا دەگـوشێ و لە پلیکانەکـانەوە دەچێـتـە سـەرێ. دەگـەنە کـۆتایی پلیکانەکـان. ڕاڕەوێک دەست پێدەکات، ڕۆشناییەکی سـپی لە چراچوارگۆشەکـانی بنمـیـچەوە پەخش دەبێـــــــــــەوە، ژاڵـە دەڵێ: «لەمـــەودوا، کــاتێ کـــوشـــتـــمت، لە ئاپارتمانەکـەی مندا بژی. بەمـــجــــۆرە لەسەرگەردانی ڕزگار دەبی.»
خـانە خـانەڕەش و سـپـیـیـەکـانی ڕاڕەوەکـە دەپێـون. دەگـەنە ژمـارەی حەفـتاو هەشت. ژاڵە م. کلیلەکە لەناو جـانتـاکـەیدا پەیدا دەکـات. دەرگـاکـە دەکرێتەوە. ژاڵەچراکـان دادەگیرسێنێ. تۆزێکی سـپی هەمـــوو جـێـیـــەکی داپۆشیوە.
ژاڵـە دەڵێ: «ســـــــــــالانێـکـە نەگـەیشـتـومـەتە مـاڵەوە، هەمـیـشـە لەکاتی مردندا خۆزگە دەخوازم کە بریا گەیشتبومایەتە ماڵەوە.»
پەنجـە بەسـەر مـێـز تەوالێـتـەکـەی تەنیـشت هۆڵەکەدا دەهێنێ. هێـڵـێـکی قـووڵ بەسـەر سـپـیـایی تەپوتۆزەکـەدا دەکـێـشـرێ، سـەیری ئاوێنەکە دەکات و دەڵێ: «کەڵکی مردن بۆ من هەر ئەمەیە کە قەت پیر نابم و هیچی تر.»
مـولازم چاکـەتەکـەی دادەکـەنێ و بەدەسکی کورسییەکەوە هەڵـیـدەواسێ، سـەیری ئاوێنە دەکـات. تۆزێکی سـپی نیشتووەتە سەرقژی و دەموچاوی پڕبووە لەوردە هێـڵ. ژاڵە لەچکە ڕەشـەکـەی دادەگرێ. تیـشـکدانەوەیەکی ئاڵـتـوونی لەناو پێچو لوولی کاکۆڵییەوە کاغەزەکە ڕووناک دەکاتەوە. عەشقەی(٥) بەرزی دوو بازوو لەنێو قەدی چنارێکدا ڕوواوە کە لە سپێتی کاغەز دەئاڵێ. وشەکان لە تۆزدا گـوم دەبن. واژەکـان لە چەشنی تامـە هاوبەشـەکـاندا سـوێری تۆزەکـە دەچێژن. ژاڵە دەگری.
مولازم کاووس د. دەڵێ: «دەگریت؟»
ژاڵـە دەڵێ: «ڕەنـگە ئەمـــــە دوایین نوسخەی چیرۆکەکەمان بێت.» ئەوسا لە قەوارەی نادیاری ماڵەکەدا، بەنهێنی لە سپێتی ماوەی نێوان وشەکاندا خلۆر دەبنەوە. پاشـــان مـــولازم لە دەروونە سپییەتەماوییەکەی تۆزو مـاوەکانەوە دەراسێ و دەمـانچـەکەی لە گـیـرفـانی چاکـەتەکـەی دەردەهێنێ. ژاڵە م. بە چۆکدا دێت، هێـڵـێکی سایەدار زراڤی بالاکەی لە دەقەکە جیـادەکـاتەوە. جا ئێستا ڕۆشنایی بەسەر وشەکاندا پەخش دەبێـتـەوەو سـەروبنیـشـیـان تیـشـک دەدەنەوەو نێـوقـەدی ڕێگـایەکـیـش لە کازیوە دەپێوێ و قەوارە کەڵەکە بووەکان دەردەکەون.
ژاڵەم. پێـــڵـــووەکـــان لێک دەنێ. دەسـتـەکـان مـشت دەکـات و نەرمـایی گـوێچکەی دەگـوشێ و چەناگـەی لە قـەوارە ڕووناکـەکـاندا دەشـارێتـەوە. خەرمـانەی قژەکەی دەئاڵۆزێ. مولازم سێ جار لەسەریەک تەققە لەناوەڕاستی تیـشـکە لوولەکـانی قژەکـەی دەکـات، هێـلی دەمـوچاوی ژاڵەم. تێـک دەشکێ و شانی دادەچۆرێ و خـوێن لەناو چین و قەفی قژەکەیەوە فـیـچقـە دەکات و دزە دەکاتە نێوان ئەو وشانەی لەسەر سپێتی کاغەزەکە هەڵتروشکاون..❖

**سەرچاوە**

.......

**کۆمەڵە چیرۆکی «دیوانی سۆمۆنات»**

**پەراوێزەکان**

.........

**١- لە فارسییەکەدا دەڵێ (افسرضد اطلاعـات)= بە ئیـسـتـخـباراتی ناو لەشکرو پۆلیس دەوترێ، گـوایە نایەڵێ زانیـاری ناو سـوپاو لەشکر بچـێـتـە دەرەوە.**
**٢- لە دەقـە فـارسـیـیـەکـەدا دەڵێ کڵاوی فەرەنسی.**
**٣- سورب: وەرەق.**
**٤- مـەسلەخ: ئەو جێگایەی مرۆڤی تێـدا دەکـوژرێ یان کـەوڵدەکـرێ، بەواتایەکی تر کوشتارگای مرۆڤە.**
**٥- عەشقە: لاولاو.**



# گەمەی گۆڕینەوەی قەرەوێڵەکان

**شێرزاد حەسەن**
**(سلێمانی)**

لەوە دەچێ من هەر لەم بیمارستانە لەدایک بووبم، هەر لەم قاوشەو لەسەر هەمان ئەو قەرەوێڵەیەی کە هەنووکە لەسەری پاڵ کەوتووم و بەدزییەوە خۆم خستۆتە سەر باڵی چەپم و ئەو چیرۆکەی خۆمتان بۆ دەنووسمەوە، ئەو چیرۆکەی نە سەرەتایەکی دیارەو نە کۆتایی دێ، ئەو چیرۆکەی سەد جارە بینووسمەوە تا بگات بە ئێوەو فریام کەون، وەلێ ناگات و ئێوەش نایەن، گرێچنی ئەم چیرۆکە جگە لە گریی دڵی خۆم هیچی دیکە نییە، تانوپۆکەشی جگە لەگینگڵ و خۆخواردنەوەم هیچی دیکە نییە، سەرەتاکەشی زریکەو واقەیەکەو کۆتاییەکەشی گریانێکی ئەبەدی و خەونی سەرفرازییەک کە هەرگیز نایە. من هەر ئەوەندە لە مێژووی خۆم دەزانم کە لە ڕێی نەشتەرگەرییەکی قەیسەرییەوە لە سکی دایکم دەریان هێناوم، هەر هەمان ئانوسات بەسەر بوونی منەوە ئەو مردووە. من مەرگی دایکم لەو ژنانە بیست کە جاروبار هەر بە ڕێکەوت لەبەردەم پەنجەرە کراوەکەی مندا هەڵوەستەیەک دەکەن و وردو درشتی ئەو زان و مەرگەم بۆ دەگێڕنەوە، هەر جارەو بە جۆرێک، هەندێک جار بە دەم گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە بەشەڕ دێن و من دەبمە بیانووی شەڕی گەرمی ئەو ژنە نەخۆشانە، دەست لە تیتکی یەکدی دەنێن و دەنێو ئەو جەنگە بێ تامەدا بەشی من، بۆ هەمیشە، چەند تف و جنێوێک دەبێ، ئەو ژنانە دەمەو ئێواران، وەختێ زەردەپەڕ کەوتن، قاوشەکانیان جێ دێڵن و دەڕژێنە ناو باخچەکانی بیمارستانەکە، ئەوە تاکە وەختێکە خۆ تێکەڵ بە پیاوە نەخۆشەکان بکەن و وادەی ژوانیش، ژوانی نیوەشەو، لەو پیاوانە وەربگرن کە تۆزە هێزو شەنگێکیان تێدا ماوە، بیمارستان دەبێ بە دەعبایەکی زەبەللاح و دەرەوشانەوەی خۆری سووتاو لەسەر شووشەی پەنجەرەکان، پەنجەرە داگیرساوەکان، جگە لە ترس و خەم هیچی دی بەسەر ئەو نەخۆشخانەدا ناڕژێنێ، بیمارستانیش وەک دەعبایەک کە سەد چاوی خوێنینی هەبێ؛ دەوەستێ لە ئاوابوونی خۆر دەڕوانێ و بێباک لە دڵتەنگی دەردە دارەکان دڵ و چاوەکانی بۆ چڕی تاریکی دەکاتەوە، هەر هەمان وەختە کە من حەز دەکەم پەنجەرەکەم بکەمەوەو لە درەختەکان ڕامێنم، لە شینایی ئاسمان و سووتانی تەشک و تیریژی هەورەکان، گوێ لە ورشەی گەڵاکان و چریکەی مەلان بگرم، هەر هەمان ئەو ساتەیە کە ژنەکان لەو دیو پەنجەرەکەمەوە پیاسە دەکەن و بە چرپەوە باسی دەردو درم و دامەنی خوێناوی خۆیان دەکەن، باسی ئەو پیاوانەی کە بە دزی پزیشکەکان و پەرستارەکانەوە، دەنێو ئاودەستخانەکاندا، ژوانیان دەگەڵ دەبەستن، باسی ئەو منداڵانەی لەم بیمارستانەدا بەخێویان کردن، کەچی کە گەورە بوون برانە نەخۆشخانەیەکی گەورەتر.. دوورتر، ئەو ژنانە ناچارم دەکەن پەنجەرەکە دابخەم و لە پشت جامەکەوە لە زەردەپەڕی نەخۆش بروانم و لەگەڵ خۆری خزاودا ڕۆحم ئاوا دەبێ و ... هۆن هۆن بۆ خۆم دەگریم، چاوانم ئاسرم، لەو دیو فرمێسکەکانمەوە زەریایەکی سوور هەڵدەستێ و لەگەڵ

مندا خۆری تێدا دەخنکێ.

تۆ بڵێی گەر دایکم نەمردبایە.. وەک زۆرێک لەو ژنانە دڵڕەق بووایە.. دڵڕەقییەک کە تەنیایی و دەردو چاوەڕوانی مەرگی بێ وادە لە ڕۆحی ئەواندا چاندوویەتی؟

من کە چاوم کردەوەو هەناسەم دا... کە گەورە بووم:

جگە لە سەدان پزیشک و پەرستارو پیاوان و ژنانی سپی پۆش و هەزاران نەخۆش و دەردەدار هیچی دیکەم نەدی، ڕەنگی سپی بەروانکەی پزیشکەکان و پەرستارەکان و دیوارەکان ومتیلی بالیف و دۆشەکەکان هەمیشە بە شەوارەی دەخستم، بە ڕاڕەوەکان و قاوشەکاندا هەر هەموان بەنێو یەکدیدا دەچن، ساتمە لەیەکدی دەکەن، لە یەکدی دەڕەونەوە، بە ترس و گومانەوە لە یەکدی ڕادەمێنن، مەرگ لەچاوانی یەکدیدا دەخوێننەوەو شەرم دایاندەگرێ، چەندین جار دیومە:

بەر یەک کەوتنی عارەبانەی نەخۆشەکان، ئەو وەختەی لە ژوورەکانی نەشتەرگەرییەوە دەهاتنە دەرێ بە دەم بای غارەوە نەخۆشەکان دەپەڕین و بەر دیوار کەوتن و مەرگی بەر لەوە ئاگاهاتنەوەیان یەکێک بوو. من جگە لە داوو دەرمان، پاشەڵی ڕووت و دەرزی لێدان، ئاو هەڵواسین، میزو گوو بەخۆدا کردن، تف و بەڵغەم بەدیوار دادان، ناڵەو گریان و دادو فیغان، زریکەی بوون و زریکەی گیان دان: هیچی دیکەم نەدیوەو نەبیستووە. لەوەتەی ئەم بیمارستانە هەیە ئاودەستەکانی بەرناکەون، هەمیشە گیراون و ئێمەش هەر هەموو بەلەفرکێمانەو ڕەوانین، لە بۆنی کوشندەی دەرمان هیچ بۆنێکی دیکەم نەکردووە، لە دیەنی مەرگی ناوادە بترازێ هیچ شتێکی دیکەم نەدیوە، مەرگی چەندین جۆرە کەس و تەمەن: منداڵ، گەنج، پیر، ژن، پیاو، کچ. کەسێک نییە لەم بیمارستانە پێ بکەنێ، کەسێک لێوی خەندەیەکی مردووی پێوەنییە، قوڕگی قریوەیەکی خنکاوی نییە، تاکە ژێیەکی ژەنگداری لاوژەیەکی برینداری لەگەرووداو نییە، هەر هەمووان تووڕەو تۆسن، دڕدۆنگ و بێ میهرو سۆز، تەوێڵەکان گرژو پڕ چرچ ولۆچ، لێوەکانیش داکەوتە لە ژێر خەمێکی ناقۆڵادا، لەوەتەی لێرەم چاوەڕێی پرشنگی نیگایەکم لە چاوی کچێکدا کە سۆز یان بەزەیی هەبێ بۆ من: نییە، دەست بەسەر داهێنانێکی دایکانەی ژنێک بۆ من: نییە.

بەدبەختترین پیاو ئەو پیاوەیە کە نەدایکی هەیە، نە خوشک و.. نە دەستگیران. من لەهەموو پیاوەکانی ئەم بیمارستانە بەدبەختترم، چونکە ئەوانی دی، گەر بە ڕێکەوتیش بێ و بۆ تەنیا جارێکیش بووبێ، بەپێی خۆیان و بە دزییەوە دەچنە ژوان، وەلێ منێکی ئیفلیج کە بەم قەرەوێڵەیەوە نووساوم: تەنیا ژوانێک بۆتە مەحاڵ.

ئەم بیمارستانە زۆر لەوە گەورەترە کە خەیاڵی منێکی ئیفلیج بۆی بچێ، من لەو کوڕو تۆڵازو پیاوانم بیست کە هەوڵی هەڵاتنیان دابوو.. وەلێ نائومێدانە گەڕابوونەوە یان وەک خۆیان دەرکاندیان: کەوتبوونە دەست پاسەوان و یاساوڵەکان، ئەوان بەحەسرەتی کۆمەڵە کەسێکی نائومێدو دۆڕاوەوە دەیانوت: تا بڕۆی..ئاگەی بە دیوارەکانی.

شەوێکیان خەونم بەوەوە بینی کە بەسەر عارەباناکەمەوە تیژ دەڕۆم و قاوشەکەو ڕاڕەوەکان جێ دێڵم، حەوشەی پان و بەرینی بیمارستانەکە، لە دەروازە سێ دەرییەکەوە تێدەپەڕم و دەکەومە ناو شارێکی زۆر قەڵەباڵغ، شارێک لە شاری خەونەکان، خەڵکەکەی هەر لە هیچە پێدەکەنێن، ویستم ئەو خەونە بهێنمە دی. ئێوارەیەکی درەنگ بە بیانووی هەناسە هەڵمژینێکی پاکەوە گوایە مەبەستی ئەوەم هەیە پیاسەیەک بکەم بەزەیی پەرستارێکم جووڵاند، ئەویش برینپێچێکی دیکەی بانگ کرد، بە هەردووکیان من و عارەبانەکەمیان لە پێپلیکە زۆرەکانی بەردەمی قاوشەکان ڕزگار کرد، بەسەر شۆستە پێچاوپێچەکاندا ملم نا، ئەوەندە هەردوو باسکم خوولاندەوە تا هەردوو شانم کەوتنە خوارێ، ئەوەندە ڕۆیشتم.. تا شۆستەی کۆنکریت هەبوو خۆم و چەرخەکەم تیژ دەڕۆیشتین، پاشان خۆم بەردایەوە بەو نیازەی ئەو دەروازە سێ دەرییەی لە خەونەکەمدا دیبووم، تا هێزم تێدا بوو لەسەر لەپ و بە سکەخشکێ و سنگەخشکێ هەردوو قاچەکانم بە دوای خۆمەوە ڕادەکێشا، سینەو دەم و چاوو هەردوو لەپ و سەر ئەژنۆکانم زامار بوون ئەوەندەی لە درک و داڵ بخشن، سەرم هەڵبڕی لە بری شارە قەڵەباڵغەکەی ناو خەونەکە؛ دیوارێکی ئەستوورو بڵندی تاریکیم بینی، ناچار لە ترسانا، ترس لەتەنیایی و تاریکی تا توانام هەبوو هاوارم کرد: هێی خەڵکینە فریام کەون، دوو یاساوڵی چەتەوڵ بەدەنگمەوە هاتن، سەر لەنوێ منیان کێل کردەوە، خستمیانەوە سەر چەرخەکە، بەنۆرە بەنێو درکوداڵی زۆری وشکەوە بووی حەوشەی پشتەوەی بیمارستانەکە منیان هێنایەوە قاوشەکە، دەستیان دایە بن باڵەکانم و لەسەر قەرەوێڵەکەم پاڵیان خستم، پەتۆکەیان لەژێر قاچەکانمەوە دەرهانی و دایان پۆشیم، فەرمانیان پێ کردم کە وەختی خەوتنەو دەبێ بنووم، کە جێیان هێشتم من لەژێر پەتۆکەدا دڕکم لە ئەژنۆکانم دەردەهانی.

سەرەتا لە قاوشی منداڵەکان بووم، کە سمێڵم گووگرە بوو.. گواستمیانەوە قاوشی مێردمنداڵەکان کە گەیشتمە تۆغیانی ئەوەی ڕدێن بتاشم هێنامیانە

قاوشی پیاوەکان.

قاوشەکانی کچەکان و ژنەکان و پیرەژنەکان جیابوون، بەڵام بۆ هەمیشە تێکەڵ دەبوون. من نەمدی بوو، بەڵام لە هاوڕێکانم بیست.. نا ...من درۆ دەکەم، لەم بیمارستانەدا هیچ هاوڕێیەکم نییە، من لە نەخۆشەکانم بیست کە قاوشی وا هەیە هەر هەمووی ئافرەت یان پیاوی کەڕولاڵن، هی کوێرەکانیش جیان، کەس نەیدەوێرا توخنی قاوشی وەرەمدارەکان و سیلدارەکان بکەوێ یان قاوشی ئەو پیاوانەی کە سوزەنەکیان هەبوو، ئارامترین قاوش بۆ من قاوشی ئەو پیاوانە بوو کە شێرپەنجە هەناوی دەخواردن، کەچی ئەوان وەک ئەوەی خەویان لێ بکەوێ: هێدی و هێمن دەمرن.

بیرم نایەو بڕوا ناکەم بۆ تەنیا شەوێک ئاسوودەو ئارام خەوتبێتم، شەوان بەدەم هاوارو ناڵەو نرکەی نەخۆشەکان هەراسان دەبووم و خەوم دەزڕا، جگە لەکونی چاوم، هەموو ئازای جەستەم دەرزی ئاژن بوو، من نەمدەزانی بۆچی ئیفلیجێکی وەکو من لە بەیانییەوە تا شەوخەوتنان شرینقە لەسەر شرینقەم لێ دەدەن، پزیشکەکانیش پتر لە کەڕولاڵ دەچوون، قەت نەبوو جارێک لە جاران، گەر بە هەڵەش بێ یان ڕێکەوت وەڵامی پرسیارێکم بدەنەوە، جارێکیان پیرە نەخۆشێک کە هەر لەو بیمارستانە لە دایک ببوو، سوێندی خوارد کە پزیشکەکان دەمیان دووراوەتەوە، پێی دەوتم: ئەگەر ئەمجارە دەرزیان لێ دای، لێیان ورد بەرەوە، لەودیو دەمامکەکانەوە دەمی دووراویان دەبینی، بڕوام نەدەکرد.. تا ڕۆژێکیان هەر بە ڕێکەوت پەتی بەستراوی پشت سەری پزیشکێک پساو دەمامکەکەی کەوتە سەر عارەبانەکەی بەردەستی کە پڕ بوو لە چەقۆو نەشتەرو مقەست و پەمۆو دەرزی و خامی خوێناوی، پزیشکەکان و پەرستارەکان حەوسەڵەی ئەوەیان نەبوو کە بە ئاماژەش پێمان بڵێن: دەرپێ داکەنە، کراسەکەت هەڵکە، بکەوە سەردەم، قۆڵت ڕووت کە، هەر بەسەر جلەکانەوە دەرزییەکانیان تێ ڕادەکردین، کە پتر لە گەستنی دووپشکێک دەچوو، بۆنی داوودەرمان هەراسانی کردبووین، ناڵەو نرکەو هاتوهاواری دەردەدارەکان، کتوپڕ پزیشکێکک بەهەڵەداوان دەهات و دەرزییەکی لە یەکێ لەو نەخۆشە دەم بەهاوارە دەداو خپ دەبوو، وامان دەزانی دەرزی خەوتنە، کەچی نیوەشەوێکی درەنگ چوار دەستە؛ هەڵیان دەگرت و دەیانبردە دەرێ، دەنیو تاریکیدا، کەس نەزانم؛ متیل و بەرگە سەرین و دۆشەگ وپەتۆ چڵکنەکانیان دەگۆڕی و هی تازەیان دەهانی، ئەو ناوەیان لە خوێن و میزو ڕشانەوەو گوو پاک دەکردەوە، لە چاو تروکانێکدا چواردەستە نەخۆشێکی دیکەیان دەهانی، نیوەمردوو پاڵیان دەخست و دەنێو نرکەو ناڵەی ئێمەدا جێیان دەهێشت.

کەسمان ناوێکی نەبوو، هەر یەکەو بە جۆرێک بانگ دەکراین: هێی شەلەی قون خوار، فەلەج، خێلە، کەڕیلە، لاڵە پتە، مل خوار، بێ قوون، قەمبوور، مەزمەعیل، نۆیل، میزکەر، بێ دەمار، سیرمە، لاسووتاو، گۆجە دەیان ناوی وا کە دیسانەوە وەبیری دەهێنایەنەوە کە ئێمە لەم بیماستانەدا نەخۆشی ئەبەدین.

- هەر کە فامم کردەوە خولیای دۆزینەوەی باوکم لە کەللەی دام، وەلێ مەحاڵ بوو لەو بیمارستانەدا بگەم بەو خەونە دێرینە، هەر لەوساوە تا هەنووکە، هەر بۆ مەزاق، نەخۆشەکانی دیکە سەدان کەسیان کرد بە باوکم، هەمووشیان لەو نەخۆشە نیوە مردووانە بوون کە بە پەلە دەبرانە هۆڵی نەشتەرگەری و نەدەهاتنەوە دەرێ، ئەو سەدان جارە بۆنی خوێناوی یەکە یەکەی ئەو پیاوانەم دەبردە ژێر پەتۆکەو بەسەریدا دەگریام، دەگریام بەسەر بۆنی باوکە ساختەو درۆکان، دەگریام بۆ مەرگی ناوادەو کتوپڕیان، ئەو پیاوانەی بە پڕتاو بەبەردەمی قاوشەکەی ئێمەدا ڕووەو مەرگ ڕادەفرێنران، کەس نەبوو لەو بیمارستانەدا دوو سێ جار سکی هەڵنەدڕابێ، بە بیانووی نەشتەرگەری دڵ، گورچیلە، گەدە، بە بیانووی سندان و شێر پەنجەی جەرگ و ناو هەناوەوە.. هەر هەموومان دڵ و گورچیلەو سی و جگەرو ئەندامانی دیکەی لەشمان گۆڕابوو، نەخۆشی وا هەبوو تا بەیانی گینگڵی دەداو دەگریاو پڕ بە قاوشەکە هاواری دەکرد:

«ئەی هاوار خەڵکینە.. من دەمێکە دڵم دزراوە!» یەکێکی دیکە واهیمەی چاوگۆڕین وا شێتی کردبوو، شەوان یەکە یەکەی نەخۆشە هێلاکەکانی لە خەو هەڵدەستاندو بە تیشکی چرایەکەوە لە چاوانیان ورد دەبووەوە. نەخۆشەکان بە چرپەوە بە یەکدیان دەوت: ئێمە لێرەین تا بازاڕی گورچیلەو دڵ و زراو فرۆشتن لەمەملەکەتێکی دیکەدا گەرم بێ، مەملەکەتێک کە پڕە لە شەقام و ڕووبارو دارستان و مەردوومی تەندروست، هەر بۆیە قەمبوورێک بە فیزێکەوە بەناو قاوشەکەدا پیاسەی دەکردو هەمیشە بەدەم ورێنەوە دەیوت:

«من گەدەم نەماوە.. گەدەی من بە پادشای مەملەتێک فرۆشراوە!»

شەوانی پڕ لە نرکەو ناڵەو کۆکێن و گریانی ئێمە کۆتایی نەدەهات، تەنیا وەختێک کە خۆشبەخت دەبووین ، ئەو وەختە بوو کە پیاوێکی کەڵەگەت و نوورانی دەهات، بەخۆو بە جبەیەکی ڕەش ومێزەرێکی سپی و کتێبێک بەبن

باڵییەوە، لە تاو بۆنی ناخۆشی قاوشەکان دەمامکی دەبەست، لە پشت دەمامکەکەوە، بە دەنگێکی خنکاوەوە، شەوانی پڕ دەکردین لە خەونی خۆش، خەونی وا کە قەت حەزمان نەدەکرد لێی وەئاگا بێین، بەڵێنی پێ دەداین کە لە پاش مردن دەچینە شوێنێک ناوی (بەهەشت)ە، لەوێدا نە شەل هەیەو نە کوێر، نە کەڕ هەیەو نە لاڵ، نە لەدایک بوون هەیەو نە مەرگ، باخێکە پڕ نەمیوەو جۆگەی شیر، بە قەد ژمارەی ئەو ئاخ و حەسرەت و هەناسەساردانەی بۆ ئەو کچ و ژنە نەخۆشانەی ئێرە هەڵیدەکێشن، ئەو کچ و ژنانەی بەتەنیا لە پشت پەنجەرەکانەوە دەیانبینین، لەوێندەرێ هەر پەریزادەیەو لە بن درەختێکدا ڕێت پێ دەگرێ، یەکە یەکە بەسەر قەرەوێڵەکاندا دەگەڕاو دەستی میهری بەسەر تەوێڵی ئارەقاویماندا دەهێناو وەک کۆمەڵێ منداڵی کفت و ماندوو دەیخەواندین و دەیچرپاند:

«بنوو رۆڵەکەم .. بەقەد برینی لەشت، لەو باخە دوورەی بەهەشتدا .. گوڵ و پەریزادە چاوەڕێتە..!»

دەخەوتین و هەمیشەش لەناو لەپی ئەودا بۆنی جێماوی ئەگریجەو پەرچەمی ژن وکچە نەخۆشەکانی ناو قاوشەکانی دیکە کاسووری دەکردین، ئەو بۆنەی نەخۆشی و مەرگ-یش نەیکوشتبوون.

خودایە.. چەندە بەغیلیمان بەو پیاوە دەبرد کە بۆنی ژنی لێ دەهات. هەر دەتوت تارماییەکی ناو خەونەکانە.. دێ و دەڕوات.

شەوەهای شەو، دوای سەفەری ئەو، من خەونم بەو بەهەشتەوە دەبینی، بەڵام هەزار ئەفسووس لەوێش نەمدەتوانی بەپێی خۆم بڕۆم، هەمیشە وەک هەنووکە ئیفلیج و بەسەر چەرخەکەمەوە بەند بووم کە دەگەیشتمە جۆگەلەی شیرو هەنگوین، ئەوەندە تینوو دەبووم کە ناچار بووم خۆ دووقەد کەمەوە، سەنگم نەدەماو ڕووەو قووڵایی جۆگەلەکە سەرانگرێ دەبووم و دە نێو هەنگوینێکی لینج وتاڵدا دەخنکام، لە تاو خنکانی خۆم ڕادەپەڕیم، جارجاریش دەمدی کە کراسێکی شین و زۆر تەنکی لەبەردا بوو، بەنێو گوڵزارەکاندا، بێ ئەوەی پێی بەر چیمەنەکە بکەوێ، ڕای دەکردو تاوێ دەفڕی، بەخۆم و چەرخەکەمەوە دوای دەکەوتم، بیرای ببڕ نەمدەگرت، هەموو جارێک لەنێو بێشەڵانێکی چڕدا لێم بزر دەبوو، دەگەڕام .. دەگەڕام، کەچی کتوپڕ پڵنگێکی بەڵەکم لێ پەیدا دەبوو، بەیەک قەڵەمباز تاوی دەدامێ و دەیخواردم، دە نێو کەڵبەکانی وەئاگا دەهاتم.

بە عەزرەتەوە بووم جارێک لەجاران دایکم میوانی خەونێکم بێ، تا دەبوورامەوەو دەخەوتم دوعام دەکردو دەگریام.. کەچی هەرگیز نەدەهات، نەک هەر من .. بگرە هاوەڵەکانیشم پڕ بەدڵ و تێر دایکی خۆیان نەدی بوو، بۆنیان نەکردبوون، ساڵی یەک دوو جار بە پەلە کۆیان دەکردینەوە، یەک دوو باوەش و ماچی بە پەلەو تکە فرمێسکێک و هەناسەی ساردو دڵ داخوریان..

ئیدی هەر کەسەو قاوشی خۆی، ئەو تەنیا وێنەگرەش کە بە قاوشەکاندا دەسووڕایەوە، بەخۆو بەکامیرای فلاشدارەوە، تەنیا ئەو وەختە وێنەی نەخۆشەکانی دەگرت کە پزیشکەکان دەیانزانی هەرچەند سەعاتێکی دیکەیەو دەمرێ، ئەو وێنانەش دەخرانە ناو فایلەکان و لەپاڵ هەندێ زانیاری و مێژووی پەیوەندیدار بەو نەخۆشانەوە فڕێ دەدرانە ناو دۆلابەکانەوە، هەر ساڵەو جارێک دەماندی، دە نێو حەوشەی بیمارستانەکەدا گردێک لەو فایلانە هەڵدەدرانەوەو دەسووتێنران،



ئێمەش لەو دیو پەنجەرەکانەوە، سەرکزو مەلوولانە، لەو گڕە بڵندە ڕادەماین کە بە لرفەلرف ئاسمانی بیمارستانەکەی پڕ دەکرد لە دووکەڵ، ئەو شەوە خەومان دەزڕاو لەژێر پەتۆکاندا دەگریاین، دەمانزانی ڕۆژێک دێ و هەر یەکەمان دەبێ بە فایلێک و دەسووتێ، کەس .. هیچ کەس بە ناوونیشانمان نازانێ، ڕۆژێ دواتر، بێجگە لە من، نەخۆشەکانی دیکە دەچوونە سەرخۆڵەمێشی جێماوی پاش سووتانی فایلەکان، هەر بە ڕێکەوت لەتە وێنەی مردووەکان و پەڕەی نیوە سووتاوی پڕ لە شەڕەپشێلەی پزیشکەکانیان دەدۆزییەوە، کەچی قەت نەبوو جارێک لە جاران بە ڕێکەوتیش بێ نەخۆشێک وێنەیەکی نیوە سووتاوی دایک و باوکی دەنێو ئەو خۆڵەمێشەدا هەڵبگرێتەوە، وێنەکان وا ڕەش هەڵدەگەڕان کە زۆر بە زەحمەت خاوەنەکەی بناسرێتەوە.

هەر لەم بیمارستانەدا خوێندنەوەو نووسینیان فێرکردین تا بتوانین خشتەی خواردن و دەرمانەکانمان بزانین، جگە لە مێژووی دەردو دەرمەکان هیچی دیکەمان نەدەزانی، دەشمان زانی یەکەمین دامەزرێنەری بیمارستانەکە کێ بووە، ئەو پیاوەی کە وێنەیەکی گەورەی لە هەر هەموو قاوشەکاندا، بە دیوارەوەو لەنێو چوارچێوەیەکی زێڕیندا هەڵواسرابوو، وێنەیەک لەو وێنە کۆنانەی کە پڕە لە سام و ترس و هەیبەت، سمێڵ و ڕیش تێکەڵ، ماش و برنجی، دووچاوی گەش و کراوە کە پڕ بوون لە پڕشنگێکی تێکەڵ لە میهرو تووڕەیی. دوا سەربوردەی ئەو پزیشکەش ئەوە بوو کە تا هەنووکەش ماوەو سەرگەرمی دامەزراندنی دەیان بیمارستانی دیکەیە، پیری پەکی نەخستووە، بیمارستانی وا کە لەوەی ئێمە گەورەترن، ئەم پیرە پزیشکە بەدەستی خۆی حیکمەتێکی نووسی بوو کە بەسەر سەری هەر هەموومانەوە هەڵواسرابوو:

«ئەم دنیایە جگە لە بیمارستانێکی گەورە هیچی دیکە نییە!»

بیستمان کە خۆی دەست و قاچێکی دەستکردن.

ساڵی جارێک مامۆستایەکی پیرو کەنەفت دەهات و یەکە یەکە ئیمتحانی دەکردین: لە مێژووی پەیدابوونی دەردو درمەکان و ناوی دەرمانەکان، چۆنیەتی بەکارهێنانیان، ڕەنگەکانیان، تامەکانیان، بۆنیان، تەمەنی گیرانەوەیان و بەسەرچوونیان، ئێمە کە ناوی خۆمان نەدەزانی، دەبوو ناوی هەر هەموو دەردو دەرمانەکان بزانین و ئەزبەریان بکەین، ناوی هەموو ئەو پەرستارو پزیشکانەی لە خزمەتی ئێمەدا مردن و ئەوانەشی کە ماون، زۆربوون ئەو ئەو نەخۆشخانەی لە ترسی دەرنەچوون و سزا نیوەشەو دەمرن.

کەسمان ڕووخساری خۆی نەدەدی، کەس لەتە ئاوێنەیەکی پی نەبوو، زوو زوو بەیەکدیمان دەوت:

«ئەرێ چۆنم دەبینی؟»

«باشم؟»

«پیرنەبوویمە؟»

«سەرو ڕدێنم سپی نەبووە؟»

«زۆر لاواز نەبوویمە؟»

«ڕەنگی چاوم چۆنە؟»

وەلامەکانیش، هەرگیز، دڵخۆشکەرە نەبوون، کەس نەبوو بەزەیی بەوی دیکەدا بێتەوەو درۆیەک هەڵبەستێ.

شەوانە درەنگ،سەروەختی پشووی پزیشکەکان وپەرەستارەکان، هەرجارەو دووسێ گەنجی چاو نەترس و سەرکێش کە بۆ دواجار بۆنی مەرگ ئازای دەکردن، لەنێو ئاودەستەکانی پشتەوەی قاوشەکان ژوانیان لەگەڵ ئەو کچە نەخۆشانە دەبەست کە هالاوی بۆگەنی مەرگ لەدەمیەوە دەهات، هەر لەوێ .. زۆر بە پەلە، بێ ئەوەی کەس دەم و چاوی ئەوی دیکە ببینێ: دوو سێ ماچی بۆگەن و دەست لەملانێیەکی بەلەرزە لەرزو مردووانە،ڕاموسانێکی بەپڕتاو، دەست گۆج بوون بەدەم داکەندنی بەپەلەی دەرپێ و هەڵدانەوەی کراسەکانەوە دوو سێ حینگ و خۆ ڕاتەکاندن و ئاهێکی پڕ لەشەرم و خنکاوو ڕاکردنەوە بۆ ناو قاوشەکان، جاروبار تاوەکو ئاسوودە بن و بە کاوەخۆ دەست لە ململانێی یەکدی بن، ناچار، ژوانیان لەو هۆڵە گرێ دەدا کە پڕ بوو لەتەرمی مردووەکان، لەوێدا خۆیان دەگرخاندو درەنگتر دەمانەوە، پیاوەکان دەیانتوانی دەنێو تاریکیدا دەست لە سینەو مەمکی ژنەکان بکوتن، کوێرانە هەردە پەنجە بەرەڵلا بکەن تا وردە ئاکارو ڕوخساری ماندووانەی ئەو کچ و ژنانە سەح بکەنەوە، تاوەکو دڵنیا بن لەوەی کە دۆستی یەک شەوە یان تارمایی و ڕۆحی مردووەکان نین، بەڵکو ئەوەتا لووت و گوێچکەو چەناگەو دەم و لێو و قژیان هەیە.

هەندێ جار لە شەوانی زۆر تاریک و ئەنگوستەچاودا پیاوەکان پەلیان دەکوتاو بەسەر ژنە مردووەکاندا دەکەوتن و ئەو تەرمە ساردوسڕانە لەژێر قورسایی پیاوەکاندا دەیانتقاند، هەندێکیان لە گەرمەی ڕاموسانیدا بەسەر تاڵترین حەقیقەتدا وە ئاگا دەهاتن، ئەو کاتەی یاساوڵەکە بە چرایەکەوە دەهات و دەیدی پیاوەکان چوونە گژ ژنە مردووەکان، ئیدی لەگەڵ قریشکەی یاساوڵەکە چاویان دەکردەوە، چی ببینن؟ خۆیان دەبینی وا دەمیان خستۆتە ناو دەمی تەرمەکان و زەندەقیان دەچوو، لەژێر ورگی پەنماوی ژنەکانەوە سەرەتاتکێیان دەکرد، ئیدی دوای ئەوە بەدەم دەردێکەوە دەتلانەوە کە بگرە پزیشکەکانیش هیچ شتێکیان لەمەڕ ئەو دەردە نەدەزانی:

سەرەتا بە لێو هەڵوەرین دەستی پێ

دەکرد، پاشان ددان کەوتن و دواجاریش بە هەڵوەرینی پەنجەکان کۆتایی دەهات.

ئەوە بە تەنیا من بووم کە نەمدەتوانی لەسەر چەرخەکە ڕاست بیمەوەو لەسەر هەردوو پێ بوەستم و کچۆڵەیەکی شەرمن و نەخۆش ڕامووسم، هەمیشە زوو دەخزامە ناو پێخەفەکەم بەو ئومێدەی خەوم لێ بکەوێ و ئەو پەریزادە کراس شینە لە خەونەکاما وەدەر بکەوێ، منیش بەسەر چەرخەکەمەوە ڕاوەدووی بنێم، کەچی هەموو جارێک دەنێو بێشەڵانەکەدا لێم بزر دەبوو، دواجار دەبووەوە بە پڵنگە بەڵەکەکەو پەلامارێک و دەکەوتمە ژێر کەڵبەکانی، هەمیشە لەگەڵ زریکەو هاواری نیوە شەوانی من نەخۆشە نیوە مردووەکان ڕادەچەنین، کەس.. هیچ کەس خەونێکی خۆشی نەدەدی، ناچار هەندێکمان دەبوو درۆ بکەن و مۆتەکەکانیان بگۆڕنەوە بەخەونی خۆش، لەوەدا تەنیا کەسێک کە حکایەتخوانی خەونە جوان و پڕ درۆکان بوو کوڕە لاوێکی نابینا بوو، بە بازنەیەک لەنەخۆش گەمارۆمان دەدا، بەدەم گێڕانەوەی خەونەکان هەر هەموو ئازای جەستەی دەجوولاند، هەردوو ئەبرۆو برژانگەکانی، بەهەردوو دەست و هەردوو قاچەکانی دەدوا، خۆی وێک دەهێنایەوە، گرمۆڵە دەبوو تا پڕ چنگێکی دەمایەوە، پاشان خۆی لێکدی دەکێشایەوە وەک خەرتەلێک کە بیەوێ بفرێ باڵەکانی لێکدی دەدا، دواجار کە دەگەیشتە دوا ڕستەی خەونە ساختەکەی بە هەردوو چنگ قژی پڕی خۆی دەردەهانی، هەندێک لە نەخۆشەکان بیرای بیر خەونیان نەدەدی، بۆیە ناچار دەبووین بۆ چەندین جار خەونەکان بۆ ئەو نەخۆشە بێ خەونانە بگێڕینەوە، پزیشکەکانیش بە عەزرەتەوە بزانن کە بزانن ئێمە چ خەونێک دەبینین، لە دەفتەرێکدا وردو درشتی خەونەکانی ئێمەیان دەنووسییەوە، هەندێ جار شێتانە دەستیان ڕادەوشاند.. یانێ ها: دووبارەو .. سێ بارەی بکەنەوە، خەیاڵی پڕ فیشاڵ و خەونی درۆو شپرزەیی و ترسمان لە پزیشکەکان وای لێ دەکردین کە لەناوەڕاستی گێڕانەوەی خەونەکاندا لاڵ بین.

وەڕسی و بێزاری لە خەون و خولیای درۆ، لە دەرمان ودەرزی، لە بینینی مەرگی سەدان هاوەڵ، لە پیاسەی ناو قاوش و ڕاڕەوەکان، لە ژوانی ژنە مردووەکان، لە هەڵاتن و نەگەیشتن بە مەملەکەتەکانی ئەودیو شوورە بڵندەکانی بیمارستان وای کرد تاکوتەرا خۆ بکوژن: لە ژەهرەوە بیگرە تا دەگا بە خۆخستنەخوارەوە لە سەربان، زوو زوو چنگێک حەبیان لە دەست یەکتێک دەردەهانی، هەبوو خۆی بە قولاپی بنمیچەوە هەڵدەواسی، هەبوو تەلەکانی پاش نەشتەرگەری دەپچڕاند یان دەمامکی ئۆکسجینی وەلادەدا یان بە گوێزانێک شادەماری مەچەکی چەپی دەقرتاند یان سۆندەی خوێنەکەی. زۆر شەو لە شاتەشات و دادو فیغان و زریکەی لە ناکاوی ژنەکان وەئاگادەهاتین، گریانی سەدان منداڵی زەندەق چوو. ئەو وەختەی ژنێک بە بالایەک لە گڕەوە بەنیو قاوش و ڕاڕەوەکاندا دەسووتاو غاری دەدا، پیاوان لە خەو ڕادەچەنین و توخمی ژنیان بەنەفرەت دەکرد کە نازانن چۆن خۆ بکوژن، لەو دیو تەلبەندو شیشەکانەوە، لەودیو دیوارو دەرگاو پەنجەرەکانەوە هاوەڵەکانم ماچی مردوویان بۆ کچە نەخۆشەکان هەڵدەدا، ئەوانەی کە بەدەگمەن دەوێران بچنە ژوانی ناو ئاودەستخانەکانەوە، لەو دوورەوە، هەر بەتەماشا.. بەنیگای زەردو مردووانەوە لە تارمایی یەکدی ڕادەمایین، ئەو وەختەی لەژێر درەختەکانی بیمارستانەکەدا بەدرۆی هەناسە هەڵمژینێکی پاک خۆمان لە قاوشەکانی ژن و کچەکان نزیک دەخستەوە.

بەیانیان زوو... بۆمان هەیە لە خەو هەڵسین و لە پەنجەرەوە لە کوژرانی کازیوەو ڕەوینەوەی تەمی بەیانی و گزنگی کزو شەرمنی خۆر هەڵاتن ببینین، پاشان هەر هەمووان لەبەردەمی ئاودەستخانەکاندا گرددەبینەوەو چاوەڕێی ئەو نەخۆشانەین کە ماوەیەکی درێژتر لەوەی کەسێک بتوانێ چاوەڕێ بێ.. دەبێ چاوەڕێ بین.. چاوەڕێی ئەوانەی یان سکیان دەچێ و ڕەوانن یان قەبزن و دەنقێتن، سەر لە ئێوارانیش تا خۆردەکەوێ لە زەردەپەڕ دەڕوانین، ئەوەیان ڕەنگی پەڕیوو زەردمان زەردتر دەکات و هەر هەموویان ڕەنگی لەگەڵ ئاوابوونی خۆر ئاوابوونی ڕۆژێکی دیکەی تەمەنی خۆمان وەبیردێتەوە.. ئەو ڕۆژە پڕ دەردانەی لەو بیمارستانە بێ هوودە.. بە «با»ی دەدەین.. بۆچی و لە پای چی؟ کەس نازانێ. هەندێکمان کە دواجار خۆر لە دەم کەل ئاوا دەبێ و هێدی هێدی تاریکی دەڕژێ وا بە کوڵ دەگرین تا نیوەشەو ژیر نابنەوە، ئەوانە ئەو نەخۆشانەن کە بڕوا ناکەن بەیانی بۆ جارێکی دیکە خۆر هەڵبێ و ئاسمان و ئاسمان و بیمارستان ڕووناک ببنەوە، ئەوانەن کە زەندەقیان لە تاریکی چووەو تا نەبووڕێنەوە خەویان لێ ناکەوێ، بەختەوەرترین نەخۆش ئەو کەسە بوو کە بێ داوو دەرمان، بێ دەرزی، بێ گریان بنوێ، بێ خەونی ناخۆش و نرکەو ناڵەو پرخاندن، هەندێ شەو لەسەر پرخاندن و ناڵەو هاوارو گریانی نەخۆشەکان دەبێ بە شەڕو تا بەیانی کەس ناسرەوێ. چەندین جار هەر لەسەر ئەوەی کە نەخۆشێک لووتی گیراوەو دەپرخێنێ، بە دە نەخۆشی دیکە دەیانخکاند، سەرینێکیان دەخستە سەر دەم و

هەناسەیان لەبەر دەبڕی، خۆر ئاوابوون زێدە غەمناک و جەرگبڕە، چونکە مەرگی ئەو هەموو دۆست و هاوەڵانەمان دەهاتەوە یاد کە لە قاوشەکانەوە چوار دەستە لاشەکانیان لەسەر قەرەوێڵەکان هەڵگیران و فڕێ درانە سەر تەختەی ساردی ناو هۆڵی تەرمەکان. شەوان کە دوا مۆمی قاوشەکەمان دەسووتێ و ئیدی دەکوژێتەوەو کەس ئەوی دیکە نابینێ، کوڕە جحێڵەکان دەکەونە سەردەم و بە زیکە زیکێکی نارێک هەر هەموو ئاسمانی قاوشەکە پڕ دەبێ لە هەراو دەنگە دەنگ، تا دێ زیاتر هەوا پڕ دەبێ لە هەناسەو هانکە هانک، لە پاش تاوێکی درێژ پیاوە پیرەکان وەڕس و بێزارو داخدار جنێو بەتوخمی نێرینە دەدەن.. بە تاریکی. . بەو شەهوەتەی ناهێڵێ مرۆڤ ئاسوودەو ئارام بنوێ، لە ناکاو ئەو زیکە زیکە نەدەماو هانکە هانکی کوڕە دەردە دارەکان بەوە کۆتایی دەهات کە قاوشەکە بۆ چەند چرکەیەک کپوخامۆش دەبوو، جگە لە کۆکەو قرخە قرخ وخیزەی سینگی هەناسە سوارەکان و ناڵەی کتوپڕی نەخۆشێک هیچی دیکەت نەدەبیست.

ناخۆشترین شەوانێکی ئەو بیمارستانە ئەو شەوانە دەبێ کەساڵی دوو سێ جار چەندین لاوی لە خوێن گەوزیودا بە پڕتاو دێننە ناو قاوشەکانەوە، فڕکان فڕکان بەسەر عارەبانەکانەوە دەیانهێنن و دەیانبەن، هیچ شتێک نامێنێ خوێناوی نەبێ، کەسیش نازانێ لە کوێوە هاتوون، سک دڕاوو سەرو گوێلاک شکاو، ئیدی لەو شەوانەدا نرکەو ناڵەی بەردەوامی ئەو بریندارانە هەر هەموومان هەراسان دەکات، زەوی بەرپێیان بۆنی خوێنی لێ دێ و ڕەنگی خوێن بەسەر هەموو شتێکەوە دەنووسێ، لە پاش تیمارکردن.. دوای سێ چوار مانگ کە دەهاتنە سەرخۆیان، لە پاش چەندین نەشتەرگەری قورس، ئەو وەختەی پرسیارمان لێ دەکردن، هیچیان بیر نەما بڕێ، سەرسام و ئەبڵەق لێمان وردەبوونەوە، ڕادەمان و بەس کە پرسیاری زۆرترمان دەکرد دەیاندایە پرمەی گریان و ژیر نەدەبوونەوە کە ژیریش دەبوونەوە بەدەم هەنسکەوە ئەوەندەی نەدەما سەریان بەڕەگی ملەوە دەربێ.

من تەنیا کەسێکم لەم بیمارستانەدا کە بە دزییەوەو لە دەفتەرێکدا هەموو ئەو خەم و خوێناوە تۆمار دەکەم، تەقەت لەژێر سەرینەکەمدا دەیشارمەوە، ئەو دەفتەرەم ئاسان دەست نەکەوت.. یان با بڵێم دەفتەرەکان، لە پاش تکاو پاڕانەوەیەکی زۆر بەزەیی پەرستارێکی چاوڕەش و سپیکەلانە دەجووڵێنم، هەموو جارێک کە دەفتەرێکم دەداتێ .. پێم دەڵێ:

«بەمەرجی ئەوەی چی تێدا دەنووسیت و چی ڕەسم دەکەیت.. من بیبینم!»

هەڵبەت بەڵێنی پێ دەدەم، کەچی کە دوا لاپەڕەی دەفتەرەکە ڕەش دەکەمەوەو ئاسوودە دەنووم کە بۆ بەیانییەکی دەست دەبەم دەفتەرەکە بدۆزمەوە.. کەچی دەبینم لێیان دزیوم، بە هەزار ترس و نقەنق و فەلاکەتەوە یاداشتەکانی خۆم دەنووسمەوە، خەونەکانی خۆم، ترس و شەرم و دوودڵیم، هی هاوەڵەکانم، ژمارەی ئەو نەخۆشانەی لە ڕۆژێکدا، لە هەفتەیەکدا، لەمانگێکدا دەمرن، ئەوانەی بە برین و بیمەو تازە دێن و قاوشەکان پڕ دەکەن لە هەراو هەوای مەرگ، ناوی دەردو درمە تازەکان کە قەت نەمبیستوون، دەرمانی کۆن و تازە، وەلێ بەر لەوەی دوا ڕستە تۆمار بکەم و قفڵی دەم؛ ئەو دەفتەری یاداشتەم لێ دەدزن .. کێ دەیدزێ؟ نازانم، هەموو جارێکیش بەسەر چەرخەکەمەوە بەناو قاوشەکەو ڕاڕەوەکاندا دەخولێمەوەو هاوار دەکەم:

«کێ دەفتەرەکەی دزیوم؟»

کەس وەڵامم ناداتەوە، وەک ئەوەی هەر هەمووان کەڕو لاڵ بن.

پڕ بە ئاسمانی قاوشەکە دەقیژێنم و جنێو دەدەم:

«گەوادینە.. دەفتەرەکەم بدەنەوە»

لە تاو قیژەی ناقۆڵای من هەر هەموو نەخۆشەکان کاس دەبن و لەژێر پەتۆکانەوە سەر دەردێنن و شێتانە لێم وردەبنەوەو لە پاشان پاڵ دەکەونەوە.

دواجار یاساوڵێکی کەتەو چەتەوڵ بە شەپازللەیەک پەناگوێم ئاگر دەداو چاوانم پڕ دەبن لە گریان، وڕوکاس دنیام لەبەر چاو تاریک دەبێ، جنێوی پیس بەدایک و باوکم دەدا، وەک مەلۆتکەیەک هەڵمدەگرێ و فڕێم دەداتە سەر پێخەفەکەم، تاوێک و پەرستارێک دێ و دەرزییەکم لێ دەدا تاوەکو بسرەوم، جاریکی دیکە بە دەم تکاو پاڕانەوە دەگریم و داوای دەفتەرێکی دیکەی لێ دەکەم، گومان لە دزینی ئەو هەموو دەفتەرە دەکاو کەچی دواجار دڵی نەرم دەبێ..

دەفتەرێکی دیکەو پڕکردنەوەو دزینی و شێت بوونی من و دەرزییەکی دیکەو سرەوتن و ... هەستانەوەو پاڕانەوەو دەفتەرێکی دیکەو دزینی و دەرزی و سرەوتن و .. دەفتەرێکی دیکەو دیکەو .. دیکەو.. دزینیان....

خودایە هاوار .. چەندە شەیدای ئەوە بووم مێژووی ئەو بیمارستانەو نەخۆشەکانی بنووسمەوە، بکەومە دوای نرکەو ناڵەکان، هەناسە مردووەکان، چەندە حەزم دەکرد وشەکانم بۆنی خوێنیان لێ بێ، زەرد بن وەک ڕوخساری سیلدارەکان، ڕستەکانم درێژ بن وەک شەوانی درێژی خەوزڕان، قووڵ بن قسەکانم وەک برینی قووڵی گەنجە لە خوێن گەوزیوەکان، شێتانە ژمارەی کۆکینی پیرەمێردێکم تۆمار دەکرد ئەو

وەختەی بۆ هەناسەیەک لە ئێمەو خودا دەپاڕایەوەو .. نەدەهات، زریکەی بێ ئامان و بێ شوماری ژن و کچە نامرادەکان، ژمارەی ژوانی بەپەلە و پچڕانی ناو ئاودەستخانەکان، هەلآتنی ئەو نەخۆشانەی قەت نەدەگەیشتنە ئەودیو شوورەی بڵندی بیمارستان، دەمویست بیخەمە ناو دەفتەرەکەم: هەر هەموو ڕۆندکە ڕژاوەکان، ڕەنگی کەم بە مۆرێکی تۆخ حەژمەتی کچە تەنیاکان، بیانووسمەوە، هەر هەموو مۆتەکەکان...وەلێ هەزار ئەفسووس ..لەوە دەچێ پزیشکێک، پەرستارێک، برینپێچێک یان یەکێ لە نەخۆشەکان بە نهێنی ئەو دەفتەرەم بزانێ، بە نهێنی ئەو لەزەتەی کە لە بیرمی دەباتەوە: من نیفلیجم، لەوە دەچێ بە خەنی و خۆشی و شاگەشکە بوونم بزانن ئەو وەختەی سەرگەرمی ڕەسم و نووسینەکانم، داخیان ناچێ کە تا مۆمی ژوور سەرم نەکوژێتەوە من ناخەوم، لەوە دەچێ بزانن ئەو تۆمارە ناگۆڕمەوە بە ژوانەکان.. وەلێ قەت نەیان دەهێشت تەواوی کەم تۆمارەکەم، هەر بۆیە کەس، هیچ کەس، تا هەنووکەش بە مێژووی ئەم بیمارستانە نازانێ، بە تەنیا شتێک کە دەیزانین مێژووی ئەو پیاوە پڕ بە هەیبەتەیە کە وێنەی لەهەر هەموو قاوشەکانە، بە دیوارەکانەوە، هەڵواسراوە، دامەزرێنەری ئەم بیمارستانە، خۆ ژیان و سەرگوزشتەی پزیشکەکان و پەرستارەکان و برینپێچەکانیش هەر پڕ لەغزو پەنهان بوون، کەس نەیدەزانی لە چ زەمانێکەوە لەو بیمارستانەدا نەخۆشین، بۆچی لێرە لە دایک بووین؟ بۆچی لێرە دەمرین؟ بۆچی تا ئەبەد نەخۆشین و ساغ نابینەوە؟ بۆچ بێ ناوین؟ بۆچی شوورەی چوار دەوری بیمارستانەکە ئەوەندە بڵندە کە دەبێ دە نەخۆش پشت بۆ یەکدی دابنێینەوە تا ئەوەی سەرەوە دەستی بگاتە تەلبەندەکان و هەر هەموو جارێکیش بەسەر یەکدیدا برمێن.

لە بیمارستانێکی وا گەورەدا هەمیشە بە هەڵەی نەشتەرگەری دەیان کەس دەمرد، هەبوو گورچیلەی ڕزابووەوە، کەچی سکیان هەڵدەدڕی و بەدوای ئەو سندانەدا دەگەڕان کە لە گەدەی دابێ، هەبوو دەردە دڵی بوو، کەچی نەشتەرگەری زراویان بۆ دەکرد، هەبوو ڕۆماتیزم گیری کردبوو، کەچی لە گورچیلەیدا بەدوای وردە بەردەکاندا دەگەڕان، هەبوو شێرپەنجە جەرگی دەخوارد، کەچی نەشتەرگەری قوڕگیان بۆ دەکرد. زۆر جاریش دەبوو بە هەلاومەزاق ئەو وەختەی چەقۆیەک یان نەشتەرێک دەنێو ورگی نەخۆشێکدا جێ دەما، ناچار سەرلەنوێ سکیان هەڵدەدڕییەوە، نەشتەرەکەیان دەردەهانی، کەچی لە تەنگەتاوی مقەستێکیان بیر دەچوو، ناچار بۆ جاری سێیەم سکیان هەڵدەدایەوە، ئەو کاتەی کە پزیشکەکانیش پێیان نەدەزانی، نەخۆشی سک هەڵدڕاو پاش ئەوەی بەنجەکە بەری دەدا شەوو ڕۆژێک لەسەر سەر دەخوولایەوە تا دەمرد.

هەرچەند ڕۆژێک لەمەوبەر زانیمان کە ئێمە چەندە دزێو ناشیرینین، چ زوو پیر بووین، زانیمان ڕەنگی ئێمەو ڕەنگی مردووەکان چەندە لەیەکدی دەچێ، ئەو حەڵەی چاوانی خۆمان بینی؛ ئەوسا زانیمان کە مەحاڵە گلێنەیەک جێی ئەو هەموو ترسە لە خۆیدا کۆ بکاتەوە. تەوێڵی چرچ و لۆچاویمان، ئێسقانی دەربەڕیوی هەردوو لا ڕوومەتمان، ئەو ڕۆژە زانیمان کە چەندە ماندووین، چەندە لەو پیاوانە دەچین کە لە مۆم دروست کراون، ئەو وەختەی توانیمان دوای دەیان پیلانی وردو ڕێک چنراوی شەوو ڕۆژانمان ئەو لەتە ئاوێنەیە لەگیرفانی یەکێک لە پەرستارەکان بدزین، ئیدی یەکە یەکە نەخۆشەکان لەتە ئاوێنەکەیان بۆ یەکدی ڕەت دەکرد، هەر نەخۆشەو سەیری ڕوخساری خۆی دەکردو دەیزریکاند، بەترسەوە هەڵیدەدایە سەر پێخەفی نەخۆشەکەی تەنیشتییەوە، هەروەک بڵێی پەنگر بێ و هەڵیدا، جارێکی دیکە داوای دەکردەوە، لە ڕوخساری ڕادەماو هۆن هۆن دەگریا، ئەو لەتە ئاوێنەیە هەر هەموو قاوشەکانی کرد، وەک هەر شتێکی دەگمەن و سیحراوی لە شکان و بزربوونی دەترساین، دوای دزینی ئەو لەتە ئاوێنەیە گلەییمان لە یەکدی دەکرد:

«بۆچی نەتوت کە من لە مردوو دەچم؟»

«بۆچی دەتوت: چاوت شینەو دڵت خۆش کردم؟»

«بۆ پێیان نەوتم کە من خێلم؟»

«بۆ نەتان وت کە هەموو سەرم سپی بووە؟»

«دەبوو پێم بڵێن کە لایەکی ڕوومەتم سووتاوەو عەیبدارم»

گلەیی و گازاندەیەکی زۆر، مەسەلە دزینی لەتە ئاوێنەیەک و ڕوخساری دزێومان نییە، بەڵکو دەبوو بیانوویەکمان هەبێ پێوەی سەرقاڵ بین، کاتێک بێ بۆ ڕەواندنەوەی وەڕسی و بێزاری، چەندین مانگ تێ دەپەڕی و جگە لە مەرگی هاوەڵەکانمان هیچی دیکە نەبوو کەمەکێ سەرگەرمان بکات، هەموو درۆو هەموو ڕاستییەک بۆ ئێمە چون یەک بوون، ئێمە لە گێچەڵێک دەگەڕاین خۆمانی تێدا ون بکەین.

پاش چاوەڕوانییەکی درێژ دزینی لەتە ئاوێنەیەک بوو بە بابەتی هەر هەموومان، دەبوو هەر ڕۆژەو لای یەکێکمان بێ، بڕیارمان دا کە ئەگەر لەلای هەر نەخۆشێک بزر بێ یان نهێنییەکەی بگەیەنێتە دەم پزیشکێک یان پەرەستارێک: ئەوە بە هەر هەموومان دەیخنکێنین، چەندە حەزمان

دەکرد یەکێک هەڵەی وا بکا بزری بکات، یان نهێنییەکەی بۆ پزیشکێک ڕەت بکات، چونکە ئەوسا لەو لەتە ئاوێنەیە ڕزگارمان دەبێ کە ڕووی دزێوی خۆمانی پێ ئاشنا کردین، جگە لەوەی کە کوشتنی ئەو نەخۆشە خیانەتکارە دەبوو بە بابەتێکی تازەو چەند شەوو ڕۆژێک پێی دەژیاین. تا ئەوە بوو ڕۆژێکیان یەکێک لەوانەی بەدەست شێرپەنجەی گەدەوە دەتلایەوەو نان و ئاوی پێ نەدەخورا؛ هەر بە ئەنقەست لەتە ئاوێنەکەی بەردایەوەو شکاندی، ئیدی ئێمە، بۆ هەفتەیەک، هەر هەموو نەخۆشەکان لە ناوەڕاستی قاوشەکە کۆدەبووینەوە، شەو تەگبیرمان دەکرد چۆن چۆنی بیکوژین و کەس پێ نەزانێ، نەخۆشەکە پەلەی بوو، دە جاران پاڕایەوە کە ژەهر خواردووی کەین، بە عەزرەتەوە بوو تا زووە بمرێ، کەچی ئێمە بەکاوەخۆ پیلانی کوشتنەکەیان دادەڕشت، خۆی لێی ورددەبۆوە، خەونی بەو شامەرگەوە دەبینی کە لە ئازارو هەلاهەلابوونی گەدەو دارزانی ڕزگاری بێ، هەر ڕۆژەو پێشنیارێکمان دەخستە بەرچاوان، پێشنیاری وا کە ڕەت بکرێتەوە، تا بکرێ بۆ ماوەیەکی درێژتر لەبەردەم ئەو گەمەی کوشتنە لەزەت بکەین و خۆ ماتەڵ بکەین، تا دواجار وەڕس و هیلاک بوو، دۆستانە بەوپەڕی میهرو خۆشەویستییەوە تکای کرد کە هەتا زووە بیکوژین، هەر کوشتنێک کە خۆمان پێمان خۆشە، چونکە هەموو جارێک درەنگی شەو دوا پیلانی کوشتنەکەمان دەخستە بەرچاوی تا ئەویش پێی ڕازی بێ، کەچی بۆ بەیانی یەکێک لە نەخۆشە پیلان ڕێژەکان دەیوت:

«نەء .. بەدڵم نییە»

دواجار بەدەم تلانەوە هاواری کرد:

«ئێوە هەرگیز هاوڕێ و هاودەردی من نین، ئێوە لە شەرەف و بەزەیی بێ بەرین، بۆچی نامکوژن؟ من ناو هەناوم دەسووتێ و هەر دەڵێی سەد پیاو لە ناوەوە شەڕە شمشێر دەکەن، کەچی ئێوەش هەر شەوەو نەخشەیەکی تازەی مەرگم دەخەنە بەر دەست، بمکوژن و تەواو .. ئەگینا تا ماوم لێتان نابوورم و کە مردیشم گەردنتان ئازاد ناکەم»

وەلێ نا .. ئەوەندە بێ کارو غەمگین بووین، ئەوەندە دەست بەتاڵ و خانە خەراپ و دەردەدار کە هەرگیز نەمان دەویست ئەو هەلە لە کیس خۆمان بدەین، ئەوەندە نەخشەی کوشتنی ئەو نەخۆشەمان هێناو برد تا خۆی لە حەژمەتان بێ یان لە داخی چاوەڕوانی یان شێرپەنجە هەر هەموو هەناوی خوارد بێ: مرد، مردو فریا کوشتنەکەی نەکەوتین، ئەوندەی بلێی یەک و دوو... لە چاوتروکانێکدا تەرمەکەیان لابردو متیل و پەتۆو بەرگی سەرین و دۆشەگەکەیان گۆڕی، نەخۆشێکی دیکەیان هانی کە کتومت لەو هاوڕێ مردووەمان دەچوو.

پرسیمان:

«تۆ چیتە؟»

ئاماژەی بۆ سەر ناوکی کرد، تێ گەیشتین کە شێرپەنجەی گەدەیەتی، خەونمان بەوەوە دەدی چ ڕۆژێکەو ئەویش هەناوی دارزێ و دەست و پێمان ماچ بکات تا بیکوژین، ئێمەش بە بیانووی دۆزینەوەی شامەرگێکی پڕ لە ئاسوودەگی ئەمڕۆو سبەی پێ بکەین، ئاخر ئێمە لەو بیمارستانەدا هیچ گەمەیەکی دیکەمان نەدەزانی، جگە لە کوشتنی هاوەڵەکانمان، ئێمە بیستبوومان، لە بیمارستانەکانی ئەم دنیایەدا گەلێ گەمەی سەیروسەمەرە هەیە، گەلێ گەمەی دیکەی وا کە نەخۆش ساغ دەکاتەوە، وەلێ بڕوامان نەدەکرد، چونکە لەم بیمارستانەی ئێمە گەورەتر هیچ بیمارستانێکی دیکە نەبوو، وامان مەزندە دەکرد کە ئێرە هەموو دنیا بێ، لەو دیو شوورەی ئەم بیمارستانەوە گەر مەملەکەتێک هەبێ؛ ئەوە دەبێ هەر ئەو بەهەشتە بێ کە کابرای نوورانی بەڵێنی پێ داوین، دەنا بۆ بیمارستانێکی دیکەو گەمەی زۆر نەدەچووە عەقڵەوە. شەوێکیان زۆر بێزار بووین، هەر هەموومان کۆبووینەوە، بیرمان لەوە کردەوە کە مادامەکێ تا ئەبەد لێرە دەژین و دەخۆین و دەمرین وا باشە کە بە دوای گەمەیەکدا بگەڕێین، داوامان لە هەموو نەخۆشەکان کرد کە خەیاڵ بخەنە گەڕ، هەر گەمەیەک کە لەم بیمارستانەدا شەوانی خەوزڕان و ڕۆژانی پڕ لە تلانەوەمان کورتتر بکاتەوە، هیچ نەبێ تا دەمرین کەمەکێ خۆش ڕابوێرین، لەزەت لەو ژیانە کورتەمان بکەین، لە دوای ڕاکێشانی ئەو هەموو تەلبەندە لەنێوان قاوشەکانی ئێمەو هی ژنەکان.. ژوانە پڕ لە ترسەکانیش ببوون بەمەحاڵ. ماوەیەک کوڕە جحێڵەکان پێیان دەوتم نامەی پڕ لە عیشق و غەزەلیان بۆ بنووسم، دەیاندا بەو برینپێچە چلێسەی ئامادەبوو بۆ ژەمێک خۆراک نامەیەک ڕەت کا بۆ قاوشی کچەکان، کەچی قەت وەلامێکمان بۆ نەدەهاتەوە، چونکە کەسمان ناوی نەبوو، ئەو وەختەی لە برینپێچە چلێسەکە کەوتینە گومان و پرسیمان:

«بۆچی وەلامی نامەیەکمان دەستگیر نابێ؟»

بێ باکانە وتی:

«ئاخر ئەوان فێری ئەلف و بێ نەکراون»

لە نامەی پڕ لە غەزەلی بەتاڵ وازمان هانی.

ماوەیەکیش بوتڵ و شووشەی دەرمانەکانمان کۆ دەکردەوەو پڕمان دەکرد لە ئاوو قاوەو چاو میز.. بەتاڵمان دەکردنەوەو پڕمان دەکردنەوە.. شووشە و بوتڵەکانمان دەگۆڕییەوە.

هەوڵێکی نیمچە شێتمان شەیدای کچێکی چاوتیل دە جاران ویستی لە نەبەندەکان بپەڕێتەوەو بکەوێتە دوای ڕەمایی کچە کە بەگران لەژێر دەرختەکاندا هەنگاوی دەناو قەت ڕێکی لێ نەدەدایەوە کە زانی کچەی چاوتیل وەک خۆی دووچاری سیل بووە، لە دوورەوە تێی دەڕوانی و دەیزانی تا ێ باریک و بنێس دەبێ کە هەردووکیان ئەوەندەیان نەماوە بمرن، لە هەنگاوەکانی ورد دەبووەوەو دەیزانی مەرگ وا لەژێر گیاوو گوڵی وشەکەوە دوی چیمەنەکە، وا لە دەوری هەنگاوەکانی، هەرجارە کە هاواری لێ دەکردو دەیویست لە تەلبەندە کە بپەڕێتەوە، یاساوڵێکی چەتەوڵی لێ پەیدا دەبوو.. هەر بە پاڵ تا قاوشەکە دەیهانی.. دەگریاو دەیوت:

«دوو ڕۆژمان ماوە.. تەنیا دوو ڕۆژ.. ئەخر بۆ لێ ناگەڕێن هەناسەی بۆگەنمان تێکەڵ کەین!»

ڕۆژێکیان سوێندی خوارد کە لە بری ئەمە دەکرێ شووشەیەک لەو شووشەی دەرمانانە بە تاڵ بکاو بەگوڵاو بیشوات و پڕی بکات لە فرمێسکی خۆی و بە دیاری بۆ کچەی چاوتیل و وەرەمداری بنێرێ، لەسەری بنووسێ:

« بۆ تۆ .. فرمێسکەکانم»

ئەی خودا چ شەوانێکی پڕ لە خەم و خەوزڕان و چ ڕۆژانێکی پڕ لە هاواربوون، چ قەهرێکی گەورە، بەرلەوەی شووشەکە پڕاو پڕ بێ لە فرمێسک، کچە مردو.. ئەویش بەدەم قریشکەیەکەوە تا دەستی تێدا بوو شووشە فرمێسکەکەی لە پەنجەرەیەکەوە هەڵیدایە دەرێ، ئەو شەوە، تا بەیانی گوێمان لە هەنسکی گرت و لەگەڵیا گریاین، بۆ بەیانی کە لەخەو ڕابووین، شێتەی عاشق سۆمایی چاوانی ڕژابوون، هەر هەموو چیمەنی باخەکە زەردو پەژمووردە بوو، گوڵەکانیش ژاکاوو مردوو، سەیرە .. گەرچی هێشتا پایز زۆری مابوو بگات، بەڵام من بە چاوی خۆم دیم کە درەختەکان گەڵای زەردیان دەباراند، دەگریاو دەیوت:

«دەبێ فرمێسکی عاشقێکی نەخۆش چی لە باخ بکات؟»

کە کەس وەڵامی نەدەدایەوە:

پڕ بە ئاسمانی بیمارستان هاواری دەکرد:

«جگە لە کوشتن چی لە باخ دەکات؟»

من لە هەموو ئەو دەفتەرانەی کە لێم دزراون چیرۆکی ئەو عاشقە شێتەم گێڕاوەتەوە، وەلێ داخم ناچێ کە من ناتوانم فرمێسکەکانی بنووسمەوەو بیخەمە دوتوێی دەفتەرەکانمەوە.

هەندێ لە نەخۆشەکان هەر بۆ خۆ خەریکردن حەبە ڕەنگاو ڕەنگەکانیان دەدزی و وردیان دەکردن کە دەبوون بە ئارد تێکەڵیان دەکردن، هەندێکیان هەروەکو مەیموون خۆیان بە پانکەکانەوە هەڵدەواسی و خۆیان بەردەدایەوە سەر قەرەوێڵەکان، هەبوون سەد جاران پەنجەرەکانیان دەکردنەوەو دایان دەخستنەوە، هەندێکیان هەر بۆ مەزاق خۆیان لە پزیشکەکان دەشاردەوەو دەچوونە بن قەرەوێڵەکان یان بە ئەنقەست خۆیان دەکرد بە نووستوو، بە کەیفی خۆیان ورێنەیان دەکردو ڕقیان لە کێ بووایە، بە بیانووی ورێنەوە داخی دڵی خۆیان هەڵدەڕشت، هەبوون بە درێژایی ئەو ڕۆژگارە لە پشت پەنجەرەکانەوە دەوەستان و لە ئاسۆیەکی دووریان دەڕوانی یان ئەوەتا شەوانە لە پەنجەرەکانەوە سەریان دەبردە دەرێ و لە مانگ و ئەستێرەکان ڕادەمان، هەندێکیان هەر بۆ مەزاق دەرمانەکانی پشت سەری نەخۆشەکانی دەگۆڕی و خۆشی لێ دەهات و قاقا پێ دەکەنی کە دەیبینی نەخۆشێک بەو ئومێدەوە دەرمانەکەی دەخوات کە ساغ بێتەوە، ئەو دەرمانەی کە هی خۆی نییە، دووان لەوانەی کە میزی خوێناویان هەبوو شووشەی پڕ لە دەرمانی پیرەمێردەکانیان بەتاڵ دەکردو پڕیان دەکردن لە میز...

ئەو وەختەی لە هەموو گەمە بێزەوەرەکانیش بێزار بوون، هەر هەموو نەخۆشەکان کەوتنە سەر ڕاوو تەگبیر، بیریان لە گەمەیەکی دانسقەو دەگمەن دەکردەوە، گەمەیەک کە هەر هەمووان بەشدار بن، گەمەیەک کە هەر هەموویان پێی بغافڵێن، گەمەیەکی لەعنەتی و ئەهریمەنانە، هەر یارییەک کە دەرد لە دڵان دەربکات، ئەو قاوشە ساردەمان گەرم بکاتەوە، پاش بینەو بردەیەکی زۆر.. ڕێک کەوتین لەسەر گەمەیەک کە لە هەمووان غافڵتر دەمێک بوو بیری لێ دەکردەوە، گەمەیەک کە تا ئێستا نەکراوە، گەمەیەک کە بە خەیاڵی شەیتاندا نایە، فیکەیەکی لێدا و لە خۆشیانا کەوتە چەپڵە کوتان و چریاندی بە گوێی یەک دوو نەخۆشدا، ئەوانیش سەرگەرمی ئەوکەیفە بوون، هەندێ لەنەخۆشەکان هاواریان کرد:

«چییە شەقمان برد؟»

یەکێک لەو نەخۆشانەی کە بە نهێنی گەمەکەی دەزانی، بە بازێک خۆی هەڵدایە سەر قەرەوێڵەیەک و ئەوەش وای کرد کە هەر هەموو ئاوڕی لێ بدەنەوە:

«ئێمە تا ماوین.. لێرەین.. وا نییە؟»

هەر هەمووان وتیان:

«وایە...»

«لەو گەمە پووچانەی هەر یەکەو بەتەنیا دەیکات بێزار بووین»

«زۆریش»

«گەمەیەکمان دۆزیوەتەوە کە ڕەنگە ئەویش هەر پووچ بێ، بەڵام بێزارمان ناکات!»

هەر هەموو بە پەرۆشییەوە پرسیان:

«چییە؟»
ئەویش بە فیزەوە گەمەی گۆڕینەوەی قەرەوێڵەکان»
پرسییان:
«چۆن؟»
خۆی هەڵدایە خوارێ و وتی:
«هەموو شەوێک تا ماندوو دەبین .. تا شل و شەکەت دەبین قەرەوێڵەکانمان دەگۆڕینەوە، ئەمشەو من لەسەر قەرەوێڵەکەی تۆ دەنووم و.. سبەی شەو تۆ لەسەر قەرەوێڵەکەی منیت .. ئەو لەسەر هی ئەم دەنوێ و.. ئەم لەسەر هی ئەو.. با بۆمان هەبێ شەوێک سەد جاران قەرەوێڵەکانمان بگۆڕینەوە».
هەر هەمووان تاوێک ڕامان و سەیری یەکدیان کرد، لەناکاو قاوشەکە بە هاتو هاواری هەمووان دەنگی دایەوە، بەدرۆ بێ یان بە ڕاست هەڵدەپەڕین و چەپڵەیان لێ دەدا، هەر زۆر زوو .. دەست بەجێ و بەپەلە، لەو شەوەدا کە هێشتا تەواو درەنگی نەکرد بو کەوتنە سەر گەمەی گۆڕینەوەی قەرەوێڵە شەق و شڕەکان، وام زانی کە ئەگەر پزیشک و پەرستارو برینپێچەکان و خۆڵ ڕێژ و ئاشپەزەکان بەم گەمەیە بزانن سزامان دەدەن، کەچی بە پێچەوانەوە.. وای لێ هات هەر هەموو ئەوانیش شێتانە بەشداری هەمان گەمە بوون، لەوە نەدەچوو هیچ گەمەیەکی دیکە بزانن، شەوو ڕۆژ شەقە شەقی قەرەوێڵەکان هەراسانی کردم، لەوە دەچوو بەتەنیا من بەو گەمەیە سەغڵەت بم، چونکە تەنیا کەسێک من بووم کە نەمدەتوانی لە قەرەوێڵەکەم دابەزم و سەرگەرمی گەمەی گۆڕینەوەی قەرەوێڵەکان بم، بگرە پیرو پەککەوتەکانیش کەم و زۆر لەسەر قەرەوێڵەکانەوە دادەبەزین و لەزەتیان لەو گەمەیە دەکرد، نەخۆشەکان لەو قاوشانەدا بەناو یەکدیدا دەخولانەوەو بەر یەکدی دەکەوتن و بەردەبوونەوەو هەڵدەستانەوە، قەرەوێڵەکان بەر یەکدی دەکەوتن گریان دەپژاند، نەخۆشەکان بەر دیوارەکان دەکەوتن دەبوورانەوە.

ئەو ڕۆژەی لەدوا دەفتەری چکۆلەی یاداشتەکانی بەر باخەڵمدا نووسیم:
«لەم بیمارستانەدا جگە لە گۆڕینەوەی قەرەوێڵەکان هیچی دیکەمان لەدەست نایەت....»
بەرلەوەی ڕستەکەم تەواو بکەم پزیشکێک هات و دەفتەرەکەی ڕافڕاند کە ئەم ڕستەیەی خوێندەوە قاقا پێکەنی و هەر هەمووان وازیان لە گەمە هێناو هاتنە کنم، یەکە یەکە دەفتەرەکەی منیان بۆ یەکدی ڕەت دەکردو بە غەزەبەوە نیگایان دەکردم، دەمێک بوو بۆ هەلێکی وا دەگەڕان کە بکەومە تەڵەوە، تاکە کەسێک لەو قاوشەدا منم کە خولقی ئەو گەمە بێزەوەرو هیچەم نییە، منێکی ئیفلیج ڕاهاتووم کە لەسەر قەرەوێڵەکەم ڕابکشێم و بە خەمێکەوە خەندەیەکی درۆ بخەمە سەر لێوانم و لەو گەمەیە بڕوانم یان ئەوەتا بەسەر چەرخەکەمەوە بەنێو هەر هەموو قاوش و ڕاڕەوەکاندا بخولێمەوە، لەلای من پێچکەکانی چەرخەکەو پێیەکانی خۆم لەیەک جوێ ناکەمەوە، دەستەکانی خۆم و هەردوو دەسکی چەرخەکە، هەناوی خۆم و مەکینەکەی، زنجیرەکانی و ڕیخۆڵەکانی من، کوشنەکەی و پاشەڵی من، منێک کە ئیفلیجی زگماکیم چیم پێ دەکرێ؟ دواجار گەر بۆ بەشداری بێ یان تۆڵە بڕیاریان دا کە کۆتایی گەمەکە بە من کۆتایی بێ.
دەمزانی بیر لە مەزاقێکی شەیتانی دەکەنەوە، چاوەڕوانی مەرگ و هەناسەدان دەنێو دەردو درمدا هەر هەمووانی دڵڕەق کردبوو، پاڕانەوە دادی نەدەدا، ناچار خۆم خستە بەردەستیان، ئەوان کە خۆشییان لە گەمەیەکی وا بێ تام دێ. بەرگری هیچ مانایەکی نییە، خۆ سوور کردنەوە، پەل بزاوتن، لەکاتێکدا من بێ پەلم، لە پەڕۆ بێ دەستەڵاتتر کەوتوومەتە بەردەستان، لە داهۆڵێک زەلیلتر، ئەوکاتانەی تەواو لە گەمەی گۆڕینەوەی قەرەوێڵەکانی خۆیان بێزار دەبن؛ دێنە گژ من، ئەو شەوانەی کە یەک دوو قەرەوێڵە لە گەرمەی ئەو گەمەیەدا لێک هەڵدەوەشان، هەر زوو بە فەرمانی پزیشکەکان نازانم لە کوێوە قەرەوێڵەی تازەیان دەهانی، من یەکێک بووم لەوانەی لە هەر شەوێکدا قەرەوێڵەکەمیان دەشکاندو دەیانگۆڕی، دوای ئەوەی تەواو شەکەت و ماندوو دەبوون، شەلاڵی ئارەقە دوا گەمەیان بە من کۆتایی دێ، بە شاگەمەیان ناو دەبردو کۆتاییان بە شەوی درێژی گەمەی گۆڕینەوەی قەرەوێڵەکان دەهانی .. نە جاریک نەدوو ... نە دەو .... نە سەدو ... نە هەزار، چاوەڕێ دەکەم کە شەوێک بێ و بێزار بن، وازبهێنن، وەلێ مەحاڵە بەهەر هەموویان دێن و ناوەڕاستی قاوشەکە چۆڵ دەکەن و بازنەیەک بە دەورمدا دەکەن و هەڵقاوهەڵق دەخولێنەوە، بە هەزار چاو سەیرم دەکەن و بابەخولەم پێ دەکەن .. بە چەپ .. بە ڕاست.. لەو سەری قاوشەکەوە بۆ ئەو سەری هەر بە شەق و پاڵ، قەرەوێڵەکەم دەدەنە پێش خۆیان و.. ڕاوەدووم دەنێن، دەنێو ئەو هەراو هەنگامەیەدا، شەوی وا هەیە، یەکێک هەناوی دەپچڕێ و ئەوی دیکەیان دڵی دەوستێ، جاروبار کە توندو بەڕک بەر دیوارەکان دەکەوم، بەر قەرەوێڵەکان و بەر نەخۆشەکان .. ڕادەتەکم و هەڵتەک و داتەک بەرز دەبمەوە، کە لەسەر قەرەوێڵەکەوە دەپەڕم، باوەشم بۆ دەگرنەوە، ئەو جارانەش کە دەکەوم و شوێنێکم دەشکێ، دەست و برد پزیشکەکان و برینپێچەکان گەرماو گەرم بۆمی دەگرنەوە، ئەگەر برینداریش دەبووم: سەرم، چەناگەم، لووتم، تەوێڵم.. زۆر بەپەلە بۆم تیمار دەکەن،

هەندێ جار وەها دەورم دەگرن کە ئیدی هەناسەم بۆ نەدرێ، هەوای پاکم لێ دەبڕن و دەبوورێمەوە، هەندێ جاریش تا پەنجەیەکی شکاوم دەگرنەوە، دوو پەنجەی دیکەم دەشکێنن کە دەپەڕیم و بەر نەخۆشەکان دەکەوتم، دایان دەپلۆسیم، نە جارێک و .. نە دوو .. نەدەو .. نە سەد... هەزار خێل و گێژ وک فرفرۆکە بەدەوری خۆمدا دەمخولێننەوە، ئەو نەخۆشخانە هەرگیزاو هەرگیز لەو شاگەمەیە وەڕس و بێزار نابن، پێم دەوتن:

«لەوانەیە ناو هەناوم بپچڕێ و بمرم...!»

پزیشکەکان دەیانوت:

«ئەوەیان بۆ تۆ باشترین دەرمانە، تا پتر بخولێیتەوە، پتر خوێن لە دەمارەکانتا کەف دەکاو دەگەڕێ، گەر ماوەیەکی تر لەم گەمەیە بەردەوام بین، لەوانەیە بکەویتە سەر پێی خۆت...!»

یەکێک لە هاوەڵە دڵڕەقەکانم دەیوت:

«دڵ لە دڵ مەدە.. تۆ جێی بایەخی هەمووماني، هەر هەموو گەمەکان بەو شاگەمەیە لەگەڵ تۆدا کۆتایی دێ، کە دەتخولێنینەوە هەر هەموومان چاومان لەسەر تۆیە، هەموو هەست و نەستمان، لەم کاتەدا تۆ خەیاڵی خۆش بکەرەوە، دەتوانی لە ڕوخساری ئێمە وردبیتەوە کە چۆن هەر هەموو دەم وچاوەکان دە نێو یەک پنتدا کۆ دەبنەوەو دەتوێنەوە، وا هەست بکە کە خۆت سەرداری هەمووانی، وابزانە دەفڕیت، لە بری ترس و تووڕەبوون باڵەکانت لێک بدەو لەوانەیە بفڕیت..!»

چەندە پتر دەیانزانی من بەو گەمەیە قەڵسم، ئەوەندە پتر بابە خولەم پێ دەکەن و پتر دەمدەن بە دارو دیواردا، لەدوای هەر لە هۆش خۆ چوونێکم کە وە ئاگادێمەوە، دەم و چاوم ئاو پرژێن دەکەن، دەڵێن:

«ئەها وا ئەمشەویش لە خۆشییانا بوورایتەوە!»

هەمیشە لەنێو ئەو لە هۆش خۆچوونانەدا ئەو کچە کراس شینە دێتەوە خەونم، دواجار کە ڕادەکەم بەدوایدا، دەنێو بێشەڵانەکە لێم بزر دەبێ، لە پاش گەڕانێکی زۆر، کتوپڕ دەبووەوە بەو پڵنگە بەڵەکەی جاری جاران و دەیخواردم.

جارێکیان پێیان وتم:

«مادامەکێ گەمەت ئەوەندە لا خۆشە، خوولانەوەکانت بژمێرە، بزانە لە کامە ژمارەدا دەبووریتەوە، کە بێدار بوویتەوە پێمان بڵێ و ئێمە لەو ژمارەیە بۆتی حیساب دەکەین و سەر لەنوێ دەست پێ دەکەینەوە!»

من لە خەم و قەهری ئەو گەمەپووچە دەگریم و کەچی ئەوان پێم دەڵێن:

«واز لە گریانی خۆشی بێنەو پێ بکەنە!»

بەهەزاران دەست، خۆم و قەرەوێڵەکەم دەخولێننەوەو.. دەخولێننەوەو.. دەخولێننەوەو..دەخولێننەوە..تا دەبوورێمەوە.

من دەمویست پێیان بڵێم:

«من لەو گەمەیە ماندووبووم خەریەکە دەمرم، گوناهی من نییە کە ناتوانم لە گەمەی گۆڕینەوەی قەرەوێڵەکان بەشدار بم.. ئاخر گوناهتان دەگاو من ئیفلیجم!»

وەلێ کە دەم هەڵدێنم زمانم تەتەڵە دەکاو دەمم گۆ ناکات، خۆ لەوەش دەچێ من قسەم بیرچوبێتەوە، ناچار هەموو جارێک دوای گریانێکی قووڵ، هەر بە درۆ بەڕوویاندا دەخەنمەوە تا ئەو حەلەی دەبوورێمەوە.

من دوا دەفتەری ئەم سەرگوزشتەو یاداشتە بێ سەرو بەرانە، ئەم ڕستە پچڕ پچڕانە دەخەمە ناو بەرمیلی زبڵ، ئەوە خودایە کەسێک هەر بە ڕێکەوت لە دەرەوەی ئەم بیمارستانە دەستی بکەوێ و هەڵیبگرێتەوە، من تا هەنووکەش وام لەم بیمارستانەدا، نازانم تاکەی هاودەردەکانم لەگەمەی گۆڕینەوەی قەرەوێڵەکان بێزار دەبن، ناشزانم ئاخۆ ئەم دەفتەرە چکۆلانەیەشم وەکو ئەوانی دیکە دەدزرێ یان نا، من ئیفلیجم و لێرەدا کەوتوم، جگە لەمەرگی خۆم چاوەڕێی هیچی دیکە نیم، من نازانم لەسەر ئەم ئەرزە، ئەم بیمارستانە وا لە کوێ، نەخشەیەک نادۆزمەوە تا شوێنەکەی دەستنیشان بکەم، نازانم چ ناوونیشانێکتان بۆ هەڵدەم تا بمدۆزنەوەو بەزەیی واتان لێ بکات لەم گەمە بێزەوەرە قورتارم بکەن، من ناوێکم نییە.. ئەگەر هەر هەموو بیمارستانەکان گەڕا بن.. بگەڕێن، من لێرەم.. چاوەڕێتانم.. ئەم یاداشتە هاوارێکە.. هاواری کەسێکی بێ کەس..بێ هاوەڵ ..بێ دایک .. بێ خوشک.. بێ باوک و برا... کەسێک کە هەر بە زگماک ئیفلیجم.. کەسێک کە چەندەمین جارە سەرگوزشتەو چیرۆک و هاواری خۆم بنووسمەوەو.. کەچی لێمی دەدزن.. ئەرێ کەسێک لەدەرەوەی ئەم بیمارستانە هەیە.. دەترسم تا ئێوە دەگەن من بمرم .. گەر لە پاش مەرگیشم من بدۆزنەوە ئەوە ڕۆحم ئاسوودە دەکەن.. من لێرەم .. ئێرە کوێیە؟ نایزانم! ئەوەتا پزیشکێک بە تاو ڕووەو لای من دێ، لەوە دەچێ بە گومانەوە تێم بڕوانێ، دەترسم نەهێڵێ دوانهێنی ئەم بیمارستانە بدرکێنم، گەر دەفتەری یاداشتەکانم لێ زەوت بکات، دەفتەرێکی دیکە پڕ دەکەمەوە، دەیخەمە ناو بەرمیلی زبڵەکان.. وا هات.. گەر ئەم دەفتەرەتان دۆزییەوە.. هاوارە فریام کەون.. گەمەی گۆڕینەوەی قەرەوێڵەکان دەمکوژێ.. هاوارە.. بگەنە هاوارم.. من ئەوەتا لێرەم... بەڵام ئێرە کوێیە؟ نایزانم...❖

٢٠٠٠-١٩٩٦

سلێمانی

# شێوازەکانی مامەڵەکردن و پێوەندیی بە ئاسایشی دەروونی و مەیلی دەمارگیری



موئەیەد ئیسماعیل جەرجیس
کولێژی پەروەردە - زانکۆی سەلاحەدین

ئەنجامدانی ئەو جۆرە توێژینەوانە پێداویستییەکی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و نیشتمانی و بنیاتنانەوەی سوودبەخشە لە کۆمەڵگەکەمان. بەکورتی دەکرێ بایەخی ئەم جۆرە توێژینەوەیەو پێداویستییەکەی بەم جۆرە باس بکەین:

## گرنگی لێکۆڵینەوە

هەر لەسەرەتاوە مرۆڤ پێداویستییە سەرەکی و هێمنییەکان و ئەو کاریگەرییانەی کە لە ژینگەی دەرەکی دەوریان داوە کاری تێدەکەن. خەڵک و دەزگا جیاجیاکانیش گرنگترین لایەنی سەرەکی لە ژینگەی خود پێک دەهێنن و لە کرداری کارلێکردن و کارتێکردن شێوەیەکی ئاڵوگۆڕ دروست دەبێت کە کاریگەریی لەسەر لایەنە جۆراوجۆرەکانی کەسایەتیی تاک بە پێی جۆرو ژمارەی جیاواز دەبێت. هەروەها ئەو گیروگرفت و کێشەو دڵەڕاوکێییەی لە ڕێگای زنجیرەیەک لە هەڵوێستەکانی ژیان لە ژینگە بۆ مرۆڤ دروست دەبێت، لەوانەیە هەندێک جار کێشەی ساکارو ئاسان بن و بەهۆی ئامادەکاری ویستی ڕاست و دروست، مرۆڤ بتوانێت ڕووبەڕوویان ببێتەوەو خۆیان لەگەڵ بگونجێنێت، لەوانەشە هەندێک جار کێشەی دژواربن و بەهۆی زۆری و بۆرییان مرۆڤ نەتوانێت بەربەستیان بگرێت و وردە وردە ببنە هۆی لەدەستدانی هەستی هێمنیی دەروونی لای ئەو تاکە، بۆیە لەوانەیە لەم حاڵەتەدا مرۆڤ چەند شێوازێکی هەست و نەستی جۆراوجۆر بۆ کارکردن لەگەڵ ئەم کێشەو ناخۆشییانە بگرێتە بەر، کە لەوانەیە هەندێکیان بەهۆی هەست کردن بە هێمنی دەروونیی دەرەکی واتە ئاسایشی مرۆڤی لەگەڵ مرۆڤدا ڕاست و دروست بن و هەندێکی دیکەیان لەڕووی دەروونییەوە ناڕاست بن و توندڕەوی لە بەکارهێنانیان ببێتە هۆی دروست بوونی وازیی دەمارگیری.

لێرەدا گرنگی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەردەکەوێت بۆ ناسینی چەند شێوازێکی هەست و نەست بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەو گیروگرفتەکانی ژیان کە تاکەکان لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەو گرفت و دڵەڕاوکێدا بەکاری دەهێنن، بۆ هەست کردن بە هێمنیی دەروونی، کە بەیەکێک لە بنەما سەرەکییەکانی تەندروستیی دەروونی دادەنرێت و کار لە تەندروستیی تاک و خۆگونجاندنی لەگەڵ تاکەکانی دیکەی کۆمەڵ و دەورووندا دەکات. ئەمەشیان وایان لێدەکات کە مرۆڤێکی باوەڕ بە خۆو جێگرو سوودمەندو کاریگەر بێت بۆ کۆمەڵ، یاخود کەسایەتییەکی لەرزۆک و دەمارگیری لێدروست دەکات و وای لێدەکات هیچ باوەڕی بەخۆی نەبێت و شڵەژاوو بێ ئۆقرەو لاوازو بێ بەرهەم بێت.

**- بەڵام کێشەی لێکۆڵینەوەکە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بەم شێوەیە:**

لە ڕۆژگاری ئێستادا کۆمەڵگەی ئێمە بەجیاوازی توێژەکانی لەهەمووو کاتێک زیاتر.

١- پێویستی بە ناسین و تێگەیشتنێکی زانستییانەی

کەسایەتی و شێوازەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەو گیروگرفتەکانی ژیاندا هەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو گرفت و کێشانەی کە دووچاری دەبن بە شێوەیەکی دروست، هەروەها بۆ وەدەست هێنانی تەندروستی و ئاسایشی دەروونی بۆ تاکەکانی، بەتایبەتی بۆ لاوەکانی لەوانەش قوتابیانی زانکۆ بەو پێیەی کە لە چینێکی خوێندەواری ئەکادیمینە.

٢- هەروەها ناسینی ئاستی دەمارگیریان بۆ زانینی هەست و کرداریان لەلایەنە کۆمەڵایەتی و دەروونی و ئابووری و فسیۆلۆجییەکانەوە، بە جیاوازی نێرومێ و بەشی زانستی و ئەدەبی و ئاستی هۆشیاری خێزانەکانییەوە (بە هۆی بەرنامەو ڕێگاکانی توێژینەوەی زانستی و هۆیەکانی ئەژماری و بیناکردنی پێوەری شێوازەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکانی ژیان و پێوەری ماسلۆ بۆ ئاسایشی دەروونی و پێوەری - کراون کرسب- بۆ وازیی دەمارگیری)، ئەمەش بە مەبەستی تێگەیشتن لە کەسایەتییان و توانستیان و پەرەپێدانی بۆ بەشداری کردن لە بونیادنانەوەی کۆمەڵگاکەمان لەهەموو لایەنەکانییەوەو تێگەیشتنی مەرجەکانی بەدەست هێنانی ئەم ئامانجە، هەروەها بۆ ڕاسپاردەکردن بۆ دامالینی ئەو ئاستەنگانەی کە ئەم لێکۆڵینەوەیە پێیان دەگات، بەمەبەستی سوود وەرگرتن لە هێزو پسپۆڕیی گەنجان بۆ ئەوەی دووبارەو بە شێوەیەکی کاریگەرتر بێنەوە نێو کۆمەڵگە.

قەرەچەتانی لە ساڵی (١٩٩٦) لە کتێبی دەروازەی دەروونزانی، ئاماژە بەوە دەکات کە: مرۆڤ لە ژیاندا کۆمەڵێک پێداویستی فسیۆلۆژی و دەروونیی هەیەو تێرکردنیان دەبێتە مایەی خۆ سازدان لە تەک ژینگەو کۆمەڵ و بەردەوام بوونی ژیان، بەڵام تێرنەکردنیان و بێ بەش بوون لێیان، کۆمەڵێک گیروگرفت و ئەندێشەی جەستەیی و دەروونی بۆ ئەو مرۆڤە دەخولقێنێ. لە ڕۆژگارێکی وەک ئەمڕۆدا تێرکردنی هەموو پێداویستییەکان کارێکی ئاسان نییەو ئاڵۆزیی ژیان و زیادبوونی پێداویستی و حەزو ئارەزووەکانی مرۆڤیش ئەوەندەی دیکە گیروگرفتەکەی ئاڵۆزتر کردووە، گومانی تێدا نییە ئەگەر مرۆڤ لە ژینگەیەکی سادەو ساکاری بێ گرفتدا ژیاو توانی زۆربەی پێداویستی و حەزو ئارەزووەکانی بە ڕێگەیەکی ئاسایی تێر بکات. ئەوکاتە، ئەو مرۆڤە دەتوانێت لە تەک دەوروبەردا خۆی بسازێنێ و لەسەر ژیانی ئاسایی خۆی بەردەوام بێت، بەڵام ئەگەر لە کۆمەڵگاو شارستانییەتێکی دژوارو ئاڵۆزدا ژیاو ڕێگرو بەربەستی زۆر دانراو لەبەردەم تێرکردنی پێداویستییەکانیداو نەیتوانی بە ڕێگەی ئاسایی و سروشتی خۆی ئەو پێداویستییانەی تێر بکات، ئەوا تووشی گرژیی دڵەڕاوکێ و خەم و ئازار دەبێت و ناچار ڕووەو چەندەها ڕێگاو شێواز دەڕوات بەهیوای تێرکردنی ئەو پێداویستییانەو خۆسازاندن لە تەک



کەریم شەریف قەرەچەتانی

دەوروبەردا، لەو شێوازانە:

١- شێوازە هەستییەکان، وەک «چارەسەرکردنی کێشە، دوورکەوتنەوە، دەستدرێژی و شەڕانگێزی، کۆنترۆڵ کردنی خود (ظبط الذات،...تاد)».

٢- شێوازە نەستییەکان واتە میکانیزمە دەروونییەکان (میکانیزمەکانی بەرگریکردن لە خود)، کە لە ڕێگەیەوە خودی مرۆڤ ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورت و کاتیش بێت دەتوانێت زۆر لەو حەزو ئارەزوو و پێداویستییانە تێر بکات و خۆی لە بارێکی هاوسەنگیدا بهێڵێتەوە لە تەک ژینگەدا. شایەنی ئاماژە بۆ کردنە کە زۆربەی ئەو میکانیزمانە مرۆڤ هەستیان پێ ناکات و لێیان بێ ئاگایەو جۆرێکە لە خۆ هەڵخەڵەتاندن و بەردەوام و نقوم بوون تێیاندا مرۆڤ بەرەو هەڵدێرو لاری دەبات و لە ڕێچکە سروشتییە مرۆڤایەتییەکەی دوور دەخاتەوە، بەڵام مرۆڤ بەناچاری لەبەر ئاڵۆزی و دژواریی ژیان پەنای بۆ دەبات، هەندێ لەو میکانیزمە دەروونییانەش ئەمانەن:

(چەپاندن- قەرەبووکردن- هەڵگەڕانەوە- نکوڵی یان حاشالێکردن- لادان- خەیاڵ و زیندەخەون- خۆخستنەشوێن- ئاوەژووکردن یان بەسەردا برین- هۆهێنانەوە (التبریر)- گەڕانەوە- بەرزکردنەوە یان سەرخستن.

*** دیاریکردنی زاراوەکانی لێکۆڵینەوە:**

یەکەم: میکانیزمەکانی بەرگریی هۆشەکی

دەبباغ لە کتێبێکدا بەنێوی (أصول الطب النفسی) (١٩٧٧) میکانیزمەکانی بەرگری هۆشەکی بەم جۆرە پێناسە دەکات:

ا- میکانیزمە هەستییەکان (هۆشیارییەکان): بریتییە لە کەرەستەکانی مرۆڤی هۆشیار بۆ بەرپەرچدانەوەی گیروگرفتەکانی ژیانی ڕۆژانە، بۆ نموونە: هەوڵدان بۆ زاڵبوون بەسەر ئاستەنگەکانی ژیان لە ڕێگەی ویستەوە یان بە گۆڕینی


فرۆید

ئامانجێک بە ئامانجێکی دیکە یاخود هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکی و کێشەکان بە شێوازێکی واقیعییانەی مەنتیقی...تاد.

ب- میکانیزمە نەستییەکان: میکانیزمە نەستییەکان ئەم جۆرە میکانیزمانەن کە مرۆڤ لەکاتی شکست هێنانی شێوازە هەستییەکان لە چارەسەرکردنی گرفتەکان پەنایان بۆ دەبات، بەم جۆرە گۆڕەپانی ململانێکە دەکەوێتە گۆڕەپانی نەستەوەو مرۆڤ بەردەوام دەبێت لە هەوڵدانی بۆ پارێزگاری کردن لە خودی خۆی لەو هەڕەشەو مەترسییانەی دەبنە هۆکاری دروست بوونی شڵەژان و هەست نەکردن بە ئاسوودەیی و دڵەڕاوکێ.

(دڵەڕاوکێ)ش ئەو هەستە پڕ لە ئازارەیە کە بە سۆز بارگاوی کراوە، خۆی لەنێو هەموو ململانێ و ناکۆکییەکی چارەسەر نەکراو دەدۆزێتەوە. هەربۆیە مرۆڤ بێ ئاگاداربوون و هەست کردن پەنا بۆ چەند کەرەستەیەکی نەستی دەبات بۆ پاراستنی ئاسوودەیی و کەم کردنەوەی هەست کردن بە شکست هێنان و بێ بەش بوون و گوناە و بنەبڕکردنی دڵەڕاوکێ.

دووەم: هێمنی یان ئاسایشی (الأمن)

هێمنی یان ئاسایش وەک چەمکێکی گشتی بەم جۆرە پێناسەکراوە: بریتییە لە حاڵەتی کۆمەڵگایەک کە ئارامی و ئاسوودەیی و یەکسانی و گونجان و هاوسەنگی ئاسایشی تێدا بلاوە.

هەروەها (فەهمي)یش لە پێناسەکردنیدا دەڵێت:

بریتییە لە حاڵەتی هەست کردنی لەگەڵ یەک گونجاو (متجانس) بە ئاسوودەیی و باوەڕبەخۆ بوون، کە بەهۆی نەمانی مەترسیی ڕاستەقینە دوای گرتنەبەری چەندین شێوازی خۆپاراستنی شایستە دروست دەبێت.

سێیەم: هێمنی دەروونی

(ماسلۆ) بەم جۆرە پێناسەی دەکات:

بریتییە لە هەست کردن بە ئاسایش و پاراستن و پاساو ڕێژە و سەقامگیری و دوورکەوتنەوە لە ئازار، ڕزگاربوون لە ترس و دڵەڕاوکێ و پشت بەستن بە کەسانی شایستەو بە توانا بۆ بەدیهێنانی داواکارییە زیندووەکان.

چوارەم: واز (الميل)

مەنسوورو چەند پسپۆرێکی دیکەی ئەم بوارە لە کتێبەکەیان بە نێوی (أسس علم النفس العام) (١٩٧٨)، (مەیل)یان پێناسە کردووە کە بریتییە لە:

- بە دەنگەوە هاتن یان ڕازی بوون بەرامبەر بە بابەتێکی دەرەکی.

(رزوق)یش لە کتێبی (موسوعة علم النفس) (١٩٧٧)دا دەڵێت:

- مەیل ڕێچکەیەکی دیاریکراوە لە بەرزبوونەوەی جووڵە یان بیر بەرەو ئامانجێک لەوانەیە واز ڕەمەکی یان زگماکی بێت لە مرۆڤدا، یاخود بەهۆی خوێندن و پسپۆڕییەوە وەدەست هاتبێت، بەڵام هەموو کاتێک بەرەو ئامانجێک یان ئاراستەیەک هەنگاو دەنێ.

پێنجەم: دەمارگیری (العصاب)

عەوادی لە کتێبێکیدا بەنێوی (العصاب -١٩٩٢) پێناسەی دەمارگیری کردووەو دەڵێت:

دەمارگیری بریتییە لە کۆمەڵێک تەنگژەی دەروونی کە بەهۆی ململانێی نێو هێزە بەگژیەکدا چووەکاندا (دەرەکی بن یان ناوەکی) کە لە خەسڵەتە گشتییەکان هاوبەشن سەرهەڵدەدات و تووش بوو پێوەی دەناڵێنێت و دەبێتە هۆی دیاریکردنی توانستی خودی تاک و سەقامگیرنەبوون لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا.

- هەروەها (العبيدي) لەنامەی دکتۆراکەی (١٩٩١) لەبارەی دەمارگیرییەوە دەڵێت:

دەمارگیری بریتییە لە تەنگژەیەکی هەڵچوونی بەهۆی توندیی دڵەڕاوکێ و زێدەڕۆیی لەبەکارهێنانی میکانیزمە بەرگرییەکان دروست دەبێت، بەڵام لەگەڵ هەست کردنی دەمارگیرەکە (عصابي) بەم بارە دەروونییەی کە پێوەی دەناڵێنێت، کەچی بەگشتی و لە زۆربەی زۆری حاڵەتەکاندا ناتوانێ لێی ڕزگار ببێت.

* چوارچێوە تیۆرییەکەی لێکۆڵینەوە:

لەم چوارچێوەیەدا توێژەر ئەو تیۆرو بیروڕا زانستییانەی کە پەیوەستن بە گۆڕانکارییەکانی لێکۆڵینەوەکەی دەخاتەڕوو، چونکە ئەم کردارە ئەو چەمکە تیۆرییانە بۆ توێژەر دەستەبەر دەکات کە لە لێکۆڵینەوەکەیدا پشتیان پێ دەبەستێت، لەوانە:

**١- ڕووخاندن- الاحباط- Frustration:**

مرۆڤ لەژیانی ڕۆژانەیدا بەرەنگاری کرداری دان و وەرگرتن

دەبێتەوە، لەلایەکەوە بۆ تێرکردن و دڵنیابوون لە پاڵنەرو پێویستییە جۆراوجۆرەکانی، لەلایەکی دیکەشەوە بۆ وەڵامدانەوەی ورووژێنەرەکانی ژینگە کە بەسەریدا سەپێندراوە.

لەهەموو بارەکانیشدا ئەنجامی ئەو بەرەنگاربوونەوانە بۆ هەر مرۆڤێک جیاوازە بەپێی هەست و هۆشیاری بۆی هەروەها بەپێی توانای بەرەنگاربوونەوەکەی.

بێ گومان مرۆڤ ناتوانێت هەموو ئارەزووەکانی تێر بکات، چونکە واقیع و کۆمەڵ، کۆمەڵە داب و نەریت و پێوەرێک دەسەپێنن بەسەریدا کە دەبێتە هۆی گۆڕین و گۆڕینەوەی پێویستییەکانی مرۆڤ و دواتر بەناچاری هەست بەفشار بکات، چ لەناو خێزان و خزم و کەس و کاردا یان لەنێو برادەران یان لە کۆلێژیان بازاڕ یان دام و دەزگاکانی ....تاد). ئەمەش پێی دەڵێن ڕووخان واتە (إحباط) کە لە ئەنجامی لێکدان و ململانێ-ی دوو هێز یان زیاتر لە پاڵنەرەکانی مرۆڤ ڕوودەدات.

هەڵوێستە ڕووخاوەکانیش (المواقف الأحباطية) بە گۆڕانی بەهاو پلەی ئاڵۆزی و ئاسەواری بەسەر ئامانجەکانی تاکدا دەگۆڕێت.

هەندێ لەم هەڵوێستانە بەئاسانی چارەسەر دەکرێت و زۆربەی خەڵکیش هەندێ شێواز پیادە دەکەن بۆ چارەسەرکردنی، کەواتە لێرەدا هیچ کێشەیەک نییە تەنیا بۆ ئەو نەخۆشانەی کە توانستی شێواویان هەیە. کەواتە هەروەک چۆن تاکەکان لە سیفەت و سیماو تواناکانی دیکەو...تاد لەگەڵ یەکتری جیاوازن و دەکرێنە دوو جۆر:

أ- ئەو جۆرەی کە تاک بە بیرکردنەوەو جەستەو دەروونێکی هاوسەنگ بەرەنگاری کێشەو فشارەکان دەبێتەوەو تێیدا هەموو تواناو شارەزاییەکانی خۆی بەکار دەهێنێت بۆ دەرچوون لەو کێشەو فشارانە بێ ئەوەی کارەکەی لەدەست دەربچێت یان هاوسەنگی تێک بچێت.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە تاکەکان توانای زاڵ بوونیان هەیە بەسەر کێشەو گیروگرفتەکانداو بەچاوی بەرەنگاربوونەوەو ئارەزوو بۆچارەسەریان هەڵسوکەوت دەکەن نەوەک بەچاوی هەڵاتن و خۆ دوورخستنەوە لەم کێشەو گیروگرفتانە، ئەمەش یارمەتییان دەدات بۆ تێگەیشتن لە هەموو لایەنەکانی گیروگرفتاکان و ئینجا چارەسەرکردنیان بە بەکارهێنانی باشترین و گونجاوترین شێوازو هاوکاری کردن لەگەڵ خێزان و مامۆستایاندا.

ب- ئەو جۆرەی کە تاکەکانی تێڕوانینیان لەسەر هەڵچوونێکی توندو بەکارهێنانی تواناکانیان بە شێوەیەکی لار(ملتوي) و بێ کەڵکەو دەبێتە هۆی تێکدان بەو شێوازە بێ کەڵک و لارانە. کە لە جیاتی ئەوەی چارەی کێشەو گیروگرفتەکان بکات، ئەوا دەکەوێتە ناو کێشەو گیروگرفتی دیکەوە، کە لە ئەنجامدا دەبێتە زێدەبوونی پلەی ڕووخان و (إحباط) قورسترکردنی هەڵوێستە فشارەکە بەسەریەوە. کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەبێتە هۆی زێدەبوونی نائارامی و شڵەژانی دەروونی و بەرزبوونەوەی پلەی وازی دەمارگیریەتی (الميول العصابية) تێیدا.

**٢- ململانێ- ناکۆکی (الصراع- Conflict):**

ململانێ بریتییە لەو ڕکابەری و بەگژیەکدا چوونەی لەنێوان حەزو ئارەزوو پاڵنەرە ڕەمەکییە سەرەکییەکانی مرۆڤ لەلایەک و بەهاو ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان و ئارەزووە هاو دژەکان یان ئاڵوگۆڕەکانی لەلایەکی دیکەوە، سەرهەڵدەدەن.

لەوانەیە هەندێک جار ئەو ململانێیە هۆشیارانەی پاژەکی یان گشتی بێت، هەروەها دەشێ نەستی بێت لەسەر ئاستی ناهۆشیارییەکی تەواودا، دوایی ئەو ململانێیەش لەلایەنی سەرهەڵدانی نەخۆشییە دەروونییەکانەوە بەگرنگترین ململانێ دادەندرێت.

تیۆری شیکردنەوەی دەروونی پێی وایە زۆربەی هەر زۆری ململانێ دەروونییەکان بەهۆی ئەو ئەزموونە هێدمەییانە سەرهەڵدەدەن کە منداڵ لە تەمەنی گەشەکردندا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە کە لە نەستدا کۆبوونەتەوەو لە هەست پێکردن و زانین بە دووری دەمێنێتەوە بەهۆی میکانیزمی خەفەکردنەوە.

**٣- میکانیزمە بەرگرییە هۆشەکییەکان:**

أ- میکانیزمە هەستییەکان: بریتین لە کردارێکی هەوسەنگی واقیعی لەلایەن خودێکی هۆشیارەوە، وەک هەوڵدانێک بۆ زاڵ بوون بەسەر ئاستەنگەکانی ژیان یان سەرکوت کردنی پاڵنەرو هۆکارەکان بە هۆی هێزو ویستەوە بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕەفتارێک لە ڕەفتارەکان، یان گۆڕینی ئامانجێک بە ئامانجێکی دیکە، یان لە ڕێگەی چارەسەرکردنی ململانێکان بەشێوازی مەنتیقییانەی هۆشەکی



ئادلەر

بەکاردەهێندرێت.

ب- میکانیزمە نەستییەکان: ئەم میکانیزمانە لەوانەی پێشووتر جیاوازن، هەندێک جار بەو جۆرە میکانیزمانە دەگوترێت فێڵەکانی بەرگری دەروونی، کە بریتین لە کەرەستەی خۆگونجاندنی سروشتی و هەموو تاکێک (ئاسایی و نائاسایی) بەهۆی نەستییەوە لەپێناو ڕزگاربوون لەو دڵەڕاوکێ و نائارامییەی بەهۆی ململانێ و شکست هێنان لە ژیان دروست دەبن پەنایان بۆ دەبات. کە هەرەشە لە ئاسایش و سەقامگیری و هاوسەنگیی دەروونی دەکەن.

(ئانافرۆید) لە ساڵی (١٩٤٨)دا، گفتوگۆیەکی تێروتەسەلی پشت بەستوو بە بەڵگەو ڕاستییە دەروونییەکان لە بارەی میکانیزمەکانی بەرگری ئەنجام داوە، تێیدا ئاماژەی بۆ میکانیزمە بەرگرییەکان لە کەسایەتیدا کردووە، کە پێی وایە گەر وڵاتان لە کاتی هەست کردن بە هەرەشەو مەترسی لەپێناو پاراستنی هێمنی و ئاسوودەییان پەنا بۆ بەرگری کردن ببەن، ئەوا گشت تاکێک لەتاکەکانی کۆمەڵ وەک وڵاتان وایە، تەنیا کاتێک هەست بە هەرەشەو مەترسی بکات ئەوا ڕاستەوخۆ پەنا بۆ (میکانیزمەکانی بەرگری دەبات). بۆیە ئەوتاکەی هەست بە مەترسی و هەرەشەکردن نەکات ئەوا هیچ پاڵنەرێک پاڵی پێوە نانێت بۆ دروست کردنی ئەو میکانیزمانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فرۆید وای بۆ دەچێت کە هەر یەکێک لە ئێمە ژێر خانێکی شارەزایی هەرەشەئامێزی تایبەت بەخۆی هەیە، هەر بۆیەش پەنا بۆ دروست کردنی ئەو میکانیزمانە دەبات لە پێناو کەم کردنەوەی هەست کردن بە مەترسی و پارێزگاری کردنی هێمن و ئاسوودەییمان، هەروەها هۆرنای لە (١٩٥٠) سێ شێوازی بەرفراوان بۆ پێوەندیی نێوان خەڵک جیادەکاتەوە، کە ئەوانیش:

١- جووڵانەوەی بەرەو خەڵک.

٢- جووڵانەوەی دژ بە خەڵک.

٣- جووڵانەوەی دوور لە خەڵک.

هۆرنای ئەو سێ جووڵانەوەیەشی بەناوی سێ چارەی دەمارگیریەتی ڕوون کردەوە کە بریتین لە هەوڵدان بۆ کۆنترۆڵ کردن (السیطرة). هەوڵدان بۆ دەست کەوتنی خۆشەویستی. هەوڵدان بۆ دەست کەوتنی سەربەستی و ئەم سێ چارەیەش هەوڵدانی کەسی دەمارگیرە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ناکۆکییەکانی ناوەوەیدا.

هەروەها (ئادلەر) گرنگییەکی زۆری بەو کێشانەی ژیان دا کە پێویستە هەر تاکێک چارەسەری بکات و ئەم کێشانەشی لەسێ پۆلدا کۆکردەوە:

ئەو کێشانەی کە هەڵسوکەوت بە ئاراستەی کەسانی دیکەدا دەگرێتە خۆی کێشەکان پیشە (المهنة)، کێشەکانی خۆشەویستی، (ئادلەر) وای بۆ دەچێت کە چوار شێوازی



ڕۆسۆ

سەرەکی لە ژیاندا هەیە کە خەڵک بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم کێشانە بەکاری دەهێنن:

- چەشنی یەکەم لە شێوازی ژیان دەسەڵات و دەسەڵاتدارێتی پێشان دەدات لەگەڵ کەمێک لە هەست و گرنگی پێدانی کۆمەڵایەتی ئەگەر هەبێت. ئەو کەسەی ئەم جۆرە شێوازە بگرێتە بەر لە ژیاندا وا هەڵسوکەوت دەکات کە هیچ ئیعتبارێک (إعتبار) بۆ خەڵکی دیکە دانانێت.

بەم جۆرە کەسی زۆر توندڕەو (Verulent) هێرش دەکاتە سەر کەسانی دیکەو ئازاری دەوروبەر دەدات و تاوان دەکات و دەبێتە دکتاتۆر، بەڵام ئەو کەسەی کە توندڕەوی کەمترە، ئەوا ڕادێت (مدمن) لەسەر مەی خواردنەوەو ماددە بێ هۆشکەرەکان، یان پەنا دەباتە بەر خۆکوشتن (إنتحار).

- چەشنی دووەم لە شێوازی ژیان بریتییە لە جۆری وەرگر (The getting Type)، (ئادلەر) ئەم شێوازەی لە شێوازەکانی دیکەدا بەبڵاوتر داناوەو وای بۆ دەچێت کە ئەوکەسەی ئەم شێوازە دەگرێتەبەر لە ژیاندا ئەوا هەموو شتێکی لە دەوروبەر دەست دەکەوێت، بەم شێوەیەش پشت بە ئەوان دەبەستێت.

- چەشنی سێیەم لە شێوازەکانی ژیان بریتییە لە دوورە پەرێز (المتجنب) (The avoiding Type) ئەوکەسەی ئەم شێوازە دەگرێتەبەر ئەوا هیچ هەوڵێک نادات بۆ بەرەنگاربوونەوەو چارەسەرکردنی کێشەکانی ژیان و دوورە پەرێزە لە کێشەکان، یان هەر توانایەکی سەرنەکەوتوو لە ژیانیدا.

(ئادلەر) لێرەدا ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم سێ چەشنەی سەرەوە ئامادەنییە بەرەنگاری کێشەکانی ژیانی ڕۆژانە ببنەوە و توانای هاوکارییان نییە لەگەڵ کەسانی دیکەدا. هەر بەرەنگار بوونەوەیەک لەنێوان شێوازەکانی ژیانیان و دنیای واقیعی دەبێتە هۆی هەڵسوکەوتی نائاسایی وەک دەمارگیری



پاڤلۆڤ

و ورێنەگری (العصاب و الذهان) بەدیاردەکەوێت، بۆیە (ئادلەر) دەڵێت ئەم سێ جۆرە لایەنی گرنگی پێدانی کۆمەڵایەتییان نییە.

- بەڵام چەشنی چوارەم کە جۆری سوود بەخشی کۆمەڵایەتییە (النوع المفید إجتماعیاً) ئەو کەسەی ئەو شێوازە دەگرێتە بەر ئەوا توانای هاوکاری لەگەڵ کەسانی دیکەدا هەیە و بەگوێرەی پێداویستییەکانیان کاردەکات و لە چوارچێوەیەکی کامڵ و گەشەسەندوو گرنگی پێدانە کۆمەڵایەتییەکان، مامەڵە لەگەڵ کێشەکانی ژیاندا دەکات.

هەروەها زانایانی دەروونزانی دیکە وەک ئەریک فرۆم و هاری ستاک، سلیڤان.. تاد، بە شێوازی جیاواز باس لەم میکانیزمە دەروونییانە دەکەن.

### ئامانجەکانی میکانیزمی بەرگری هۆشەکی

گرنگترین ئامانج و ئەرکەکانی فێڵەکانی بەرگریی دەروونی بریتین لە:

١- کەم کردنەوەی گرژی و نائارامی دەروونی و پاراستنی مرۆڤ لە هەست کردن بە دڵەڕاوکێ.

٢- پارێزگاری کردنی هاوسەنگیی دەروونی.

٣- بە دیهێنانی ئارامی و هەست کردن بە ئاسوودەیی.

٤- پارێزگاری کردنی خودو بەرگری کردن لەسەری و پاراستنی بڕواو، ڕێزگرتن لەخود.

٥- پێشکەش کردنی چارەسەرێکی مامناوەندی بۆ ململانێی نێوان حەزو ئارەزووە پاڵنەرەکانی مرۆڤ لەلایەک و داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگا کە ڕێگرن لە بەدیهێنانی لەلایەکی دیکەوە.

٦- یارمەتی دانی لە داچەپاندنی (کبت) ململانێ دەروونییەکان و ڕێگە گرتن لەسەر هەڵدانیان.

**٤- هێمنی دەروونی:**

أ- تێرکردنی پێداویستییەکانی ژیانی مرۆڤ بەرمەجێکی بنەڕەتی لە مەرجەکانی خۆگونجاندن بۆ بەدیهێنانی سەقامگیری دەروونی دادەندرێت... بۆیە (ماسلۆ) پێی وایە شکست و دەستەبەرنەکردنی پێداویستی هێمنی مرۆڤ هۆکارێکە بۆسەرهەڵدانی زۆر لە نیشانە و شڵەژان لە کەسایەتیدا وەک دەمارگیری و باوەڕهێنان بە ئەفسانە و جادوو پەیڕەوکردنی لە ژیاندا کە بەخت دەستەبەردەکات.

- فرۆم دەڵێت: کارو بەرپرسیاریەتیی کۆمەڵگەی هاوچەرخ خۆی لە پەروەردەکردنی کەسایەتییەک دەدۆزێتەوە، کە هەست بە هێمنی و بڕوا بە خۆبوون و پێگەیشتنی لایەنەکانی کەسایەتییەکەی خۆی بکات، لەسەر بنەمای باوەڕهێنان بە خودو کیانی خودو پێویستی بە بەندیواری و خۆشەویستی و پێگەیشتن و خۆگونجاندن لەگەڵ دەوروبەردا.

- (ئادلەر)یش ئاماژە بەوە دەکات، کە کەموکورتی لەلایەنی کۆمەڵایەتی یان مەعنەوی دەبێتە هۆی هەست نەکردن بە هێمنی و ئارامی.

- هەروەها پەیڕەوکەرانی قوتابخانەی ڕەفتاری (سلوکی) نوێ لەسەروویانەوە (شافی)و (دولارد)و (میلر) پێیان وایە هەندێ لە هەڵسوکەوت و ڕووداوە ئاساییەکان، لەنێوانیاندا ڕووداوە تێرنەکراوەکان دەبنە هۆکاری سەرهەڵدانی دڵەڕاوکێی دەروونی، لەوانەیە مرۆڤ هەر لە منداڵییەوە تووشی هەڵسوکەوت و ڕووداوی وا بێتەوە ترس و هەڕەشە لەخۆیان بگرن و هیچ بوارێکی نەبێت بۆ خۆگونجاندنێکی سەرکەوتووانە، ئەمەش دەبێتە هۆی وروژاندن و نائارامی و هەڵچوون و گرژی و سەقامگیرنەبوون، بۆیە هێمنی دەروونی بە ڕوویەک لە ڕووەکانی کەسایەتیی ئاسایی و توخمێک لە توخمە گرنگەکانی خۆ گونجاندنی کاریگەر دادەندرێت، بە پێچەوانەشەوە واتە نەبوونی هێمنی دەروونی دەبێتە هۆی دروست بوونی کەسایەتییەکی نائاسایی لەرزۆکی پابەند بە مەیلی دەمارگیری کە کاریگەریی خراپی لەسەر خۆگونجاندنی تاک دەبێت.

- بەڵام (سۆلیڤان) وای بۆ دەچێت کە هەست کردن بە هێمنی دەروونی یەکێکە لە ئامانجەکانی ڕەفتاری (السلوک) مرۆڤ، مەبەستیش لە هێمنی دەروونی هەست کردنە بە ئاسوودەیی و دوورکەوتنەوەیە لە دڵەڕاوکێ.

هەروەها دەڵێت: مرۆڤ بەدرێژایی ژیانی بۆ دیهێنانی دوو ئامانج تێدەکۆشێ کە بریتین لە گەیشتن بە تێرکردنی پێداویستییەکان و هەست کردن بە هێمنی.

- (فرۆم)یش ئاماژە بە گۆڕانکارییە شارستانی و کۆمەڵایەتییەکان دەکات و دەڵێت: گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و شارستانییەکان کاریگەریی تەواویان بەسەر هێمنی دەروونییەوە هەیە، لەوانەشە کار بکەنە سەرشڵەژانی تەواوی

تەبیعەتی کۆمەڵایەتی (الطبائع الأجتماعیە) خەڵک:

- (هۆرنی)یش لە تیۆرەکەی لە بارەی (کەسایەتی)، جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە ئەو بنەمایەی کاردەکاتە سەر ڕەفتاری مرۆڤ بریتی نییە لە غەریزەی سێکسی و شەڕانگێزی وەک (فرۆید) بۆی چووە، بەڵکو بریتییەلە پێداویستی مرۆڤ بە هێمنی و ئاسوودەیی.

بۆیە (هێمنی دەروونی) بە پێداویستییەکی گرنگ لە پێداویستییەکانی قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ لە منداڵی و هەرزەکاری و لاوێتی دادەندرێت، بەتایبەتی بۆ لاوانی زانکۆ گرنگی تایبەتی خۆی هەیە، کە (هەرلۆک- Hurlocke) بە قۆناغێکی ورد لە قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ ناوی دەبات، چونکە لاوان لە قۆناغی زانکۆدا دەکەونە دووریانی، قۆناغی هەرزەکاری دواکەوتوو و سەرەتای قۆناغی کامڵ بوون، هەروەها بەپێی بۆچوونی مەجالییەکان (المجالیین) لەسەرووی هەموویانەوە (لیڤین) دەتوانین بە قۆناغی گۆڕانکاری بۆ هاتنە ریزی کۆمەڵ لە قەڵەمی بدەین.

بێگومان ئەو گۆڕانکارییەش لە هاتنەڕیزی کۆمەڵی هەرزەکارییەوە بۆ هاتنەڕیزی کۆمەڵی کامڵ بوون گۆڕانکارییەکی لە ناکاوە، واتە لە قۆناغێک بۆ قۆناغێکی نوێ، کە بە هەڵوێست و شارەزایی جۆراوجۆر دەوڵەمەندە، ئەمە سەرباقیی ئەوەی لەم قۆناغەدا مرۆڤ پێگەیشتنی کۆمەڵایەتی بەدی دەهێنێت و زۆربەی هەرە زۆری ڕوانگەو واژو بۆچوونەکانی لەبارەی ژیان دروست دەبێت و ئامادەی بەرپرسیارێتی ژیان دەبێت.

ئەوەی گرنگیی ئەم قۆناغەی ژیان لە مرۆڤدا دەردەخات گوتەیەکی (ڕۆسۆ)یە کە دەڵێت: دەتوانین لە قۆناغی لاوێتیدا مرۆڤ و گەلان چاکسازی بکەین، بەڵام لە قۆناغی پیریدا هەرگیزا و هەرگیز ناتوانین داوای چاکسازییان لێبکەین.

ب- هێمنی دەروونی لەلای ماسلۆ:

هێمنی دەروونی، ئاسوودەیی دەروونی یان هەڵچوونییە، حاڵەتێکە تێرکردنی پێداویستییەکان تێیدا مسۆگەرە و تووشی مەترسی نابن، ئاسوودەیی دەروونی توخمێکی تێکەڵە لە ئاسوودەیی خودی و باوەڕهێنان پێی لەگەڵ هاتنە ریزی کۆمەڵگەیەکی هێمن و ئاسوودە، مرۆڤی هێمن لە ڕووی دەروونییەوە ئەو مرۆڤەیە هەست بە تێرکردنی پێداویستییەکانی ژیانی دەکات و کۆڵەکە سەرەکییەکانی ژیانی لە مەترسیدا نین و لە حاڵەتێکی هاوسەنگی و گونجانی ئاسوودەییدا دەبێت و پێداویستی بە هێمنی دەروونی بە گرنگترین پێداویستییە دەروونییەکان و کاریگەرترین پاڵنەری ڕەفتار دادەندرێت بە درێژایی ژیانیدا، هەروەها پێوەندییەکی توندو تۆڵ و نەپچراوی لە غەریزەی (ڕەمەکی) پارێزگاری کردن لەپێناو مانەوەدا هەیە، دەستەبەرکردنی ئەم پێداویستییەش پێویستی بە تێکۆشانی بەردەوامی مرۆڤ هەیە بۆ هێنانەدیی ئەو کەش و هەواو بارودۆخەی کە پێداویستییەکانی تێداتێردەکرێت و پەرە بە گەشەکردنی دواڕۆژی دەدات بۆ باشتر بەکارهێنانی توانا و هێزی لە ژیاندا.

بێگومان پێوەندیی تاک بەکۆمەڵگەو دەسەڵاتی سیاسییەوە بەندە بەچەندێتی تێرکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی ژیانی ڕۆژانەی ئەو تاکە، ئەو پێداویستییانەی ڕێگە بۆ ژیانێکی هێمن و ئاسوودە خۆش دەکەن پەرەو گەشەش بە ژیانی دەدەن.

ج- چەمکی هێمنی هەڵچوونی کە (ماسلۆ) دایهێناوە چەند ڕەهەندێکی بنەڕەتیی هەیە، لایەنە لە بارەکانی خۆی لە مانەی خوارەوە دەبینێتەوە:

یەکەم: هەست کردن بە ڕازی لێبوون و خۆشەویستی و پێوەندیی برایەتی و پێشوازی لێکردن لەلایەن خەڵکانی دیکەوە.

دووەم: هەست کردن بە ئەندامێتی (الأنتماء) لە کۆمەڵ و پلەو پایە لەنێو کۆمەڵگەدا.

سێیەم: هەست کردن بە سەلامەتی و نەبوونی هەڕەشە لەسەرهێمنی دەروونی.

لەم سێ ڕەهەندە سەرەکییەی سەرەوەشدا یازدە ڕەهەندی دیکەی لاوەکی دروست دەبێت کە لایەنە پۆزەتیفەکانی خۆی لەمانەی خوارەوەدا دەبینێتەوە:

١- جیهان و ژیانی ڕۆژانە بە ژیانێکی خۆش و ئاسوودە دانان.

٢- هەست کردنی تاک بە کەسانی دیکەو وەسف کردنیان بە مرۆڤی باش و بەکەڵک.

٣- هەستی باوەڕ بەخۆبوون بەرامبەر کەسانی دیکەو کەم کردنەوەی ڕکابەری لەگەڵ خەڵکی و بوونی گیانی لێبوردەیی.

٤- واز (المیل) بۆ پێشبینی کردنی دەستکەوتنی خێرو خۆشی.

٥- هەست کردنی تاک بەخۆشی و شادی.

٦- هەست کردن بە هێمنی و سەقامگیریی هەڵچوونی و نەبوونی ململانێ.

٧- واز بۆ کرانەوە بە دەوروبەرو کۆمەڵگە لە بری تەرکیزکردنە سەرخود.

٨- لە خۆڕازیبوون و لێبوردن لە خود.

٩- ئارەزووی تاک لە بوونی کەفائەت و توانست بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان.

١٠- نەبوونی وازی دەمارگیری و ورێنەگری (الذهاني) بە شێوەیەکی ڕێژەیی و ڕووبەڕووبوونەوەی واقیعییانەی بارودۆخەکان.

١١- کۆبوونەوە لە دەوری کۆمەڵ و کۆمەڵگەدا.

**٥- دەمارگیری (العصاب- Neurasis)**

نەخۆشیی دەمارگیری یان داهێزانی دەمار، بریتییە لە شڵەژانی ئەرکی کەسایەتی (Functionel)، کاردەکاتە سەر هەڵچوونی تاک و خۆشی و ڕادەی ڕازی بوون لە ژیان بەگشتی. هەندێک بەو حاڵەتە دەروونییە وەسفی دەکەن کە دەکەوێتە نێوان کەسایەتیی ئاسایی لەلایەک و کەسایەتیی وڕێنەگر لەلایەکی دیکەوە، واتە ئەم نەخۆشییە دەروونییە بە قۆناغێکی ئاسایی دەست پێ دەکات، ئینجا بە دەمارگیری و دواتر بە وڕێنەگری، بەڵام هیچ سنوورێکی لێک جیاکەرەوە لەنێوان ئەم سێ ئاستە (ئاسایی- دەمارگیری- وڕێنەگری) دانییە، بۆ نموونە لەوانەیە نیشانەکانی دەرمارگیری لەلای کەسێکی ئاسایی هەبن، بەڵام هەمان ئەم نیشانانە لەلای مرۆڤێکی وڕێنەگر زۆر بە توندو تیژی سەرهەڵدەدەن کە ئاماژە بۆ جیابوونەوەی کەسایەتی و دوورکەوتنەوەی لە واقیع دەکات.

هەندێکی دیکە پێیان وایە نەخۆشیی دەمارگیری و وڕێنەگری دەکەونە دوو دووری ئەستوونییەوە لە یەک، لێک جیاوازن، جیاوازیی هەرە دیارو بەرچاویش لەنێوان مرۆڤی دەمارگیرو مرۆڤی وڕێنەگر بریتییە لەوەی کە یەکەمیان لەگەڵ واقیع و دەوروبەری خۆی دانابڕێت و هەست بەو شڵەژانە دەروونییە دەکات کە تێیدا دەژیت و زۆرجاران هەوڵی خۆ چارەسەرکردن دەدات، بەڵام مرۆڤی وڕێنەگر بە پێچەوانەوە لە دەوروبەری خۆی دادەبڕێت و توانستە هەڵچوونییەکان و هۆشەکییەکانی تووشی شڵەژان و شپرزەیی دەبن، بۆیە دەمارگیری شڵەژانە لە هەڵچوون بەهۆی دڵەڕاوکێی توندوزێدە ڕۆیی لەبەکارهێنانی میکانیزمە بەرگرییەکان دروست دەبێت لەگەڵ پەی پێ کردنی مرۆڤی دەمارگیر بەو موعاناتەی کە هەیەتی، بەڵام لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ناتوانێ خۆی لەو موعاناتە ڕزگاربکات.

* تیۆرە دەروونییەکانی دەمارگیری:

ئەم شیکردنەوانە لە قوتابخانە ناودارەکانی دەروونناسی هەڵدەقوڵێن:

١- تیۆریی شیکردنەوەی دەروونی (فرۆید):

دەتوانین بڵێین تیۆری شیکردنەوەی دەروونی تاکە تیۆرییەکە نزیکەی بە تەواوەتی دیاردەی دەمارگیری شیکردۆتەوە، فرۆید پێی وابوو نەخۆشیی دەمارگیری دەرئەنجامی ئەو پێداویستییە دەروونی و سێکسییەکە لە ساڵانی سەرەتای تەمەنی مرۆڤدا سەرهەڵدەدات.

دواتر فرۆید هەر بە مەبەستی شیکردنەوەی ئەم دیاردە پەنای بردە بەر تیۆرێکی دیکە تیۆری (گرێی ئۆدیبە)، فرۆید لەم شیکردنەوەیە ئەوەی بە دیار خستووە چۆن ململانێ لەسەرگرێی ئۆدیب و بەشێوازی جۆراوجۆر بۆی هەیە ببێتە دەمارگیری، پاشان ئەم ململانێیەی گشتگیرتر کرد لەنێوان بەشەکانی کەسایەتیی مرۆڤ (ئەو- من- منی باڵا)و وتی داچەپاندن و ئاسەوارەکانی داچەپاندن حاڵەتەکانی دەمارگیری دیاری دەکەن، هەر بۆیەش هۆکارەکانی ژینگە و تاقیکردنەوە سەرەتاییەکانی ژیانی منداڵی بەهۆکاری ڕێخۆشکەرو پەلەکەر بۆ دروست بوونی دەمارگیری لە قەڵەم دەدات، نیشانەکانی دەمارگیری چەند ڕێگە چارەیەکی ڕێژەیین کە نەست دوای کرداری داچەپاندن پێیان دەگات بۆ گەیشتن بەهاوسەنگی دەروونی.

نیشانەکانی دەمارگیری بە زمانێک باس لە خۆیان دەکەن کە زمانی هێمایە و ئاماژە بە ڕووداوەکانی نەستی مرۆڤ دەکەن.

٢- بەڵام (ئادلەر) لە شیکردنەوەی ئەم دیاردەیەدا پەنای بردۆتە بەر تیۆریی (خۆشەویستی خۆبەزل زانین و خۆسەپاندن) بەم پێیەی ئەم غەریزەیە غەریزەیەکی خۆڕسکاوە لە سروشتی مرۆڤدا و خۆشەویستی هێز پاڵنەرێکی بەهێزترە لە پاڵنەرە سێکسییەکەی (اللبیدو) فرۆید، لەم ڕوانگەیەوە دەمارگیری لەلای (ئادلەر) دەرەنجامی هەست کردنە بە لاوازی و خۆ بەکەم زانین و بێ توانستی لەبەرامبەر ئەو ڕەوت و بارودۆخانەی لە توانستی مرۆڤ بەدەرن. دەمارگیری بەپێی تیۆریی تاکایەتی (الفردیة) دەرئەنجامی هەرەشەردن و بێ بەش بوونە لە ئارەزووی توانا و هێزو هەوڵدانە بۆ قەرەبووکردنی ئەو لاوازی و کەموکورتییانە لە کەسایەتیدا بە دیاردەی دەمارگیری.

٣- (یونگ)یش لەو باوەڕەدایە کە کشان و گۆشەگیری (الانبساط و الانطواء) خەسڵەتی سروشتیی گرنگن لە مرۆڤدا، تەوەرەیەکە پاڵنەری (اللبیدو) سێکسی تێیدا خول دەخواتەوە و ئەو پاڵنەرە سێکییە بەرەو ناوەوەو بەرەو خود ڕێچکە دەگرێت لەلایەن گۆشەگیرەکاندا، بەڵام لەلای مرۆڤی کشاودا (الانبساط) بەرەو جیهانی دەرەوەی خود ڕێچکە دەگرێت، هەر بۆیە ڕەفتارە جیاجیاکانی مرۆڤی دەمارگیرو وڕێنەگر پێوەندی بەم دوو خەسڵەتە سروشتییەوە هەیە.

٤- فرۆیدییە نوێخوازەکانیش لە سەروویانەوە (ڕانک و هۆرنی و فرۆم) وەک پێشتر ئاماژەمان پێی کرد، چەند چاکسازییەکیان بەسەر تیۆرییەکەی فرۆید هێناوە، بەتایبەتی (ئانەفرۆید)ی کچی فرۆید کە دەڵێت:

دەمارگیری تەنیا دەمارگیریی (من)ە، میکانیزمە هۆشەکییەکانیش هەر لە کردەی (من) و دروستبوونیان دەرئەنجامی موعاناتەکانییەتی لەهێور کردنەوەی توخمەکانی کەسایەتیدا.

٥-بەڵام (بافلۆف پێی وایە هاوسەنگی لەنێوان کاردانەوەکان و سیستەمە دەمارییەکانی مێشک بەتایبەتی لە (توێکڵی سنجابی و ژێرەوەیدا) پێوەری سەرەکی تەندروستی دەروونییە. دەمارگیری شڵەژانە لەنێوان وەڵامدانەوەی وروژاندن و قەدەغەکردن (إستجابة الكف و الأستثارة).
ئەو وەڵامدانەوەیە کە پشت بە پێکهاتەی تاک دەبەستێت، هەر بۆیە بافلۆف نەخۆشیی هستریاو (ماندووبوونی دەروونی) Psych asthenia) بە دیارترین نەخۆشییەکانی دەمارگیری (العصاب) دادەنێت.

٦- زانایانی دەروونزانی بواری تیۆرەکانی فێربوونی هاوچەرخ (التعلم الحديثة)، لە لێکۆڵینەوەکانیاندا سوودێکی باشیان لە تیۆریی بافلۆف و تیۆریی ڕەفتاری کۆن (السلوكية القديمة) وەرگرتووە.

(ئایزنک)، یەکێک بوو لەو زانایانەی کە بانگەشەی شیکردنەوەی دیاردەی دەمارگیری کرد لە ڕوانگەی تیۆرە مەرجییەکەی بافلۆف و تیۆریی خەسڵەتی یۆنگ، (ئایزیک) پێی وایە دەمارگیری بریتییە لە عادەتێکی هەڵە لە تاکێک لە تاکەکانی کۆمەڵ بەهۆی چەند ئەزموون و باروودۆخێکەوە توشی بووە کە پشتیان بە ڕێگەی کاردانەوە مەرجییەکانی جۆراوجۆر بەستووەو هیچ پێوەندییەک لە نێوان دەمارگیری و نەستی مرۆڤ و داچەپاندن بەدی ناکرێت، بۆیە نەخۆشیی دەمارگیری ئاسانەو دەتواندرێ لە ڕێگەی کوێرکردنەوەی (الأنطفاء) نەریتە نەخۆشەکەو دروست کردنی نەریتێکی نوێ و دروست یان بە دروست کردنی ڕەفتارێکی سروشتیی نوێ لە شوێنی ڕەفتارە چەوتەکەدا چارەسەربکرێت.

٧- تیۆریی ڕەفتاری نوێ و... دەمارگیری (السلوكية الحديثه والعصاب).

وەک لە پێشتردا باسمان کرد ئەم تیۆرە دیاردەی دەمارگیری لەسەر بنەمای کاردانەوە مەرجییەکان و کاری پاڵنەرەکان و ئەزموونەکان شیدەکاتەوە، هەروەها چەند ڕێگە چارەیەکی بۆ چارەسەری دەستنیشان کردووە کە لەتیۆرە شیکردنەوە دەروونییەکەی (فرۆید) زۆر جیاوازە، هەربۆیە شیکردنەوەی ڕەفتاری بۆ نەخۆشیی دەمارگیری و چارەسەرکردنی بە قوتابخانەیەکی نەیار بەرامبەر قوتابخانەکەی فرۆید لە قەڵەم دەدرێت.

- دوای پەیڕەوکردنی ڕێچکەیەکی زانستییانە و شێوازی بەستنەوەی مەیدانی لەدیراسەکردنی گۆڕانکارییەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە و بەکارهێنانی چەند پێوەرێکی گونجاو و کەرەستەی ئاماری پێویست بۆ وەدەستهێنانی ئامانجەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە توێژەر ئامانجەکان دەخاتە ڕوو و شییان دەکاتەوە لە ڕوانگەی ئەو تیۆرو بیروڕازانستییانەی کە لەچوار چێوەیەکی تیۆریی پشتی پێبەستراوە.

دواتر توێژەر چەند ڕێنماییەک و ڕاسپاردەیەکی گونجاو لە ڕوانگەی ئەو دەرئەنجامانەی پێیان گەیشتووە پێشکەش دەکات، بەمەبەستی سوود وەرگرتنی زیاتر لە هێزو تواناو گروتینی لاوان و دووبارە لکاندنەوەیان بە ڕیزەکانی کۆمەڵ و بەشێوەیەکی کاریگەر بۆ نوێکردنەوەو ئاوەدانکردنەوەی نیشتمانە خۆشەویستەکەمان بە سەقامگیربوونی هێمنی و ئاسوودەیی و سەقامگیریی دەروونی و کەم کردنەوەی نامۆیی لەسەر ئەو ئەساسە زانستییەی کە لەتوێژینەوەکەدا ئاماژەی بۆ دەکرێت.. ❖

## سەرچاوەکان

..........

**١- الدباغ، فخري (١٩٧٧)، أصول الطب النفساني، ط٢، جامعة الموصل.**
**٢- رزوق، أسعد (١٩٧٧)، موسوعة علم النفس، ط١، مطابع الشروق- بيروت-.**
**٣- منصورو آخرون، (١٩٧٨)، أسس علم النفس العام.**
**٤- العبيدي، سعد خضير خلف، (١٩٩١)، المضاوف المرضية (الرهاب) و العلاج المعرفي لها، أطروحة دكتوراه غير منشورة، جامعة بغداد.**
**٥- العوادي، قاسم هادي (١٩٩٢)، العصاب، ط١، دار الشؤون الثقافية العامة-بغداد.**
**٦- مطلك، فاطمة عباس (١٩٩٤)، بناء مقياس مقنن للأمن النفسي لطلبة جامعة بغداد.**
**٧- قەرەچەتانی، کەریم شەریف (١٩٩٦)، دەروازەی دەروونزانی، هەولێر.**
**8- Boeree, George, (2000), PERSONALity THEORIES, microsoft I nternet explorer.**
**9- ATKWSON. RITAL. RICHARD AT-KINSON, EDWARD, E.smiTH. (1996), Hilgards I troduction to Psychology, PRINTED IN THE UNITED STATES of AMERICA.**
**10- Davidoff, L. LindAL, (1980), I NTRODUCTION TO PSYCHOLOGY, MCGRAW-HILL, I nc.**
**second Edition.**
**11- FROMM, ERICH. (1994). The Art of Listening, Fore work by RAINER FUNK, CONSTABLE.**
**LONDON.**
**12- Horney k, (1950), Neurosis and human growth. New york. Norton.**

# ڕۆشنگەری چییە؟

ئیمانوێل کانت
و/ لە فارسییەوە: سەید جەعفەری مستەفەوی
(بۆکان)

ڕۆشنگەری، دەرچوونی مرۆڤە لە کاڵیدا بە تاوانی خودی خۆی. کاڵیش، بێ هێزییە لە بەکارهێنانی فامی خۆی بێ ڕێ نوێنی کەسێکی تر. کاڵیش تاوانێکی خۆکردە، هۆی ئەوە کەم بوونی فام نییە، بەڵکو نەبوونی ئیرادەو دلێرییە لە بەکارهێنانیدا، بێ ئەوەی کەسێک ڕێ نوێنی بکات. دلێربە(١) لە بەکارهێنانی ئاوەزی (فام) خۆت. ئەمەیە دروشمی ڕۆشنگەری. تەوەزەلی و ترسنۆکییەک بووە بەهۆی ئەوەی کە بەشێکی زۆر لە مرۆڤ هەرچەندە کە سروشت لە مێژە ئەوانی پێگەیاندووە(٢) و لە ڕێنوێنی کەسانی تر ڕزگاری کردوون، بەڵام پێیان خۆشە (دەیانەوێ) هەموو تەمەنیان لە کاڵیدا بمێننەوەو، کەسانێکی تر ئاوەها بە فێرۆ بتوانن خۆ بگەیننە پلەی حەق داریان (ئەستونگییان).

کاڵی حەساوەییە، چونکی هەتا کتێبێک هەبێ کە بۆ من ئامرازی فامە، هەتا قەشەیەک هەبێ و لەباتی وژدانی من بێ و هەتا حەکیمێک هەبێ و پێم بڵێ چی بخۆم و چی نەخۆم من خۆم بۆ لە زەحمەت خەم، خۆ پارەش بگا من چ حەوجێم بە تێ گەیشتن هەیە، کەسێکی تر ئەم ئیشە ناخۆشە بۆ من بەجێ دێنێ.

بەشێکی زۆری مرۆڤ (ئافرەتان) چوون بەرەو پێ گەیشتنیان نەتەنیا لەلا دژوار نییە، بەڵکو زۆر پڕ لە مەترسیشی دەزانن، بۆیە حەق دارەکان (ئەستونگەکان) بەخێرا خۆیان چاودێری گەورەییان بەسەریاندا وەئەستۆ گرتووە. ئەمانە دوای ئەوەی گیان لەبەرە دەستەمۆکانی خۆیان باش گەوج کردیە بە جوانی ئاگادارییان لێ دەکەن کە ئەم بوونەوەرە هێمنانە لە ڕکەی(٣) منداڵیان دا، یانی ئەو بەندیخانەی کە بۆیان پێک هێناون، پێ نەخەنە دەرێ.

ئەوجا بەگوێیاندا دەخوێنن ئەگەر بێتو بەتەنیایی پێ بنێنە دەرێ چ مەترسییەک هەڕەشەیان لێ دەکات، بەڵام ئەو مەترسییانە ئەوەندەش گەورەنین کە دەیلێن، بەڵکو لە ئاکامدا بە چەندجار کەوتن و هەستانەوە شێوازی ڕێ ڕۆیشتن فێردەبن.

بەڵام نموونەیەکی ناقیس بەسە بۆ ئەوەی لە هەموو تاقی کردنەوەکانی دوایی بسڵەمێنەوە، زۆر دژوارە بۆ هەر کەسێک کە بە تەنیایی لەکاڵییەکی کە بووە بە سروشتی دووەمی، خۆی ڕزگار بکات، تەنانەت حەزیشی لێ دەکات، چونکو قەت دەرفەتێکی پێ نەدراوە، زۆر بێ دەسەڵاتە لە بەکارهێنانی ئاوەزی خۆی.

داب و نەریتەکانی (دارشتووی پێشوو) ئەم ئامرازە ئوتوماتیکییەیی کارهێنی ئەقڵانی- زۆر جاریش چەوت بەکارهێنانی توانای خۆی بوون بە ڕایەڵەی بەردەوامی کاڵی ئەوکەسەی ڕایەکانیش دادەماڵێ دەتوانێ لەسەر قوڵکێکی تەسکەوە بازێکی بێ متمانە بداو بەس، چونکو (فامی ئەو) خۆی بەم چەشنە جووڵەی سەربەخۆیانەی نەگرتووە.

لەبەر ئەمەیە زۆر کەمن کەسانێکی توانیبێتیان بە پەروەردەکردنی زەینییان، خۆیان لە کاڵی ڕزگار کردبێ و هەنگاویان بە متمانەوە هەڵێنابێتەوە، بەڵام ئەوەی کە تاقمێک(٤) خۆیان دەتوانن بە ڕۆشنگەری بگەن، ئەگەر لێیان گەڕێن هەر بە یەکجاری دەتوانن، چونکو هەمیشە چەند کەسێک «خوزان»(٥) تەنانەت لەنێو حەقدارەکان گومار دراوی سەر جەماوەر پاش ئەوەی کۆتی کاڵیان وەلانا، هەستی ئەقڵانی و ڕێزی بایەخەکان و گەیشتن بە مەبەستی بوونایەتی (هەستی) مرۆڤایەتییانە کەخۆ زانینە لە دەوروبەری خۆی بڵاودەکاتەوە. سەیر ئەودیە هەر ئەو جەماوەرەی کە لەمەوبەر بە دەستی خۆی کەوتبوونە ژێر کۆت ئەگەر ئێستا بە دەستی هێندێک لە حەقدارەکان کە خۆیان هێشتا بە ڕۆشنگەری نەگەیشتوون هان بدرێن، ئەمانە واناچار دەکا هەروا لەژێر کۆتی کاڵیدا بمێننەود! بڵێ وەها زیانێکە چاندنی تۆی بەدفامی (خام داودری)(٦)، هەر بۆیە بەدفامی لە ئەنجامدا لەو کەسانەی دای چاندوون تۆڵە دەستێنن بەم گوێرەیە جەماوەرەکان وردە وردە دەگەنە ڕۆشنگەری. دەکرێ بە شۆڕشێک ڕووخاندنی سەردڕۆیی تاکی و مل هوڕی دەسەڵات پەرستی دەس کەوێت، بەڵام چارەسەری ڕاستەقینەی شێوازی بیرەوەری(٧) لێ هەڵناوەرێت.

بەدفامی نوێش لە پاڵ بەدفامی کۆندا دەبنە ئامرازی



کانت

ڕێبەرایەتی جەماوەری گەورەی بیر لێ دۆزراوەکان. بۆ (بەدەست هێنانی) ڕۆشنگەری پێویستمان بە هیچ شتێک نییە مەگەر سەربەخۆیی، ئەویش سەربەخۆیی بەکەمترین زیان واتە: بەکارهێنانی ئەقڵی خۆ بە گشتی لە کاروباری هەمووانیدا، بەڵام دەبیسم لە هەموو لایەکەوە هاوار دەکەن، ئەقڵی خۆ وەکارمەهێنن! نیزامی دەڵێ ڕوینە بکەن ئەقڵ وەکارمەهێنن! سەرۆکی مالییە دەڵێ پول بە سەلەم دە: ئەقڵ وەکارمەهێنن! قەشە دەڵێ ئیمان بهێنن... ئەقڵ وەکارمەهێنن! (لە جیهاندا تەنیا سەرۆکێ(٨) هەیە کە دەڵێ.. هەرچەندی کو لە هەرشتێک کە دڵخوازتانە ئەقڵ وەکاربهێنن، بەڵام بەر حوکمیش بن!) ئەم شتانە هەموو سەربەخۆیی بەرتەنگ دەکەنەوە، بەڵام کام شت بەرهەڵستی سەربەخۆییەو چ شتێک نەوەک بەرهەڵست نییە، بەڵکو سەربەخۆییش بەردو پێش دەبات! وەڵامی ئەم پرسیارە ئاوا دەدەمەوە: (بەکارهێنانی هەمووانی بۆ ئەقڵی خۆ) دەبێ لە هەموو کاتێکدا ئازاد بێڵێتەوە ئەمە تەنیا ئامرازێکە دەتوانێ مرۆڤ بە ڕۆشنگەری بگەینێت، بەڵام بەکارهێنانی تایبەتی ئەقڵی خۆ زۆرجار بەرتەنگ و کورتە، هەرچەندە پێشکەوتنی ڕۆشنگەری لەم بوارەوە بە دژوارییەکی تایبەتی ناگا، هەستی من لە «بەکارهێنانی ئەقڵی خۆ لە کاروباری هەمووانیدا» ئەوەیە کەسێک وەک «خاوەن زانست» لە ئاست جەماوەری خوێنەران لە ئەقڵی خۆی کەڵک وەردگرێ هەروا بەکارهێنانی تایبەتی بەو بەکارهێنییە دەڵێم کە کەسێک دەتوانێ لەگەڵ ئەوەی کە کاربەدەستێکی ئیدارییە و کارێکی تایبەتی ژیاری پێ ئەسپێردراوە بتوانێ لە ئەقڵی خۆی کەڵک وەرگرێت، بەڵام هێندێک ئیشوکار کە بۆ ژیانی گشتیی بەنرخن ڕێبازێکی تایبەتی پێویستە، بەپێی ئەوە تاقمێک لە ئەندامانی کۆمەڵ دەبێ (بێ نواندنی ویستی خۆی) ڕەوشتێکی کاروەرکرانەی Pussiv هەبێ تاکو دەسەڵات بتوانێ بە یارمەتی پێک هاتنێکی ویستخوازانە، ئەوان بەرەو ئامانجەکانی هەمووانی ڕێنوێنی بکات و نەهێڵێ ئازار بە ئامانجەکان بگات.

لە کاتی وادا ئیتر جێ بیرکردنەود نامێنێت، بەڵکو مرۆڤ دەبێ بەر حوکم بێت، بەڵام کاتێک ئەو کەسە کە بەشێکە لەو هەموو دامو دەزگایە خۆی وەک ئەندامێکی کۆمەڵ وەبەر چاوبێنێت- یان وەک ئەندامێکی کۆمەڵگەی جیهانی- ئەوکات بە ناوی خاوەن زانست دەتوانێ بە نووسراوەکانی خەڵک بانگێشتێ بکات کە ئەقڵ وەکاربێنن بێ ئەوەی چەت بکەوێتە کارەکانی کە ئەویان وەک ئەندامێکی بێ دەسەڵات و گوێرا دێر لەسەر داناوە. بەم جۆرە ئەگەر نیزامییەک فەرمانێکی لە سەرۆکییەوە پێ دەگا، بێتو لەکاتی خزمەتیا بە ڕاشکاوی باسی سەمەرە یا بێ سەمەرەیی ئەو دەستوورە بکات، کارێکی زیانبەخشە ئەو دەبێ بەر حوکم بێت، بەڵام دەبێ بەرگری لێی نەکرێ، بەڵکو دەبێ وەک خاوەن زانستێ لە بابەت ناکۆکییەکانی کاروباری شەڕو نیزامی گەرییەوە تێر قسە بکات و بیانخاتە نێو بیسەرانی خۆی هەتا ئەوان دادوەری بکەن، هیچ ژیارێک ناتوانێ لە ئاست ئەو باجانەی کە لە ئەستۆیەتی سەرچۆتی بکات و نەیاندات. بەتایبەت باج دانەکەی ئەگین پێویست بێ وردە بیانوو هێنانەوە کارێکی ناحەزە (فیتنە هەلایسێنە بۆیە ناحەزە)، بەڵام ئەوکەسە ئیشێکی دژ بە ئەرکی ژیاری خۆی نەکردووە، ئەگەر زێدەیی و مل هوڕانە بوونی وەها باجێکی بە ئاشکرایی سەرزەنشت کردبێ، هەروەک کە ڕۆحانییەک بەپێی «بنەما بڕوایەکانی» (٩) ئەو کلێسایەی کە خزمەت کاریەتی دەبێ لەگەڵ فەقێ و بەرەی ئیماندارانی خۆی بدوێ، چونکو بەم مەرجەیان بە خزمەتکارگرتووە، بەڵام وەک خاوەن زانستێ سەربەخۆیی تەواوی هەیە و دەبێ گشت بیران کارییەکی باش لە بابەت کەمو کوڕییەکانی ئەو بنەمایانەوە بڵێ و بۆ ئەو بڕوا، کلێسایە ئەگەر پێشنیارێکی هەبێ لەگەڵ بیسەرانی بخاتە ئاراوە ئیتر لەم کارەدا هەست بە نائاسوودەیی ویژدان ناکرێت، چونکی ئەوشتەی بەپێی ئیشەکەی دەیڵێتەوە هەڵبژێردەی سەربەخۆو دڵ خوازی نییە، بەڵکو کرێ گرتەیەکە و دەبێ ئەوشتانەی بۆی دیاری کراوە بە خەڵک بڵێتەوە.

بەڵگەی بۆ کارەکانی دێنێتەوە و دەڵێ کلێسای ئێمە خەڵک فێری ئەوشتانە دەکات. پاشان بێ ئەوەی ئیمانی پتەوی بەو بڕیارانە هەبێ قازانجی بەجێ هێنانیان بۆ جەماوەری ئیمانداران دەڵێتەوە هەرچەند لەوانەیە حەقیقەتیان تیا شاردرابێتەوە.

ئەگەر شتێکی دژ بە بڕوای دەروونی خۆی لەو بڕیارانەدا بدینێتەوە ئیتر ناتوانێ لە ڕووی ویژدانەوە درێژە بە ئیشەکەی بدا، بەڵکو دەبێ خۆی لێ بکێشێتەوە، بەم شێوەیە ئەقڵی خۆ بەکارخستن لەلایەن مامۆستایەکی بەرپرس لە ئاست تاقمی ئیمانداراندا شێوازێکی بەکارهێنانی تایبەتییەو بەس، چونکو ئەو وەک قەشەیەک سەبارەت بە کۆبوونەوەیەکی ئاوا مەزنی کلێساییەکان ئیتر ناتوانێ و نابێت سەربەخۆبشی هەبێت؛ بەڵکو ئەمر پێکراوێکە بەناوو دەستووری ئەو کەسەی ئەوی بەخزمەتکار گرتووە کارێ دەکا، بەڵام بەپێچەوانەوە، وەک خاوەن زانستێک کە بەنووسراوەکانی لەگەڵ جەماوەر بە واتای ڕاستەقینە، یانی لەگەڵ جیهاندا دەدوێ و بەناوی ڕۆحانییەک لە سەربەخۆییەکی بەربڵاوی وەکارخستنی ئاوەزی خۆی لە کاری هەمووانیدا بەشدارە، چونکو ئەم قسەیەکە حەقدارەکانی

خەڵکی (لە کاروباری ڕۆحانیدا) دەبێ خۆیان لە کاڵەکان بن ڕاواندنێکی (خۆلەوێژێکی) ناماقوڵانەیە کە دەبێتە هۆی بەردەوامی ناماقوڵی، من دەڵێم شتی واناکرێت کە هێندێک لە قەشەکان واتە تاقمێکی کلێسایی، یان کلاسیسێکی(١٠) خاوەن شکۆ (ناوێک هۆڵەندییەکان بەوەها تاقمێکی دەڵێن) ئەم مافەی هەبێ کە لەنێو خۆیاندا لە بابەت هێندێک بنەمای نەگۆڕی دینییەوە هاوسوێندبن و (مافدارێتی) دایسیان بەسەر هەموو ئەندامەکانیانەوە هەبێ، بەهۆی ئەوانیشەوە بەسەر هەموو خەڵکدا داسەپێن و تەنانەت بیکەنە یەکجاری. هەر بەڵێنێک کە لە گەیشتنی بەرەی مرۆڤ بە ڕۆشنگەری بەرگری بکات پووچ و هەڵوەشاوەیە، تەنانەت هەر دەسەڵاتداران و ڕاوێژکارانی قانووندانەرو پڕ شکۆترین ڕێکەوتننامەکانی ئاشتی مۆری قەبووڵیان پێوەنابێ، هیچ سەردەمێک ناتوانێ سوێند بخوا کە سەردەمی داهاتوو بخاتە جەغزێکی وا کە نەتوانێ پەرە بە زانستەکانی خۆی بداو لە هەڵە خاوێنیان بکاتەوە، بەگشتی لە شارێی ڕۆشنگەریدا درێژە بەم کارەی خۆی بدا، ئەم کارە کوشتاری سروشتی مرۆڤایەتییە کە لە هەوەڵەوە ڕۆیشتن بە شازییانەی ڕۆشنگەریدا بە ئامانج و مەبەست داناوەو داهاتووان مافیان هەیە وەها ویستێکی سەرە ڕۆیانەو زۆڵەکی بە یەکجاری فڕێبدەن. سەنگی تاقی کردنەوەی ئەوشتەی کە بەناوی یاسا بۆ خەڵکی دادەڕێژن ئەمەیە کە ئاخۆ خەڵک یاسای وا بۆخۆیان دادەنێن یانا؟ بەڵام تاکو پێکهاتنی یاسایەکی باشتر، بۆ ماوەیەکی کورت و دیاری کراو ئەو کارە دەکرێ. تا لە سایەی ئەم ڕێکو پێکییەدا بە تایبەت ڕۆحانییەکان سەربەخۆییان هەبێ وەک خاوەن زانستێک بە ئاشکرایی (لەگەڵ هەمووان) واتە لە ڕێی نووسراوەکانیانەوە لە بابەت هەڵەو کەموکورییەکانی دامەزراوی ئێستاو ڕێکخراوەکانی پێشوودا بڕوای خۆیان دەربڕن، لە کاتێکدا «ڕەوتی لەگەڕ» هەروا بەردەوامەو ویست و ڕای جۆراوجۆر لەم بابەتەوە ئەوەندە تاقی بکرێتەوە کە بتوانن بە هەڵوێستێکی تێکڕایی (تەنانەت بەتێکڕایی نەبێ) بگەن، پاشان بەپێی ئەم ویستە تێکڕاییە پێشنیارێک بە دەرباری شاهانە بدرێ تاکو پارێزەرێ ئیماندارانێک بێ کە لە ڕوانگەیەکی باشترەوە لە بەینی خۆیاندا لە بابەت گۆڕانی ڕێکخراوەکانی هەنووکەیی مەزەبەوە پێک گەیون، بێ ئەوەی بەرهەڵستی ڕێگەی کەسانێک بن کە هێشتا گیرۆدەی پێوەندی کۆنن، بەڵام هاو پەیمان بوون لەسەر یاسایێکی بنەڕەتی مەزەبی بەردەوام کە هەرگیز کەسێک نەتوانێ گومانی تێدا بکات، بەتەواوی قەدەغەیە، تەنانەت ئەگەر ئەو پەیمانە لە ماوەی ژیانی مرۆڤێکدا ببڕێتەوە، چونکی مرۆڤایەتی لە ماوەیەکدا لەپێشکەوتن بەرەو چاکە دەوێستێنێ و بە داهاتووەکان زیان دەگەینێ، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ ڕۆشنگەری خۆی لە بابەت ئەوشتانەی کەدەبێ بزانێ وە درەنگ بخا، بەڵام وازهێنان لە ڕۆشنگەری سەبارەت بەخۆی و بە نەتەوەکانی دوایی، پەلامارە بە مافی پارێزراوی مرۆڤایەتی و پێ شێل کردنی ئەو مافەیە. پاشا مافی ئەوەی نییە یاسایێکی وادانێ کە خەڵکی مافی دانانی ئەویان نەبێ، چونکی دەسەڵاتی یاسا دانانی پاشا لێرەوە سەرچاوە دەگرێ کە ویستی هەمووان لە ویستی خۆیدا بەیەک دەگەنێت و دەیانخاتە بەرچاو. ئەگەر ئەو بتوانێ هەموو ڕێکارییەکانی دیاری کراوی ئێستا لەگەڵ ڕەوتی ژیاری سازگار بکا، ئیتر دەتوانێ ڕایەتەکانی سەربەخۆ بکا تاکو ئەوشتەی پێیان باشەو بۆ ڕزگاریان بە پێویستی دەزانن بە کاری بێنن، ئەمجار چ شتێک لە ئەستۆی ئەو نییە مەگەر (گێڕانەوەی) کەسانێک کە بەشەڕخوازی (تووڕەیەی) بەرهەڵستی خەڵکین لە تەقەلای هەموو لایانەیان بۆ زانست و پەرەپێدان بەو شتانەی کە بۆ چاکە و ڕزگاریان بە پێویستی دەزانن، مەکۆی بەرزی شایەتی ئەگەر نووسراوەی ڕایەتەکانی کە بۆ بەدەس هێنانی ڕوانگەیەکی هاوبەش لەگەڵ یەکتردا لە شەڕە قسە (دەمە قاڵە)دان، بیانخاتە ژێرچاودێری دەسەڵاتی خۆی زیان دەبینێت.

چ ئەوکاتەی بڕوای بەرزی خۆی بێ ڕەخنەی لێ دەگرن کە: «دەستوورییەکان دەستوور لە قەیسەر وەرناگرن» (١١)، چ ئەوکاتەی کە بە پێچەوانەی ویستی ڕایەتەکانی بۆ پشتیوانی کردنی سەرەڕۆیی دەروونی تاقمێک سەرەڕۆ، چاوەدێری وەکاربینێت دەسەڵاتی گەورەیی خۆی پتر سووک دەکات، ئەگەر ئێستا پرسیار بکرێت ئێمە هەنووکە لەسەردەمی ڕۆشنگەریدا دەژین؟

دەڵێم نا، بەڵام لەسەردەمی ڕۆشنگەری-دا بەڵێ. لە بارودۆخی ئەمڕۆدا خەڵک هەموو لەوەها قۆناغێکدا نین و ناکرێ بیانخەیتە (ئەو قۆناغەوە) کە بێ ئەوەی کەسێک ڕێنوێنییان بکات لە مەسەلەکانی ئایینیدا ئەقڵی خۆیان بە باشی و بەمتمانە وەکاربێنن، هێشتا لەم بابەتەوە کەموکوڕی زۆرن هەرئێستا دیاردەی ئاشکرامان لە دەست دایە کە مەوداگەلێ لە ئاستیاندا ئاواڵە دەبێتەوە.

کە بەرەو ئەو سەربەخۆیانە بچنە پێش و بەرهەڵستەکانی ڕۆشنگەری گشتی و دەرچوونیان لە کاڵیدا بەتاوانی خۆیان وردە - وردە کەمتر دەبێتەوە، سەردەمی ئێمە لەم ڕوانگەیەوە سەردەمی ڕووناک بەخشییە، یان (بە وتەیەکی تر) سەردەمی فێردریکە(١٢).

شازادەیەک کە بە کەمایەسی نازانێ کە بڵێ: لە مەسەلەکانی مەزەبیدا خەڵکی بۆ بڕوایەک کێش ناکات و، بەڵکو لەم بابەتەوە بەتەواوی سەربەخۆیی هێشتوونەتەوە، شازادەیەک نازناوی خۆبایی مودارایەتی بۆ خۆی دانابێت و تەسی دەداتەوە بەڕاستی شایەکی ڕۆشنگەرەو شیاوی ئەمەیە کە خەڵکی جیهان و داهاتووە پێزانەکان بەهۆی ئەوە پێیدا هەڵ بڵێن، کەوا بەرەی مرۆڤی هەتا جێیەک کە بەدەوڵەت پەیوەستە لە دیلی ڕزگارکردوون، بەهەمووان سەربەخۆیداوە کە لە هەموو مەسەلەکانی ویژدانیدا وەدوی ئەقڵی خۆیان کەون. لە سەردەمی ئاوەها شازادەیەکدا ڕۆحانییە خاوەن شکۆکان مۆڵەت دراون کە بێ ئەوەی ئەرکەکانی پێشەییان تەگەرەی تێ بکەوێ بەوپەڕی سەربەخۆییەوە وەک خاوەن زانستێک بە ئاشکرایی هەر بیروڕایەک کە لەگەڵ بنەماکانی قبووڵ کراوی ئایینییاندا دژایەتی هەیە لە تەک هەموو خەڵکی جیهاندا بخاتە ئاراوە تاکو بە محەکی ڕەخنە تاقی بکرێتەوە. بەر لە ڕۆحانییەکان ئەم حەقە بە کەسانێک دراوە کە ئەرکەکانی

پێشەبیان دەست و باڵیانی نەبەستووەتەوە. ڕۆحی سەربەخۆیی بەرەو دەرێ ئامێز دەکاتەوە. تەنانەت هەتا جێیەک کە دەبێ بەرەنگاری ئەو بەرهەڵستانە بێت کە بەهۆی دەوڵەتێکی نەزان کارەوە سەریان هەڵداوە. ئەگەر سەربەخۆیی دەسەلاتی هەبێ لەبەرچاوی دەوڵەتدا نموونەیەکی ئاشکرا دێتە گۆڕێ کە هیچ جێگای مەترسی نییە: بۆ تێکدانی یەکێتی نەتەوایەتی و دەوڵەتی گشتی، مرۆڤ ئەگەر بە ئەنقەست ناچار نەکرێت وردە وردە خۆی لە بەدفامی دێنێتە دەر. لە ڕۆشنگەریدا من پتر لە هەموو شتێکی تر بە «دەرچوونی مرۆڤ لە کاڵیدا بە تاوانی نەفسی خۆی لە هەرێمی مەسەلەکانی مەزەبیدا» پێم داگرتووە، چونکو دەسەلاتدارانی ئێمە لە مەوداکانی تردا، وەک زانست و هونەر حەز ناکەن دەورگێڕی حەق داری (ئەستونگی) ڕایەتەکان بگێڕن، بەلام کاڵی لە بابەت ئایینییەوە لە هەموو چەشنێکی تری کاڵی سووک و چرووکترە، بەلام بیرەوەری سەرۆکی حوکماتێک کە لە هەرێمی مەسەلەکانی ئایینیدا ڕۆشنگەری پەرە پێ دەدا لەوانە تێ دەپەڕێ و بەباشی دەزانێ کە جێی مەترسی نییە کە بەرایەتەکانی ئیجازە بدا کە نەقڵی خۆیان لە بابەت یاسا دانانەوە، لە کاروباری هەمووانیدا بەکاربێنن هەروا بیروڕایان لە بابەت شێوازی باشتری دانانەوە ڕەخنەی بێ دەغەڵەی یاساکانی ئێستا لەگەڵ خەڵکی جیهان بخەنە نێوان. نموونەی مێژوویی و کەم وێنەو درەوشاوەی وەهاشایەک ئێمە هەمانە کە لەم کارەدا پێشەنگی هەموو شایانە تەنیا کەسێک دەتوانێ بڵێ: ئەقڵ وەکارخەن؛ هەر چەندو لە هەر بارێکەوە کە دڵخوازتانە، بەلام بەرحوکم بن: کۆمارێکی سەربەخۆی ڕۆشنگەر کە لە تارماییەکان ناترسێ و هاوکات بۆ پاراستنی ڕەوتی گشتی لەشکرێکی ڕێکو پێک و پڕ ئەژماری لە ڕەکێفدا هەبێ. هێشتا ناوێرێ ئەم قسەیە بکات. ئەگەر باش تێ بڕوانی لێرەدا کارەساتی مرۆڤ ڕواڵەتێکی غەوارە و بێ چاوەڕوان دەگرێتەبەر، چونکو هەموو شتێک کەم تا کورتی دژاو دژن.

وێ دەچێ کە پلەیەکی سەرتری سەربەخۆی ژیاری بە پێچەوانەی ئەوەی کە سنوورێکی ئاستەمی بۆ دیاری کردوون بە کەڵک بێ و پلەیەکی نزمتری سەربەخۆیی کەشو هەوایەکیان بۆ بخوڵقێنێ کە لەویدا بە هەموو توانایانەوە گەشەبکەن. دوای ئەوەی سروشت تۆیەکی لەژێر ئەم توێژە ڕەقەدا (لەپاڵ سوپای ڕێکو پێک و پڕ ئەژماری پارێزگەری ڕەوتی گشتی بەمیهرەبانی پەروەردە کرد، هۆگری و خۆشەویستی زاتی مرۆڤ بۆ بیرەوەری کاریگەر دەبێ (لە ئاکامدا خەڵکی بەردەوام لە کاری سەربەخۆیدا بەوزەتر دەبن) و لە ئەنجامدا لەسەر بڕوای بنەڕەتی دەوڵەتدا شوێن دادەنێ کە بزانێ بە قازانجیەتی بە چاوێکی پتر لە ماشێنێ(١٣) بڕوانێتە مرۆڤ، ئاکارێک ڕەچاو بکا کە شیاوی مرۆڤ بێ. ❖

**پەراویزەکان**

........

**١- ئەسڵی ئەم وتەیە لە هوراسە (٦-٨٥ پ. ز) شاعیرو ئەدیبی ڕۆمی «دلێر بە لەزانین».**

**٢- یانی لە بابەت لەشەوە تەواو، بەلام لە بابەت بیرو هزرەوە چووکەو ناتەواو.**

**٣- ڕەوڕەوەیەک کە منداڵی تێ دەنێن بۆ ئەوە ڕێ ڕۆیشتن فێر بێت.**

**٤- تاقمێک: جەماوەرو خەڵکی کە لە مەحاڵێک یان وڵاتێکدا کۆبوونەتەوە، هەموو خوێنەرانی نووسەرێک.**

**٥- «خوداندیش» لە وشە ڕێنوێنەکانی مەتنەکەی کانت-ە، واتا کسانێک کە بەدوای داب نەریتەکانی داڕشتووی کۆن ناکەون، بەڵکو بەهۆی وەکارهێنانی فامی خۆیان لە بابەت چلۆنایەتی جیهاندا دەس دەکەن بە ڕۆشنگەریی.**

**٦- وەرگێڕی فارسی بۆ وشەی «vorurteil» لەجێی پێشداوری «خام داوری» داناوە من لە ڕەوتی مانای دەقەکەدا بەد فامی-م بە باشتر زانی(و.)**

**٧- بیرەوەری= تفکر بیرەوەر= متفکر.**

**٨- مەبەست لە فردریکی کەبیر ئیمپراتۆری پروسە.**

**٩- Symbol لەعلیمی کەلامی مەسیحی-دا بە بنەماگەلێ دەگوترێ کە قەبوول کردنیان بە مانای ئیمان هێنان کەسانێکە کە ئەو مەزەبەیان ڕەچاوگرتووە.**

**١٠- (Klassis) ئەنجومەنی (ڕاوێژکاری) کلێسا لە هولەندا کە هەقی قانوون دانانی لە بابەت مەزەبەوە هەیە.**

**11- Caesar non est Supra Grammaticos.**

**١٢- ئاماژە بە گەشەکردنی هەستی ڕۆشنگەری لە سەردەمی پاشایەتی فردریکی کەبیردا.**

**١٣- ئاماژە بە ژولین ئۆفرای دولامتری (١٧٠٩-١٧٥١) و کتێبەکەی ئینسان- ماشین، ١٧٤٨.**

**١٤- ئەمڕۆکە سێیەمی مانگی ئەیلوولە لە هەواڵی حەوتانەی بوشنگ هی مێژوو سێزدەیەمی ئەم مانگە ڕاگەیاندنێکم خوێندەوە کە جوابی بەرێز مندلسزون بەم پرسیارە لەم ژمارە ئەم مانگەی برالینیسە موناتسشریفت-دا دەنوسرێ. هێشتا من ئەو جوابەم بە دەس نەگەیشتووە چونکی لەوانە بوو بەم بۆنەوە ئەم جوابەم نەناردایێ، ئێستا ئەم نووسراوە تەنیا بە کەڵکی ئەم ئەزموونە دێت کە بڕوانین تاکو کوێ گەردوون دەتوانێ لە بیروڕاکاندا هاودەنگی و هاوڕەنگی بە دیاری بێنێت.**

**وەرگێڕ لە چەند دێڕێکدا**

- لە گوندی داشاغڵ-ی سەر بە بۆکان لە ساڵی (١٣٣٤) هەتاوی (١٩٥٥ز) لەدایک بووە.
- ساڵی (١٣٥٥) هەتاوی (١٩٧٦ز) لە زانستگای ورمێ خوێندوویەتی.
- فەرمانبەری ئیدارەی دامپزیشکی (بۆکان) بوو.
- هۆگری فەلسەفەو ئەدەب بوو.
- لە ڕۆژی ١٣٨٠/٥/١٩ هەتاوی (٢٠٠١ز) بەکارساتێکی دڵتەزێن کۆچی دوایی کرد.

**(ڕامان)**



# ڕاسیزم
# هەڵگێڕانەوەی جیاوازییەکان

محەمەد تەها حوسێن

**خودی نەتەوە**

خــودی نەتەوە، پێکهــاتەیەکی ســایکۆ کــولتــووریــیــەو ڕێکخــراوێکی بەیەکــەوە نووســاو و گــونجــاوی کــۆمــەڵە ڕەفـتـارێکی ناوەکی و دەرەکـیـیـە و لە هەست (شـعـور)ی بە کـۆمـەڵی نەتەوەیەکـدا داب و نەریت و بەها کـۆمـەڵایەتی و کـولتـووریـیـەکـان دەردەکـەون و لە نەسـتی (لاشـعـور)ی بە کۆمەڵیشیدا گەڕانەوە بۆ مێژوو و نووسان بە شوێن و سۆز بۆ یادەوەرییەکان و بەرگری لە مانەوەو دەرچوون بەرەو زەمەنێکی دیکە بە هیواو ئاوات و پرۆژەی دیکە لە ڕەفتارە جەستەیی و دەروونی و عەقڵییەکان خۆ دەردەخەن.

ئەگەر هەستی نەتەوە، عـاقڵانە بەقووڵایی نەستە بە کۆمەڵە مێژوویەکەیدا شۆڕبێتەوە و جبەخانە کەڵەکە بووەکەی لێک کاتەوە و ئیش لەسەر (بەها- داب-نەریت)ە کۆمەڵایەتییەکان و سـیـسـتـمـە سیاسی و ئابووری و ئینجا بەفـراوانتـری کـار لەسـەر کـولتـوور بکات و لە خـوێندنەوەیدا بۆیان، جـومگە زەمەنییەکانی مێژوو و کارکردنی زەمەن بەسەر دەرکەوت و دیاردەکان لێکداتەوە و پێوەندییە کولتووری و کۆمەڵایەتی و سـیـاسی و ئابووری و ژیارییـەکـان بۆ هەر یەکـە لە ئەڵقـە بە ئەرشـیف سـپـێردراوەکـانی مـێژوو وەک خـۆی ڕەسم بکات و ئەڵقـەی ئێـسـتـای خـۆی (نەتەوە،تاکەکـانی) بە تـەنیـا لەگـەڵ یەک مێژوودا بخاتە بەراوردکارییەوە، ئا لەو حاڵەتەدا نەتەوە بوونەوەرێکی یا مـەوجـوودێکی وریاو بەهەسـت و عـاقـڵـەو بەرهەمـهـێنی فـیـکرێکی خاوێنی مـێـژوویی، کـۆمـەڵایەتی، سیاسی، فەلسەفی دەبێ و نەخۆشییە فیکرییەکانی ڕاسیزم و شـۆڤـێنیـزم کـە دواجـار لەچەمکەکـانی ناسـیـونالیـزم و وەتەنچییەتی نا هاوسەنگدا ژینگە دەدۆزنەوە و گەشە دەکەن لە مێژووی بە ئاگادا ڕەگیان ڕۆناچێ.

خــودی نەتەوەش وەک خــودی هەر تاکــێـک ئامــادەگی لەبەریەکتـرازانی هاوسەنگیی سـایکۆلۆژی و کەسـێتی هەیە، چوون کەسی (عوسابی) لە ئەنجامی لاسەنگ بوونی ئۆردەری یا ڕێکخراوی دەروونی و ترازانی پێوەندییە ئاسـاییـەکـانی تاک لەگـــەڵ دەوروبەری خــۆی و لەگــەڵ خــودی خــۆیدا دەردەکــەوێ، ئاوەهاش (کــۆمــەڵی عــوسـابی) دیاردەیەکی سەمەرە نییە و گرووپی نەتەوەیی یا ڕەگەزیی هەبووە لەسەر ڕێچکەی ئاسایی گەشەی سایکۆسۆسیۆلۆژی و لە بازنەیەکی فـراوانتـری مــێـژووییــدا لایداوە یا لادراوەو ســەرتاپا مـەوجـوودێکی کـۆمـەڵایەتی نا هاوسـەنگی هەڵچـوو یان بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی (ملکەچ)ی لێ پێکهاتووە.

مەوجوودی کۆمەڵایەتی ستەمگەر مێژوویەک بەرهەم دێنێ، پڕیەتی لە بردنە دەرەوەی هێزو دەسەڵات و بەردەوام هەوڵدان بۆ بەرهەمـهـێنانی هێزو بەکاربردنی لە پێناوی فـراوانکردنی جـوگـرافـیـای دەسـەڵات و هەژمـوونی سـیـاسی. ئەم جـۆرە مـەوجـوودە هەروەک هیگڵ دەڵێ، تەنیـا یەک کـەس تێـیـدا ئازادە، ئەویش ئیمپـراتۆر، شا، سەرۆک کۆمار... تاد-یەو هەر هەموو تاکەکانی نەتەوە یا هاووڵاتیانی نیشتمان دەبێ لەبەر ئەو کـەسـە خـۆیان ڕێکخـەن و بۆ ئەو بژین، تاک و هاووڵاتیـان ئازادییـەکـانی خۆیان دەبەخشنە ئەو تاکـە ئازادەو ناوە ناوە بەیعــەی بۆ نوێ دەکـەنەوەو وێنە و هێـمـاکــانی دەسـەڵاتی تاکی ئازاد دەبن بەهێـمـای ئایدیۆلۆژی و تادێ پیرۆزی وەردەگرن. بەمـانایەکی دیکە کۆمەڵگە هەر هەمووی دەبێ بەیەک کـەس و هەر ئەو کـەسـەش کـەکۆمـەڵە (مـانا)ی دەبێ و بە (مەوجوود) دەخوێندرێتەوە.

بەرهەمـهـێنانی هێـز، ئەگـەرچی دیاردەیەکی دەرکـەوتووی پێوەندییە سروشتییەکانی تاک بە کۆمەڵ و تاکەکانی دیکەو کـۆمـەڵگەو تاکـەکـانی ترە، بەڵام لە حـاڵەتی کـۆمـەڵگەی ستەمگەردا کە گرێی خۆ بە زل زانی و گەورەیی لە دەروونی



هیگل

مێژووەکەیی و سیستەمە سیاسییەکەیدایە. بەرهەمهێنانی هێزو بڕی بەرهەمهاتوو لێی دابەش ناکرێتە سەر هەموو فەزاکانی ژیان و ئەو هێزە تەنیا لە لەشکر و سوپاو عەسکەرو کەلوپەلەکانیاندا مانای دەدرێتێ. شمشێرو پاشان چەکەکانی دیکەی بەرهەمهاتووی تەکنۆلۆژیای شەڕ، دیارترین هێماکانی پۆلێنکردنی هێزمەندەکانی بوونە و هێزیش تەنیا بەو ئاماژانە دەرککراوەو لێی ڕوانراوە.

لێرەدا کۆمەڵگەی ستەمگەرو سیستەمی سیاسی کە بژاردەیەکی ستەمگەر لێی دەخورێ، وێنەی یەکتر دەدەنەوەو لە گرێی بەخۆنازین و خۆ بەزل زانییەوە قەوارەی بوونی خۆیان جیادەکەنەوەو پەرژین ڕێژی دەوروبەری خۆیان دەکەن، لەنێو ئەم پەرژینەدا پرۆسەی دروستکردنی یەک تاک (کەسی ملکەچ) بۆ بژاردەی فەرمانڕەوا بە بەردەوامی کاری خۆی کردووە. کەسی ملکەچیش لە حاڵەتی هەڵبژاردنی خۆی بۆ ئەم میکانیزمە بەرگرییە چێژ لە ملکەچی وەردەگرێ و ڕاستەوخۆ دەکەوێتە نێو ماشێنی پێکهێنانی سیستەمی دەسەڵاتی پیرۆزو لە ڕوانگەی بژاردەی دەسەڵاتیشەوە مێژوو دەبینێ و دیمەنەکانی هەڵدەداتەوەو دەخوێنێتەوە، تا سەرەنجام بژاردەی دەسەڵات لەهێماو ڕووداوەکانی مێژووی خۆیان مێژوویەک لە چوارچێوە دەگرن و دەیکەن بە مەرجەعی هەڵێنجانی فیکری (نەتەوە، کۆمەڵ، ڕەگەز)، لەوانەیە زەقترین نموونە بۆ کەسی ملکەچ و بژاردەی دەسەڵاتی ستەمگەر لە مێژووی نوێدا نازییەکانی ئەڵمانیا بووبن کە لە بەرنامەیەکی پلان ڕێژکراوو لە زەمەنێکی نزیکەی نۆ ساڵەدا، کۆمەڵگەیەکی ئامادەو ملکەچ پێکهات و هەر هەمووی بوو بە یەک ماشێنی گەورەی جەنگێکی سووتێنەر.

کەسی ملکەچ کە بەرهەمی هێزێکی گەورەتری دەرەوەی خۆیەتی، هەمیشە لەنێوان دوو ئاماندا لە دڵەڕاوکێیەکی تێدا بووە، هێزێک دەیەوێ لە فەزای ملکەچی دەری کاتە دەرەوە، هێزێکیش ڕایدەکێشێتە ناو قووڵایی ملکەچی. بە مانا شەڕ لەنێوان خۆ ڕزگارکردن و خۆ دۆڕاندندا، مانەوە لە هەریەکە لەم فەزایانە ئاستی هێزی دەرەوەی تاکەکە خۆی کە دەسەڵاتی سیاسییە دیاری دەکات. سایکۆلۆژییەتی ملکەچی یا گوتاری ملکەچان لەلایەن خۆیان ڕەسم ناکرێ و نانووسرێتەوە، ئەو بۆی نییە لە هۆکارەکانی پەیڕەوکردنی ئەسفاری دەقەکانی گوتاری ملکەچی بکۆڵێتەوە یا بە هزری خۆی بیانخوێنێتەوە.

کەسی ملکەچ هەمیشە لە کورسی خوێنەرانی دەقە پیرۆزەکاندایە و لەدوا کەسی ژمارە یەک دەڵێتەوە. کۆمەڵی لەو جۆرە ئاسان لە قالب دەدرێ و چوار چێوە بەند دەکرێ، چونکە جۆرێک لە ئامادەگی بۆ ملکەچی چووەتە ناو ستراکتوری دەروونی تاکەکانەوە.

ئەگەر مێژوو یا ئەڵقەیەکی دیاری مێژوو لەلایەن بژاردەی دەسەڵاتی ڕەگەزییەوە لە چوارچێوە بگیرێ و فیکر بەهەموو دینامیکییەتی خۆیەوە بکەوێتەوە خزمەت گەڕان بەدوا پیرۆزییەکانی ڕەگەزو نەتەوەو بەرهەمهێنانی هێماکانی گرووپی نەتەوەیی لە بژاردەی فەرمانڕەواوە نەخۆشی سکیزۆفرینیای خۆ بە گەورە و پیرۆز زانی دەگرێتەوەو ئیدی نەتەوە لەوەهەمەوە مێژووی خۆی دەنووسێتەوە و پێشکەشی بژاردەی دەسەڵاتی دەکاو خۆشی دەبێ بە کەرەستە لەبیرکراوەکانی ئەم مێژووە. لەو حاڵەتەدا نەتەوە- ڕەگەز پیرۆز دەکرێ کە پیرۆز بوو وەک ئایدیۆلۆژیا پەیڕەو دەکرێ یا باشتر بڵێین دەپەرسترێ. پەرستن وەک پێوەندییەکی ڕۆحی هەمیشە لەنێوان کەسی ملکەچ و خودانی دەسەڵاتی ڕەهاوەیە، ئەم تەقسە (تەقسی پەرستن) هێمایەکی ئاینییەو هەردەم مانا بووە بۆ پێوەندی نێوان بەندەو خالق.

کاتێ ئەم شێوە پێوەندییە دادەبەزێتە خوارەوە بۆ بەیەکەوە گرێدانی تاک لەگەڵ تاکی دەسەڵاتدارەوە، ئەوا دەسەڵات لەو حاڵەتەدا خەسڵەتێکی خواوەندانە وەردەگرێ و خوازیار دەبێ بپەرسترێ. بەدبەختی نەتەوە یا ڕەگەزی پیرۆز لەوەدایە لە یەک کاتدا دەبێ دوو پەرستراویان هەبێ بژاردەی دەسەڵات و نژادی ڕیشەداری مێژوویی پاک و بێگەردیشیان، بە مانا خودی نەتەوە لێرەدا توتالیتاریزەی بەهاو ترادیسیۆنەکان دەکاو بە پیرۆزی دەیانناخنێتە قەوارەی سایکۆلۆژی تاکەکانییەوە، بە دوا میکانیزمەکانی خۆ فوودان و خۆ بە پاک و ڕەسەن زانیندا دەگەڕێ، زەمانی خۆی دەباتەوە سەر ئادەم و ڕیشەکەشی لەو سارەتایەوە دەچەقێنێ، خوێنی ڕەگەزی خۆی بە پاکترین و تۆوەکەشی بە بەرەکەت و ڕۆحیشی بە باڵاتر دەزانێ.

ڕەنگە ناسیونالیزم و وەتەنچییەتی توندڕەوانە باشترین و لەبارترین ژینگەی بەخێوکردنی ڕاسیزم بن و ئەگەر ڕیشەی ناسیونالیزم بۆ نزیکەی سێ سەد ساڵێک بەر لە ئێستا دەگەڕێتەوە، بەڵام سەدەی بیستەمیش زەمەنە درەوشاوەکەی بوو، لەو سەدەیەدا ناسیونالیزم لە چوارچێوەی سیاسی گیراو هەڵو مەرجەکەشی زیاتر زەمینەیەکی بە پیتی تەشەنەکردنی

بوو.
ئەگەر سۆسیۆلۆژیست و بیرمەندەکانی بواری بەرهەمهێنانی فیکرو فەلسەفە بە خۆیان و فیکرەکەیانەوە بەستراوەی خۆیانن و لەنێو پێوەندییەکانی زەمەنی خۆیاندا هەڵسووڕاون، وەلێ لە سەدەی بیستەمیش و بگرە ئێستاش کە باس لە پێکهێنانی قەوارەی نەتەوەیی و پتەوی کۆمەڵگە و زەرووەتی پێکەوەنانی دەسەڵات و پێوەندییەکانی هاووڵاتی و دەسەڵات و کۆمەڵگەی سیاسی و مەدەنی دەکرێ لە جیاتی بیناکردنی فیکری تازە لەسەر فیکری کلاسیک ناوی هۆبزو لۆک و مۆنتسیکۆ و رۆسۆو ڤیبەرو هیگڵ و....تاد. بە دوا یەکدا دێن و بێ ئەوەی ئەمانە هیچیان خەبەردارین، هەمان پیرۆزییەکانی دەقە ئایینییەکان وەردەگرن.

بە مانا پیرۆزکردنی فەرهەنگ لە لایەن تیۆریزەکەرانەوە، ئەم حاڵەتە ئەوەندەی دۆگمای هزر دەگەیەنێ، ئەوەندە دەرچوون (الانطلاق) لەو مەرجەعە تیۆریانە نییە. هەڵبەتە هەریەکە لەوانە رۆڵی بەرچاوی بینیوە لە بە فیکرکردنی ناسیونالیزم و هیدیکەی وەک دۆرکهایم و هەندێ لە هاوڕێیانی قوتابخانەی فرانکفۆرتیش و چەندانی دیکە ناسیونالیزمییان بۆ نەتەوەو قەوارەی نیشتمانی خۆیان لە قاڵبێکی فەزا جیاجیای دینامیکیدا گرتووە، بەڵام لە پرۆژەی ناسیونالیزمی سەرەتایی یا رووکەشدا تەنیا ناوهێنانی ئەمانە و هەوڵدان بۆ لێکدانی ڕاو بۆچوونەکانیان و بردنەوەی ڕای خۆت بۆ سەر ئەوان، جگە لە ئیعتیباردانەنان بۆ زەمەن و پێدراوەکانی چیدیکەت بۆ زیاد ناکات.

کولتووری مرۆڤایەتی لە ئەڵقە زەمەنییە مێژووییەکانی خۆیدا لە یەکتر دابڕاونین، بە مانای (پچڕان) چوون هزریش لەسەر مێژووی خۆی ئیش دەکاو دەکەوێتە کاری وەبەرهێنان (استثمار)ەوە، واتە دۆزینەوەی فۆرم و گەوهەری دیکە بۆ دراوو داواکراوەکانی کە ڕاستەوخۆ زادەی زەمەنێکی جیا لە ڕابردوو دەبێ و جۆری بەرهەم لێرەدا شتێکی دیکەیە، لەو حاڵەتەدا پرۆسێسی جووڵەی سۆسیۆلۆژی بە پێوەندی تازەتر هەڵدەسوورێ و سیستمی ڕەفتاریش بە حوکمی زەمەنی تازەو دەرکەوتە تازەکانییەوە جیاواز دێنە بەرچاو. سیستمی ڕەفتار بە مانا هەڵسووڕانی تاکەکان لەگەڵ خۆیان و لەناو کۆمەڵدا بە گوێرەی ڕێکخراوی دیکە لە هەر چەقێکەوە سەرچاوە بگرێ.

### کلێشەی ناسیونالرِاسیزم

نەتەوە یا گرووپی رەگەزی و ئەتنی بۆ ئەوە ناژی لەبەر کلێشەیەکی سۆسیۆلۆژییەوە مێژووی خۆی بنووسێتەوە و لە بیناکردنی پێوەندییەکانیدا دامەزراوە فەرهەنگی و کەسە بیریارەکانی ئەوەندە بە کەم بزانێ و بیانخاتە پەراوێزەوە.
بە مانایەکی وردترو روونتر ئەگەر گرووپێک بیانەوێ لە حزبێکی سیاسیدا خۆیان ڕێکخەن و بازنەی کاری خۆیان فراوان بکەن، مەرج نییە لە دیدی ڤیبەرو وایت هێد و



مۆنتسکیو

مارکس و هۆرکهایەرو... تاد-یەوە تەماشای حزبی سیاسی بکەن و بیخەنە قالبی ئەوانەوە، ئەوەندە بەسە ئەرکەکانی حزب و ئامانجەکانی کاریان بۆ دەکا دیاربن، وەکو تر کێشەی فۆرم و بەرنامەو دیسپلین و میکانیزم و ستراتیژەکانی جووڵان بە جووڵەی ئاسایی زەمەن و پێوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگییەکانەوە گرێ دەدرێنەوە. لە نموونەیەکی دیکەدا هەروا تێبگەین قەوارەگرتنی نەتەوەیی و پێکهاتنی سەروەری نیشتمانی قسەی هۆبزو لۆک و هیگڵ و ماکیاڤیللی و لینینی لەگەڵ نەبێ، تەواو نابێ و لەدەرەوەی شێواز بەندییە ناسروشتییەکەی دوای کۆنگرەی سولح و سایکس پیکۆش بێ کە هەر لە بنچینەوە نزیکەی سەد ساڵیان بەسەردا تێپەڕیوە، ئەوا دەرچوون لە عورفی نێو دەوڵەتی و لە ناوەوەی هەر وڵاتێکیش ئەگەر هەر گرووپێکی نەتەوەیی ئەم ئاراستەی هەبێ، ئەوا خیانەتی نیشتمانییە.

ئەم قاڵبگرتنە سۆسیۆسیاسییە کە لە جووڵاندنی ناسروشتی مێژوو لە دایک دەبێ، ماوەیەک کولتوورێکی ناشەرعی لێ دێتە ئارا بێ سەرەتا و بێ کۆتا، بە مانا نە لە لاهووت بناغە دادەکوتێ نە لە زانست و سیاسەتی رووت، لەم حاڵەتەدا کوێرانە کولتوور لە ناچیزی خۆیەوە بۆ سەرەتایەک دەگەڕێ لێیەوە سەرچاوە بگرێ.

ڕەنگە پیرۆزکردنی نەتەوە،ڕەگەز، تا ئاستی (گەلی بژاردە) ئەو چوارچێوەیە بێ بۆ ڕاسیزم دەبێتە ئایدیۆلۆژیا. لە خۆرهەڵاتی ئەورووپا و ئاسیای بچووک و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و گەلێ شوێنی دیکەدا نەتەوەی لەو باباتە هەن، پیرۆز کرابن یا وردتر بڵێین لە سەدەی بیستەمدا بژاردەی دەسەڵاتی سیاسی یا پارێزەرانی کولتووری نەتەوەیی و ڕەگەزی، ویستوویانە و بانگەشەیان بۆ کردووە لە جوگرافیای ئێستایان بچنە دەرێ و جوگرافیای ئەتنیکی بکەن بە چوار چێوە. ئەلکسەندەر سۆلجنستین داوای پێکهێنانی یەکێتی سلاڤی دەکا بۆ ئەو وڵاتانەی بە سلاڤی دەدوێن، بە مانا گەڕانەوە بۆ توخمی (زمان) و سوود وەرگرتن لە

پارادایمی ناسیونالی دەوڵەتی نەتەوەیی تاک ڕەگەزو زمان. ئەم پارادایمە لە زۆر جێگەی دیکەدا پراکسیس کراوە، فەرەنسای ئێستا لەو بابەتەیە.

بیرۆکەی فیدراسیۆنێک بۆ تورکەکانی جیهان کە لە ناوەوە و دەرەوەی تورکیا هەن، بانگەشەی بۆ دەکەن لە دەرەوەی سرووتی پیرۆز کردنی ڕەگەکانی نەتەوەو ڕەگەزیی نییە و لە ڕاستیشدا حزبی سیاسی و پانتاییەکی فراوانی (ئیمانداران) هەن لەو باوەڕەیان هەڵگرتووە. نیمانداری ئەو بیرۆکەیە باوەڕی بە گەورەتری نەتەوەکەی و برا گەورەیی خۆیان هەیە.

ئەوەی سەرنج ڕاکێشە تیۆریزەکردنی ئەم بیرۆکانە کردەی هزری بوونەو لەلایەن هزرمەندانی ناسیونالی لە چوارچێوە گیراون.

هەمیشە دروشمی پان ناسیونالیستەکان (یەکێتی لە زمان و هزرو کاردا) بووەو ئەو لۆژیکە چووەتە نێو کولتووری نەتەوەیی و لە کایەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە،سێکوچکەی یەکێتی لە (زمان- هزر- کار) بوو بە سێکۆچکەی پیرۆزو گوتاری پان ناسیونالیستەکان. یەکێتی لە زمان دارشتنی بناغەو ڕێسایەکی تۆکمە بۆ زمان و گێرانەوەی بۆ ڕەگەکانی و پێکەوەنانی مێژوو و ئەدەبیاتی تایبەت بە زمان و بە سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری و فەرهەنگی کردنی ئەو زمانە.

یەکێتی هزر بە مانا سەرچاوە گرتنی سیستەمە مەعریفی (ئەپستمۆلۆژی) یەک نەتەوە لە چوارچێوەیەکی پیرۆز کە تێیدا ڕەگەز جۆرە بیرکردنەوەو میکانیزمی هزریی تایبەت بە خۆی هەیە و لە ئەنجامدا یەک ڕەگەز لە مەرجەعێکی هزرییەوە ئێستاو ئایندە بەرهەم دێنێ و زۆربەی ئەندامانی وەک یەک بیردەکەنەوە سیستەمی هزریی بینا دەکەن و یەک هۆشی نەتەوەیی لە غوونەی (هۆشی بە کۆمەڵی نەتەوە) بەرهەم دێنن، هەروەک کۆمەڵە بازنەیەک لەنێو یەک بازنەی گەورەتردا.

یەکێتی کاریش لە پرۆسێسەکانی کاری سیاسی و جەنگی و ئابووری و کۆمەلایەتی و ... تاد.دا خۆی دەنوێنێ کە لە دواییدا هەر هەمووی لە خزمەتی بەرزی نەتەوە و پاریزەرانی بژاردەی کولتووری نەتەوەیی کە لە گرووپی دەسەلاتی سیاسیدا کەم دەبنەوە، دەردەکەون، لەو پارادایمە ڕەگەزییەدا نەخشە بۆ تەنیا یەک ڕەگەز و یەک سەرەتا دەکێشرێ و پرۆسەکانی ڕاسیزم شەرعیەت وەردەگرن.

### یەقینگەرایی نیچە.... دڵەڕاوکێی نیچە

ئەگەر ئەو لاپەڕانەی کە نیچە بۆ ئەڵمان و ڕەگەزی خۆی تەرخانی کردوون بخوێنینەوە، قورسایی (لاشعور)و کارکردی نەستی بە کۆمەڵی ئەڵمانی لە بیرکردنەوەی ئەو بیرمەندە ئاماژە بە بینین و لە قەوارەی سروشتی گەورەتر بینینی خودی نەتەوە، تاکی ئەڵمانی دیار دەبێ.

نیچە تێوریزەکەری ڕاسیزمی ئەڵمانی نەبووە، بەلام هزری ئەو لەخوێندنەوەو تەئویلی سیاسییەکاندا ناسانکارییەکی



ڕۆسۆ

زۆری بۆ گەلاڵە کردنی یەکێتی هزرو زمان و ڕەگەز و کاری ئەڵمانی کردووە. هزری نیچە، بەشێک لە مەعریفەی ناسیونالی تاکی ئەڵمانی، نەتەوەی ئەڵمانی، دەوڵەتی ئەڵمانی، تا ساڵی (١٩٤٥) پێک دەهێنا. تاکی ئەڵمانی وەک سوپەر تاک، ڕەسەن، بەهێز. نەتەوەی ئەڵمانی وەک زمانی ستانداردی سروشتی، نەتەوەیی ڕیشەدار، دەوڵەت وەک مەوجوودێکی یەکگرتوو.

نیچە شۆڕشڤانێکی سەرسەختی چاخی مۆدێرنی ئەورووپا بوو و بە ڕەخنەگرێکی مۆدێرنیزم دەدرێتە قەڵەم و گوتاری ڕەخنەیی لە مۆدێرنیزم لەوەوە سەرەتای گرتووە نیچە ئەگەر لە موتڵەقگەرایی و حەتمییەتی ڕەهەندە جیاجیاکان کشایەوە، حەتمییەتی دایە زانستی ڕووت و شۆڕشی لەسەر عەقڵ ڕاگەیاند، شۆڕش لەسەر عەقڵ لای نیچە ڕەتکردنەوەی یەک چاخی نزیکەی دووسەد ساڵی دەگەیەنێ و ئەو بیری لە شێوە تەفسیری فیزیۆلۆژییانەو دوور لە فیکری میتافیزیکا دەکردەوە و تەنانەت ئەخلاق و بەهاکانیش لای ئەو لە زانستەوە دروست دەبن. ئەم بینینە تا سەر لەگەڵ نیچە لەسەر یەک هێڵ بۆ یەکگرتنی فیکری ئەو هەنگاوی نەناوە، بەڵکو نیگەرانی نیچە هەمیشە لە ناکۆکییەکانی فیکری خۆیدا دەردەکەوتن.

نیگەرانی نیچەیی + نیگەرانی مۆدێرنیزم= شەڕی نیچە لەگەڵ خۆیی و بە یەکدا هەڵشاخینی تێگەی کایە جیاجیاکان.

نیچە لە حەتمییەتی زانستییەوە بۆ تەعالیمەکانی هیگڵ بایدەدایەوە. لە لایەکەوە زانستی بە بەرهەمهێنی ئەخلاق و هێزی جەدەلیانەی سیستمی پێوەندییەکان زانی، کەچی لە لایەکی دیکەوە بە مەنتیقی هیگڵ بۆ مێژوو، نەتەوە بیری دەکردەوە.

نیچە لە کتێبی (العلم المرح)دا دەڵێ: ئێمەی ئەڵمان هەموومان هیگڵین، تەنانەت ئەگەر هیگڵ بوونیشی نەبوویێ، چونکە بە غەریزە ئێمە ماناو نرخ دەدەینە خولانەوەی جەدەلی

و پەرەسەندنی دەرکەوتەکانی بوون و مەنتیقی خۆشمان بە تاکە مەنتیق دەزانین و دەمانەوێ قەناعەت بە خۆمان بهێنین کە ئێمە حاڵەتێکی سەمەرەو تایبەتین، لەوانەیە مەبەستی نیچە لە هیگڵی بوونی ئەڵمانەکان، تەنیا ئەڵمانیا وەک دەوڵەت، وەک نەتەوە بووبێ لە نەزەری هیگڵەوە، چونکە هیگڵ تەنیا کۆمەڵی بە مەوجوود دەزانی و تاکی بە مەوجوود نەدەخوێندەوەو ئیرادەی دەوڵەتی لەسەرەوەی ئیرادەی تاکەکان دەبینی، جگە لەوە هیگڵ زۆر بە کولتووری ئەڵمانیاو ریشەی لە کولتووری ئەورووپیدا دەنازی و لە چوارچێوەیەکی گەورەتردا ناوەندی دنیای لە ئەوروپا ڕەسم دەکرد.

نیچە باس لەوە دەکا کە ئەڵمانەکان بە غەریزە ماناو نرخ دەدەنە خولانەوەی جەدەلی و پەرەسەندنی دەرکەوتەکانی بوون، سەیرە کە لێرەیە نیچە زۆر شێلگیرە لەسەر حەتمیەتی بە زانستی بوونی پێوەندییەکان، کەچی غەریزە لە وەزیفەی دیاری خۆی دەترازێنێ و ئەرکی دیکەی دەخاتە پاڵ کە (١٠٠٪) کاری ژینگەیە، ماناداان بەشت ئەرکی زمان و ئیدراک و سیستمی مەعریفییە کە ڕاستەوخۆ لە کارکردی تاک و بەرخوردی لەگەڵ دەوروبەریدا شکڵ دەگرێ و جەدەلییەتەکەشی حاڵەتێکی ئاساییە و کاری بەسەر غەریزەوە نییە. مانا هەرگیز لە غەریزە چاپ نابێ و جەدەلییەتی مانا وەک میکانیزمی سروشتی بەرهەمهێنانی مەعریفەو ناونان لە دەرکەوت و دیاردەکان لەگەڵ گۆڕینی کەسەکان و کەرەستە بەرجەست و بەرهەستەکاندا دەگۆڕێ، واتە مانا جێگیر نییە و ئەگەر نیچە لەگەڵ هەمیشە گۆران و جەدەلە، بەڵام نەدەبوا ئەو ئەرکەی بەهی غەریزە زانیبایە.

مەنتیقی ئەڵمانی بۆچی دەبێ تاکە مەنتیق بێ؟، ئەگەر چی لێرەدا واتە لای نیچە مەنتیق زیاتر بەلای حیکمەت و فەلسەفەدا، دەچێ، بەڵام تاکە مەنتیق نییە، مەنتیقی نیچە نیشتمانچییەتی خۆی بوو، ئەڵمانیای لە سەرەوەو پشتەوەی هەرشتێکدا دەدیت، لێرەدایە لەگەڵ هیگڵ ئەڵمانیا وەک مەوجوودێکی پیرۆز دەبینێ، ئەڵمانی بوونی نیچە، فیکری نیچەی، لەناو گێژەن و فەرتەنەکانی ئەو وڵاتەدا تووشی ئەو نیگەرانییە کرد کە پێشتر چەند واژەیەکمان لەسەر درکاند. توندو تیژی فیکری نیچە لە ناو پرۆژەیەکی توندو تۆکمەی ئەڵمانییەوە تا هاتووە ڕیشەی داکوتاوە، تا ئەو ئاستەی لە بازنەکانی ڕاسیزم نزیک کەوێ و ڕاسیستەکان بۆی بگەڕێنەوە.

لەوانەیە بۆ کەسانی بواری فیکرو ئەوانەی لە مێژوو و زمانی فیکر سەر دەردەکەن و لە قەوارەی هزری نیچە و لێکدانەوەکانی بۆ مێژوو و بەهاو زانست و بوون ئاگاییان هەیە، ئەو کەسانە بتوانن خشتە و کایەو فەزا مەعریفییەکانی نیچە بەجیا هەڵسەنگێنن و بخوێننەوە و تەنیا لە کایە مەعریفەی ئەتنیکی ئەو بۆ تێرامانەکانی لە کایەکانی دیکە نەڕوانن. نیچە مردنی مرۆڤی کۆن ڕادەگەیەنێ، بەڵام سەرەتای مرۆڤێکی دیکەی نموونەیی دەستنیشان دەکا، گرنگ ئەوەیە ئەو پیرۆزی لە شتەکان دادەماڵێ و بە زمان، مانا، بەهاکانی سەردەمی خۆی هەڵدەسووڕا.

لێرەدا نیچە پیاوێکی نوێیە و تا ئەو ئاستە دەچێ کەسانێکی زۆر فیکری ئەو بەسەرەتای تێپەڕین لە مۆدێرنیزم بزانن، بەڵام کە ئەڵمانەکان هەموو دەباتەوە سەر هیگڵ ئەمەیان دیسانەوە ئەو نیگەرانییەیە کە پێشتر باسمان کرد.

مرۆڤی نموونەیی لای نیچە کەسی ئەڵمانی نموونەیی و دواتر کۆمەڵگەیەکی ئەڵمانی نموونەییە، ئەم کەسە لە (کۆن- ڕابردوو) پچڕاوە، سەرەتایەکی دیکەی هەیە و لە دنیایەکی دیکەی چەمک و ماناکاندا دەژی. نیچە دەیەویست دنیا بێتە باوەشی ئەڵمانیاوە نەوەکا ئەڵمانیا ببێ بە پنتێک لە دنیا. لەگەڵ قسەکردنی لەسەر فرە بابەتی جیاجیا نەیتوانیوە ببێ بە کەسێک خودی لەگەڵ زمانی یەک تەرجەمەی ئەوی دی بکا. نیچە، هیگڵ پیرۆز دەکا، بازنەیەکی پیرۆزی بە دەوری ئەڵمانیا و تاکی ئەڵمانیدا دەکێشێ، لە کاتێکدا کەس ئەوەندەی ئەو دژی پیرۆز کردن و پیرۆز ڕاگرتن نەبووە، ئەو بە جەرگانە مردنی گەورەترین پیرۆزی ڕاگەیاند، کەچی لە سۆنگەی بە یەک بینینی هەموو شتەکانی بوون لای هێگڵەوە تەماشای تاک و کۆمەڵ و دەوڵەت و دەسەڵات دەکاو جیاوازی شتەکان و جەدەلییەتی جووڵانیان لەناو یەک مەوجوودی گەورەی یەکگرتوودا دەبینێ کە ئەڵمانیایە، ئەگەر چی بیرمەندانی دوای مۆدێرنە لەو فێربوون مێژوو بە پارچە پارچە و ئەڵقە ئەڵقە ببینن و بخوێننەوە.

ئەگەر نەزعەی ڕەگەزبینی و ئەڵمان نژادی و لێکدانەوە سیاسییەکانی نیچە دەرهاوێژین، ئەوا کەس ئەوەندەی ئەو جووڵەی زەمەن و پێکهاتەی بەهاو دەرکەوتەکانی مێژووی بە عەقڵێکی زانستی نەخوێندۆتەوە، بەڵام لێک هەڵشاخینی فیکری نیچە لەناو کایە جیاجیاکانی مەعریفەی نیچەییدا تەرزە فکرێکمان دەداتێ، واچاکە هەر بە ناو خودی نیچەوە



ماكس ڤيبەر

ناوی بنێین. نیچه له قسه‌كردنی له‌سه‌ر ئه‌وانه‌ی ڕه‌گه‌زو جۆر ده‌پارێزن ده‌ڵێ:

ده‌روونی به‌هێـزو ده‌روونی پیس هی ئه‌و كـه‌سـانه‌یه كـه تا ئێـسـتـا زیاتر له پێشكه‌وتنی مـرۆڤـایه‌تیـدا به‌شـدار بوون، چونكه هه‌رگـیـز له گـه‌شـانه‌وه‌ی سـه‌رله‌نوێی ئاره‌زووه خامۆشه‌كان بێخه‌به‌ر نین، هه‌میشه كار بۆ زیندووكردنه‌وه‌ی گیانی به‌راوردكاری، ململانێی دژه‌كان، ئاره‌زوو له شتی نوێ و تازه، هه‌وڵی به جـه‌رگـانه، ئه‌زمـوونی داهێنه‌رانه ده‌كـه‌ن. بێگومان ئه‌م فۆرمگیرییه له مۆدێرنیته‌دا له ئه‌وجی ده‌ركه‌وتن و كارلێكی خۆیدا بوو.

هه‌ر دوای ئه‌وه ده‌ڵێ: له‌گـه‌ڵ ئه‌وه‌شـدا (تازه) له نه‌زعـه‌ی شـه‌ڕانگـێـزیدا ده‌رده‌كـه‌وێ، ته‌نانه‌ت ئه‌وه‌ی كــه هه‌وڵی داگیركاریش ده‌دا. نیچه ده‌ڵێ: كۆن هه‌میشه نمایندە‌ی خێره‌و پیاوه باشه‌كان له هه‌موو سه‌رده‌مێكدا ئه‌وانه‌ن كه خاوه‌نی بیری كۆنن و هه‌ر ئه‌وانه جووتیاری ڕۆحن.

نیچه لێره‌دا ده‌یه‌وێ له‌وه‌مان حاڵی بكا كه مادامه‌كێ خێر به ته‌نیـا له كـۆندا دیاره، چه‌نده كۆن بێن ئه‌وه‌نده خـێـرمـه‌ند ده‌بێن و به پێچه‌وانه‌وه، هه‌ر بۆیه نیچه وه‌رده‌گه‌ڕێته سه‌رباری شه‌ڕ خوازی و (تازه) له شه‌ڕدا ده‌بینێ و گه‌ڕانه‌وه بۆ ڕابردوو (كۆن) ناو ده‌نێ (خێر).

ئه‌م هاوكـێشـه و ئه‌م لێكدانه‌وه‌یه بۆ (كـۆن ـــــ نوێ) و (خێر ـــــ شه‌ڕ) به كۆمه‌ڵێ یه‌كتر بڕی چه‌مک و ماناكاندا تێده‌په‌ڕێ و شۆڕده‌بێته‌وه ئاستی (بێ هێز ـــــ به‌هێز) و (نه‌خۆش ـــــ ساغ) و (خراپ ـــــ باش) و له هه‌موویاندا لای دووه‌می هاوكـێشـه‌كه وه‌رده‌گرێ. ئه‌م بژارده‌كـارییـه‌ی فیكری نیچه‌و ئه‌م هه‌ڵبه‌زوو دابه‌زه دژایه‌تییه‌كمان له فیكری ئه‌ودا بۆ ده‌رده‌خـا كـه ڕه‌نگه له‌و دراوانه‌دا هه‌ندێكیـان ده‌ركه‌ون:

* پێشكه‌وتن= ده‌روونی به‌هێز+ ده‌روونی پیس

* مـردانـدنی پیـرۆزییـه‌كـان= لاوازبینی و لێـدانی مه‌سیحییه‌ت# گه‌ڕانه‌وه بۆ میتافیزیكا. لێكدانه‌وه‌كانی



لۆك

نیـچـه و به‌ر له‌و هی هیگڵ و دواتر پیـا هه‌ڵدانه‌كـانی هایدگه‌ریش هیچیـان نه‌گه‌یشـتوونه‌ته ئاستی سیـسـتـما تیزه‌كه‌ری ڕاسیزم و نه‌بوونه‌ته فه‌لسه‌فه‌ی بونیادی بۆی، به‌ڵام پیاوان و ئه‌هلی سیاسه‌ت و ده‌سه‌ڵات، سیاسییانه فه‌لسه‌فه ده‌خـوێننه‌وه‌و دار له ئاوی فـه‌یله‌سـوفـان وه‌رده‌ده‌ن و ده‌سته‌بژێری واژه‌و ده‌سته‌واژه‌و ڕسته‌كانی ناو ده‌قه فیكری و فه‌لسه‌فیه‌كان ده‌كه‌ن و له چوار چێوه‌یه‌كی مه‌رجه‌عی ده‌گرن.

ڕاسیزمی ئه‌ڵمانی و ڕۆحی ئه‌ڵمانی و ڕه‌سه‌نی جه‌رمانی، سـه‌ره‌تا له‌و ده‌قـانه هێـزیان وه‌رگـرتووه‌و به ناسـیـونالیـزم و ناكـۆكـییـه‌كـانی ناوه‌وه و ده‌ره‌وه‌ی خـۆی له قـاڵبی ڕاسیـزم چه‌سپیـون، گـوناهی ڕاسیزم و چوارچێوه گرتنی وه‌ک فیكری سیاسی زیاتر له ئه‌ستۆی ئه‌و ناسیونالیزمه‌یه كه ته‌نیا یه‌ک نه‌ته‌وه، یه‌ک ڕه‌گـه‌ز، دروست ده‌كـاو ئه‌وی دیكه یا نه‌ته‌وه و كۆمه‌ڵه‌كـانی دیكه له بۆته‌ی كولتووری نه‌ته‌وه‌ی سه‌رده‌سـتـدا ده‌توێنێـتـه‌وه. كـولتـووری نه‌ته‌وه‌ی سـه‌رده‌ست هه‌مـیـشـه له هه‌وڵی ئه‌وه‌دا ده‌بێ به زه‌برو جـه‌بر یه‌ک زمـان، یه‌ک فـیـكر، یه‌ک پێـوه‌ندی كـۆمـه‌ڵایه‌تی، یه‌ک تاكی ناسیـونال بۆ خـۆی به‌رهه‌م بهێنێ، بۆ ئه‌مه‌ش له جیاتی جیاوازییه ئاساییه‌كانی ناو قه‌واره‌ی دروستكراو جیـاوازی له ڕه‌سه‌ن، ڕه‌گه‌ز، نه‌ته‌وه ده‌كـاو خـۆی له‌هی دیكه جیـاده‌كـاته‌وه‌و له پرۆسـێـسـه‌كـانی ئاپارتایدا ڕاسیزم ده‌گه‌یه‌نێته لووتكه، كوشتنی به كۆمه‌ڵ- ڕاگـواسـتن- قـه‌ده‌غـه كـردنی زمـان- كـولتـوور- هاوبه‌شی سیاسی.... تاد. په‌یڕه‌و ده‌كا.

ئه‌وروپا سـه‌ره‌تا زێدی سـه‌رهه‌ڵدانی ئه‌م جـۆره فـیكره بووه‌و سه‌ده‌ی بیسته‌میش ئه‌وجی ته‌شه‌نه‌كردنی ڕاسیزم بوو. ڕاسیزم وه‌ک سیاسه‌ت و ئاراسته‌یه‌كی ئایدیۆلۆژی دابه‌شینه‌وه‌ی نمره‌ی هاووڵاتی بوون و له حـاڵه‌ته تونده‌كـانیـشـیـدا نه‌هێـشـتنی ژماره‌كانی دوای ژماره یه‌ک له هاووڵاتی بوون ده‌گه‌یه‌نێ.

قـه‌واره گـرتنی نه‌ته‌وه‌یی له‌سـه‌ر مـۆدێلی دوای جـه‌نگی یه‌كه‌می جیهانی و په‌رژین ڕێژكردن و داخرانی سنووره‌كان و به‌خشینی سه‌روه‌ری و پیرۆزی پێیـان، موڵكایه‌تی هه‌رچی مـه‌وجـوودی ئینسـانی هه‌یه له ناو ئه‌و سنوورانه دایه ده‌ست بژارده‌ی ده‌سـه‌ڵات، له‌ناو ئه‌و دۆزه‌خه‌دا هه‌مـیـشـه كـۆمـه‌ڵگه ناهۆمـۆجـینه‌كـان له‌به‌رهه‌مـهـێنانی توندو تیـژی و مـیكانیـزمـه‌كانی كوشتن و مردندا بوون. هه‌رده‌م ورووژێنه‌رو بزوێنه‌ری نامۆ بۆ نه‌ته‌وه‌و ڕه‌گه‌زی قوربانی فه‌راهه‌م ده‌كرا له‌و حاڵه‌ته‌دا به‌جه‌بری له ده‌ره‌وه‌ی جووڵه‌یه‌كی سروشتی ڕاسیزم پیاده ده‌كراو ده‌گه‌یشته ئه‌وج.

## (سپی- ڕه‌ش)و ڕاسیزم

ڕه‌نگه له مێژووی نوێدا ڕه‌شپێسته‌كان زیاترین بڕی ڕاسیزم و ئاپارتایدیان به‌سـه‌ردا چه‌سـپـابێ و دوای دۆزینه‌وه‌ی ئه‌مریكاش له پرۆسێسی بازرگانی پێوه‌كردنی كۆیله‌وه (ڕه‌ش) ڕاسته‌وخۆ یه‌كسان بوو به ماشێن یا كه‌ره‌سته‌یه‌كی به‌رهه‌م و به ته‌واوه‌تی له پێوه‌ندییه‌كان به دوور بوو.



مارکس

(سپی- ڕەش) پەسەندبوونی سپی و ڕەتکردنەوەی ڕەش و دابەزاندنی بۆ ئاستی جەستەیەکی بێزراوو تەنیاو تەنیا بەکاربردنی وەک بوونەوەرێکی بایۆلۆژی و سوود لێ وەرگرتن لە جەستەکەی و بەکاربردنی ئابووریانەی ئەم جۆرە جەستەیە.

ئەم سەرمایەیە لە کۆیلە سەرەڕای وەدەرنانی ڕەش لە پێوەندییە کۆمەلآیەتی و فەرهەنگی و مرۆییەکان، جۆرێک لە ڕەواج بوو پێی، بەلآم چ ڕەواجێک؟ ڕەواجی ئابووری، دارزاندنی بەو مەبەستەی کەسی سپی خاوەن ڕەش چەندە لە ڕەش بەرخورداره ئەوەندە کیسەی لە پوول گران و پڕ دەبێ. کەواتە هەمیشە (ڕەش) لە هاوکێشەکانی (هێز ـــــ بەرهەم)دا مانای (هێز)ی بەرهەمهێن بووەو لە کەرەستە زیاتر لێی نەڕوانراوە، واتە (هێز) لە (ڕەش) و (بەرهەم) بۆ (سپی).

ئەفریقیا سەرزەمینێکی پان و بەرینی بازرگانی کردن بوو بە ڕەشەکان و بوو بوو بە جوگرافیای مرۆڤە ئیرادە لێ هەلکێشراوەکان، کوشتنی ئیرادە یەکەم ئەرک و ستراتیژی ڕاسیزمە. ئیرادە بۆ کەسی مرۆیی بە مانا (بوون) ئەگەر ئیرادە بخرێتە ناو پرۆژەی هەلکێشانی ئیرادەوە، ئەوا بوونی ئەو تاکە یا ئەو کۆمەلە دەخرێتە هەڕەشەوە، واتە وەک مەوجوود ناخوێندرێتەوە.

(کەسی بێ ئیرادە= جەستەیەکی گۆشتین) لەو حالەتەدا بەهاو ئینجا کولتوور کە لە ئیرادەوە هێز وەردەگرێ لەبەرامبەر بەهای مرۆڤی ژمارە یەکدا دەتوێندرێتەوەو گوێی پێ نادرێ.

کە دەسەلآتێکی سیاسی سەرچاوە گرتوو لە فیکرێکی ڕەگەزپەرستی هێزی خۆی لە جیاکردنەوەی ڕەنگ و ڕەگەزەکانی ناو قەوارەی خۆیی و سڕینەوەیان وەرگرت، ئەوا مەحالٚ دەبێ ماناکانی دیموکراسی و فرەحزبی و ئالوگۆڕی دەسەلآت و خوێندنەوەی بەرامبەرو ئازادی بیروڕاو ئازادییەکانی دیکە لە کولتوورەکەیدا بدۆزینەوە، کولتووری ئەو هێزە ڕەنگی خۆی بەسەر هەموو جیاوازییەکانی دیکە دادەڕژێنێ و ناهەماهەنگی و نائۆرگانیکییەتێک سەرتاپای

کۆمەلگە دەگرێتەوە. لەو حالەتەشدا ڕاسیزم دێتە ئاستێکی خوارتر بۆ ڕەتکردنەوەی تاکەکان و قەوارەی فیکری و سایکۆلۆژییان، لێرەدا ڕاسیزم یەک کولتوور لە توتالیتاریزم و دیکتاتۆرییەت و فاشیزم دروست دەکاو ئەم خەسلەتە لە تەوێلی یەک گرووپی یا کۆمەلی نەتەوەیی دەدات.

سەرەڕای سوکایەتی و بێ نرخ سەیرکردنی جەستەو گیان و کولتووری قوربانی، گەلێ جار لە ئۆپەراسیۆنەکانی بە کۆمەلکوژی و جینۆسایدیدا ناو پەرژینی ولآتێک دەبێ بە دۆزەخێک، ڕەگەزو کولتوورو نەتەوەیەکی تێدا دەکەوێتە ژێر ئەزموونی ڕاسیزم.

چۆن ئەورووپا بەلانکەی ناسیونالیزمی تازە دەزانرێ و لەوێوە شکڵ و شێوازە جیاجیاکانی قەوارە ناسیونالییەکان وەک مۆدێل لە دەرەوەی ئەورووپا لەبەریان گیرایەوە. بەکەم زانینی کەنارو جیهانی دووەمیش لەلایەن ناوەندی ئەورووپاوە گرێی ڕەسەنتریی ئەورووپی خستە دەروونی تاکی ئەورووپی و ئینجا سیستەمە سیاسییەکانی و ئەم گرێیە لە زەمەنی مۆدێرنیزمی ئەورووپاو کەسێتی ئەورووپی فاوستیدا تا دەهات ئالۆزتر دەبوو و شێوە ڕاسیزمێکی ئەورووپی لە دژی کەنارو ولآتانی دەرەوەی ئەورووپا لێ کەوتەوە. کۆلۆنە ئەورووپییەکان لە ئەفریقیاو ئەمریکای لاتین و باکوور جوگرافیای پان و بەرینی مۆدێلی ڕاسیزمی تازەگەری بوون کە لە هەناوی ناسیونالیزمی ئەورووپییەوە لەدایک بوو بوو.

باشووری ئەفریقیا دیارترین ناوچەی پیادەکردنی ئاپارتاید بووە لە کیشوەری ئەفریقیادا کەمینەیەکی غەوارەی چوار ملیۆن کەسی حوکمی زیاتر لە بیست ملیۆن ڕەشپێستیان دەکرد. فیکری ڕەش لە ڕێگای بێ نرخ کردنی جەستەکەیەوە لە بەها خۆمالی و داب و نەریتە لۆکالییەکان و مێژووەکەی دەسڕایەوە، جەستەش لەو حالەتەدا بوونێکی ماتریالەو لەگەلٚ ماتەرەکانی دیکە جیاوازییەکی نامێنێ.

ڕاسیزم لە ئەفریقیای باشوورو چەندین ولآتی دیکەی ئەم کیشوەرە، جگە لە بازرگانی پێوەکردنی ئینسانە ڕەشەکانەوە، سەگی هاری بەردەدایە جەستە ڕەشەکان و بە بەرچاوی دنیاوە پۆخلترین ساتەکانی بوونێکی عاقلی لای جەللادێک نیشان دەدایەن.

کە سەگ لە مرۆڤ بەر دەدرێ هیچ نامێنێتەوە، لەگەلٚ هەلگری فیکری ڕاسیزمدا قسەی لەسەر بکەی، چونکە مەیدانی قسە سەگ داگیری دەکاو لەو دیمەنەدا ڕەش لە خوار سەگ دەردەکەوێ. مێژووی ئاپارتاید لە ئەفریقیا کولتووری ئەو کیشوەرەی لەتوپەت کرد، برسێتی و جەهل دوو میکانیزمی ڕاسیزم بوون، بە هۆیەوە شیرازەی ڕەشەکانیان لەبەریەک دەترازاند، کولتووری ئەفریقییەکان لەسەر برسێتی و جەهل بالآی گرتووە، لەم مێژووەدا جگە لە کولتوورێکی برسی- تینوو- وشک- جاهل چیدیکە پێوەندییەکان بەیەکەوە نالکێنێ. لە درێژەی فەراهەمکردنی

(معطيات)ەكانى ڕاسيزم لە ژينگە جۆراوجۆرەكانى ئەفريقيادا تاك و كۆمەڵى ئەفريقى لەنێوان جەبرى ملكەچى و پەيوەست بوون بە كولتووره هەژارەكەوە، جوگرافيايەكى فراوان لە ملكەچى و مێژوويەكى گەشيش لەبەر خودانى پێوە ديار بوو.

ترس- برسێتى- جەهل- ميكانيزمى بەرهەمهێنانى كەسى ملكەچ بوون لە ئەفريقيا، ملكەچى هەروەك چۆمسكى دەڵێ: ڕاستەوخۆ ڕاسيزمى لێ دەكەوێتەوە. مرۆڤ كە دەبێ بە قوربانى و ئامانجى ڕاسيزم لەنێوان دوو هەڵوێستى سايكۆلۆژيدا دابەش دەبێ، دوو تاكى ملكەچ لە قوربانيانى ڕاسيزم دێتە ئارا، ئەريك فرۆم ئەو دووكەسە بەم شێوەيە دەناسێنێ: يەكێك بۆ ئەوەى بمێنێتەوە تا ئەو ئاستە ملكەچ دەبێ كە كەرامەتى خۆشى لە پێناودا دادەنێ. ئەوەكەى دى لەگەڵ ملكەچيشى پارێزگارى لە كەرامەتى خۆى دەكاو تا ئەو ئاستە ناچێ هەموو شتێك بدۆڕێنێ. لەهەردوو حاڵەتدا ئەريك فرۆم كەسى ملكەچ بە كەسێكى ماسۆشى دەزانێ كە گوتارى ئەو كەسە هەميشەو تەنيا لەپێناو مانەوەى خۆيەتى لە بەرامبەر كەسى يا كۆمەڵى دەسەڵاتداردا. ستراتيژييەتى ملكەچى كە لە ميكانيزمەكانى ترس و چەپاندن هێز وەردەگرێ، تاسەر يەك نەتەوە، يەك كۆمەڵيان پێ لەوحاڵەتەدا ناهێڵرێتەوە، لە جەدەلييەتى يان هەڵسووڕانى پێدراوەكانى ژينگەى ڕاسيزمدا لە پەستانى زياترى ستەم و دەسەڵات زۆر سروشتييانە پرۆسەى هەڵگەڕانەوەو ڕووبەڕووبوونەوە بە ئەزموون دەبێ، ئەم جووڵەيە لە پرۆژەى دژدا خۆى ناودەنێ (شۆڕش، كودەتا، ڕاپەڕين....تاد) بە شێوازە جۆراوجۆرەكانييەوە.

## (سپی- سوور)و ڕاسيزم

ئەگەر ديمەنێكى ديكەى ڕاسيزم لەبەرێكى ديكەى ئەم سەرزەمينە هەڵدەينەوە، ئەوا يەكسەر هيندييە سوورەكانمان دێتە بەرچاو كە هەميشە قوربانى سوورايەتى و ڕەنگاوڕەنگى خۆيان و سادەيى خۆيان بوون، بيرەوەرى بە كۆمەڵ و زەخيرەى مەعريفى ئەو كۆمەڵگەيە تا ئەو ڕادەيە برى هێزو مەعريفەى لا ئەمبار نەكردبوون بۆ ئەوەى لە ڕەسەنايەتى خۆيان بەرگرى لە بوونى خۆيان وەك جەستە، ڕۆح، ڕەگەز، كولتوور بكەن.

چۆمسكى دەڵێ: بەرلەوەى ئەمريكا بدۆزرێتەوە هيندييەكان (پازدە) مليۆن كەس بوون، ئێستا تەنيا دووسەد هەزار كەسيان لێ ماوەتەوە. هيندييە سوورەكان دواى دانانى پێ و قەدەمى كۆلۆمبس لەسەر خاكى ئەمريكا، چۆمسكى وتەنى وەك گورگ لەسەر شێوەى مرۆڤ تەماشايان دەكرا.

كە مرۆڤ لەبەر چاوى مرۆڤێكى ديكە دەبێ بە گورگ، دەبێ چ حەماسەتێك، شوڕێك هەبێ بۆ كوشتنى جەستەيان و سڕينەوەى ئاسەواريان؟!. گورگ دڕندەيەكى بە هەڵمەتە هەميشە ترس، مەترسى، هەڕەشە بەرهەم دێنێ، هەر بۆيە نابێ لەگەڵ مەحشەرى ئادەمييەكان و لە نزيكيانەوە بژى، چارەسەرى ئەم گورگانە نەهێشتنيانە!! واتە سڕينەوەى فيزيكييانەى جەستە.

لە سەرەوەى ڕووبارى مسيسپى و ناوچەى هۆمسفير گەورەترين تراژيدياى هيندييە سوورەكان چووە مێژووى ئەم كيشوەرەوە.

لە ئەورووپاو بەتايبەت لە ئەڵمانيا، بەو پێيەى ئەولادەكانى سام سام ڕوونتر بڵێين يەهودييەكان لە پلەيەكى نزمى هاوولاتى يا مرۆڤ تەماشا دەكران. توندى جوولانەوەى ناسيوناليزم و قەوارە بەندى نەتەوەيى لە ئەورووپادا هەوڵى ئەوەى دەدا ئەورووپا هەر هى ئەوروپييەكان و كريستيانيزم بێ و لە سۆنگەى پێوەنديە ستوونييەكانى ناوەند بۆ كەنارەوە جوولەكەكانيش بوون بە قوربانى ڕاسيزم و دژەساميەتەوە. لە ئەمريكاش ئەو ديارديە تەشەنەى كرد، چۆمسكى بەو پێيەى يەهودييە دەڵێ: كە منداڵ بووم بە پێچ و پەناى سەير خۆم دەگەياندە قوتابخانەو لە ترسى ئەوەى نەوەكا هەڵكوتنە سەرم و سووكايەتيم پێ بكەن. ئێستا خۆش بەختانە ئەم ديارديە لە ئەمريكا نەماوە، لەوانەيە زوو تێپەڕينى ئەمريكا لە كولتوورى مۆدێرنيزم هەروەك بۆدريار دەڵێ كە ميرات و كولتوورێكى ئەورووپى و پەرينەوەى بۆ دواى تازەگەرى، هۆكارى ڕيشەكێشكردنى ئەو ديارديە بووبێ. چۆمسكى وەكو قوربانى ئەزعەيەكى زەمەنيى ڕاسيزم و ئەزموونێكى خۆى لەگەڵيدا بيرمان دەباتە سەر ڕەگەكانى ڕاسيزم لە بيرەوەرى مێژوويى و ئەستى نەتەوەداو بە ڕێچكەيەكى ديكەشمان دادەبا كە پێمان وابێ ناسيوناليزم تەنيا دەبێ بە مەرجەعى يەك نەتەوە، واتە يەك جۆر ئەتنيك و هەرلەناو يەك نەتەوەدا دەمێنێتەوەو گەشە دەكا، چونكە تەنيا يەك جۆر مرۆڤ كە يەك جۆر ئينتيماى ڕەگەزيان هەيە لەوەدا هاوبەش دەبن كە سەر بەيەك سەرچاوەى كولتوورى نەتەوەيى بن، هەر بۆيە دەبێ پێمان وابێ كە ناسيوناليزم وەك فيكرێكى سياسى يەك نەتەوە ئەگەر بەرەو ڕەگوريشەكانى خۆيى و بالاكردنى خۆى بەسەر بوونە نەتەوەييەكانى ديكە بچێ، بەمانا خۆى پيرۆز نيشان بدا، ئەوا لە بارترين و بە پيستترين ژينگەى ڕاسيزم دەبێ. ئەم شيكارە فيكرييە وێنەيەكە لە خۆدزينەوەى چۆمسكى لە چاوى دژەكانيدا دەيگرين.

لێرەدا لەوە حاڵى دەبين ئەگەر پێمان وابێ ناسيوناليزم و قەوارەگرتنى لە ئەورووپا نەشونماى كرد، ئەوا لامان ئاسايى دەبێ كە ناسيوناليزم ڕاستەوخۆ لە كار لێك و بەركەوت و دەركەوتەكانى مۆدێرنيزمى ئەورووپادا چووە قالبى تيورى و پراكتيكييەوەو سەرەنجام نابێ لامان سەير بێ ئەگەر ڕاسيزميش بە زركوڕێكى ناسيوناليزم بزانين كە من بە قەناعەتەوە بەو شێوەى دەبينم.

چەند ساڵێكە لەگەڵ هەندێ ديارەدى وەك گلۆباليزەيشن و سيستمى تازەى جيهانيدا، خەريكە ڕاسيزم فاكتەرەكانى مانەوەى لەدەست دەدا. نەتەوەو كولتوورى لۆكاڵ لە مەترسيدا نييە بەقەد ئەوەى بژاردەى پاسەوانى كولتوورى نەتەوەيى كە

لە دەسەڵاتدان یا لێیەوە نزیکن جێ لەق دەبن و دەکەونە مەترسییەوە.

چۆن لەو زەمەنەدا ماناکان بۆ شتە تازەکان بە شێوازی دیکە دەناسرێن و دەبن بە هێما؟ یا ڕوونتر بڵێین لەو زەمەنەدا بە پێی گۆڕان لە سیستمی پێوەندییە ئابووری و تەکنۆلۆژی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان سیستمی مەعریفی هەر کۆمەڵگەیەک زەمەنی خۆی بەجێ دێڵێ و دەچێتە قاڵب و زەمەنی دیکەوە. تا لەو حاڵەتەدا ناسیونالیزم ماڵی سیاسی خۆی جێ دێڵێ و سەربە ماڵە ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و مێژوویی و ئیکۆلۆژییەکانی خۆیدا دەکا.

کەواتە جومگەکانی ڕاسیزم دەپسێن و ئەو سیاسەتە یا ئەو نەزعە لەچوارچێوە گیراوە لەناو ئەو دنیا هەمەڕەنگ و کولتوورە جێی بۆ لە ئەرشیف ڕادەخرێ.

ئێستا کۆمەڵگەی خۆرئاوا لەوە تێپەڕیوە ئەمە (ڕەشە، سوورە، سپییە، ڕەنگاوڕەنگە....) ئەوان ئێستا خەریکی خوێندنەوەی گرووپ و دەستەو تاقمە پەراوێزەکانن کە یا سیستمی کۆمەڵایەتی، بەهاکان، تراديسیۆن، یا....تاد پەراوێزی کردوون، ئەو دەستەو تاقمانە دەبینرێن، دەخوێندرێنەوە، گوێیان لێ دەگیرێ، لێیان دەکۆڵرێتەوە. ئەمانە گوتاری تایبەت بە خۆیان هەیە، کارکردن لەسەر پەراوێزکراوەکان دەچێتە چوارچێوەی لیکۆڵینەوەی سایکۆسۆسیۆلۆژییەوە.

## کوردو ڕاسیزم

ئەگەر لە هەندێ لاپەڕەدا باس لە کورد وەک قوربانییەکی ڕاسیزم بکەین، ئەوا بەرلەوەی بچینە سەر قەوارەی ئەم قوربانییە، یەکسەر دوو فاقییەک یا عەرەب وتەنی (مفارقة) یەک لە ناسیونالی ڕاسیستەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەڕوونی دەبینین، ئەویش خەبات و بەرخودان و خۆپارێزی خۆیان لە (ئیمپریالیزم)!و فرۆشتنی هەڵوێستی نیشتمانچییەتی، لە لایەکی دیکەش پابەندبوون بەو نەخشەو کلێشە جیۆپۆلتیکییە، یا ئەو شکڵ و شێوازە جوگرافییەی دەسەڵاتە کە هەر ئەوان (ئەوروپییەکان) لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم لەنێوان خۆیان و بە ڕێککەوتنی خۆیان دایانڕشت. لەوە (مفارقە)تر تۆ سنوورێک بپارێزی کە (ئیمپریالیزم!) دروستی کردووە، لەکاتێکدا شەڕ دژی ئەو ئیمپریالیزمە بە هەڵوێست بفرۆشیتەوە. لەو حاڵەتەدا ڕاسیزم بەرقێکی دیکە چەندین ڕێگا بۆ خۆی دەکاتەوەو بەوەرگرتنی نموونە ئەوروپییەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی کەوتۆتە لاسایی کردنەوەی نموونەی فەرەنسی و ئیتاڵی و ئەڵمانی و ئینگلیزی و ئەمریکی (هەڵبەتە نموونە کلاسیکییەکان) بێ وەرگرتنی فاکتەرە مێژوویی و ئابووری و فەرهەنگییەکان، لە کاتێکدا ئەوروپییەکان خۆیان وا خەریکە بەسەر ئەو نموونانەدا باز دەدەن و دەچنە زەمەنێکی دیکە، نموونەی تازەتر بۆ پێکهاتەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی خۆیان دەدۆزنەوە.

خراپ حاڵی بوونی ناسیونالیزمی خۆرهەڵاتی و جیهانی کەنار لەوەدایە کە تاکو ئێستاش نموونەی سێ سەد ساڵ لەمەوبەری ناسیونالیزمی ئەوروپی بۆ لاسایی کردنەوە وەردەگرن.

ئێستا لە ئەوروپا جوگرافیا، مێژوو، کولتوور، بەها، سیستمی کۆمەڵایەتی، ئەخلاق، ئایین، سیاسەت، ئابووری....تاد بە شێوازی دیکە لەناویەکدا جوڵە دەکەن و لە سیستمی دیکەدا دەخولێنەوەو کاریگەرییەکانیشیان بە شێوەی تازە دەردەکەون.

بەو پێیەی ئێستا بەتەنیا سیاسەت قۆرخی هەموو ڕەهەندەکانی دیکە ناکا، کایەکانی دیکەش دەچنە ناو سیاسەتەوەو دروستی دەکەن.

ئەگەرچی سایکۆلۆژیای هەندێ گرووپ یا تاکی هەڵچوو گەلێ جار دەمانباتەوە سەر بیرەوەری ڕاسیزم و مێژووە تاریکەکەی، بەڵام ڕەفتاری مەدەنی و دیموکراسی و بیرکردنەوەی ئەودیو ناسیۆن و ناوچەگەرییەکان دەتوانێ ئەو دوومەڵە ڕەفتارییانە بتەقێنێ و لە دەرهاویشتەکانی ڕزگارمان کات، بەو پێیەی ڕەفتارگەلی پەرتوبڵاوی لەو شێوەیە خاڵی دەرچوونی ناو خودی تاک یا چەند تاکێکی هەڵچووەو لەمەرجەع و چوارچێوەیەکی تیۆری دەرناچێ، هەربۆیە بە فیعلی نەحەوانەوەی ڕەفتاری خێچی لەو جۆرە لە ژینگەی دیموکراسی یا هەلومەرجی هەنوکەی دنیا هەروەک سکینەر دەڵێ دەسڕێنەوە، بە مانا ڕەفتارەکە ژینگەی گەشەکردن و نەشونماکردنی خۆی نادۆزێتەوە، تاکو سەرلە نوێ ببێتەوە بە کۆڕەفتارو (خوو)و کەنەشی دۆزییەوە، ئیدی لەبەریەک هەڵدەوەشێتەوە.

هەرچەندە کەمێ بەرلەو چەند دێڕە باسمان لە هەلومەرجی بەرەو ئەمانی ڕاسیزم کرد لە ئەمریکاو ئەوروپا، بەڵام بۆ ئەوەی کەمێ پشکی کوردیش لەو سیاسەتە وەدیارخەین، هەقە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە وێنەکە شی بکەینەوە. لەو خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە نەتەوەی کورد گەورەترین قوربانی ڕەگەزپەرستی و سیاسەت و میکانیزمەکانی ڕاسیزمەو ڕەنگە ئەم پارادایمە بەسەر ئاسیا بەگشتی بێتەوە.

قەدەغەکردنی زمانی نەتەوە لە بەکاربردنی ڕەسمی و نارەسمیدا، یاساغکردنی کەلەپوورو تەوزیفکردنی سروشتی ئاسابییانەی لەژیانی ڕۆژانەدا، لادان و شێواندن و ترازاندنی کولتووری نەتەوە، فەراهەمکردنی هەرچی زیاتری وروورژێنەرو بزوێنەرە نامۆکان بە ژینگەی کوردو هەوڵدان بۆ هێنانەکایەی ژینگەیەکی پڕاوپڕ لە پێدراوەکانی داگیرکاری و تاواندنەوەی نەتەوەیی، دواجار هەڵتەکاندن و تەختکردنی گوندوشارو شارۆچکەکان و دواتر ڕاگواستن و لە دوا هەوڵدا بە کۆمەڵ زیندە بەچاڵکردن و ونکردنی سەدان هەزار کەس لە نۆبەراسیۆنەکانی ئەنفال و کۆمەڵکوژییەکانی تردا.

مەغزای ڕاسیزم بەرامبەر بەکورد لە چوارچێوەیەکی زۆر سیستماتیک جێبەجێ نەکراوە، بەڵکو شکڵێکی ڕەمەکی وەرگرتبوو، واتە ڕاسیزمێکی ڕەمەکی دڵڕەقانە، نەتەوەی کورد لە دیدی ناوەندەکانی ڕاسیزم جەستەو ڕۆحێکی بێ کەڵک بووە، هەمیشە شەڕ بۆ کوشتنی ڕۆحەکەی کراوە، جەستەکەشی هەرگیز بە قابیلی بەکاربردنی ئابوورییانە نەزانراوە بە قەد ئەوەی جەستەیەک بووە لە سیستەم و شێوازە جۆراوجۆرەکانی سزاو کوشتندا ئەزموونی لەسەر کراوە. ناوناوەش لەبەکاربردنی سیاسی و عەسکەرییانەدا سووکە کەڵکێکی لێ وەرگیراوە. لەڕووی سیاسییەوە هەوڵەکانی ڕاسیزم بۆ شاردنەوەو پەردەپۆشکردنی ماجەرایەتەکانی شەڕی ڕەگەزی بووەو لەڕووی عەسکەریشەوە بووە بەکەرەستەی شەڕەکانی دەسەڵاتداری ڕاسیست.

ئەمانە میکانیزمەکانی ڕاسیزمی ڕەمەکی بوون و بەدرێژایی ترازانی مێژووی ئاسایی نەتەوەی کورد مۆری جیاجیایان بەو مۆدێلە ناسیونالیزمییەو قەوارەگرتنەکانییەوە ناوە، کەهەر خودی ئەو مۆرانە بەسن بۆ ئەوەی مۆدێلی دیکەی بەدیل جێی ئەو شێوە پێوەندییە تەقلیدیانە بگرنەوە.

## گلۆبالیزم و ڕاسیزم

گلۆبالیزم کە هێزی خۆی لە گەشەکردنی تەکنۆلۆژیای گەیاندن و زانیاری و ڕاگەیاندن وەردەگرێ، سنوورو پەرژین و جوگرافیاکانی ڕاسیزم دەبڕێ، کولتوورەکەی دەڕژێنێ، پیرۆزو پیرۆزکراوەکان دەکاتەوە بە دیاردەی ئاسایی. گلۆبالیزم بەدەر لەشیکاری سیاسییانە (تاک ڕەهەندییانە) گوتار بۆ هەموو ڕەنگ و دەنگە جیاجیاکان دەدۆزێتەوە. زەمەنێک وەردەگێڕێ و لە زەمەنی خۆیدا جیاوازییەکان تا ئاستی جیاوازی تاکەکان دەبا.

گیرتز دەڵێ: لەمەولا ئێمە لەسەر سنووره جوگرافییەکان و ئەو دیو دەریاکان لەگەڵ دەرەوە بەیەک ناگەین، بەڵکو لەسەر سنووری پێستی لەشمان بە دەرەوە دەبەسترێینەوە. لەم قسەیەی گیرتز بایەخ وەرگرتنی تاک و بواری جووڵەی لە بەرامبەر بەرخوردی لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا دەردەکەوێ. تاک وەک ناوەندی خودێکی بە مانا (دانپیانراو) لە خۆیەوە پێوەندییەکان لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا دەکێشێ، لەگەڵ دەرەوەی وەک تاک، ئینجا وەک کۆمەڵ:




ئەم حاڵەتە بەشێکی زۆر لە کولتووری ڕاسیزم کە لە ناسیونالیزمی ڕەمەکی و ناهاوسەنگ سەرچاوەی گرتووە، ئاودیو دەکاو زۆر لە قەوارەگرتنە نەتەوەییەکانیش کە لەسەر بنچینەی تاواندنەوەی کولتووره ناوچەیی و جیاوازەکان بناغەیان گرتبوو، لەگەڵ خۆی ئاودیو دەکا.

ژیاندنەوەو بایەخدان بە کولتووری ناوچەیی و نەتەوەیی لە یەکتر جیا، لەهەلومەرجی ئێستادا لەگەڵ فیکری ناسیونالیزم نایەتەوە، ئەم ئەرکە بە فیکرێکی فراوان و کراوەتر ئەنجام دەگرێ. فیکری گلۆبال لە ناو مێشکێکدا دەبێ هەموو دنیای بە گەورەیی خۆی لە نێو کەللەی خۆیدا جێ کردبێتەوە. لەو تێگەیەوە (Act Localy think Globaly) واتە ناوچەییانە کار بکە، جیهانییانە بیر بکەوە. ئەم تێگەیشتنە دینامیکییەتی فەرهەنگە لە یەکتر جیاوازو ناوچەییەکان لەگەڵ یەکتردا بەدیار دەخاو ئاستی بایەخ دان بە کولتووره لۆکالییەکان دەباتە ئاستی بیرکردنەوەیەکی فراوان و جیهانییانە.

بە مانایەکی دیکە لەمەولا لە فیکری جیهانبینییەوە فیکری نەتەوەگەرایی گەشە دەکاو جیهان هەرهەمووی جوگرافیاو ڕووبەرێکی بێ سانسۆری بیرو فیکری مرۆڤ دەبێ و وەزیفەی دەسەڵات و ڕۆشنبیران دروستکردنی جیهانە بە گەورەیی خۆی لە سەرزەمینە فەرهەنگییە لۆکالییەکان و ئینجا گەورەکردنی فەرهەنگە لۆکالییەکانە بەقەد هەموو جیهان. واتە لەمەولا سنووره دەوڵەتییەکان کۆتایی دنیا نابن، بەڵکو تۆ دەچیتە ناو دنیای خەڵک و خەڵکیش دێتە ناو دنیای تۆوە، فەرهەنگەکان خەسڵەتی جووڵەو گەشەی سروشتی خۆیان وەردەگرنەوە، پێوەندییەکان لە ستوونییەوە دێنەوە سەرباره ئاسۆییەکەی.

ئەم بینینە لە زێدە گەشبینییەوە نییە، بەقەد ئەوەی سروشتی گەشەو جووڵەی پێوەندییە ئینسانییەکان بەم شێوەیە دەبینم، دەنا تا ئێستا سایکۆلۆژیای ڕاسیزم لە کەسێتی زۆر کەس و دەسەڵاتداری دنیادا هەیەو لە دەرفەت و هەلی ڕەخساودا وەریدەگێڕنە سەر کردەوەیەکی بینراوو بەرجەستە. لەوە گرنگتر ئەوەیە ژینگەکانی ڕاسیزم و سەرچاوەکانیان بەرەو وشک هەڵاتن دەچن، ورووژێنەرو بزوێنەرەکانیان ڕووەو نەمانن.

ئەمەش بەمانای نەمانی ململانێ نییە، چونکە نەمانی ململانێ بەبێ مانابوونی ژیان لێکدەدرێتەوەو کە ململانێ نەمێنێ دووانەکانی بوون هاوسەنگییان لەدەست دەدەن.. ❖

بۆ ئەم باسە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

١- نیتشه (العلم المرح)، حسان بورقية ٢٠٠٠.

٢- ديڤيد بارساسيات (تواريخ الانشقاق -حوارات مع چومسكي).

٣- محمد بدرالدين (تركيا في زمن المتحول).

٤- رونالد روبرتسون (العولمة- النظرية الاجتماعية والثقافة الكونية)، نورا أمين - أحمد محمود ١٩٩٨.

٥- علي حرب (حديث النهايات)، المترجم محمد النجار، ١٩٩٧

# بینای (ئاوەڵناو)و ئەرک و جۆری لە شێوەزاری دەشتی هەولێردا



ئیدریس عەبدوڵلا

**پێناسە**

زمانەوانانی کورد کۆمەڵێک پێناسەیان بۆ (ئاوەڵناو) داناوە، لەوانە گرنگترینیان:

١- ئاوەڵناو: ئیسمێکە حاڵ و شەئنی ئیسمەکەی پێش خۆی بەیان دەکاو بەو ئیسمە دەڵێن (مەوصوف) بەهەردووکیان دەڵێن (تەرکیبی وەصفی)، وەک: (کاغەزی سپی) (١)

٢- ئاوەڵناو: وشەیەک وەصفی مەوصوفەکەی خۆی دەکات، مەوصوفەکەی (ناو) بێت یان (ڕاناو) یان هەر شتێکی تر (٢).

٣- ئاوەڵناو: ئەو وشەیەیە کە لە خۆیدا (وەصفیە) هەیە، بۆیە جۆرو چۆنیەتی (مەوصوف) دیار دەخات لە ڕستەداو بەمە لە (ناو) جودا دەکرێتەوە (٣).

٤- لە (دەستوری زمانی فارسی)دا بەم جۆرە (ئاوەڵناو) تەعریف کراوە: سیفەت (ئاوەڵناو) وشەیەکە ڕوونکردنەوەیەک لە مەعنای ئیسم زیاد دەکات، بەو هۆیەوە سەربە ئیسمە (٤).

٥- لە (دەستوری زمانی ئینگلیزی)یشدا، (ئاوەڵناو) بەم جۆرە پێناسە کراوە: (ئاوەڵناو: ئەو وشەیەیە کە وەسفی ناوێک یان ڕاناوێک دەکات) (٥).

جا لەبەر ڕۆشنایی هەموو ئەو پێناسانە، دەگەینە ئەو ڕاستییەی بڵێین: (ئاوەڵناو: ئەو بەشەی ئاخاوتنە کە هەمیشە هاوەڵێتی (ناو) یان (جێناو) دەکات و لەیەک لە ڕووەکانەوە پەسنیان دەدات (٦).

**جۆرەکانی (ئاوەڵناو)**

بۆ دەرخستنی جۆرەکانی (ئاوەڵناو) لە سێ ڕووەوە دەتوانین لێکۆڵینەوە بکەین، ئەوانیش:

١- لە ڕووی دارشتنەوە:...

٢- لەڕووی ئەرکەوە:....

٣- لە ڕووی (چی)یەتییەوە:...

کە لەهەر یەکە لەم ڕووانە چەند جۆرێکی (ئاوەڵناو)مان بۆ بەرجەستە دەبێت، وەکو ئەم هێلکارییەی خوارەوە، جوانتر مەبەستەکەمان ڕوون دەکاتەوە:

(ئاوەڵناو)

١- لە ڕووی دارشتەوە:

ا- سادە

ب- دارژاو

ج- لێکدارو

٢- لەڕووی ئەرکەوە:

ا- تەواوکەری ناو

ب- تەواوکەری جێناو

ح- تەواوکەری ئاوەڵناوێکی تر

ء- تەواوکەری فرمانی ناتەواو

٣- لەرووی (چی)یەتییەوە

ا- پرس

ب- چۆنی

ح- نیشانە

ء- نادیار

ه- کراو

و- بکەر

ز- ژمارەیی

ع- تەرتیبی

## پێکهاتەی (ئاوەڵناو) لە رووی دارشتنەوە

لەم رووەوە سێ جۆر ئاوەڵناوی (سادە)و (دارژاو)و (لێکدراو)مان هەیە کە یەکەمیان لێدەرکەین، دوو جۆرەکەی دیکە بە شێوازی جۆراوجۆر بینادەکرێن، وەکو لە خوارەوە ئاماژەیان بۆ دەکەین:

ا- ئاوەڵناوی سادە: (لە وشەیەکی سادەی واتاداری سەربەخۆ پێک دێت) (٧) بۆ نموونە: (خاوێن- پیس- شیرین- تار- گچکە- گەورە- درێژ- کورت- رەش- سپی-سوور- کەسک- مۆر-...تاد)

ب- ئاوەڵناوی دارژاو: (لە وشەیەکی سادەو پێشگرێک یان پاشگرێک پێکدێت)(٨) ئەمەش بە چەند شێوازێک، لەوانە:

١- پێشگر+ ناو ـــــ ئاوەڵناوی دارژاو

بە + ناز ـــــ بەناز

بێ + عار ـــــ بێ عار

٢- ناو + پاشگر ـــــ ئاوەڵناوی دارژاو

ژن + انی ـــــ ژنانی

پیاو + انە ـــــ پیاوانە

کورە + چی ـــــ کورەچی

٣- رەگی چاوگ + پاشگر ـــــ ئاوەڵناوی دارژاو

لەرز + ۆک ـــــ لەرزۆک

ترس + نۆک ـــــ ترسنۆک

٤- قەدی چاوگ + پاشگر ـــــ ئاوەڵناوی دارژاو

مرد + ی ـــــ مردی

سووتا + ی ـــــ سووتای

ح- ئاوەڵناوی لێکدراو: (ئەو ئاوەڵناوەیە کە لەدوو وشەی واتادار، یان پتر پێکهاتووە، جا راستەوخۆ یان بەیارمەتی پێشگرو پاشگرو ناوگرەکان) (٩)..ئەمەش دیسانەوە بەچەند شێوازێک، لەوانە:



د. نەسرین فەخری

١- ناو + ئاوەڵناوی چۆنی ـــــ ئاوەڵناوی لێکدراو

چاو + پیس ـــــ چاوپیس

دەست + پاک ـــــ دەستپاک

روو + رەش ـــــ روو رەش

٢- ناو + رەگی چاوگ ـــــ ئاوەڵناوی لێکدراو

جێ + گر (لە/گرتن) ـــــ جێگر

جەو + بڕ (لە/بڕین) ـــــ جەوبڕ

کا + فرۆش (لە/ فرۆشتن) ـــــ کافرۆش

٣- ناو + ئاوەڵناوی کراوی دارژاو ـــ ئاوەڵناوی لێکدراو

سەر + شکای ـــــ سەرشکای

با + بردی ـــــ با بردی

زمان + سووتان ـــــ زمان سووتای

٤- وشەی نادیار + رەگی چاوگ ـــــ ئاوەڵناوی لێکدراو

زۆر + زان (لە/ زانین) ـــــ زۆرزان

کەم + زان (لە/ زانین) ـــــ کەمزان

٥- وشەی نادیار + ناو ـــــ ئاوەڵناوی لێکدراو

زۆر + کابان ـــــ زۆرکابان

٦- ئاوەڵناوی چۆنی + رەگی چاوگ ـــــ ئاوەڵناوی لێکدراو

راست + گۆ (لە/ گۆتن) ـــــ راستگۆ

بەد + بین (لە/ بینین) ـــــ بەدبین

٧- ناو + ئامرازی پەیوەندی/ ناوگر + ناو ـــــ


سادق بەهائەدین

ئاوەڵناوی لێکدراو

هاوار + بە + دەو ـــــ هاوار بەدەو

شان + بە + قوڕ ـــــ شان بەقوڕ

سەر + بە + هەش ـــــ سەربەهەش

٨- ناو+ ئامـــرازی پەیوەندی/ ناوگـــر + چاوگ ـــــ ئاوەڵناوی لێکدراو

دەو + بە + پێکەنین ـــــ دەوبە پێکەنین

٩- ئاوەڵناوی چۆنی سادە + ئامرازی پەیوەندی/ ناوگر + ئاوەڵناوی چۆنی سادە ـــــ ئاوەڵناوی لێکدراو

قیت + و + قۆز ـــــ قیت و قۆز

پیس + و + چەپەر ـــــ پیس و چەپەر

١٠- پێـشگر + ناو + ئامـرازی پەیوەندی + ناو ـــــ ئاوەڵناوی لێکدراو

بێ + سەر + و + بەر ـــــ بێ سەروبەر

بە + ژن + و + مار ـــــ بەژن و مار

١١- ناو + ئامرازی پەیوەندی + ئاوەڵناوی كراوی دارژاو ـــــ ئاوەڵناوی لێکدراو

سەر + لێ + شێواي ـــــ سەرلێشێواي

کۆست + لێ + کەوتی ـــــ کۆست لێکەوتی

**ئەرکی (ئاوەڵناو) لە ئاخاوتندا**

لە ئاخاوتن یان نووسیندا (ئاوەڵناو) چوار ئەرکی سەرەکی دەگرێتە ئەستۆ، ئەوانیش:

ا- تەواوکەری ناو:

(ئاوەڵناو) بەدوو جۆر دەبێتە تەواوکەری ناو؛

١- بەبێ یارمەتی ئامرازی پەیوەندی، بۆ نموونە:

- هەموو ژنەک ژن نییە!

(هەمـــوو) ئاوەڵناوی نادیارە، بەبێ یارمـــەتی ئامـــرازی پەیوەندی پەسنی ناوی (ژنەک)ی داوە.

٢- بە یارمەتی ئامرازی پەیوەندی، بۆ نموونە:

- پیـاوی خراپ نەک هەر لێرە، بەڵکی لە هیچ جێیـەکی خۆشـەویست نییـە! (پیـاو) ناوە، پەسندراوە بە ئاوەڵناوی چۆنی..(ی) ئامـــرازی پەیوەندییـــە.. (خـــراپ) ئاوەڵناوی چۆنییە، تەواوکەری ناوی (پیاو)ە.

ب- تەواوکەری جێناو:

ئەمەش دیسانەوە بەدوو جۆر دەبێت، ئەوانیش:

١- بەبێ یارمەتی ئامرازی پەیوەندی، بۆ نموونە:

- هەموو ئەوان دەناسم.

(هەمـــوو) ئاوەڵـناوی نادیارە، پەسنی جـێناوی (ئەوان) دەدات کە جێناوی سەربەخۆی کەسی سێیەمی کۆیە،

٢- بە یارمەتی ئامرازی پەیوەندی، بۆ نموونە:

- ئەنگۆی ئازا جێی ئومێدن.

(ئەنگۆ) جـێناوی سـەربە خـۆی کـەسی دووەمی کـۆیە، پەسـەندراوە.. (ی) ئامـرازی پەیوەندییە.. (ئازا) ئاوەڵناوی چۆنییە، پەسندەری جێناوی (ئەنگۆ)یە.

ح- تەواوکەری ئاوەڵناوێکی تر:

ئەمەش دیسانەوە بەدوو جۆر:

١- بەبێ یارمەتی ئامرازی پەیوەندی، بۆ نموونە:

- پیاوی زۆر ئازام دەوێت.

(پیـاو) ناوێکی گشـتـیـیـە، پەسندراوە.. (ی) ئامـرازی پەیوەندییـــە.. (ئازا) ئـاوەڵناوی چۆنیـیـــە پەسندەری ناوی (پیـاو)ە.. (زۆر) ئاوەڵناوی نادیارە، تەواوکـەری ئاوەڵناوی (ئازا)ی چۆنییە، لێرەشدا ئاوەڵناوی (زۆر) ڕاستەوخۆو بەبێ یارمـــەتی هیچ ئامـــرازێکی پەیـوەندی، هاتووە بووەتە تەواوکەری ئاوەڵناوی (ئازا).

٢- بە یارمەتی ئامرازی پەیوەندی:

- کوڕەکی ڕاستی خواناسە.

(کـــوڕ) ناوە، بەشی نیـــهـــادە.. (ە ک) نیـــشـــانەی نەناسیـارییە.. بەسـەریەکەوە (کوڕەک) ناوێکی نەناسـراوی گـشـتـیـیـە، بەشی نیـهـادە، پەسندراوە.. (ی) ئامـرازی پەیوەندییە.. (ڕاست) ئـاوەڵناوی چۆنییـە، پەسندەری ناوی (کوڕ)ە دیسـانەوە تەواوکراوە..(ی) ئامرازی پەیوەندییـە.. (خـــواناس) ئاوەڵـناوی بکەری لێکدراوە، تەواوکـــەری ئاوەڵناوی (ڕاست)ە کـە لە پێـشـەخۆی هـاتووە.. لێـرەشـدا

تەواوکردنەکە بە یارمەتی (ی) ئامرازی پەیوەندی هاتووە کە لکاوەتە سەر دوایین بەشی ئاوەڵناوی (ڕاست).

د- تەواوکەری فرمانی ناتەواو:

ئەمەش بەڕاستەوخۆیی دەبێت، بۆ وێنە:

- ئەو پیاوە بێکەسە.

(ئەو پیاوە) ـــــ بەشی نیهادە.. (بێکەسە) ـــــ بەشی گوزارەیە.. (بێکەس) ئاوەڵناوی چۆنییە تەواوکەری فرمانی (ە)ی ناتەواوە کە لکاوەتە سەر دوابەشی.

٣- ئاوەڵناو لە ڕووی (چی)یەتیەوە:

لە ڕووی (چی)یەتیەوە، (ئاوەڵناو) چەند جۆرێکی هەیە، ئەوانیش:

ا- ئاوەڵناوی پرس: وشەیەکی پرسە، پرسیاری (ناو)ێک یان (جێناو)ێک لە ڕستەدا دەکات.. بە زۆریش ئەم ئاوەڵناوانەن (کو- چ) بۆ وێنە:

- کراسەکی کوت کڕی؟ (کو) ئاوەڵناوی پرسە، تەواوکەری ناوی (کراس)ە.

- ئەتوو بە چ ڕووەکی وەدەکەی؟ (چ) ئاوەڵناوی پرسە، تەواوکەری ناوی (ڕوو)ە.

ب- ئاوەڵناوی چۆنی: وشەیەکە پەسنی (ناو)ێک یان (جێناو)ێک دەدات، چۆنییەتیان لەیەک لە ڕووەکاندا وەدەردەخات.. ئەمانەش لە ژمار نەهاتوون..بۆ وێنە:

- ئەو عەیامی پیاوی باش زۆر بوون!

(باش) ئاوەڵناوی چۆنییە، تەواوکەری (پیاو)ە.

- کراسەکی مۆری لەبەرە.

(مۆر) ئاوەڵناوی چۆنییە، تەواوکەری (کراس)ە.

- گوندەکی خۆشیان هەبوو!

(خۆش) ئاوەڵناوی چۆنییە، تەواوکەری (گوند)ە.

ح- ئاوەڵناوی نیشانە: ئاوەڵناوێکی دوولەتییە، هەمیشە ئەو (ناو) یان (جێناو)ەی دەستنیشانیان دەکات، بەنێو هەردوو بەشەکانی خۆیان دەگرێت.. ئەمەش چەند شێوەیەکی هەیە، بۆ وێنە:

١- بۆ شتانی بەرجەستە: لەگەڵ ئەم شتانەدا، ئاوەڵناوی نیشانە بەم شێوانە دەردەکەوێت:

- ئەو دارەم بدێ. (ئەو... ە) ئاوەڵناوی نیشانەیە بۆ شتانی نزیک.

- ئەو دارێهێم بدێ. (ئەو... ێهێ) ئاوەڵناوی نیشانەیە بۆ شتانی دوور.

تێبینی: لەم دوو نموونەی سەرەوودا ئەو ناوەی بە ئاوەڵناوی نیشانە پەسندراوە، ناوێکی تاکە، بەڵام ئەگەر کۆ بێت ئەوا بە تەنیا (ان)ی نیشانەی کۆ بۆسەر دوابەشی (ناو)ەکە زیاد دەکەین، ئیتر دەیخەینەوە نێو دوو بەشەکانی ئاوەڵناوی نیشانەکە، بۆ نموونە:

- ئەو دارانەم بدێ.

- ئەو دارانێهێم بدێ.

٢- بۆ شتانی واتایی: لێرەشدا شێوەی ئاوەڵناوی نیشانە بەم جۆرەی لێدێت.

- (ئەو... ی) بۆ تاکی نزیک

+ ئەو جاری هاتم.

- (ئەوێ... ێ) بۆ تاکی دوور

+ ئەوێ جارێ هاتم.

بەڵام لەگەڵ ناوی (کۆ)دا لێرەدا هەریەک شێوەی ئاوەڵناوی نیشانە هەیە، ئەویش (ئەوان... ی)یە، بەواتا نیشانەی (کۆ)یەکە یەکسەر دەچێتە سەربەشی یەکەمی ئاوەڵناوەکە، نەوەک بچێتە سەر (ناو)ەکە خۆی، بۆ وێنە:

+ ئەوان ساری دنیا زۆر خۆشبوو.. (ئەوان... ی) ئاوەڵناوی نیشانەیە بۆ (کۆ) تەواوکەری (سار)ە.

د- ئاوەڵناوی نادیار: ئەم وشە نادیارانەن کە بەشێوەیەکی گشتی پەسنی (ناو)ێک یان (جێناو)ێک دەدەن..

ژمارەی ئەم ئاوەڵناوانەش زۆرن، لە نێویاندا گرنگترینیان: (هەموو- هەندەک- بڕەک- کەم- زۆر- قیچەک- تۆزەک... تاد) بۆ وێنە:

+ لەهەموو هەورەکی باران نابارێ. (هەموو) ئاوەڵناوی نادیارە، تەواوکەری (هەور)ە.

+ هەندەک کەس مل بەڕاستی نادەن. (هەندەک) ئاوەڵناوی نادیارە، تەواوکەری جێناوی (کەس)ە.

+ خەڵکەکی زۆر هەژارن. (زۆر) ئاوەڵناوی نادیارە، تەواوکەری ناوی (خەڵک)ە.

+ چۆڕە ئاوەکم خواردەوە. (چۆڕە) ئاوەڵناوی نادیارە، تەواوکەری ناوی (ئاو)ە.

هـ- ئاوەڵناوی کراو: ئەو ئاوەڵناوانەن کە سیفەتی کارێکی کراو دەدەنە پاڵ (ناو)یان (جێناو).. دوو جۆری هەیە (داڕژاو)و (لێکدراو)، بۆ وێنە:

١- ئاوەڵناوی کراوی داڕژاو: ئەمە بە سێ ڕێگە دروست دەکرێت:

یەکەم: ڕەگی چاوگی تێپەڕ (لە بنجدا تێپەڕ) + ڕای ـــــ ئاوەڵناوی کراوی داڕژاو

نووس + رای ـــــ نووسرای

کوژ + رای ـــــ کوژرای

دووەم: قەدی چاوگی تێپەڕ (لە بنجدا تێنەپەڕ بێ) + رای ـــــ ئاوەڵناوی کراوی دارڕژاو

شکاند + رای ـــــ شکاندرای

سووتاند + رای ـــــ سووتاندران

سێیەم: قەدی چاوگی تێنەپەڕ + ی ـــــ ئاوەڵناوی کراوی دارڕژاو

شکا + ی ـــــ شکای

مرد + ی ـــــ مردی

و- ئاوەڵناوی بکەر: ئەو ئاوەڵناوانەن کە سیفەتی کارێک بە خۆوە دەگرن و دەکەونە پەسنی (ناو) یان (جێناو).. سێ جۆری هەیە:

یەکەم: ئاوەڵناوی بکەر سادە: هەندێک جار (ڕەگی چاوگ) بە تەنیا خۆی ئاوەڵناوی بکەر سادەیە، وەک (دز) کە ڕەگی چاوگی (دزین)ە.

دووەم: ئاوەڵناوی بکەر دارڕژاو: پێک دێت لە (ناو + پاشگر) بۆ وێنە:

باغ + ە وان ـــــ باغەوان

گا + وان ـــــ گاوان

سێیەم: ئاوەڵناوی بکەر لێکدراو: پێک دێت لە (ناو + ڕەگی چاوگ) بۆ وێنە:

پیاو + کوژ ـــــ پیاو کوژ

ناو + نووس ـــــ ناونووس

ز- ئاوەڵناوی ژمارەیی: ئەم ئاوەڵناوانە هەموو ژمارەیەکی تەواو و کەرتی دەگرنەوە، کە پەسنی (ناو)ێک یان (جێناو)ێک دەدەن.. بۆ وێنە:

١- ئاوەڵناوی ژمارەی بنجی: هەموو ژمارەیەکی تەواو دەگرێتەوە، بۆ وێنە:

- سەد دینارم پێیە. (سەد)

- سێیەم دەرکە مارێ مەیە. (سێیەم)

٢- ئاوەڵناوی ژمارەی کەرتی: هەموو ژمارەیەکی کەرتی دەگرێتەوە، بۆ وێنە:

- پشت بە چارێکە ئاقران مەبەستە. (چارێک)

- دەیەکی مەڕەکانم فرۆشت. (دەیەک)

٤- ئاوەڵناوی تەرتیبی: ئەو ئاوەڵناوەیە کە بە ژمارەی دووبارە کراو تەرتیب بۆ (ناو)و (جێناو)ەکان دادەنێت.. بۆ وێنە:

- پێشمەرگەکان دوو دوو دەرچوون. (دوو دوو)

- ئەوانە یەک یەک دەناسم. (یەک یەک)

**ئەنجام**

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا بۆمان دەرکەوت، کە (ئاوەڵناو) لە (شێوەزاری دەشتی هەولێر)دا لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت، چۆن دروست دەبێت- گرنگترین ئەو ئەرکانەی دەیانبینێت لە ڕستەدا کامانەن- چەند جۆرن و بەسەریەکەوە چەند فراوان و لەیەک جیان.. ئەمەش هەمووی ئەوە دەردەخات کە ڕۆڵی (ئاوەڵناو) وەک لە شێوەزاری دەشتی هەولێردا گەورەیە، ڕەنگبێ لە شێوەزارەکانی دیکە بەو دەوڵەمەندییە شێوەی هێندە زۆرو جۆراوجۆری نەبێت، وەک بەراوردکاران گەر بێت و بێن بەراوردی ئەم شێوەزارە لەگەڵ شێوەزارەکانی دیکەدا بکەن بۆیان دەردەکەوێت.

**سەرچاوەو پەراوێزەکان**

...............

**١- مامۆستا سەعید صدقی (ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی- بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی- کۆڕی زانیاری کورد)، بەغدا، ١٩٧٦، ل ٧٥-٧٦.**

**٢- مامۆستا صادق بەهائەدین (هەمان سەرچاوەی پێشوو)، ل ٧٧.**

**٣- د. نەسرین فەخری (هەمان سەرچاوەی پێشوو)، ل ٧٧**

**٤- (هەمان سەرچاوەی پێشوو)، ل ٧٦.**

**٥- (هەمان سەرچاوەی پێشوو)، ل٧٦.**

**٦- ئیدریس عەبدوڵلا، (ڕێزمانی ئاخاوتنی دەشتی هەولێر)، دەستنووس**

**٧- لیژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردەی عێراق، (زمان و ئەدەبی کوردی- بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی)، چاپی (١٠)، بەغداد، ١٩٩٥، ل ٥٦.**

**٨- (هەمان سەرچاوەی پێشوو)، ل ٥٦.**

**٩- ئیدریس عەبدوڵلا، (ڕێزمانی ئاخافتنی دەشتی هەولێر)، دەستنووس.**



# دوو هەڵوێستی مەردانەی حوزنی لە دیدەنی مەلیک فەیسەڵی یەکەم و مەلیک غازی-دا

د. کوردستان موکریانی

بەهەشتی حوزنی موکریانی لە پەڕاوێکیدا بە دوورو درێژی بەسەرهاتی خۆی لە نێوان ساڵانی (١٩٣٥-١٩٤١)دا دەگێڕێتەوە. کارەساتی ڕۆژانەو هەرچی ناهەموارییەکی کە لەو ماوەیەدا بەسەری هاتووە، هەر تەنێ بۆ ئەوە بووە کە چاپخانەکەی پووچ بکەنەوە و چاپەمەنییەکانیشی لەنێو بەرن.

بیرەوەرییەکانی حوزنی، سامانێکی دەوڵەمەندە، لە ڕووداوانی مێژوویی کۆمەڵگەیەک دەدوێت کە پێوەندی ڕاستەوخۆیان بەچارەنووسی کوردەوە هەیە، نووسینەوەو بڵاوکردنەوەی بیرەوەری دەبێتە هۆی بە یەکەوە گەیاندنی وەچان، ئەم بیرەوەرییانە بۆ ئەوانەی هاوچەرخی بوون، چێژی لێ دەنۆشن، ئەوانەی هیچی لێ نازانن سوود لە تاقیکردنەوەکانی پێش خۆیان دەبینن و ئەمە لە کاتێکدا کە کورد زۆر جار مێژووی خۆی دووبارە دەکاتەوەو کەڵک لە ڕابردووی خۆی وەرناگرێت، چ لەبەر گوێ نەدانی بۆ ڕووداوانی بەسەرچوو وەیا نائاگاداری لەو ڕابردووەو یان لە ڕووی ئەوەی نەنووسراوەتەوەو بڵاونەکراوەتەوە.

بیرەوەرییەکانی حوزنی بە زمانێکی وا دەوڵەمەندو شیرین دەربڕاون، مرۆڤ هەر هەژدەکات بیانخوێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەی بیرەوەرییەکان بەسەرهات دەگێڕنەوە، ئەوەند ڕەوان نووسراون دەڵێیت پارچەیەکی وێژەییە و ڕۆمانە و هەر ئارەزووی بەردەوام بوونی خوێندنەوەی دەکەیت و لەگەڵ پاڵەوانەکانی دەژیت.

لە (١٩٣٢/٨/١٦)دا مەلیک فەیسەلی یەکەم، مەلیکی عیراق ڕووی لە کوردستان کردووە و سەرێکی لە کەرکووک، مووسڵ، هەولێر و ڕواندز داوە، لە کاتی هەبوونیدا لە جوندیان داوادەکات کە حوزنی بێتە لای و چاوی پێ بکەوێت، حوزنی بەم شێوەیە لە بیرەوەرییەکانیدا باس لەو چاوپێکەوتنە دەکات:



حوسێن حوزنی موکریانی

«من لە ماڵی خۆم ڕوو بەخودا و بێدەنگ، گۆشەگیر دانیشتبووم، گەورەو بچووکی شار و دێهاتەکانی ڕواندز بانگهێشت کرابوونە پێشوازی کردن، نزیک نیوەڕۆ جگە لە من کەسێک نەنێرو نە مێ لە شاردا نەمابوو، هەر هێندەم زانی تەزکەرەیەکی تەحسین قەدری بەگ مورافقی جەلالەتی مەلیک بە دەست شورتییەکەوە پێم درا کە وەرم گرت نووسرابوو: (جەلالەت مەئابی مەلیکی عیراق دەیەوێت بتبینێت، ئەوا ئوتومبیلم بۆ ناردی تالوکە لە هاتن بکە).

من کەوتمە ئەندێشەوە دەبێت چی بێت؟ بۆچی بێت؟ یان چ کارێکی بەمن هەبێت؟ بە ئەندێشەو لێکدانەوە کەوتمە ڕێ و سواری ئوتومبیل بووم و چووم جەلالەت مەئاب لە جوندیان لە خانوو بەرەیەکی مستەر هەمیلتونی ئینگلیز بۆ میوانەکانی ئینگلیزی لەسەر گردێکی نێزیک پردی دروستکردبوو، جێی بۆ چاککرابوو و ڕوو بە قیبلە، لە پێش خانووبەرەکەدا سابات و کەپرێکی بەرزو گەورەیان بۆ ڕێکخستبوو، تەنیا خۆی لەو ساباتە دانیشتبوو.

هەرکە چووم لە ڕواندزەوە هەتا پردی جوندیان، خەڵکی شارو ڕەعیەت و میللەتی دەرەوەی ڕواندزم لەمبەر و ئەوبەری ڕێگا، لەژێر سێبەرە دارەکان کەوتبوون ڕێی ئوتومبیل نەبوو بڕوات کە گەیشتمە سەر پردی جوندیان دوو پۆلیس لەوبەری پرد ڕاوەستابوون، ڕایانگرتم و دایانبەزاندم لە پیادەڕێوە سەریان خستم کەدیم تەحسین قەدری بەگ ڕاوەستابوو، چاوەنواری منی دەکرد، چوومە پێش و ڕۆژ باشم لێی کرد و پێشم کەوت، هێندێک ڕەوشتی نیشاندام کە گوایا من ناشارەزام و پیاوانی گەورەم نەدیوەو نەچوومەتە دیوانی سەرهات و ناودارانەوە و منیش هەر بەڵێم بۆ دەگوت و دەڕۆیشتم و تەماشای دەورویشتی خانوو بەرە و کۆمەڵەکانم دەکرد، چاوم پێکەوت کە ئەمین زەکی بەگی کوردی سلێمانی- وەزیری ئیقتیساد و مواسەلات و ئەشغالی عیراق لە تەنیشتییەوە لەلای ڕۆژاوای دیواری خانووبەرەکە ڕاوەستابوو، تەماشای منی دەکرد و بە قامکی ڕاستی ئیشارەتی بە من دەدا کە زبانی خۆت بگرەو ئاگاداری گفتوگۆکردن بە زاراوە دەگرت و لەگەڵم خەریک بوو.

چاوێکم لە ئەمین زەکی بەگ و چاوێکم لە مەلیک بوو، لەنێو ساباتەکە لەسەر کورسییەکی مورەسەع ڕوو بە ڕۆژاوا دانیشتبوو، لە من ورددەبووەوە و هەردوو گوێم دابووە تەحسین قەدری بەگ کە فێری داب و دەستووری چوونە پێش و گفتوگۆ و ڕەوشتی ڕاوەستان و دەست ماچکردن و کڕنووشبردنی دەکردم، کەوتبوومە نێو وەهم و... کە داخوا ئەمین زەکی بەگ مەبەستی چی بێت و تەحسین قەدری بۆ چ دەرسم دەدات و مەلیک قسەی چم لەگەڵ دەکات کەوا ئەم دوو گەورە پیاوانەی بەمنەوە خستۆتە ئەندێشەوە ؟..

چوومە پێش و قسەکانی تەحسین قەدریم بەهێند نەگرت و بە ئیشارەت و قامک گەزتنی ئەمین زەکی خۆم دانەچڵەکاند، بە دەستوورێکی موسڵمانانە نزیک بە پێشگاهی مەلیک کە بوومەوە، دەستی ڕاستم بڵند کردو گوتم (السلام علیکم) و کورسییەک لە نزیک داندرابوو، چووم لەسەری دانیشتم، چاوەنواری فەرمانی جەلالەت مەئابیانم کرد، مەلیک نەرمە کەنینێکی گرت و کەمێک بەسەرچوو، جوابی سلاوەکەی دامەوە و گوتی (مرحبا) بێدەنگبوو.

لە دوای دوو دەقیقەیەک ئەحواڵ پرسی کردم و لە مەتبەعە و مەتبوعات و تەئلیفەکانی پرسیم، پێم گوت کە زۆر باشە و هێندە جلد مجەلەی زاری کرمانجی نەشربووەو چەند کتێبێکی تاریخی کوردان و ئەدەبی ئیجتماعیشم لە چاپ دراوە و ناوی کتێبەکان و فەهرەستیانم پێ گوت. لەنێوانی من و ڕەزا بەگی پرسی کە چۆنین. گوتم: زۆر باشین و ڕەزا بەگ مادام قایمقامی مەلیکە، چاک و دادگەر و بەکردە و ڕەعیەتپەروەر و قانوونی و ڕاست و سادقی حکومەتە، هیچ قسووری و عەیبی لێنابینم.

گوتی: لەگەڵ تۆو مەتبەعەکەت چۆنە؟ گوتم: لەگەڵم بە میهرەبانەو زۆر ئارەزووی پێشخستن و دارایی مەتبەعەکەم دەکات و کتێب و مەتبوعەکانم بەهۆی ئەوەوە نەبێ ناسووڕێت.

هەرچەند قسەکانم بەر ئاوەژووی کردەوەی ڕەزا بەگ بوو، بەڵام لەمەدا مەبەستی من ئەوە بوو پیاوێکی کورد نەشێکنم و لەسەر دەستووری خۆم کە لە پاشملە خراپی کەسم بە زباندا نەهاتووە، نەمویست لە حزووری مەلیکێکی گەورە، باسی خراپی هیچ کەسێک بکەم، بەتایبەتی ڕەزا بەگ کە کوردێک و لە بنەماڵەیەکی گەورەی سلێمانی بوو، چۆن بە زبانم دادێ



به خراپی بدوێم.

له پاش ئەوە هەڵیدایە کە تۆ لەگەڵ گەورەو سەرهات و مەزنەکانی عەشایری کورد تێکەڵاوی و لەگەڵ شێخ ئەحمەدی بارزان و پژدەری و شێخ مەحموود زۆر ڕێک و دۆستی و هەواخوانی ئەوانی، هەمیشە بۆ کوردایەتی تێدەکۆشی و هەموو کوردێک تۆیان خۆشدەوێت. ڕەزا بەگ بە دوور و درێژی بۆی گێڕامەوە.

گوتم: بەڵێ. لەبەر ئەوە کە بە پشتیوانی قانوونێکی بە میللەتی نەجیبی کوردتان بەخشیوە و میللەتی کوردتان بە شەعبێکی موهیمی عیراق داناوە و تەشکیلاتی حکوومەتی عیراقی لە دوو عونسری نەجیب و بەهێزی کورد و عەرەب دراوەتە ناسین و قانوونی لوغاتی محەلییە بۆ میللەتی کورد تەتبیقکراوە. مجەلەو نەشریاتم بە زبانی کوردی بوون و منی بە هەموو کوردێک داوەتە ناسین و لەبەر ئەمە کە یەکەمین کوردێکم کە تاریخی کوردانم بە زبانی کوردی نووسیوە و بەناوی عەدالەتی جەلالەت مەئابتانەوە چاپ و بڵاوم کردۆتەوە و حکوومەتی خۆشەویست ئیمتیازی داوم، دیارە کە گەورە و سەرهاتەکانی کورد دەبێ خۆشیان بوێم و مادام لوتف و مەرحەمەتی ئێوەم لەسەر بێت پتر خۆشەویست دەبم».

لەبەر ڕۆشنایی بیرەوەرییەکانی حوزنی بەدیاردەکەوێت، ڕەزا بەگی قایمقامی ڕواندز بە ڕادەیەک مەحموود فەخری کەرکووکی- موتەسەڕیفی هەولێر لە حوزنی دڵگیرکردبوو، نێو براو فەرمانی دەرکردنی حوزنی لە عیراق لە ساڵی (١٩٣٣)دا دەرکردبوو.

حوزنی بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەی بەرەو بەغدا بەڕێ دەکەوێت و یەکسەر ڕوو لە وەزارەتی ناوخۆ دەکات و ناجی شەوکەتی وەزیری ناوخۆ ڕووبەڕوو پێی دەڵێت: تۆ کورد پەرستی دەکەیت، لەگەڵ مێژووی کورددا خەریکی و نایەڵم لە



عیراق دانیشت... دەبێت دەست لە بیری کوردایەتی بەردەی، تاکو بژی.

کەواتە تاکە کەسێکی کە مابێت لە عیراقدا چارەی بکات تەنێ پاشای عیراقە کە بەم جۆرە چاوپێکەوتنەکەی باس دەکات:

«هیچ چار نەما، لە دەوروبەری مانگی کانوونی ساڵی (١٩٣٣)دا هەستام بەشەو چوومە لای مەرحووم مەلیک عەلی برای مەلیک فەیسەل. زۆر منەتداری ئەم مەلیکە موحتەرەمە بووم کە بەبێ پرسیار خوازتیە حزوور و زۆر بە لوتفەوە نوازشی کردم، شەوی (٢١ی ڕەمەزان) بوو، سەربهووردی لێ پرسیم، بەسەر داهاتووی خۆم و ئیستیبدادێکی ناجی شەوکەت بەگ دەیەوێت پێم ڕەوا ببینێت دوورو درێژ ئەوەی ڕاست و دروستبوو، بۆم گێڕاوە، ئەو گەورە پیاوە دەست بەجێ لەگەڵ مەرحووم مەلیک غازی بە تەلەفۆن گفتوگۆی کرد و هەستا بە ئۆتومبێلی خۆی بردمییە (قصرالزهور) کە چووینە ژوور تەنیا جەلالەت مەئابییان لە ژوورێکدا دانیشتبوو، دوو کورسی دیکەش داندرابوون، یەکێک لە بەرامبەر خۆی، هی دووەم نزیکەی مەترێک لە خوار خۆیەوە داندرابوو.

جەلالەتی مەلیک عەلی چوو لەسەر کورسی بەرامبەری دانیشت، منیش بۆ لای کورسی دووەم چووم ڕاوەستام و چاوەنواری فەرمانی دانیشتنم کرد. مەلیک غازی، چونکو نەوجەوان و خوێنگەرم بوو، ڕووی تێکردم، بەم دوو- سێ پرسیارانەی داگرتم و گوتی:

تۆ لەگەڵ چاوو ڕاوی کوردایەتی خەریکی کورد پەرستی دەکەی، کتێب و مجەلەی مەتبەعەکەت بەهاندانی میللەتی کورد نەشریات دەکات، کورد لە عیراقدا تۆ فێرت کردوون و لاوەکانی کوردت خستۆتە سەر ڕەوشتی خۆت.

ڕاوەستام و دەستم لەسەر تەختە مێزەکە داناو گوتم: جەلالەت مەئاب مەلیکی گەورەو خۆشەویستمان ئەم تەختە مێزە تەختەی یاری بوو ئێمەی کورد لە لایەکەوە و ئێوەش لەلایەکی دیکەوە بۆ بردنەوە لە تەڕ دەستیدابووین، تێدەکۆشاین، ناڵێم ئێمە نەمانزانی و تێنەگەیشتوو بووین و ئێوە ئازاتر و تەڕ دەستربوون و بردتانەوە، بەڵام پشتیوانی ئێوە بەهێزبوو، پشتی لە ئێمە نەستاندبوو، بە زۆر بە ئێمەی دایە دۆڕاندن و پەریشانی کردین، ئەو دۆڕاندن و پەریشانییەیە منی ناچارکردووە کە پەنا بۆ بارەگاهی بەرزی جەلالەت مەئابتان بێنم و لەپێش دەستتان ڕابوەستم کە ئەوەم بە عەرەبی پێ گوت، مەرحووم عەلی وەکو گوڵ گەشایەوە، چونکو دەمدیت لە فەرمایشەکانی مەلیک غازی وەکو ژی کەوان وێکهاتبوو، ڕەنگی لە ڕوودا نەمابوو، هیچ ئومێدی نەدەکرد مەلیک غازی بەو جۆرە قسانە بدوێنێت».

# ئەنتڵ زلهێزی کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت



**ئەندازیار: مەهاباد عومەر خۆشناو**

سەردەمی تازەی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی و بڵاوبوونەوەی ئینتەرنێت بەم شێوە سەرسوڕهێنەرە، بووە هۆی ئەوەی کۆمپانیای ئەنتڵ-ی ئەمریکی بیر لەوە بکاتەوە کە جێگا پەنجەی خۆی لەنێو دنیای ئینتەرنێتدا بکاتەوەو سەرمایەکی زۆریشی بۆ تەرخان بکات، ئەوە ئەگەر ئێمە زانیمان کە کۆمپانیای ئەنتڵ یەکێکە لەو کۆمپانیایانەی کەوا لە جیهاندا زۆر بەناوبانگ و ناسراوە بە بەرهەم هێنانی بچووکترین و هەستیارترین بەشەکانی کۆمپیوتەر، هەروەها وەبەرهەم هێنانی بچوکترین بەش لە زۆربەی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان، بە تایبەتیش ئەو بەشەی ناسراوە بە پەڕەی سلیکۆنی تەنک (رقائق السليكون).

کۆمپانیای ئەنتڵ تاکە کۆمپانیایە لەنێو ئەو هەموو کۆمپانیایەی لە ناوچەی بەرهەم هێنانی مادەی سلیکۆن دامەزراوە -دەربەندی سلیکۆن، بەمەش ناوی کۆمپانیاکە لەگەڵ شوێنگەی دەگونجێ، هەروەها یەکێکە لەو کۆمپانیا هەرە گرنگانەی لەسەر ئاستی جیهاندا مادەی سلیکۆن بەرهەم دێنێت، ئەم کۆمپانیایە سلیکۆن بەداهاتووی دوارۆژێکی گەورە دەزانێ بۆ خۆی و بۆ پێشکەوتنی کارەکانی، جگە لەوەش کۆمپانیای ئەنتڵ تایبەتمەندی وەرگرتووە لە دروست کردنی بەشی چارەسەرکردنی زانیارییەکان و بەشەکانی هەڵگری زانیارییەکان لە کۆمپیوتەرە تایبەتی و تاکەکەسییەکان. ئەنتڵ لەو باوەڕەدایە کە ئینتەرنێت تاکە فاکتەری پاڵنەری بەرەو پێش بردنی ئابوورییە لە هەموو جیهانداو خەریکە سەرجەم پرۆژە بازرگانییەکان دەخزێنە ناو ئینتەرنێت و بازاڕێکی نوێ و گەورەو مەزنی لەبەردەست دایە.

کۆمپانیای ئەنتڵ لەلایەن هەموو زانستیخوازان لە جیهاندا لەسەردەمی ئێستاماندا وەکو قوتابخانەیەک سەیر دەکرێت، نەک تەنیا لەبەر پێشکەوتنی زانستی، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەو کۆمپانیایە جگە لە زیرەکی و پێش کەوتنی زانستیش، وەکو نموونەی هەڵسوڕاندنی ئیشوکار تێی دەڕواندرێت.

### ئەوەی نوێ لە کاروباری ئینتەرنێتدا

وەک ئاشکرایە لەلای هەموومان ئێستا هەموو کاروبارەکان بەشێوەیەکی ئەلیکترۆنی بەڕێوە دەبرێت، بۆیە لە هەموو لایەنەکانی کارەوە پشت بەتەکنەلۆژیای ئەلیکترۆنی دەبەسترێت، پشت بەو ئامێرانە دەبەسترێت کەوا سوودی ئەلیکترۆنییانەیان لێ وەردەگیرێت، بۆ ئەوەی ئەم کارانە بخرێنە چوارچێوەی جێبەجێ کردن، ئەنتڵ نەخشەی بنچینەیی پێشکەش دەکات کە خۆی لەو ئامێرە خزمەتگوزارییە بەهێزانە دەنوێنێت کە پشت بەو پەیکەرەی ئەنتڵ دەبەستێت کە لەسەر تەکنیکی بەرز دامەزراوە کە چارەسەری نوێی ئەنتڵ کە ناوی نراوە (ئەتانیۆم) دابینی دەکات، ئەوەی کە جیهانگیری کارەکان دەکاتە ڕاستییەکی واقیعی بەهۆی ئەنجامدانی خێراو نرخی گونجاوی، ئەوەش ڕێگا خۆشکەرە بۆ زیاتر بەتواناکردنی ئینتەرنێت و دابینکردنی خزمەتگوزاری زیاتر، بەتایبەتیش ئەو مواسەفاتەی تازەی هەڵگرتن و کۆکردنەوەی زانیارییەکان، چونکە لەم ڕێگایەوە دەتوانرێت نەوەیەکی نوێ

لە سیستەمی کۆمپیوتەری ئینتەرنێتی بەرهەم بهێندرێت.

## بەرهەمهێنانی ئەنتڵ

لەگەڵ ئەو گەشەکردنە زۆر خێرایەی لە ئینتەرنێت و بوارەکانی ڕوویدا، کۆمپانیاکانی تەکنیکاری زانیارییەکان خۆیان لە بارێکدا دۆزییەوە کە بەخێلیان پێ نەدەبردرا، چونکە بوارە نوێیەکان لەمیانەی ستراتیژییەتە بنچینەییەکانیان دەرچوو، بۆیە دەبوایە کارێکی وا بکەن بەخێرایی ستراتیژی خۆیان ڕاست بکەنەوەو بۆ ئەوەی گالیسکەکە لەنوێوە دروست نەکەن، بیرۆکەی یەکگرتنی کۆمپانیاکەیان هاتە ئاراوە یان دەست بەسەرداگرتنی بچووکەکان لەلایەن گەورەکانەوە یان گرێدانی گرێبەندی ستراتیژی لەنێوانیاندا.

کۆمپانیای ئەنتڵ-یش ئەم حاڵەتەی بەخۆیەوە بینی، بگرە ئەو یەکێک بوو لەو کۆمپانیایانەی زۆر وردو کارایانە ئەم کارەی بە ئەنجام گەیاندو بەشێکی تایبەتی لەژێر ناوی (ئەنتڵ کابیتاڵ) دامەزراندو بودجەیەکی تایبەتی بۆ دابین کردووە، لەگەڵ ئەوەی ئەم بەشە کارەکانی لەساڵی (١٩٩٥)دا بە وریایی و سستی دەست پێکرد، بەڵام کۆتایی ساڵی (١٩٩٩) کە چالاکییەکی یەکجار زۆری ئەنتڵ-ی بە خۆیەوە بینی، لەم بوارەدا توانی ژمارەی کۆمپانیاکانی سەر بە ئەنتڵ بکات بە زیاتر لە (٣٥٠) کۆمپانیاو نزیکەی ملیارێک دۆلاری ئەمریکی تێدا وەربەرهەم هێنرابوو کە (١٠٠) لەو کۆمپانیایانە لەساڵی (١٩٩٩)و لە (٢٠) وڵاتی جیهانی و (٥) کیشوەری جیهان کرابوون.

## تێڕوانینی ئەنتڵ بۆ ئاییندە

یەکێک لەو تایبەتمەندییانەی ئەنتڵ لە ئەوانی تر جیا دەکاتەوە، تێڕوانینیەتی بۆ ئاییندەو داهاتووی کاری تەکنیکی و ئینتەرنێتی، چونکە لەو باوەڕەدایە کە سەردەمی ئاییندە سەردەمی مرۆڤی تاکە، ئەو سەردەمەیە کە مرۆڤ تێیدا خاوەنی تایبەتمەندی تەکنیکی خۆیەتی، بۆیە دەستی کردووە بە پرۆژەی بەرهەم هێنانی کۆمپیوتەری تاکە کەسی و بچووک بەشێوەیەک مرۆڤ دەتوانێت لەناو فڕۆکەو شەمەندەفەرو کاتی گەڕان و هاتوچوویدا بەکاری بێنێت، ئەوەی ڕاستی ئەو بۆچوونەی ئەنتڵ-یشی سەلماند ئەو پێشوازییە گەورەیە لەم جۆرە ئامێرانە، بەتایبەتیش ئەگەر ئەوەمان زانی کە جیاوازی نرخیان، واتا هەرزانی کۆمپیوتەری بچووک یارمەتیدەری سەرکەوتنی پرۆژەکە بوون، بۆیە تەنیا لە ساڵی (٢٠٠٠)دا نزیکەی (٣٠)ملیۆن کۆمپیوتەری بچووکی فرۆشتووە. ئەو شێوە تازەیەی کۆمپیوتەری ئینتەرنێتی بوار بە مرۆڤ دەدات زۆر بە سانایی بتوانێت پێوەندی بەتۆڕی گشتی ئینتەرنێتی جیهانی بکات، بگرە ئەو ئامێرە تازەیە توانای خەزن کردنی وزەیەکی زۆری هەیە بەشێوەیەک دەتوانرێت بۆ ماوەیەکی زۆریش بەبێ شەحن کردنەوە بەکار بهێنرێت، جگە لەوەی ئەوەندە هەستیارە دەتوانێت زۆر بە سانایی بچێتە نێو هەموو تۆڕەکانی پێوەندی.

## ئەفسانەی دەربەندی سلیکۆن

دەربەندی سلیکۆن دەکەوێتە ویلایەتی کالیفۆرنیا، درێژییەکەی (٤٠) کیلۆمەترەو پانییەکەشی (١٥) کیلۆمەترە، لەوێدا سەرجەم پێداویستییە گرنگەکانی تەکنیکی ئەلیکترۆنی و کۆمپیوتەرو پەڕەی سلیکۆنی تەنک، بەرهەم دەهێنرێت، بۆیە ڕۆژنامەکانی ئەمریکا بە دڵی پڕ لە ژیانی سەدەی بیست و یەک ناوی دەبەن، ناوچەیەکی پیشەسازی زۆر گرنگە، دەشێت لە داهاتوودا کۆنترۆڵی بازاڕی ئینتەرنێتی جیهانی بکات و ڕۆڵێکی گەورە لە بەرەو پێش بردنی پیشەسازی ئینتەرنێتدا بگێڕێت، بەتایبەتیش نرخی تێچوون و بەرهەم هێنان بە بەراورد لەگەڵ بازاڕەکانی تری نێو دەوڵەتان زۆر هەرزانتر دەوەستێت، ئەو سیستەمە ئەلیکترۆنی و ئینتەرنێتییە پێشکەوتووەی کە لەوێشدا پیادە دەکرێت زیاتر پشت بە تەکنەلۆژیای تازەی ئینتەرنێتی دەبەستێت، هەر بۆیەش پارەی کەمتر لە دەستی کار خەرج دەکرێت، ئەوەش واتا دابەزینی کۆی گشتی تێچوون. بەرهەم هێنانی پەڕەی سلیکۆنی تەنک بازدانێکی گەورە بوو لە بواری تەکنەلۆژیای پێوەندی و ئینتەرنێتدا، چونکە لەلایەک بووە هۆی ئەوەی قەبارەی کۆمپیوتەرەکان بچووکتر ببێتەوەو لەلایەکی تریشەوە توانای کارکردنیان زیاتر بێت، بەشێوەیەک دەیان جار باشترو وردتر کارەکان ئەنجام بدەن..❖

### سەرچاوە


......

(١) الشرق الأوسط، العدد ٧٧٩١، سنة ٢٠٠٠.

(٢) المنار، العدد الثامن، السنة الأولى ١٩٨٥.

# چوار بەڵگەنامە لە بارەی سەرەتاکانی پێوەندی نێوان کوردو عوسمانییەکان



د. زرار سدیق تۆفیق
کۆلیجی ئاداب/ زانکۆی دهۆک

ئەم بەڵگەنامانەی وا لێرە بلاودەکرێنەوە، بریتین لە بەشێک لە کۆمەڵێک لە نامەو بەرسڤنامە کە لەنێوان سوڵتانەکانی عوسمانی و میران و سەرداران و سەرۆک هۆزەکانی کورد ئالوگۆڕ کراون.

گرنگیی ئەم بەڵگەنامانە کە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی دەیەمی کۆچی/ شازدەیەمی زایینی لەوەدایە کە تیشک دەخەنە سەر سەرەتاکانی پێوەندیی نێوان کوردو عوسمانییەکان وهەوڵدانی بە بەرنامەی خان و سوڵتانەکانی ئالی عوسمان لە پێناوی ڕاکێشانی کورد بەلای خۆیانداو سوود وەرگرتن لە هێزی سەربازیی میرو ئاغاو بەگ و خان و سەرۆک هۆزەکانی کوردستان و خستنەگەڕی هێزو توانایان بە مەبەستی ڕێخۆشکردن و ئاسانکردنی ئەنجامدانی سیاسەتی «ڕووکردنە ڕۆژهەلات- التوجە نحو الشرق» کە عوسمانییەکان لە کۆتایی سەدەی پازدەیەمەوە هەوڵی جێبەجێکردنیان دەدا(١).

**- بەڵگەنامەی یەکەم:**

نامەی بایەزید خانی دووەم (١٤٨١-١٥١٢ز) بۆ حاجی ڕۆستەمی کورد.

مێژوو: ڕەبیعی یەکەم(ربیع الأول) ٩٠٨ کۆچی/ ئەیلوول ١٥٠٢ز (بە زمانی فارسی).

حاجی ڕۆستەم کێیە؟.

لەنێو میرە کوردەکانی هاوچەرخی بایەزیدی دووەمدا دووانیان ناویان ڕۆستەمە:

١- ڕۆستەم بەگی کوڕی زۆراب بەگی ملکێشی ناسراو بە حاجی ڕۆستەم فەرمانڕەوای میرنشینی چەمشکزاک لە ماوەی (پێش ١٤٧٣-١٥١٤ز).

٢- شاە ڕۆستەمی کوڕی شاە حوسێن لوڕستان (١٤٦٨- پاش١٥٠٢ز) (سەبارەت بەم دوو میرە بڕوانە، شەرەفنامە، چاپی عەرەبی (بەغدا ١٩٥٣) ل (٢٦٨،١٨٦-١٨٧)

لە نامەکەدا ناوی ئەم میرە کوردە بە (حاجی روستم بیک) هاتووە، واتە بە ناوەکە زیاتر لەوە دەچێت حاجی ڕۆستەمی چەمشکزاک بێت، بەلام ئەم هەر لەسەردەمی محەمەد خانی عوسمانییەوە (محمد الفاتح) (١٤٥١-١٤٨١ز) نەیاری عوسمانییەکان بوو و بووە ئەگەری ئەوەی محەمەد خان نەتوانێ لە ساڵی (١٤٧٣ز) دەست بەسەر قەلای (کەماخ)دا بگرێت، بەپێچەوانەوە هەر لە دەستپێکەوە پێوەندی و نێوانی لەگەڵ شاە ئیسماعیلی سەفەوی (١٥٠٢-١٥٢٤ز) خۆش بوو، کاتێک شاە ئیسماعیل سەرکردەیەکی قزلباشی ناردە سەر دەڤەری چەمشکزاک، حاجی ڕۆستەم بێ شەڕو بەرگری، هەموو شارۆچکەو قەلاو ناوچەکانی ژێر دەستی تەسلیمی قزلباشەکان کرد و دانی بە دەسەلاتی شا ناو ملکەچی خۆی بۆ ڕاگەیاند.

پاش شەڕی چاڵدێران (١٥١٤ز) و سەرکەوتنی سوڵتان سەلیمی عوسمانی (١٥١٢ - ١٥٢٠ز)، حاجی ڕۆستەم بە یاوەریی کوڕەزایەکی و چل لە سەردارو پیاو ماقوولانی هۆزی ملکیشی چووە خزمەتی سوڵتان کە لە شوێنێکی سەر بە شاری مەرەند لە باکووری

دەریاچەی ورمێ مۆڵی بە سوپاکەی دابوو، لەوێ پابەندی و گوێڕایەڵیی خۆی بۆ سوڵتان دەربڕی، کەچی دارو دەستەی سوڵتان قینی کۆنیان بەرامبەر حاجی ڕۆستەم لەدڵدا بوو، هەڵسوکەوت و کردەوەی حاجی ڕۆستەم کە لە ساڵی (١٤٧٣ز) بەرامبەر محەمەد خان نواندبووی، هێنایە گۆڕێ و سوڵتانیان لێ ئاگادار کردەوە، سوڵتانیش بڕیاری دا لە ملی هەموویان بدرێت (شەرەفنامە، ل ١٨٦-١٨٧).

بۆیە دەتوانین بڵێین نامەکە ئاراستەی شاە ڕۆستەمی لوڕستان کراوە نەک حاجی ڕۆستەمی چەمشکزاک، سەرەڕای ئەوەی کە:

(١) لە وەڵامنامەکەیدا بۆ بایەزیدخان (بەڵگەنامەی دووەم) حاجی ڕۆستەم باسی وڵاتی عیراقی عەجەم (ڕۆژئاوای ئێران) و عیراقی عەرەب(عیراق)ی کردووە، دەڵێت ئێستا ڕوویانکردۆتە (واتە قزڵباشەکان) دیاربەکرو مەرعەش، ئێران لە بێدادییان پەرێشانە، لوڕستانیش هەرێمێکە لە هەرێمەکانی ئێران.

(٢) دوای شەڕی چاڵدێران، سوڵتان سەلیم یەکسەر نامەیەکی تری ئاراستەی شاە ڕۆستەمی لوڕستان کردووە تێیدا سوپاسێکی گەرمی کردووە بۆ ئەو هاوکاریکردنەی لەشەڕی چاڵدێراندا.

لە نامەکەیدا بایەزید خان پاش پێداهەڵدان و ستایشێکی زۆرو سڵاوێکی گەرم لە حاجی ڕۆستەم دەپرسێت ئەنجامی ناکۆکی و پێکدادانی قزڵباشەکان بە سەرکردایەتی شاە ئیسماعیلی سەفەوی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی بایەندەری -تورکمانی ئاق قۆینلو(١٤٠٣-١٥٠٨ز) بە چی گەیشتووە؟ داوای لێدەکات کە «هەواڵی ڕاستەقینە»و دوا دەنگوباسی جموجوڵی قزڵباشەکانی بۆ کۆبکاتەوەو بە

امیر معظم کبیر مفخم ذوی القدر الأتم والمجد الأشم ملکی الصفات فلکی الذات حارس محاسن الشیم صاحب الطبل والعلم، المختص بعنایة باری النسم واجر حاجی رستم بیك مکرم دامت معالیه سلام عاطفت پیام که از عنایت شاهی فایض گردد مطالعه فرمایند و بدانند که مدت مدید که خصومت جماعت قزلباش به ارباب دولت بایندریه به چه انجامید. علی ما هو الواقع معلوم نواب کامیاب ذوی الاقتدار و معروض عتبهٔ علیهٔ فلك مقدار و حضرت بزرگوار ما نشد. حالیا برای استعلام احوال دارندهٔ کتاب مستطاب قدوة الأقران کیوان چاوش بدان طرف فرستاده شد و اولکای جای شما متصل آن نواحی است و بحقیقت حال تمام معلوم شماست. چون دارندهٔ مکتوب شریف به شرف ملاقات مشرف گردد از اخبار صادقه و وقایع آن جانب هر چه پیش شما تحقیق پذیرفته استً بـه مشارالیه انهاء نواب کامیاب دارید و این معنی را سبب عنایت شاهانهٔ ما دانید و هر چه معلوم نموده باشند اصلا کم نکرده شیمهٔ صداقتً را به ظهور آورید.
تحریراً فی اول الربیعین سنة ثمانً و تسعمایه.

بەڵگەنامەی یەکەم

نێردەکە یا (کەیوان چاوش) کە بۆ ئەم مەبەستە ناردوویەتی، بۆی ڕەوانە بکات.

**دەقی نامەکە:**

«أمیر معظم کبیر مفخم ذوي القـدر الأتم والمجـد والاشم، ملکي الصفـات فلکي الذات حارس محاسن الشـيم صـاحب الطبل و المعلم،، المختص بعناية باري النسم و أجـر حـاجي رسـتم بيك مكرم دامت معاليه سلام عاطفت پيام كه أز عنايت شاهي فـايض گـردد مطالعـه فـرمـايند وبدانند كه مدت مديد كه خصومت جماعت قزلباش به أرباب دولت بايندر بـه چه أنجاميد. على ما هو الواقع معلوم نواب كامياب ذوى الاقتدار معروض عتبه عليه فلك مقدار وحضرت بزرگوار مانشد. حالياً براي إستعلام أحـوال دارنده كـتـاب مـستطاب قـدوة الأقـران كـيـوان چاوش بدان طرف فرستاده شد و أو لكاي جاي شما متصل آن نواحي أست و بحقيـقت حال تمام معلوم شـمـاست. چون دارندهء مكتـوب شـريف بـه شـرف مـلاقـات مـشـرف گـردد آز أخـبـار صـادقـه وقـايع آن جـانب هرچه پيش شـمـا تحـقـيق پذيرفتـه أست به مـشـار إليـه أنهـاء نواب كـاميـاب داريد وأين معنى را سبب عنايت شاهانه ما دانيـد و هرچه مـعلوم نموده باشند أصـلا كم نكرده شيمهء صداقت را به ظهور آوريد.

تحـريراً في أول الربيـعين سنة ثمان و تسعمايه»

- بەڵگەنامەی دووەم:

وەڵامنامەی حاجی ڕۆستەم

لەوەڵامنامەکەیدا حاجی ڕۆستەم نێردەی بایەزیدخان بە «عمدة الأماثل والأقران» ناو دەبات و گەیشتنی بە «نیشتنەوەی باڵندەی لوتکەی دەوڵەت و کۆتری بورجی کامەرانی» دەچوێنێ و بایەزید خان ئاگادار دەکاتەوە کە قزڵباشەکان لەگەڵ ئەڵوەندخان - واتە ئەڵوەندی کوڕی یووسفی کوڕی ئوزون حەسەن (حەسەنە درێژ)- شەڕیان کردووەو پاشان ڕوویانکردۆتە عیراقی عەجەم (ڕۆژئاوای ئێران) و مورادخانییان شکاندووە -مورادی کوڕی یەعقووب بەگی کوڕی ئوزون حەسەن-، لە عیراقی عەرەبەوە ڕوویانکردۆتە دیاربەکرو مەرعەش و پێوەندییان بە دەوڵەتی میسرەوە کردووە، گوایە باری وڵاتی ئێران لە سۆنگەی ئەم شەڕانەوە ئاڵۆزو پەرێشان بووە، زۆربەی هەرێم و ناوچەکان بە ئەگەری ستەم و بێدادی و زۆرداری دەسەڵاتدارانی قزڵباشەکانەوە وێران بووە.

هەروەها حاجی ڕۆستەم لە وەڵامەکەیدا، ئومێدەوارە بایەزیدخان بە پشتیوانیی خواو بەگورزو شمشێری موسڵمانانەوە بتوانێ قزڵباشە گومڕاکان لەناو ببات و لە ڕەگەوە هەڵیان بکێشێ.

**دەقی وەڵامنامەکە: (بە فارسی)**

« بر رای عـالم آرای

گماشتگان درگاه گیتی پناه أعلی الله شأن صاحبه معروض می گردد که فرمان قضا جریان نفذه الله الملک المنان باعمدة الأماثل والأقران کیوان چاوش زید قدره چون طائر أوج دولت و حمامهء برج سعادت شرف نزول یافت و أز ورود مسعودش قدر و منزلت أفزوده به رسم شکر گزاری گفت:

بیت:

**آفتاب أزخاک بر دارد به لطف أز دره‌را**

**هیچ نقصانی نباشد جز کمال أز آفتاب**

و الحمدلله هدانا لهذا وآنچـه از إستفسار أحوال قزلباش مذهب خراش لعنهم الله و دمرهم تنبیه فرموده بودند، قصهء آن طائفه باغیهء حالا بر إین منوال أست که به الوندخا گزند رسانیده و أز آن جا به عراق عجم رفته، مرادخان را منهزم ومنکسر ساخته ودر عراق عرب کار پرناکیان راپرداخته باچرا کسهء مصر مصالحه و اتحاد نموده و حالا عزیمت دیاربکرو مرعش داشته، أحوال ایران أز بیداد إیشان پریشان و أکثر بلاد و نواحی أز ظلم و حیفشان ویران گشته، أمید أز فضل یزدان أست که قلع و قمع گروه باغیان به‌گرز و سنان غازیان و تیغ خون فشان مجاهدین خداوندگار اسلامیان و شهنشاه زمان میسر و مقدر گردد ان شاء الله تعالی، باقی فرمان برأو عالی مفوض أست»

**- بەڵگەنامەی سێیەم:**

فەتح نامەی چاڵدێران

لە سوڵتان سەلیمەوە بۆ میرو فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارانی کوردستان و سەرجەم ڕۆژهەڵات

مێژوو: سەرەتای مانگی ڕەجەب ٩٢٠ک/ئاب ١٥١٤ز (بە زمانی تورکی عوسمانی)

وەک ئاشکرایە میروخاوەن قەڵاو سەردار و سەرۆک هۆزو بەگەکانی کوردستانی باکوور هاوکارییەکی زۆری سوڵتان سەلیمی عوسمانییان کرد لە شەڕی چاڵدێراندا، ڕۆڵێکی کاریگەریان گێڕا لە سەرکەوتنی سوڵتان بەسەر شاه ئیسماعیلی سەفەویدا.

پاش تەواو بوونی شەڕ لەبەرژەوندیی عوسمانییەکان، سوڵتان سەلیم بە مەبەستی ڕاگەیاندنی هەواڵی سەرکەوتن و دەربڕینی سوپاس و پێزانینی خۆی بۆ هەموو ئەو فەرمانڕەوا و دەسەڵاتدارانەی وا پشتیوانییان لێکردو بە هێزی سەربازییەوە بەشداری شەڕیان کرد، ئەم نامەیەی ئاراستەکردن:

«مفخار الامراء الکرام و اعاظم الکبراء الفخام المختصون بعواطف الله الملک العلام دیار شرق بگلری دام آقبالهم و ختم بالخیر آمالهم و سایرامراء اکراد و عشایر و قبایل سردار لری اولان مبارزان پاک نهاد ، ملکر وایل کتخدالری و آیش آرلری آصلح الله شأنهم توقیع رفیع همایون و آصل آولیجق معلوم آوله هر بریکزه که اشبو مبارک رجب المرجبک ایکنجی گونی یوم الاربعا ضحوه کبری سنده آردبیل او غلی دین اسماعیل بی دین ومفسد بد آیین مقابله إیتدکی کبی بعنایه

جواب

بر رای عالم آرای گماشتگان درگاه گیتی پناه اعلی‌الله شان صاحبه معروض می‌گردد که فرمان قضا جریان نفذه الله الملک المنان با عمدة الأماثل و الأقران کیوان چاوش زید قدره چون طائر اوج دولت و حمامة برج سعادت شرف نزول یافت و از ورود مسعودش قدر و منزلت افزوده به رسم شکرگزاری گفت : بیت

آفتاب از خاک بر دارد به لطف از دره را

هیچ نقصانی نباشد جز کمال از آفتاب

و الحمدلله الذی هدانا لهذا

و آنچه از استفسار احوال قزلباش مذهب خراش لعنهم الله ودمرهم تنبیه فرموده بودند ، قصة آن طایفة باغیه حالا بر این منوال است که به الوند خان گزند رسانیده و از آن جا به‌عراق عجم رفته مراد خان را منهزم و منکسر ساخته ودر عراق عرب کار پرناکیان را پرداخته باچراکسة مصر مصالحه و اتحاد نموده. و حالا عزیمت دیار بکر و مرعش داشته احوال ایران از بیداد ایشان پریشان واکثر بلاد ونواحی از ظلم وحیفشان ویران گشته ، امید از فضل یزدان است که قلع و قمع گروه باغیان به گرز و سنان غازیان و تیغ خون فشان مجاهدین خداوندگار اسلامیان و شهنشاه زمان میسر و مقدر گردد، انشاءالله تعالی . باقی فرمان بر امرعالی

بەڵگەنامەی دووەم

الله و توفیقه طرفة العین دەمنهزم و مغلوب ومنکسر ومنکوب اولوب فرار آختیار إتیدکده نەجانبه کتدیکی مـعلوم أو لمدیفی اجلدن سزلردن عقیدهء پاکله درگاه سعادت دستگاهمه أولان إخلاص و عبودیت ظهور نیک فرصتی فوت أولنما مغیچون بروجه عموم بوحکم جهان مطاع واجب الاتباعمی کوندروب بیورد مکه فرهم قلما جر یانم هرقنغیکزه وصول بولور سەصورت شریفک قراطیس متعددەیه یاز دیروب برریکزه أولا شدیروب سرخ سرمز بور نەجانبه واردیغک وداغینه نامرغوبی نه آیدوکین وبالفعل قنده لغن و صحت وسقامتن و قاچ یرده جراحتی أولدیغک و بود و نابود لغن علی التفصیل یا زوب اعلام إیلیه سز که انواع عنایت لریمه مستحق و سزاوار أوله سرشویله بیلەسز. تحریرا فی أوائل شهر الله الأصم رجب المرجب سنه عشرین و تسعمایه بیورت چالدران»

**- بەڵگەنامەی چوارەم:**

نامەی سوڵتان سەلیم بۆ شاه ڕۆستەمی لورستان

مێژوو: سەرەتای مانگی ڕەجەب ساڵی ٩٢٠ک/ئاب١٥١٤ز (بە زمانی فارسی)

وادیارە شاه ڕۆستەمی لورستان هاریکاییەکی زۆری لۆجیکی سوڵتان سەلیمی کردووە لە میانی کێشە و ململانێی سەفەوی - عوسمانیدا و زانیاری و دەنگوباسی لەسەر شاه ئیسماعیل و قزلباشەکان بە نامە بۆ ناردووە، چەند لە توانایدا بووە بەرهەڵستی قزڵباشەکانی کردووە، بۆیە دەبینین سوڵتان سەلیم دوای شەڕی چاڵدێران نامەیەکی تایبەتی بۆ ڕەوانە کردووەو سوپاسی خۆی پێ ڕاگەیاندووە، وەلێ تا ئێستا چۆنییەتی ئەم هاریکاریکردنە

روون نەبۆتەوەو، شەرەفنامەو سەرچاوە فارسییەکان ئاماژەیان بۆ نەکردووە.

سـولّتـان لە نامـەکـەیدا باس دەکـات، چۆن ڕووبەڕووی «پێشـەوای نەعلەت لێکراوان و سـەرلەشکری سـەربازەکـانی شـەیتـان ئیـسـمـاعـیلی بێ دین» بۆتەوەو شکاندوویەتی و سەربازەکانی دوای کەوتوون و ڕاویان ناوە.

**دەقی نامەکە:**

«جناب أمارت مآب أيالت نصاب دولت إنتساب سعادت اكتساب ملكى الجلال ملكى الخصال» المؤيد بتأييد الله الملك المتعال، أمير مكرم كبير مفخم ذو القدر الاتم و الفخر الأمم اشاه رستم بيک دامت معاليه به عواطف و مراحم پادشاهانه سمت اختصاص داشته بداند كه پيشواى ملاعين و سرلشكر جنود شياطين؛ إسماعيل بى دين، در روز چهار شنبه أولين ماه رجب المرجب،بعد از ضحوهء كبرى، عساكر نصرت مآثر مارا مقابل آمد، بسى كوششهاى بى فايده نمود. عاقبت نسيم فتح و فيروزى أزمهب سر عزيز الحق يعلوولا يعلى اعلام ظفر اعلام مارا طلاوهء خفوق و إهتزاز داد. أسماعيل مخذول از شمشير تيز لشكر ظفر رهبررو بەگريز نهاد، دليران لشكر در عقيش رفتند و علمهايش معكوس ومنكوس وسردارانش مقيد و محبوس پيش الويه نصرت كار خصم شكار در آوردند. أسيران همه هدف تبر و طعمة شمشير گرديدند.

الحمدالله كه اعداى دين و دولت مقهور و اولياى حضرت مبتهج و مسرور گشت، مقصود از رفع آن ملحد وقلع آن مفسد غير از اعلاء كلمة الله و تنظيم أمور جماهير ملک وملت چيزى ديگرنيست، عنايت و شفقت ما در بارهء رعايا كەودايع خالق برايا أند فوق الحد و العد أست. هرمـؤمن مـوحـدرا أهانت آن مخذول واجب أست ولازم. يا يد كه شمانيز ازسد طريق و منع زاد وعناد و قتل كسانش هرچه دروسع ومكنت داريد به ظهور آريد، أين خدمت پسنديده را موجب عنايات شاهى و مستوجب التفات پادشاهى دانيد. تحريراً في التأريخ المذكور» (٢)

### پەراوێزەکان

........

**(١) لە ژمـــــارە (٤) گۆڤـاری زاگـروس، کـانوونی یەکـەم ١٩٩٧ گـوتارێکـم بە عـەرەبی لەسـەر بەڵگەنامـەی یەکەم و دووەم بڵاوکردۆتەوەو دەقی هەردوو بەڵگەنامـەکـەم لەگـەڵ گـوتـارەکـەیا نـاردبوو، کـەچی بڵاونەکرانەوەو تەنیـا وێنەیان پیـشـاندراوە، بۆیە لێـــــرە دەقی ئـەو دوو بەڵگەنامەیە و بەڵگە نامەی سـێـیـەم و چوارەم پێکەوە بڵاودەکـەمـــەوە، چونکە تەواوکەری یەکـتـرین پێکەوە سوودیان زۆرتر دەبێت.**

**(٢) ســـــهـارەت بـەم بەڵگەنامانە بڕوانە:**

**- فـريدون بـک، مـجموعـه منشآت السلاطين «منشآت فــريدون بك» (استـانبـول ١٢٧٤ هـ/١٨٥٧م).**

**- عـبدالحسين نوائى، شاه إسماعيل صفوى، إسناد و مـكاتبـات تاريخى همـراه باياداشـتـهـاى تفـصـيلى (تهــران ١٣٤٧هـ.ش)، ل (٣١-٣٢،١٧٧،٢٢١).**

**فـەرەيدون بـەگ نووسـەری دەرباری سـولّـتـان سلێـمـان قانوونی (١٥٢٠-١٥٦٦ز) بـووەو لـە ســـــــاڵـی (٩٩١ک/١٥٨٣ز) کـۆچی دوایی کـــردووە، لە دووتوێی دوو بەرگی گـەورەدا، سـەدان نامـەی گـرنگ و بايەخداری عـەرەبی و فـارسی و تورکی کۆکردۆتەوە، هەندێکیان کەم تا زۆر پێوەندییان بە کوردەوە هەیە.**

مفاخر الامراء الكرام واعاظم الكبراء الفخام المختصون بعواطف الله الملك العلام ديار شرق بكثرى دام اقبالهم وختم بالخير آمالهم وساير امراء اكراد و عشاير و قبايل سردارلرى اولان مبارزان پاك نهاد و ملكلر وايل كتخدالرى وايش ارلرى اصلح الله شأنهم توقيع رفيع همايون واصل اولیجق معلوم اوله هر بريكزه كه اشبو مبارك رجب المرجبك ايكنجى گونى يوم الاربعا ضحوة كبرى سنده اردبيل اوغلى دين اسماعيل بى دين ومفسد بدآيين بنله مقابله ايتديكى كبى بعناية الله و توفيقه طرفة العين ده منهزم و مغلوب و منكسر و منكوب اولوب فرار اختيار ايتدكده نه جانبه كتديكى معلوم اولمديكى اجلدن سزلردن تعهد؛ پاكله درگاه سعادت دستگاهمه اولان اخلاص وعبوديت ظهورنيك فرصتى فوت اولنمامق جهتندن بروجه عموم بو حكم جهان مطاع واجب الاتباعى كوندروب بيوردمكه فرصتى گلدكجه جريانم هر قنغيكز دوصول بولورسه صورت شريفك فراطيس متعدده بەيازديروب بر بريكزه اولاشديروب سزلر سرمز بورنه جانبه وارديغك و داغينه تامر غوبى نه ايدوكين وبالفعل قنده لغى و صحت وسقامتن وقاچ برده جراحتى اولديغك و بودونابود لغن على التفصيل بازوب اعلام ايليه سز كه انواع عنايت لريمه مستحق وسزاوار اوله سز شويله بيله سز. تحريرا فى اوائل شهر الله الاصم رجب المرجب سنة عشرين وتسعمايه بيورت چالدران. *

* منشآت فريدون بك ج١ ص٣٩٠.

بەڵگەنامەی سێیەم

جناب امارت مآب ايالت نصاب دولت انتساب سعادت اكتساب ملكى الجلال ملكى الخصال، المؤيد بتأييد الله الملك المتعال، امير مكرم كبير مفخم ذوالقدر الاتم و الفخر الامم، شاه رستم بيك دامت معاليه به عواطف ومراحم پادشاهانه سمت اختصاص داشته بداند كه پيشواى ملاعين وسرلشكر جنود شياطين، اسماعيل بى دين، در روز چهارشنبه اولين ماه رجب المرجب بعد از ضحوة كبرى عساكر نصرت مآثر مارا مقابل آمد. بسى كوششهاى بى فايده نمود. عاقبت نسيم فتح و فيروزى از مهب سر عزيز الحق يعلو ولايعلى اعلام ظفر اعلام مارا طلاوة خفوق واهتزاز داد. اسماعيل مخذول از شمشير تيز لشكر ظفر رهبر رو بەگريز نهاد. دليران لشكر در عقبش رفتند و علمهايش معكوس ومنكوس وسردارانش مقيد و محبوس پيش الويۀ نصرت كار خصم شكار در آوردند. اسيران همه هدف تير وطعمۀ شمشير گرديدند.

الحمدالله كه اعداى دين و دولت مقهور و اولياى حضرت مبتهج و مسرور گشت. مقصود از رفع آن ملحد وقلع آن مفسد غير از اعلاء كلمة الله و تنظيم امور جماهير ملك وملت چيزى ديگر نيست. عنايت وشفقت ما در بارۀ رعايا كه ودايع خالق براياأند فوق الحد والعد است. هر مؤمن و

بەڵگەنامەی چوارەم

# لانک و لای لایەی کوردەواری لە تەرازووی دەروونزانیدا

زەینۆ شێخانی

هەموو گەلێکی سەر ڕووی ئەم زەمینە، کۆمەڵێک دابونەریتی تایبەت بەخۆی هەیەو شانازی پێوە دەکات، مەرجیش نییە هەموو دابونەریتەکان ڕاست بن، لەوانەیە هەندێک لەم دابونەریتانە هەڵە بن. گەلی کوردیش وەکو هەموو گەلانی جیهان کۆمەڵێک دابونەریتی تایبەت بەخۆی هەیە کە لە گەلانی تری جیهانی جیای دەکاتەوە، لەوانەیە زیاتر لە گەلانی تر شانازی بەم دابونەریتانە بکات، چونکە هەردەم لەگەڵ بارودۆخی سیاسی بۆ دروست کردنی قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ لە ململانێ دابوو، بەڵام نەیتوانیوە ئەم ئامانجە بەدی بهێنێت، جا بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەم بۆشاییە بکاتەوە زیاتر لە میللەتانی سەربەخۆ زمان و دابونەریتی خۆی پاراستووە، چەندین جار ڕۆڵەکانی تووشی ناخۆشی و گیروگرفت بوونە بەهۆی سووربوونیان لەسەر پاراستنی دابونەریتەکانیان.

لانک و لای لایەی کوردەواری دوو دابونەریتی زۆر کۆنن، نەوەیەک بۆ نەوەیەکی تری گواستۆتەوەو پاراستوویەتی، لەوانەیە هەندێک لە گەلان بەشێک لەم دابونەریتەیان هەبێت، بەڵام لە ناو گەلی کورد زۆر بە زەقی و زیاتر لە گەلانی تر دەردەکەوێت. پێش ئەوەی ئەم دوو دابونەریتە بهاوێینە نێو تەرازووی دەروونزانیدا حەز دەکەم کورتە باسێکیان بکەم.

لانک بریتییە لە کەژاوەیەکی جوان و ڕازاوە، وەک سیسەمێکی بچووک لە دار دروست کراو، لەهەردوو لای سەرووخوارووی لانک دوو چەماوەی هەیە بە کەوارەی لانک ناو دەبرێت، ئەو دارەی هەردوو چەماوەکە بەیەکەوە دەبەستێتەوە پێی دەوترێت سەردەرەی لانک، دەسترازەیەک ، بەتەنیشتی لانکەکەوە بەستراوەو بە دەستبێنک بە سەردەرەی لانکەکە گەیاندراوە، بۆ پێچانی دەست و پێی منداڵ. چەندین مۆرو مەرجان و پۆلی بەرامبەر ڕووی منداڵەکە بە سەردەرەی لانک هەڵواسراوە. هەروەها بلوریان قامیش بۆ هاتنە دەرەوەی میز بەکار دێت، کە سەرێکی لە ناو لاقی منداڵەکەیەو سەرەکەی تری لە دەرەوە چۆتە ناو قوتوویەک یان بتڵێک .... تاد. سەر لانێکی لە کوڵلە یان قوماش دروست کراو لە هاوین و لە زستاندا بەسەر لانکەکە دادەدرێت.

لای لایە بریتییە لەم دەنگ و ئاوازو گۆرانییەی کە دایک لە کاتی خەواندنی بۆ منداڵەکەی دەیڵێت. لەوانەیە ئەم دەنگ و ئاوازو گۆرانییە لە فۆلکلۆرەوە وەرگیرابێت یان دایکەکە خۆی دایرشتبێت بۆ دەربڕینی سۆزو خۆشەویستی بەرامبەر بە منداڵەکەی یان لای لایەکە بریتییە لە دەربڕینی ناخۆشی و غەم و پەژارەی خودی دایکەکە.

با بگەڕێینەوە بۆ لانک و تەرازووی دەروونزانی. بوونی لانک لە ناو هەر خێزانێک مانای خۆشی و شادی دەگەیەنێت ئەگەر

خێزانەکە بارودۆخی تەواو بێت، ئەگەر بارودۆخیان تەواو نەبوو، ئەوا لانک هۆکارێکە بۆ ئارامگرتن و حەسانەوەی دەروونی.

هەروەها بەهۆی ڕێکخستنی لانک دایکەکە هەست بە خۆشی و حەسانەوە دەکات، بەڵام لانک بۆ منداڵ مانایەکی قووڵترو فرەوانتر دەگەیەنێت، چونکە شوێنی حەوانەوەیەتی و زۆر لە پێداویستی و پاڵنەرەکانی تێر دەکات و هەندێک جار وەک چارەسەریش بۆ نەهێشتنی هەندێک ڕەفتاری نامۆ بەکار دێت.

گرنگترین ئەو کردارانەی کە دایک لە کاتی منداڵ هاوێشتنە ناو لانک ئەنجامی دەدات ئەمانەن:

١- پێچانی دەست و پێی منداڵ بەهۆی دەستڕازە. منداڵ کە بەرز دەکرێتەوە هەست بە ترسان دەکات، بۆیە خۆی بە جلوبەرگی ئەو کەسە دەگرێت کە بەرزی دەکاتەوە، ئەمە پێی دەگوترێت ترسان لە کەوتن، منداڵ کە دەهاوێشترێتە ناو لانک هەست دەکات شوێنەکەی بەرزترە لە زەوی، بەڵام هەست بەم ترسە ناکات، چونکە دەپێچرێت. بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم ڕاستییە، لە تاقیگەی دەروونزانی لە زانکۆی ئەلموستەنسەرییەدا لە بەرچاوی نووسەری بابەت و بە سەرپەرشتی مامۆستای وانەی دەروونزانی، ئەزموونی قوتابییەکی دایک تاقی کردنەوەیەکی بەهۆی منداڵەکەی ئەنجام دا، دەقی تاقی کردنەوەکە بەم شێوەیە بوو: دانانی دوو مێز بەرامبەر یەکتر کە نزیکەی مەترێک لە یەکەوە دوور بوون و سەری مێزەکان وەک کاشییەکانی ناو تاقیگەکە نەخشێندرا بوو، دانانی جامێک لەسەر هەردوو مێزەکە کە هەردوو ڕووەکەی بەتەواوی داپۆشتبوو لەپاشان بەرەڵلاکردنی منداڵەکە (کە تەمەنی لە ساڵێک) کەمتر بوو لەلایەکی مێزەکەو وەستانی دایکەکە لە لاکەی ترو بانگکردنی منداڵەکەی. لەم تاقی کردنەوەیەدا بینرا، منداڵەکە بە گاگۆڵە دەهات تا دەگەیشتە سەر لێوی مێزەکەو دەوەستا، هەرچەندە دایکی بانگی دەکردو مێزەکەش جامی لەسەر بوو، بەڵام منداڵەکە بەرەو پێش نەدەهات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە منداڵ هەست بە بەرزایی و قووڵی دەکات و لە کەوتنیش دەترسێت، بەڵام پێچانی منداڵ لە ناو لانک، ئەم ترسە ناهێڵێت، هەر بۆیەش چەندین جار سەری خۆی دەهێنێتە خوارەوەو لە کەوتن ناترسێت.

هەروەها پێچان و بەستنەوەی دەست و پێی منداڵ لەناو لانک وەک چارەسەریش بەکاردێت بۆ مژینی لە ڕادەبەدەری پەنجە. پەنجەمژین دیاردەیەکە لای هەموو منداڵێک هەیە، چونکە منداڵ لە قۆناغی دەمی هەموو شتێک بە دەم تاقی دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر منداڵ لەم قۆناغەدا دەرفەتی پێ نەدرا پێداویستی مژین تێر بکات، ئەوا پەنا دەباتە بەر مژینی پەنجەی خۆی بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر کەوا لە دایک و باوکان دەکات دڵەڕاوکێ بیانگرێ سەبارەت بە منداڵەکانیان، بۆیە بە دوای چارەسەر دەگەڕێن و یەکێک لە چارەسەرەکان درێژکردنی منداڵە لەسەر سنگ بۆ ماوەیەکی درێژ بۆ ئەوەی نەتوانێت پەنجەی خۆی بمژێت و پێچان و بەستنەوەی منداڵ لە ناو لانک هەمان ئامانج بەدی دەهێنێت، چونکە ناتوانێت پەنجەی خۆی بمژێت.

٢- بەکارهێنانی بلور یان قامیش بۆ ئەوەی میز لەژێر خۆی نەکات و ژێری بە بەردەوامی تەڕ نەبێت، چونکە ئەگەر منداڵ بە بەردەوامی ژێری تەڕ بوو، ئەوا میزکردنی بێ ویستی خۆی لای دەبێتە شتێکی ئاسایی، بەڵام بەکارهێنانی قامیش بۆ دەرهێنانی میز لەژێر منداڵ وای لێ دەکات بە ئاسانی و زووتر کۆنترۆڵی میزکردن بکات.

٣- هەژاندنی منداڵ لە ناو لانک وای لێ دەکات زووتر بخەوێت. خەویش یەکێکە لە پێداویستییە سەرەکییەکانی منداڵ. خەوتن وەک خواردن پێویستەو دەبێ بە هەوەستی منداڵ بێت، نەک دانانی خشتەیەکی دیاری کراو بۆ خەوتن، بەڵام پێویستە لەسەر دایک و باوک دەرفەتی گونجاو بۆ منداڵەکانیان برەخسێنن بۆ تێرکردنی ئەم پێداویستییە، لانک و هەژاندنیش هۆکارو دەرفەتی گونجاون بۆ خەوتن.

٤- ئەو مۆرو مەرجان و پۆلیانەی کە بە سەردەرەی لانک هەڵدەواسرێن، پێداویستییەکی گرنگی منداڵ تێر دەکات، ئەویش یارییە.

یاریش یەکێکە لە مافەکانی منداڵ کە نابێت لێی بێ بەش بکرێت و پاڵنەری یاری لە هەموو قۆناغەکانی تەمەنی مرۆڤ هەیە، بەڵام لە هەر قۆناغێک بەشێوەیەک دەردەکەوێت.

یاری کردارێکی زیندووەو ئامانجی ئامادەکردنی منداڵە بۆ ژیانی گەوران، هەروەها ڕاهێنان و پەرەپێدانی کارەکانی جەستەیی و ئەقڵی و هەڵچوونی و کۆمەڵایەتی ئامانجی گرنگی یاری کردنن، یارمەتی

ســـــووککردنی دڵەڕاوکێ دەدات و وەک شێوازێک بۆ فێرکردن و دیاری کردن و ڕێنمـــــایی کـــــردن و چارەسەرکردن بەکاردێت.

ئەو شتـانەی کـە لەناو کـــــوردەواری بـە لانـک هەڵدەواسرێن دەتوانین بڵێین بەشێک لەم پێداویستییە گرنگە تێر دەکات.

٥- لای لایەو هەژاندن، وتنـی لای لایـە لـە لایـەن دایک کـاریگەری دەروونی باشی هەیە بۆ سەر دەروونی دایکەکـە، چونکە ئەم لای لایەیە بە تایبـەتی ئەگـەر بریتـی بێت لـە دەربـڕینـی ناخی دایکەکـە وەک بەتاڵ کـەرێکی هەڵچـوونەکـان وایە، دەبێــــتــــە هۆی ڕزگـــــاربـوون لـە ئـازارە دەروونییـــەکـــان. ئەمـە بەگـوێرەی دایک، بەڵام بۆ منداڵ کـاریگەری باشـتری دەبێت.

کـە دایک منداڵەکـەی دەهەژێنێت و لای لایەی بۆ دەڵێت و دەنگە بەسۆزەکەی لەگەڵ زرەی مۆرو و مەرجان و پۆلی تێکەل بە یەکـتـر دەبن، خۆشترین مۆسیقایە بۆ منداڵ، چونکە ئەگـەرچی منداڵ لە مـانای وشـەکـان ناگـــات، بـەڵام هەست بە خۆشییـەکی زۆر دەکات کە گـوێی لەم دەنگە دەبێت، ئـــەم دەنـــگـــەش وەک بزوێنەرێک وایە بۆ منداڵ، بۆیە بۆ دەربڕینی ئەم خۆشییە وەڵامی دایکی دەداتەوە بە (م م م م م ...) تاکو دەخەوێت، بۆ دەرخستنی ئەم ڕاستییە چەندین تاقی کـردنەوە ئەنجـام دراوە، یەکـێـک لەم تاقی کردنەوانە لەلایەن بترفیلد لەسەر کـۆمەڵێک منداڵی تازە لەدایک بوو (پاش ٢٤ کاتژمێر لە لەدایک بوونیان) ئەنجام دراوە، بەهۆی بەســتنەوەی ڕیکۆردەرێکی ئەلکتـــرۆنی بەمـەمـەی منداڵەکـان، بەشێـوەیەک ڕیکۆردەرەکە دەست بە لێدانی مۆسیقا دەکات ئەگەر منداڵەکان مەمەکانیان بمژن، دەرکەوت منداڵەکان بە ڕادەیەکی زۆر مەمەکانیان دەمژی بۆ بیستنی مـۆسیـقـا، ئەمـەش ئەوە دەگـەیەنێ کـە منداڵ لە تەمـەنێکی زۆر بچـووک حەز بە بیسـتنی دەنگ دەکـات و خۆشی لێ وەردەگرێت و منداڵ دوای ئەوەی دەنگی دایکی دەناسێتـەوە حەز بە بیستنی دەکات، چونکە ئەمە مـانای نزیک بوونی دایکیـــــــەتی لێی، ئەم نزیک بوونەش حەسانەوەی دەروونی بە منداڵ دەبەخشێت.

پاش شی کـــردنەوەی هەردوو نەریتـــەکـــە لە ڕووی دەروونییەوە دەتوانین بڵێین دوو نەریتی ئیجابین و هۆکاری گـرنگن بۆ بەدی هێنانی تەندروسـتی دەروونی، چونکە تەندروستی بە شێـوەیەکی گـشـتی هەروەک ڕێکخـراوی تەندروستی جیهانی (who) پێناسەی دەکات (بریتییە لە بارێکی حەسانەوەی جەستەیی و دەروونی و کـۆمەڵایەتی نەک تەنیا نەبوونی نەخۆشی).

لانک ولای لایەی کـوردەواری ئەم حـەسـانەوە بەمنداڵ دەبەخشێت. لەوانەیە بەکارهێنانی لانک هەندێک لایەنی سلبی هەبێت، ئەمـەش بە زۆری بەهۆی پشتگوێ خستن و لەبیـرکـردنی دایکەکـە ڕوودەدات کـە منداڵەکـە تووشی ڕووداوی دڵتـــــەزێن دەکــــات، چونکە لە ناو لانـک بەستراوەتەوەو ناتوانێت بجووڵێت.. ❖

سەرچاوەکان

........

**١- د. موفق الحمداني، اللغة و علم النفس، الطبعة الاولى، دار الكتب، بغداد ١٩٨٢.**

**٢- د. حامد عبدالسلام زهران، الصحة النفسية والعلاج النفسي، الطبعة الثانية، عالم الكتب، القاهرة ١٩٧٧.**

**٣-دحام الكيال، الصحة النفسية والنمو، الطبعة الاولى، دار الكتب، بغداد ١٩٧٣.**

**٤- د. فؤاد حيدر، علم النفس الاجتماعي دراسات نظرية وتطبيقية، الطبعة الاولى، بيروت ١٩٩٤.**

**٥- احمد زكي صالح، علم النفس التربوي، الطبعة الاولى، مكتبة النهضة، القاهرة ١٩٧٢.**

# چۆپی

## stran، ئاکل (ریتم)، دیلان، سەماو و گۆڤەندا چۆپی «ب دار»



بەشیر بوتانی
(سوید)

### پەیڤا چۆپی

ئەڤ پەیڤ ب خـــوە کـــوردی یە، ژ «چۆپیێ» هاتبـــوو و ئەگـــەر بێت دابەشکرن، دیار دبە، کـــو ژ «چۆ» و «پێ» هاتبـــوو؛ چۆ ب خـــوە شـــڤـــە (دارکە)، وەسان ژێ رە چۆنگ ژی تێت گۆتن. ل سەر هندێ رە مە د کوردی دە پەیڤــا چۆگــان ژی هەیە، ئەو دارەکی سـەرخـوارە، یێ کـو ژ ئالیێ پیـران ڤـە تێت بکارئانین؛ (چۆنگێ شڤانی زەرە، شڤێ گاڤانی شکسـەتی یە. چۆگـانێ فاتێ دارگووزە).

چۆپی ب خوە دزمانێ کوردی دە ناڤێ ئاکلەکی (ریتمەکی)یە، یێ کو دبەر رە ژی چەند سـەمـا، دیلان و گـۆڤـەندێن چۆپی تێن کرن و ل گەل ستراندنا نەرم. ئێدی ئەگەر سەما، دیلان و گۆڤـەندێن چۆپێ بن، ژوان رە چۆپی تێت گـۆتن، و ئەگەر بێن جەنگێ بن، ژوان رە جەنگی تێت گـۆتن و تد. ئێـدی ژ مـە رە دیار بوو، کو چۆپی ئاکلە (ریتمـە)و هەم ژی سەمایەک، دیلانەک، یان گۆڤەندەک ب دارەو ل گـەل سـتـراندنێ. ژ زانینێ رە، سـتـراندن، سـەمـا، دیلان و گـۆڤـەندێن چۆپی تەنێ ب ریتـــمێ چـۆپی تێن پێـــشکێـــشکرن، وەســان جــارنا ب ریتـــــەکی دی، ئانکو ریتم تێت گـــوهارتن، ئەو ژی ل ســـەر بریارا سترانبێژی دمینە. ئەرەبێن کۆچەر یێن ئیـــراق، ســـووریا، لوبنان، ئوردن و فەلەستینێ ژی ڤی ریتمی بکارتینن و دبەر رە گـۆڤـەندێ دگـرن. لێ ئەرەب ب گـشـتی نەشـێن پەیڤـا چۆپێ ب لێڤ بکن، ژبەر کو ئەڤ چار پیتێن هە «چ، ۆ، پ، ێ» د ئەرەبی دە نینن، ژ لەو رە ب جـووبی تێت خـوەندن و تد....ئەڤ ژی چەند سترانێن چۆپی نە.

١- گرێ سیرا، یا ٨- پێ
٢- ئەسمەر، یا ٦ و ٨- پێ
٣- جەنگی، یا ٨- پێ
٤- رەقاس (هەژاندن)، یا ٦- پێ
٥- لێ لێ وەسێ، یا ٤- پێ
ویێن دی...

### چۆپیا ٤- پێ و ساناهی

وەک من شروڤە کر، کو چۆپی ریتمە، هەم ژی ســـەمـــاو گـــۆڤـــەندەکـــە ب ستراندنەکە نەرمە، و ژ زانینێ رە، کو سەما سەربەستەو پێگاڤێن گۆڤەندێ ل هەمی رۆژهلاتا ناڤین نە وەکـهـەڤـن، ئانکو ل هەر دەڤەرەکێ یان باژارەکی ب ئاوایەکی تێت پێـــشکێـــشکرن. ساناهیترین چۆپی ب خوە چارپێ یە:

١- گۆڤەندڤان لنگێ راستێ هلدگرن

و ل ئەردی ددەین.
٢- پشترە یێ چەپێ.
٣- چۆکێن خوە دشکینن.
٤- پشترە خوە ڕاست دکن.

**ئاکلێ (ریتمێ) چۆپی**

پیشانا ڤی ریتمی ب خوە ٢/٤ و ٤/٤ ە، لێدانا وی ژی وەسانە
دەستێ ڕاستێ (دوم دوم دوم)
دەستێ چەپێ (تەک)
دەستێ ڕاستێ (دوم)
دەستێ چەپێ (تەک تەک)
وجارنا ب ئاوایەکی تژی تێت لێدان
دەستێ ڕاستێ (دوم تەک دوم تەک دوم)
دەستێ چەپێ (تەک)
دەستێ ڕاستێ (دوم)
دەستێ چەپێ (تەک تەک تەک)

**چەند سترانێن چۆپی**

سترانبێژ و هونەرمەندێن کو ریتمێ چۆپی د چەند سترانێن خوە دە بکارئانی گەلەکن، وەک محەمەد ئارف جزیری، ئیسا بەرواری، شەمال سائیب، جەمال جەلال، تەحسین تەها، گولبەهارێ و یێن دی، ئەڤ ژی چەند سترانێن چۆپی نە.

١- ئەسمەر
هەلبەست و ئاواز: فۆلکلۆر
دەڤەر: بۆتان
هەوا: حیجاز
ئاکل (ریتم): چۆپی
مۆرک: ئەڤینی (پەستەیا لاوکان)
گۆڤەند: ئەسمەر
ژێدەرا موزیک و سترانێ: جانۆ، جاسم مشەختی و محەمەد یووسف بۆتانی

**ئەسمەر وەرە چۆپی یە**
**ل سەربانێ ڕەش و سپی یە**
**هۆی، وەرە هۆی، هۆی هۆی**
**یاری خوەشی و شاهی یە**

**ئەسمەر تە دگۆ وە ناکم**
**سۆزا خوە خرا ناکم**
**هۆی، وەرە هۆی، هۆی، هۆی**
**چ جارا تە ژبیر ناکم**

**ئەسمەر چاڤێن تە ڕەشن**
**وەک هەیڤ و ستێران گەشن**
**هۆی، وەرە هۆی، هۆی ، هۆی**
**ئاخفتنێن تە خوەشن**

**ئەسمەر کەمبەر زێرینێ**
**کەڤۆکا چاڤمەهینێ**
**هۆی، وەرە هۆی، هۆی، هۆی**
**جزیر خوەشە داپچینێ**

٢- گرێ سیرا
هەلبەست و ئاواز: فۆلکلۆر
دەڤەر: بۆتان
هەوا: بەیات کوردی
ئاکل (ریتم): چۆپی
مۆرک: دیلان
گۆڤەند: گرێ سیرا
ژێدەرا موزیکێ: جەمیل بەشیر
ژێدەرا سترانێ: مریەم خان و محەمەد ئارف جزیری

**گرێ سیرا ب نیسکە**
**لێ لێ، لێ لێ مەیرۆ**
**گر خۆیانێ ب نیسکە**
**تۆلجوانێ مەیرۆ**
**دوسوارا نیسک و نیسکە**
**لێ لێ، لێ لێ مەیرۆ**
**دوسوارا نیسک و نیسکە**
**تۆلجوانێ مەیرۆ**
**خوەستیێ مەیرۆ بلالیسکە**
**لێ لێ، لێ لێ مەیرۆ**
**خوەستیێ مەیرۆ بلالیسکە**
**تۆلجوانێ مەیرۆ**

**گرێ سیرا ب سیرە**
**لێ لێ، لێ لێ مەیرۆ**
**گرخۆیانی ب سیرە**
**تۆلجوانێ مەیرۆ**
**دوسوارا حیرو حیرە**
**لێ لێ، لێ لێ مەیرۆ**
**دوسوارا حیرو حیرە**
**تۆلجوانێ مەیرۆ**
**خوەستیێ مەیرۆ وەزیرە**
**لێ لێ، لێ لێ مەیرۆ**
**خوەستیێ مەیرۆ وەزیرە**
**تۆلجوانێ مەیرۆ**

**گرێ سیرا ب جەیە**
**لێ لێ، لێ لێ مەیرۆ**
**گرخۆیانێ ب جەیە**
**تۆلجوانێ مەیرۆ**
**دوسوارا هەی و هەیە**
**لێ لێ، لێ لێ مەیرۆ**
**دوسوارا هەی و هەیە**
**تۆلجوانێ مەیرۆ**
**خوەستیێ مەیرۆ فلەیە**
**لێ لێ، لێ لێ مەیرۆ**
**خوەستیێ مەیرۆ فلەیە**
**تۆلجوانێ مەیرۆ**

٣- کەڤۆکم
هەلبەست و ئاواز: حەسەن جزیری
هەوا: بەیات کوردی
ئاکل (ریتم): چۆپی
مۆرک: ئەڤینی (پەستەیا لاوکان)
گۆڤەند: کەڤۆک و ئەسمەر
**کەڤۆکم لێ لێ لێ**
**لێ لێ لێ، لێ لێ لێ لێ لێ لێ**

لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ، لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ کەڤۆکێ سۆرم، وای وای
ل سەر بانا و بن بانا ئەز دچێرم، لێ لێ
ئەز ئاشقێ لێ لێ ژنا ب مێرم، وای وای

کەڤۆکم لێ لێ لێ
لێ لێ لێ، لێ لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ، لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ کەڤۆکێ ڕەشم، وای وای
ل سەر باناو بن بانا ئەز دمەشم، لێ لێ
ئەز ئاشقێ لێ لێ چاڤێت ڕەشم، وای وای

کەڤۆکم لێ لێ لێ
لێ لێ لێ، لێ لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ، لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ کەڤۆکێ شینم، وای وای
ل سەر بانا و بن بانا ئەز دخوینم، لێ لێ
ئەز ئاشقێ لێ لێ کەچکا دینم، وای وای

کەڤۆکم لێ لێ لێ
لێ لێ لێ، لێ لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ، لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ لێ
لێ لێ لێ لێ کەڤۆکێ سپی مە، وای وای
ل سەر بانا و بن بانا ئەز گۆری مە، لێ لێ
ئەز ئاشقێ لێ لێ کەچکا گوندی مە، وای وای

تێبینی:
من دڤێ سترانێ دە کەڤۆکێن (نێر و مێ) ژ هەڤ جودا کرن
کەڤۆکێ نێر دبێژە
کەڤۆکێ سۆرم
ویا مێ دبێژە
کەڤۆکا سۆرم
وتد...

٤- شاهمیران
هەلبەست و ئاواز: فۆلکلۆر
دەڤەر: بادینان
هەوا: بەیات کوردی (نەهاوەند ژی هەیە)
ئاکل (ریتم): چۆپی
مۆرک: کوورۆک (پانۆک)
گۆڤەند: شاهمیران، شێخانی و دەلیلۆ
ژێدەرا ستران و موزیکێ:

شاهمیرانێ، های شاهمیرانێ
های مالا بابێ شاهمیرانێ

مە کێشا جۆکەک ژ بەحرا وانێ
های شاهمیرانێ، شاهمیرانێ
سێسەد پالە وەی، پێت بەردانێ
های شاهمیرانێ، شاهمیرانێ
هەر پالەکی لۆ، زێڕەک دانێ
های شاهمیرانێ، شاهمیرانێ
شاهیمرانێ لێ، گەردەنزیڤی
های شاهمیرانێ، شاهمیرانێ
پەزکێ میرا بەردا نشیڤی
های شاهمیرانێ، شاهمیرانێ
ئەڤە لێ دچەرن پەزێت کویڤی
های شاهمیرانێ، شاهمیرانێ

شاهمیرانێ لێ، گەردەنگازی
های شاهمیرانێ، شاهمیرانێ
پەزکێ میرا بەردا ئەڤرازی
های شاهمیرانێ، شاهمیرانێ
ئەڤە لێ دچەرن تەیرو بازی
های شاهمیرانێ، شاهمیرانێ

# گیروگرفتەکانی شانۆکارانی کورد لە دەرەوەی وڵات



مەهدی مەجید جاف
(سوید)

دابڕان لە وڵات و لە میللەت لای هونەرمەندانی بە هەست و سۆز کارەساتێکی ئەوەندە گەورەیە کە باسکردنی ئاسان نییە، دابڕان نەک بە مانای جەستە، بەڵکو دابڕانێکی ڕۆحی، دابڕان لە کۆڕی گەرمی ڕۆشنبیری و فکری، دابڕان لە کەشوهەوای، دابڕان لەو کێشانەی کە بەرهەمی هەموو داهێنانێکن.

هونەرمەند تا زیاتر لە کێشەکانەوە نزیکتر بێت باشتر لای ئەو دەخرێنە ژێر تیشکی ئەنالیزەوە باشتریش دەرک بە نهێنییەکانی دەکات، چونکە خۆی یەکێکە لە بەشداربووەکانی ناو کێشەکان، واتە گوتار و کرداری لە نزیکەوە یەک دەگرنەوە.

لاوازی و پاشکەوتوویی شانۆ، کاری نێگەتیڤ هەر لە شانۆکاران ناکات، لە کۆمەڵێ لایەن و کەسایەتیی تریش دەکات، تەعبیر لە ئاست نزمیی دەزگا و لایەنە سیاسییە کوردییەکانیش دەکات. ئەوان ئەگەر گرنگی بە هونەری شانۆ و شانۆکارانیش نەدەن، ڕەوتی پێشکەوتنی کۆمەڵگا بەرەو دواوە دەکشێتەوە و کارەکانی ئەمانیش بەرەو هەڵدێر و نشێوی دەڕوات.

لەملاو لەولا، لەم وڵات و لەو وڵات، چەندان گرووپی شانۆیی هەن، لە ژێر ناوی شانۆی کوردیدا، شانۆنامە خۆماڵی و بیانییەکان پێشکەش دەکەن. لێرەدا دوو پرسیار ڕووبەڕوومان دەبنەوە:

یەکەم: ئایا شانۆی کوردی لە تاراوگەدا بوونی هەیە؟ یان درێژەپێدانی ئەزموونەکانی وڵاتە و لە تاراوگەدا لە ڕێگەی ئەوەوە تەعبیر لە کێشەکانی ئەمڕۆی پێ دەکرێت؟

دووەم: شانۆی کوردی لە تاراوگە چ پێشکەوتنێک لە ڕەوتی شانۆی کوردی لە ناوەوەی وڵات دەکات؟

بۆ وەڵامی پرسیاری یەکەم: زۆر کەس بڕوایان وایە کە شانۆی کوردی لە تاراوگە هیچ پەیوەندێکی بە تینی بە شانۆی کوردییەوە لە ناوەوەی وڵاتدا نییە، چونکە نە بینەری تایبەتی خۆی هەیە و نە (تیمی، تێکستی) شانۆنامەکانیش کوردیی پەتین.

بە بڕوای من هەریەک لە ئێمە هەموو خواست و مەبەستە پیرۆزەکانمان لەگەڵ خۆماندا هێناوە و لە کۆڵی خۆمانی ناکەینەوە، تێکۆشان لەوێ جۆرێکی ترو لێرەش جۆرێکی ترە، تێکستی شانۆیش هەر وەک بابەتی ڕۆمان و کورتەچیرۆک و شیعرە و لە تاراوگەش لە نێوان گەلێکی دوور خاک و دوور لە وڵاتی خۆی هەزاران گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمەی سەخت ڕووبەڕوویان دەبنەوە.

ئەگەر نووسەری بە توانا هەبێت دەتوانێت ئەو ڕووداوانە هەموو بکرێنە زنجیرەی نواندنی تەلەفزیۆنیی شانۆیی، ئەم کێشانەش وەک کێشەی سیاسی، کێشەی کۆمەڵایەتی و گرفتی سایکۆلۆژی.

زۆر جار کەسایەتییەکان بەسەر پردی نێوان وڵات و تاراوگەدا دەپەڕنەوە و لە لای هەر تەماشاکەری هەردوو لا جێی سەرنج و لێکۆڵینەوەن.

بۆ وەڵامی پرسیاری دووەم: دەتوانین بڵێین کە شانۆکارانی کورد لە تاراوگە

دەتوانن بە شێوەیەکی تر ڕۆڵیان هەبێت. لە لایەکی ترەوە شانۆکاران لە تاراوگە دەتوانن لە بزووتنەوەی شانۆی بێگانە کەڵک وەربگرن و خۆیانی پێ بەهێز بکەن، زۆرجاریش لە ڕێگەی خوێندنەوە لەسەر شانۆ کادیری باش پەروەردە دەبن و دەتوانن ئەزموونەکانیان لە ڕێگەی بەرهەمی نواندنی تەلەفزیۆنییەوە بۆ کوردستان بگوێزنەوە بەتایبەتی کوردستانی باکوور و ڕۆژهەلات.

لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە لە تاراوگە سانسۆر لەسەر کارێکی هونەری نییە و دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی پێسەکەی ئامادە بکات ئەمە کارێکی باشە، چونکە شانۆ لە هەموو بوارەکانی تر زیاتر پێویستی بە دیموکراتییەت و ئازادی ڕا دەربڕین هەیە. ئەمە لە لایەک لە لایەکی ترەوە لە تاراوگەدا هەموو شانۆکارانی پارچەکانی کوردستان یەکتر دەگرنەوە و دەتوانن لە ئەزموونی یەکتر کەڵک وەربگرن، جاری وا هەیە لە بەرهەمێکی شانۆییدا شانۆکارانی هەر چوار پارچەکەی کوردستان پێکەوە کار دەکەن، ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەیەکی پۆزەتیڤانەیە بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەزموونەکان.

گیروگرفتەکانی شانۆی کوردی لە دەرەوەی وڵات زۆرن و کاریان لە چەند ڕوویەکەوە کردووەتە سەر شانۆکارانی کورد. ئەم گیروگرفتانەی کە لە خوارەوە باسیان دەکەین ڕووبەڕووی میللەتانی وەک فارس و عەرەب و تورک و دەبنەوە، لە گەڵ ئەوەشدا هێشتا هەر کورد لەوان چالاکترە لەم بوارەدا. ئەوەش دیارە لەبەر چەند هۆیەکە کە دوورە لەم باسەو بە پێویستی نازانم باسی بکەم.

یەکەم: کەمی یان قەیرانی بینەران:

بە بڕوای من تەماشاکەر ڕەگەزی یەکەمە لە ڕەگەزەکانی شانۆ و بە بێ



ئەحمەد سالار

تەماشاکەر نە ڕێژەسۆر و نە نووسەر و نە ئەکتەر دەستیان ناچێتە کارێکی شانۆیی.

ڕێژەسۆر هەمیشە بۆ هەڵبژاردنی پێسێکی شانۆیی لە تەماشاکەرەکەی، لە لایەنی بەرزی هونەری دەکۆڵێتەوە و ئەو پێسە هەڵدەبژێرێت کە بینەران لەو کات و شوێنەدا داخوازیکەری ئەو بابەتانەبن کە ڕەنگدانەوە ئازار و خەم و گیروگرفت و حەزەکانیانن. ڕاکێشانی تەماشاکەر بۆ بینینی شانۆنامەیەک کارێکی ئاسان نییە، زیرەکی و هوشیاری، چاو نەترسی ڕێژەسۆر و بەشداران دەخوازێت.

تەماشاکەران بە شێوەیەکی گشتی سێ جۆرن.

جۆری یەکەم: ئەوانەی کە بۆ لەزەت وەرگرتن لە کارە هونەرییەکە و بۆ کات بەسەر بردن دێنە هۆڵی شانۆکەوە.

جۆری دووەم: ئەوانەی کە بۆ فێربوون و خۆ ڕۆشنبیری کردن دێن.

جۆری سێیەم: بریتین لەو بینەرانەی کە بە مەبەستی ڕەخنە و لێکۆڵینەوە بەشدار دەبن.

تەماشاکەرانی کورد لە دەرەوەی وڵات زۆر جیاوازن وەک لەوانەی وڵات. لە دەرەوەی وڵات تەماشاکەران بە جۆرێکی تر لە کێشەکانیان دەڕوانن هەرچەندە ئەوانیش ئەگەر خاوەن فکرێکی بەتین نەبن، ئەوا ئەوانیش دەکەونە دووریانی بڕیاردانەوە، گەڕانەوە بۆ وڵات یان توانەوە لە تاراوگەدا.

تەماشاکەران کۆمەڵێ گیروگرفتی نوێ ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. ئەو گیروگرفتانەش زۆرن، سەختترین گیروگرفتیان، گیروگرفتی خۆ نەگونجاندنە لەگەڵ ئەو ژیان و کولتوورە نوێیە و ئەو جیاوازییانەی کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە.

تەماشاکەرانی دەرەوەی وڵات کەسانی دابڕاو لە وڵات و لە چالاکییە ڕۆشنبیری و کولتوورییەکانن ، لە کێشە سیاسی و کۆمەلاتی و ئابوورییەکانی.

تەماشاکەران لە دەرەوەی وڵات کەم دەبنەوە، لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

(١) کەمی کات.

جۆری ژیان و کار لە دەرەوەی وڵات زۆر جیاوازە لە ناوەوەی وڵات، کار لە دەرەوی وڵات زیاتر بە کاتژمێرە واتە ئەو ڕۆژانەی کە پشووە کار نییە دەتوانێت کار بکات و مووچەکەی دوو بەرامبەریش دەبێت، ئەمەش ئاسان نییە، چونکە ئینسان لەم کاتەدا چ لە لایەنی لەشی و چ لە لایەنی فکرییەوە زۆر ماندوو دەبێت و پێویستیان بە پشوو هەیە.

خێزانێک لە هەفتەیەکدا تەنیا ڕۆژێک کاتیان بۆ گەڕان و یەکتر بینین و میوانی و سەردانی کەسوکار هەیە. ئەگەر کەسێک تەنیا بێت ئەوە تا ڕادەیەک هەر هەمان گرفت ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. جاری وا هەیە ژن و پیاوێک ئارەزووی چوون بۆ شانۆ یان سینەما دەخوازن، بەڵام گرفتی ئەوەیان دەبێت منداڵێکیان یان منداڵەکانیان لە کوێ دانێن. من زۆر کەس دەناسم کە لەگەڵ ژنەکەیدا گرفتی ئەوەیان هەیە کە ڕێکناکەون لەسەر ئەوەی کێ لای منداڵ بمێنێتەوە.

(٢) گرفتی دووری و هاتوچۆ.

لای هەندێک کەس ئەو گرفتانەی لە پێشەوە باسمان کرد گرفت نییە و بەسەریاندا زاڵە، دەمێنێتەوە سەر ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە کرێی پاس و شەمەندەفەر و دووری بکاتەوە. ئەو کەسە ئەگەر هەر لەو ناوچەیە یان هەر لەو شارە بژێت ئاسانترە، بەڵام ئەگەر لە شارێکی چەند کاتژمێر دوورەوە بژێت ئەوە گرفتێکی سەختە. هەڵبژاردنی شار، شوێن بۆ پەنابەر لە تاراوگە بە دەستی خۆی نییە، زۆر جار ئینسان لە گوندێکی زۆر دوور نیشتەجێ دەکرێت کە لە هەموو چالاکییەکی هونەری دادەبڕێت. دەزگاکانی ئەو وڵاتانە نایانەوێت پەنابەران لەیەک شوێن یان چەند شوێنێک بڵاوبینەوە، ئەوان دەیانەوێت شارە گەورەکان زیاتر قەرەباڵختر نەبێت، لە لایەکی ترەوە جاری وا هەیە کە کار لەو شوێنە بچووکانە بە دەست دەکەوێت. یان بۆ فێربوونی زمان شوێنی بچووک باشترە، چونکە کاتی زۆری بۆ دەبێت.

(٣) لەزەت وەرگرتن و فێربوون لە شتی تر.

دنیای ئەمڕۆ زۆر جیاوازترە لە ساڵانی هەشتاکان و پێشتر، لە پاش ساڵانی ناوەڕاستی نەوەدەکانەوە جیهان بوو بە جیهانی ساتەلایت و ئینتەرنێت، بۆ کەسێکی ئاوارەی کورد چەند دەرگایەکی بۆ لەزەت و چێژ وەرگرتن لە کات کرایەوە، کەڵک وەرگرتن لە کەناڵە تەلەفزیۆنییەکان، چوونە ناو دنیای ئینتەرنێت و نزیک بوونەوە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی وڵات بوونەتە سەرچاوەی یەکەمی خۆ ڕۆشنبیر کردن و کات بەسەر بردن. ئەگەر یەکێک توانای کۆمپیووتەر و کردنەوەی ئینتەرنێتی لە ماڵەوە نەبێت ئەوا دەتوانێت لە کتێبخانەی گەڕەک یان لەو ناوچەیەی کە لێیی دەژێت بۆ ماوەی خولەکێک بە خۆڕایی و بێپارە لە دنیای پڕ لە ڕەنگاوڕەنگ و دەڵەمەندی ئینتەرنێتدا کەڵک وەربگرێت.

(٤) دەست پێوەرگرتن لە باری ئابووریان.

زۆربەی ئەوانەی کە لە تاراوگە دەژین دەکەونە ناو کێشەی سەختی ئابوورییەوە، لێرە مەبەستم بێ توانایی و کەمدەستی نییە، هەرچەند پەنابەران بریتین لە چینی کەمدەستی ئەو وڵاتانە، ئەمە لە سەرەتادا پاشان کە باری ئابووریان باش دەبێت بیر لە سەرمایەگوزاری دەکەنەوە.

کڕینی بلیتێکی، پسوولەیەکی چوونە ژوورەوە بۆ بینینی شانۆگەرییەک یان فیلمێک لە هەر یەکێک لەو وڵاتانەدا لە دە دۆلار کەمتر نییە، بەڵام نرخی بلیتێکی شانۆنامەیەکی کوردی لە پێنج دۆلار زیاتر نییە، کەچی لای ئەوان هەر زۆرە.

(٥) ڕەشبینی لە ڕووداوەکان و ئایندە.

ئەو کەسەی کە لە یەکێک لە وڵاتانی ئەورووپا یان هەر شوێنێکی تر دەبەوێ مافی مانەوەی پێ دەدرێت، ڕووبەڕووی سیستەمێکی نوێ لە ژیان، لە کار دەبێتەوە، بەر لە هەموو شتێک بیر لەوە دەکاتەوە ئایندەیەکی باشی هەبێت، لەم کاتەدا هەموو شێوەکانی ژیان دەگۆڕێن، تا ڕادەیەکیش بیرکردنەوەکانیش دەگۆڕێن، بەراوردێک لە نێوان هەموو ژیانی ڕابردوو و ئێستای دەکەونە بیرییەوە، زۆر جار ئینسان بیر لەوە دەکاتەوە کە جارێکی تر بیر لەوە نەکاتەوە بەشداری لە کێشە خوێناوییەکانی پارتە سیاسییەکانی وڵاتدا بکات، بە ماقووڵی نازانێت لە وڵاتێکی پێشکەتوو لە هەموو بوارەکاندا بژێت و وەک شەڕخوازێکی کۆنەپەرست هەڵسوکەوت بکات کە هیچ گەشبینییەکی لێ بەدی ناکات.

نایەوێت گوێ لە کەسانێ بگرێت لەسەر شانۆ کە لەو دنیایەی نزیک بکەنەوە، بۆیە زۆر جار ئەگەر بە کەسێک بڵێی شانۆنامەیەکی کوردی پێشکەش دەکرێت یەکسەر پرس لەوە دەکات کێ ڕێژەسۆرە و شانۆنامەکە باس لە چی دەکات؟

لێرە من نامەوێت بینەری کورد تاوانبار بکەم، چونکە زۆربەی ئەوانەی کە شانۆکاریشن لە بینەرەکان ڕەشبینترن، زۆر شانۆکاری چالاک لە کوردستان کە وڵاتیان بە جێهێشتووە نەک هەر ئامادەنین لە شانۆنامەیەکدا بەشداری بکەن، بەڵکو وەک بینەرێکیش ڕۆڵیان نەماوە.

ساڵانی پێش ڕاپەڕین ژمارەی تەماشاکەران لە شارێکی وەک سلێمانی دا، لە سنووری چەند هەزارێک تێپەری دەکرد، وزە و گەشبینیی دەدا بە شانۆکاران کە کاری باشتر و داهێنەرانەتر بەرهەم بهێنن. بۆ نموونە لە مانگی تەمووزی ساڵی (١٩٨٣)دا، شانۆنامەی مرۆڤ و شارەکەی نزیکەی چل ڕۆژ بەردەوام بوو لە پێشکەش کردنی، هەر ڕۆژەی لە دووسەد کەس زیاتر ئامادەی بینینی بوو، بەڵام لە ئەورووپا ژمارەی تەماشاکەرانی باشترین شانۆنامە لە چەند سەد، سێ سەد کەسێک زیاتر تێناپەڕێت. ئەمە یەکێکە لەو هۆیانەی کە شانۆکاران لە ئامادەکردنی شانۆنامەیەکدا سارد دەکەنەوە، هەروەک دەزانن کە بۆ بەرهەمهێنانی شانۆنامەیەک جاری وا هەیە لە شارێکی وەک ستۆکهۆڵمدا کە کوردە نیشتەجێ بووەکانی چەند هەزارێکن، نزیکەی شەش مانگ دەبێت ماندوو بوون و زەحمەتی پرۆڤەکردنی لە گەڵدا بکێشرێت، پاشانیش لە سێ ڕۆژ زیاتر پێشکەش ناکرێت و لە چەند سەد کەسێک زیاتر نایبینێت، ئەوانەش کە

دەبینن جاری واهەیە خزم و ناسیاوی بەشداربووانی بەرهەمەکەن. ئەو زەحمەت و ڕەنجەی کە دەدرێت بۆ بەرهەمەکە بە فیڕۆ دەچێت.

ڕێژەسۆر لە دەرەوەی وڵات، لە هەڵبژاردنی پێسێکدا پێویستە بە جۆرێکی تر لێکۆڵینەوە لەسەر بینەران بکات، لە وڵات کێشەکانی بینەر جیاوازترن وەک لە کێشەکانی دەرەوەی وڵات، بەڵام لە هەندێ لایەندا یەکتر دەگرنەوە، نموونەی ئەوەش بیروبۆچوونی ئایدۆلۆژییە.

بینەرانی دەرەوە، چاو کراوە و تا ڕادەیەک لە نهێنیی کێشەکان هوشیارن، جا لەبەر ئەوە پێویست ناکات ڕێژەسۆر پێسێک هەڵبژێرێت کە لە وڵات پێشکەش کراوە، یان لەو جۆرە پێسانە بێت کە لە وڵات پێشکەش دەکرێن، یان شانۆنامەیەکی جیهانی، بینەری کورد پێی باشترە ئەو بەرهەمە لە یەکێک لە شانۆ مەزن و خۆشەکانی ئەو وڵاتەدا و بە زمانی ئەوان ببینێت وەک لەوەی لە شانۆیەکی بچووک و لە ئاستێکی نزمدا، واتە بۆ نموونە ئەگەر بڵێین تیپی شانۆی کوردی..... شانۆنامەیەکی بریخت پێشکەش دەکات، لە هەمان کاتیشدا هەمان شانۆنامە لە لایەن گرووپێکی شانۆیی ئەو وڵاتە پێشکەش دەکرێت، من لەو بڕوایەدام لە سەدا نەوەدی بینەری کورد ئەگەر بڕۆن بۆ بینینی شانۆنامەکە ئەوا شانۆنامەی گرووپی وڵاتەکە هەڵدەبژێرن، چونکە دڵنیان لەوەی کە کارێکی باش و پارەیەکی باش بۆ شانۆنامەکە تەرخان کراوە.

لێرەدا مەبەستم بەرهەمی سیاسیی سرف نییە، مەبەستم ئەوەیە بەرهەمێک لێرە پێشکەش بکرێت کە لە کێشەکانی بینەری ئێرەوە نزیک بن. ئەگەر ڕێژەسۆرێک بیەوێت خۆی لەو کێشانە دوور بخاتەوە ئەوە بێگومان



د. فازڵ جاف

تەماشاکەرانیش لە ڕێژەسۆر و بەرهەمەکەی دوور دەکەونەوە.

تەماشاکەران ئامادەنین جارێکی تر گوێ لەو کێشانە بگرن کە لە وڵات باس دەکرێت. ئەو ڕووداوانەی لە کوردستانی باشووردا ڕوودەدەن هەر وەک ئەو ڕووداوانەن کە لە دواکەوتووترین وڵاتانی ئەم سەر زەوییەدا ڕوودەدەن، بەدەست کەسانێکەوە دەناڵێنن کە لە ئەورووپا و لە لوتکەی شارستانی و تەکنۆلۆژیادا ژیاون، ئەوان نەک هەر خەڵکە ئاساییەکە، بەڵکو ڕووناکبیرانیشیان ڕەشبین کردووە. چ تەماشاکەرێک ئامادەیە لەم دنیای پێشکەوتووی تەکنۆلۆژیایەدا گوێ لە پێدا هەڵدان و وەسف کردنی ئەوانە بگرێت.

ئەگەر ڕێژەسۆر شانۆنامەیەک هەڵبژێرێت بۆ پێشکەش کردن کە لە وڵات بە هیچ جۆرێک ڕێگای پێ نادرێت و لە پرسگەی سانسۆر و پۆلیسی دڕ ڕزگاری نابێت، ئەوە لە یەکەمین هەنگاودا سەرکەوتوو دەبێت. ئەمە مانای ئەوە نییە کە بیر لە لایەنی بەرزی هونەری نەکاتەوە.

کارێکی تر کە بینەر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت بیرکردنەوەیە لە بە هەرزان فرۆشتنی بلێت. دەمێنێتەوە سەر ئەوەی کە لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و بڵاوکراوە کوردییەکاندا ڕیکلامی بۆ بکرێت. دنیای ئەمڕۆ دنیای ڕیکلام و بەربەرەکانێی بازرگانییە، لە ڕێی ڕیکلامی زۆر باشەوە دەتوانرێت بینەران بۆ هۆڵە چۆڵەکانی شانۆ ڕابکێشینەوە. جاری وا هەیە خەرجیی ڕیکلام گرفتێکی گەورەیە، چونکە ڕیکلامی باش دەستکەوتی باشی دەبێت. ڕیکلام کردن بۆ بەرهەمێکی درامی زیرەکی و هونەرێکی باشی دەوێت.

ئەو کوردانەی لە دەرەوەی وڵاتن خەڵکی یەک پارچەی کوردستان نین، بەڵکو هەموو لایەکن هی واشیان هەیە هەر کوردستانیان نەدیوە و لێی نەژیاون. ئەو دەرهێنەر و ئەکتەرانەی لە ئەورووپا بەرهەمێکی هونەری بە ئەنجام دەگەیەنن چەندان ساڵ خەباتی هونەرییان کردووە تا ناودار و ناسراو بووە، تا بینەری بۆ خۆی پەیدا کردووە. بینەری کورد لە دەرەوەی وڵات بێ ئاگان لەو ڕابردووە هونەرییانە، ئەگەر لە بینەرێکی ئاسایی کوردی باشوور بپرسیت قوتبەدینی سادقی کێیە؟ بێگومان بە کە نایناسێت یان لە کوردێکی باکوور بپرسیت ئەحمەد سالار یان تەڵعەت سامان کێیە؟ بێگومان بە نایانناسێت. تاوانەکە بۆ ئەوان ناگەڕێتەوە، تاوانی دوژمنانە کە لێکیان دابڕیوین و بێئاگابووین لە ئەزموونی یەکتر.

ئەوەی لێرەدا پێویستە کە ئاماژە بۆ ڕۆڵی مەزنی دکتۆر فازڵ جاف-ە کە توانیویەتی لە ئاوارەییشدا بینەر لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە، شانۆنامەکانی گێڕدن و ڕووتبوونەوە و دوو پێغەمبەر دەسترەنگینی و توانایی مەزنی ئەو لە کاری ڕێژەسۆریدا دەردەخەن. ئەو شانۆنامانە هەر وەک بەرهەمی ڕێژەسۆرە بە تواناکانی جیهان بوونەتە مینبەری گفتوگۆ و کێشمەکێشمی بیروبۆچوون.

ئەو جـۆرە کـارانە هەم بینەری کـورد لە خۆی نزیک دەکاتەوە و هەمیش شانۆی کوردی بە شانۆی جیهانی دەناسێنێت.

ئەو تەنیـا کـەسـێکە کـە وەک ڕیژەسۆرێکی بە توانای کورد بەردەوامە لە گەیاندنی پەیامە مەزنەکەی شانۆ، چەند لاوی بە تواناش لەبەر دەسـتی ئەودا وەک ئەکـتـەر ناوبانگیـان دەرکـردووە. ئەو نەک هەر لەناو کورداندا، بەڵکو لە ناو وڵاتانی عەرەبی و سـوێدیشـدا ناوبانگ و خـاوەنی کەسایەتییەکی بەهرەمەند و بە توانایە.

دووەم: قەیرانی ئابووری:

شانۆکارانی کورد لە تاراوگە هەر وەک شـانۆکـارانی وڵات ئەم پیـشـەیە وەک ئارەزوویەک و لە کـاتی ئازاددا بە زۆر بۆیان براوەتەوە، لە تاراوگـە لەوانەیە چەند هۆیەکی لۆژیکی بۆ ئەم گـرفـتـە هەبێت، بەڵام لە وڵات هیچ هۆیەک نییە تەنیا گێلی و بێ ویژدانی ئەوانە نەبێت کە دەسـەڵاتی ئابووریـیان هەیە، ئەوانە لە وڵات دەیانەوێت هونەرمەندان بکەنە کۆیلەی خۆیان.

هونـەر و وەرزش کـــە چەنـد بـۆ پێگەیاندنی مرۆڤ ڕۆڵی مەزنیان هەیە سـەد ئەوەندەش، هەزار ئەوەندەش سـوودی ئابووری سـەرچاوەیەکی ئابووریـیە بۆ ئەو وڵاتە، ئەمـە جگە لەوەی ناو و ناوبانگی ئەو مـیللەت و وڵاتە بە دنیـا دەگـەیەنێت و کـاریگەرییـەکی باشی بۆ کـارگـە پیشەسازییەکانی ئەو وڵاتە دەبێت.

ئەگەر جارێک شانۆکارێکی کورد لە دیدارێکدا بە شانۆکارێکی بێگانە یان کەسێکی لەم بوارانەدا سەرقاڵ باسی ئەوە بکات کـە لە وڵاتی ئێـمـەدا ئەم هونەرە مـەزنە هێـشـتـا هەر وەک ئارەزوویەکە و لە کاتی ئازاددا ئەنجام دەدرێت و نەبووەتە پیشە ئەوە یەکسەر و بێ پێچ و پەنا تێدەگات کە ئەو وڵاتە وڵاتێکی دواکەوتووە، ئەو ڕابەرانەی کە لێی بەرپرسن ئینسـانی بێ ئاگـاو کـەم هۆشن. هەندێ جار شانۆکاری کورد پێی شـەرمـە لەم کـاتانەدا خـۆی بە کـورد و خەڵکی کوردستان دابنێت.

هەر وەک ئامـاژەمـان بۆ کـرد گیروگرفتی ئابووری سەرچاوەی هەموو گیروگرفتەکانی تری شانۆی کوردییە، هیچ گـەشبینییـەک بۆ نەهێشتنی ئەم گـرفـتـە لای هونەرمـەندان لە دەرەوەی وڵاتدا نییـە. یەکـێک لە گـرفـتـە ئابوورییـەکـان نەبوونی شـوێنی پرۆڤـە کردنە، بۆ پرۆڤە کردن پێویستە کرێی ئەو شـوێنە بدرێت، ئەو شـوێنەش بە کاتژمێرە هەر جارێک لە بیست دۆلار زیاتری تێدەچێت.

ئێستا کە سەردەمی شۆڕشی توندڕەوی تەنکنۆلۆژییە و لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە مـرۆڤ دەتوانێت بە هەمـوو شـێـوەیەک ڕێگا سـەختـەکـانی پێـوەندی کـردن بشکێنێت، ئەفـسـووس تا ئێـسـتـا پیاوانی سیاسی و سیاسەتمەدارانی ئێمە لە هونەری شانۆ نەگەیشتوون و گرنگیی پێ نادەن و بگرە زۆر جـار بە سـووکی تەمـاشـای کـەسێک دەکـەن کە کـاری شـانۆیی بکات، ئەوان لە ئەقـڵی خۆیانەوە هونەر بە کاڵایەک تێ دەگەن و لە ئەوان وایە تەنیـا بە پیـاو کـوشتن دەتوانرێت کێشەکان چارەسەر بکرێت و کـۆمـەڵگا گـۆڕانی بەسـەردا بێت، زۆر جـار لەوانەیە بە پێـچـەوانەوە بێت تێـبگەن و خـۆیانی لێ گـێـل بکەن، چونکە سیاسییـەکانی ئێـمە تا ئێستا ڕەوتی ڕەخنەیی بە کارێکی دوژمنگەری تێـدەگـەن، ئەوەی ڕەخنەی گرت دەبێت گـیـانی لەسـەر دەسـتـیدا بێت، شانۆی ڕاستەقینە هەمیشە ئەرکی مرۆڤایەتیی خۆی ئەنجام داوە و ئامادەشە هەر درێژە بەو پەیامـە مـەزنە مـرۆڤـایەتی و نەتەوەییە بدات.

وەک لای هەمـووان ئاشکرایە کـە لە ئەوروپا قـەیرانی کـات لای شـانۆکـاران گـرفـتـێکی گـەورەیە. شـانۆکـار ناچاردەبێت بـۆ درێژەدان بە ئەرکـە نەتەوایەتی و مرۆڤایەتییەکەی قوربانی بە کـۆمـەڵێ ئەرک و پێـوستـیـەکـانی ژیانی بدات. ئەمـە لە کـاتێکدا هیچ سـەرمـایەیەکی لە شـانۆ دەسناکـەوێت، جگە لە زیان نەبێت.

لە وڵاتـێـکی وەک سـوێـد-دا کـۆمـەڵێک ڕێکخـراو و لایەنی کوردی هەن کە ساڵانە بودجەیان بۆ براوەتەوە، کەچی پاش چەند ساڵێکی زۆر لە چەند ژمـارەیەکی گـۆڤـارێکی لاواز و بێ خوێنەر هیـچی تریان نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا بەو بودجەیە دەتوانرا باشترین کاری پێ ئەنجام بدرێت. بەدرێژایی ئەو چەند ساڵە شتێکی وایان نەکردووە کە بۆشـاییـەکی لە ئەدەب و کـولتـووری کوردیدا پڕ کردبێتەوە.

ئەگـەر ئەوان لە باتی ئەو گـۆڤـار و بڵاوکراوانە بهاتنایە و هەر لە سەرەتاوە بانگەوازێکـیـان بۆ شـانۆکـارانی کـورد بکردایە و گرووپێکی شانۆییان دروست دەکـرد کـە سـاڵانە چەند بەرهەمـێک ئامـادە بکەن و تا ڕادەیەک یارمـەتیی شانۆکارانیان بدایە. بارەکە جۆرێکی تر دەکەوتەوە. ئەو کاتە ئەوانیش نەک هەر کـارێکی باشـیـان ئەنجـام دەدا بگرە کـۆمـەڵێک هونەرمـەندیان لە دەوری خۆیان کۆدەکردەوە کـە فـێـری کرداری باشیان بکەن.

لایەن و ڕێکخـراوە کوردییـەکـانیش هەر گـۆڤـار دەرکـردنیـان لا گـرنگە و لە ئەوان وایە بەبڵاوکـردنەوەی گـۆڤـار و بڵاوکـراوەی هەمـوو کـارێکیـان ئەنجام داوە. گۆڤارە سەربەخۆکانیش بە دەست گرفتی مالی و نە کڕیارییەوە دەناڵێنن. زۆر لەو گۆڤارانە ژمارەی ئابوونەکەریان ناگاتە دوو سەد کەسێک.

ئەمـڕۆ تەلەفـزیۆنی کـەناڵە ئاسـمـانییـەکـان ئەوانەی بە هۆی

سەتەلایتەوە یان دیگیتاڵەوە بە دنیا دەگات بۆشاییەکی گەورەی لە هونەری کوردیدا پڕ کردۆتەوە و وزەیەکی گەرم و ڕۆحێکی تری بە بەر هونەرمەندا کردووە کە بەردەوامی بە ئەزموونەکانیان بدەن، ئەوانیش ئێستا هەست دەکەن کە پڕۆگرامی تەلەفزیۆنەکانیان ناتەواوە هیچ بەرهەمێکی شانۆیی تەلەفزیۆن و زنجیرە نواندنی تەلەفزیۆنیان نییە و داوا دەکەن کە لەملاو لاوە بەرهەمیان بۆ ئامادەبکەن.

ئەوان پێویستە ئەوە بزانن کە ئەم کارە پێویستی بە یارمەتیی ئابووری هەیە، پێویستی بە گرووپی تایبەت هەیە، چونکە بەرهەمهێنانی کارێکی شانۆیی کاری یەک ڕۆژ و دوو ڕۆژ نییە و پێویستی بە قوربانی دانێکی زۆرە تا دێتە بەرهەم. بێگومان تا کارێکی شانۆیی یارمەتیی مالی باشتر بێت بەرهەمێکی باشتری لێ دێتە دەست.

ئەگەر دەزگایەک یان چەند دەزگایەکی نەتەوایەتی هەبێت، بیەوێت گرنگی بە بووژانەوەی کولتووری و هونەری و بە هێزکردنی بدات و چەند گرووپێکی شانۆیی سەربەخۆ دروست بکات و ساڵانە بودجەیەکی تایبەتی بۆ تەرخان بکات، ئەوا بارەکە بە جۆرێکی تر دەکەوێتەوە.

بێگومان ئەم دەزگایانەش لە لایەن پارت یان ڕێکخراوی نەتەوەییەوە دەتوانرێت دروست بکرێن، چونکە سەرچاوە ئابوورییەکە لای ئەوانەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەوان وەک بانکەکانی جیهانن، مرۆڤ شەرم دەکات وا بڵێت، بەڵام ئەمە واقیعێکە و تێیکەوتووین تا لێی دەرباز دەبین دەبێت قوربانیی بۆ بدەین. بە مەرجێک سەربەخۆ بن، هەر وەک ئەوەی کە وڵاتێکی سەربەخۆ، دەزگای



تەلعەت سامان

بەرهەمهێنانی کاری هونەری مەبەستی بێت. لێرە ئەو دەزگایانە بە دڵنیاییەکی زۆرەوە قازانجێکی زۆر دەکەن، چونکە لە ڕێگەی ئەم دەزگایانەوە دەتوانرێت بەرهەمە هونەرییەکان بە دەزگاکانی وڵاتانی تر بفرۆشرێن. بۆ نموونە ئەمڕۆ لە ڕێگەی تەلەفزیۆنە کەناڵە ئاسمانییەکانەوە دەتوانرێت بەرهەمی شانۆگەری تەلەفزیۆنی و زنجیرە نواندنی تەلەفزیۆنی بە تەلەفزیۆنەکانی وڵاتانی تر بفرۆشرێت و قازانجی لێ بکرێت، کۆمەڵێک وڵات لەم دنیایەدا هەن کە دەستمایەیەکی باشیان لەم هونەرە دەست دەکەوێت وەک: ئەمەریکا و هیندستان، لە وڵاتە عەرەبییەکانیشدا میسر..

مەسەلەی کورد و چارەنووسی ئینسانی کورد زۆر جێی بایەخ و لێکۆڵینەوەن لە لایەن گەلانی ترەوە. جا ئەگەر ئەم دەزگایانە گرووپێکی شانۆیی دروست بکەن و میزانییەی ساڵانەی بۆ دابین بکەن و مووچەش بۆ ئەوانە ببڕنەوە کە بە هەمیشەیی تێیدا کار دەکەن گرفتەکە چارەسەر دەبێت. بۆ نموونە ئەگەر لە یەکێک لە ئینستیوتە کوردییەکاندا یان فیدیراسیۆنەکاندا بەشی شانۆ بکەنەوە و ساڵانە پەیڕەوی کاریان بۆ دیاری بکرێت و دەتوانرێت لە ساڵێکدا دوو تا سێ بەرهەمی باش ئامادە بکرێت.

هەر لەم بەشانەدا دەتوانرێت دەرسی شانۆ بەو لاوانە بووترێتەوە کە لێرە گەورە بوون هیچ بوارێکیان بۆ نەڕەخساوە لە دەرەوە بخوێنن، چونکە هەر وەک خۆتان دەزانن لەم وڵاتانەدا مەرجەکانی خوێندن لە شانۆ و سینەما چەندە سەختە.

ساڵی (١٩٩٧) وڵاتی سوید لە فرۆشتنی موزیکدا بە وڵاتانی بێگانە یەک ملیار و نیو کرۆنی سویدی قازانج کرد، کە ئەم مەبلەغە بەقەدەر قازانجی فرۆشتنی چەک بوو.

سێیەم: قەیرانی ئەکتەر:

گیروگرفتەکانی ئەکتەری کورد لە دەرەوەی وڵات زۆرن، گیروگرفتی گەورە پرشوبڵاوی ئەکتەرانە بەسەر کۆمەڵێک لە وڵاتان و شاراندا، لە وڵاتێکی وەک سوید جاری وا هەیە بەتواناترین ئەکتەر لە گوندێکی ئەو وڵاتە دەژی، زۆر بۆی گران دەکەوێت کە لە شارێکی وەک ستۆکهۆڵمدا پرۆڤە لە شانۆنامەیەکدا بکات. نەک هەر ئەوەش بگرە ئەو مووچەیەی وەریدەگرێت بەشی چەند سەفەرێکی ناکات کە سەردانی هاورێکانی بکات.

شانۆکارانی تاراوگە لە بینەرانی خۆیان دابڕاون، زۆر لە ئەکتەرانی باشی وڵات لە تاراوگە ناناسرێن و لە ڕابردوویان ئاگادار نین، لەبەر ئەوە دەبێت جارێکی تر تێ بکۆشێتەوە تا دەناسرێت و بینەر پەیدا دەکات.

شانۆکارانی کورد بە شێوەیەکی گشتی لە دەرەوەی وڵات سارد بوونەوەیەک روویان تێ دەکات، ئەوان دەکەونە دووریێیانەکەوە، ڕێی یەکەم دووبارە خۆ دروست کردنەوە و بەردەوامی دان بە کاری شانۆ یان

توانەوە لە تاراوگـــە و دابینکردنی ژیانێکی باش بۆ ئەوەی بتـــوانێت سەرمایەکەی لێ بەدەست بکەوێت کە لە وڵات لێی بێبەش بووە. لێرەدا وەک کارێک کە ژیانی خۆی و خێزانی پێ دابین بکات. هەر وەک ئاشکرایە و دەزانن لە ئەوروپا و ئەمـــەریکا و لە وڵاتانی پێشکەوتوودا ئەوەی کە کاری فکری دەکات داهاتی زۆر زۆر باشترە لەوەی کـە کـاری فـیـزیکی دەکـات. زۆربەی هونەرمـەندانی ئەوروپا ئەگـەر ملیۆنێریش نەبن ئەوا باشترین ژیانیان هەیە، بەڵام شانۆکارانی کورد ژیانیان لێـرەش لە کـەباب فـرۆشـێک یان کرێکارێکی کورد خۆشتر نییـە. لێرە هەر دەبێت بەدەست باری ســەخـتی ژیانەوە بناڵێت، ئەکتەرێکی کورد کە ئەم ڕاستـییـە دەرک پێدەکات ئامادە نییە هەرەشە و گورەشەی ئەم حزب و ئەو حزبی بێتە سەر.

ئەوەی کە شایانی گـوتنە ئەوەیە کـە ئەو وڵاتانەی کـە ئێـمـە وەک پەنابەر قـبـووڵ دەکـەن مـەبەسـتی سەرەکـییـان ئەوەیە کـە ئێـمـە خـزمـەت بە وڵات و کـولتـووری ئەوان بکەین، بە هەمـوو شـێـوەیەکی نەرم دەیانەوێت خـۆمـان لەگەڵیاندا بگونجێنین.

ئەکـتـەرێکی کـورد خـوا خـوایەتی بـانگی بکەن لە شـانـۆگـەرییـەکی ئەورووپیدا ڕۆڵ ببینێت، بەڵام بە هەزار پاڕانەوە و لاڵانەوە ئامـادە نیـیـە لە شانۆنامەیەکی کوردیدا ڕۆڵی هەبێت، هەرچەند کە دراما کـوردییـەکـەش لە بێگانەکـە بەهێـز تر و ڕیژەســۆرە کوردەکەش لەوی تر بە توانا تر بێت.

زۆرجار لەو برادەرانەم بیسـتـووە کە لەگەڵ گرووپە سوێدییەکاندا کار دەکەن کە ئەگـەر لای سوێدییەکـان کـار بکەن زیاتر لای کـوردەکـان ڕێز و حـورمـەتی لێ دەگیرێت وەک لەوەی لە گرووپێکی کوردیدا کار بکات. لە وڵات ئەکتەر لە ڕیژەسۆر دەپارێتەوە کە ڕۆڵێکی باشی پێ بدات، لێرەش بە پێچەوانەوە. لە گـیـروگـرفـتـەکانی ئەکـتـەر لە تاراوگـە وەک:

یەکەم: گیروگرفتی خوێندن و کار.

کە شانۆکارێکی کـورد سـەرەتا ڕوو لەم وڵاتانە دەکـات ناچار دەبێت کـە ماوەی دوو سێ ساڵێک خۆی تەرخان بکات بۆ فـێـربوونی زمـان، لەم کـاتەدا ئەو کــەســە ناچار دەبێت لە کـــاری هونەری و خوێندنەوە بە زمـانی دایکی دوور بێت. پاش تەواو کردنی کۆرسی زمـان نۆبەی کـارکـردن دێتـە پێشـەوە، کار کردنیش هەر وەک گوتمان بۆ ماوەی نۆ کاتژمێرە و پاشانیش ئەگەر کەسەکە و کارەکە بخوازێت چەند کاتژمێرێک زیاتر کـار دەکـات. پاشـانیش گرفـتی هاتوچۆی کار دێت کە دوور نییـە ئەو کەسە ماوەی دوو کاتژمێرێکی دەوێت. ئەمــە جگە لەوەی ڕۆژانی شــەممە و یەکشەممەش بە نرخی دوو بەرامبەر کار بکات. گرفتە سەرەکییەکە ئەوەیە کە ئەم کـارانە هیچ پێـوەندییـەکـیـان بە پیشەکەی خۆیەوە نییە.

دووەم: کەمیی کات.

کـات هەر وەک ئامـاژەمـان پێـدا، گرفتێکە لە گرفتە سەختەکان، کەمیی کـات بۆ خـوێندنەوە، کـەمـیـی کـات بۆ بینینی شـانۆنامـەیەک یان فـیلمـێک گرفتێکن لای ئەو. ئەگەر ڕیژەسۆرێکی کــورد داوا لە ئەکـتـــەرێک بکات لە شانۆنامـەکـەیدا وەک ئەکـتـەر بەشدار بێت ئەوە یەکـســەر و بێ سێ و دوو ئەگــەر نەیەوێت بەشــداری بکـات بەرسیڤەکەی ئەوەیە کە کاتی نییە.

سێیەم: گرفتی ماڵی، ئابووری.

هەرکەسێک ڕوو لە ئاوارەیی دەکات بە ئومـێـدی ئەوەیە کـە بەر لە هەمـوو شـتـێـک باری ئابووری باش بێت. خـەرجـیی هونەرپیـشـەیەکی کـورد لە کەسێکی ئاسایی کورد زیاترە، ئەگەر ئەو هونەرپیـشـەیە بڕوات بۆ بینینی دراما و فیلم.

ئەو کـەسـانەی کـە لە دەرەوەی وڵات بـاری ئـابـووریـیــــــان بـاش بـووە و سەرمایەگوزاری دەکەن سەرەتا هەروەک شانۆکارەکە یان هونەرپیشەکە بوون. هونەرپیشەکە پاش دەیان ساڵ هەروەک ئەوە وایە کە ئەمـڕۆ پێی نابێتـە ئەو وڵاتە، کەچی ئەوانی تر کە شـەریکەی تایبــەت و «دوکــانی گـــەورەی خواردەمـەنی و پێـویستی» دەکـەنەوە دەبنە ملیۆنێر.

چوارەم: گرفتی کۆمەڵایەتی.

زۆر جـار زۆربەی گـرفـتـەکـان ڕێگەی چارەسـەریان بۆ دەدۆزرێتەوە، بەڵام کە دێتـە سـەر منداڵ بەخـێـو کـردن و ئاگـاداری کـردنی پیـاو بێ دەسـەڵات دەمـێنێـتەوە. ئێـمـە ئەوەمـان بە چاوی خـۆمـان دیوە کـە چەند ئەکـتـەرێک لە کـاتی پرۆڤـەکـردنی شـانۆنامـەیەکـدا منداڵەکانیـان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە و لە کـاتی پرۆڤـە کـردندا لێی بووەتە تەوق و زۆر جـــار پێ و دەســــتی باوکـیـشی یان دایکیـشی بەرنەداوە. زۆر جـار پیـاو ناچار دەبێت بینینی شانۆنامەیەک لەدەست بدات هەر لەبەر ئەوەی کەس نییە ئاگای لە منداڵەکەی بێت. زۆر جاریش ئەگـەر منداڵیش لە ئارادا نەبێت ئەوە دەمـێنێـتـەوە سـەر ئەوەی ئەم و ئەو بە تەنیـا لە مـاڵەوە بەجێنەهێڵێت.

پێنجـەم: کـەمـیی پێـسی بە هێـز و کەمیی بینەران.

زۆر جــار درامــایەکی کــورت لە ئاهەنگی نەورۆز یـان لە بۆنەی لەو بابەتەدا پێشکەش کراوە لە شێوەیەکی زۆر ئاست نزمدا و لە هۆڵێک کە هیچ مەرجەکانی هۆڵی شانۆیی تێدا نییە و بینەرەکانیشی بینەرانی شانۆ نین، ئەو بەرهەمـانەش هەروەک بەرهەمـەکـانی ســاڵانی شـەست و حـەفـتـاکـانن لە

کوردستان.

ئەمە لە لایەک لە لایەکی ترەوە بێ دیسپلینی ئەکتەرانی کورد لە بەرهەمێکی شانۆییدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ڕۆحی مەغروورییەت پەیدا دەکەن حەز بە ڕۆڵی کەسایەتیی تایبەت دەکەن، هەندێک جار هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بیر و بۆچونی فکری ئەم پەرشوبلاوییە دروست بکات، چونکە پارتەکان لەگەڵ یەکتردا لە دەرەوە دوورەپەرێزن لە یەکتری و ئەندامەکانیشیان لە کارێکی نەتەوەیی هاوبەشدا یەک ناگرنەوە.

گرفتێکی گەورەتر لە ڕێگەی ئەکتەری کورددا ئەوەیە کە بە ئەو هەست و سۆزە و خۆشی ئازارانەوە کە لە کوردستان ڕۆڵی کەسێکی یاری دەکرد لێرە زۆر جار لەو هەستانە خاڵییە.

ئەگەر لۆکاڵێکی هونەری کە شانۆیەکی تێدا بێت و شوێنی یەک یان چەند گرووپێکی شانۆیی تێدا بێتەوە، لەوێدا هەندێک لە ئەرکە سەرەتاییەکانی سەرشانی ئەکتەری پێ سووک بێت، بۆ نەهێشتنی گرفتی کەمیی ئەکتەر پێویستە چەند خاڵێک لەبەرچاو بگیرێت وەک:

یەکەم: کردنەوەی لۆکاڵێکی تایبەت بۆ شانۆکاران.

دووەم: کردنەوەی کۆرسی فێرکردنی وانەکانی شانۆ.

سێیەم: کردنەوەی چێشتخانە و کافەتریایەک کە بە نرخێکی زۆر کەم و ڕەمزی خواردن و خواردنەوەکان بفرۆشرێت.

چوارەم: بە بوونی چەند ڕێژەسۆر و نووسەری شانۆیی، بە مەرجێک ڕۆحی لێ بوردوویی و ڕێز لە بیر و بۆچوون و کاری یەکتریان لا هەبێت

پێنجەم: بۆ هەر کارێکی شانۆیی گرووپەکە بتوانێت کارتی هاتوچۆ بۆ



د. قوتبەدین سادقی

ئەکتەرەکان دابین بکات.

شەشەم: کارێکی باشتر ئەوەیە کە ئەو لۆکاڵە کتێبخانەیەک بکاتەوە و ئابوونەوە لەو گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییانەدا بکات کارێکی باشە، چونکە شانۆکار ئەرکی کڕینیانی لەسەر شان کەم دەبێتەوە.

چوارەم: گیروگرفتی تێکست:

هەڵبژاردن و بڕیاردان لەسەر تێکست لە لایەن ڕێژەسۆرەوە سەختترین کارێکە، چونکە سەرکەوتنی هەموو بەرهەمێکی شانۆیی پێوەندە بە چۆنیەتیی پێسەکەوە، هەڵبژاردنی پێس پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی وردی ڕێژەسۆرە لەسەر کۆمەڵێک لایەن، وەک:

(١) چۆن تەماشاکەر ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

(٢) کاریگەریی پێسەکە لە سەر ڕووداوەکان.

(٣) توانای ئەکتەرەکان بۆ دۆزینەوە و گەیاندنی ڕۆڵەکان.

(٤) بە هێزی لە لایەن لانی هونەری و ئەدەبییەوە.

(٥) دەستنیشان کردنی بارە ئابوورییەکەی.

ئەمە بە شێوەیەکی گشتی و لە هەر شوێنێک بێت، بەڵام بۆ دەرەوەی وڵات ئەرکەکانی هەڵبژاردنی تێکست زیاتر گرانتر لەسەر ڕێژەسۆر دەکەوێت، چونکە ئەگەر ڕێژەسۆر لە دەرەوەی وڵاتدا بیەوێت درێژە بە ئەزموونەکانی ڕابردووی خۆی لە بواری شانۆی کوردیدا بدات ئەوا پێویستە زۆر بە وردی ئاگای لە ڕەوتە شانۆییەکەی وڵات بێت.

ئەو پێسەی کە لە دەرەوەی وڵات پێشکەش دەکرێت ئەگەر کاریگەر نەبێت لەسەر کێشەکان و ڕەنگدانەوەی بیر و فکری بینەرانی تاراوگە نەبێت ڕوو لە شکست دەکات، لێرەدا ڕێژەسۆر دەبێت زۆر بە هوشیارانە و چاو نەترسانە بیر لە هەڵبژاردنی تێکست بکاتەوە.

بینەرانی تاراوگە حەزیان لە کارێکی شانۆیی نییە کە بە پێچ و پەناو شاراوەیی کە زۆر ئاڵۆز و نیشانەی ترسی ڕێژەسۆرەکەی پێوە بێت لە تەماشاکردنیدا بەشدار بن، زۆر جار ڕۆژەسۆر لە تاراوگەدا دەکەوێتە هەڵەوە، چونکە بەرهەمی سیاسیی ڕووتیش هەر هەمان حیسابی بۆ دەکرێت. ئەو ڕووداوە پڕ لە تراجیدی و ناخۆشانەی کە لە کوردستان و لەسەر دەستی ئەو کەسانە ڕوو دەدەن کە زۆر هوشیار و زیرەکن، بە ئەنالیزکردنی ڕووداوەکان و شیکردنەوەی کاسایەتییەکان کارێکی ئاسان نییە، لێرەدا پێویستە ڕێژەسۆر بە تەواوەتی شارەزایی لە مێژووی سیاسەتی جیهانی و هەموو پێوەندییە دەرەکی و ناوەکییەکانی هەبێت، چونکە زۆر جار بڕیارەکان لێرەوە دەدرێت و بەدەستی ئەوان ئەنجام دەدرێت.

پێنجەم: گرفتی بێ ئاگایی لە چالاکییە شانۆییەکانی وڵات و تاراوگە:

ئێمە ئەگەر درێژە بە ئەزموونەکانی وڵات بدەین، دەبێت ئاگامان لە

پێشڕەوییەکان و گرفتەکانی شانۆی کوردی هەبێت لە وڵات، زۆر جار هەتا لە دەرەوەش بێ ئاگاین لە کارەکانی یەکتری.

ساڵی جارێک یان دوو جار یان بە ڕێکەوت لە ڕێگەی ئەو کەسانەی کە بۆ کوردستان سەفەر دەکەن و لەو سەرەوە لە باتی پۆست دەست لەسەر کاسێتی ڤیدیۆ درامایەک دەگاتە دەرەوەی وڵات لەگەڵ ئەوەی کە ئەو درامانە زۆر گرنگییان لە کاتی تۆمارکردندا پێنەداوە و زۆر لە لایەنی دەنگ و ڕەنگەوە لاوازن.

ئەوانەی کە لەوێ بەرهەمەکان پێشکەش دەکەن بیر لەوە ناکەنەوە کە بە شێوەیەکی پرۆفس لەسەر کاسێتی ڤیدیۆ بەرهەمەکانیان تۆمار دەکەن و بینێرنە دەرەوە بۆ بڵاوبوونەوە و فرۆشتن ئەگەر شانۆکارانی کورد بێ ئاگابن لەو بەرهەمانەی کە لە وڵات پێشکەش دەکرێت، کارێکی سەخت بە بێ ئاگایی درێژە بە ڕەوتەکە بدات، یان لە تاراوگەوە تەمەڵی دەکرێت لەوەی کە گرنگی بدرێت بە کارێکی هونەری و بە شێوەی پرۆفس لەسەر کاسێتی ڤیدیۆ تۆمار بکرێت و بنێردرێتەوە بۆ وڵات.

بە دروست بوونی لیژنەیەک یان ڕێکخراوێک دەتوانرێت پردێک بۆ پێوەندیی شانۆکاران لە وڵات و تاراوگە دروست بکرێت، ئەویش بە گواستنەوەی هەواڵەکان و بەرهەمەکانی یەکتری.

ئەم لیژنەیە دەتوانێت بەرهەمی گرووپە شانۆییەکانی وڵات لە دەرەوە بفرۆشێت و قازانجەکەی بۆ گرووپەکە بنێرێتەوە بۆ ئەوەی ئەوانیش لە قەیرانی ئابووری ڕزگاریان بێت. ئەو کاسێتانەش لەو بابەتانە بێت کەس نەتوانێت کۆپیی لێ بگرێتەوە. لە تاراوگەشەوە بە هەمان شێوە.

شەشەم: قەیرانی نووسین لەسەر شانۆ بەکوردی لە دەرەوەی وڵات.

نەبوونی یان کەمیی بڵاوبوونەوەی پێس بە زمانی کوردی یان نووسین لە گۆڤارە کوردییەکاندا لەسەر تیۆریی شانۆ یەکێکە لە گرفتەکان، چونکە خوێندنەوە بە زمانی بێگانە لەسەر شانۆ کارێکی ئاسان نییە لای هەموو کەسێک. ئەمە لە لایەک لە لایەکی ترەوە خوێندنەوە بە زمانی زگماکی هەستێکی تر و چێژێکی تری هەیە و دەبێتە هۆی بە هێزبوونی زمانەکەش.

خۆشبەختانە ئێستا لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت چەند گۆڤارو ڕۆژنامە هەن کە لەسەر شانۆ دەنووسن و ناو بە ناویش ژمارەی تایبەت بە شانۆ بڵاودەکەنەوە وەک گۆڤاری ڕامان و پاشکۆی ئەدەب و هونەری ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ و برایەتی.

ئەو کەسانەی کە شانۆکارن و بە وڵاتانی دنیادا بڵاوبوونەتەوە دەتوانن بە کاری وەرگێڕانەوە سەرقاڵ بن وەک لەوەی دەسەوسان چاوەڕوان بن تا کارێکی هونەری دێننە بەرهەم. ئەمڕۆ لە کوردستاندا قوتابیان و شانۆکارانی کورد زیاتر چاوەڕوانی ئەو بەرهەمانەن لە شانۆکارانی کورد.

گیروگرفتی دیکۆر و ئێکسەسوار:

گیروگرفتی جلوبەرگ و پێویستەکان نیشانەی هەژاری و لاوازیی بزووتنەوەی چالاکییە شانۆییەکەیە لە تاراوگەدا، زۆر جار پیاو بۆ تەزبیحێک، سەبیلێک، شمشاڵێک، دەستێک جلی کۆن، پەستەکێک و چی و چی پەکی دەکەوێت و بۆ پەیداکردنی سەری لە ئەرز و ئاسمانەوە دەردەچێت، کەچی لە کوردستانیش لە ئان و ساتێکدا و بەبێ گیروگرفت بۆی دێتە دەست.

ئەو جلوبەرگانەی لە دەروەی وڵاتن جلوبەرگی ئاهەنگ و شاین، هیچ یەکێک لەو کەسانە ئامادە نییە جلوبەرگەکەی پیس بێت و دەستکاری بکرێت، ئەگەر یەکێک ڕۆڵی حەماڵێکی هەژاری کوردستانی هەبێت ئەوا ناچار دەبێت بە جلوبەرگێکی جوان و ڕازاوەوە هەر وەک ئەوەی بۆ کۆنسێرتێکی موزیکی بڕوات دێتە سەر شانۆ، لە فیلمێکی کوردیدا لە دەرەوەی وڵات ئەمە ڕوویدا و لە وەڵامی ئەو ڕەخنەیەدا ئامادەکەرانی فیلمەکە بەرسڤیان وا دایەوە کە با لای بینەرانی ئەورووپی سەریان بەرز بێت کە کورد هەمیشە جلوبەرگی خاوێن و ڕازاوە لەبەر دەکەن.

بە بوونی لۆکاڵێکی هەمیشەیی و ئابوورییەکی باش، دەتوانرێت ئەم گیروگرفتە نەمێنێ، چونکە پیاو لە ڕێگەی کەسانێکەوە کە هاتوچۆی کوردستان دەکەن دەتوانرێت ئەو کەلوپەلانە بهێنرێت و لە بەشی پێویستییەکاندا بپارێزرێ.. ❖

# دراکیۆلا
# جەستەی ئەنتی هیومانیزم یا میتۆلۆژی هاوچەرخ

ئا: نەسیم ستیڤن

ئایا شتێک هەیە لە چەشنی خوێنخۆرەکان یان خوێنمژەکان ئەو ئەفسانەیەی مردوویەکی زیندووە!؟. کە لەگەڵ تاریکیدا زیندوو دەبێتەوە و لە ڕۆشنایی دەرکەوتنیشی دەمرێتەوە!؟. ئەو ئەنتی هیومانیزمە لەسەر خوێنی قوربانییەکانی دەژییت. کە ئەوەش بابەتێکە نە سینەمای جیهانی دەستبەرداری دەبێت و نەبینەرانیش لەو بابەتە ترسناکە وەڕس دەبن. بۆیە تا ئێستا هیچ کەسایەتییەکی سینەمایی نییە توانیبێتی خۆی لە شانی (دراکیۆلا) بدات. کە لە هەر هەموو ئەو کەسایەتییە ئەفسانەییانەی سینەمایی وەک (فرانکزشتاین و تەرەزان و سندباد و جێمس بۆندو...... ناودارترە، دراکیۆلا لە هەر هەموویان زیاتر بوونی هەبووە لەسەر شاشەی سینەمایی کە تا ئەو ساتە وەختە لە دوو سەد فیلم تێپەر بووە.
یەکەم جار لە لایەن دەرهێنەری ئەڵمانی (فریدریش مۆرنۆ) ساڵی (١٩٢٢) یەکەم فیلمی بە ناوی (نۆسفیراتو)ی لەسەر خوێنمژەکان بەرهەم هێنا.
ئەوەی وای لە نووسەرێکی وەک (ئار. دەبیلو. جۆنسون) کرد (درا کیۆلا) بە ئەفسانەی سەدەی بیستەم ناو ببات. هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەگەر ئەو ئەفسانەیە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم دەرکەوتنی کارێکی ئاسایی بووبێت، بەڵام لە سەدەی بیستەم سەدەی تەکنەلۆژیاو زانست و ماهیەت ئەو ئەفسانەیە پرسیارێکی میتۆلۆژیی سینەمایە بەرەو ڕووی گوتاری سۆسیۆلۆژیای هاوچەرخ. ئەگەر چی ئەو شاکارە لە ڕەهەندی سۆسیۆ ڕۆشنبیرییەوە. ناوانانی ئەو سەدەیە بەم مەزنییەش بۆ ئابڕوو بردنی وەهمەکانی سیکۆلاریست و گەڕانەوەیە بەرەو میتۆلۆژیاو بەها بەخشینەوەیە بۆ کولتووری جوولەکەو ئاری و ڕەشپێست. ڕەخنەیەکە لە سیستەمی عەقڵانی (دیکارت) دیالیکتی (هیگل) نامێز کردنەوەیە بەرەو نا عەقڵانییەتی (نیتشە) ئەو فۆرمالیستە میتۆلۆژییەی لە بەری کراوە وا دەکات کە بەتاقە فیلمێک نەتوانرێ تامەزرۆی وەرگر بشکێنرێت. ئەو خوێنمژانەی لەو ئەفسانەیەدا بوونی هەیە و لە فیلمە سینەمایییەکاندا ڤاڵایەکی ئەفسوناوی داگیردەکات پێشتر لە بواری فەلسەفەدا لای فەیلەسووفی فەرەنسی (ڤۆلتێر) ببووە مایەی پرسیارێکی فەلسەفی کە دەیوت لە سەدەی هەژدەمی ئێمەدا خوێنمژەکان تا ئەمڕۆ بوونیان هەیە کە دیارە ئەو پرسیارە فەلسەفیە لەوە هاتبوو کە لە نێوان ساڵانی (١٧٣٠-١٧٣٥) ببووە قسە و باسی هەموو کۆمەڵگا. بۆیە



(ڤۆلتێر) لە بارەی ئەو ئەفسانەیەوە دەیوت «بوونی ڕاستەقینەی خوێنمژەکان لە گۆڕستانەکان نییە، بەڵکو لەنێو کۆشکە بەرز و مەزنەکان دان» سەدەیەک بە دوای (ڤۆلتێر) فەیلەسووفی ماتریالیزمی و دیالەکتیک (کارل مارکس) لە بەشی هەشتەمی کتێبی (سەرمایە). سەرمایەدارانی فەرەنسی و ئینگلیزی بە خوێنمژەکان ناو برد کە لەسەر خوێنی پرۆلیتاریا دەژیێن، فەیلەسووفی وجوودی (جان پۆل سارتر) ناویانی بە دۆزەخییەکان برد، پێش مارکس و سارتەر گەورە شاعیرانی فەرەنسی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم لە چەشنی (جوتیە) و (بۆدلێر) یەکەم کەسانێک بوون دەرکیان بەوە کردووە کە شێتانە ڕوویەکی مێینەیان هەیە بەهۆی لاڤەکردنیانەوە تووشی ئەو شێوە دڕندە مێیە هاتوون.
زانای دەروونناسی ئینگلیزی (تۆنی هوایتهێد) لە لێکۆڵینەوەیەکی بەناوی (پێوەندیی خۆشەویستیمان بە دراکیۆلا):- ئاماژە بە سەرنج ڕاکێشانی ئاڵۆزو هەمە جۆر دەدات کە کارێکی ڕێژەییە و لە کەسێک بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت، بەڵام ئەوەی کە جێگرە وروژاندنی هەستی ترسە.
بەشێوەیەک هەندێ کەس ژیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە بۆ ئەوەی هەستی ترسی بووروژێنێ و گەرێنتو ئەو ترسە بێ مەترسی بێت ئەوا زۆربەیان پێشوازیی لێدەکەن. ئا لەو دیمەنە کلاسیکیەی کەوا خوێنمژەکە ددانەکانی لە گەردنی کیژۆڵەیەک گیر دەکات و خوێنەکەی دەمژێ یا ئەو دیمەنەی خوێنمژەکە لە ترسی بینینی خاچ ڕادەکات



ی ئەو کۆشکە گەورەیەی کە دراکیۆلا تێیدا دەژی یا ئەو دیمەنە سیحرەی کە درا کیۆلا دەگۆڕێ بۆ شەمشەمە کوێر ئینجا سەمفۆنیایەکی ترسناک لەو دیمەنە کلاسیکیانە. یا ئەو کردە سێکسییەی کە هەندێ جار زۆربە ڕوونی دەردەکەوێ ئەو پەردەی نێوان خوێنمژو قوربانییەکە کە ئەو وی شێوەی دوو جەستەی (سادی و مازۆشی) دەکەوێتە بەرچاو. بە شێوەیەک ئەم دیمەنە کلاسیکیانە لە ڕادێکی ترس لای بینەران دروست دەکات کە گۆڕانکارییەک لە جەستەو ناوەوەی مرۆڤ دروست دەکات وەک زیادبوونی لێدانی دڵ و گرژبوونی ماسولکەکانی لەش و موچڕکێک لە بن پێستی مرۆڤ دروست دەبێت وا هەست دەکات مووەکانی سەری هەلدەستێ وەک چۆن پشیلەکان لەکاتی ترسدا مووەکانی لەشیان بەرز دەبێتەوە، هەروەها مرۆڤ لە کاتی ترسدا ڕەنگی سووردەبێتەوە و ئارەقە لە پێستی دەردەچێ...

هەروەها ڕەخنەگر (جێمس تویتشل) لە بارەی کردەی سێکسی لە فیلمی خوێنمژەکان. ئەوسێکسە ناو دەبات بە ئامادەنەبوونی ئەندامەکانی ئەو پرۆسەیە. سێکسێکە بێ پرسیارییەت و هەست کردن بە گوناح سێکسێکە بێ خۆشەویستی و ورووژاندنی دواجار ئەو پرۆسەیە ناودەبات بەسێکسێک کە ناوی نییە.

دەلێن چیرۆکی خوێنمژەکان شێوازێکی ڕوونکردنەوەی داستانی بۆ ترس لە سێکس بە تایبەت نەخۆشییە سێکسییەکانی وەک (زوهری و سەیەلان) کە لە سەدەی هەژدەیەم و نۆزدەیەم پەرەی سەندبوو. هەروەها ترس لە (ئایدز)، هەشتاکانی سەدەی بیستەم کە بووە هۆی دووبارە گەڕانەوەی فیلمی خوێنمژەکان لە نەوەدەکان بە تایبەتی ئەو دوو فیلمەی (دراکیۆلا)ی دەرهێنەر (فرانسیس فورد کۆپۆلا) سالی (١٩٩٢) و (چاوپێکەوتن لەگەڵ خوێنمژێکدا)ی (نیل جۆردان) سالی (١٩٩٤)، بەلام ئەمە تاکە هۆنییە بۆ دروست بوونی ئەم داستانە زۆر ڕوون کردنەوەی تر هەیە بۆ پەیدابوونی ئەم داستانە وەک ڕوون کردنەوەی دەروونی و سیاسی و کۆمەلایەتی و زانستی ئیتر پێش ئەوەی بچینە سەرچۆنیەتی دروست بوونی داستانی خوێنمژەکان بە وشەی خوێنمژ دەست پێدەکەین کە لە زۆربەی زمانەکانی جیهان بە وشەیەک ئاماژەی پێ دەکرێت «Vampire» و مێینەکەی «Vampira» و ناوی کرداری «Vampirsm». ئیتر ڕوون کردنەوەی قاموسی ئۆکسفۆرد بۆ ئەم وشەیە بەم شێوەیە «Vampire» وشەیەکی پێکهاتەی سالی (١٧٣٤) لە ڕەچەڵەکی «سلاڤی»ە.

١- بوونەوەرێک هەلسوکەوتی دڕندانەی هەیە. دوای مردنی لاشەکەی دەبێتە شتێکی زیندوو شەوانە گۆڕەکەی جێی دێلێ و هەولدەدات بۆ ئەزیەتدان و مژینی خوێنی ئەو کەسانەی نووستوون.

٢- کەسێکی خاوەن کەسایەتییەکی دڕندە و ڕقە (ئەو مانایە هاتووە لە سالی (١٧٤١)).

٣- یەک یا کۆمەلە شەمشەمە کوێرێکی خوێنمژ سالی (١٧٧٤).

٤- دەرگایەکی دوولا بە تەلەدەچێت لەسەر تەختەی شانۆش هەیە بۆ ون بوونی لە ناکاوی ئەکتەر بەکار دێت ( سالی ١٨٨١).

دەرچوونی داستانی خوێنمژەکان لە چاخەکانی ناوەڕاستی خوێناوی بە تایبەت ڕۆژهەلاتی ئەورووپا و ڕۆژئاوای ئاسیا هەرچەندە زۆر زەحمەتە شوێنەکەی دیاری بکرێت، بەلام چیرۆکی خوێنمژەکان چۆتە ناو کتێبی ئەدەبەوە، دوای ئەو کۆبوونەوە ناودارەی پایزی سالی (١٨١٦) نێوان شاعیران (لۆرد بایرۆن) و (بیرس شیللی) و خێزانەکەی (ماری جودوین-شیللی)- و (جون ویلیام بولیدوری). بۆ خوێندنەوەو گفتوگۆکردن لەسەر چەند ئەفسانەو چیرۆکێکی ترس و تۆقێنەری کۆمەلایەتی. لەسەر ئەوە ڕێکەوتن هەریەک چیرۆکێکی ترسناک بنووسێ. ئەوە بوو (ماری شیللی) ڕۆمانە ناودارەکەی خۆی نووسی بەناوی (فراکنشتاین) لە سالی (١٨١٨). ئینجا (لۆردبایرۆن) ڕۆمانێکی لەسەر خوێنمژەکان نووسی کە تەواوی نەکرد، بەلام (بۆلیدۆری) هاوڕێی ڕۆمانێکی لەسەرهەمان بابەت تەواوکرد بەناوی (the Vampire) سالی (١٨١٩)بە بەش بەش لە یەکێک لە گۆڤارەکان بلاوی کردەوە. بۆ ماوەی سی سالی تەمەنی ئەدەبی. خوێنمژ بە وێنەی خەیالی (لۆردبایرۆن) بەستراوە کە خۆی وای دارشتبوو. کەسایەتییەکی یەهوودی خانەدان و خاوەنی دەسەلات. شەوی بووکێنی هەر خزمەتکارێکی بۆ خۆی دانابوو. بە زۆرکرداری سێکسی لەگەڵ کچان دەکات. بۆ کەیف و خۆشی خۆی سل لە هیچ شتێک ناکاتەوە. بە دوای ئەمە چەند چیرۆک و ڕۆمانێکی تر دەرکەوت دەربارەی خوێنمژەکان تا سالی (١٨٩٧) ڕۆمانی (دراکیۆلا)ی نووسەری ئێرلەندی (ئەبراهام...یا «برام ستوکر») دەرکەوت. ستۆکر زۆربەی ئەو باس و چیرۆکە فۆلکلۆرییانەی لە بارەی خوێنمژەکانەوە بە شێوەیەکی درامی دارشت و کەسایەتیی درا کیۆلای بە تێک هەلکێشانی چەند کەسایەتییەک دروست کرد. وەک کەسایەتیی لۆردبایرۆن و شەیتان لە باسی ئاینی مەسیحییەوە و داستانێکی تر کەدەکەوێتە ڕۆمانیا



ناوچەی ترانسلڤانیا.

شوێن نشینی (کۆنت ڤلاد)ی سێیەم یاڤلاد دراکیۆلا کە لە دایک بووی ساڵی (١٤٣١). حوکمڕانی هەرێمی (والاشیا)ی کردووە بەر لەوەی لە شەڕی ئەوروپییەکان دژ بە عوسمانییەکان بکوژرێ لە ساڵی (١٤٧٦) گوایە تاوانبار بووە لە مردنی هەزاران کەس. قسەو باسێک بلاو ببۆوە ئەوکات. گوایە (کۆنت ڤلاد) خوێنمژەو شەوانە لە گۆڕەکەی هەڵدەستێتەوە بۆ گەڕان بەدوای نێچیرو کوشتن و خواردنەوەی خوێنیان.

نیتر وشەی دراکیۆلا (Dracul) بە ڕۆمانی مانای (ئەژدها) دەگەیەنێ هەروەها بە مانای (کوڕی شەیتانیش) دێت. ئیتر تێک هەڵکێشانی ئەژدەهاو شەیتان ئەوا وێنەیەکی ناسراو هەیە لای مەسیحییەکان کە ئەویش کەسایەتیی قەدیس جۆرج یا (مارجەرجیس)ە کە لەسەر ئەسپەکەیەوە شمشێرەکەی لە پشتی شەیتانێک چەقاندووە لەنێو پێستی ئەژدیهایە...

بێگومان هەست کردن بە هێزو ترسناکیی شەیتان شتێکی ئاساییە لەم سەدەی ئێستاشماندا کە بە سەدەی زانست و تەکنەلۆژیا ناسراوە و نەتوانرێ بەسەرەو ژێر کردنەوەیەک دراکیۆلا ببێ بە هێمایەک بۆ دەسەڵاتی ئایینی کە لەگەڵ دەرکەوتنی ڕووناکی ون دەبێت.

هەروەها ستوکر سوودی لە چەند ئاژەڵێک وەگرتووە بۆ گۆڕینی دراکیۆلا بە تایبەت شەمشەمە کوێرە کە جۆرێکی خوێنمژی هەیە تا ئێستا بوونی ماوە لە خوارووی ئەفریقیا.

لە کتێبی (سینەمای خەیاڵی) بیترنیوکولز بۆمان ڕوون دەکاتەوە کەوا چۆن فیلمی دیودزمە ترسناکەکان بڕبڕەی پشتی کۆمەڵایەتی پێک دێنن. خوێنمژەکان ئاستی دەوڵەمەندەکان دەگرێتەوە کە زیرەکترو ڕۆشنبیرترن لە گورگەپیاوزومبیەکان. هەرچەندە هێمای وەحشییەت و دڕندەیین، بەڵام خانەدانی خوێن خواردنەوەش هەست کردنە بە دەسەڵات و گەورەیی، هەروەک چۆن ئاهەنگێکی ئایینی مەسیحی ناسراو هەیە لە بارەی خوێن خواردنەوە.

گۆشت خۆرو گورگە پیاوەکان ئاستی فەرمانبەرەکان دەگرێتەوە وەک پارێزەر و دکتۆرو ئەندازیار...

بەم شێوە زومبییەکان ئاستی کرێکارەکانن کە ئەوانە زۆر سەرنج ڕاکێش نین زوو لەناو دەچن.

هەروەها سەرچاوەی تری ستوکر چیرۆکی کونتیسەی مەجەری ئیرتشبیت یا (ئیلزەبیس) باتوری کە لە ساڵی (١٥٦٠) لە بنەماڵەیەکی سحربازو جادووگەر لە دایک بووە. بە تایبەت خۆی بە ئافرەتێکی لادراو لە ئەریت ناسرابوو. سەرشێت بوو لە پێناو پارێزگاری کردن لە گەنجیەتی خۆی. هەر بۆ ئەم مەبەستەش (٦١٠) ئافرەتی تازە پێگەیشتووی سەربڕیبوو خوێنەکەیانی لە ئاهەنگێکی (طقس) تایبەت خواردۆتەوەو خۆی پێ شوشتووەو تافیشی هەڵگری وێنەی ئەژدەها بووە. لە کاتی سازدانی ئەم ئاهەنگە دەسگیر دەکرێت لەگەڵ هاوەڵەکانی. هەموویان بە بڕیار لە سێدارە دەدرێن تەنیا خۆی نەبێت. لەبەر ئەوەی بە ڕەچەڵەک بنەماڵەکەیان خانەدانن بڕیاری بەندکردنی هەتا هەتایی دەدرێتێ، لەناو چوار دیواری ژوورێک لە ماڵەکەی و لە ساڵی (١٦١٤)دا دەمرێت و مانای ناسراوی ئافرەتی خوێنمژ (Vampira) دەلالەت لە ئافرەتێکی (شەهوانی)ی پیاو باز دەکات. بە تایبەت وشەی (Vamp) کە هەمان مانا دەگەیەنێ و لە ڕوونکردنەوەی تر بلاوبوونەوەی ڕۆمانی خوێنمژەکان لە سەدەی نۆزدەیەم دەلالەت لە دڵەڕاوکێی نووسەرە پیاوەکان دەکات سەبارەت بە پەیدابوونی بزووتنەوەی (ئافرەتی نوێ)ی سەربەخۆ (ڤامپ). هەروەها لە ڕوونکردنەوەیەکی پزیشکی (د. دێڤید نیتش) دەڵێ خوێنمژەکان کە- پیاو ئافرەتن- تووش بە نەخۆشی بۆماوەیی (ویراسی) بەناوی(«پۆرفیزیان» porphyrias) هاتوون کە دەبێتە هۆی پەککەوتنی جگەر لە دروست کردنی خڕۆکە سوورەکان کە بەرپرسیارە لە گواستنەوەی ئۆکسجین لە هیمۆگلۆبین. ئەم نەخۆشییەش هەشت جۆری هەیە لەبەر ئەم هۆکارە لەشیان تووشی شێوان و حەساسییە دەبێت، گەرتیشکی خۆریان بەربکەوێ بۆیە لە تاریکی ژیان بەسەر دەبەن و (د. دولفین) دەڵێت قوربانییەکانی ئەم نەخۆشییە لە چاخەکۆنەکان هەوڵیان داوە بۆ پەیداکردنی ئەو خوێنەی کە لەشیان بەرهەمی ناهێنێت لە ڕێگای گاز گرتن و خوێنمژینی خەڵکانی تر وەدەستی بهێنن.

هەروەها د. دولفین دەڵێت ئێستا لە ساڵی (١٩٨٥)دا نزیکەی (٢٠٠) هەزار نەخۆشی تووش بوو هەیە بە ڕێگای سرنج خوێنی پێویستیان پێ دەبەخشرێت.

ئیتر چیرۆکی خوێن مژەکان وەک کۆشکەکەی دراکیۆلا وایە ترسناک و پڕنهێنی....❖

**سەرچاوە**

......

**کەناڵی ئەسمانی mbc**

**گۆڤاری هونەری حەوتەم- ژمارە/ ٢٩.**

## فازڵ عەززاوی بۆ (زەمان) دەدوێ:

# بۆ دروست کردنەوەی ئەفسانەیەکی کەونی چنگکۆڵی مێژووی کەرکووک دەکەم

* لەهەمـوو کـارە ڕۆمـاننووسـیـیـەکـانتـدا زۆر لە (کـۆتایی)یەکاندا ڕادەمێنی، تەنانەت لە شیعرەکانیشتدا، نهێنیی ئەم خۆخەریک کردنە زۆرە بە ڕستەی کۆتاییەوە چییە؟

- کۆتایی بەلای منەوە پەیوەستە بەو شێوەیەی کە کارەکەی پێ دەنووسم، گـرژی تا دوا برگـە یان دوا دێڕ یان دوا وشـە هەردەمێنێ کە مـرۆڤ دەیگاتێ هەمـوو کارەکە دووبارە گردەگرێتەوەو لەوانەیە بە ڕێگەیەک کـە مـرۆڤ چاوەڕێی نەبێ. ئەمـەش پەیوەسـتـە بە واتای بیـری هەرە قـووڵی ڕۆمـانەکـەوە یان چامـەکـەوە. بێ ئەوە، کـار زۆر لە لایەنە پەسندەکـانی لەدەست دەدا.

لە (داتاشـراوە جـوانەکـانی فـازڵ عـەززاوی)دا دەروازە (سـەرەتا) کە پیت بە پیت دووبارە دەبێـتـەوە کـە ڕێی بۆ ڕۆمـانێکی دیکە دەکـاتەوە، لەوانەیە خوێنەر بەخۆی بتوانێت بیگێڕێتـەوە. لە (قـەڵاتی پێنجـەم)یشدا کـۆتایی ئاماژە بۆ بیـرۆکـەی بازنەی بەردەوام پەیوەست بە بەردەوامیی ئەو تۆقاندنە دەکا کە قوربانی تێـدا دووبارە دەبێـتـەوە. لە (دوایینی فریشتەکان)دا کۆتایی وەک خودی خەون کراوەیە.

* بورهان عـەبدوڵڵای- ڕزگـارکـەر، ئەوەی کـە خـەڵـک بە (مـەهدی-ی چاوەڕوانکراو)یان چوواند نەمـردووە. سـەردڕای ئەوەی سـەربازەکـانی یاجـووج و مـاجـووج لەهەمـوو لایەکـەوە گـەمارۆیان داوە کـە دوو دەستی بەرز دەکاتەوە بەرز بەفڕێنیـان دەدخا. ئایا لەمـردن ڕزگـارکـردنـدا پشت بەوە دەبەستێ کـە ئەو هیوایە دەنوێنێ و ڕەمەکی خەڵک خۆیانی پێ هەڵواسیوە؟ یان هێزێکی سـیـحراوی هات و لە مـردنی بێ شک ڕزگـاری کـرد؟ ئەدی بۆچی لە کـۆتایی ئەم دەقـە ڕۆمـانە سـەرسـام کـەردوویەدا پەنات داوەتە بەر دیمەنی خەونئامێز؟

- نەخێر شتەکە بەهێزێکی نادیاری سیحرییەوە ئاوێزان نییە کە لە مردنی ڕزگار بکات و تەنانەت بەو ئومێدەشەوە نییە کە ڕەمەکی خەڵک خۆیانی پێ هەڵدواسن.

هەر شتێک هەبێ ئەوەیە کە دوای دۆزینەوەی ڕاستی نەدەبوو بمرێ. ڕاستە خۆی کۆتایی هەموو شتە جوانەکانی بینی و لەگەڵ ئەو شـتـە سـامناکـانەدا ژیا کـە لە ڕۆژی پەسـلان (قـیـامـەت) دەچوو، بەڵکو هەموو هەلێکی ڕزگاربوونیشی لەدەست دا، بەڵام دەستی بەسەر بەرزیی خۆیەوە گیرکردو بە دڵسۆزیی خۆیەوە بۆ خـۆی کـە لەڕووی نەهات وەک کـەسـانی دیکە لەناو چاڵ و ئەشکەوتاندا بزر بێت. هێـزی ناوەکـیی خـۆی وای لێکرد بەرز بفـڕێ و هیـوا بەو ڕەمـەکی خـەڵکانە ببـەخـشـێت کـە ڕۆژێ لە ڕۆژان چاوەڕێی دووبارە گەڕانەوەی دەکەنەوە. لە ڕاستـیدا دیمەنی خـەونئـامـێـز تەنیـا بە کۆتاییـەوە بەندنیـیـە، بەڵکو هەمـوو بەشی دوایی دەگرێتەوە. بەڕای منیش ترۆپکی ڕۆمانەکە دەنوێنێ کە سـۆزێکی زۆرم لە نووسـینیدا بەخـشـی. تەنانەت دوای نووسـینی هەر برگەیەکی نەخۆش دەکەوتم و تام دەهاتێ.



* تۆ نووسـەرێکی مـیـتـاڕیالیـسـتـیت لەدەقی ڕۆمـان-یشـدا لەلایەکەوە پشت بە بنیاتێکی ڕیالیستی و لەلایەکی دیکەوە بە بنیـاتێکی -ڕۆحی- دەبەسـتیت، بەڵام تۆ حەز لە نووسینی دەقی داستانئامێز دەکەیت وەک لە ڕۆمـانی (دوایینی فـریشـتـەکان)دا کـردووتە کـە پێـویست بە لێکۆڵینەوەی مـیـتـۆلۆژیاو ئەو بە بەڵگەکـردنە کـۆمـەڵایەتیـیـەی شـاری کـەرکـووک-ی لێ پێکدێت و بە چنگکۆڵی کـەلەپووری مـیللی دەکا، سەرەڕای هەستی فەنتازی، فازڵ عەززاوی چۆن پێی کرا ئەم دژانە پێکبهێنێ؟

- چەمکی نووسینی میتاڕیالیـستی لەوە پتر گشتگیرترو وردترە کە لە نووسینی ئەمریکای لاتینیدا بە ڕیالیستی سیحری ناوبراوە. ئەمە ناولێنانێکی شیعرییە لە بنەڕەتدا لە سینەمای ئیـتـاڵـیـیەوە وەرگـیـراوە. مـیـتـاڕیالیـسـتـییەک کە پەیوەسـتـە بە مـێـژووی پەرەسـەندنی خـودی ئەدەب و بەرەو دوورتر لەو سەردەمانەوە دەکشێـتـەوە کە لە کۆنیـدا ڕۆدەچن و هەروەها ئەو شـەپۆلە ئەدەبیـیـە پێشـەنگانەی ناو ئەدەبی نوێش دەنوێنن. بە پێـچـەوانەی نووسـینی ڕیالیـسـتی مـیکانیکیـیـەوە چەمکی نووسینی مـیتـاڕیالیـستی، لەسـەر بناغەی تێکەڵکردنی واقیع پێکدێ بەهەموو ماکە خەیاڵییەکانییەوە کە بە ژیانی مرۆڤانەوە پەیوەسـتـە. واتە دوورتر لە ڕووکـەشی واقـیـعی دیارەوە دوورتر

دەڕوا بەرەو واقیعی گشتگیرترو نادیارتر وەک لەوەی مرۆڤ بیری لێ دەکاتەوە، هەروەکو بابلۆ پیکاسۆ دەڵێ: ئەوساکە خودی خەون بەخۆی دەبێتە بەشێک لە پێکهاتەی واقیعەکە بەخۆی، هەموو ئەدەبی مەزن، ئەوەی تا ئێستا نووسراوە لەم چەمکەوە سەرچاوەی گرتووە.

من تێکۆشاوم کە لە دەرکەوتە ئەندێشەی گشتیی خۆرهەڵاتییەکانەوە واقیع بنوێنم و گەڕەکێکی بچووکی پشتگوێ خراوی کەرکووک بگێڕمەوە بۆ مەڵبەندی هەموو جیهان، بەڵکو هەر هەموو کەون. هەرگیز خەمی من ئەبوو کە پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکەی کەرکووک ڕەنگ بدەمەوە، نە ئەوەش بوو کە چنگکۆڵی کەلەپووری میللی بکەم، بەڵکو داستانی خودی ژیان بوو لەنێو تێکەڵکردنی واقیعەوە بە خەون و پاژیش بە گشتگیریی کەونی.

* لە ڕۆمانی (شارێکی خۆڵەمێشین)دا چارەسەری بیرۆکەی قوربانی و جەللادت کردووە کە هەریەکەیان ئەوی دیبیان دەڕووخێنێ، ئایا مەبەست ئەوە بوو کە ئەم دووانەیە وا دیارن کە لە عیراقدا جێگرن. ئایا خەمی تۆ بەسەر لایەنی فیکری و ڕامیاریدا ڕژا بوو یان پریشکەکانی ئەم بابەتە باڵی بەسەر بابەتی خیانەتی ژن و مێردایەتیشدا کێشابوو کە دەورێکی تەوەرەیی لە بنیاتی دەقدا دەبینێ؟

- بابەتی قوربانی و جەللاد دوورترە لە عیراق و پەیوەستە بەهەموو مێژووی مرۆڤایەتی، هەمیشە قوربانی و جەللاد هەیە. نەک هەر لە ڕامیاریدا بەتەنیا، بەڵکو لەهەموو شتێکدا کە بەژیانی مرۆڤایەتییەوە پەیوەستە. ئەوەندەی جەللاد قوربانی دەڕووخێنێ، قوربانیش جەللادەکەی دەڕووخێنێ.

ئەمە دیالیکتیکی خودی مێژوو خۆیەتی، نەخێر مەبەستم خیانەتی هاوسەرێتی نەبوو، بەڵکو خودی باری مرۆڤایەتی بوو و بەیەکداچوونی خۆشەویستی و ڕق و هێزو بێ هێزی و ئەو بەهەڵەدا چوونە وجوودییەی کە لەناو دڵی هەموو پێوەندییەک دایە.

* جارێکیان وتت، بەرلەوەی دارشتنی ڕستەی شیعری و ڕۆمان پەسند بکەیت، چەند جارێک دووبارەی دەکەیتەوە، نهێنیی ئەم نیگەرانییە چییە کە لەکاتی نووسیندا تووشت دەبێ؟

- هەموو کارێکی نوێی شاعیر یان نووسەر ئەزموونێکی نوێیە، من هەمیشە کارەکانم وەها دەنووسمەوە وەکو بڵێی پێشتر هیچ شتێکم نەنووسیبێ، نووسینی ڕاستەقینە دژی ئەو چەندو چۆنییە نامادانەیە کە نووسەر خۆی تێیاندا دووبارە دەکاتەوە. شاعیری وەها هەن بەدرێژایی ژیانیان هەر ئەو چامەیە دەنووسنەوە. لەناو یەک شێوەدا خۆیان بەند دەکەن، هەموو جارێک دووبارە دەبێتەوەو ڕۆماننووسی ئەوتۆش هەن هەر ئەو کارە دەکەن. یەک جار خوێندنەوەی چامەیەکیان بەسە بۆ ئەوەی پێویستت بەوانی دیکە نەبێت.

لە ئەزموونی نووسینەوە فێر بووم کە هەزار ڕێگە هەیە بۆ دارشتنی ڕستەیەک، ئەوەش دەزانم کە یەک ڕستەیان تێدایە کە دەبێ نووسەر بیگاتێ. من تەنیا کار لەسەر ڕستە ناکەم و بەس، بەڵکو کار لەسەر برگەو دەقیشدا دەکەم. کە ڕستەیەکی نوێ دەنووسم دەکۆشم بۆ ئەوەی بیر لەهەموو وشەیەک بکەمەوە لەکاردا. هەندێک ڕۆماننووسی گەورەی عەرەب هەن جارجارە ژمارەی خانووەکانی پاڵەوانەکانیان یان ناویان لەبیر دەکەن یان تەنانەت ئەوە لەبیر دەکەن کە چییان لێ هات.

**و: ڕامان**

سەرچاوە: الزمان، ألف باء، العدد (٧٣٤)، السنة الثالثة، (٢٥/٩/٢٠٠٠)

# عەلۆ پاڵانی

## «لاوکبێژ و حەیرانبێژ»

پاش ئەوەی تایەر تۆفیق ئاغای تەمەن سێزدە ساڵان، لەسەر داوای دایکی، ماڵی خۆی لە ناو قەڵاتی هەولێر دەگوازێتەوە بۆ خوار قەڵات و لەوێش کۆشک و تەلارێکی جوان دروست دەکا، هەروەها دیوەخانێکی ڕازاوەش بۆ میوانان و ڕۆشنبیران و هونەرمەندانی ئەوێ ڕۆژێ ساز دەکاو هەر پاش نیشتەجێ بوونی چەند ماڵێکیش لە دەوروبەری ماڵی تایەر ئاغا، شوێنەکە بە گەڕەکی تەیراوە ناو دەردەکا.

عەلۆ پاڵانی لاوکبێژو حەیرانبێژیش کە ئێمە لێرەدا بەسەری دەکەینەوە، یەکێک بوو لەو هونەرمەندە دەنگخۆشانەی کە بەردەوام لەگەڵ تایەر ئاغا دا بووە، بەلاوکبێژو حەیرانبێژی دیوەخانی تایەر ئاغاش ناوبانگی دەرکردووە.

مامۆستا جەلال مەلا حەسەن خۆشناو، لە وتارێکیدا دەڵێ:

ناوی تەواوی **عەلۆ پاڵانی، عەلی کوڕی مەحمود کوڕی جومعەیەو** لە خێڵی پاڵانییە. **لەساڵی (١٨٨٩) لە هەولێر لە دایکبووە.** مەحموودی باوکی

لەبەر دوژمنکاری، گوندی (کولە جۆ) جێ دەهێڵێ و دێتە شاری هەولێرو لە (حەساری نەفتێ)دا نشتەجێ دەبێ و لەپاشان دەبێتە سەرکاری چەند گوندێکی عەولا ئاغا، بەلام لە ئەنجامی مەسرەتکردنی نێوان دوو سەرکاری تری عەولا ئاغا، دەکوژرێ.

پاش ئەوەی عەلۆ پالانی تەمەنی دەگاتە هەژدە سالان، سەربازی بۆ دەولەتی عوسمانی ناکاو ڕوو لە ناوچەی خۆشناوەتی دەکاو لای ئەحمەد سوری مەندیری خاوەنی گوندی (مەندیر) جێگیر دەبێ و هەر لەوێش یەکەم ژن دەخوازێ، بەلام پاش ماوەیەک ژنەکەی بە نەخۆشی خوریکە دەمرێ عەلۆ پالانیش ئەو گوندە جێ دەهێلێ و ماوەیەک ژیان لە گوندەکانی (کونە فلوسەو ئەسپیندارەو بێ لینگە و خوران و قەلاسنج و سپی گردو شەقلاوە) دەباتە سەرو ژنێکیش لە گوندی (سپی گرە) دەخوازێ. عەلۆ پالانی لەبەرئەوەی پیاوێکی دلتەڕو گۆرانیبێژێکی ناسراو بووە، حەوت ژنی هێناوەو ژنی حەوتەمی خەلکی (گەلیاوە)ی سەر بە شارۆچکەی مەسیفەو هەر لەوێ ڕۆژێشەوە نیشتەجێی گەڕەکی (تەیراوە) دەبێ و مالیان لەنزیک مەخفەری شورتەی تەیراوەی کۆن بووەو ئێستاش خانووەکەی ماوە.

هەروەها مامۆستا جەلال مەلا حەسەن



تایەر ئاغا ئیسماعیل ئاغا



عەلۆ پالانی

خۆشناو دەلێ:

تایەر ئاغا، زۆر شەیدای لاوک و حەیران و چیرۆک و بەیت و پەندی پێشینان بووە، دیوەخان و چایخانەکەی مەلبەندی هونەرمەندان بووە. شەوان هەتا بەیانی عەلۆ پالانی و عەزیز ئاغای قەوان و حەمەد مەندۆ بە گۆرانی ڕەسەنی کوردی بەجۆشیان خستووە، ئەویش یارمەتی داون و پاداشتی بەسەر دابەش کردوون، بەلام عەلۆ پالانی دۆست و یاوەری هەرە نزیکی تایەرئاغا بووەو جێی باوەڕو متمانەی تایەر ئاغا بووەو هەر بۆیە وەک سەرکارێک هەموو زەوی و زاری خۆی خستبووە ژێر دەستی و مالیشی لە نزیک مالی تایەر ئاغا بووە، هەر بۆیە وەک هونەرمەندانی ئەوساکە زۆر گۆرانی حەیران و لاوکی تۆمار نەکردووە، تەنیا چەند لاوکێک نەبێ کاک موشیری کوڕی تایەر ئاغاش لەبارەی هونەرمەند عەلۆ پالانییەوە دەلێ:

لە شەستەکان سابیری برام دەچووە سۆڤیەتی پێشوو، بۆ خوێندنی پزیشکی لە شاری تاشقەند، پێش ئەوەی بڕوا عەلۆ پالانی لە مال داناو چەند لاوکێکی پێ تۆمارکردو ئێستاش لاوکەکان لەلای من ماون.

عەلۆ پالانی کابرایەکی ڕەش ئەسمەری بەژنوبالا بەرز بووە، هەردەم پۆشتەو دلتەڕ بووە، کورتەک و شەلواری موورادخانی لەبەر کردووەو بەردەوامیش دەمانچەو خەنجەری لە قەد بووە. عەلۆ پالانی بە عەرەبی و بە تورکیش گۆرانی گوتووەو لاوکی سوارچاکی و دلداری مێژوویی و شەڕو شۆڕو ئەمەکداری گوتووە. عەلۆ پالانی دۆستایەتی لەگەل هونەرمەندان کاوێس ئاغاو حەمەد ئاغا مەندۆ و عەزیز ئاغای قەوان هەبووە، هەروەها پێوەندی لەگەل هونەرمەندانی بادینان، عەلی خەنجەرو ژەنگاری گولی خان و ئەلماس خان و ژەنگاری منجێ و مریەم خان هەبووە.

لە سالی (١٩٣٠) نوێنەرانی کۆمپانیای (بیزافۆن و ئۆدیون) دێنە هەولێر و پێوەندی بە هونەرمەندان، حەمەد ئاغای مەندۆ کاوێس ئاغاو عەزیز ئاغاو عەلۆ پالانی دەکەن و هەندێ گۆرانیان بۆ تۆمار دەکەن. ئەو لاوکانەی کە عەلۆ پالانی دەیچڕین ئەمانە بوون: (گەنج خەلیل، چەتۆ، حەمی مووسا، جەوێ گەرگەری، بۆزبەگی کەمالات، دەروێشێ عەبدی، سەعدونێ نحۆ، غەزال، بابێ عەبدولکەریم ونایف، لاوکێ مەعدەنێ، کولک وکەرۆ، مەم و زین، هەرچار کوڕی یووسف پاشا، سیامەندو خەجێ، شیرین و فەرهاد.) عەلۆ پالانی هونەرمەند لەسالی (١٩٧٧) ئەمری خوای کردووەو لە قەبرستانی شێخ مەلا ڕەشید نێژراوە.

**ئا: فیکرەت عزەت**

# ٧٧ ساڵ تەمەن ٧٧ کتێبی جۆراوجۆر

ڕۆژی (٦/ ٩/ ٢٠٠١) کاتژمێر چواری ئێوارە لە هۆڵی (گەنجینەی میللی ئێران) لە تاران، کۆڕێک بۆ ڕێزلێنان لە (نووسەرو ڕۆماننووس و وەرگێڕی کورد- دوکتۆر ئیبراهیم یوونسی) ساز کرا، ئەم کۆڕە لەلایەن (کۆمەڵەی کوردەکانی دانیشتووی تاران) پێک هێنرا بوو. کۆمەڵەی ناوبراو لە بەهاری (١٩٩٩) دامەزراوەو لە پاییزی (٢٠٠٠) بە ڕەسمییەت ناسراوەو دەستی بە چالاکی کولتووری و فەرهەنگی خۆی کردووە. سەرەتا بەڕێز دکتۆر عەبدوڵلا ئابریشەمی وتارێکی خوێندەوە سەبارەت بە کۆمەڵە و چالاکییەکانی کۆمەڵەکە. دوای ئەویش مامۆستا محەمەد ڕەئووف تەوەکولی وتارێکی پێشکەش کرد سەبارەت بە ژیان و چالاکییە فەرهەنگی و ئەدەبییەکانی دکتۆر یوونسی. دواتر ڕۆماننووسی کورد (عەلی ئەشرەف دەروێشیان) بە وتارێکی بە پێز کۆڕەکەی شکۆدار کرد. دوای ئەویش نووسەری ڕۆمانی (کلیدر) مەحموود دەوڵەت ئابادی لە وتارێکدا گوتی: {کاتێ کە باسی کورد دەکرێ مرۆڤ خۆی لەخۆیدا دلێری و ئازایەتی و ڕاستگۆیی و سەربەرزی دێتەوە بیر، من خۆم یەکێ لەو بەڵگانەم لە نووسینێکدا باس کردووە، هەروەک کاک ڕەئووف تەوەکولی باسی کرد من کوردم، لە ناخەوەش ئێرانیم و عاشقی کوردەکانیشم، هەروەها عاشقی بەلوچ و خووزییەکانیشم، هەروەها گوتی ئەو شتەی کە سی ساڵ پێش ئێستا، د. یوونسی هەستی پێکردووەو وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی، ئێمە مانان لەو چەند ساڵەی دواییدا بە شێوەیەکی تر باسی لێوە دەکەین، لە کتێبێکدا باسی ئەدەبیات دەکات لە دوای ڕێنیسانسەوە، لە ڕاستیدا ئەم کتێبە بانگهێشتێکە بۆ ئێمە بۆ گەیشتن بە ڕۆژگاری نوێ و پێچ و پەناکانی، لە کۆتایی ئەم کتێبەدا چەند سەردەمێک دەژمێرێ، وەک سەردەمی ئەلیزابێت و سەردەمی سەدەی هەژدەیەم و ڕێنیسانس و تا دەگاتە سەردەمی ئێمە کە ئێستا تێیدا دەژین، ئەو نووسینەی کە دکتۆر یوونسی سی ساڵ بەرلە ئێستا وەریگێڕاوەتە سەر فارسی، ئێستا ئێمە لەژێر ناوی مۆدێرنیتەو سوننەت باسی لێوە دەکەین، سەیر کەن نووسەرێکی ڕۆژئاوایی کەی نووسیویەتی و دکتۆر یوونسیش سی ساڵ بەرلە ئێستا وەریگێڕاوە، مەبەستمە بڵێم یوونسی سی ساڵ بەرلە ئێستا هەستی بەنیازی کۆمەڵگا کردووە لەم بارەیەوە}. دوابەدوای ئەوان بەڕێز محەمەدی سوڵتانیش وتارێکی لەبارەی ڕاستگۆیی و دڵسۆزیی کورد خوێندەوە. هەروەها شیعرێکی بەڕێز عەلی شافعی لەلایەن کۆڕگێڕ کاک ئەخەوان خوێندرایەوە کە شیعری ناوبراو لە ستایشی د. یوونسیدا بوو. ئەنجا ڤیۆلۆن (کەمانچە)ژەنی کورد حوسێن یووسف زەمانی بە ژەنینی ڤیۆلۆنەکەی کۆڕەکەی گەرمتر کرد. پاشانیش خودی بەڕێز دکتۆر ئیبراهیم یوونسی وتەیەکی پێشکەشی ئامادەبووان کردو تێیدا گوتی: {وەک دەزانن من هەشت ساڵ لە زیندان بووم، ئێمە چوارسەد کەس بووین پێکەوە، ئەوانەی لەگەڵ من بوون زۆربەیان خەڵکی ڕۆشنبیر بوون، دەتوانم بڵێم لەو چوارسەد کەسە زۆربەیان بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان هەبوو، ئیتر ئەوانە لە زیندان کاریان خوێندنەوە بوو. هەندێ لەوانە لە ڕێگای نامەنووسین لە زانکۆکانی جیهان دەرسیان دەخوێند، بەڵام زۆربەیان دەرسی هونەروپیشەییان دەخوێند. منیش هەرچەند تەماشای خۆمم دەکرد، بینیم باری فیزیکی من ڕێگام پێ نادا کە ئەو بەشە پیشەییانە بخوێنم، بۆ نموونە ئەگەر ئەندازیاریم بخوێندبایە، باری فیزیکیم ڕێی پێ نەدەدام کە بەڕێوەبەری کارگەیەک بم. هەر بۆ ئەمەش ڕووم کردە فێر بوونی زمان، من زمانی فەرەنسیم لە قوتابخانە خوێندبوو، چونکە ئەو کاتە زمانی فەرەنسی پتر دەخوێندرا لە قوتابخانەکانی ئێران. زمانی ئینگلیزیم لە (ئەلف و بێ)وە دەست پێکرد لە زیندان. چەند کەسێ لە هاو زیندانەکانم پێشتر چووبوون بۆ ئەمریکاو ئەوروپا و زمانەکەیان بە چاکی دەزانی و ئێمەیان فێر دەکرد. بە هەوڵ و کۆششی خۆم توانیم ئنیگلیزی فێربیم بە شێوەیەک ڕۆژانە (١٦) سەعات خەریک دەبووم، چونکە بەهۆی لە دەست دانی قاچی چەپم لە (کاری بەزۆر)ی زیندانیش بەخشرا بووم. هەر هاو زیندانەکانم



لە ڕاستەوە بۆ چەپ:
١- ئەحمەد مەحموود ٢- ئیبراهیم یوونسی ٣- مەحموود دەوڵەت ئابادی

خواردنیان دروست دەکرد و تەنانەت پێخەفەکەشیان بۆ دادەخستم. دواتر دەستم کردە ڕۆمان خوێندنەوە، هەر لەوێدا بوو خوالێخۆشبوو (سیاوش کەسرایی) هانی دام کە ڕۆمانی (ئارەزووە مەزنەکان) وەربگێڕمە سەر فارسی، هەر خۆشی دایە دەزگایەکی بڵاوکردنەوە و دواتر بەڕێز (دکتۆر سیروس پەرهام) سەرپەرشتی چاپی ئەو ڕۆمانەی گرتە ئەستۆ، ڕۆمانی ناوبراو بڵاوبووەوە و پێشوازییەکی زۆر گەرمی لێکرا، ساڵی دوای ئەوە، واتە ساڵی (١٩٥٩) بە باشترین وەرگێڕانی ساڵ هەڵبژێررا. دوای ئەویش چەند کتێبێکی تریشم هەر لە زیندان وەرگێڕا (سپارتاکۆس و {خانە قانون زدە}ی چارلز دیکنز کە هەزار لاپەڕە بوو و چەندین کتێبی تریش).. تا بەهاری (١٩٦٢) من لە زیندان بووم و پاشانیش دوای سێ ساڵ بێکاری ساڵێک وەرگێڕی ئینگلیزی بووم لەگەڵ خوالێخۆشبوو محەمەدی قازی، دوای ئەوە تا ساڵی (١٩٧٨) نزیکەی (٣٠) دانە کتێبم وەرگێڕا، هەر لە ئەدەبیات بگرە تا مێژوو و ڕەخنەی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی، بە تایبەتیش نووسینەکانی سەدەی هەژدەیەم. پاشانیش بیرم لەوە کردەوە کە من بۆ ژینگەی خۆم یا بڵێم زادگای خۆم دەتوانم چی بکەم و ئەرکم چییە؟ بەپێی ئەزموونم لە تاران ئەوەم بۆ دەرکەوتبوو کە فارس کورد ناناسێ و کوردیش فارس ناناسێ، تەنانەت لوڕیش ناناسێ کورد و لوڕیش، فارس ناناسن هەموویان بەلووچ ناناسن، من خۆم پتر بیرم لە کوردستان دەکردەوە، هەستم کرد پێویستە من کورد بە فارس بناسێنم و بۆ ئەم مەبەستەش ناچار هانام بردە بەر ڕۆمان، چونکە من ناتوانم مێژوو بنووسمەوە، مێژوو نووسین پێویستی بە بەدوا داگەڕان هەیە بۆ پەیداکردنی بەڵگەو شتی تر، ناشتوانم لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەم، چونکە لێکۆڵینەوەش کاری تاکەکەس نییە و چەند کەسێکی پێویستە و تەمەنێکیشی گەرەکە، کەسانێک هەن بەرهەمی سی ساڵیان تەنیا کتێبێکی سی لاپەڕەییە هەروەها دەزگایەکی پشتیوانیشی دەوێ، بۆیە ناچارم ڕۆمان بنووسم و ئەو نیازە ئیحساسییەم بە ڕۆمان دابمرکێنمەوە، چونکە فۆڕمی ڕۆمان جۆرێکە دەتوانێ هەم مێژوو بێت و هەم لێکۆڵینەوە بێت و هەم کۆمەڵناسیش، واتە ئەو پاڵەوانانەی کە ڕۆماننووس هەڵیاندەبژێرێ نوێنەری کۆمەڵێکن و گرفتێکیش باس دەکات کە لە سەردەمێکدا ڕووی داوە، من ڕۆمانم هەڵبژارد بۆ ناساندنی گەلی کورد پێش هەموو کەسێک بە خۆیان، چونکە نەتەوەی کورد خۆشی خۆی ناناسێ، پاشان بە نەتەوەکانی تر} هەروەها ئاماژەی بە خۆشحاڵیی خۆی کرد بە ئامادەبوونی لەم کۆڕەدا و لە وتووێژێکی فرە کورتیشدا فەرمووی زۆر خۆشحاڵم بەوەی کە خۆم لەناو ئەو هەموو کوردەدا دەبینمەوە و لەو باوەڕەشدا نەبووم بەم شێوە ڕێکوپێکە بەڕێوەبچێ، بەڵام زۆر باش و ڕێکوپێک بوو و سوپاسی هەموو لایەک دەکەم کە زەحمەتیان کێشاوە و هاتوون بەشداری ئەم کۆڕەیان کردووە. هەروەها بەڕێوەبەری دەزگای بڵاوکردنەوەی (پانیز) لە وتووێژێکی کورتدا ئامـاژەی بەوە کرد کە کتێبەکانی د. یوونسی یەکێکن لە پڕفرۆشترین کتێبەکانی ئێران بەگشتی.

هەروەها لە کۆتایی ئەو مەراسیمەدا (تابلۆی ڕێز لێنان) لەلایەن بەڕێز دکتۆر ئەردەڵان خوێندرایەوە و لەلایەن بەڕێز (سادق وەزیری) بە نوێنەرایەتیی کۆمەڵە پێشکەشی د. یوونسی کرا. شایانی باسە دکتۆر یوونسی لە ماوەی (٧٧) ساڵی تەمەنیدا تا ئێستا توانیویەتی (٧٦) کتێب بەچاپ بگەیەنێت لەوانە پێنج ڕۆمان و ئەوانی تریش وەرگێڕانن لە زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی بۆ زمانی فارسی. هارەوەها کتێبی حەوتاو حەوتەمینی لە مانگی داهاتوودا بڵاودەبێتەوە، ئەو کتێبەش کەناوی (مێژووی هاوچەرخی کوردستان)ە، شرۆڤەیەکی مێژووی کوردستانی بەخۆوە گرتووە.

**دڵشاد خۆشناو**
**پەیامنێری تاران**

## شانۆی کوردی لە ئەستەنبۆڵ

# تیپی شانۆی ژیانی نوێ
# شانۆگەریی کۆمارا دینان

کۆمیدیای ڕەش وامان لێدەکات پێکەنین و فرمێسکی ژان بە چاوەکانماندا بێتە خوارێ. پێکەنین لەم هونەرەدا تامێکی جیاوازی هەیە، گەورەیی ئەم هونەرە لەوەدایە، ئێمە لەناو خۆشی هەست بە ناخۆشی دەکەین. ئێمە چێژ لە هەڵوێستی کارەکتەری کۆمیدی وەردەگرین، بەڵام دڵیشمان بۆی دەسووتێ و هاوسۆزی دەبین. کۆمیدیا ئەگەر هەر بۆ خۆشی بێت بەهایەکی هونەریی هەیە، بەڵام ئەگەر ئەو کۆمیدیایە بۆ گوزارشت کردنی ئێش و ئازارو مەینەتییەکانی مرۆڤ بێت، بەهایەکی هونەری و فەلسەفی دەبێت.

تیپی شانۆی ژیانی نوێ کە لە ئەستەنبۆڵ کاری هونەری کوردی دەکات، پێشتر لە (هەفتەنامەی گوڵان) بەدواداچوونێکمان لەسەر شانۆگەریی «تا» نووسیی و بەکورتی



باسی ئەو تیپەمان کرد. شانۆگەریی «کۆمارا دینان» بەرهەمێکی دیکەی ئەو تیپەیەو جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ بەرهەمەکەی پێشوو «تا» هەیە، ڕاستە ئەکتەرەکان هەمان ئەکتەرن، تیپەکە هەمان تیپە، بەڵام جیاوازییەکی زۆر لەنێوان ئەو دوو بەرهەمەدا هەیە. شانۆگەرییەکە لە چیرۆکی چیرۆکنووس حەلیم یووسف وەرگیراوەو ئەردال سیڤیز دەری هێناوەو بەشداری لە نواندن کردووەو شازدە ئەکتەر بەشداری کردووە، شانۆگەرییەکە ژیانی دواکەوتوویی و کۆمەڵگای دوێنێ و ئەمڕۆی کۆمەڵگای کوردەواری کوردستانی باکوور دەخاتە ڕوو. لە زۆر شت لە تەواوی کۆمەڵگای کوردەواری دەچێ، تەنیا کڕینی ڕۆژنامە نەبێت کە ئافرەتان بەهەمان شێوەی پیاوەکان بەشداری کڕینی دەکەن. لەم ڕووەوە ئەمڕۆی کوردستان هەمووی بەم شێوەیە نییە. شانۆکە لە ڕووی هونەرییەوە گوزارشتی لە دوێنێ و ئەمڕۆ دەکرد، هەندێ دیمەن سادەو ساکارو واقیعی بوون، هەندێ دیمەن شێوەی هونەری دەربڕینی بوو. لەو شانۆگەرییەدا کەسێک عاقڵ نییە، هەموویان شێتن. کەسایەتییەکان قوربانی داب و نەریتی کۆن و نەهامەتییەکانی ئەمڕۆن. سەرەتا، شێوەی هونەری نوێی شانۆ، گوزارشت لە ئازارەکانی مرۆڤ دەکا، ئافرەتێک عەبایەکی گەورەی لەبەرە، هەموو شانۆکەی داپۆشیوە، لە ژێرەوەی عەبایە پیسەکە جووڵانەوەی مرۆڤ هەیە. ڕووناکی تابلۆیەکی تەعبیری نمایش دەکات.

پاشان، چوار دیمەن لەیەک کێشەدا بەدوای یەک دادێن، ئەو دیمەنانە گوزارشت بوون و زۆر بەخێرایی بەدوای یەک دادەهاتن. لە دیمەنی یەکەمدا، خەڵک، پیاو، ئافرەت لە شوێنێکی گشتی جەنجاڵ دان، ڕۆژنامە فرۆشێکی گەڕۆک دێت و هاوار دەکات: ڕۆژنامە، هەواڵی نوێ. بەخێرایی هەموو ڕۆژنامەکان دەفرۆشرێن. خەڵکەکە دەپرژێنە سەر خوێندنەوەی ڕۆژنامەکە.

لە دیمەنی دووەمدا، خەڵکەکە هەندێک سارد بوونەتەوە کە ڕۆژنامەفرۆشە گەڕۆکەکە دێت، بەبێ ئومێدی ڕۆژنامەکە دەکڕن، دەیخوێننەوە.

لە دیمەنی سێیەمدا، ژمارەی خەڵکەکە زۆر کەم بۆتەوە، ڕۆژنامەفرۆشەکە دێت و هاوار دەکات: ڕۆژنامە، هەواڵی نوێ. کەس بایەخی پێ نادات، کەسیش داوای ڕۆژنامەکە ناکات، ڕۆژنامەفرۆشەکە هەندێکیان ناچار دەکات ڕۆژنامەکە بکڕن، ئەوان بە نابەدڵی ڕۆژنامەکە دەخوێننەوە.

لە دیمەن چوارەمدا، کەس لە شوێنەکە نەماوە، ڕۆژنامە لەسەر زەوی کەوتووە. ڕۆژنامەفرۆشەکە دێت و هاوار دەکات، بەڵام کەس لەوێ نییە، شێت دەبێت، ڕۆژنامەیەک دەدڕێنێ و لەسەری خۆی دەکات. ڕۆژنامەیەکی دیکە دەدڕێنێ و بەقاچی وەدەکات. هەموو ڕۆژنامەکان فڕێ دەدات و بەتەواوی شێت دەبێت. لەدیمەنی دوای ئەوە، گەنجێکی شێت لە ماڵێکدا، شتەکان تێک دەدا، باوک و دایکی، ئازارو نارەزایی دەردەبڕن، پاشان شێتەکە جانتایەک دەدۆزێتەوە، کاغەزێکی تێدایە، هێواش هێواش کاغەزەکە دەدڕێنێ. زۆر چێژ لە دڕاندنی کاغەزەکە وەردەگرێ، دایک و باوکی کە دەزانن ئەوە تاپۆی خانووەکە بوو، کوڕە شێتەکەیان دڕاندی، هاروهاج دەبن و لە کوڕەکەیان دەدەن، پاشان کوڕەکەیان دەبەنە لای شێخێک، داوای لێدەکەن کوڕەکەیان چاک بکاتەوە، شێخەکە پێیان دەڵێ، جنێکی گەورە چۆتە جەستەی، باوکەکە سێ سەد وەرەقە دەداتە شێخەکە بۆ ئەوەی کوڕەکەیان چاک بکاتەوە، بەڵام شێخەکە ڕازی نابیت و دەڵێت، ئەو جنە بەسێ سەد وەرەقە دەرنایێ، بەڵکو بە پێنج سەد وەرەقە دەردێ. باوکەکە تکا لە شێخەکە دەکات، چونکە هەژارە. شێخەکە هەوڵ دەدات و دەڵێت «دەرکەڤە جنۆ دەرکەڤە».

پاشان باوک و دایکەکە کوڕەکەیان دەبەنەوە. لە کۆتاییدا ئەوانیش شێت دەبن. لە دیمەنێکی دیکەدا، هونەرمەندێک هەوڵ دەدات نیگارەکەی تەواو بکات، بەڵام هەرگیز بۆی تەواو نابێت و خۆی وا نیشان دەدات، نیگاری تەجرید دەکات، پاشان ئەویش شێت دەبێت. فرۆشیارێکی گەڕۆک عەقڵی سووکە، نامە پیرۆزەکان دەفرۆشێ و نامە بۆ خۆشەویستەکەی دەنووسێ، ئافرەتەکە عەقڵی سووکە چەندان نامەی دڵداری وەرگرتووە، ئەوانیش شێت دەبن و بە یەکجاری دەچنە شێتخانە. دیمەنی کۆتایی درێژترین دیمەنەو لە چەندان وێنەی شانۆیی پێک دێت. هەموو شێتەکان لەو شێتخانەدا کۆبوونەتەوەو بەردەوام لاسایی خۆیان دەکەنەوەو هەراوهۆریا دەکەن. لە کۆتاییدا شێتەکان بڕیاردەدەن کۆماری شێتان دروست بکەن، بۆ ئەو کۆمارەش چەند وەزیرێک دادەمەزرێنن، هەر یەک لەو شێتانە دەبێتە وەزیری شتێک. پاشان سەرۆک کۆمار دادەنێن و هاوار دەکەن بژی کۆمارا دینان، بژی دینان. دیمەنی شێتخانەکە زۆر درێژ بوو، بەرادەیەک بینەر وەڕس دەکەن، هەرچەندە ئەکتەرەکان بە توانابن، بەڵام کە شت دووبارە بووەوە بێزاری دروست دەکات، بەتایبەتی لەو وێنانەی کە ڕووناکی بە خێرایی دەگۆڕدرا، تاریک دەبوو، پاشان ڕووناک دەبوو.

بەڕای من ئەو تەکنیکە زۆر زیاد بوو. دەرهێنەر دەیویست بەهۆی شێتەکانەوە چی بڵێت؟ ئەگەر مەبەستی دەرهێنەر هەڵوێستەکان بووبێت، مانای وایە هیچی نەگوتووە، ئەگەر شێتەکان بۆ مۆڵەتی پەڕینەوەی شانۆگەرییەکە بێت، ڕێی تێدەچێت، بەڵام ئەگەر مەبەست کۆمارەکە بێت ئەوە زۆر بە خراپ لەسەر دەرهێنەر دەکەوێتەوە. هەر چەندە تێگەیشتن سەد دەر سەد لەو شانۆگەرییە زۆر ئاستەنگە، چونکە شێوەی قسەکردنەکان زۆر تایبەت بوو بە کوردستانی تورکیا، دیارە ئەوانیش ڕەچاوی بینەری خۆیان کردووە. زۆریش زەحمەتە بتواندرێ لە کۆمیدیای ڕەش گەشبینی بنیات بنرێ، هەر بۆیەش شانۆگەرییەکە لە شێتخانە کۆتایی هات و کۆمارەکەش لەناو شێتان دروست بوو.

**موحسین محەمەد**

# له مه‌غریبێکی پڕ له جوانیدا یادی مۆسیقای جیهانی له سلێمانی سازکرا!!

- مـۆسـیـقـا هونه‌رێکه، زیاد له هونه‌ره‌کانی تر له‌گه‌ڵ چێـژو هه‌ستی مرۆڤدا هاوه‌ڵه، به‌مه‌ش هۆکارێکه بۆ کارلێکردن له هه‌سته شاراوه‌کانی ناخی مرۆڤ، که‌م که‌س هه‌یه به مۆسیقا نه‌شئه نه‌یگرێت، مه‌گه‌ر ئه‌و که‌سه قوفڵی له هه‌سته‌کانی دابێت!!

هه‌ر بۆیه به‌رده‌وام ده‌روونناسان و زانایانی بواری سایکۆلۆژی، مۆسیقا به تاکه هۆکارێک داده‌نێن بۆ چاره‌سه‌رکردنی زۆر گرێی ده‌روونی. له‌م سه‌روبه‌نده‌دا کوردیش وه‌ک هه‌ر میلله‌تێکی تری سه‌ر ڕووی زه‌وی، سالانێکه ئاشنایه‌تی له‌گه‌ڵ ئه‌م هونه‌ره‌دا هه‌یه، به‌مه‌ش چه‌ندان هونه‌رمه‌ندو به‌هره‌مه‌ندی له‌م بواره‌دا به‌رهه‌م هێناوه.

کردنه‌وه‌ی به‌شی مۆسیقا له هه‌ر سێ په‌یمانگه‌ی هونه‌ره‌جوانه‌کانی (دهۆک-هه‌ولێر-سلێمانی) هۆکارێکی زۆر ئه‌کتیڤ بوون بۆ بره‌ودانی زیاتر به‌م هونه‌ره، به‌مه‌ش ده‌زگاکانی ڕاگه‌یاندنی کوردی زیاد له‌هه‌موو ده‌زگاکانی تر سوودمه‌ند بوون له پسپۆرانی مۆسیقا، هه‌ر بۆیه کوردیش خاوه‌نی تایبه‌تمه‌ندێتی و ستایلی تایبه‌تی خۆیه‌تی له گۆرانی و مۆسیقاو مه‌قام و به‌یت و ئه‌ڵلاوه‌یسی و چه‌ندان جۆری تری ئه‌م هونه‌ره، به‌ڵام ئه‌وه‌ی لێره‌دا ده‌مانه‌وێت له‌سه‌ری ڕابوه‌ستین بوونی شکلێک له مۆسیقای جیهانی و ئه‌کادیمییه، به تایبه‌تی ئه‌و جۆره مۆسیقایه‌ی که وه‌ک کولتوورێکی ده‌وڵه‌مه‌ند بۆ مرۆڤایه‌تی ماوه‌ته‌وه، موڵکی هیچ میلله‌تێک نییه‌و هه‌موو میلله‌تان وه‌ک یه‌ک پشکیان تێدا هه‌یه.

کوردیش یه‌کێکه له‌و میلله‌تانه‌ی که چه‌ندین مۆسیقاری به‌هره‌مه‌ندی هه‌یه، به تایبه‌تی ئه‌وانه‌ی که خوێندنی ئه‌کادیمیای هونه‌ریان ته‌واو کردووه.

له‌م چوارچێوه‌یه‌دا مه‌غریبی (١/١٠/٢٠٠١) له هۆڵی ڕۆشنبیری سلێمانی، کۆمه‌ڵێک هونه‌رمه‌ندی به‌هره‌مه‌ند که ده‌رچووی ئه‌کادیمیای هونه‌ره‌جوانه‌کانی به‌غداو په‌یمانگه‌ی هونه‌ره‌جوانه‌کانی سلێمانی بوون له گرووپێکی ئه‌کادیمیادا مه‌غریبێکیان تایبه‌ت کرد به مۆسیقای جیهانی، به ڕاستی مه‌غریبه‌که له مه‌غریبی تر نه‌ده‌چوو، به ته‌واوه‌تی ڕه‌نگی ڕۆمانسیه‌تی پاییزی گرتبوو، هونه‌رمه‌نده‌کانیش پێک هاتبوون له:

عادل محه‌مه‌د که‌ریم/که‌مان، چالاک سدیق/که‌مان، لوقمان سابیر/فلووت، ئارێز عومه‌ر/که‌مان، هه‌ردی مه‌جید/ڤیولا، شیلان عومه‌ر/چه‌لۆ، سدیق عوسمان/کۆنته‌ر باص، نه‌ورۆز حه‌سه‌ن ته‌نیا/پیانۆ.

ئه‌و به‌رهه‌مانه‌ی که پێشکه‌شیان کرد بریتی بوون له:

١-ئه‌رکانگیلۆ کۆریللی (١٦٥٣-١٧١٣)، مۆسیقا بۆ هارپسیکۆرد- چه‌لۆ، که‌مان.

٢- یۆهان سباستیان باخ (١٦٨٥-١٧٥٠)، چه‌ند سه‌مایه‌کی به‌دوای یه‌کدا هاتوو بۆ فلووت و ژێداره‌کان و هارپسیکۆرد.

٣- لۆدڤیک ڤان بتهۆڤن (١٧٧٠-١٨٢٨)، ڕۆندۆ ڤیولاو پیانۆ.

٤-ئه‌نتۆنین دڤۆرژاک (١٨٤١-١٩٠٤)، تریۆ بۆ که‌مان -چه‌لۆ.

٥- ئاریایه‌کی دێهاتی (دوگیتار)، ڕێکخستنی کرۆسپی مۆلینهاویر بۆ که‌مان و پیانۆ.

٦- ئیزاک ئه‌لبانیز (١٨٦٠-١٩٩٠)، ئوستریاس بۆ پیانۆ سۆلۆ، ڕێکخستنی (دابه‌شکردنی نه‌ورۆز حه‌سه‌ن ته‌نیا)، بۆ ژێداره‌کان و پیانۆ.

ئیدی بینه‌ران و ئاماده‌بووان له‌م ئێواره مۆسیقییه‌دا هه‌ستیان به‌وه ده‌کرد له ڤییه‌نا دانیشتوون، نه‌ک کوردستان، ده‌بێ ئه‌وه‌شمان له‌بیر بێت، مۆسیقا ناسنامه‌یه‌کی جیهانی هه‌یه، واته ئه‌م مه‌قتوعانه ئه‌گه‌ر له پاریس یان له

وه‌زاره‌تی ڕۆشنبیری
به‌ڕێوه‌به‌رێتی گشتی ڕۆشنبیری و هونه‌ر
کۆنسێرتی یادی
ساڵڕۆژی مۆسیقای جیهانی
1.10.1975 - 1.10.2001
ساز ده‌کات
له‌هۆڵی ڕۆشنبیری سلێمانی
به‌رواری ٢٠٠١/١٠/١ کات ٥ ی ئێواره

ڤییەنا یان لە نیویۆرک پێشکەش بکرابان، وەک یەک دەبوو، مەگەر توانایی و لێهاتوویی هونەرمەند بیگۆڕیبایە.

لەوەوە بۆمان دەرکەوت، مۆسیقا ناسنامەیەکی جیهانی هەیەو هەموو میللەتێک بە پێی هوشیاری خۆی دەتوانێت لێی سوودمەند بێت، ئەم گرووپە ئەکادیمیایەش هێندەی تر دڵخۆشیان کردین و ئومێدی ئەوەیان داینێ ئیدی نیشتمان چۆڵ نەبووەو گەر پشتیوانی بکرێت، ئەوا کۆمەڵێک دەنگ ماوە کە ئایندە و ئێستا پەمەیی تر بکەن. دەکرێت لەسەر وەتەرو لە ڕونیاو چاوەکانی ئەم هونەرمەندە لاوانەدا چەندان خەونی پیرۆز و جوان ببینین کە دەسگیرۆکردنیان بە پلەی یەک لای دەسەڵاتدارانە، ئەوسا لای ڕێکخراوە هونەرییەکان، چونکە ئیدی کاتی ئەوە هاتووە کوردیش بەهۆی کولتوورو ڕۆشنبیرییەوە لە دەرگای مێژووی هاوچەرخی ڕۆژئاوا بدات، نەک لە ڕێگەی توندوتیژی و چەک و درندەییەوە، ئەم ئێوارەیە هەوڵێکی ناوازەی شارستانییەت و مەدەنییەتی کورد دەردەخات، هەر لە دەلیلی ئەم

کۆنسێرتەدا ئەم کۆمەڵە هونەرمەندە پەیڤێکیان نووسیبوو، لەم پەیڤەدا هاتووە: (یادی ساڵرۆژی مۆسیقای جیهانی یەکێکە لەو بۆنە گرنگانەی کە ئێوەندی مۆسیقا لەجیهاندا دەیگێڕێت، لە ڕاستیدا دامەزراوەی نێونەتەوەیی مۆسیقا لە ساڵی (١٩٧٥) ئەم ڕۆژەی (١/١٠)ی هەموو ساڵێکی کردە ڕۆژی جیهانی مۆسیقا.

ئەم دامەزراوە مۆسیقییە هەوڵ دەدات لە سەرتاسەری جیهاندا زۆرترین ئەندامی لێ کۆببێتەوە، ئەرکەکانی ئەم دامەزراوەیە زۆرن، دەکرێت گرنگترینیان ئەوە بێت: هەوڵ دەدات بڵاوکراوە مۆسیقییەکان و تەنانەت مۆسیقارەکانیش لەنێو وڵاتەکاندا ئاڵوگۆڕیان پێ بکات.

دوای دەست بەکاربوونی ئەم کۆمەڵەیە لە ساڵی (١٩٤٩)ەوە چەندین کۆمەڵەی تێدا بووەتە ئەندام، لەوانە کۆمەڵەی نێونەتەوەیی دانەرە مۆسیقییەکان، کۆمەڵەی نێونەتەوەیی مۆسیقای نوێ، پەیمانگەی نێونەتەوەیی خوێندنی مۆسیقای بەراودکاری.

ئێمەش وەک کۆمەڵێک لە هونەرمەندانی ئەم شارە، حەزمان کرد لەم ئێوارەیەدا ئەم یادە بگێڕینەوە، بە هیوایین مۆسیقا بتوانێت ساتێک بمانگەڕێنێتەوە

ناوخۆمان و ڕۆحمان شادومان بکات، چونکە زۆرجار شەڕەنگێزی مرۆڤەکان لە هەموو شتەکان بێ بەشمان دەکات و کاری هونەریش ئەوەیە دووبارە ئەو جوانییەمان لە پێناسەو ناوو دەرکەوتەی تردا پێ بناسێتەوە).

ئەوەی لەدوا سەرنجمدا دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە، ئەو هێمنی و لەسەر خۆییە کە باڵی کێشابوو بەسەر بینەرانی هۆڵەکەدا، کە بەتەنیا دوای تەواو بوونی پارچەیەک مۆسیقا خەڵکی بە چەپڵە دەهاتنەوە هۆشی خۆیان، دەکرێت ئەم حاڵەتەش بە هوشیاری و دانایی بینەرو گوێگری مۆسیقا ناوبەرین کە هونەرمەندەکانمان دەتوانن کار لەسەر ئەم حاڵەتە بکەن بۆ پەروەردەکردنی چێژو زەوقی بینەرانی کوردی، چونکە ساڵانێکە بەهۆی چەندین هۆکارەوە ئەم چێژە دەشێوێندرێت.

**هەرێم قادر**
**(سلێمانی)**

---

## لە فەرهەنگی ئامێرە مۆسیقییەکانەوە:

# کۆمەڵەی ئامێرە ژێدارەکان

# ئامێری ڤیۆلا

لە سەرەتادا دەڵێین بە زمانی ئەڵمانی پێ دەوترێت (Die Brats-che) و جگە لە گشت ئەو نووسینانەی کە لە بارەی ئەو ئامێرە نووسراوەتەوە، دەتواندرێت هەموو ئەو سەرچاوە زانستی و هونەرییانە کۆبکرێتەوە کە

پێوەندییان بەو ئامێرەوە هەیە، ئەو ئامێرەی کە توانیویەتی توانای هونەری خۆی لە ئۆرکێسترای سەمفۆنی و مۆسیقای ساڵۆن جێگیربکات. دکتۆر ڤالەنتین دانەری کتێبی (Handbuch der mu-sik Instrmenten Kunde) ڕوونی کردۆتەوە و

دەڵێت: ئامێری ڤیۆلا لە سەدەی هەژدەیەم سەری هەڵداوە، لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکەین کە بە (Braccio) ناوزەد کرابوو، پێوەندییەکی نزیکی بە ئامێری فیدۆلای لێ بوو لە ئامێری لیرادابراسیۆ. ئەو ڕوونکردنەوەیە وەکو مێژوویەک لە ئەدەبی مۆسیقا

ئامازەی پێکرا، لەبەر ئەوەی ناوی لە سەرەتاوە پەیوەیست بوو بە ئامێری ڤیۆلادا گامباوە، ئەوە بێگومان پێوەندییەکی بنەڕەتی بەهێزی بە خێزانی ئەو ئامێرە مۆسیقییە ژێدارانەوە هەیە کە لەسەدەی شازدەیەمدا

سەریان هەڵدابوو، لە ساڵی (١٧٠٠) ئەم ئامێرە پێشکەوتنێکی هونەری بەخۆوە بینیوەو ناوی بە ئامێری ڤیۆلاوە بەستراوەتەوە و بەخشین و نیشانەی هونەری بەتوانا هونەرییەکانی لێ بەدەرکەوت، پاش ئەوەی هونەرمەند یوهان کریستیان هۆفمان لە ساڵی (١٧٢٤) بە قەبارەیەکی گەورەو پێنج ژێیی (دۆ، صۆل، ڕێ، لا، می) دروستی کرد، لەو سەردەمەدا ئامێری ڤیۆلا بە خاوەن دەنگێکی پڕو هەڵقوڵاوە لە چینی تینۆر وەسف دەکرا، ناوی (Viola Pomposa)ی لێ نرا، درێژییەکەی دەگەیشتە نزیکەی (٧٥سم). هونەرمەند باخ ئەو جۆرە ئامێرەی لە دانراوە مۆسیقییەکانی بەکارهێناوە. بەو شێوەیە ئەو ئامێرە مۆسیقییە بەرە بەرە چاکسازی بەسەر داهاتووە، وادادەنرێت ئەو چاکسازییانە لە سەدەی نۆزدەیەم ڕووی دابێت و قەبارەکە بچووک بۆتەوە بۆ (٣٩ سم)، بەبێ ملەکەی و شێوەو دەنگی وەکو خۆی ماوەتەوە، بەڵام لە چینی دەنگی ئالتۆ بە چوار ژێ (دۆ، صۆل، ڕێ، لا)، هەروەها ئاوازەکان لەسەر چینی کۆنتەر ئالتۆ دەچرێ و ئەو نەغمە گرانە دەژەنێت کە گوزارشت لە سۆزو عاتیفە دەکەن. شێوەو ڕوخساری ئامێری ڤیۆلا بە شێوەو ڕوخساری ئامێری کەمان دەچێت، بەڵام قەبارەکەی گەورەترەو پلەی دەنگی لە چینە بەرزەکان لە دەنگی کەمان کەمترە، بەکلیلی (دۆ- صۆل) مۆسیقای بۆ دەنووسرێتەوە و ژمارەی ئەمڕۆ لە ئۆرکێسترای سەمفۆنی دەگات بە دوازدە ئامێر. لە ئەدەبیاتی مۆسیقا چەندین دانراوەی مۆسیقی بە توانا دەست دەکەوێت کە بۆ ئەم ئامێرە نووسراوەتەوە وەکو باخ- لە سویتی سۆلۆ لە مەقامی ڕێی مێجەر و کانتاتە و یوهانس باسیون، هەروەها لێکۆڵەرانی مۆسیقا ئاماژەیان بۆ توانای هونەرمەند کارل شتامیتز کردووە و بە چاکترین ژەن و دانەری ئامێری ڤیۆلا دایان ناوەو لە سەدەی نۆزدەمیشدا هونەرمەند مایربێر و هندمیت، چەندین دانراوەی مۆسیقییان بۆ ئەو ئامێرە نووسیوەتەوە، لەوانەش سۆناتە لە ساڵی (١٩٢٩) و کۆنشۆرتۆی ڤیۆلا لە ساڵی (١٩٣٠)-ی هونەرمەند هندمیت.



**ئا: هیوا کەریم ئەحمەد**

سەرچاوە: فن الموسیقی، تالیف: فاضل جاسم الصفار.

# وێنەگرتنی شوێنەوارەکان

وێنەگرتنی فۆتۆگرافی بۆ شوێنەوارەکان، گرنگییەکی تایبەتی هەیە، کەمتر نییە لە کاری کۆڵین (تنقیبات)، بەڵکو زۆرجار دەبێتە تەواوکەری کارەکە. لەساڵانی دواییدا گرنگییەکی زۆریان بەم بوارە داوە، هەتا زۆربەی قوتابییانی کە لەم بوارەدا دەخوێنن ڕادەهێنرێن لەسەر وێنەگرتنی شوێنەوار، یا وێنەگرتنی ئەو کەلوپەلانەی دەردەهێنرێن.

بەگشتی وا بەباش دەزانرێ کەوا کامێرای گەورە بۆ وێنەگرتن بەکاربهێنرێت لەجیاتی کامێرای ئاسایی کە فیلمی (٣٥)ملیمی لەگەڵ بەکاردێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کامێرای گەورە نێگەتیڤەکانیان گەورەیەو بە زۆریش لەسەر جامن، دەتوانرێ وێنەکان بە قەوارەی زۆر گەورە گەورە، بکرێن، بێ ئەوەی شێوەو دیقەتی لەدەست بدرێ، زیاتریش لەمە وێنەکان بەڕەش و سپی بێ باشترە، بەڵام بۆ کاری ڕەنگاوڕەنگ و سلاید کامێرای تاک هاوێنەی ڕفلێکس (SLR)ی (٣٥)ی ملیمی بەکار بێت چاکترە، لە پاڵیا هەندێ فلتەریش بەکاربێت، وەک فلتەری پۆلەرایزو سکای لایت.

وێنەگری شوێنەوار دەبێ زۆر وریا بێ، بەر لەوەی دەست بە وێنەگرتن بکات، پێویستە چاڵەکان بەجوانی خاوێن بکاتەوە یان کرابێتەوە، نابێ پیسی و چقڵ و دارو دەوەن وپیسایی لەناو چاڵەکان هەبن لەکاتی وێنەگرتن. سەرەڕای ئەوەی دەبێ لە شوێنێکی بەرز بەرەوخوار وێنەکان بگرێت، بۆیە واچاکە قادرمەیەکی بەرز یا بورجێکی بەرز دەستنیشان بکات تا لەسەری بوەستێ و وێنەکان بگرێت. دەبێ وریای ئەوەش بێت لە هەڵبژاردنی کاتی وێنەگرتنەکە، بەزۆری کاتی بەیانیان یان ئێواران بۆ وێنەگرتن باشە، چونکە چاڵەکان سێبەرێکی (٤٥)ەکی دروست دەکەن بەمەش قووڵی چاڵەکانی دەردەکەوێت، بەڵام هەندێ جار تا ڕووبەرێکی چاک لە زەمینەی چاڵەکانی شوێنەوارەکە دەرکەوێ کاتی نیوەڕۆیان بۆ وێنەگرتن باشە.

ئەو کەلوپەلانەی دەردەهێنرێن، پێویستە پاش پاک کردنەوەیان لە

ژوورەوە لەسەر قوماش و باکگراوندی وا وێنەیان بگیرێت کەوا بەرچاو بن و ئیبراز بن، بۆیە ڕەنگی وا دەستنیشان دەکرێت کە کۆنتراست بێت لەگەڵ کەلوپەلەکان، بۆ نموونە: ئەگەر کەلوپەلەکان گۆزەو دیزە بوون باکگراوندی سەوز یان شین گونجاوە بۆ ئەم بابەتانە، لەم حاڵەتەدا دەتوانرێ بە ڕووناکییەکی سۆفت، واتە ناڕاستەوخۆی خۆر وێنەکانی لەبەر بگیرێ. خۆ ئەگەر فلاش بەکارهات، پێویستە دیفیوزەری لەسەر بێت تا ڕووناکییەکە پەرشوبڵاوبکاتەوە، بۆ کاری وردو ئەم بابەتانە کامیرای تاک هاوێنەی ڕفلێکس (SLR) گونجاوەو لەگەڵ بەکارهێنانی هاوێنەی تەلی فۆتۆی (١٠٠)ملیم یا (١٣٥)ملیم، هەروەها هاوێنەی ماکرۆی (١٠٠)ملیم.

بۆ وێنەگرتن لەنێو ئەشکەوتەکان، دەتوانرێ بۆ ڕووناک کردنەوەی ناوەوە سوود لە ڕووناکی خۆر وەربگیرێ، بەوەی بەهۆی تیشکدەرەکان ڕووناکی خۆر ڕووەو ناوەوە بکرێت، ئینجا وێنەکان بگیرێن، هەروەها بەهۆی فلاش و بلاجکتۆریش هەندێ دیمەنی ناوەوە دەگیرێت.



بەباش دەزاندرێ کەوا پێوەرێکی دیارکراو لەنێو وێنەکەدا هەبێت تا دوورو درێژی شوێنەوارەکە بناسرێت، بۆیە زۆرجار هانا دەبردرێتە بەر دانانی هەندێ ڕاستە یا داری پلەپلەکراو بەڕەش و سپی، بەگشتی درێژییەکانیان یەک مەتر دەبن، هەندێ جار زیاتریش لەوە، ئەم ڕاستەیە یان زیاتر لە ڕاستەیەک بە ئەستوونی دادەنرێ، بەڵام بەشێوەیەکی وا کەوا تەریب بێت لەگەڵ بەشەکەی شوێنەوارەکە، پێویستە ئەو دارە یا ڕاستەیە هێندە دوور بێت کە لەوێنەکە هەست بە درێژییەکەی بکرێت، واتە نابێ زۆر لە وێنە دوور بێت، ناشبێ زۆر زۆر لێیەوە نزیک بێت.

زۆرجار بۆ زانینی گەورەیی یا بەرزی شوێنەوارەکە هانا دەبرێتە بەر دانانی مرۆڤێک وەک پێوەرێکی ناسراو، بەڵام دەبێ مرۆڤەکە لە شوێنێکی وا بوەستێ کە زۆربەی بەشی وێنەکە داگیر نەکات و شوێنەوارەکە بەکەمی دەرکەوێ، هەروەها ناشبێ مرۆڤەکە تەماشای ناو کامیرا بکات، بەڵکو وابێ تەماشای لایەکی تر بکات، وەک بڵێی بە دیتنی شوێنەوارەکە سەرقاڵە.

زۆرجار وا دەخوازێ بۆ وێنەگرتنی شوێنەوار، زیاتر لە جارێک سەردانی شوێنەکە بکەیت و دەیان وێنەی بگریت، واتە نابێ بە چەند وێنەیەک کۆتایی بە کارەکە بهێنی، زۆرجار هەندێ گرتە لە دوورەوە دەگریت، هەتا دەوروبەری شوێنەوارەکەش لەگەڵ گرتەکە دەربچن تا شوێنەکە بەجوانی پێناسە بکرێت و بە ئاسانی بناسرێتەوە، یا ئەوەتا ڕووبارو جۆگەلەو گردۆڵکە ئەگەر هەبوون لەگەڵ شوێنەوارەکە دەربچوێنە.

**ب. هەوراز**

---

# جۆن تراڤۆڵتای فرەبەهرە ماڵئاوایی لە سینەما دەکات!

ئەستێرەی سینەمای جیهانی جۆن تراڤۆڵتا، دوای بەسەربردنی تەمەنێکی پڕ لە بەخشش لە پێناو خزمەتکردنی هونەری بەرزی سینەما، بڕیاری داوە ماڵئاوایی لە سینەما بکات، بەتایبەتی کاتێ لە هەر سێ فیلمی ئەو دواییەی بە ناوی (ژمارەکانی بەخت) و (گۆڕەپانی شەڕ) و (ماسییە شمشێرەکە) نشوستی هێناو نەیتوانی سەرکەوتن بەدەستەوە بدات و دڵی جەماوەرەکەی شاد بکات!


جۆن تراڤۆڵتا

جۆن تراڤۆڵتا لە (١٨)ی شوباتی (١٩٥٤) لە ولایەتی نیوجیرسی ئەمریکاییدا، لە باوکێکی ئیتاڵی و دایکێکی ئیرلەندی لەدایک بووە. ڤۆڵتا هەر لە تەمەنی (١٦)ساڵیدا وازی لە قوتابخانە هێناو ڕووی کردە هونەری نواندن، دواتر بەرەو ئاوازو گۆرانی گوتن هەنگاوی پڕ لە هیوای هەڵهێناو چەند گۆرانییەکی بەناوبانگی تۆمارکرد، کە دیارترینیان ساڵی (١٩٧٦) بوو بە ناوی (Let Herin).

ڤۆڵتا جگە لەو دوو بەهرە گەشەی، لە هونەری سەماکردنیشدا کەسایەتییەکی دیارو بێ هاوتا بوو، بۆیە هەرسێ بەهرەکەشی لە فیلمی (تای شەوی شەممە)دا بە تەواوی بەرجەستە بوو کە لە ساڵی (١٩٧٧)دا خەڵاتی ئۆسکاری باشترین ئەکتەری تێدا وەرگرت.

جێی وەبیر هێنانەوەشە ڤۆلتا ساڵی (١٩٩٤)یش لە فیلمی (هەقایەت)دا بۆ جاری دووەم خەڵاتی ئۆسکاری باشترین ئەکتەری پێدرا.

ڤۆلتا خاوەنی بەناوبانگترین دوو گۆرانییە لە جیهاندا، ئەوانیش (تۆی کە تەنیا بیرت لێ دەکەمەوە) و (شەوانی هاوین)ە، هەر بۆیەش ئەو دوو گۆرانییە لە پێشبڕکێی گۆرانیی جیهانیدا خەڵاتی یەکەمی پێدرا، بەڵام ئەوەی جێگای داخەو هەرگیز لە بیری ڤۆلتا ناچێتەوە، لە یەکێک لە ئەلبوومی گۆرانییەکانیدا بە ناوی (ساندی) کە لە ساڵی (١٩٧٩) لە بەریتانیا بڵاوی کردەوە،نشوستی تێدا هێناو ئەلبوومەکەی نەیتوانی جێگای خۆی لە دڵی جەماوەرەکەیدا بکاتەوە، هەر ئەوەش وای کرد لە دەوروبەری هەشتاکاندا، ڤۆلتا جارێکی دیکە بۆ باوەشی سینەما بگەڕێتەوەو لە هەمان کات و ساتیشدا ببێتە جێگای سەرنجی ئەکتەرانی دیکەی سینەمایی وەک توم کروزو توم هانکس و کیڤن کوستنەرو چەندانی دیکە، بۆیە ئێستا زۆر لە ئاشقان و سەوداسەرانی ڤۆلتا لە نێوان خۆیاندا دەپرسن، ئایا ئەوە بڕیاری کۆتاییە یان ڤۆلتا لێی پاشگەز دەبێتەوە؟!

ئەوەیان پرسیارێکە، مەگەر ڤۆلتا هەر خۆی وەڵامێکی ڕاستودروستی بداتەوە.

**ئا: محەمەد سەعید کوردە**

سەرچاوە: ڕۆژنامەی (الموعد)ی ژمارە (١٧٦)ی ڕۆژی (١٣)ی ئابی (٢٠٠١).

# ماڵئاوایی کردنی داهێنەری (تۆم و جێری)

لەم دواییەدا لە هۆلیوود ئەستێرەیەکی تری ئەو ئاسمانە درەوشاوەیە کوژایەوە، ئەویش هونەرمەندی وێنەکێشی جوولاوەی بەناوبانگ ویلیام حەننای تەمەن نەوەد ساڵە کە کۆمەڵێک کەسایەتی کارتۆنی زیندووی داهێناکە هەتا ئێستاش لە هزری چەندین ملیۆنی گەورە و بچووک تۆمار کراوە، بە تایبەتی فیلمەکانی پشیلەو مشکی شەڕانی (تۆم و جێری) کە خۆشی و پێکەنینی خستۆتە سەر دڵ و لێوی خەڵکەوە لە ڕێگەی زنجیرەیەک لە بەسەرهاتە پێکەنین ئامێزەکانەوە و کە پشتی بە جموجۆڵ و گفتوگۆی زیرەکانە دەبەست، وێڕای بەهێزی لەکاری دەرهێنان و وێنەکێشان و تەکنیکە بەرزەکانی بەرهەم هێنان.

ویلیام حەننا بە نیوەی دووەمی کۆمپانیای ئەفسانەیی (حەننا بەربارا) دادەنرێ کە لەگەڵ هاوڕێیەکەی جۆزیف بەربارا دایەزراند و لە ماوەی دەیان ساڵدا ژمارەیەکی زۆر لە فیلمەکارتۆنییە بەناوبانگەکانی وەک (یۆجی بیر- سکۆبی دو- تۆپ کات- دک داس- بینلۆپ پیستستۆپ) بەرهەم هێنا و هەردووکیان حەوت خەڵاتی ئۆسکار و هەشت خەڵاتی جیهانیان پێ بەخشرا، هەردووکیشیان لە کەڵەپیاوانی بەرهەم سازی وێنەی جوولاو بوون، دوای ئەوەی کە ڕەوتی ئەم هونەرەیان لە سینەماوە گۆڕی بۆ تی ڤی، بۆ ئەوەی ببێتە هونەرێک بۆ هەموو خەڵکی، هەروەها توانییان نیگارە جوولاوەکان لەگەڵ کەسایەتییە ڕاستەقینەکان تێکەڵ بکەن و لەم بارەیەوە سەرمەشق بوون.



شایانی باسە ویلیام حەننا لە ساڵی (١٩١٠)ی زایینی لە شاری نیومەکسیکۆ لە دایکبووە و لەسەر ڕێی باوکی ڕۆیشت و وەک ئەندازیارێکی بیناسازی کاری دەکرد، بەڵام بەهۆی ئەو تەنگژە ئابوورییەی کە هاتە سەر جیهان، کارەکەی دۆڕاند و لە ساڵی (١٩٣٠) چووە ڕیزی یەکێک لە ستۆدیۆ هونەرییەکان و کارە سەرەکییەکەی تەنیا بەخشینی مۆسیقاو گۆرانی و شیعر بوو بۆیان، تا لە ساڵی (١٩٣٨) چاوی بە جۆزیف-ی هاوڕێی کەوت و کۆمپانیایەکی تایبەتیان دامەزراند و فیلمی (تۆم و جێری)، یەکەمین بەرهەمیان بوو، دواتر چەندین فیلم و کەسایەتیان پێشکەش کرد و خەڵکی لە سەرانسەری جیهان پێی ئاشنابوون و خۆشیان دەویست و بووە بەشێکی جیا نەکراوە لە ژیانیان.

**ئا: ڕەهیل حەسەن جاف**

گۆڤاری (الجدیدة)، ژ ٧٩١، ٢٠٠١/٨/٢٢

# گۆستابۆ ئەدۆلفۆ بیکەر
# شاعیری ئەڤین و ئازارو وێنە پاکیزەکان

گۆستابۆ ئەدۆلفۆ بیکەر سەردەمی منداڵییەتی، بە بێنازی و گەنجایەتییەکی تژی لە ئاوات و مەرگی ناوەخت دەناسرێت.

ساڵی (١٨٣٦) لە ئەشبیلیاله دایکبووەو ساڵی (١٨٧٠)ش لە مەدریدی پایتەخت کۆچی دوایی کرد. ژیانی کورتی شاعیر ئەوەمان پێڕادەگەیەنێت کە لەم جیهانەدا وەک نەیزەکێکی بەلەزو تیژڕەو گوزەری کردو بە ئاگری حەزو پەرۆشیش بۆ جاویدانی سووتا. گۆستابۆ هەتا تەمەنی (١٩ ساڵان) لە ئەشبیلیا ژیاو لەوێدا بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە کەوتە خوێندنەوەی وێژەی جیهانی و لە تەک بالیریانۆی برایدا فێری نیگارکێشان بوو کە لە دواییدا بووە یەکێک لە نیگار کێشە ناسراوەکانی سەدەی نۆزدەیەم، بەڵام دوای ئەوەی دایک و باوکی دەمرێت، .. کتێبخانەکەی خاتوو مانۆیلا مۆناهای کە دایەنی گۆستابۆ بوو، ڕۆڵێکی مەزنیان لە گۆشکردن و ڕۆشنبیرکردنی شاعیردا گێڕا، هەر لەو کتێبخانەیەدا، سەدان شاکاری نووسەرانی وەک شاتۆبریان و مەدام دەستال و بایرۆن و هۆگۆو...تاد. خوێندەوە، ئەمە وێڕای سەیران و گەشتکردنەکانی بۆ کەناری ڕووباری (دۆڵی مەزن) کە هەست و هۆشیان دەخرۆشاندو پڕ لە ئاوات و هیوایان دەکرد، ئەم هۆکارانە بوونە مایەی ئەوەی ملی ڕێگە بگرێتە بەرو هەڵوەدای سەرکێشییەکانی بێت، ئەوەبوو ساڵی (١٨٦٤) خۆی گەیاندە مەدرید.

گۆستابۆ بەو شیعرە کورت و سادەو ساکارو قووڵ و نوێیانەی بە ئەستێرەیەکی درەوشاوەی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم لە ئیسپانیا دادەنرێت، بەڵام بەبێ ئەوەی کەس هەستی پێبکات تێپەڕ بوو. ژیانی لە مەدرید زۆر سەخت و دژوار بوو، لە سەرەتادا بۆ چەندین ساڵ بە کلۆڵی و نەهامەتی و نەداری ژیانی دەگوزەراند، تا لە دواییدا وەک وەرگێڕو نووسەر لە یەکێک لە ڕۆژنامەکاندا کاری دۆزییەوەو بە هاوکاری چەند نووسەرێکی تریش کە لە خۆشی و ناخۆشیدا بە ڕاستی هاوڕێی بوون ژمارەیەک شانۆنامەی نووسی، تاوەکو بکارێت ژیانی ئاسایی بگوزەرێنێت.. ساڵی (١٨٥٧) دووچاری نەخۆشی سیل دەبێت و هەست بە ئازارەکانی دەکات و زۆر تەنگی پێهەڵدەچنێت، ئەگەرچی بۆ ماوەیەکی کورت لە نووسین دادەبڕێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دووبارە گەڕایەوە سەر نووسینی شانۆگەری و کارکردن لە ڕۆژنامەگەریدا، لە ئاکامیشدا هەر بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە سەری نایەوە.

گۆستابۆ لەگەڵ براکەی بە مەبەستی تۆژینەوەی شوێنەوارە دێرینەکان سەردانی گرنگترین شارەکانی ئیسپانیایان کرد، وەک (تلیتلا، سۆرەیا..تاد)

ساڵی (١٨٦١) کاستا ئیستیبان بووە هاوسەری، بەڵام چونکە ئەو ئافرەتە خودان ڕۆشنبیرییەکی وەها نەبوو، بۆیە ئەو هاوسەرێتییەیان زۆر درێژەی نەکێشاو نەیتوانی لە تەکیدا بەری بەختەوەری بچنێت.

گۆستابۆ ساڵانی بەر لە ماڵئاوایی بوونی، تژیبوون لە کلۆڵی و شەکەتی و بێزاربوون و وەڕسی کەخۆی بەم شێوەیە گوزارشتی لێکردووەو دەبێژێت: (حەزم لە ژیانە، ژیانێکی گۆشەگیرو بەختەوەر، ژیانێک بەبێ نیگەرانی و بەبێ ئاوات، ڤالا نەبێت لە حەزو ئارەزووەکان، ئاواتە خوازم ببمە ئەکتەرێکی هیچ و پووچ لە گاڵتەجاڕی مەزنی مرۆڤایەتیدا). دوا ساڵانی بەر لە مردنی بەو ڕەشبینی و نائومێدییەی بەسەربرد، پایزی ساڵی (١٨٧٠) بۆ هەتایێ ماڵئاوایی لە ژیان کرد، جگە لە هەردوو ڕۆژنامەی (سەردەم و ڕای نیشتمانی) ئیدی هیچ ڕۆژنامەیەکی دیکە ئاماژەیان بە مەرگی ناوەختی گۆستابۆ ئەدۆلفۆ بیکەر نەکرد کە ئەوانیش نزیکەی سێ چوار دێڕیان لەبارەی کۆچکردنی بڵاوکردەوە.

هەڵبەتە ئەوەی ئەم شاعیرە لەو سەردەمەدا لە بارەی ئافرەتەوە وتی، دەشێت لە بارەی سەردەمەکەشەوە هەمان تێڕوانینی هەبێت کە لەم شیعرەدا دەڵێت:

**سەرم لەمە سوڕنامێنێ**
**منت لە یاد کردووە**
**چونکە ئەو شتە گرانبەهایەی**
**لەناخمدایە**
**ناتوانی هەستی پێ بکەی!**

سەرجەمی بەرهەمەکانی گۆستابۆ بریتییە لە (٧٩ دەقی شیعری) لە دیوانێکدا کۆکراوەتەوەو لە دوای کۆچکردنی چاپ و بڵاوکراوەتەوە. ئەم دیوانە شیعرەی هیچ چامەیەکی تێدا نییە



گۆستابۆ ئەدۆلفۆ بیکەر

تەواو نەکرابێت یان بە نیوەچڵی مابێتەوە.

بەرهەمەکانی گۆستابۆ ڕەسەنایەتی و قووڵییەکی هەمەلایەنی پڕ واتاو سۆزێکی لە ئەندازە بەدەری ئیستێتیکیانەو خەملیوبوونێکی بێ پایان بەرجەستە دەکەن، سۆزێک لە لای خوێنەر دەورووژێنن و بە ناخیدا ڕۆدەچێت. گۆستابۆ هەر بەتەنیا هەستیارو بەسۆز نەبووە وەک چۆن یەکەمین ڕەخنە لە بارەیەوە دەبێژێت، بەڵکو تا ئەندازەیەکی زۆر هەست ناسک و لە ئاست سادەو ساکاری ڕەنگاوڕەنگ یان ڕووکەشایەتی تێی دەپەڕاند، ئەویش ناسک و نازداری هەمەچەشنی واتاو چەمک و تێڕوانینەکانی بوو، ئەمەش لەلای ئەودا لە چوارچێوەیەکی تەسکدا بەدی دەکرا، هەروەکو لە لای ئەنتۆنیۆ ماچادۆش دەبینرێت.

هەروەک داماسۆ ئەلۆنسۆ لەو بارەیەوە دەبێژێت: هەرچەندە بەم جۆرە نمایشکردنی چەمک و جیهانبینییەکان وا لە شاعیر دەکەن ڕوونتر خۆی بنوێنێت و بەرجەستەیان بکات، دوور لە هەر تەمومژێک.. بۆ نموونە ئەم شێوازە لە شیعری ژمارە (٦٢) لەدیوانەکەیدا بەرچاو دەکەوێت:

**ئەم پەیکەرە لە پێست و ئێسقان چێکراوە**<br>
**دواجار، بەسەرێکی شێتەوە**<br>
**لە منەکردندا ماندوو بووە**

لەبەرامبەر ئەم کۆپلە ڕوون و ئاشکرایە کە وێنەی کۆتەڵێکمان بۆ دەکێشێت کە بێژەی (سەری شێت) گوزارشت لە کەللەسەر دەکات، ئاخۆ هیچ کەس دەتوانێت بێژێت: چامەکان هەر بەتەنیا ڕووکەش و ڕاشکاوانەو ناسکن؟ ڕاستە شیعرەکانی گۆستابۆ ڕێژەیەکی یەکجار زۆری لە سۆز تێدایە، بەڵام زۆر نایاب ئەو سۆزە ون دەبێت و گاڵتەجارییەکی شاراوەو نادیار یان نائومێدییەکی بەرفراوان و مەزن جێگەی دەگرێتەوە کە ڕەخنەگرە کورتبینەکان پەییان بەو لایەنە نەبردووەو شتەکان لەلایان تێکئاڵاوەو سۆزێکی نەخۆشیان لای گۆستابۆ دەبینی.

کەواتە چامەکانی شاعیر ئاوێتەیەکی قووڵن، لە وێنە پاکو بێگەردەکان، هەرچەندە تاووتۆیان بکەین و لێکیان بدەینەوەو مشتومالیان بکەین، پتر کاریگەرییەتی و خرۆشاندن لەلاماندا دروست دەکەن و بە ڕەنگی نوێترو قەشەنگترو ڕەنگاوڕەنگتر خۆیان نیشان دەدەن.

**ئا: کامەران تاهیر**

سەرچاوە: گۆڤاری (العاملون فی النفط)، ژمارە ١١٩.

# چاودێری کردنی ئەلیکترۆنی

کاتێک سیستەمی نوێی پێوەندی ژمارەیی و ئەلیکترۆنی ئینتەرنێت و مۆبایل هاتنە بوون، خەڵک لە هەموو دنیا بەوە بەختەوەر بوون کە ئەم سیستەمە کۆدی و ژمارەییە تازەیەی پێوەندی ئینتەرنێتی ناتوانرێت لەلایەن هیچ دامودەزگاو دەوڵەتێکەوە چاودێری بکرێت، ئەوەش واتا فراوانبوونی سنووری ئازادی مرۆڤ لە پێوەندییەکانیدا، بەڵام ئەم خۆشباوەڕییە زۆری نەخایاند، چونکە دەزگاکانی ئاسایشی نێودەوڵەتی و هەواڵگری ئەمریکی و بەریتانی لەم پێشڤەچوونە دڵگران بوون، ئەوەبوو سیستەمی تازەی ئەلیکترۆنیان داهێنا کە دەتوانێت چاودێری ئینتەرنێت و ئیمێل و تەلەفۆنی مۆبایل بکات.

سەرژمێرییەکانی ئەم دواییەی پۆلیس و دەزگای (سی، ئای، ئەی) ئەمریکی بە ڕوونی ئەوە دەردەخات کە ئەوان ساڵانە دەتوانن چاودێری چەندین ملیۆن هێڵی ئینتەرنێت و مۆبایل بکەن، بە تایبەتیش دەزگای (ئێف، بی، ئای) کە هەر بە ئەوەندەش نەوەستاوە، بەڵکو ئێستا سیستەمێکی تازەی داهێناوە کە لە سایەیەوە دەتوانێت چاودێری هەموو ئەو نامە ئەلیکترۆنییانەش بکات کە لە ڕێگای ئیمێل ڕەوانە دەکرێن و دەگوازرێنەوە.

لەم بارەیەوە ڕاپۆرتێک لە لایەن نووسینگەی کارگێڕی دادگاکانی ئەمریکی بڵاوکراوەتەوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ژمارەی چاودێری کردنەکان ساڵانە سێ بە قەد خۆی زیاتر دەبێتەوە. بۆ چاودێری کردن و گوێگرتن لە هێڵی مۆبایل ئێستا سیستەمێکی ئەلیکترۆنی لە شێوەی وەرگرێکی زۆر هەستناک داهێنراوە کە دەتوانێت شەپۆلی تەلەفۆنی مۆبایل وەربگرێت، جگە لەوەش پۆلیسی ئەمریکی ئێستا بۆ ئەم مەبەستە ئامێرێکی تازە بەکار دەهێنن بۆ کۆنترۆڵکردنی شەپۆلە موگناتیسییەکان و چاودێری کردنیان.

لە بەریتانیاش هەر لەم ماوەیەدا ڕاپۆرتێک لە لایەن ئەنیستیۆتی مافی کارکردن بڵاوکراوەتەوە کە تێیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات گوایە کۆمپانیاو دەزگاکان، ئێستا سیستەمی ئەلیکترۆنی بۆ چاودێری کردنی کارمەندان و فەرمانبەرانیان بەکار دەهێنن بەشێوەیەک شوێنی کارکردن بۆتە زیندانێکی کۆنترۆڵکراوو چاودێری کراو، چونکە هەر ژوورێک و داڵانێک کامێرایەکی لێ دانراوە، چاودێری فەرمانبەرەکان دەکات و گوێ لە قسەکانیان دەگرێت.

هەروەها ڕاپۆرتەکە ئاماژە بۆ ئەوەش

دەکات کە ئەم سیستەمە توندەی چاودێری کردن، هێڵی ئینتەرنێت و ئیمێل-یشی گرتۆتەوە، بەشێوەیەک بەرپرسانی دەزگاو کۆمپانیاکە دەزانن ڕۆژانە کارمەندەکانیان پێوەندی بە کێ دەکەن و ناوەرۆکی نامە ئەلیکترۆنییەکانیان دەخوێننەوە، ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی کارمەندان نەتوانن لە هەندێک لەم دەزگاو کۆمپانیایانە کاربکەن، چونکە بەردەوام هەست دەکەن لەژێر چاودێری دان.

سەرژمێری و ئامارەکان پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشن کە ئێستا لە بەریتانیادا زیاتر لە یەک ملیۆن سیستەمی چاودێری لەم شێوەیە لەنێو دامودەزگاکاندا هەیە، بگرە هەر ئەم شوێنانەش نا، بەڵکو ئێستا سەرشەقام و وێستگەی گواستنەوەو میترۆو شوێنە گشتییەکانیش دەگرێتەوە. بەرپرسانی دەزگای (تەلەڤزیۆنی داخراو) ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەوان دەتوانن ڕۆژانە چاودێری خەڵک بکەن، هەر لەو کاتەوەی لە ماڵەوە دێتە دەروەوەو بە درێژایی ڕۆژ لە شەقام و چێشتخانەکان و میترۆو شوێنی کارکردن و .. تاد.



بۆیە شارەزایانی ئەم بوارە پێیان وایە هەر مرۆڤێکی ئاسایی ڕۆژانە دەکەوێتە بەر شاشەی (٣٠٠) کامیرای لەم شێوەیەدا! ئەوەی یارمەتی بڵاوبوونەوەی ئەم سیستەمە دەدات هەرزانی نرخەکەیەتی، ئەمەش پاڵی بە کۆمەڵێک خێزانەوە ناوە ئەم سیستەمە لە ناو ماڵ و ژوورەکانی خۆشیاندا دابنێن تاوەکو چاوەدێری منداڵەکانیان بکەن. کلایف نۆریس کەسێکە لە زانستی تاوانکاری دەکۆڵێتەوە، کتێبێکی بڵاوکردۆتەوە بە ناوی (کۆمەڵگای چاودێری)، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لەم دوو سێ ساڵەی دواییدا، (٤٦٠) هەزار سیستەمی تەلەڤزیۆنی داخراو فرۆشراوە، بەمەش ڕۆژانە ئەم سیستەمە زیاتر بڵاو دەبێتەوە، بۆیە هاوڵاتییەکی ئاسایی لە شارێکی گەورەدا هەر پێنج دەقیقە جارێک دەکەوێتە بەر کامیرای چاودێری.

بڵاوبوونەوەی ئەم سیستەمە تازەیەی چاودێری کردنی ئینتەرنێت و ئیمێل و مۆبایل، بۆتە هۆی ئەوەی مرۆڤ نەتوانێت پارێزگاری لە هیچ نهێنییەکی تایبەتی خۆی بکات، دەزگاکان ئاگاداری هەموو هەڵسوکەوتێکی مرۆڤن، بۆیە کۆمەڵگای خۆرئاوای ئەمڕۆ کۆمەڵگایەکە لە ژێر چاودێرییەکی توندا دەژی.

**ئا: ئەردەڵان ساڵح**

سەرچاوە: الشرق الاوسط، (١٩٩٩/٢/٢١).

---

# شیزۆفرینیای خود لە فەلسەفەی کیرکیگۆرد-دا

سۆرێن کیرکیگۆرد (١٨١٣-١٨٥٥) فەلسەفەکارێکی دانیمارکی بوو، بە پێشڕەوی وجوودییەت دادەنرێت، لەناو فەلسەفەکەیدا زۆر بایەخی بە خود دەدا، بۆیە هەندێک لە نووسەران و بیریاران پێیان وایە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی فەلسەفەی خودە، چونکە خود لەلای ئەو چەق و سێنتەری وجوودە.

ئەو فەلسەفەکارێکی میتافیزیکی بوو، بەڵام بەردەوام لە ململانێدا بوو لەگەڵ کڵێساو هزری لاهووتی سەردەمی خۆیدا، لەلای ئەو کڵێساو قەشەو ڕاهیبەکان ناتوانن ببن بە نێوەند لەنێوان خواو مرۆڤدا، ئەوانە تەنیاو تەنیا فەرمانبەری دەوڵەتن.

کاروفرمانی فەلسەفەی وجوودی ئەوەیە کە جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە، گوایە مرۆڤ وەکو مرۆڤێک لە دایک نابێت، بەڵکو لە سایەی وشیارییەوە دەبێتە مرۆڤ، واتا ئەوە پرۆسەیەکە بۆ سەرلەنوێ بە دەستهێنانەوەی مرۆڤایەتی مرۆڤ، دەشێت لەکاتی ئەنجامدانی ئەم پرۆسەیەدا مرۆڤ شکست بێنێت و نەتوانێت ببێتە خاوەنی خودی خۆی.

ئالێرەوە گرنگە لە فەلسەفەی کیرکیگۆرد بکۆڵینەوە، چونکە سانایە مرۆڤ خودی خۆی لە دەست بدات، بەڵام کارێکی زەحمەت و قورسە بتوانێت ئەم خودە وەدەست بێنێتەوە، ئەوەتا کیرکیگۆرد دێت پرەنسیپە ناودارەکەی سوقرات (ئەی مرۆڤ خۆت بناسە) دەگۆڕێت بۆ (ئەی مرۆڤ خودی خۆت هەڵبژێرە).

پرسیاری هەرە سەرەکی کیرکیگۆرد ئەوەیە: (چۆن

دەکرێت مرۆڤ ببێتە مرۆڤ)؟ یا (چۆن مرۆڤ دەتوانێت خودی خۆی هەڵبژێرێت)؟

له لای کیرکیگۆرد مرۆڤ وەکو خود بە سێ قۆناغ تێپەڕ دەبێت، ئەو ناویان دەنێت (سێ قۆناغە گەورەکانی وجوود) بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- قۆناغی هەستی ئێستێتیکی ڕاستەوخۆ- هەستی تێرامانکاری.

٢- قۆناغی ئەخلاقی.

٣- قۆناغی ئاینی.

بەم شێوەیە ئەو دەمانخاتە بەردەم دووڕیانێک یا دەبێت بە خاوەنی خودی خۆت یا ون دەبیت و دەفەوتێیت!

له قۆناغی یەکەمدا مرۆڤ تەنیا لەپێناو چێژی هەستی و ئێستێتیکیدا دەژی و ژینگەی سروشتی و کۆمەڵایەتی لە دەست دەدات، بەبێ ئەوەی خاوەنی وشیاری خودی بێت و بتوانێت بڕیار دەربکات، ئالێرەدا گوێ بە ئیلتیزاماتی ئەخلاقی و ئاینی نادات، مرۆڤی ئەم قۆناغەش لە تەمەنی منداڵی و هەرزەکاریدایە، لەگەڵ ئەوەشدا دەشێت مرۆڤ بە تەمەنیش بێت، بەڵام لەناو ئەم قۆناغەدا گیربووبێت، نموونەی ئەم قۆناغەش لەلای ئەو، کەسایەتی دۆن جوان-ە، بەڵام مرۆڤ هەر لەم قۆناغەشدا هەندێ جار باڵاتر دەبێت و دەچێتە بەشی دووەمەوە کە بەشی هەستی تێرامانکارییە.

لێرەدا خود هەست بەوە دەکات کە دەشێت خودێکی کارابێت، بەڵام ئەم بیرکردنەوەیە ناگۆڕێت بۆ کردەیەکی ژیانیانە، چونکە تێڕوانینێکی تۆتالیتاری بۆ جیهانبینی لەدواوە نییە.

له قۆناغی ئەخلاقیدا مرۆڤ خودی خۆی هەڵدەبژێرێت و دیاری دەکات، واتا مرۆڤ هەست بە خودی خۆی دەکات وەکو خودێک، بەڵام ئەوە هەموو شتێک نییە، دانپیانان بەبوونی خود، واتا هەوڵدان بۆ تێپەڕین لەم خودە بەرەو خودێکی وشیارتر، ئەوەش واتا مرۆڤ بە شێوەیەکی ئەخلاقیانە خودی خۆی هەڵبژێرێت، چەمکی ئەخلاق لێرەدا چەمکێکی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو مانای ئیلتیزامی ناوەخۆییە بەرانبەر بە خودو بەرپرسیارییەتەکانی.

یەکەم هۆکاری گواستنەوە و بازدان لە قۆناغی هەستی بەرەو قۆناغی ئەخلاقی بێزاری و هەستکردنە بە پووچی، ئالێرەوە وجوودی ئەخلاقی تێڕوانین بۆشتەکان دەگۆڕێت، مرۆڤی ئەخلاقی دان بەبوونی خواوە دەنێت، بەڵام ناتوانێت جیاوازی لەنێوان خوا وەکو کیانێکی تایبەت و سەربەخۆ لەگەڵ جیهاندا بکات، ناتوانێت خواو خود لە یەکتری جیابکاتەوە، ئەوەش خاڵی هەرە لاوازی ئەم قۆناغەیە و دەبێتە هۆی شڵەژان و ناهاوسەنگی لە مامەڵەکردنی خود لەگەڵ دەوروبەردا. وجوود ئەوەیە کە من خاوەنی خۆم بم، بۆیە وجوودێکی ڕاستەقینە بوونی نییە، تەنیا بوونی خود نەبێت لە بەرانبەر خوا، مرۆڤیش ناتوانێت بگاتە ئەو حاڵەتە ئەگەر لەناو دڵەڕاوکێدا گوزەران نەکات، خودی ئیمان واتا دڵەڕاوکێ. کاتێک مرۆڤ سروشتی پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ خوا زانی، ئەوە دەرباز دەبێت و بەختەوەری بەدەست دێنێت.

له قۆناغی سێیەمدا ئەخلاقیش ئەو بایەخەی نامێنێت و ئامانجێکی تر جێگای دەگرێتەوە ئەویش ئامانجی ڕەهایە، واتا خوا چی لەخود دەوێت.

لێرەدا مرۆڤی ئیماندار ئەو کەسەیە کە بە تەواوی پشت بەخوا دەبەستێت و دەستبەرداری دنیا دەبێت و دان بەوەدا دەنێت کە بوونی ئەو وەکو خودێک لە بوونی خواوە سەرچاوە دەگرێت.

لەلای کیرکیگۆرد فاکتەرە ئەنتۆلۆژییەکانی پێکهاتنی خود بە شێوەیەکی دیالیکتیکیانە بە یەکەوە پەیوەستن، هەر شڵەژانێک لە زنجیرەی ئەم پێوەندییانە دەبێتە هۆی سەرنەکەوتنی پرۆسەی بە دەستهێنانەوەی خود، ئەوەش واتا خود دووچاری نەخۆشی ڕۆحی و شیزۆفرینیا دەبێتەوە. شیزۆفرینیای خود واتا ژیان لەبێ ئومێدیدا، بێ ئومێدی واتا لە دەستدانی هیوای بە دەستهێنانی خود و گەیشتن بە ئامانجی ڕەها. بێ ئومێدی دیاردەیەکە لەناو مرۆڤایەتیدا باوە، بۆ ئەوەی لە دەستی دەربازبین دەبێت هانا وەبەر ئیمان بەرین، بێ ئومێدی مرۆڤ ئەوکاتە دەست پێدەکات کە ناتوانێت ببێتەوە خاوەنی خودی خۆی، ئەوەش شێوەیەکە لەخۆ کوژی، شیزۆفرینیایەکی ئەبەدی.

مرۆڤ هەرچەندەی ڕۆچووە ناو ژیانی خۆی ئەوەندە زیاتر دەزانێت کە بوونی ئەو لە وەهمێک زیاتر نییە و ژیانیش زۆر پووچ و بێ مانایە.

کیرکیگۆرد پێی وایە مرۆڤ بۆ ئەوەی دووچاری شیزۆفرینیای خود نەبێت، دووچاری بێ ئومێدی نەبێت، ئەوە دەبێت بە دوای خودی خۆیدا بگەڕێت، گەڕان بەدوای خود لەناو خودی خۆمانەوە دەست پێدەکات، بەڵام بە دۆزینەوەی خوا کۆتایی دێت، بە دەستنیشانکردنی سروشت و سنووری پێوەندییەکانی خود لەگەڵ خوا کۆتایی دێت، دابڕانیش لە هەر یەکێک لەم قۆناغانە واتا پچڕانی پرۆسەی گەڕان بە دوای خودو ونبوون لەناو قۆناغی هەستی ئێستێتیکیدا، ئەو قۆناغەی تەنیا چێژی تێدایە و مرۆڤیش لەناویدا گوم دەبێت.

دەبێت ئەوەش بزانین کە ئەنتۆلۆژیای خود لەلای کیرکیگۆرد لەم بەشانە پێکدێت:

١- خودی لێکدراو لە موتەناهی و نامووتەناهی- عەینی.

٢- خودی لێکدراو لە دەروون و جەستە- ڕۆح.

٣- خودی لێکدراو لە واقیع و ئایدیا- وشیاری.

٤- خودی لێکدراو لە پێداویستی و توانا- ئازادی.

٥- خودی لێکدراو لە زەمانی و ئەزەلی- زەمانگەرایی.

**ئا: سەلام مستەفا**

سەرچاوە: شیزوفرینیا الذات في فلسفة سورن كيركغارد، فاضل سوداني، من الأنترنت.






# مولازم تەحسین و شتی تریش...

لێدوانی: عوسمان یاسین

ئەم نۆڤلێتەی د. فەرهاد پیربال کە (١٣٦) لاپەڕەی قەبارە بچووکە، بە تەکنیک و شێوازێکی نوێوە تراژیدیای میللەتی کورد دەگێڕێتەوە.

لەوانەیە گەر سەیری ڕووداوەکانی ناو ئەم نۆڤلێتە بکەین، ڕووداوەکان بەلامانەوە زۆر ئاسایی بن، بەڵام لە میانەی شێوازو تەکنیکی تازەی گێڕانەوەدا ئەم ڕووداوە ئاساییانە خوێنەر تووشی سەرسووڕمان و سەرنج ڕاکێشان دەکات. دیارە گەر سەرەڕۆییانە سەیری ژیان بکەین، ژیان زۆر سادەو ئاساییە، بەڵام کاتێک لەبەردەم ژیاندا ئێستێک دەکەین و لێی ڕادەمێنین، ئەو کاتە ژیان دەبێتە مایەی سەرسووڕمان. کەواتە مەسەلەکە لەچۆنیەتی بینین و سەیرکردندا، ئەگەر سەیرکردنەکەمان ڕووکەشانە بێت ئەوا بینینەکەشمان ڕووکەشانە دەبێت و نابێتەمایەی سەرنج دان، تێڕامان و سەرنجدان لە خوێندنەوەی چیرۆک و نۆڤلێت و ڕۆمان...تاد ڕاستەوخۆ پەیوەستن بەو شێوازو تەکنیکەی کە لەم دەقانەدا بەرجەستەکراون، لەبەر ئەوە ڕووداوی زۆر سادە لەمیانەی تەکنیکێکی قووڵدا سادەیی خۆی لەدەست دەدات و دەچێتە ئاستێکی دیکەوە.

کەسایەتییە سەرەکییەکانی ئەم نۆڤلێتە، ئەختەرو جوامێرو مولازم تەحسین-ە.

سەرەتای نۆڤلێتەکە هەرلە لاپەڕەی یەکەمەو دەتوانین بەدوو شێوە بیخوێنینەوە، لە سەرەوەی لاپەڕەکەدا باس لە ژیانی ڕۆژانەی ئەختەر دەکات کە لەگەڵ مولازم تەحسین دەیگوزەرێنێت، لە نیوەی خوارەوەی هەمان لاپەرە ژیانی شەوانەی ئەختەر دەگێڕێتەوە کە لەگەڵ جوامێردا دەیگوزەرێنێت، ل٣ ئیتر بەم شێوە بەشی یەکەمی نۆڤلێتەکە دەست پێ دەکات، نیوەی سەرەوەی لاپەڕەکان باس لەژیانی ڕۆژانەی ئەختەر دەکات و نیوەی خوارەوەی هەمان لاپەڕەکان باس لە ژیانی شەوانەی ئەختەر دەکات.

لەمیانەی ئەو تەکنیکەوە کە لەم نۆڤلێتە بەکار هاتووە یەکسەر دووفاقی ژیانی ئەختەری پاڵەوان یا خود کەسایەتی سەرەکیی ئەم نۆڤلێتەمان بۆ دەردەکەوێت، ئەختەر کچە کوردێکی شاری سلێمانییەو جوامێری خۆشویستووەو لەگەڵ یەکتردا خەریکی کاری سیاسی بوونە پاشان جوامێر کەشف دەبێت و دەچێتە شاخ و دەبێتە پێشمەرگە. ئەختەریش تووشی مولازم تەحسین دەبێت و دواجاریش ناچار دەبێت دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکات و پارێزگاری خۆی پێ بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەختەر ژیانێکی دووفاقی دەژێت، بەڕۆژ لەگەڵ مولازم تەحسین و بەشەویش لەگەڵ جوامێردایە..

مولازم تەحسین و جوامێر هەردووکیان پاڵەوانی یاخود قارەمانی ئەم شارەن، بەڵام مولازم تەحسین بەڕۆژ و جوامێر بەشەو..

مولازم تەحسین و جوامێر هەردووکیان لەگەڵ ئەختەردا ڕادەبوێرن، ئەمیان بەڕۆژو ئەویان بەشەو، هەردووکیان لەگەڵ ئەختەر ڕادەبوێرن و نایانەوێت بیخوازن. هەرچەندە مولازم تەحسین داوای لێدەکات شووی پێ بکات: شووم پێ بکە.. شووم پێ بکە، هەی ئیبلیس!. ئەختەر سەری داخستبوو، تەماشای پەرداخە بەتاڵەکەی دەکرد..نیوەی سەرەوەی ل ١١.

- ئەختەر، گوێ بگرە: من خۆشم دەوێی..! ئەختەر، توورە!) دەستی دایە پەرداخە ئاوە بەتاڵەکەو هەستایەوە؛ هەردوو دەستی لەناو قەدی خۆی گرت: ئەدی بۆچی نامخوازی؟ بۆ نامخوازی.. هەی ترسنۆک، نیوەی خوارەوەی ل ١١ و١٢ لەم دوو دیمەنە جیاوازەدا خولیای ئەختەر بۆ شووکردن بە جوامێرو ڕۆژ ڕابواردن بە مولازم تەحسین دەردەکەوێت.

مولازم تەحسین، لە ژوورەکەوە هاواری لێکردە دەرەوە:

- ملوانکەیەکی زێڕینی تازەم بۆ کڕیوی.. حەیوان! ل١١

جوامێر، لە ژوورەکەوە، هاواری لێکردە دەرەوە:

- گوارەوییەکانت بۆ چنیوم، ئەختەر گیان؟ نیوەی خوارەوەی لاپەرە (١٢).

لەم دوو دیمەنەدا دەکرێت زۆرشت بخوێندرێتەوە.

لە بەشی دواتر بەهەمان شێوەی پێشتر ژیانی ڕۆژانەی ئەختەر لەنیوەی سەرەوەی لاپەڕەو ژیانی شەوانەی ئەختەر لەنیوەی خوارەوەی لاپەرە



ـووسراونەتەوە، بەڵام لەم بەشەیدا چۆنیەتیی پێوەندیکردنی ئەختەر بە جوامێرو مولازم تەحسین دەردەکەوێت. هەرچەندە نیوەی سەرەوەی لاپەڕەکان ئەختەر خۆی ڕۆڵی گێڕەرەوە دەبینێ و بۆ جوامێر باس دەکا، کە چۆن پێوەندی لەگەڵ مولازم تەحسین دروست بوو. بەڵام، نووسەر بە تەکنیکێکی تازەو، دەروونی ئەختەرمان بۆ دەکاتەوە.

ئەختەر بە جوامێری دەگوت: مولازم تەحسین پیاوێکی قۆزی کەڵەگەتی چاوو برۆجوانی کەشخە بوو. هەروەها پێشی دەگوت: لەو دەمەدا کە لەناو چیمەنەکەدا دانیشت: دەم و دەست حەزم دەکرد بیکەمە موشتەریی بەردەوامی خۆم.

ئەختەر بە جوامێری گوت: ئەو ناجسنە خوێڕییە، دەتگوت کوڵلە ڕەشەگەورەکانی کەربەلایە. هەروەها گوتی: لەناو چیمەنەکەدا، هەردوو قاچی بەرامبەرم ڕاکێشابوو، نەشەرم نەحەیا: بە نیگا حەشەرییەکانی بەژن و باڵای دەلستەوە، ئەختەر بە جوامێری دەگوت: دوای ئەوە ئیتر منیش یەکسەر کورسییەکەم ڕاکێشایە ناو چیمەنەکەو بەرامبەری دانیشتم. نیوەی سەرەوەی لاپەڕەکانی (٢٣ و ٢٤)..

ئیتر بەم شێوازە نووسەر واقیعییەتی پێوەندی و حاڵەتی دەروونیی ئەختەر لەگەڵ مولازم تەحسین دەخاتەڕوو، ئەویش لەمیانەی ئەم ڕستەیەدا (ئەختەر بە جوامێری نەگوت). ئەوەی کە ئەختەر بە جوامێری ناڵێت سەبارەت بە مولازم تەحسین.

نووسەری ئەم نۆڤلێتە بە شێوەیەکی زۆر هونەرییانە بەخوێنەر دەڵێت. بەهەمان ئەم شێوازە هونەرییە نووسەر ئەو لایەنە شاراوەوەی جوامێرمان بۆ باس دەکات، کاتێک کە ئەختەر لەگەڵ باجی بناری مامەندەمۆن دەدوێت.




ئەختەر، لەبەر جوامێر، دڵی نەدەهات بە باجی بناری مامەندەمۆن بڵێت:

- جوامێر ئەوکاتە هەمیشە لە شاخەوە نامەی بۆم دەنارد، دەیگوت: «قەیناکە: جاری تەحەممول بکە» ئەختەر بە باجی بناری مامەندەمۆنی دەگوت:- جوامێر ئەوکاتە لە شاخ بوو، ئاگای لە من نەبوو؛ هەواڵی منی نەدەزانی. ئەختەر، بۆ ئەوەی شەخسییەتی جوامێر نەشێوێنێ، دڵی نەدەهات بە باجی بناری ژنی مامەندەمۆن بڵێت:- تەنانەت دواتریش، کار گەیشتە ئەوەی کە جوامێر بۆی نووسیم، گوتی: «قەیناکە لەگەڵیان کار بکە؟ بۆ ئەوەی بتوانیت، بەخەتی مایل، لەناو شاردا درێژە بە خەباتی ژێر زەمینی و سیاسییانەی خۆت بدەیت» نیوەی خوارەوەی لاپەڕەکانی (٢٩ و ٣٠)

لە ژیانی ڕۆژانەی ئەختەر (٤)و ژیانی شەوانەی ئەختەر (٤) بەهەمان تەکنیکی پێشوو، نووسەر بەردەوامی بەخستنەڕووی لایەنە ناکۆکەکانی دەروونی ئەختەر دەدات.

لە ژیانی ڕۆژانەی ئەختەر (٥)و ژیانی شەوانەی ئەختەر (٥) بەهەمان شێوە. لە نیوەی لاپەڕەکانی سەرەوە ژیانی ڕۆژانەی ئەختەرە لەگەڵ مولازم تەحسین و لە نیوەی لاپەڕەکانی خوارەوەش ژیانی شەوانەی ئەختەرە لەگەڵ جوامێردا.

ئەوەی کە لەم بەشانەدا هەستی پێ دەکرێت گەشەکردنی هێڵە درامییەکەی نۆڤلێتەکەیە، لە بەشێکی دیکەی نۆڤلێتەکەدا لەمیانەی گفتوگۆی باجی بناری ژنی مامەندەمۆن لەگەڵ پووره ڕەعنای ژنی سەلیم سەرپان، خوێنەر ئاگاداری لایەنێکی دیکەی ژیانی ئەختەر دەبێت. دواتر لە بەشێکی دیکەدا ژیانی ڕۆژانەی مولازم تەحسین (١)و ژیانی شەوانەی جوامێر (١) خوێنەر زیاتر ئاشنایی بەو دوو کەسایەتییە پەیدا دەکات. دواتریش بەشەکانی دیکەش بەهەمان شێوە باس لەژیانی ڕۆژانەی مولازم تەحسین (٢ و٣و٤و٥)و ژیانی شەوانەی جوامێر (٢و٣و٤و٥) دەکرێت.

لە دوابەشی نۆڤلێتەکەدا لەسەر زاری باجی بناری ژنی مامەندەمۆن دواساتی مەرگەساتی ئەم نۆڤلێتە دەگێڕدرێتەوە؛ کە بەچاوی خۆی لە نیوەشەوێکدا بینیویەتی کە چۆن پیلان بۆ جوامێر دادەنێتەوەو لە ماڵی ئەختەردا کەشەو دێتە لای ئەختەر پیاوانی مولازم تەحسین بۆی لە بۆسە دەبن و دەیگرن و سەری دەبڕن و، دوای ئەوەی بەهاوکاریی ئەختەر ئەم کارە ئەنجام دەدەن، مولازم تەحسین بەسەری لمۆزی ئاماژەیەکی بێزاوی بۆ ئەختەر دەکات و بە یاوەرە چەکدارەکانی دەڵێت:

- لەم قەحپە پیسەش ببەن! لێرەی بەجێ نەهێڵن!. ل١٣٣

ئەمە تەنیا خستنەڕوویەکی خێرای نۆڤلێتەکە بوو، دیارە ئەم خستنەڕووە هەرگیز ناچێتە قاوغی خوێندنەوە بۆ ئەو نۆڤلێتە، لەمیانەی خوێندنەوەی ئەم نۆڤلێتەدا دەبێ جیهانی ئاماژەکانی تاوتوێ بکرێن و حاڵەتی کەسایەتییەکان شی بکرێنەوە. ئەمەش پێویستی بە دەرفەتی زیاتر و تێروانینی قوولتر هەیە بەو هیوایەی لە دەرفەتێکی دیکەدا، خوێندنەوەیەک بۆ ئەم نۆڤلێتە بکەین..❖



# دەرسیم لە مێژووی کوردستاندا

لێدوانی: عەباس سلێمان سمایل

دەرسیم لە مێژووی کوردستاندا کتێبێکی قەوارە ناوەندیی (٣٥٩) لاپەڕەیە. (د. نووری دەرسیمی) بەزمانی تورکی نووسیویەتی و (د. ئەحمەد فەتاح دزەیی) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریان ئەرکی بەچاپ گەیاندنی خستۆتە ئەستۆی.

د. نووری دەرسیمی بەشێکی کتێبەکەی بۆ ڕیشەی زازاکان و هۆزەکانی دەرسیم بە کرمانج و زازاوە تەرخان کردووە، لەگەڵ جوگرافیای دەرسیم و داب و نەریتی هۆزەکانی، بەشەکەی دیکەشی بۆ جوولانەوەی سیاسی دەرسیمییەکان تەرخان کردووە، بەتایبەتی لەسەردەمی عوسمانییەکان و تادوای جەنگی دووەمی جیهانی و هەموو ڕاپەڕین و جوولانەوەیەکی سیاسی دەرسیمییەکانی گرتۆتە خۆی، هەروەها بەڕێزی دەڵێت: هەر لەسەرەتای هاتنی زەرد پێستەکان بۆ کوردستانی باکوورو دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، دەرسیمییەکان دژیان جوولاونەتەوەو ئەوانیش بەهەموو توانایەکەوە ویستوویانە هەرێمی دەرسیم داگیر بکەن و هەستی نەتەوایەتییان لەناوبەرن و ڕایان بکێشن بۆ ئەرکی سەربازی و هۆزەکانیان چەکدار بکەن و ڕووبەڕووی سەفەوی و ڕووس و ئەرمەن- یان بکەنەوە، بەلام دەرسیمییەکان هەمیشە یارمەتی سەفەوییەکانیان داوەو قەلای (کەماه)یان بۆ سەفەوییەکان چۆڵ کردووە، ئەویش بەهۆی نزیکایەتی زمانی فارسی لە شێوەزمانی زازاو هاومەزهەبییەوە بووە، هەروەها دەرسیمییەکان نەچوونەتە ناو سوپای عوسمانی و هاوکاریی سوپای ڕووس-یشیان نەکردووەو هاوبەشیی کوشتاری ئەرمەنیشیان نەکردووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەرمەن-یان پاراستووەو کۆمەڵ کۆمەڵ بەشەو دەربازیان کردوون.

لەشەڕی یەکەمی جیهانیشدا عوسمانییەکان زۆر هەوڵیان دا هۆزەکانی هەرێمی دەرسیم ڕاپێچ بکەن بۆ مەیدانی جەنگ، بەلام هۆزەکان ڕازی نەبوون، ئەوکاتیش هەرێمی دەرسیم بەشێکی لەبەردەستی ڕووس بووەو بەشەکەی دیکەشی ببووە مەیدانی تەڕادانێی تورکان، دەرسیمییەکانیش بەردەوام هەرێمەکەیان دەپاراست و شەڕی هەردوولایان دەکرد.

کاتێک لەساڵی (١٩١٥) ڕووس ئەرزەڕۆم داگیر دەکات، داوا لە دەرسیمییەکان دەکات جاشایەتی بۆ بکەن، بۆ ئەم مەبەستەش لەدوای سەرەک خێلەکانی دەرسیم ڕەوان دەکات، بەلام ئەوان جاشایەتی ڕووس-یان قەبووڵ نەکرد، جارجاریش تورک بەناوی ئایینەوە دەیویست دژی سوپای ڕووس بەکاریان بهێنێت و پێی دەوتن شەرکردن دژی ڕووس غەزایە.

جا دەرسیمییەکان هەرچەندە جاشایەتی ڕووس و تورک-یان قەبووڵ نەکرد، بەلام لە ساڵانی (١٩١٥-١٩١٦) زیانێکی زۆریان لێکەوت، ئیتر تورک نەیتوانی بەتەواوی دەست بەسەر هەرێمی دەرسیم-دا بگرێت تا ساڵی (١٩٣٨) ئینجا ژمارەیەک لە هۆزانی هەرێمەکەی ئاوارەی دەرەوەی کوردستان کردو خەڵکێکی زۆریش شەهید بوون، ناوی دەرسیمیشی بۆ (تونجەلی) گۆڕی. جا لەماوەی شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانی زنجیرەیەک ڕاپەڕین و شۆڕش سەری هەڵداوە وەک: شۆڕشەکانی خێلی کۆچان،



شۆڕشی سەیدڕەزا.

د. نووری دەرسیمی زۆر بەدرێژی لە ڕاپەڕینەکان دواوەو هەموو شەڕەکانی زۆر بە وردی باس کردووە.

**لێکدانەوەی هەندێ ناوی جوگرافی**

د. نووری دەرسیمی لە کتێبەکەیدا زۆر گرنگیی بەڕەگ و ڕیشەی ناوی جوگرافی هەرێمی دەرسیم داوە کە سوودێکی باشی هەیە بۆ سەلماندنی ناوچە کوردییەکان لەڕووی زمانەوانییەوە وەک:

**دەرسیم:** دەر (دەرگا)+ سیم (زیو)= دەرگای زیوین، شەش سەدە بەرلە زایین مێژوونووسانی یۆنانی بە دەرسیم-یان وتووە (دەرانیس)و (دارا)ی پاشای فارس لە نووسراوەکانی ناوی ئەم ناوچەیەی بە (زوزا) هێناوە کە نزیکە لە زازا یا لە زۆزان.

**چیای تۆژیک:** ئەم چیایە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ناوچەی دەرسیمی ڕۆژئاوا، ئەم چیایە چیایێکی زۆر سەختە لەبەرئەوەی لووتکەکانی تیژن بۆیە پێی دەوترێت تۆژیک.

**چیای کرکلارو چیای ماراوی:** ئەمەش زنجیرە چیایێکە لە باکووری دەرسیمی ڕۆژئاواو لەبەرانبەر شاخەکانی مونزووردا زۆر لە خێڵەکان دەڵێن: گۆڕستانی باپیرە گەورەیان (ماران) بووە، لەبەر ئەوە دەچنە زیارەتی و پێشی دەڵێن کێوی ماران، واتە بەناوی کەسێکی زازاکراوە.

**چیای ساری سالتک:** ئەم چیایە گۆڕی پیاوچاکێکی تێدایە کە ناوی (سالتک) بووە، نەوەی ئەو پیاوە زۆر بووینەو بوونەتە هۆزێک، زۆر خێڵی دیکەش دەچنە زیارەتی گۆڕی سالتک.

**ڕووباری فورات:** ڕووباری فورات لە نزیک شاری ئەرزەڕۆم لە شاخەکانی مە مەخاتوون-ەوە سەرچاوە دەگرێت و بەرەو دەرسیم شۆڕ دەبێتەوە، لە هەرێمی دەرسیم بەم ڕووبارە دەڵێن (ئەرازانی)یا (ناوی ڕەش).

**ڕووباری مونزور:** ڕووباری مونزور بەناوی چیای مونزور کراوە، هەندێکیش دەڵێن بەناوی شوانی عەگیدێکی دەرسیمی کراوە بەناوی مونزور، عەگیدەکەش ناوی جەمشید بووە. کاتێک کە جەمشید تووشی شەڕێک دەبێ و حەزی دەچێتە حەڵوا مونزوری ڕەوان دەکات کە ژنەکەی حەڵوای بۆ دروست بکات، هەرچەندە ژنەکە بڕوای بەشوانە نەکرد، بەڵام بۆی دروست کرد.

کاتێک کە جەمشید لەشەڕ دەگەڕێتەوە، بە خەڵکەکە دەڵێت: بڕۆن پێشوازیی مونزور بکەن، خەڵکەکەش کە هەواڵ بۆ مونزور دەبەن کە بێتەوە، مونزور-یش کە هەواڵەکەی پێدەگات لە خۆشییان شیرەکەی لەدەست بەردەبێتەوەو جێگای هەر دڵۆپە شیرێک کانیاوێکی لێ دەتەقێتەوە، کاتێ خۆشی لەناو بەردەکان ون دەکات ئەویش دەبێتە هۆی تەقینەوەی کانیاوێک، ناوی ئەم کانیانەش زۆر سپییە وەکو شیر، ئینجا ئەم کانیاوانە تێک دەکەنەوەو ڕووباری مونزور پێک دەهێنن.

**دەرسیمییەکان لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە**

دەرسیمییەکان لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە هەر لە کۆنەوە یەکییەتییەکی هۆزایەتی هەبووە لە نێوانیان و هەرکەسێکیان سیخوڕی کرد بێت، بە زووترین کات لەناویان بردووە، هەمیشە گوێ ڕایەڵی شێخەکان و سەرەک هۆزەکانیان بووینەو شێخ و ئاغاکانیشیان نیشتیمانپەروەر بوونەو دژی داگیرکەران جووڵاونەتەوەو دادپەروەرییان نواندووە لە نێو خەڵکان، دەرسیمییەکان لەم ڕووەوە زۆر نزیک بوونە لە بارزانییەکان.

**نەژادی دەرسیمییەکان**

دەرسیمییەکان زۆربەیان بە زاراوەی زازا قسە دەکەن و ئەوی دیکەشی بە زاراوەی کرمانجی، ئەوی مەبەستە (زازا)کان بە گوترەی زۆربەی بیروڕاکانی پسپۆرانی (زازا) وەک بەهروز شوجاعی و مالیسانژو...زاراوەی زازاو زاراوەی هەورامانی، جاران یەک زارەوە بوون ، بەڵام بە درێژایی ڕۆژگار بەهۆی لێک



دوورکەوتنەوەیان هەریەکە کاژێکی سەربەخۆی وەرگرت.

باشترین بەڵگەش کە زازاکان لە هەورامانەوە گەیشتبنە دەرسیم ئەو شیعە کۆنەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای فەتحی هەورامان لەلایەن سوپای عەرەبی ئیسلام کە بەدرێژایی ئەم ڕۆژگارە وەک مەقامێکی شینی لەلایەن ئافرەتانی زازا دەگوترا، ئەمەش نموونەیەکی دەقەکەیە:

**هورمزگان ڕومان**
**ئاتران کوژان**
**هۆشان سورەڤە گەڤرە**
**گەڤرەگان**
**زۆرکار ئارەب کردنە**
**خاپوور**
**گەهانە پاڵە پەشە**
**شارەزوور**
**ژن و کەنیکان ڤەدل**
**بەشران...**

لەم شیعرە وا پێدەچێت زازاکان لە هەورامانەوە چووبنە هەرێمی دەرسیمی ئەمڕۆ، چونکە لە دەوروبەری ساڵی (١٩٠٠)ز ژمارەیەک پێستە لەناو ئەشکەوتی سورێن دۆزرایەوە، هەریەک لە پێستەکان مێژووی سەردەمێکی لەسەر نووسرابۆوە، یەک لە پێستەکان ئەم شیعرەی لەسەر نووسرا بۆوە کە باسی لە داگیرکردنی (فەتح کردن) هەورامان دەکات کە چۆن پەرستگاکانیان ڕماندووە، ئاگرەکانیان کوژاندۆتەوەو ژن و کچەکانیان بەدیل بردووەو عەرەبیش لە پاڵەوە تا شارەزوور کۆری کردۆتەوە.

جا ئەوی ئەم کتێبە بخوێنێتەوە سەرەڕای ئاشنابوون بە هەرێمی دەرسیم، قارەمانێتی زازاکانی بۆ دەردەکەوێت کە تا ساڵانی (١٩٣٨) حکومەتی تورکیا نەیتوانی دەست بەسەر هەرێمی دەرسیم دابگرێت، ئەویش بەهۆی بەکارهێنانی چەکی قورس و گازی ژهراوی توانی شۆڕشەکان لەناو بەرێت، هەروەها لە خوێندنەوەی ئەم کتێبە درندەیی و بێ ئابڕوویی ڕژێمی تورکیا-ت بۆ روون دەبێتەوە، هەرکەسێکی لەشەڕ بەدیل بگیرابایە، ئەوا لە سێدارە دەدراو سووکایەتی بەماڵ و منداڵەکەی دەکراو، ئەو شوێنانەی کە شەڕی تێدا ڕوویدابایە ئەوا دانیشتووانەکەی ئاوارەی دەرەوەی کوردستان دەکرا.

ژمارەیەکی زۆریش لەو گوندانەی کە بەرهەڵستی سوپای تورکیان دەکرد، ئەم گوندانە بە دانیشتووانەوە دەسووتێنران. جا لەگەڵ ئەو هەموو ئێش و ئازارەیان دەرسیمییەکان کۆڵیان نەداوەو تاکو ئەمڕۆ زمان و کولتووری کوردییان پاراستووە، لە کۆتاییدا هیوادارین خودا بە بەهەشتی



پان و بەرین پاداشتی د. نووری دەرسیمی و ئەحمەد فەتاح دزەیی بداتەوە.

**پەراوێزەکان**

.........

دەرسیم: دەرسیم هەرێمێکە کەوتۆتە نێوان شارەکانی ئەرزەرۆم، ئەرزنجان، سیواس، مەلاتیەو جاران دابەشی سەر دەرسیمی ڕۆژهەڵات و دەرسیمی ڕۆژئاوا کرابوو، هەربەشێکیش چەند شارۆچکەیەکی تێدا بوو. هەروەها دەرسیم شارێکە کەوتۆتە ناوەڕاستی خاکی دەرسیمییەکان. ئەمڕۆکە پێنج یەکی بە کرمانجی قسە دەکەن و ئەوانی دیکەش بەزازا، دەرسیم بەهۆی ئەوەی ماددەی زیوی تێدایە پێی دەگوترێ دەرگای زیو یا واتای ناوچەی زیو دەگەیەنێت، دوای ئەوەی حکومەتی تورک داگیری کردو شۆڕشەکانی لەناوبرد ناوەکەی بە ناوێکی تورکی (تونجەلی) گۆڕی.

* زاراوەی زازا: زاراوەی زازا زاراوەیەکی ڕەسەنەو پێویستە سوودی لێ وەربگیرێت بۆ زمانی یەکگرتووی کوردی، نەوەک بخرێتە پەراوێزەوەو دوژمن هەوڵی جیابوونەوەیان بدات لەگەڵی کورد.

* دەقی شیعرەکەی کە لە ئەشکەوتی سورێن دۆزراوەتەوە:

**هورمزگان ڕمان، ئاتران کوژان**
**وێشان شاردەوە گەورە گەورەکان**
**زۆرکار ئەرەب کردنە خاپوور**
**گۆنای پاڵە هەتا شارەزوور**
**شن و کەنیکان وەدیل بشینا**
**مێرد ئازاتلی، وەڕووی هووینا**
**ڕەوشت زەردەشت مانەوە بێ دەس**
**بزێکا نەیکا هورمزد وەهۆیچ کەس**

**سەرچاوە**

...........

**ڕاهنمای خواندن و نوشتن زبان کوردی**
**نوشتە/ محمد مصری**
**سازمان إنتشارات سیدیان**



# زەکی هەناری و هۆنراوەی منداڵان

لێدوانی: ڕۆستەم باجەلان

- (زەکی هەناری و هۆنراوەی منداڵان ٢٠٠٠): ئەم نامیلکەیە بریتییە لە (٢٢) شیعری جۆراوجۆری مامۆستای پەروەردەکار -زەکی هەناری- کە پێشکەشی بە جگەرگۆشەکان کردووە... شایانی باسە برای هێژام- د. کەمال مەعرووف- ئەم بەرهەمەی ئامادە کردووەو پێشەکیی بۆ نووسیوەو لە لاپەڕەی (٤)ی پێشەکییەکەیدا دەڵێ:

«ئەم شیعرو چیرۆکە شیعرییانەی مامۆستا- زەکی هەناری- کە بۆ ساڵانی (١٩٥٦) دەگەڕێنەوە، کاریگەریی کتێبی عەرەبیی پۆلی دووەم و سێیەمی سەرەتایی ساڵی (١٩٥٠) یان بە سەرەوەیە، مامۆستا ئیلهامی لێ وەرگرتوون و بە کوردییەکی جوان و پەتی داڕشتوونەتەوە...»..

ئێمەش لێرە لە چاپکراوەکە دەدوێین و سەرەتا دەڵێین:

-ئەم شیعرانە هەر هەموویان دەکەونە خانەی قۆناغی قارەمانییەتی جگەرگۆشەکانەوە (٨-١٢ساڵ).. منداڵ لەم قۆناغەدا هەوڵ دەدا لە باوەشی واقیعییەت و خەیاڵ دوور بکەوێتەوەو ڕوو لە قۆناغی نزیک لە واقیعییەت بکا.. بۆیە هەر لەم کلاورۆژنەیەوە سەیری فۆرم و حاڵەتی ناوەوەی بەرهەمەکە دەکەین.

گومان لەوەدا نییە، ئەدەبی منداڵان خۆماڵی بێ یان وەرگێڕان، ئەوا سوود بە منداڵ دەگەیەنێ و چەندین زانیاری و بەهای بە نرخی دەداتێ و بەهۆی ئەم کارەوە پێداویستییەکانی هزری و دەروونی و جوانکاری جێبەجێ دەکا، بەمەش ئەو منداڵە دەتوانێ بە شێوەیەکی ڕاست و دروست مامەڵە لەگەڵ دەوروپشتی خۆی بکا، ئەم خەونە ئاوریشمینییەش ڕێڕەوی ڕاستەقینەی خۆی ناگرێ، ئەگەر نووسەری منداڵان زانیاریی تەواوی سەبارەت بە نەخشەی زانستیی ئامانجی بە ڕۆشنبیرکردن و زمانی گونجاوی پێگەیاندن و ویستی جگەرگۆشەکان نەبێ.. من پێم وایە، لەم حاڵەتەدا نووسەری داهێنەر ئەو کەسەیە، کە بەیەک چاو سەیری ئەو بوونەوەرە خەیاڵی و یاریزان و هەستەوەرانەی سەر گۆی ژیان دەکا کە ناویان -منداڵ-ە و لە دەرەوەی چێوەی گەورەکانەوە سەیری ناوەوەو دەرەوەی جۆری بیرکردنەوەیان دەکا.. هەر لێرەشەوە هەوڵ دەدا بە زمانی ئەدەبێکی یەکگرتووی ئەوانەوە قسەیان لەگەڵ بکا.. ئەمە زمانی سەردەمەو هەر بەو مەفهوومەش سەیری نوێخوازی دەکەم...

زمان، فەرهەنگێکی جەڤەنگییە بۆ بیرکردنەوەی ئیبداعی، من پێم وایە، ئەگەر نووسەری منداڵان لە زمانی ئەم فەرهەنگە فرە لقە نەزانێ، ئەوا ناتوانێ بە شێوەیەکی زانستییانە مامەڵە لەگەڵ قۆناغەکانی تەمەنی منداڵان بکا... مامۆستا-هەناری- هەوڵی داوە بە زمانی فەرهەنگی قۆناغی قارەمانییەتی جگەرگۆشەکان (٨-١٢ساڵ) لەگەڵ منداڵان بدوێ و هەر بەو مەفهوومەش ڕوخساری ئەدەبێکی دیودەریان پێ بناسێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەمەش دەبینین دووچاری ئەم ساتمانە بووە:

- دەرچوون لە فەرهەنگی قۆناغی قارەمانییەتی (٨-١٢ساڵ) ئەویش بەهۆی بەکارهێنانی ئەم وشە نامۆو ئاڵۆزو پاڵۆزانەوە: (تازەبەر. کەدەر. ئینکار. دەقن. خاوەند. تەوان. زینهار. ڕەسیدە...)

- دەرچوون لە ئیقاعی جگەرگۆشەکان.

- دەرچوون لە بنکەی بابەتی تاک و بابەتی کۆی ڕێزمان، ئەم ڕاستییەش لە شیعری -هەنگ- بەدەردەکەوێ:

لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ دەفڕین
لەسەر خۆ بوون بێ ترسان
خۆی مات دەکرد لە ناو گوڵ
جار جار دەهات بۆ چڵان.. (ل ٢٠- ل ٢١)

بەهەرحاڵ، من حەزم دەکرد ئەم بەرهەمەی مامۆستای گەورە -هەناری- ئیقاعی سەردەمی لەبوونی خۆی لوولدابایەو بە زمانی منداڵانەوە خۆی بە جگەرگۆشەکان بناساندبایە، بەڵام لەبەر ئەوەی ماوەیەکی زەمەنی لە نێوان ئەدەبی ئەمڕۆ و ئەدەبی دوێنێی منداڵاندا هەیە، بۆیە ئەم کارە هونەرییەی- هەناری- بە شتێکی پیرۆز لە قەڵەم دەدەین.

منداڵ زۆر حەز لە هونەر دەکاو هەوڵ دەدا لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەو هەڵوێستە جۆراوجۆرەکاندا

هونەر بەکار بێنێ و بەزمانی ڕاستەقینەی ئەوەوە دیالۆگەکان ئەنجام بدا...

هونەریش لە نامیلکەی- زەکی هەناری و هۆنراوەی منداڵان-دا بەم جۆرەیە:

ا- مۆسیقا:

شیعرەکان لە ڕووی مۆسیقاوە بەم شێوەیە دابەش کراون:

١٠ شیعر/ ٧ برگەیی
١ شیعر/ ٨ برگەیی
١١ شیعر/ ١٠ برگەیی
٢٢ شیعر (کۆی گشتی).

مامۆستا-هەناری- لە ڕووی مۆسیقاوە شارەزاییەکی چاکی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەش لە هەندێک جێگادا تووشی ساتمەبووە:

**کۆترو بێچووەکانی/ ٧** برگەیی
ڕێوییەک هات بۆیان بەغار/ ٨ برگە
بێچووەکانی هەموو خوارد/ ٧ برگە

**کچی تێکەیشتوو/ ٧** برگەیی
دەیکەم هەرچی پێم بڵێ/ ٧ برگە
بەیانی تاکو خەوتنان/ ٨ برگە

**پەپوولە/ ٧ برگەیی**
منداڵ دەیەوێ بیگاتێ/ ٨ برگە
حەز دەکا دەستت داتێ/ ٧ برگە

**بووکۆکە/ ٧ برگەیی**
هەر یەک گۆرانییەک بڵێ/ ٨ برگە
بووکۆکەم چەند جوانە/ ٧ برگە

**تووتی/ ١٠ برگەیی**
(١)
نەبووە دامەنت تێکەڵ گوناهان/ ١٠ برگە
دڵت چوویتە ڕێزی گوم ڕاهان/ ٩ برگە
(٢)
بێ دەنگ بە مەینە ناڵە لە دڵتا/ ١٠ برگە
ناڵەی مەزلوومان نابینێ کەس ئێستا/ ١١ برگە

**چوارکەڕی ساڵ/ ١٠** برگەیی
کانی و ڕووباران ڕوونن وەک کەوسەر/ ١٠ برگە
هەڵ دەکوڵێ دەڕۆن لەسەر خۆ بێ کێن/ ١١ برگە

**خۆ هەڵکێش/ ١٠ برگەیی**
هاوڕێ لە وەڵاما گوتی: مەترسە/ ١١ برگە
ئازام، لە هێزم سا هەر مەپرسە/ ١٠ برگە

**زوبان بەڵای سەرە/ ١٠** برگەیی
کەوتە سەر زەوی قەڵشییەوە پشتی/ ١١ برگە
گیانی لەشی تێک شکا گشتی/ ٩ برگە

**زانا بە هێزە/ ١٠ برگەیی**
فیل پێی گۆ کەمەی گەوج و گێژ/ ٨ برگە
کردم چۆن تێ بگەی دەمان مەکە ڕێژ/ ١٠ برگە

**تەگبیر/ ١٠ برگەیی**
(١)
تووشی شێر بوو، لێی پرسی بۆچی/ ٩ برگە
وا خێرا دەڕۆی، بۆ کوێ تۆ دەچی/ ١٠ برگە
ڕێوی پێی گوتن شێر ڕێ نادا/ ٩ برگە
پەنای پێداوە پشتی بەر نادا/ ١٠ برگە
چاکتر وا بوو بڵێ:
ڕێوی پێی گوتن شێر ڕێگا نادا/ ١٠ برگە
پەنای پێداوە پشتی بەر نادا/ ١٠ برگە
(٣)
قەل هاتە لای شێر، مل شۆڕو بێ هێز/ ١٠ برگە
ئاشتیی لێ کرد زۆر بە شەرم و ڕێز/ ٩ برگە
(٤)
گشت نیشتمانیش فیدای شایە/ ٩ برگەی
تا شا بمێنێ گەل لە ژیاندایە/ ١٠ برگە
(٥)
لە ڕێی دەردی تۆ گیان دەبەخشین/ ٩ برگە
بۆ جەمی خواردنت یەک یەک پێشکەشین/ ١١ برگە
(٦)
بڕیاریان وا دا هاتنە لای حوشتر/ ١٠ برگە
چاکی شێریان ژمارد لەسەر وی زیاتر/ ١٢ برگە
(٧)
مانی تۆ مانی مەو ژینی گەلە/ ١٠ برگە
فەرموون بخۆ فیدات بێ قەلە/ ٩ برگە

**هەر شتە دەچێتەوە سەری تیرەی خۆی/ ١٠ برگەیی**
(١)
با بەشووت بدەم یەکێک هەڵبژێرە/ ١٠ برگە
پایەو ڕێکخستنی بەمن بسپێرە/ ١١ برگە
(٢)
عابید کە زانی چوو بە مشکی وت/ ١٠ برگە





کیژم تۆی دەوێ لەگەڵیا
بیتە جووت/ ١١ بڕگە
(٣)
مشک لە وەڵامدا وتی: بە
چاوان/ ١١ بڕگە
گەر جێی بێتەوە لە
خانووەکانمان/ ١٠ بڕگە
چاکتر وابوو بڵێ:
مشک لە وەڵام وتی: بە
چاوان/ ١٠ بڕگە
گەر جێی بێتەوە لە
خانووەکانمان/ ١٠ بڕگە
(٤)
عابید بە کچەی وت بە
پێی هەڵدانت/ ١١ بڕگە
مشکە تۆ دەتوێ بۆ
هاوڕێیانت/ ١٠ بڕگە

**نەگوتی بوو نە دڵ/ ١٠ بڕگەیی**

(١)
لێرێکی فێنک، لەوەرخۆش، سازگار/ ١٠ بڕگە
پڕ کانی و چیمەن، گوڵی ناودار/ ٩ بڕگە
(٢)
بە خۆشی و بێ ترس هەموو گیاندارێک/ ١٠ بڕگە
لێی دەژیا زۆر خۆش هەریەک لە کەنارێک/ ١١ بڕگە
(٣)
جێی گرت وتەی کەوتە دڵی کەر/ ٩ بڕگە
چوو کەوتە دوای ڕێوی وەک نۆکەر/ ١٠ بڕگە
(٤)
لە گەوەرێکی دی نووستبوو دۆزییەوە/ ١٣ بڕگە
چوو بەلایەوە بە نەرمییەوە/ ١٠ بڕگە

جگە لە ساتەی مۆسیقایی، لە هەندێک جێگادا وشەی -بیژۆک-ی بۆ کێش و قافیە بەکار هێناوە:

پەروەردەیان کرد زل بوو/ ڕەسیدە
دەتگوت نەمامی باغی/ ئومێدە.... (ل ٦١)

جاری واش هەیە لە یەکسانی کێش دەردەچێ و کێشێکی نوێ بەکار دێنێ:

**دەرزییەکەم/ ٨ بڕگەیی**

تۆ بۆ من زۆر بە کەڵکی/ ٧ بڕگە
دوورمان فێر بووم بەچاکی/ ٧ بڕگە

**تەگبیر/ ١٠ بڕگەیی**

ڕێوی تێری خوارد دەمی سڕییەوە/ ١١ بڕگە
فیلی قەل گوتی ئێمەی کڕییەوە/ ١١ بڕگە

ب- وێنەی شیعر:

هەرکە واتاو حاڵەتەکان خۆیان دەکەن بە وێنە، ئەوا کردارەکە دەبێتە زاخاوی مێشکی جگەرگۆشەکان.. مامۆستا-هەناری- لەم ڕووەوە توانیوویەتی چەندین وێنەی دیودەرو وێنەی هەستی بە منداڵان نیشان بدا:

**(١) کێشوولەی گچکە...**
خوا تووکی جوانی داومێ
نەرمتر لە ئاوریشمێ... (ل ٩)

**(٢) پەپوولە...**
دەفڕێ لە بن گەڵایان
وەک ڕووناکی بەیانان.. (ل ١٧)

**(٣) گوڵی ئاجیلە...**
چیمەن بە من دەرازێ
شەماڵ دەمخاتە نازێ... (ل ٢٥)

**(٤) بەهار...**
مەلان دەکەن هێلانان
لەسەر درەخت و داران... (ل ٢٧)

**(٥) زمان بەڵای سەرە**
باڵیان پێچاوە هاتنە خوار بەتاو
نیشتن یەکسەرە خۆیان کوتا ناو... (ل ٤٣)

**(٦) زانا بە هێزە**
بۆ ناو خواردنەوە فیلێک کردییە خوو
بە ژێر ئەم دارە دەهات و دەچوو.. (ل ٤٩)

ج- نیگاری دەرەوەو ناوەوە:

هونەرمەندی بەتوانا- پەخشان سەلیم گەلالی- نیگاری دەرەوەو ناوەوەی کتێبەکەی بۆ منداڵان کێشاوە. نیگارەکان لەگەڵ ناوەڕۆکی شیعرەکان یەکدەگرنەوەو منداڵان بەجۆشەوە بەرەو پیریان دەچن.. بەڵام خۆزیا وێنەکانی ناوەوە ڕەنگاورەنگ دەبوون، چونکە منداڵ بە سروشتی خۆیەوە حەز لە ڕەنگ دەکاو مانای تازەتری لێ دەدۆزێتەوە.

ژان ژاک ڕۆسۆ، یەکەم کەس بووە بیری لەوە کردۆتەوە، بوونەوەر بە پێی قۆناغەکانی تەمەن گۆڕانکاری بەسەر حاڵەتی ناوەوەو دەرەوەی کەسییەتی دادێ، ئەم کردارەش لە قۆناغی منداڵییەوە دەست پێدەکا، کە ئەویش بەدەوری خۆیەوە، چەند قۆناغێکی لێ دەبێتەوەو هەر یەکێک لەم قۆناغانەش تایبەتمەندیی خۆی هەیە...

نووسەری بە توانای منداڵان ئەو کەسەیە فەلسەفەو سایکۆلۆژیاو هونەرو جیهانی قۆناغەکان بزانێ و لە کلاوڕۆژنەی ئەوانەوە، سەیری ئەو بوونەوەرە خەیاڵییە بکا کە ناوی -منداڵ-ە... ئەگەر لە ڕووی سایکۆلۆژیاوە سەیری ئەم بەرهەمەی-هەناری- بکەین، ئەوا دەبینین، گەلێ دێڕە شیعری تێدا هەیە خۆیان لە دەروونزانیی منداڵ وەرپێچاوەو لە دواڕۆژدا لە کەسییەتی ڕەنگ دەدەنەوە.. ئەمانەش چەند نموونەیەکن:

(١)
نەسرین دەفتەری دەرهێناو نووسی
یا خوا بەهار بێ دونیا هەتا سەر... (ل ٣١)
(٢)
فڕین کە دیتران وتیان چەند سەیرە
کیسەڵ چۆن دەبەن ئەم جووتە سەیرە
کیسەڵ ویستی بڵێ چاوتان دەرپەڕێ
کە زاری بزووت، بەربۆوە پەڕی....(ل ٤٤)
(٣)
سەیری کرد دیتی سەرکردەی بەڕێز
کارێک ڕوویداوە لەیەکی بێ هێز... (ل ٤٦)
(٤)
بتان وێت بژین لەنسکۆ ڕزگار
مە بن بە دۆستی کەسێکی بەدکار... (ل

(٥٩

(٥)

شێر بۆ خۆی گریا ڕێویش پێی هەڵگوت
کوا هێزی جاران؟ کوا تینی بازووت؟....(ل ٦٧)

چیرۆک، ئەگەر بۆ گەورە بنووسرێ یان منداڵ، ئەوا بریتییە لە کۆمەڵە ڕووداوێکی ڕێکوپێک، ئەوەی چیرۆکی منداڵان لە چیرۆکی گەورەکاندا جیا دەکاتەوە ئەوەیە: چیرۆکی منداڵان دەبێ پارێزگاری لە زنجیرەی مێژوویی زەمەن بکاو کەشی بە پیرەوەچوون بۆ جگەرگۆشەکان بخوڵقێنێ...-هەناری- ئەم ڕاستییە دەزانێ و هەر بەو مەفهوومەش چیرۆکەکانی (کۆترو بێچووەکانی سەرداری ڕاستی. خۆ هەڵکێش. چاکە بۆ بەدخو تیا چوونە. زوبان بەڵای سەرە. بەدی بە چاکە لا. زانا بە هێزە. تەگبیر. هەر شتە دەچێتەوە سەر تیرەی خۆی. نەگوتی بوو نەدڵ.) هەڵبژاردووە. سەرکەوتنی چیرۆکەکانیش لەوە دایە مامۆستا خستوونیەتە قاڵبی شیعرەوە، ئەم کردارەش لە بەرژەوەندیی منداڵانە.

ئیتر ئەوە ماوە بڵێم، ئەم شیعرانە لە ڕووی ڕێبازی پەروەردەوە قبوڵ کراون، چونکە چەندین بەهای بە نرخیان لەبوونی خۆیان لوول داوە. لەوانە: (کارکردن. زانین. خۆشەویستی نیشتمان. گیانی لێ بووردن. یاسای ڕێگاوبان. ناسینی ژینگەو دەوروبەر. دۆزینەوەی نهێنییەکان. ناسینی گیانەوەرو باڵندەکان...)

* تا چ ڕادەیەک-هەناری- لەم بەرهەمەدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە؟

- لە ڕاستیدا، من لە قۆناغی خوێندنی سەرەتاییدا زۆربەی ئەم بابەتانەم بە عەرەبی خوێندووە.. ئەوەی ئەم بەرهەمە لەناوەرۆکی پرۆگرامی خوێندنی پۆلی دووەم و سێیەمی سەرەتایی جودا دەکاتەوە ئەوەیە:

هەناری نەهاتووە بابەتە عەرەبییەکان وەکو خۆیان فۆتۆکۆپی بکا، بەڵکو هەوڵی داوە لە پاڵ کارە هونەرییەکەیەوە زانیاریی تازەش بە منداڵان بناسێنێ، ئەمەش لەبەرژەوەندیی جگەرگۆشەکانە.

* ئایا ئەم بەرهەمە خۆی لە تەنی فەلسەفەی منداڵان لوول داوە؟

- وەک دەزانین ئەمڕۆ فەلسەفەو هونەر تێکەڵ بە یەکتری بووبن و زۆر بەزەحمەتی لە یەکدی جودا دەکرێنەوە، ئەم ڕاستییەش زیاتر لەم بەرهەمانە بەدەردەکەوێ کە بە خوێنی نوێخوازی، خۆیان بە خوێنەر دەناسێنن. بەڵای منەوە شاعیری سەرکەوتوو ئەو کەسەیە: دەتوانێ چەندین دەنگ لەناو حاڵەتی دەرەوەو ناوەوەی دەقەکانی خۆی پەیدا بکاو بەهۆی ئەم کردارەوە درزو بۆشاییەکانی ناو تەنی جۆری تێڕوانین و بیرکردنەوەی خۆی پڕ بکاتەوە.. دیارە ئەدەبی منداڵانیش لەم کردارە خۆی جودا ناکاتەوە، هێندە هەیە فەلسەفەی منداڵ وەکو سایکۆلۆژیاو هونەر بە پێی قۆناغەکانی تەمەن دەگۆڕێ و لەڕووی شکڵ و ناوەرۆکەوە تایبەتێکی دیودەر بە خۆوە دەگرێ...

ئەم بەرهەمەی-هەناری- لە کرداری فەلسەفەوە دوور نییە، بەڵکو لە هەندێک جێگادا دێڕە شیعرەکان بۆنی تێڕوانینی فەلسەفییان لێوە دێ، ئەم حاڵەتەش لە بەرژەوەندیی جگەرگۆشەکانە...

**ڕوونکردنەوە:**

- بە پێی ئەو زانیارییانەی کە لە ئەنجامی تەمەنی ڕۆشنبیریی مامۆستا-زەکی هەناری-یەوە کۆم کردوونەتەوە، دەتوانم بڵێم، ممکین نییە- هەناری- بەهۆی کرداری کێشەوە تووشی هەڵەی مۆسیقایی بوو بێ.. چونکە مامۆستا لەم ڕووەوە هونەرمەند بووە. بەڵای منەوە، ئەوەی ڕووی داوە لە ئەنجامی یەکێک لەم خاڵانە، یان هەردووکیان بووە:

١- هەڵەی چاپ.

٢- یان ڕەنگە ئەو نوسخەیەی کە بە دەستی دکتۆر کەمال مەعرووف کەوتووە، دەستخەتی مامۆستا- هەناری- نەبووبێ.

**ئەنجام:**

لە ڕاستیدا ئەم کارە پڕ لە تریفەیەی- د. کەمال مەعرووف- شتێکی پیرۆزە، سوود بە مێژووی ئەدەبی منداڵان و جگەرگۆشەکان دەگەیەنێ، وەک خۆیشی لە پێشەکیی ئەم بەرهەمەدا دەڵێ:

«ئەوانەی خزمەتی نەتەوەکەیان دەکەن وەکو گڵۆپی پرشنگدار وان، ڕووناکی بەهەموو لایەک دەبەخشن و هەرگیز لەیاد ناکرێن...»

منیش هەر لەم کڵاوڕۆژنەیەوە، داوا لە بەرێزیان دەکەم جگەرگۆشەکان لە ڕووناکیی ئەم چرایانە بێ بەش نەکاو شتێکی چاکە ئەگەر هەوڵ بدا بەرهەمەکانی مامۆستا- ڕۆستەم حەویزی-ش کۆ بکاتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی کە پێشکەشی بە جگەرۆشەکان کردووە..❖

*** سوود لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە**

**- أدب الاطفال وثقافتهم. د. سمير روحي الفيصل، ١٩٩٨.**



# فەرهەنگۆكا كلاسيكێن كورد

لێدوانی: یاسرێ حەسەنی

(فەرهەنگۆكا كلاسكێن كورد) ناڤ و نیشانێن كتێبەكا هێژایێ نڤیسەر مەسعوود خالد گولی)یە، ل ڤێ دوماهیێ دەزگەها چاپ و بەلاڤكرنا موكریانی ل چاپخانا هاوار بۆ چاپكریە.

كتێبخانا كوردی- ب راستی- ژمێژەوەرە ل هیڤیا كتێبەكا ژ ڤی رەنگی یە، و دا پتر یا دلخاز بیت ئەگەر فەرهەنگۆك با ل جهێ كو فەرهەنگۆك، چونكی دا پتر یاتەڤگرو تاڤەگر بیت و دا گەلەكێ ل سەر خواندەڤانێ شعراكلاسیك سڤككەت، بەلێ هەر چاوا بیت كارێ نڤیسەری ژی كری یێ هێژایە و شیایە قولاچەكا مەزن رۆنكەت.

ئەڤ فەرهەنگۆكە ژی ئەڤا نڤیسەری ب سەر و بەركری هەمی ئەو پەیڤن یێن د هەلبەستێن شاعیرێن كلاسیكێن كورددا هاتین مینا: جزیری و خانی و تەیران و باتەیی و شۆشی و .. تاد.

هەروەسا گەلەك ژوان پەیڤان شاعیرێن فارس و ترك و عەرەب ژی بكارهێنانینە، لێ رامانێن وان دبیت ل دەڤ هەر كەسەكی د ئاشكرا نەبن- چاوا نڤیسەر دبێژیت- لەوا ئەڤ فەرهەنگۆكە هاتیە درست كرن.

گەلەك ژ ئەڤان پەیڤان نڤیسەری رامانا وێ یا زمانڤانی دایە و پاشی وەك زاراڤ شرۆڤەكرینە نەخاسمەیێن گرێدایی ب جیهانا سۆفیاتیێ ڤە، چونكی- وەكی یا زانا- كلاسیكێن كورد یێن كەڤن پترینا وان سۆفی بوون. ئەڤ شرۆڤەكرنە ژی وەكی نڤیسەر دبێژیت: «من شرۆڤەكرنەكا كورت بەس تێرو تەسەل بۆ دایە» و دگەل ئەڤان پەیڤێن شرۆڤەكرین ژی مالكێن هەلبەستان دگەل هینایە تنێ وەك نموونە، دا خواندەڤان بزانیت ئەو پەیڤ مشەد دیوانێن وان دا هاتینە.

نڤیسەری فەرهەنگۆكا خوە كریە دوو پشك، ل پشكا یەكێ باراپتر ناڤ و ئیدیۆم و زارا ڤێن سۆفیاتینە. و ل پشكا دوویێ ناڤێن كەسایەتی و جیهانە و هەر تشتێ ب ڤان هەردووان ڤە گرێدای بیت.

ئەڤێ فەرهەنگۆكێ، رامان و شرۆڤە كرنا (٨٦) پەیڤان دایە. دناڤ (١٤٤) رووپەلان دا، (٥٣) پەیڤ ل پشكا ئێكێ نە و (٣٣) ل پشكا دوویێ نە. نڤیسەر ژ بەركو شارەزاو مەلەڤانە ب زمانێ فارسی بارا پتر مفا ژ فەرهەنگ و كتێبێن فارسی- ژبلی یێن كوردی- وەرگرتیە بۆ شرۆڤە كرنێ.

ئەڤ پەیڤێن نڤیسەری ژی ژێگرتین و شرۆڤەكرین، باراپتر ژ وان ئەون یێن گرنگ و وەكی كلیلكان بۆ تێگەهشتنا هەلبەستا كەڤن و پترینا وان پێڤەگرێدراینە، لێ دگەل هندێ ژی هندەك پەیڤ ژێگرتینە كو قەت نەیێن تایبەتن ب زمانێ كلاسیكێن كەڤن ڤە، بەلكی تا نۆكە ژی ب رەگەكێ ئاسایی دهێنە بكارهینان و چ ئالۆزی د تێگەهشتنا وان دا نینە و كلاسیكان ژی هەر ب وێ رامانا وێ یا ئاسایی بكارهێنانینە و چ مەعنایێن دی ب خوە ڤە ناگرن، وەكی ڤان پەیڤان:

ئادار و شیعرو مسك و عەنبەرو... تاد.

كو ب دیتنا من نڤیسەری ئەگەر لە جهێ وان هندەك پەیڤێن دی یێن تایبەت ب زمانێ كلاسیكان ڤە ئینابان دا باشتر بیت.

ب راستی نڤیسەری گەلەك ب رەنگەكێ جوان و كورت و تێر ئەو پەیڤ شروڤەكرینە و خواندەڤانی دكێشیتە خوە بەردەوامیێ پێ بدەت و ژ وی دهێتە خواستن بەرگێن دوویێ و سێ یێ ژی دروست بكەت. و ئەڤە ژی نموونەكە ژ شروڤە كرنەكا وی دا پتر بۆ خواندەڤانا- ئەڤا مە گۆتی- دیاربیت:

**«ئاڤا حەیاتێ:**
**سەر خوەشێ ئاڤا حەیاتێ**
**مەجلسا رەقس و سەما تێ**
**دێ چكم ب صەوم و صەلاتێ**
**ب كوز و فنجانم ئەز**
**(فەقێ تەیران، ل٥١)**

(ئاڤا حەیاتێ) دبێژن كانیەكە د تاریاتیێ دە كو (خضر و ذو القرنین) ل دویڤ چووینە، دەمێ كو (ذوالقرنین)ی ڤیای ژ ڤێ ئاڤاڤێ ڤەخوت، كانی ل بەر چاڤا بەرزەبوو و خدر ئلیاس گەهشتێ و ئاڤ ڤەخوار و بۆ هەروهەر مایە ساخ.

«ئاڤا حەیاتێ» دزاراوێ هوزانڤانی دا دركەیە ژ ئاخفتنا ئاشكەرا و دەڤێ یارێ و ئاخفتنا خوەش ژوی دەڤی و هندەك جارا مەبەست ژێ یارب خوەیە. و دزاراوێ صۆفیان دە، دركەیە ژ كانیا ڤیان و حەژێكرنێ كو هەركەسێ تام كەتێ چو جار نامریت.

شهاب الدین سهرەوەردی دبێژیت: ئاڤا حەیاتێ؛ جەڤەنگەكە كو مرۆڤ پێ دگەهیتە ناسكرنا حەقیقیا خودێ».






# فەرهەنگی وێنەدار سەرەتایەک بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی

**عەبدولخالق قەرەداغی**
**(سلێمانی)**

ئەمڕۆ زمانی ئینگلیزی بۆتە یەکێک لە زمانە ڕەسمییەکانی جیهان و ڕۆژانە کاری پێ دەکرێ. هەر ئەمەش وای کردووە لە هەموو جیهاندا بەگشتی و لای خۆشمان بەتایبەتی بایەخێکی گەورەی پێ بدرێت، تا ئێستاش نزیکەی سەد بڵاوکراوەی ئینگلیزی- کوردی لای خۆمان هەن کە زۆربەیان لە چوارچێوەی فێربوونی زمان و گفتوگۆو چۆنیەتی وەرگێڕان و چیرۆک و ڕۆمانی وەرگێڕراو نامیلکەی گەشت وگوزاردا...خۆیان دەبیننەوە، تەنانەت مامۆستایەکی بەڕێز سەرقاڵی وەرگێڕانی فەرهەنگی ئۆکسفۆردە بۆ کوردی و عەرەبی..بەندەش ئەرکی پێداچوونەوەی گرتۆتە ئەستۆ. ئەمەو جگە لەوەی مامۆستای بەڕێز سەلاح سەعدوڵلا لە دوو توێ (١١٨٢) لاپەڕەدا فەرهەنگی (سەلاحەددین)ی بۆ ئینگلیزی- کوردی، ساڵی (١٩٩٨) لەچاپ داوە.. پاشان فەرهەنگی قوتابی، فەرهەنگی شارەزوور و فەرهەنگی حەوتەوانەو فەرهەنگی ئینگلیزی، عەرەبی، کوردی، فۆنەتک- هاوکات کۆمەڵێ فەرهەنگی تر بەڕێوەن..

ئەمەو بوونی کۆمەڵێک مەڵبەندو سەنتەرو کردنەوەی خولی تایبەت بە زمانی ئینگلیزی ئەوەندەی تر بانگەشەو هانی خەڵکی دەدەن بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی، بەڵام زۆرجار گرانیی نرخی خولەکان و کتێبەکان و فەرهەنگەکان دەبنە کۆسپ لەبەردەم ئارەزوومەندانی فێربوونی زمانی ئینگلیزیدا.

ئەوەی شایەنی باسیشە ئەمڕۆ لە هەرێمی کوردستاندا گەلێ کتێب و نامیلکەی هەمەجۆرو هەمە چەشنی زمانی ئینگلیزی هەن بۆ (گەورەو بچووک) کە لە زۆربەی کتێبخانەکانی ناوشاری سلێمانی وەک(ژیان و زانست و ڕۆژی نوێ و...تاد.) بەدی دەکرێن و هەندێ لەو کتێب و نامیلکانەش دەزگاکانی حکومەتی ئیسلامیی ئێران سەر لەنوێ سادەو کورتی کردوونەتەوە. جگە لەوەی ڕۆمان و چیرۆکی زۆر دەکەونە بازارەوە کە بە خوێنەری کورد نامۆن، چونکە هەندێکی تەنانەت بەزمانی عەرەبییش نەبینراون.

یەکێ لەو کتێبانەی کە سەرنجی ڕاکێشام و حەزم کرد لەسەری بنووسم فەرهەنگێکی بچووکە و قەبارەیەکی مام ناوەندیی هەیە بەناوی My picture dictionary واتە (فەرهەنگە وێنەدارەکەم) کە بە تیراژی دە هەزار دانە دەزگای (بشیر)ی ئێرانی لە دەزگای Belgiumی بەریتانیی وەرگرتووەو سەرلە نوێ لەچاپی داوەتەوە، هەرچەندە فەرهەنگێکی سادەیە، بەڵام سەرچاوەیەکی زۆر باشە بۆ منداڵ و مێردمنداڵان، چونکە فەرهەنگەکە پڕە لەوێنەی هەمە جۆر و لە (١٢) پەڕە پێک هاتووە، بە پیتی (A) دەستی پێکردووە بە پیتی (Z) کۆتایی هاتووە، ئەمە خۆی لە خۆیدا هەنگاوێکە بۆ لەبەرکردنی پیتەکان لە (A-ەوە تا- Z).

جگە لەوەش لەپاڵ هەموو پیتێکدا کە پیتاڵ و سمۆڵەکەی نووسراوە بۆ غوونە پیتی ( Bبە و b) نووسراوە واتە پیتی (کێرسقەکەشی) نووسراوە.

ئەمەو پیتی (A) هەژدە وشەی لە خۆگرتووە هەر وشەیەکیش لە پاڵیدا وێنەکەی بەڕەنگاو ڕەنگ دروست کراوەو بە کورتیش

پێناسەی وێنەکە کراوە، بۆ نموونە: یەکەم وشە لە پیتی (A) وشەی (acorn) واتە (بەڕوو)، لە پاڵیدا وێنەکەی کراوەو پێناسەیەکی کورتی (بەڕوو) کراوە.. بەم شێوەیە تا فەرهەنگەکە تەواو دەبێ، کۆی هەموو وشەکانی فەرهەنگەکە (468) وشەیە وەک لە کۆتایی فەرهەنگەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە، بوونی ئەم وێنانە ئەوەندەی تر سەرنجی خوێنەرانی لە منداڵ و مێردمنداڵان ڕادەکێشێ، تەنانەت گەر (فۆنۆتیکەکانی) لەگەڵدا بووایە زیاتر منداڵانی فێری خوێندنەوەو حونجەکردن دەکرد، بۆیە لێرەوە داوا لەو دایک و باوکانە دەکەم گەر دەیانەوێ منداڵەکانیان فێری زمانی ئینگلیزی بن، لەم جۆرە فەرهەنگانە بێ بەشیان نەکەن، چونکە ئەمانە سەرەتایەکی باشن بۆ چرۆکردنی حەزو ئارەزووەکان و پانتاییە خەونەکانی منداڵ، چونکە لە ڕاستیدا بەندە وەک مامۆستایەکی زمانی ئینگلیزی و پاش (١٢) ساڵ ئەزموون هەست دەکەم منداڵی ئێمە لە دەست زمان ڕادەکات بەتایبەتی (ئینگلیزی و عەرەبی). هەر ئەم ڕاکردن و ڕقە وا لە قوتابییان دەکات ئاستی لاواز بێت بە تایبەتی منداڵەکانی قۆناغی پۆلی (٥ و ٦)ی سەرەتایی کە وەک پێویستە فێری زمانی ئینگلیزی نابن، ئەمەش زۆرجار دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی مامۆستاو پسپۆری تایبەت بەو وانەیە، ئەمەش لە قۆناغی ناوەندیدا بە ئاشکرا دەردەکەوێ دیارە ئەم کارەش تەنیا بە مامۆستا ناکرێ، بەڵکو هەوڵی دایک و باوکیشی گەرەکە.




هەر بۆیە منیش بڕیارم دا ئەم فەرهەنگە بکەمە کوردی و فۆنەتیکەکانی بۆ زیاد بکەم و هەموو پیتێکیش لە (٢٥) وشەو وێنە کەمتر نەبێ تا سەرجەمی وشەکانی بکاتە (٦٥٠) وشەو وێنە، لەبری (٤٦٨) وشە ئێستا لەژێر چاپدایەو ماوەیەکی تر دەکەوێتە بەردەستی خوێنەرانی، بۆیە داوا لە بەڕێزانی وەزارەتی ڕۆشنبیری دەکەم کە هاریکاریمان بکەن، چونکە دەتوانرێ ئەم فەرهەنگە بکرێتە وانەیەک و لەپاڵ کتێبی قوتابخانەدا بخوێنرێت..❖





# ئەزموونی شیعری منداڵان

لێدوانی: نیان حەمە کەریم سوبحان
(سلێمانی)

پێم وایە تا هەنووکە ئەدەبی کوردیمان خاڵییە لە ئەدەبی منداڵان، بەمەش ناکرێت هەموو هەوڵ ودەنگەکان خەتی ڕاست و چەپیان بەسەردا بێنین، بەڵام ئەوەش حەقیقەتێکی بەڵگە نەویستە تا هەنووکە زۆر بە کەمی خزمەت بەم توێژەی دوارۆژ کراوە.

ئەزموونی ڕۆژنامەگەریمان تەواو خاڵییە لە گرنگی دان بە ئەدەب و هونەری منداڵان، بەڵام دەکرێت بەڕێزەوە ئاماژە بە گۆڤاری ڕامان بدەین تا هەنووکە لە زۆر ژمارەداو لە بەشی تیراژدا کتێب و ئەزموونێکی منداڵان لێدوانی بۆ دەکرێت...

بەتایبەتی لێدوانەکانی کاک ڕۆستەم باجەلان، مایەی دەست خۆشی و سوپاس کردنە. ئەمە جگە لەوەی ئەم گۆڤارە تا ئێستا چەندین تەوەرەو مێزگردی تایبەت بە منداڵانی کردۆتەوەو چەندین قەڵەم و نووسەری تایبەت بە منداڵان ڕۆئیای خۆیان لەم گۆڤارەوە پەخش کردووە.

ئەگەرچی نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت کە لە کوردستانی خۆشماندا چەندین گۆڤاری منداڵان دەردەچێت کە تا ڕادەیەکی زۆر خزمەتیان بە ئەدەب و هونەری منداڵان کردووە. بەتایبەتی گۆڤاری جگەرگۆشەکان و گۆڤاری هەنگ و گۆڤاری پەپوولە..

منداڵ بەهۆی سروشتی تایبەتییەوە خوا وای خەڵق کردووە، بەردەوام حەزی بەخوێندنەوەی شیعرو چیرۆکە، ئەمە جگە لەوەی بەردەوام هەمووماندا لە منداڵیدا زۆر گوێمان لە داستان و چیرۆک و حەقایەتەکانی نەنکمان گرتووە، ئەو حەقایەت و شیعرانەی کە یادوەریمانی بەرەو خەونێکی قووڵ بردووە.

ئەوەی لێرەدا دەمەوێت ڕاوەستانێکی لەسەر بکەم، زیاتر شیعرو هۆنراوەی منداڵانە، پێم وایە شیعر ڕەهەندێکی ئەدەبی منداڵانە کە منداڵ زۆر حەزی لێیەتی، من بەحوکمی ئەزموونی مامۆستایەتیم، بۆم دەرکەوتووە شیعر دەتوانێت زۆر بە جوانی منداڵان پەروەردە بکات، وەک ئەوەی کە خۆمان دەمانەوێت، چونکە منداڵ پەڕەیەکی سپییە، ئێمەی گەورە ڕەشی دەکەینەوە.

مامۆستا دیار ئەحمەد هەڵەبجەیی، شاعیرێکی زیرەک و هۆشیاری منداڵانە، ئەوەی دوای ڕاپەڕینەوە قەڵەمەکەی خستۆتە خزمەت ئەم نەوەیەی ئێستامان، بەمەش کاک دیار خزمەتێکی گەورە بەم جیهانە پاکوبێگەردە دەکات، ئەمە جگە لەوەی بەردەوام ناویشی لە گۆڤارەکانی منداڵان دەبینرێت..

دوا ئەزموونی ئەم شاعیرە منداڵ پەروەرە بە ناوی (بەرسیلە)یە. (بەرسیلە) چاپی(٢٠٠١)ی سلێمانییەو نامیلکەیەکی شەست و پێنج لاپەڕەیی ڕەنگاوڕەنگ و قەشەنگە. ئەم نامیلکەیە نزیکەی سی شیعری منداڵانی لەخۆ گرتووە، لەوانە (ترێ، شەمەندەفەر، ماسی، پەپوولە، هەنگ، باران، ساڵی نوێی خوێندن، تەلەفزیۆن، قوتابخانە، کۆلارە، باخچە، چۆلەکە، پێنووسەکەم..)و چەندانی تریش.

یەکێک لەو شتانەی کە لەسەرەتادا دەمەوێت لەسەری بوەستم و قسەی لەسەر بکەم، ناوی هۆنراوەکانی کاک دیار هەڵەبجەیی-یە کە بەڕاستی کۆمەڵێک موفرەدەی هێناوەو کردوویە بە ناوی شیعرەکانی کە هەموویان لە منداڵەوە نزیکن و منداڵ بەردەوام بە هاورێ و بە هەڤاڵی خۆیانی دەزانێت، بۆ نموونە (ترێ) میوەیەکە بەردەوام منداڵ زیاتر حەزی لێدەکات، چونکە لە زۆربەی ماڵەکانماندا ئەم میوەیە دەنێژرێت..

شەمەندەفەر، منداڵ دنیایەک وێنەی فانتازی بۆ ئەم ئامێرە هەیە، بەردەوام لە کاتی یاری و گەمەکانیاندا چەند دانەیەکیان کۆدەبنەوەو خۆیان بە گاڵتەو بە ئەندێشە دەکەنە شەمەندەفەر!! کۆلارە، ئەفسوونێکی باڵایە لە زاکیرەی منداڵاندا، منداڵ دەیەوێت بەهۆی کۆلارەوە بگاتە فڕین، ئەو فڕینەی گەورە بوون لێی زەوت دەکات، ئەمە جگە لەوەی کۆلارە، هاوڕێی هەمیشەیی مێرد منداڵانە.

پێنووس، ناوی هۆنراوەیەکی تری ئەم نامیلکەیە کە پێم وایە منداڵ لەگەڵ چوونە قوتابخانەی، ڕاستەوخۆ قەڵەم و پێنووس دەبێتە هاوڕێی، بۆیە زۆر پێویستە کە مامۆستایان و چاودێران پێنووس و قوتابخانە لای منداڵ خۆشەویست بکەن،

ئەمە جگە لە باخچە و تەلەفۆن و دراوسێ، کە کۆمەڵێکی شیعری کاک دیار هەڵەبجەیین، دەکرێت گرنگی و بایەخی بابەتەکانیان باس بکەین.

ئەوەشمان لەبیر نەچێت لە پشت هەموو ئەم شیعرانەوە هەستێکی پەروەردەییانە ئامادەیی هەیە کە دەکرێت بیکەینە چەقی شیعرەکانی

ئەم شاعیرە.

نووسەر لەسەرەتای ئەم نامیلکەیەداو لە پێشەکی شیعرەکانیدا، ئاوا لە ئەزموونی خۆی و دنیای منداڵان دەدوێت: «منداڵ مرۆڤێکی بچووکە، پاکوبێگەردە، دنیایەکی، پڕ خۆشەویستی و سادەو ساکاری هەیە....

هەر ئەم هۆیانەشە کە گەلێک مرۆڤی گەورە هەیە، هەستەکانی، تواناکانی خۆشەویستییەکانی، دەخاتە خزمەت ئەو مرۆڤە بچووکانە، تا بە گەورەیی پەروەردە بکرێن و داهاتوو بە ئەوان نەخشە بکێشن، هەر بۆیە لە ئەنجامی ئەم دوو خۆشەویستییە هەوڵی ترمان دا ئەو دنیایە پڕتر بکەین لە خۆشەویستی» ئەمە بەشێکی قسەی دەزگای چاپ کردنە بۆ دنیای منداڵ، هەرچی دیار هەڵبجەیی-یشە ئاوا لە دنیای منداڵ دەدوێت: «منداڵی ئەو دنیا پاکوبێگەردو ڕەنگاڵەییە کە جگە لەگوڵ و پەپوولەو خەندەو یاری هیچ شتێکی تری تێدا بەدی ناکرێت، ئەو دنیایەیە کە کاتێ گەورەکانیش دەگەنە حاڵەتی تووڕەبوون و بێزاری تەمەنا دەکەن بۆ ساتێکیش بێ بگەڕێنەوە ناو کۆڵانە خۆشبەخشییەکانی و لەوێ هەناسەیەک بدەنەوە بە ژیان»

لە شیعرەکانی ئەم شاعیرەدا زمان پاراوی و پاکیەتی زمانی کوردی دەبینین، بە شێوازێک بە کوردییەکی پاراو، سەرجەم هۆنراوەکان نووسراون و منداڵ بە ئاسانی دەتوانێت لێیان تێبگات و دووریشە لەگرێ و ئاڵۆزی، وشەکان ئاسانن لەسەر زمانی منداڵ و بە ئاسانی دەتوانێت لەبەریان بکات، بەمەش هۆنراوەکان ڕاستەخۆ لە ژیان و خولیاکانی منداڵەوە نزیکن وەک لە شیعری (باران)دا دەڵێت:

**مژدە بێ وا هەور هات**
**باران دەکات بە خەڵات**
**گوێ ی لێبگرن مناڵان**
**وا هەور کەوتە گریان**
**بارانێ دەستی پێکرد**
**لادێ و شاری گشت تەڕکرد**
**دەشت و دەر گەشایەوە**
**خەمی دڵ ڕەوایەوە**
**منداڵان دامەمێنن**
**چەترەکانتان دەربهێنن**

یان لە شیعری (تەلەفۆن)دا دەڵێت:

**ئامێرێکی دڵپاکم**
**زۆر بە سوودو چالاکم**
**قسەی دووری وڵاتان**
**دێنمە پەنای گوێچکەتان**
**بەهاناتانەوە دێم**
**بە چاک و خراپ نەدوێم**
**دۆستی گفتوگۆی جوانم**
**دوژمنی بەدکارانم**
**لە تەک زۆر ماڵدا هاوڕێم**
**هەژاران بێ بەشن لێم**
**خۆزگەو ئاواتم وایە**
**لە گشت ماڵێ بومایە.**

لەشیعری (باران و تەلەفۆن)دا شاعیر هەوڵی داوە بە زمانێک بدوێت، ئەو زمانە زمانی ئەو ئامێرو موفرەدەیە بێت کە بووەتە چەقی شیعرەکە، واتە باران دەبێتە هاوڕێی منداڵ و قسەی بۆ دەکات...

یان لە شیعری (تەلەفۆن)دا هەوڵ دەدات ئەو ئامێرە خۆی بۆ منداڵ قسە بکات، ئەمە ئەو ئەفسوون و فانتازیایەیە کە پێویستە لە دنیای منداڵدا هەبێت، چونکە خەیاڵی منداڵ زۆر فراوانەو هەست بە شتی زۆر وردو شاراوە دەکات کە لەوانەیە هەرگیزاوهەرگیز گەورەکان ئەو هەستەیان بەرامبەر نەبێت.

جگە لەوەش شاعیر زۆر هەوڵی داوە، کێش و سەروا بۆ شیعرەکانی دابنێت و بە دووری بگرێت لە هەموو لەنگییەک، هەر ئەمەشە وای کردووە کە زۆرێک شیعرەکان بکرێنە گۆرانی.

لایەنێکی تری نامیلکەی (بەرسیلە)، لایەنی تەکنیک و چۆنیەتی چاپ و وێنەکانی ناو نامیلکەکەیە، چونکە وێنەو چۆنیەتی ڕازاندنەوەی بەرهەمی منداڵان گرنگیەکی تایبەتی هەیە بۆ وەرگرتنی چێژ لە لایەن خوێنەران بەگشتی و منداڵان بە تایبەتی.

هەموو هۆنراوەکانی ناو ئەم نامیللەکەیە، هەندێکیان وێنەی سروشتی منداڵانەو هەندێکی تریش مۆتیڤی دروست کراوە.

هەرچی وێنە سروشتییەکان ڕاستەوخۆ گوزارشت لەو شیعرە دەکەن کە لە بەرامبەری دایە، هەر وەک لە هۆنراوەی (وێنەکەم، کورپەکەم، ترێ)دا دەبینرێت کە وێنەی فۆتۆگرافییەکە ڕاستەوخۆ گوزارشتی ئەو هۆنراوەیە کە بۆی دانراوە، بێگومان ئەمەش ئەزموونێکی تازەی شاعیرەو دەکرێت مایەی دەست خۆشی بێت..

هەندێکی تر لە شیعرەکانی ناو ئەم نامیلکەیە لەلایەن هونەرمەندان شەهلا ئامیق و ژیان عەلی-یەوە مۆتیڤیان بۆ دروست کراوە.

پێم وایە جیاوازی نێوان ئەو مۆتیڤانەی ئەم نامیلکەیە لەگەڵ هەندێک نامیلکەی تری منداڵان، تەنیا واقیعی بوونە کە ئەم وێنە و مۆتیڤانە بە شێوازێکی زۆر واقیعی دروست کراون، بە شێوازێک لەخولیاو خەونی منداڵەوە نزیک بن. ئەمە جگە لەوەی وێنەکان بە ستایلێک نەخشاون دەڵێی منداڵان خۆیان کێشاویانە، بەمەش دەرگایەکی تر لە ڕووی منداڵاندا دەکرێتەوە کە زیاتر هۆنراوەکانیان لا خۆشەویست تر بێت...❖





# شەوچرا

**لێدوانی: بەدرەدین ساڵح**

فۆلکلۆر ئەو کانیاوە ڕوون و سازگارەیە کە هەرچەند ئاوی لێ هەڵێنجی ڕوونترو ڕوونتر دەبێ. بەرهەم و بابەتی فۆلکلۆری بە واتای کولتووری هەر نەتەوەیەک ئەو سامانەیە کە هەر ڕۆشنبیرێک بەردەوام پێویستی پێیەتی و من لەسەر ئەو باوەڕە نیم هیچ ئەدیب و هونەرمەندێک بەبێ خوێندنەوەو بەبێ ئاگاداریی لەمێژووو ڕابردوو و کولتووری خۆی بتوانێ هەنگاوێکی بە نرخ بۆ داهاتووی گەلەکەی خۆی بنێ.

کوردستانی ئێران بە گەلێک هۆیەوە «گەنجینەیەکی سەربەمۆری»ی ئەدەبی کلاسیکی و کولتووری نەتەوەییمانە ئەویش، چونکە خۆش بەختانە زۆربەی هەرە زۆری گوندو لادێکانی بە پێوەن و ئێستەش لەگەڵدا بێ؛ زۆربەی دابونەریتی کوردەواری لەبرەودان و خەڵکی ئەو هەرێمە نرخیان دەزانن و لە خەمی پاراستنیانن.

ئێستەش لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی ئێران کۆچی ڕەوەندان، گەرمێن و کوێستان دەکەن و قەدپاڵ و شاخ و پێدەشتەکانی لە بەهاراندا ئاوازی بەسۆزی لاوک و حەیران و مەقام و بەیت بێژان مەیدان بە بولبولان چۆڵ دەکەن و هاوینانی بەرمووچەو مەزراو نێو ڕەزو باخ پڕن لە ئاوازو حەیران و... پایزانیش هەر بەدەم کۆچەوەو شەوانی سەخت و بە سەرماو سۆڵی زستان پڕاوپڕن لە گێڕانەوەی داستان و سەربوردەی قارەمان و ئاوازی بەسۆزی حەیران و لاوک و مەقام و بەستەو.. تین و گەرمی دەخەنە دڵی زستان. بەم شێوەیە دەتوانین کوردستانی ئێران بە کۆڵەگەیەکی پتەوی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی بزانین و بەڵگەشمان کۆمەڵێک کاری بەنرخ و جوانی دەیان خوێندەواری ڕۆشنبیرە کە بەویەری عەشق و وردبینیەوە خۆیان تەرخان کردووە بۆ هێنانە سەر کاغەزو ساخ کردنەوەو چاپ و بڵاوکردنەوەی بەیت و بابەتە فۆلکلۆرییەکان و ئاوە ئاوە چاو و دڵمان بە بابەتێکی جوان و بە پێز ڕۆشن دەکەنەوە.

لەم ماوەیەدا بەشی یەکەمی کتێبی شەوچرا (کۆمەڵە چیرۆکێکی فۆلکلۆری کوردی)یەو هەردوو برای ڕۆشنبیرو خەمخۆر، ڕەسووڵ وەیسی و سوارە فتووحی بە بەشداری خوالێخۆشبوو مارفی ئاغایی کۆیان کردۆتەوەو لە هەڵەو پەڵە دایان پاچیوەو بە تیراژێکی سێ هەزار دانەیی ساڵی(٢٠٠٠)- لە ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی- بڵاویان کردۆتەوە. ئەم کۆمەڵە چیرۆکە لە سەدو پەنجاو دوو لاپەڕەدا بەم شێوەیەی خوارەوە پێک دێت.

دوو پێشەکی لە هەر دوو برای بەرهەڤ کارو چیرۆکی گەوهەری شەوچرا؛ لاپەڕە(١-٣٥)-چیرۆکی شازادە تەیموور؛ لاپەڕە (٣٦ - ٨٢) - چیرۆکی حەتەم؛ لاپەڕە (٨٣ - ٩٨) - چیرۆکی قەل و کۆتر؛ لاپەڕە (٩٩ - ١٢٥) - چیرۆکی کەچەڵی کەوان؛ لاپەڕە (١٢٦-١٥٢) پێک دێت کە لە تەک هەندێ لە چیرۆکەکان پێناسەیەکی ژیان و بەسەرهاتی گێڕەرەوەکەو مەڵبەندی باوبوونی چیرۆکەکەو دوا چیرۆکیش لە گردەوە کۆی خوالێخۆشبوو مارفی ئاغایی-یە. ئەم شێوازە هاندەرێکە بۆ هەموو ئەو خۆشەویستانەی کە ئەفسانەیەک، چیرۆکێک بەسەر هاتێکی کۆنیان لە بیرە تا لە هەوڵی تۆمارکردن و پاراستن و چاپ کردندا بن و هەست بەوە بکەن کە ڕۆشنبیران و ناوەندەکانی چالاکی و بڵاوکردنەوەی فەرهەنگی کوردی ڕێزیان دەگرن و بەهای کارەکەیان دەزانن. دەکرێ ئەوەش بڵێم کە ئەم کۆمەڵە چیرۆکە؛ یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی کوردی-یە کە لە قەبارەو لاپەڕەو بەرگێکی جواندا لە کوردستانی ئێراندا چاپ دەبێ و جوانیی چاپەکەی زیاتر سەرنجی خوێنەران بۆ لای خۆی ڕاکێش دەکات.

هەروەها ئەم کۆمەڵە چیرۆکە کۆنینە کوردەوارییانە، وەک کۆکارەکانی لە پێشەکیی کتێبەکەیاندا، ئاماژەیان پێداوە کۆمەڵێک خوشک و برای دڵسۆزو خەمخۆری ڕۆشنبیری هونەرپەروەری تر بەشداری و هاوکارییان کردوون کە ئەمە خۆشی نیشانەی کاری هاوبەش و پوختی زیاترو ڕەسەن بوونی بەرهەمەکە دەگەیێنێ.

لە کۆتاییدا دەستخۆشانەو پیرۆزبایی لە هەر دوو برای بەرێزمان کاک ڕەسووڵ وەیسی و کاک سوارەی فتووحی دەکەین و یادی مارفی ئاغایی-ی جوانەمەرگ بە خێر دەگرین بۆ ئەم بەرهەمە بە پێزەو هیواداریین بەم زووانەش چاوو دڵمان بەبەشی دووەم و بەدواوەی شەوچرا ڕۆشن بێتەوە.. ❖



# چاوی مێژوو (40)



گومەزی سلێمان پاشای ئاوڕەحمان پاشای بابان لە گردی - سەیوان - شاری سلێمانی، ساڵی (١٩٨٣) بە کامێرای مامۆستا عەبدولڕەقیب یووسف گیراوە.
(دیاری: عەبدولڕەقیب یووسف)



دیمەنێک لە مزگەوت و قوتابخانەی میر ئاڤدەلی لە جزیرە، کە مەزاری مەم و زین-ی تێدایە. لەلایەن خەمخۆری کەلەپووری کورد لە کوردستانی باکوور خوالێخۆشبوو (مەلا خەلەفێ بافەیی) گیراوە.
(دیاری: عەبدولڕەقیب یووسف)



کۆمەڵە ئەفسەرێک لە دەرچووانی کۆلێژی سەربازیی بەغدا، لەو ڕۆڵەو لاوانەی لە عەشیرەتەکانی کوردستان هەڵبژێردرابوون بۆ چوونە ناو سوپای عیراقییەوە.
ئەم وێنەیە ساڵی (١٩٣٩) لە بەغدا گیراوە. کە لە ڕاستەوە بۆ چەپ ئەمانەن:
١- شەهید عیزەت عەبدولعەزیز
٢- خوالێخۆشبوو: مستەفا میران خۆشناو
٣- خوالێخۆشبوو: بەکر سامی خدر خۆشناو
٤- خوالێخۆشبوو: حەمید میران خۆشناو
(دیاری: سەردار میران)



پیشانگەی فوتابخانەی ناوەندی کچانی سلێمانی لە نیوەی یەکەمی شەستەکاندا.
کەسەکان لە ڕاستەوە بۆ چەپ: عومەری عەلی ئەمین، قادر کوردی، سەید موحسین خەتات.
(دیاری: عومەری عەلی ئەمین)



پیشانگەی فوتابخانەی سەیوان، ساڵی خوێندنی (١٩٥٧ - ١٩٥٨) کە لەلایەن فۆتۆی ئاسۆوە گیراوە.
(دیاری: عومەری عەلی ئەمین)



مامۆستا «هێمن»
کۆمەڵەی ڕۆشنبیرانی کورد - بەغدا
لە (٢٦/ ١٢/ ١٩٧٨) گیراوە.
(دیاری: سەباح ڕەنجدەر)

# چیرۆکی ئەفسانەیی - Contes de fees

چیرۆکی ئەفسانەیی کە ئێمە بەرامبەر Contes de fees-ی فەرەنسیمان داناوە، بریتییە لە گێڕانەوەیەکی زارەکی، مێژووی سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە پێش شارستانی گریک و ڕۆمانەکان، وەک ماددەو کەرەستەیەکی ئەدەبی و هونەریش سوودی لێ وەرگیراوە: ئەمەش لە ناو ئەدەبی نووسراو لە کۆن و نوێ نموونەی زۆرە، وەک ئۆدیسەی هۆمیرۆس، هەندێ لە ڕۆمانەکانی یەشار کەمال، بەتایبەتی (کوێر ئۆغلی)، بەڵام لەسەر ئاستی ئەدەبی و کولتووری کوردی، ڕەنگە مێژووەکەی بگەڕێتەوە بۆ پێش سەدەکانی ناوەڕاست، یان زووتریش، پێش سەردەمی سەرهەڵدان و سەقامگیر بوون و چوارچێوەوەرگرتنی ئەدەب و زمانی کوردی. لێرەش سەرچاوەکان لە ئەدەبی فۆلکلۆری و میللی دەدۆزرێتەوە.

لە خاسییەتەکانی چیرۆکی ئەفسانەیی لە ئەدەبی ڕۆژئاوا، پاڵەوانەکانیان بریتین لە کەسایەتیی سەرەوەی سروشت- Surnaturels، یان کارێکتەرێکی ئەفسانەیی لەم جۆرەیان هەیەو هەمیشەش بریتین لە ژن، ئیتر ژنی باش و خراپ، یان وردتر ژنی چاکەخوازو ژنی شەڕەنگێزو خاوەن دەسەڵاتێکی ئەفسوونی لەبن نەهاتوو.

لە ئەدەبیاتی میللیی ڕۆژهەڵات بەگشتی و ئەدەبی میللی و فۆلکلۆری کوردی بەتایبەتی، هەمان پێوەندیی دەدۆزینەوە، بەڵام پاڵەوانی سەرەکی ژن نییە، بەڵکو پیاوە، یان بەشێوەیەکی گشتی پیاوە. لە ناو کورد، پاڵەوانی سەرەکی کوڕێکە لە چینی هەرە سەرەوەی کۆمەڵ (بەگزادەو میرو پاشاکان)ە. دەسەڵاتێکی ئەفسوون ئامێزی هەیەو بەشێوەیەکی گشتی لایەنگیری خێرە، خەباتی ئەو دژی دێوی ڕەشە کە ڕەمزی شەڕەنگێزییەو (دێوی سپی ڕەمزی خێرخوازییەو هەمیشە دەستەمۆی پاڵەوانی سەرەکییە). ژن لەم پێوەندییە بە پلەی یەکەم دێ و گەلێ جاریش ڕۆڵی جیاجیا دەبینێ، وەک دولبەر، لە وێنەی کچە پاشاو کچە میر، پیرەژن لە ڕۆڵی تێکدەرو چقڵ چاندن.

سەرچاوەی ئەم چنینە دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی کۆنی کورد (Archaique). لەم چنینە ڕوخسارو سیمای ئایینی کۆن هەستی پێدەکرێ، بەتایبەتی ئایینە دوالیزمەکانی ئێران و میزۆپۆتامیای کۆن، وەک مەزدایزم Mazdaismeو زەردەشتی Zoroastrismeو میترایزم Mithraisme، وەک دووانەی ناسراوی (ئەهریمەن و ئاهورامەزدا). بەهەمان شێوە لە ئەدەبی ڕۆژئاواش پاڵەوانە ئەفسانەییەکان (Fees) بنچینەی ناوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ(Parques) کە کۆمەڵە خواوەندێکی پلە دوو بوون یان پایەیەکی لەم جۆرەیان هەبووەو دەگەڕێنەوە سەردەمی ئەو ئایینە کۆنانەی کۆمەڵێک خواوەندیان هەبووە(=Polytheisme)و تا ڕادەیەکیش ئەنیمیزم (Animisme) کە بریتی بووە لە (ارواحی یان احیائی= ئەو ڕێبازەی دەڵێ دەروون باوەڕی سەرەکیی بیرو ژیانی ماددییە.) لە سەردەمی ئایینی تاک خوداوەندی (یەکتاپەرستی- Monothaisme)، چیرۆکی ئەفسانەیی گۆڕانی بەسەردا هاتووەو لە ناو کریستیانی، بەهۆی مژدەبەرەکان، بەتایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاست، کەوتۆتە بەر کاریگەریی ئەم ئایینەو کارێکتەرە کۆنەکانی فڕێداوە. لێرەوە زۆرتر کەوتۆتە ناو ئەدەبی نووسراو، لەناو داستان و بەرهەمە خەیاڵییەکان دەدۆزرێتەوە. ناسراوترین چیرۆکی ئەفسانەیی ئەوروپی، چیرۆکی (لانسلۆی دەریاچەکە- Lancelot)یە، کە لانسلۆ ڤیڤیان لە دەریاچە ڕزگار دەکاو هەڵی دەگرێ و مارلین ئۆنشاتۆر (Marline Enchanteur) دەخاتە ناو بازنەیەکی ئەفسووناوی. یان چیرۆکی مێلوزین Melusine کە پاڵەوانێکە نیوەی ژنەو نیوەکەی دیکەی مارەو پارێزگاری لە خانەوادەی (لوزینان-Lusignan ) دەکا، یان تیتانیا-(Titania) کە شکسپیر لە شانۆگەریی (خەونی شەوێکی هاوین) باسی دەکا.

لە چیرۆکی ئەفسانەییدا پێوەندییەکان سەرەڕای جۆرە ئاڵۆزییەکی تایبەت بەگێڕانەوەو شێواز، سادەن، ئەگەر چارەنووس بەخێرو خۆشی کۆتایی بێ، هەردەم هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ توانای عەقڵی و فیزیکیی پاڵەوانەکە، ئەمەش لە گشت چیرۆکەکان هەستی پێ دەکرێ.

**ئا: د. موحسین ئەحمەد عومەر**

# نامەیەک لە (ئەنوەر قادر محەمەد)ەوە

**زامداری برام!**

خۆشەویستی و ڕێزی زۆرم.

ئەمە سێیەم نامەیە کە بۆتی دەنووسم و هیچ وەڵامێکم لێت نەبووە. نازانم بۆچی وا؟! دوورنییە سەرقاڵ و خەریکی دەردەسەری ڕۆژنامەنووسی و ماڵ و منداڵ بی. پیرۆزبایی لە دایک بوونی کچەکەشت لێ دەکەم، هیوامە خنجیلەو کامەران بێ، بەڵام چاوەڕوانم لەتۆ دەکرد ناوێکی غەریب و بەخەیاڵی کەسا نەهاتووی لێ بنێی وەک هی (سیڤەر)... هەرچی چۆن (ڤیان)یش هەر ناوێکی خۆشە.

من ژیان و گوزەرانم باشە. خوێندنەکەم خراپ نییە و لە ماوەی ئەم دوو سێ مانگەی داهاتوودا دەبێ دیفاع بکەم لێرە پێی دەڵێن دپلوم و لای خۆمان ماجستەرە، گوایە دەبێ ئەوە وەربگرم و بەخێر دوای ئەوە دەبمە قوتابی دکتۆرا. با واز لەوە بهێنین، ئێستە ڕووسییەکەم خەریکە باش دەبێ و کەوتوومەتە خوێندنەوە، لەمەو دوا ڕەنگە سەرم سووکتر ببێ. هەوڵ دەدەم ئەوەندەی ڕووسییەکەم بڕیکا وردە وردە شت بکەمە کوردی. من پەخشانی ڕووسی باش تێ دەگەم و شیعریش دەخوێنمەوە...

ڕەنگە بشزانی من تۆزێ سەرسەختم کە سواری سەری زمانێ بووم تا فێری نەبم وازی لێ ناهێنم. ماوەیەک لەمەوبەر کتێبێکم لەسەر ژیان و



ئەنوەر قادر محەمەد

بەرهەمی (بلۆک) خوێندەوە، ئەم شاعیرە زۆر نزیکە لە دڵ و دەروون و بیرکردنەوەمەوە، ئێستەش خەریکی خوێندنەوەی (یەسەنین)م بە ڕووسی، تەرجەمەکەی (حەسەب شێخ جەعفەر)یش، خوا هەڵناگرێ جوانە، بەڵام زۆر شت هەیە لە شیعردا تەرجەمە ناکرێ.

من ئەو ماوەیەی لێرەم هەر زیاتر خەریکی ئیمتحان و زمان فێربوون بووم، ژیانی تریشم زۆربیانەیە.. بالمناسبە، بۆ جاری سێیەم لەو ڕۆژانەدا (زۆربا)م خوێندەوە، لەسەر خەلیجی فنلدی ئیسراحەتمان دەکرد، لەسەر دەریا و لەناو کچ و سروشتی ڕووسیادا، مرۆڤ ئەگەر شێخێکی وەک زۆربا فریای نەکەوێت دەبێ یارلەیلی بڵێت. باوەڕبکە! هەمیشە یادتان دەکەم، ئێوە مانان کە ژنتان هەیە هەرنەیا! بەڵام بیر لە ژیانی ئێستەی خۆم و ئەدیبە بێ ژنەکانی لای خۆمان دەکەمەوە.. وەک دەڵێ کسپە لە جەرگمەوە دێ... ئەو قیامەتەی تۆ باسی دەکەی ئەمەیە.. شاعیر هەر بەرەڵای ئەم ناوە بکرێ باشە. هەرچەندە مەترسی ئەوەش هەیە شیعری لەبیربچێتەوە، بەڵام لە قووڵایی ژیاندا مەلە دەکات. ئەرێ توخوا لەگەڵ قۆڕیاتەکەتدا لە چیدای؟! زەوقەکەی جارانت ماوە یان کەنەفت کەوتووی؟! بەڵام لام وایە تۆ هەر دڵتەڕو بەزەوق دەبی. نووسینەکانت دەخوێنمەوە، سوپاست دەکەم کتێبەشتم پێ گەیشت. ئەرێ ئەو (فازل جاف)ە بۆ وەڵامی نامەکەی نەدامەوە، نامەی دووەم. ئەی دەتوانی ناونیشانی (سەردار)م بۆ بنێری. نامەیەکم بۆ خوشکەکەی نووسی، کەچی ناونیشانەکەی بۆ نەناردم. زۆر جار یادت دەکەمەوە. تۆ زۆرجار ئەوەندەت قۆڕیات هەیە، کە جارجار زیان لە بەهرەی ڕەسەنی خۆشت دەدا، بەڵام مرۆڤ ناتوانێ تۆی خۆش نەوێ، وانەزانی ئەوە هی ئەوەیە، کە کاتێ ئێمە لەسەرەتای بڵاوکردنەوەو دەرکەوتندا بووین و لەبەر ئەوەش خاوەنی قسەی خۆمان بووین، زۆر ئەدیب و نووسەردانی خێریان بە ئێمە دانەدەنا.... وانەزانی هەر لەبەر ئەوە تۆم خۆش دەوێ، کە تۆ دەهاتی هۆنراوە بێ نازەکانت دەبردین بۆ بڵاوکردنەوە، خۆ ئەگەر هەر نەشتتوانیایە بڵاویان

بکەیتـەوە، لە کـونجـێکی گـازینۆی پەرلەمـانا، یان لە شـوێنانی تر ملی خەڵکت دەگرت و بە قیامەتە، قیامەتە بۆت دەخـوێندنەوە. من بەش بە حـاڵی خۆم. هەمیشـە ئەوەم لەپێش چاوە.... بەڵام ڕێزم بۆ تۆ هەرچی ئەوە نییـەو هی زۆر شتی تریشە. نازانم مەرگ دەرفەت دەدا جـارێکی تر لە بارێکی (ئەبو نەواس)دا دابنیشین و تۆ بۆنی چارەکە عـەرەقـەکـە بکەیت و منیش یەک دوو بوتڵـەبیـرە بخـۆمەوە ئیـتر لەگـەڵ ئەو هاوڕێ و برادەرانەدا قـسـەی قـوڕ بکەین؟!

من لە پارەوە چەند شـیـعـرێکی بچکۆلەم نووسیـوە، ڕەنگە بیـاننێرم بۆ بڵاوکـردنەوە، هەرچەندە زاتیش ناکـەم، چونکە پاش ئەو هەمـوو بێ دەنگییـە، دەترسم وەک تەیرەکـەم لێ بێت، دەڵێن سـاڵی جـارێ دەخـوێنێ، ئەویش دەڵێ «گوو!»...

ئەم وڵاتەو ئەم شـارەی منی لێم هەر خۆی شیـعـرە... شاعـیـرێک چەنێ سەنگین و سەلار بێ کە کەوتە ئێرە و شیعرەکانی (یەسەنین)ی خوێندەوەو ئەم کچە نازدارو جوانانەی بینی... دەبێتە شـاعـیـرێکی شـەلاتی تەواو.. بەڵام لەگـەڵ ئەو هەمـوو خـۆشی و هێـمنی و جوانییەشدا ئەو پێوەندییە سیحرییەی لەنێـوان مـرۆڤ و خاکدایە، سـرەوت لە دڵدا نایەڵێت و هەمیـشـە بەرەو لای خۆیت ڕادەکێشێ.. کام شاعیرە غەریبە دەتوانێ، پەراوێزێ بۆ «قـوربانی تۆزی ڕێگەتبـمـە کـەی نالی بنووسێ؟!»... هەر بێـزار دەبم، دەیخـوێنمـەو و دەیخوێنمەوە.

دیسانەوە سەرلەنوێ (حەمەوسێوێ) کـە دەنووسـمـەوە، بەرهەم و کـتـێبی عـەرەبی باشیـشم چنگ دەکـەوێ، هی فارسیش.. لە خوێندنەوە نەکەوتووم و خەریکم بەیەکجاری دەست دەکـەم بە ڕووسی خـوێندنەوە، چونکە وانەبێ مـرۆڤ هیـچی بۆ ناکـرێ، سڵاووڕێزی زۆرم بۆ مـاڵەوەتان هەیـە چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم.

بـبوورە شەو درەنگەو من ڕقیـشـمە لەوەی سووراو و سپیاوی نامە بکەم، چونکە دڵسۆزی و خۆشەویستی زیاتر لە وشـەی مـاکیـاج نەکـراودا دەبینم، نـازانم ڕات دەربـارەی ئـەو دیـوانـەی «عەبدوڵڵا پەشێو» کە لە بەغدا دەرچوو چی بوو؟! من لام شـتـێکی باش بوو مەبەستم دیوانی «شەو نییە خەونتان پێوە نەبینم»ە. ئەگەر لات ماوە، چەند دانەیەکم لە کتێبەکەی خۆت بۆ بنێرە دووانیان بۆ ئەو دوو کچە کوردەی کە لێرە لەسەر مۆسیقای کوردییان نووسیوە، مەبەستم نورێ و خوشکەکەی ئۆردیخانە، هەندێکی تریشیان دەدەمە کتێبخانەکان.

سڵاوو ڕێزی زۆرم بۆ فازل جاف و ئەحمەد تاقانە و محەمەد موکری و عەبدوڵڵا قەرەداخی و عەبدوڵڵا عەباس و هەموو دۆست و ناسیاوان هەیە. تەحا ئەی خەمەبێ بنەکان

تا نامـەیەکی تر خـۆشـەویسـتی و دڵسۆزیم

**ئیمزا**

**برات: ئەنوەر قادر محەمەد**

**١٩٨٠/٨/٢٣: لینینگراد**

**تا: ڕامان**



# شوێنەوارەکانمان وەک سەرمایەیەکی گرنگی نەتەوایەتی

* شوێنەوارەکانی کوردستان بەشێکی گرنگی ناسنامەی کوردن، بۆیە دەبێ وەک گەنجینەو سەرمایەیەکی نەتەوایەتی تەماشا بکرێن و بپارێزرێن. بە فەوتان و لەناوچوونی ئەو شوێنەوارانە گەنجینەیەکی گرنگ و کۆڵەگەیەکی بەهێزی ڕابردووی ئێمە دەڕووخێ کە هەرگیز دووبارە نابنەوەو قەرەبوو نابێتەوە.

ئەو شوێنەوارانە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگری دێرینیی ئەم نەتەوەیە دەسەلمێنێ، کە لەم وڵاتەدا بەدرێژایی هەزاران ساڵ ڕەگوڕیشەی لەناو ئەم خاکەدا داکوتاوەو ڕەوتەنی نەبووە. چەند کارێکی ناهەموارە بەبێ شارەزایی دەست لەو شوێنەوارانە بدرێ و کنەیان تێدا بکرێ؟ چ خیانەتێکی گەورەیە دەست درێژیی بکرێتە سەر ئەو شوێنەوارە کۆنانەی باوک و باپیرانمان و تاڵان و ئاودیو بکرێن..؟

* ئەم خاکی کوردستانەی ئێمە سەرپاکی شوێنەواری مێژوویی دێرینەیە، بێجگە لەو شوێنەوارانەی لە کتێبە بەنرخەکەی (اطلس الآثار العراقیة)دا ناویان هاتووەو دەست نیشان کراون و پشکنین و کنەیان تێدا ئەنجام دراوە، بە دەیان و سەدان شوێنەواری دیکە ماون کە تا ئێستا دەق و مۆریان نەشکاوەو دەست نیشان نەکراون و دەرفەتی لەبارو گونجاو نەبووە کاریان تێدا بکرێ.

* بەڕێوەبەرایەتیی شوێنەوار لە شارەکانی کوردستاندا ئەرکێکی مێژوویی گەورەیان لە ئەستۆیە بۆ بەتەنگەوە هاتن و پاراستنی شوێنەوارەکانمان و پێویستە خەمخۆرانە قۆڵی لێ هەڵماڵن و لەم ئەرکە نەتەوەییەدا خەمسارد نەبن، یان کە شەقامێک لێدەدرێ، بیناغەی خانوویەک هەڵدەکەنرێ، یان پرۆژەیەکی ئاوەدانکردنەوە دەست پێدەکات، ئامادەگی هەمیشەیی خۆی هەبێ، نەبادا ئەو شوێنانە شوێنەوارێکی کۆنینەی تێدابێ و لە ئەنجامی کەمتەرخەمی کردنێک کوێربێتەوەو ئەڵقەیەکی گرنگی مێژوویی وڵاتەکەمان لەبەین بچێ، کە تا ئێستا بەدەیان و سەدان شوێنەوار زیانیان لێ کەوتووەو بە بەرچاوی شوێنەوارناس و دامودەزگاکانی پێوەندیدار چ بە ناشارەزایی، یان بەدەستی ئەنقەست دەست درێژییان کراوەتە سەر، وەک لەو ماوەیەی ڕابردوودا لە کاتی کارکردن لە دروست کردنی جووت سایدی هەولێر - دهۆک شوێنەواری (گرد عارەب) کە شوێنەوارێکی گرنگە بەر شۆفڵ کەوت و زیانێکی گەورەی بەو شوێنەوارە گەیاند.

* مافیاکانی ئاودیوکردنی شوێنەوارەکانمان لەم ساڵانەی دواییدا نەک هەر بە تاڵان و بڕۆ بردنی شوێنەوارەکانمان و هەرزان فرۆش کردنی نەوەستان، بگرە گۆڕی باوک و باپیرانیشمانیان هەڵتەکاند بۆ دۆزینەوەی کوپەگۆڕێک، گوایە ئاڵتوون و کەلوپەلی بە نرخی تێدایە، کە بۆ هەندێ دەسکەوتی بچووک زۆر ناشیانە کەوتنە وێزەی شوێنەوارەکانمان و داروپەردوویان بەسەر یەک دادا و کەسیش ورتەیەکی نەکرد.

* بۆیە بەلای منەوە پێویست نییە، لە ڕۆژی ئەمڕۆکەداو لەم قۆناغەی میللەتەکەمانی پێدا دەڕوا شوێنەوارەکانمان بپشکنین و کنەیان تێدا بکەین و بیانکەین بەدیاری و خۆراکی مافیاکانی شوێنەوارو زیاتر بۆیانیان دەست نیشان بکەین، چونکە دەست نیشان کردن و نیشاندانی گرنگیتی هەر شوێنەوارێک، جگە لەوەی زیادە مەسرەفێکە کە دەبێ بخرێتە بارودۆخێکی تەواو ئارام و جێگیر، لە هەمان کاتیشدا پێویستی بە دانانی پاسەوان و کەسانێکە کە بەچاکی و وەک بیلبیلەی چاویان بیپارێزن، بۆیە پێویستە زیاتر بایەخ بەو شوێنەوارانەمان بدەین کە لەبەر چاومانن یان ئەو شوێنانەی کە خەریکە زیانیان پێدەگات، یان بەرەو ڕووخان دەڕۆن، تا بە فریایان بکەوین لەجیاتی ئەوەی پارە لە پشکنیندا سەرف بکەین.

* ئەوەی کە زۆر بەلامەوە گرنگە لەم قۆناغەدا پێداگرتنە لەسەر (هوشیاریی) پاراستن و بە گرنگ ڕاگرتنی ئەو شوێنەوارانە لەلای میللەتەکەمان، تا بە بەشێک لە مێژوو و میراتی نەتەوایەتی باوک و باپیرانی خۆی بزانێ و ڕێزی لێبنێ و نەهێڵن زیان بەو جێگایانە بگات و هەر کاتێ کەسانێکی نامەسئوول دەستیان بۆیان درێژ کرد ڕێگەیان لێبگرن و لایەنە بەرپرسەکانیان لێ ئاگادار بکەنەوە. هەروەها قووت نەکردنەوەی خانوو و دوکان و بازاڕ و شەقام لێدان لە دەورووپشتی ئەو شوێنەوارە دێرینانەو زیان گەیاندن پێیان، ئەو کاتە کە هوشیاریی بڵاوکرایەوە هەموو کوردێک دەبێتە هاوکاری بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوار و لەهەر شێواندن و دەست تێوەردان و زیان گەیاندن و ئاودیوکردنێک داکۆکی لێیان دەکات.



ئازاد عەبدولواحید

* دیسان سوورم لەسەر ئەو ڕایەی خۆم کە لەمڕۆکەدا شوێنەوارەکانمان دەستکاری نەکەین و پشکنین و کنەکردن تێیاندا بەڕاست نازانم، چونکە جگە لە کەمیی ژمارەی کادیری پسپۆڕ و شارەزا، دیسانەوە پێویستمان بە (تاقیگە) و کەرستەو پێداویستیی پێشکەوتووی سەردەم هەیە کە نەبوونی (تاقیگە) زۆر جار لە کاری پشکنیندا زەرەرو زیانی لە قازانج زیاترە، کە لەوانەیە زۆر دۆزینەوەی نوێ و پەنجە لەسەر دانانی وردو ئەنجامی گرنگمان لەکیس بدات، جاری وا هەیە دەنکە گەنمێک لەناو ئەو شوێنەوارەدا کە بەخەڵوز بووە (تفحم) کە لە تاقیگەدا دەردەکەوێ و تەمەنەکەی دەست نیشان دەکات، لە کاتی دەستکاری کردنی ئەو شوێنە دەبێتە خۆڵ و هەستی پێناکرێ، کە لە یەکێک لەو چینانەی زەویدا چاخێک دەست نیشان دەکات. نەک هەر ئەوەش زۆر جار کارکردنی ئەو کرێکارانەی لەو شوێنەوارانەدا کار دەکەن بە پاچ و قولینگ دیزەو گۆزەو دەرخونە و (لقی) پارچەی شوێنەواری زۆر گرنگ وردو خاش دەکەن و تێکی دەشکێنێ و زیانێکی گەورەیان پێدەگەیەنێ.

* بۆیە ئەرکی هەموو لایەکە، بەتایبەتی بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری کوردستان گرنگی زیاتر بە کارەکانی خۆی بدات و لە ڕێگەی کادیری پسپۆڕ و شارەزاوە هوشیاریی پێویست لەناو میللەتەکەماندا بڵاوبکاتەوە بۆ ڕێز لێنان لە شوێنەوارەکانمان، تا شان بەشانی زانکۆی سەلاحەدین خەڵکی شارەزا بۆ ئەو کارانە بخەنە گەڕ، لەپاش ئەوەی ئەو بەشە لە ساڵی پارەوە لەو زانکۆیەدا کرایەوە.

* هەموو خەمخۆرانی ئەو کەلەپوورە شارستانییە پێویستە پرۆژەی یاسایەک گەڵاڵە بکەن، تا پێشکەشی پەرلەمانی کوردستانی بکەن و بەپێی یاسایەک ئەو سامانە گرنگ و گرانبەهایە کە هەرگیز بە پارە مەزەندە ناکرێ بپارێزن، تا پاراستن و سزادانی ئەوانەی بازرگانی پێوە دەکەن ڕێک بخات.

* دەزگا بەرپرس و پێوەندیدارەکانیش پێویستە پێش ئەوەی مۆڵەتی خانوو کردن، یان شەقام برین و بینایەک بکەن، پێشەکی ڕەزامەندیی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوار وەربگرن، تا بە تەواوی دڵنیابن لەوەی شوێنەکەی نەک هەر شوێنەوار نییە، بگرە دووریشە لە شوێنەدار، کە ئێستاکە وەک زانیومانە لە زۆر شوێندا کە جێگەکەی شوێنەوارە لە نزیکی ئەوێ، موەلیدەی گەورەو زەبەللاح دانراون کە بە لەرزینەکەی زیان بەو شوێنەوارانە ددگەیەنێ.

لە کۆتاییدا پێشنیار دەکەم دەلیلێک بە زمانی کوردی و ئینگلیزی گرنگترین شوێنەوارەکانی کوردستان بەچڕی تێدا باس بکرێ، تا لەلایەک نەوەکانی خۆمان و لەلایەکی دی بێگانەکان سوودی لێوەربگرن.. ❖



ئەرشیفی: د. فەرهاد پیرباڵ

(قەڵای کوردان)

کوردستانی سوریا - سەردەمی سەلاحەدینی ئەیووبی.


Monthly

RAMAN

5,November,2001

Issue,No.65

Raman : A General Cultural Monthly

Issued by Gulan Information Establishment